# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

## بەرگی بیستەم

سوورەتەکانی

(القصص) و (العنكبوت)

عەلی باپیر

## تەفسیری سوورەتەکانی

# القَصَص و العَنكبُوت


نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

٧٢٥ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

تەفسیری سوورەتەکانی

# القَصَص

# و

# العَنكبُوت

نووسینی: عەلی باپیر

# پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّهِ مِـنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْده اللَّـهُ فَلاَ مُضِــلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضْلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فَـإِنَّ أَصْـدَقَ الحَدِيـثِ كَلَامُ اللَّـهِ، وَخَـيْرَ الْهَـدِيِ هَـدْيُ مُحَمَّـدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُـورِ مُحْدَثَاتُهَـا، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَــلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَــلاَلَةٍ فِي النَّــار[1].

خوێنـەرە بەڕێــزو خۆشـەویستەكان!

هیــچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤــی بــڕوادار - كـە ئــەو تەمەنــەی لـە خزمــەت دوایـین كتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەكانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفكریـن و ڕامـان، فێركـردن، كارپێكـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتــن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەكـەی لـە دنیـاو دواڕۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگــوترێ: (خطبـة الحاجـة) كـە پێغـەمبــەر ﷺ هــاوەڵانی بەڕێـزی فێــردەكرد، پێــش هـــەر قسـەیەكی گرنـگ، بیڵــێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازیكردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتــارە، هـەركام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النســائي: (١١٠٤)، ابن ماجـە: (١٨٩٢) أحمـد: (٢٧٢٠)، الطَّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشــێكی هێنـاوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی بەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پیرۆز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاکـو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بەڵـکو خۆشـیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شـایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئـان پێشـکەش بە مسـوڵمانانی کوردسـتان بکەم، کـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش کـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئانی بـەرزو مـەزن و تەفسـیرەکانی و کتێبەکانی سـوننەتدا خـەریکم و، دەیـان کتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەکانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شـایانی باسیشـە کـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی کرانەم لەلایـەن ئەمریکاوە - لـە (١٠/٧/٢٠٠٣ تاکـو: ٢٨/٤/٢٠٠٥) - دەرفەتێـکی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەکانی یـەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك دەروشـاوەتەوە[1]. بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچکەسـیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسـیرەی من تێروتـەواوە، چونکـە وێـڕای سـنووردارבوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر کتێبـی لـە هـەموو ڕووێکـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسـووعەیە کە ئێسـتا چـاپ کراوەو، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵـمداوە بەگشـتی تێیـدا باسـی سـەرجەم لایەنـەکانی ئیسـلام بکـەم و، تاکـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەسـتی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

شـــارەزا نیـم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبارك وتعـالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویسـتی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتــرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسـیــرەماندا بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشــکردنەکانی دیکــەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکــە هـــەر ســـووڕەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســـەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتــەکانی وەك ئاڵقــەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـــدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســـووڕەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســـۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنـی نیـوەی زیاتـری قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کـردوە، کـە ئەگـەر تەمەنمـــان بـەردەوام بێ، هەتـــا کۆتـــایی ئـەم تەفسـیـرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، نیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ،

وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحمدللـه ربِّ العالمیـن والصـلات والسـلام والـبركات علـى جميـع الأنبيـاء والمرسـلين لاسـيما سـيدهم وخاتمهـم إمـام المتقيـن وقائـد المجاهديـن، وآلـه أجمعيـن، مـن الصَّحـب والأزواج والقرابـة والتابعيـن لهـم بإحسـان ويقيـن.

بەڕێـــــزان!

ستایشـی لێوەشـاوە بـۆ خـوای بـەرزی مـەزن، ئەمـە بەرگی بیسـتەمە لە تەفسـیری قورئانـی بـەرز و بەپێـز، کـە هـەردووک سـوورەتی (القصـص) و (العنكبـوت)ی گرتوونە خـۆی، کـە بـەش (جـزء)ی بیسـتەم (٢٠)ی قورئانـی تێدایـە بەپێـی دابەشـکردنی زانایـان.

ئـەم بەرگـەش وێـڕای شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بەپێزەکانـی ئـەو دوو سـوورەتە موبارەکـە (القصـص) و (العنكبـوت) ژمارەیـەك کورتـە باسیشـی تێـدان، بەمجـۆرەی خـوارێ:

أ- لە سوورەتی (القصص)دا :

١- کورتە باسێک : مووسا و هارون و چەند زانیارییەك لەبارەی خۆیان و گەلەکەیان و فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە.

٢- کورتە باسێك : دە (١٠) هەڵوەستەی گرنگ لەبەردەم ئەو چوار ئایەتەی سەرەتای (القصص)دا.

٣- چوار نیعمەت و چاکەی گەورەی خوا بۆ گەلی چەوساوەی مووسا.

٤- کورتە باسێك : ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی (فؤاد) و (قلب).

٥- حوکم و حیکمەت و پەندەکانی ئەم پێنج قۆناغەی بەسەرهاتی مووسا.

٦- كورتە باسێك لە سێ سەرەنج دا.

٧- چیرۆكی مسوڵمانبوونی سەلمانی فارسیی.

٨- كورتە باسێك : ئەم ئایەتانە (القصص: ٥٢-٥٥) بەسەر كێ دا دەچەسپێن؟

٩- كورتە باسێك لە پێنج سەرنج دا لەبەر تیشكی ئایەتی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾.

١٠- كورتە باسێك لەبارەی بەهرەمەندبوونی خەڵكی مەككە و دەوروبەریەوە، لە حەرەمی مەككە.

ب- لە سوورەتی (العنكبوت) دا:

١١- كورتە باسێك لەبارەی تاقیكردنەوەی خواوە بۆ بەندەكانی.

١٢- كورتە باسێك لە حەوت كورتە سەرنج دا.

١٣- چەند زانیارییەك لە بارەی جاڵجاڵۆكەو ماڵەكەیەوە.

١٤- كورتە باسێك لەبارەی نوێژەوە.

هیواداریشم ئێوەی خوێنەرانی بەڕێز بە چاوی سەر و بە چاوی دڵیشتان ئەم تەفسیرە بەپێزە بخوێننەوە و باشترین بەهرەی لێوەربگرن.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت

أستغفرك وأتوب إليك

٢٠٢١/١/٧ز

١٤٤٢/٥/٢٣ك

# دەستپێک

بەڕێـزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٠/ی شوال/ ١٤٤٠) کۆچییـە، بەرانبـەر (١٣/ ٦/ ٢٠١٩)ی زایینـی، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (القَصَـص)، سـەرەتا پێناسـە و نێوەڕۆکـی سـوورەتی (القَصَـص) دەخەینـە ڕوو، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە نێـو قووڵایـی شـیکردنەوەی مانـاو مەبەسـتەکانی ئایەتـە موبارەکەکانـی ئـەم سوورەتە، جوگرافیا و نەخشـەی گشـتیی سـوورەتەکە و کەسـایەتییەکەی و، پێگەکەی و، نێوەڕۆکەکـەی لەبـەر چاومـان بـێ.

## پێناسەی سوورەتی (القصص)و بابەتەکانی

لـە حـەوت بڕگـەدا، ئێمە هەم پێناسـەی ئەم سـوورەتە دەکەین، هەم نێوەڕۆکەکەشـی دەخەینە ڕوو:

### ا)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی سـوورەتی (القَصَـص)ەو، نەزانـراوە هیـچ ناوێکـی دیکـەی هەبـێ، یـان هیـچ ناوێکـی دیکـەی بـۆ بـەکار هاتبـێ، هـۆی ناونرانیشـی بـەو نـاوە، ئەوەیـە وشـەی (القَصَـص)ی تێـدا هاتـوە، لـە ئایەتـی ژمـارە (٢٥): ﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ ۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

هەرچەنـدە سـوورەتی (یوسـف)یش ئـەم وشـەیەی تێـدا هاتـوە، لـە ئایەتـی ژمـارە (١١١) دا، بـەڵام سـوورەتی (یوسـف) دوای (القَصَـص) هاتۆتـە خـوار، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الأعراف)یشـدا: ﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦﴾، هاتـوە، ڕەنگـە لـە شـوێنی دیکـەش دا هاتبێ، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە کـە ئـەم وشـەیە لێـرەدا، وەک لـە کاتـی خـۆی دا پێـی دەگەیـن، مانایەکـی تایبەتیـی هەیـە، ئەویـش ئەوەیـە کـە مووسـا ، دوای ئـەوەی دەگاتـە پیـاوە بـە تەمەنـە صاڵحەکـەی مەدیـەن، بەسـەرهاتە سەرسـووڕهێنەرەکانی خـۆی، هەوراز و نشـێوەکانی کـە هاتوونەتە ڕێی، بـۆی دەگێڕێتەوە.

**٢)- شوێنی دابەزینی:**

ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، هەرچەنـدە وەک عادەتـی خۆیـان، هەندێـک لـە زانایـان چەنـد ئایەتێـک لـەم سـوورەتە بـە مەدینەیـی دادەنێـن، وەک ئـەو چـوار ئایەتـەی کـە دەفەرمـوون: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ٥٢ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ٥٣ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٥٤ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ٥٥﴾، هەندێکیـان دەڵێـن: ئـەم ئایەتانـە لـە مەدینـە هاتوونـە خـوار، هەروەهـا گێڕدراوەتـەوە کـە ئـەم ئایەتـە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٖۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ مَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ وَمَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٨٥﴾، لـە (الجُحفَـة) هاتۆتـە خـوار، کـە شـوێنێکە لـە نیزیـک مەدینـە، لـە کاتێکـدا کـە پێغەمبـەر ﷺ بەڕێـوە بـووە بـۆ کۆچکـردن، لـە مەککـەوە بـەرەو (یَـثْرِب)، لـە سـاڵی (١٣)ی ڕەوانەکرانیـدا.

بـەڵام بێگومـان مەبەسـت لـە مەککەیـی بوونـی هـەر سـوورەتێک، یـان ئایەتێـک، دابەزینیەتـی لـە قۆناغـی پێشـچوونی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـەدا، هەرچەنـدە شـوێنی دابەزینیشـی مەککـە نەبێ، واتـە: گرنـگ ئەوەیـە کـە پێـش ئـەوە دابەزیبێ،

کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـەوە کـۆچ بـکات بـۆ شـاری (یـثرب) - کـە دواتـر نـاوی لێـنرا مەدینـە - ئـەو قورئانـەی لـەو قۆناغـەدا دابەزیـوە، پێـی دەگوتـرێ: قورئانـی مەککەیـی، بـا لـە خـودی مەککـەش دانەبەزیـبێ و لـە شـوێنێکی دیکـە دابەزیـبێ، هەروەهـا هەمـوو ئـەو قورئانـەی دوای کـۆچ کردنـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـە دابەزیـوە، ئەگـەر لـە خـودی مەککـەش دابەزیـبێ، هـەر بـە مەدینەیـی لـە قەڵـەم دەدرێ، چونکـە لـە دوای کۆچـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـە دابەزیـوە.

ئـەو ئایەتانـەش کـە ئاماژەیـان پێکـرا، کـە گوایـە مەدینەییـن، لەبـەر ئەوەیـە کـە باسـی خـاوەن کتێبـەکان دەکـەن، کـە پێشـتریش وەڵامـمان داوەتـەوە: ئەگـەر بـەو پێیـە بـێ، دەبـێ لـە سـوورەتەکانی: (الأنعـام و الأعـراف و الأحقـاف)و، زۆرێـک سـوورەتە مەککەییـەکان دا، کـە باسـی خـاوەن کتێبـەکان دەکـەن، ژمارەیـەک لـە ئایەتـان لەوانـە هەموویـان دا، مەدینەیـی بـن! بـەڵام ئـەوە ڕاسـت نیـە، چونکـە لـە مەککـەش، جوولەکـە و نەصرانییـەکان هاموشـۆیان هەبـووە و، بـاس و خواسـیان هەبـووەو، تێکەڵییـان هەبـووە، کـەم و زۆر، تەنانـەت یەکێـک لـەو تۆمەتانـەی کـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ کـراوە، ئەوەیـە کـە یەکێـک لەوانـەی قورئانـی لـێ فێربـووە، غوڵامێکـی نەصرانیـی بـووە، کـە نـاوی یەسـار، یـان ناوێکـی دیکـەی بـووە! کەواتـە: ئـەوە ڕاسـت نیـە کـە هـەر ئایەتێـک باسـی خـاوەن کتێبـان، یـان باسـی جوولەکـەو نەصرانییەکانـی کردبـێ، مەککەیـی نەبـێ.

### ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی (مُصحَـف)دا، ژمارەکـەی (٢٨)ە، واتـە: کـە لـە سـوورەتی (الفَاتِحَـة)وە پێـدا دێـی، سـوورەتی (القَصَـص) لـە ژمـارە (٢٨)دا دانـراوە، ئنجـا ئێمـە لـە کتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قورئـان دابیـن)دا[1]، بـە تەفصیـڵ لـەو

---

(١) بـەڵام فراوانـترو وردتـر لـەوە، لـە بابـەتی: (قورئـانی مـەزن لـە نـۆزدە تـەوەر)دا، بـاسی ئـەو مەسـەلەیەمان کـردوە.

بـارەوە قسـەمان کـردوە، کـە وا پێدەچـێ دانرانـی هەندێـک لـە سـوورەتەکان لـە دوای هەندێکیـان، بـە فەرمانـی ڕاسـتەوخۆی پێغەمبـەر ﷺ بووبـێ و، لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ زانـراو بـووە کـە (الفَاتِحَـة و البقـرة و آل عِمـرَان و النسـاء)، بـەو ڕێزبەندییـە بـوون و، لـە هەندێـک فەرموودانـدا هاتـوە، کـە ڕیزبەندیـی هەندێـک لـە سـوورەتەکان، وەک ئێسـتا لـە (مُصحَـف)دا هەیـە، بـووەو بـە وەسـتاندن (توقیـف)ی پێغەمبـەر ﷺ بـووە، بـەڵام زۆربەیـان وا پێدەچـێ ڕیزبەندییەکەیـان تەوفیقیـی بـێ، هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بـە تایبەتیـی چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەکان - کـە لـە سـەردەمی ئەوانـدا قوڕئـان خراوەتـە نێـوان دوو بەرگـەوە، ئەگەرنـا هـەر هەبـووە، بـەڵام کراوەتـە (مُصحَف)ێـک - بـە ئیجتیهـادو بۆچوونـی ئـەوان بووبـێ، هەڵبەتـە هەندێـک لـە زانایانیـش دەڵێـن: ڕیزبەندیـی هەمـوو سـوورەتەکان تەوقیفییـە هـەروەک ئایەتـەکان، کـە ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان گومانـی تێدانیـە تەوقیفییـە و، خـوا ﷻ چۆنـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دابەزانـدوون، ئەویـش ئـاوا خوێندوونیـەوە لـە دوو توێـی سـوورەتەکاندا، بـەڵام بـۆ سـوورەتەکان، زانایـان ڕای جیاوازیـان هەیـە، هەندێـک لـە ڕیزبەندیـی سـوورەتەکان، هیـچ گومانـی تێدانیـە، بـە دوای یەکـدا هاتنیـان بـە فەرمانـی ڕاسـتەوخۆی پێغەمبـەر ﷺ بـووەو، هەندێـک دەقـی ڕوونـی لەسـەرن، بـەڵام هەندێـک دەقیـش ئـەوە دەگەیەنـن، کـە ڕیزبەندیـی زۆربـەی سـوورەتەکان بـە ئیجتیهـادو بۆچوونـی هـاوەڵان، بـە تایبـەت خەلیفـە ڕاشـدەکان (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) بووە.

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی دابەزیـن (ترتیـب النـزول)دا، ژمـارە (٤٩)یـە، واتـە: ئـەم سـێ سـوورەتە (الشـعَراء و النمـل و القَصَـص) وەک چـۆن لـە (مُصحَـف)دا لـە دوای یـەک دانـراون، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینیشـدا، ژمـارە (٤٧، ٤٨، ٤٩)یـان هەیـە.

### ٤)- ژمارەی ئایەتەكانی:

ژمارەی ئایەتەكانی ئەم سوورەتە موبارەكە، بە یەكدەنگیی ژمێرەران (باتفاق العادّین)، هەشتاو هەشت (٨٨) ئایەتە، هیچ زانایەك لەو بارەوە ڕای جیاوازی نەبووە، جیاوازیی ژماردنی ئایەتەكانیش، دەگەڕێتەوە بۆ كورتیی و درێژیی ڕستەكان، لە شوێنێك لە نێوەڕاستی ئایەتێك بوەستی، ئەوێ دەبێتە ئایەتێك و، دواتر دەبێتە ئایەتێك، بەڵام ئەگەر نەوەستی، تاكو تەواو دەبێ، هەمووی دەبێتە ئایەتێك، لێرەدایە كە جیاوازیی ژمارەی ئایەتەكان سەری هەڵداوە، بە پێی ڕای زانایان، كە ئەوانیش بە تەئكید هەر لە شوێنكەوتووان و، ئەوانیش لە هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) وەریانگرتوە.

### ٥)- نێوەڕۆكی:

لە ڕووی نێوەڕۆكەوە، ئەم سوورەتەش، وەك سەرجەم سوورەتە مەككەییەكانە، لە باسكردنی بابەتەكانی بووناسیی، ئیمان و عەقیدە، تەنیا خواپەرستیی بە تایبەت، ئنجا گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ) و، باسی ڕۆژی دوایی، هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و هەڵسانەوەو زیندووبوونەوە، سزاو پاداشتی خوا و.... هتد.

### ٦)- تایبەتمەندییەكانی:

سوورەتی (القَصَص) وەك هەر كام لە سوورەتەكانی قورئان، چەند تایبەتمەندییەكی هەن، كە تایبەتن بە خۆیەوەو، تەنیا لەم سوورەتەدا بەو شێوەیەن، ئێمە حەوت تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەكە، دەرهێناون، هەڵبەتە ئەوە هەمووی بە بۆچوونی خۆم و، لە ئەنجامی تێرامانی خۆم دا پێی گەیشتووم:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** پێنج قۆناغی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ وەک دواییش باسی دەکەین، لە سێزدە قۆناغەکەی ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ، تەنیا لەم سووڕەتەدا بەم ڕیزبەندییە و وردەکارییە هاتوون، ئەوەی لە شوێنەکانی دیکەدا هاتوە، زۆری ئاماژەیە بە هی تێرە، یاخود بە کورتیی، ئەگەر باسی هەندێ لەو شتانە کرابێ، کە لەم پێنج قۆناغەدا هاتوون، لە هەندێکیان دا بە کورتییش ئاماژەیان پێ نەکراوە.

**تایبەتمەندیی دووەم:** ئەم یاسایەی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ ۝٦ ﴾.

کە هەردووک ئایەتی: (٥ و ٦)، دەیگرنە خۆیان، لە هیچ شوێنێکی دیکەی قورئاندا بەو ڕوونیی و ڕاشکاوییە ئەم یاسا گەردوونییەی خوا ﷻ لە قورئانـدا نەهاتوە.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا، باسی ئەگەری هەمیشە شەوگار بوون و، هەمیشە ڕۆژگار بوون لە ژیانی مرۆڤدا کراوە، کە لە هەردووک ئایەتی: (٧١ و ٧٢)دایەو، نەکەوتۆتە بەرچاوم کە لە هیچ شوێنێکی دیکەی قورئاندا، باسی ئەوەی کرابێ:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ۝٧١ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ۝٧٢ ﴾.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** تەنیا لەم سووڕەتەدا باسی بەسەرهاتی قارووون و دەوڵەمەندیی و بوغڕابوونی و، دوایی بەزەوییدا ڕۆچوون و نغرۆبوونی خۆی و، ماڵ و سامانەکەی کراوە، لە ئایەتەکانی: (٧٦ - ٨٢)دا، لە شوێنی دیکەدا ناوی قارووون هاتوە، بەڵام بەسەرهاتەکەی تەنها لەم سووڕەتی (القَصَص)دا هاتوە.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ئەوە کراوە کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ ناچاری کۆچکردن دەکرێ، بەڵام دوایی خوا دەیگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ ﴾، کە وەک دوایی دەیکەینێ، زۆربەی لێکدەرەوان و شیکەرەوانی چەمک و واتای ئایەتەکانی قورئان دەڵێن: ئەوە ئاماژەیە بەوە کە موحەممەد ﷺ ناچاری کۆچ کردن دەکرێ لە مەککەوە بۆ مەدینە، بەڵام دواییش خوا ﷺ بە سەربەرزیی و بە سەرکەوتوویی دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوە زێدو شوێنەی خۆی، کە ناچاری کۆچ کردن کراوە لێی.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ئەوە کراوە کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ هیچ بە ئومێدی سروش بۆ کران و بوونە پێغەمبەر ﷺ نەبووەو، هیچ چاوەڕوانیی نەبووەو، بە هیوا نەبووە بکرێتە پێغەمبەرو وەحیی بۆ بنێردرێ و، قورئانی بۆ دابەزێنرێ، تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ئەوە کراوە بە پێی زانیاریی من، ئەویش کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾.

واتە: تۆ بە تەما نەبووی قورئانت بۆ بنێردرێ، بەڵام بە هۆی بەزەیی پەروەردگارتەوە قورئانت بۆ هات، واتە: تۆ هیچ هەوڵ و کۆششێکت بۆی نەبوو، هیچ چاوەڕوانییەکیشت نەبوو، بەڵام خوا بەخششی خۆی بە هەر کەسێک دەدا، کە بیەوێ، هەڵبەتە خواش کاربەجێیەو بەخششی خۆی لە هەر شوێنێک دابنێ، دیارە ئەو شوێنە شایستەیە.

**تایبەتمەندیی حەوتەم و کۆتایی:** چەند وشەیەک تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون، کە ئەمانە زەقترینیانن:

١)- وشەی (حِجَج) کە کۆی (حِجَّة)یەو بە مانای ساڵە، (حِجَج) یانی ساڵەکان، (ثَمَانِيَ حِجَج) لە ئایەتی بیست و هەشت (٢٨)دا هاتوە.

٢)- وشەی (جَذوَة)کە بە (جِذوَة)ش و (جُذوَة)ش خوێنراوەتەوە، بە مانای بزووت دێ، یان پشکۆ، یان بڵێسە ئاگرێک بە دارێکەوە بێ، سەرێکی ئاگر بێ و سەرەکەی دیکەی بگیرێ، بە کوردیی پێی دەڵێن: بزووت، ئەویش تەنیا لە ئایەتی بیست و نۆ (٢٩)ی ئەم سوورەتە هاتوە.

٣)- وشەی (عَضُد) لە ئایەتی ژمارە سی و پێنج (٣٥)دا، یانی: قۆڵ، کە مەبەست پێی بەهێزکردنە.

٤)- وشەی (المَقبُوحِينَ)، واتە: ناشیرینکراوان، دزێوان، قەڵبان، کەسانێک کە زۆر ناشیرین بن و ئینسان تاقەتی نەبێ تەماشایان بکات، لە ئایەتی ژمارە (٤٢)دا هاتوە، بۆ فیرعەون و گەلەکەی بەکارهاتوە.

٥)- وشەی: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ﴾، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە پەنجا و یەک (٥١)دا هاتوە، واتە: قسەمان بۆ پەیوەستکردوون، واتە: بەردەوام بۆمان ناردوون، کە مەبەست پێی وەحیی و ڕێنماییەکانی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی.

٦)- وشەی (سَرمَد)، کە لە هەردووک ئایەتی: (٧١، ٧٢)دا، دووجار هاتوەو، بە مانای بەردەوامە بە بێ پچڕان.

٧)- وشەی (وَيكَأَنَّ)، دوو جاران هاتوە لە ئایەتی ژمارە (٨٢)دا، وشەی (وَيكَأَنَّ) زانایان زۆر ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر واتایەکەی، هەندێکیان دەڵێن یانی: ئایا بینیت؟! هەندێکیش گوتوویانە: یانی: سەرت سوڕبمێنێ، کە دوایی پێی دەگەین.

هەڵبەتە دەگونجێ وشە و تەعبیری دیکەش دەربهێنرێن، بەڵام ئێمە بەو حەوتە واز دێنین، کە پێمان وایە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا، ئەم حەوت وشەیە هاتوون.

**٦)- دابەشكردنی ئەم سوورەتە بۆ دە (١٠) دەرس:**

**دەرسی یەكەم:** شەش (٦) ئایەتی سەرەتا دەگرێتە خۆی، كە قۆناغی یەكەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام) و گەلەكەیان بەنوو ئیسرائیلمان بۆ باس دەكەن.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەكانی: (٧ - ١٣)، قۆناغی دووەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ هەڵبەتە پەیوەست لەگەڵ دایكی (خوا لێی ڕازی بێ) خراوەتە ڕوو، كە حەوت ئایەتن.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەكانی: (١٤ - ٢١)، قۆناغی سێیەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسایان ﷺ تێدایە، كە هەشت ئایەتن.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەكانی: (٢٢ - ٢٨) قۆناغی چوارەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسایان ﷺ تێدایە، كە حەوت ئایەتن.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەكانی: (٢٩ - ٣٥) قۆناغی پێنجەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسایان ﷺ تێدایە، كە حەوت ئایەتن.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەكانی: (٣٦ - ٤٢) قۆناغی شەشەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسایان ﷺ تێدایە، لەگەڵ هاڕوونی برای و بەنوو ئیسرائیل، لە بەرانبەریشیاندا فیرعەون و هامان و قاڕوون و داروودەستەكەیان و گەلە ملهوڕەكەیان، كە كوێرانە شوێنیان كەوتوون، ئەوانیش هەر حەوت ئایەتن.

**دەرسی حەوتەم:** ئایەتەكانی: (٤٣ - ٥٥) دەگرێتە خۆی، باسی چەند ڕاستییەكی گەورە و گرنگ و، پووچەڵكردنەوەی چەند قسە و بیانوویەكی كافرەكانە، لە بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ و قورئان و ئیسلامدا، كە سێزدە (١٣) ئایەتن.

**دەرسی هەشتەم:** ئایەتەکانی: (٥٦ - ٧٥)، واتە: بیست (٢٠) ئایەت، کە تێیان دا باسی چەند یاسایەکی گەردوونیی خوا لە ژیانی مرۆڤدا، باسی چەند دیمەنێکی ڕۆژی دوایی و، چەند سیفەتێکی بەرز و بێ وێنەی خوا ﷻ کراوە.

**دەرسی نۆیەم:** ئایەتەکانی: (٧٦ - ٨٢)، واتە: حەوت (٧) ئایەت، باسی بەسەرهاتی قارون کە لە گەلی مووسا ﷵ بووەو لێیان هەڵگەڕاوەتەوە، ئنجا بوغڕابوون و لە خۆبایی بوون و خۆهەڵکێشانی بەسەر گەل و کۆمەڵگاکەی خۆی داو، سەرەنجام فەوتان و بە ناخی زەویدا ڕۆچوونی خۆی و کۆشک و تەلارو ماڵ و سامان و هەموو شتێکی.

**دەرسی دەیەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی: (٧٦ - ٨٨)، کە ئەمیش سێزدە (١٣) ئایەتی کۆتایی، ئەم سوورەتەن و باسی چەند ڕاستییەکی جۆراوجۆر دەربارەی ژیانی مرۆڤ و، سەرەنجامی حوکمڕانان و، چەند ئامۆژگارییەک بۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کراوە.

# کورتەباسێک

## مووساو هارِوون (علیهما السلام) و چەند زانیارییەک

## لە بارەی خۆیان و گەلەکەیان و، فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە

بەڕێـــزان!

هەوڵدەدەیـن لـە سـێ تـەوەری سـەرەکیی دا، چەنـد زانیارییـەک لـە بـارەی مووسـاو هـارِوونی بـرای (صلی اللـه علیهـما وسـلم)و گەلەکەیـان (بەنـوو ئیسـرائیل)و، فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیەوە، بخەینـە ڕوو:

تـەوەری یەکـەم: قۆناغـەکانی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـاو هـارِوونی بـرای و گەلەکەیـان، لـە قوڕئـان دا.

تەوەری دووەم: ژمارەی ناوهێنانی مووساو هارِوونی برای لە قوڕئان دا.

تـەوەری سـێیەم: پوختەیـەک لـە ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا لـە تـەورات (پەیـمانی کۆن)دا.

هەڵبەتـە بەسـەرهات و سەرگوزشـتەی مووسـاو هـارِوون و گەلەکەیـان و فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی، هەویرێکـی نـاو کێشـەو زۆری دەوێ، بـەڵام ئـەم سـێ تـەوەرە تەنیا وەک ڕێخۆشـکردن و پێشدەسـتیەکن و، لـە درێـژەی تەفسـیرکردنی ئایەتەکانـدا، ئەوەی پێویسـت بـێ گوتـراوەو دەگوتـرێ، هەروەهـا حوکـم و حیکمـەت و پەندەکانیـش، کەلێنێکـی بـاشی ئـەو بابەتـە پـڕ دەکەنـەوە، کـە خـوا پشـتیوان بـێ لـە کۆتایـی پێنـج قۆناغەکـەدا دەیانخەینـە ڕوو.

## تەوەری یەکەم: قۆناغەکانی ژیان و بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای (علیهما السلام) و گەلەکەیان، لە قورئان دا

بەڕێـــــزان!

لێرەدا دەمـەوێ ئاماژە بکـەم بـە بابەتێکـی گرنـگ، ئەویـش بریتیە لـە قۆناغەکانی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا و هاڕوونـی بـرای (عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلام) و گەلەکەیـان بەنــوو ئیســڕائیل و، لــە بەرانبەریشــیاندا فیرعــەون و داروودەســتەکەی و گەلــە ســەرکەش و یاخییەکـەی، ئێمـە لـە کاتـی خـۆی لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الأعـراف)دا، ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و هاڕوونــی بــرای و گەلەکــەی و، فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیمان، دابـەش کـرد بـۆ سـێزدە (١٣) قۆنـاغ، کـە هەشـت لـە قۆناغەکانمـان لـە میانـی تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الأعـراف)دا، ئایەتەکانـی: (١٠٣ - ١٧١)، واتـە: شەسـت و نـۆ (٦٩) ئایـەت، هەشـت لـە قۆناغەکانـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـاو هـاڕوون ﷺمـان لـەوێ دا توێژینـەوەو، پێنـج قۆناغـمان، قۆناغـی یەکـەم تاکـو پێنجەمـمان هەڵگرتـن بـۆ ئێـرە، بـۆ کاتـی تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (القَصَـص)، چونکـە وەک لـە ناسـاندنی ئـەم سووڕەتەشـدا گوتمـان: ئـەو پێنـج قۆناغـە، تەنیـا لـە سـووڕەتی (القَصَـص)دا بـەو شـێوەیە هاتـوون، بەڵکـو هەندێـک لـە قۆناغـەکانی ئـەم پێنـج قۆناغـە، تەنیـا لـەم سـووڕەتەدا بـاس کـراون.

ئنجـا ئێسـتا بـا چاوێـک بـە سـێزدە (١٣) قۆناغەکانـی بەسـەرهاتی مووسـا و هـاڕوون (عَلَيْهِمَا السَّلام)و گەلەکەیـان و، فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی و گەلەکەیانـدا بخشـێنین:

قۆناغــی یەکــەم: چەوســێنرانەوەی بەنــوو ئیســڕائیل لــە لایــەن فیرعەونــەوە، پێـش لـە دایـک بوونـی مووسـا ﷺ، کـە بـە پلـەی یەکـەم لـە سـووڕەتی (القَصَـص)

ئایەتەکانی: (١ - ٦)دا هاتووەو، لە ئایەتی (٤٧)ی سوورەتی (طَهَ)دا، هەروەها دوو ئایەتی (١٠و ١١)ی سوورەتی (الشعَرَاء)دا، تەنیا ئاماژە کراوە بەو قۆناغە.

قۆناغی دووەم: لە دایک بوونی مووسا ﷺ و بەخێوکرانی لە ماڵی فیرعەوندا، ئەویش بە پلەی یەکەم، تەنیا لەم سوورەتی (القَصَص)دا، لە ئایەتەکانی: (٧ - ١٣) دا هاتوە، واتە: حەوت (٧) ئایەت، لە سوورەتی (طَه)شدا، لە ئایەتەکانی: (٣٧ - ٤٠)، چوار ئایەت دا، ئاماژەیەکی کورتی پێکراوە.

قۆناغی سێیەم: پێگەیشتنی مووسا ﷺ و گەورەبوونی و، بەرگرییکردنی لە گەلەکەی خۆی و، کوژرانی قیبتییەک بە دەستی مووسا ﷺ، کە ئەوە تەنیا لەم سوورەتی (القَصَص)دا، ئایەتەکانی: (١٤ - ٢١)دا، هاتوە، واتە: لەو هەشت ئایەتەداو، لە سوورەتی (الشعَراء)، ئایەتی (١٤)دا، لەلایەک، پاشان دوو ئایەتی: (١٩و٢٠)دا، ئاماژە بە کوشتنی بابای قیبتیی کراوە، هەروەها لە سوورەتی (طَه) شدا کە خوا بە یەک دێڕ دەفەرموێ: ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ ۝٤٠﴾، واتە: نەفسێکت کوشت، تۆمان لە خەم و پەژارە دەرباز کرد، ئەم قۆناغەی سێیەم تەنیا لەو سێ شوێنەدا، هاتوە کە بێگومان ئەوەی (الشعراء و طَهَ) زیاتر ئاماژە کردنن و، تەنیا لە سوورەتی (القَصَص) ئایەتەکانی: (١٤ - ٢١)دا، ئەو رووداوە گێڕدراوەتەوە.

قۆناغی چوارەم: ڕاکردنی مووسا ﷺ بۆ مەدیەن و شوانیی کردنی بۆ ماوەی (٨ - ١٠) ساڵ، کە ئەوەش بە پلەی یەکەم، تەنیا لە سوورەتی (القَصَص) ئایەتەکانی: (٢٢ - ٢٨)دا هاتووەو، لە سوورەتی (طَه)شدا لە ئایەتی ژمارە چل (٤٠)دا، ئاماژەیەکی کورتی بۆ کراوە.

قۆناغی پێنجەم: گەڕانەوەی مووسا ﷺ بۆ میسرو، بەدەم ڕێگاوە کرانی بە پێغەمبەرو دوێنرانی لە لایەن خوای بەرز و بێ وێنەوەو، نێردرانی بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، بە هەردوو موعجیزە سەرەکییەکەیەوە: کە گۆچانەکەی بوو کە

فرێی دەدا، دەبوو بە حەزیاو ئەژدیهایەکی گەورەو، دەستیشی کە دەیخستەوە بن قوڵی و دەریدەهێنا، دەدرەوشایەوە، ئەم قۆناغەش لەم سوورەتی (القَصَص) ئایەتەکانی: (٢٩ - ٣٥)دا، دیسان حەوت ئایەت و، بە درێژتریش لە سوورەتی (طَه) ئایەتەکانی: (٩ - ٤٨)دا، باسکراوەو، لە چەند سوورەتێکی دیکەش دا ئاماژە بەم قۆناغی پێنجەمە کراوە، کە کرانە پێغەمبەری مووسایە ﷺ، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الشُّعَرَاء) ئایەتەکانی: (١٠ - ١٧)و، لە سوورەتی (النَّمل) ئایەتەکانی: (٧ - ١٢)داو، لە سوورەتی (النَّازِعَات) ئایەتەکانی: (١٥ - ١٩)دا.

ئەم پێنج قۆناغە ئێمە هەڵمان گرتبوون بۆ کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (القَصَص)و، خوا پشتیوان بێ هەڵوەستەی باشیان لە بەردەمدا دەکەین، چونکە قۆناغەکانی دیکە، هەشت قۆناغەکەی: (٦ - ١٣) لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (الأعراف)دا قسەمان لەسەر کردوون.

قۆناغی شەشەم: ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا و هاروون (عَلَيْهِما السَّلام) لەگەڵ فیرعەون و داروودەستەکەیدا، کە وێڕای سوورەتی (القَصَص) ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٢) واتە: حەوت ئایەت، کە ئەویش چوار ئایەتەکانی: (٣٦ - ٣٩) بە پلەی یەکەم هی ئەو قۆناغەن، بەڵام سێ ئایەتەکانی: (٤٠، ٤١، ٤٢)، زیاتر هی قۆناغی نۆیەمن، کە قۆناغی دەربازکرانی مووسا و گەلەکەی و، فەوتێنرانی فیرعەون و سوپایەکەیەتی.

ئنجا ئەم قۆناغی شەشەمە، کە ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا و هاروونە (عَلَيْهِما السَّلام) لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەی دا، وێڕای سوورەتی (القَصَص)، لەم شوێنانەش دا کەم و زۆر باسکراوە، یان ئاماژەی پێدراوە:

١- لە سوورەتی (الإِسرَاء)دا، ئایەتەکانی: (١٠١ - ١٠٣)دا هاتوە.

٢- لە سوورەتی (طَهَ)دا، ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٦) واتە: دە (١٠) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٣- لە سوورەتی (الشُّعَراء)دا، ئایەتەکانی: (١٨ - ٣٧) واتە: بیست (٢٠) ئایەتی بۆ تەرخان کراون.

٤- لە سوورەتی (النّمل)دا، ئایەتەکانی: (١٢ - ١٤) سێ ئایەت.

٥- لە سوورەتی (الذّاريات)دا، ئایەتەکانی: (٣٨ - ٤٠) واتە: سێ ئایەت.

٦- لە سوورەتی (النّازعات)دا، ئایەتەکانی: (١٥ - ٢١) واتە: دوازدە (١٢) ئایەت.

هەڵبەتە لە سوورەت و شوێنی دیکەش دا هەیە، ئاماژەیەکی کورت کرابێ، بەڵام شوێنی تێدا خرانە ڕووی ئەم قۆناغی شەشەمە، لە ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ و هاروونی برای و گەلەکەی، ئەم سوورەتانەن.

قۆناغی حەوتەم: لە ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ و هاروونی برای و بەنوو ئیسرائیل لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەی دا، بریتیە لە: کۆکردنەوەی فیرعەون بۆ جادووگەرەکان لە دژی مووسا ﷺ، ئەمە بە پلەی یەکەم لە سوورەتی (طـهٰ) ئایەتەکانی: (٥٧ - ٧٦)دا، واتە: بیست (٢٠) ئایەتی لەوێ تەرخان کراون و بە وردیی هاتوە، هەروەها لە سوورەتی (الشُّعَرَاء) ئایەتەکانی: (٣٦ - ٥١)دا، دیسان بە وردیی ئەم قۆناغی حەوتەمە هاتوەو، لە چەند شوێنێکی دیکەشدا لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە.

قۆناغی هەشتەم: توندکردنی سزای فیرعەون لەسەر بەنوو ئیسرائیل و، گرفتاربوونی فیرعەون و فیرعەونییەکان بە چەند بەڵایەکەوە، کە بە پلەی یەکەم لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (١٣٠ - ١٣٥)دا هاتوەو، لە سوورەتی (الإسرَاء) یش ئایەتەکانی: (١٠١ و ١٠٢)دا، بەس ئاماژەی پێدراوە.

قۆناغی نۆیەم: دەربازبوونی مووسا و هاروونی برای (عَلَيْهِما السَّلام) و گەلەکەیان و خنکانی فیرعەون و سوپایەکەی لە دەریای سووردا، کە بە پلەی یەکەم لە سوورەتی (الشُّعَراء)، ئایەتەکانی: (٥٢ - ٦٨)دا هاتوەو، لە سوورەتی (الإسرَاء) ئایەتەکانی: (١٠٣ و ١٠٤)داو، لە سوورەتی (طـهٰ) ئایەتەکانی: (٧٧ - ٧٩) داو، لە سوورەتی (القَصَص) ئایەتەکانی: (٤١ و ٤٢)داو، لە سوورەتی (الصافات) ئایەتەکانی: (١١٤ - ١٢٢)داو، لە سوورەتی (الذاريات) ئایەتەکانی: (٣٨ - ٤٠)دا، ئاماژەی پێدراوە.

قۆناغی دەیەم: نیشتەجێ بوونی گەلی مووسا ﷺ لە بیابانی سینادا، ئەویش لە چەند شوێنێک دا باس کراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (٦٠)داو، لە سوورەتی (طـٰهٰ) ئایەتەکانی: (٨٠ - ٨٢)دا، هەروەها سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٥٧)دا.

قۆناغی یازدەیەم: تەورات پێدرانی مووسا ﷺ کە لە چەند لەوحێک دا نووسرابۆوە، کە لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (١٤٣ - ١٤٥)داو، لە سوورەتی (طـٰهٰ) ئایەتەکانی: (٨٣ - ٩٨)دا باس کراوە.

قۆناغی دوازدەیەم: داواکردنی مووسا ﷺ لە گەلەکەی، بەنوو ئیسرائیل کە بچنە شارێکەوە لە شام و، سەرپێچیی کردنیان و، سەرەنجامیش سزا درانیان، بە چل (٤٠) ساڵ مانەوە بە سەراسیمەیی و سەرگەردانیی لە بیابانی سینادا، ئەمیش لە چەند شوێنێک دا باسکراوە: لە سوورەتی (البقرة) ئایەتەکانی: (٥٨ و ٥٩)داو، لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (١٦١و١٦٢)داو، لە سوورەتی (المَائدة) ئایەتەکانی: (٢٠ - ٢٤)دا.

قۆناغی سێزدەیەم و کۆتایی: بریتییە لە نائومێد بوونی مووسا ﷺ لە گەلەکەی و، لە خوا پاڕانەوەی کە لە یەکیان جیابکاتەوە: ﴿ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ۝٢٥ ﴾، واتە: من و ئەو خەڵکە لادەرە، لێک جیا بکەوە، کە ئەم قۆناغ و ڕووداوە تەنیا لە سوورەتی (المَائدة) ئایەتەکانی: (٢٥و٢٦)دا هاتوە، کە کاتی خۆی ئێمە لە تەفسیرکردنی سوورەتی (المائدة)دا، بە درێژیی قسەمان لێکردوە.

**هەروەها دوو بەسەرهاتی دیکەی مووساش ﷺ هەن:**

**یەکەمیان:** قوتابییەتیی مووسا ﷺ بووە بۆ بەندەیەکی صاڵح، کە لە سوورەتی (الکهف) ئایەتەکانی: (٦٠ - ٨٢)دا، واتە: بیست و سێ (٢٣) ئایەت بۆ ئەوە تەرخانکراون، کە مووسا ﷺ دەبێتە قوتابیی و فێرخواز لە لای زانایەک کە خوا ﷻ بە ناوی عەبدێکی صاڵح، پێناسەی دەکات، لە سوورەتی (الکهف)دا قسەمان لە بارەوە کرد، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە.

**بەسەرهاتی دووەمیان:** بریتیە لە هەڕەشە کردنی فیرعەون لە مووسا ﷺ کە بیکوژێ و بەرگریی لێکردنی پیاوێکی بڕوادار لە دارو دەستەی فیرعەون، کە ئیمانەکەی خۆی شاردۆتەوە، ئەویش لە سوورەتی (غافِر) ئایەتەکانی: (٢٣ - ٤٦)دا، واتە: بیست و چوار (٢٤) ئایەتی بۆ تەرخان کراوە، کە خوا پشتیوان بێ، کاتێ کە دەیگەینێ تەفسیری دەکەین.

ئەم دوو بەسەرهاتەش هەر پەیوەستن بە ژیان و بەسەرهاتی مووساوە ﷺ، بەڵام نەمان خستوونە نێو ئەو سێزدە (١٣) قۆناغەوە، چونکە دیار نیە لە چ قۆناغێکدا بوو ون!.

هەڵبەتە ئەوە کە پیاوە بڕوادارەکەی نێو دەزگا و دارو دەستەکەی فیرعەون، بەرگریی لە مووسا کردوە، دیارە کە لە قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەی مووسا و هاڕوونی برای (عَلَيْهِمَا السَّلام) لەگەڵ فیرعەوندا بووە، بەڵام بە هەر حاڵ لەوێ خوا ﷻ لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیاندا، ئەوەی باس نەکردوە ئەو بەرگرییکردنەی ئەو پیاوە بڕوادارە لە مووسا ﷺ، کەی بووە؟ ئنجا زیاتریش دەبێتە بەسەرهاتی ئەو پیاوە بڕوادارە، نەک هی مووسا ﷺ.

وەک پێشتریش گوتمان: ئێمە ئەو پێنج قۆناغەی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای (عليْهِما السَّلام) و گەلەکەیان، لەم سوورەتی (القَصَص) دا، کە ئایەتەکانی: (١ - ٣٥) واتە: سی و پێنج ئایەت دەگرێتەوە، دەتوێژینەوە،

ئنجا ئێمە ئەو پێنج قۆناغە بۆ پێنج دەرس دابەش دەکەین، وەک لە پێناسە و خستنەڕووی نێوەڕۆکی ئەم سوورەتەشدا گوتمان.

هەڵبەتە دوایی ئایەتەکانی: (٣٦ - ٣٩)ش، وەک قۆناغی شەشەم لە بەسەرهاتی مووسا ﷺ باس دەکەن، کە قۆناغی بەرەنگاربوونەوەی مووسا و هاڕوونی برایەتی (عليهما السّلام) لەگەڵ فیرعەوندا، هەروەها دواتر ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٢)، ئەو سێ ئایەتەش، باسی قۆناغی نۆیەم دەکەن، بەڵام تەنیا باسی فەوتاندنی فیرعەون و سوپایەکەی لە دەریادا دەکەن، نەک باسی دەربازکرانی مووسا و هاڕوون و گەلەکەیان بەنوو ئیسرائیل، بەڵام چونکە ئەو قۆناغ و ڕووداوانە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (الأعراف)و، سوورەتی (طـٰـهٰ)و، سوورەتی (الشُّعَرَاء) دا بە درێژیی لە بارەیانەوە دواوین، لێرەدا بە کورتیی لە بارەیانەوە دەدوێین.

## تەوەری دووەم: ژمارەی ناوهێنرانی مووسا و هارِوونی برای (علیهما السلام) لە قورئاندا

### أ- مووســـا:

مووسا ﷺ سەدو سی و شەش (١٣٦) جار، لە سی و چوار (٣٤) سوورِەتدا، ناوی هاتوە و دووبارە بۆتەوە، بە ناوی مووسا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١)- لە سوورِەتی (البقرة)دا، لە ئایەتەکانی: (٥١، ٥٣، ٥٤، ٥٥، ٦٠، ٦١، ٦٧، ٨٧، ٩٢، ١٠٨، ١٣٦، ٢٤٦، ٢٤٨)دا، واتە: سێزدە (١٣) جاران ناوی مووسا ﷺ لەو سوورِەتەدا هاتوە.

٢)- لە سوورِەتی (آل عمران)دا، تەنیا لە ئایەتی هەشتاو چوار (٨٤)دا جارێک، ناوی هاتوە.

٣)- لە سوورِەتی (النساء)دا، سێ جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتی (١٥٣)دا، دوو جارو، لە ئایەتی (١٦٤)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٤)- لە سوورِەتی (المائدة)دا، لە ئایەتەکانی: (٢٠، ٢٢، ٢٤)دا، سێ جاران ناوی هاتوە.

٥)- لە سوورِەتی (الأنعام)دا، لە ئایەتەکانی: (٨٤، ٩١، ١٥٤)دا، سێ جاران ناوی هاتوە.

٦)- لە سوورِەتی (الأعراف)دا، ناوی مووسا زۆر دووبارەبۆتەوە، لە ئایەتەکانی: (١٠٣، ١٠٤، ١١٥، ١١٧، ١٢٢، ١٢٧، ١٢٨، ١٣١، ١٣٤، ١٣٨)دا، لە هەر کامیان دا جارێک، هەروەها لە ئایەتی (١٤٢)دا دوو جارو، لە ئایەتی (١٤٣)دا، دیسان دوو جاران، ئەوە چواردە (١٤) جارو، لە ئایەتی (١٤٤)دا جارێک هاتوە، ئەوە پازدە (١٥) جارو، لە ئایەتەکانی: (١٤٨، ١٥٠، ١٥٤، ١٥٥، ١٥٩، ١٦٠)دا، شەش جاران، ئەوە بیست و یەک (٢١) جار، لە سوورِەتی (الأعراف)دا ناوی هاتوە.

٧)- لە سوورەتی (یونس)دا، چەند جارێک ناوی مووسا ﷺ هاتوە لە ئایەتەکانی: (٧٥، ٧٧، ٨٠، ٨١، ٨٣، ٨٤، ٨٧، ٨٨)، واتە: هەشت (٨) جاران ناوی هاتوە.

٨)- لە سوورەتی (هود)دا، لە ئایەتەکانی: (١٧، ٩٦، ١١٠)دا، سێ جاران ناوی هاتوە.

٩)- لە سوورەتی (إبراهیم)دا، سێ جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٥، ٦، ٨)دا.

١٠)- لە سوورەتی (الإسراء)دا، سێ جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتی (٢) دا، جارێک و لە ئایەتی (١٠١)دا دوو جاران ناوی هاتوە، ئەوە سێ جار.

١١) لە سوورەتی (الکهف)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (٦٠و ٦٦)دا، یەکی جارێک ناوی هاتوە.

١٢)- لە سوورەتی (مریم)دا، یەک جار، لە ئایەتی (٥١)دا، ناوی هاتوە.

١٣) لە سوورەتی (طه)دا، دیسان چەند جارێک ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٩، ١١، ١٧، ١٩، ٣٦، ٤٠، ٤٩، ٥٧، ٦١، ٦٥، ٦٧، ٧٠، ٧٧، ٨٣، ٨٦، ٨٨، ٩١) واتە: حەڤدە (١٧) جاران ناوی هاتوە.

١٤)- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا یەک جار ناوی هاتوە، لە ئایەتی (٤٨)دا.

١٥)- لە سوورەتی (الحج)دا، دیسان لە ئایەتی (٤٤) یەک جار، ناوی هاتوە.

١٦)- لە سوورەتی (المؤمنون)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (٤٥، ٤٩)دا، ناوی هاتوە.

١٧)- لە سوورەتی (الفرقان)دا، یەک جار لە ئایەتی (٣٥)دا، ناوی هاتوە.

١٨)- لە سوورەتی (الشعراء)دا، لە ئایەتەکانی: (١٠، ٤٣، ٤٥، ٤٨، ٥٢، ٦١، ٦٣، ٦٥)دا، هەشت (٨) جاران ناوی هاتوە.

١٩)- لە سوورەتی (النمل)دا، لە ئایەتەکانی: (٧، ٩، ١٠)دا، سێ جاران، ناوی هاتوە.

٢٠)- لە سوورەتی (القصص)دا، لە ئایەتەکانی: (٣، ٧، ١٠، ١٥، ١٨، ١٩، ٢٠، ٢٩، ٣٠، ٣١، ٣٦، ٣٧، ٣٨، ٤٣) چوارده (١٤) جارو، لە ئایەتی: (٤٤)دا جارێک و، لە ئایەتی (٤٨) دوو

جارو، لە ئایەتی (٧٦)یش دا جارێک، تنجا: ١٤+ ٤=١٨، واتە: هەژدە (١٨) جاران ناوی هاتوە.

٢١)- لە سوورەتی (العنكبوت)دا، لە ئایەتی (٣٩)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٢٢)- لە سوورەتی (السجدة)دا، جارێک لە ئایەتی (٢٣)دا، ناوی هاتوە.

٢٣)- لە سوورەتی (الأحزاب)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (٧، ٦٩)دا، ناوی هاتوە.

٢٤)- لە سوورەتی (الصافات)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (١١٤، ١٢٠)دا، ناوی هاتوە.

٢٥)- لە سوورەتی (غافر)دا، پێنج جاران ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٢٣، ٢٦، ٢٧، ٣٧، ٥٣)دا.

٢٦)- لە سوورەتی (فصلت)دا، لە ئایەتی: (٤٥)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٢٧) لە سوورەتی (الشورى)دا، لە ئایەتی: (١٣)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٢٨) لە سوورەتی (الزخرف)دا، لە ئایەتی: (٤٦)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٢٩)- لە سوورەتی (الأحقاف)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (١٢، ٣٠)دا، ناوی هاتوە.

٣٠)- لە سوورەتی (الذاريات)دا، یەک جار، لە ئایەتی: (٣٨)دا، ناوی هاتوە.

٣١)- لە سوورەتی (النجم)دا، لە ئایەتی (٣٦)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٣٢)- لە سوورەتی (الصف)دا، لە ئایەتی (٥)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٣٣)- لە سوورەتی (النازعات)دا، لە ئایەتی (١٥)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٣٤)- لە سوورەتی (الأعلى)دا، لە ئایەتی (١٩)دا، جارێک ناوی هاتوە.

هەمووی دەبێتە (١٣٦) جار، کە زۆرترین ناوی یەکێک لە پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە[1].

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، کە دەکاتە بەرگی شەشەمی ئەم تەفسیرە: (تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز)، لە کاتی تەفسیرکردنی

---

(١) أطلس القرآن: ص٧٣ - ٧٥.

ئایەتـەکانی: (١٠٣ - ١٧١)دا، واتـە: شەسـت و نـۆ (٦٩) ئایـەت، کـە هەمـووی تەرخانکـراوە بـۆ بەسـەرهاتی مووسـا و هـارووونی بـرای (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و گەلەکەیـان و، لـە بەرانبەریشـیان دا فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی، لەوێـدا بە تەفسـیلّ بـاسی زۆربـەی قۆناغـەکانی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـاو هـاروون و گەلەکەیانمـان، لەگـەڵ فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی دا کـردوە، کـە هەشـت قۆناغـن (٦ - ١٣)، بـەڵام قۆناغـەکانی سـەرەتای تەمـەنی مووسـاو هـارووونی بـرای و گەلەکەیـان هەڵمانگرتـوە، بـۆ کاتی تەفسـیرکردنی ئـەم سـوورەتە: (القصـص)، ئایەتـەکانی: (١ - ٤٣)، کـە لەوێـدا وردەکاریـی زۆر باسـکراوە، دەربـارەی پێنـج قۆناغـەکانی سـەرەتای ژیـانی مووسـا ﷺ، واتـە: پێـش ئـەوەی مووسـا لـە دایـک بـێ و، دوای ئـەوەی لـە دایـک بـووەو، چـۆن دایکـی بـە ئیلهامـی خـوا خسـتوویەتە نێـو صندوقێکـەوەو، بـە ڕووبـاری داداوەو، چـۆن ماڵـی فیرعـەون گرتوویانەتـەوە، چـۆن لـە ماڵـی فیرعەونـدا گـەورە بـووە، دوایـی پیـاوە قیبتییەکـەی لـە دەسـت کـوژراوە و، چـووە بـۆ مەدیـەن و... هتـد، ئەوانـە هەموویـان لـە سـەرەتای (سـوورەتی القصـص)دا، هاتـوون.

هەڵبەتـە پێـش سـوورەتی (القصص)یـش، لـە سـوورەتی (طـه)دا، ئایەتـەکانی: (٩ - ٩٨)، واتـە: نـەوەد (٩٠) ئایـەت، لەوێـش تەرخانکـراون، بـۆ ئـەو قۆناغانـەی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و، هەندێـک بەسـەرهاتی دیکـەش، کـە لـە سـوورەتی (الأعـراف) دا، قسـەمان لێکـردوون، ئایەتـەکانی سـوورەتی (طه)شـمان بـەو بۆنـەوە لـەوێ هێنـاون، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا، لەوێشـدا: پەنجـا ونـۆ (٥٩) ئایـەت تەرخانکـراوە، ئایەتـەکانی: (١٠ - ٦٨)، لەوێشـدا جارێکـی دیکـە، هـەر لەمیـانی تەفسـیرکردنی ئـەو ئایەتانـەدا، ئـەو قۆناغانـەی ژیـانی مووسـا ﷺ جارێکـی دیکـە باسـمان کردوونـەوە، هـەروەک لـە سـوورەتی (الأعراف)یشـدا تەفسـیرمان کـردوون، بـەڵام لێکۆڵینـەوەی تێروتەسـەلی بەسـەرهاتی مووسـا و هـارووونی بـرای (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و، گەلەکەیان لەگـەڵ فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیداو، قۆناغـەکانی کاتی نێـردرانی مووسـا و هـارووونی بـرای، بـۆ لای فیرعـەون، تاکـو دەربـاز بـوونی (بنـوو إسرائیـل)و، گەیشـتنیان بـە دەشـتی (سـیناء)، لـە شەسـت و نـۆ ئایەتەکـەی سـوورەتی (الأعـراف: ١٠٣ - ١٧١)دا، خراوەتـە ڕوو.

### ب- هـــارۆون:

شتێکی ئاشکرایە کە تێکهەڵکێش لەگەڵ بەسەرهات و چیرۆکی مووسادا، هی هارۆونی برایشی، باسکراوە، بەڵام کاتێک سەرنجی قورئان دەدەین، دەبینین: تەنیا بیست (٢٠) کەڕەت، ناوی هارۆون لە قورئاندا هاتوە، لە حاڵێکدا کە ناوی مووسا سەدو سی و شەش (١٣٦) جاران هاتوە! هۆکارەکەشی ئەوەیە کە هارۆون عليه السلام وەزیرێک و پاڵپشتێکی مووسا عليه السلام بووە و، لەسەر داوای مووساش خوای پەروەردگار کردوویەتی بە پێغەمبەر، وەک لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾، ئەو بیست (٢٠) جارەش کە لە قورئاندا ناوی هارۆون هاتوە، بەم شێوەیە:

١)- لە سوورەتی (البقرة)دا، لە ئایەتی: (٢٤٨)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٢)- لە سوورەتی (النساء)دا، لە ئایەتی: (١٦٣)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٣)- لە سوورەتی (الأنعام)دا، لە ئایەتی: (٨٤)دا، جارێک ناوی هاتوە.

٤)- لە سوورەتی (الأعراف)دا، دوو جاران، لە ئایەتەکانی: (١٢٢، ١٤٢)دا، ناوی هاتوە.

٥)- لە سوورەتی (یونس)دا، یەک جار لە ئایەتی: (٧٥)دا، ناوی هاتوە.

٦)- لە سوورەتی (مریم)دا، دوو جاران، ناوی هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٢٨، ٥٣)دا.

٧)- لە سوورەتی (طه)دا، چوار جاران لە ئایەتەکانی: (٣٠، ٧٠، ٩٠، ٩٢)دا، ناوی هاتوە.

٨)- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، یەک جار، لە ئایەتی (٤٨) دا، ناوی هاتوە.

٩)- لە سوورەتی (المؤمنون)دا، لە ئایەتی ژمارە (٤٥)دا، جارێک، ناوی هاتوە.

١٠) لە سوورەتی (الفرقان)دا، جارێک لە ئایەتی (٣٥)دا، ناوی هاتوە.

١١) لە سوورەتی (الشعراء)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (١٣، ٤٨)دا، ناوی هاتوە.

١٢)- لە سوورەتی (القصص)دا، یەک جار لە ئایەتی (٣٤)دا، ناوی هاتوە.

**١٣)- لە سوورەتی (صافات)دا، دوو جاران لە ئایەتەکانی: (١١٤، ١٢٠)دا، ناوی هاتوە.**

**هەمووی دەکاتە: بیست (٢٠) جار، ژمارەی دووبارە بوونەوەی ناوی هارووون ﷺ لە قورئاندا یانی: ناوی مووسا ﷺ (١٣٦) جارو لە (٣٤) سوورەتدا، دووبارە بۆتەوە، بەڵام هارووون ﷺ لە (١٣) سوورەتدا و (٢٠) جاران، ناوی هاتوە[1].**

---

(١) أطلس القرآن: ص٨١، ٨٢.

## تەوەری سێیەم: پوختەیەک لە ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەبەر ڕۆشنایی تەورات (پەیمانی کۆن)دا

لەم تەوەرەدا چەند تیشکێک دەخەینە سەر ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ، بە تایبەت قۆناغەکانی سەرەتای ژیانی کە لە قورئاندا زۆر بە کورتیی و پوختیی خوا ﷻ باسی کردوون، بەڵام لە (پەیمانی کۆن)دا، هەندێک وردەکاریی هەیە، بەڵام قۆناغەکانی دواتری ژیانی مووسا ﷺ، ئەوە دیارە کە لە قورئاندا تیشکی باشیان خراوەتە سەر، بە تایبەت ڕووبەڕوو بوونەوەی مووسا لەگەڵ فیرعەون و، جادووگەرەکانی داو، پەڕینەوەیان لە دەریای سوورو، دەرباز بوونی بەنی ئیسرائیل و، خنکانی فیرعەون و دارو دەستەکەی، دوایی نیشتەجێ بوونی مووسا ﷺ و گەلەکەی لە دەشتی سینادا و، ڕووداوەکانی دیکە، لە قورئاندا، تیشکی باشیان خراوەتە سەر.

بەڵام ئەو پێنج قۆناغەی تەمەنی مووسا ﷺ، کە باسمان کردن، بە تایبەت لێرەدا لە سوورەتی (القصص)دا، هاتوون و هیچیان لە شوێنی دیکەدا نەهاتوون، مەگەر ئاماژەیەکی کورتیان پێکرابێ، بۆیە بە چاکمان زانی لێرە لەبەر تیشکی تەورات (پەیمانی کۆن)دا، هەندێک شت لە بارەی قۆناغەکانی سەرەتای ژیانی مووساوە ﷺ بخەینە ڕوو.

هەڵبەتە ئێمە جاری دیکەش گوتوومانە: جگە لە وەحیی پارێزراوی خوا (وَحيُ اللهِ المَعصُوم) کە لە دوو توێی قورئان و سووننەتدا، بەرجەستەیە، هیچ سەرچاوەیەکی دیکەی متمانە پێکراومان نیە، بۆ زانینی ئەو شتانەی لە ڕێی وەحییەوە، نەبێ نازانرێن، پاشانیش هەرچی پێویست بووبێ بزانرێ لە بارەی پێغەمبەرانەوە، خوا ﷻ باسی کردوە، لە کاتێکدا کە بەسەرهاتەکانیانی بۆمان

گێڕاونەوە، ئەگەرنا بە تەئکید لە ژیان و بەسەرهاتی مووساشدا ﷺ چەند لایەنێکی شاردراوە هەن، بۆ وێنە:

ناوی بابی و دایکی و خوشکەکەی، فیرعەونە هاوچەرخەکەی ناوی چی بووە؟ پیاوە بە تەمەنەکەی مەدیەن کێ بووە؟ کە هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان بە هەڵە گوتوویانە: شوعەیبە، کە بە دڵنیایی وانیە، هەرچەند زۆربەی تەفسیرەکان وا دەڵێن، بەڵام دوایی ڕوونی دەکەمەوە، بە بەڵگە کە هەر ناگونجێ شوعەیب بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا کە کتێبەکانی خاوەن کتێبان، (پەیمانی کۆن، پەیمانی نوێ، ئاڤێستای مەجووس، کتێبەکانی صابینە)و ئەوانی دیکە، بە حەقیقەت جێی پشت پێ بەستن و جێی متمانە نین، بۆ ئەو شتانەی کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، بەڵام بە چاکم زانی بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر، لە بارەی تێڕوانینی خاوەن کتێبان، بە تایبەت جوولەکە و نەصرانییەکان، لە بارەی مووسا و ژیاننامەکەیەوە، سەرنجێکی خێرایی (تەورات) بدەین، لە حەوت (٧) بڕگەدا:

## ١- ڕەچەڵەکی دووری مووسا و، هۆی لە دایك بوونی مووسا ﷺ لە میسر:

هەموو ئەوەی کە دەیهێنم لە: (التفسير التطبيقي لِلكِتَابِ المُقَدَّس)ەوەیە، ئەویش، دوو بەشە:

أ- پەیمانی کۆن (العَهدُ القَدِيم): کە لە سی و نۆ (٣٩) کتێب پێک دێ، پێنجیان ئەو پێنج (٥) سیفرەن، سیفرەکانی: (التكوين، الخروج، اللّاويين، العدد، التثنية) کە ئەصڵی تەوراتیان لێ پێکهاتوە، ئەوانی دیکەش کتێبەکانی دیکەن.

ب- پەیمانی نوێ (العَهدُ الجَدِيد): لە چوار (٤) ئینجیلەکان و، دە (١٠) کتێبی دیکەدا، واتە: ئەویش سەرجەم لە چواردە (١٤) کتێبان پێک دێ.

ئنجا هەرچی نەصرانییەکانن، هەم (پەیمانی کۆن)یان تەبەننیی کردوە، بە هەر سی و نۆ (٣٩) کتێبەکەیەوەو[1]، هەم (پەیمانی نوێ)ش، بە هەر چواردە (١٤) کتێبەکەیەوەو، چوار (٤) ئینجیلەکە و دە (١٠) کتێبەکەی دیکەش، بەڵام جوولەکەکان تەنیا دان بە (پەیمانی کۆن)دا دەنێن، عیسا ﷺ هەر بە پێغەمبەر نازانن، چ جای بڕوا بە کتێبەکەی بێنن!

**بڕگەی یەکەم: سەرەتای نیشتەجێ بوونی باب و باپیرانی مووسا لە میسردا:**

لە کتێبی ناوبراودا[2]، دەربارەی سەرەتای نیشتەجێ بوونی باب و باپیرانی مووسا ﷺ لە میسر، دەڵێ: (**يَعقُوب يَرتَحِلُ إلى مِصر**): یەعقووب ﷺ دەگوازێتەوە بۆ میسر.

هەڵبەتە لەبەر ئەمانەتی زانستیی، هی هەموو بڕگەکان، سەرەتا دەقە عەرەبییەکەیان دێنم:

**{وَارْتَحَلَ إِسْرَائِيلُ وَكُلُّ مَالَهُ حَتَّى وَصَلَ إِلَى بِئْرِ سَبْعٍ، فَقَدَّمَ ذَبَائِحَ إِلَى إِلَهِ أَبِيهِ إِسْحَاقَ. وَقَالَ اللهُ لإِسْرَائِيلَ فِي رُؤَى اللَّيْلِ: «يَعْقُوبُ، يَعْقُوبُ». فَأَجَابَ: «هَا أَنَا» فَقَالَ: «أَنَا هُوَ اللهُ، إِلَهُ أَبِيكَ. لاَ تَخَفْ مِنَ الذَّهَابِ إِلَى مِصْرَ لأَنِّي أَجْعَلُكَ أُمَّةً عَظِيمَةً هُنَاكَ، أَنَا أُصَحِّبُكَ إِلَى مِصْرَ، وَأَنَا أُرْجِعُكَ أَيْضاً، وَيُغْمِضُ يوسوف أَجْفَانَكَ بِيَدَيْهِ عِنْدَ مَوْتِكَ}.**

واتە: ئیسرائیل (کە نازناوی یەعقووبە ﷺ) کۆچی کرد، خۆی و هەرچی هەبوو، تاکو گەیشتە (بِئرِ سَبعٍ)، (کە شارێکە ئێستاش لە فەلەستینە)، لەوێ چەند سەربڕاوێکی بۆ پەرستراوی بابی ئیسحاق ﷺ پێشکەش کردن، (واتە: چەند قوربانییەکی سەر بڕین)و، خوا لە خەونی شەوێدا بە ئیسرائیلی فەرموو: یەعقووب یەعقووب! ئەویش وەڵامی دایەوە: ئەوە منم، خوا فەرمووی: من

---

(١) بەڵکو لە (الكتاب المقدس: قراءة رعائية)دا، پەیمانی کۆن، دە (١٠) کتێبی دیکەشی لێ زیادکراون و، سەرجەم چل و نۆ (٤٩) کتێبە.

(٢) العَهدُ القَدِيم، سفر التكوين، الإصحاح: ٤٦، صفحة: ١١٦.

خـوام ﷻ، پەرسـتراوی بابـت، مەترسـێ لـە چـوون بـۆ میسـڕ، چونکـە مـن لـەوێ دەتکەمـە کۆمەڵێکـی گـەورە و، مـن لەگەڵتـم هاوەڵتـم تاکـو میـسرو، دوایـی مـن دەتگێڕمــەوەش و، یوسـوف ﷺ بـە دەسـتی خـۆی لـە کاتـی مردنتـدا، پێڵـوە چاوەکانـت لێـک دەنـێ.

کەواتـە: زانیـمان کـە یەعقـووب کـوڕی ئیسـحاقە، ئیسـحاق کـوڕی ئیبراهیمـە ﷺ و، یەعقـووب بابـی یوسـوف و یـازدە (١١) برایەکانـی دیکەیـەتی، دیـارە مووسـاش ﷺ دەچێتـەوە سـەر یەعقـووب و ئیسـحاق و ئیبراهیـم (عَلَيْهِـم الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، کەواتـە: زانیـمان چـۆن کاتـی خـۆی بـاب و باپیرانـی مووسـا ﷺ لـە کەنعانـەوە هاتـوون بـۆ میـسرو، لـەوێ نیشـتەجێ بـوون، کاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (یوسـف)دا، بـە درێژیـی باسـی ئەوەمان کـردوە، لـە (پەیمانی کۆن)ەوەو، لـە سـەرچاوە مێژووییەکانەوە، ئـەوەی پێویسـت بـوو بـێ و، بـە پێویسـتمان زانیبـێ، لـەو بـارەوە زانیارییـمان هێنـاوە.

**بڕگەی دووەم: نیشتەجێ بوونی بەنوو ئیسرائیل لە میسڕ لە سەر زەمینی جاسان دا:**

**أ)- {وَأَقَامَ بَنُو إِسْرَائِيلَ فِي مِصْرَ فِي أَرْضِ جَاسَانَ، وَاقْتَنَوْا فِيهَا أَمْلاكاً وَأَثْمَرُوا وَتَكَاثَرُوا، وَعَاشَ يَعْقُوبُ فِي أَرْضِ مِصْرَ سَبْعَ عَشْرَةَ سَنَةً حَتَّى بَلَغَ مِنَ الْعُمْرِ مِئَةً وَسَبْعَةً وَأَرْبَعِينَ عَاماً}**[١].

دەڵـێ: بەنـوو ئیسـرائیل (واتـە: وەچـەو ڕۆڵەکانـی یەعقـووب ﷺ) لـە میسـڕ نیشـتەجێ بـوون لەسـەر زەمینـی جاسـان (شـوێنێکە لە میسـڕ) و، لـەوێ موڵـک و ماڵیان پەیداکـردو، بەروبوومـی ئەوێـیان پەیداکـردو، زۆر بـوون و، یەعقـووب لەسـەر زەمینـی میسـڕ حەڤـدە سـاڵان ژیـا، هەتـا گەیشـتە تەمەنـی (١٤٧) سـاڵیی، (دیـارە تەمەنەکـەی دیکـەی پێشـتر لـە کەنعـان بەڕێکـردوە)و، لـە تەمەنـی (١٤٧) سـاڵیی دا وەفاتـی کـردوە.

**ب)-** دوای ئەوەی باسی کۆچی دوایی یەعقووبی کرد، دەڵێ: **{ثُمَّ مَاتَ يُوسُف وَقَد بَلَغَ مِنَ الْعُمْرِ: ١١٠ سِنِين، فَحَنَّطُوهُ وَوَضَعُوهُ فِي تَابُوتٍ فِي مِصْر}**[٢].

---

(١) العهد القديم، سفر التكوين: الإصحاح: ٤٧، ص: ١١٩.

(٢) العهد القديم، سفر التكوين: الإصحاح: ٥٠، ص: ١٢٥

دەڵێ: یوسوفیش مرد، لە کاتێکدا گەیشتبووە تەمەنی: (١١٠) ساڵیی، مۆمیایان کردو، لە تابووتێک (صندووقێک)دا، لە میسر دایاننا.

ج)- ئنجا باسی ناوی کوڕەکانی یەعقووب دەکات، هەر یازدە کوڕەکەی، دەڵێ: **{وَهَذِهِ أسماءُ أَبنَاءِ إسرَائيل الّذِين قَدِمُوا مَعَ يَعقُوب إلى مِصْر، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُم مَعَ أَهْلِ بَيتِهِ: رَأُوبَيْن، شِمْعُون، لاوِي، يَهُوذَا، يَسَّاكِر، زَبُولُون، بَنيامِين، دان، نَفتَالِي، جَاد، وَأَشِير}**[1]، ئەمە یازدە، بە یوسوفیشەوە دەکاتە دوازدە، چونکە یوسوف کە خەونەکەی دەبینێ، دەڵێ:

﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ ﴿٤﴾﴾ **یوسوف**، واتە: یازدە ئەستێرە و مانگ و خۆرم بینین، کە کڕنووشیان بۆ من دەبرد، واتە: ڕێزیان لێ دەگرتم و سڵاویان لێم دەکرد، کە مانگ و ڕۆژەکە دایک و بابی بوون و، یازدە ئەستێرەکەش، یازدە برایەکەی بوون و، خۆیشی دوازدەیەمینە.

ئەمە لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە، ناوی ئەو یازدە برایەی یوسوف ﷺ و، ئەوانە هەموویان کوڕانی یەعقووب ﷺ بوون، کە لە کەنعانەوە هاتوون و ماڵ و منداڵیشیان لەگەڵدا بووە.

**بڕگەی سێیەم: بە کۆیلە کردنی بەنوو ئیسرائیل و چەوساندنەوەیان لە لایەن حوکمڕانی میسرەوە:**

أ)- لە (پەیمانی کۆن)دا، لەژێر ناوونیشانی: **(إستِعبَادُ بَنِي إسرَائيل)**دا، دەڵێ:

**{وَمَا لَبِثَ أَنْ قَامَ مَلِكٌ جَدِيدٌ عَلَى مِصْرَ لَمْ يَكُن يَعْرِفُ يوسُفَ، فَقَالَ لِشَعبِهِ: هَا بَنُو إسرَائِيلُ أَكثَرُ مِنَّا وَأَعْظَمُ قُوَّةً، فَلنَتَآمَرَ عَلَيهِم لِكَيلا يَتَكَاثَرُوا وَيَنضَمُّوا إلَى أَعْدائِنَا...، وَأَتعَسُوا حَيَاتَهُم بِالأَعْمَالِ الشَّاقَّة فِي الطِّينِ وَاللِّبنِ كَادِحِينَ فِي الحقُولِ وَسَخَّرَهُمُ المِصرِيُّونَ فِي كُلِّ أَعْمَالِهِمُ الشَّاقَّة}.**

---

(١) العهد القديم، سفر الخروج: الإصحاح: ١، ص: ١٣٠.

واتـە: زۆری پـێ نەچـوو، پادشـاو حوکمڕانێکـی دیکـەی تـازە لـە میسـڕ بـوو بـە حوکمـڕان، کـە یوسـوفی نـە دەناسـی، (ئـەوە دوای وەفاتـی یوسـوف ﷺ)، بـە گەلەکـەی خـۆی گـوت: بەنـوو ئیسـڕائیل لـە ئێمـە زیاتـرن و، لـە ئێمـە بەهێزتـرن، وەرن بـا پیلانیـان لـە دژ بگێڕیـن، نـەوەک زۆر بـبن و دوایـی بچنـە پـاڵ دوژمنەکانمـان، (چەنـد قسـەیەک دەکات، دوایـی دەڵـێ:) ئیـدی دەسـتیان کـرد بـە ناڕەحەتکردنـی ژیـان و گوزەرانیـان، بـە کـردەوە قورسـەکان لـە قـوڕو لـە خشـتدا، (واتـە: خشـتی قوڕیـان پـێ دروسـت دەکـردن) و، لـە کێڵگەکانـدا ڕەنـج و زەحمەتیـان دەکێشـا و، میسـڕییەکان لـە هەمـوو کارە قورسـەکاندا ئەوانیـان بـە سـۆغرە و بێـگار دەگـرت.

ب)- هەر لەو سیاقەدا لە پەیمانی کۆن دا، لە ژێر ناوونیشانی: (**مَقْتَلُ الأَطفَالِ الذُّكُور**)، کوشتنی منداڵە نێرینەکاندا، دەڵێ:

[**ثُـمَّ قَـالَ مَلِـكُ مِـصْرَ لِلقَابِلَتَـيْنِ العِبرَانِيَّتَـينِ: عِنْدَمَـا تُشْرِفَـانِ عَـلَى تَوْلِيـدِ النِّسَـاءِ العِبْرَانِيَّـاتِ: فَـإِنْ كَانَ الْمَوْلُـودُ صَبِيّـاً فَاقْتُـلاهُ، وَإِن كَانَ بِنتـاً، فَاترُكَاهَـا تَحيـا، ثُـمَّ أَصـدَرَ فِرعَـونُ أَمـرَهُ لِجَمِيـعِ شَـعبِهِ قَائِـلاً: إِطْرَحُـوا كُلَّ إِبـنَ عِـبرَانِيٍّ يُولَـدُ فِي النَّهـرِ أَمَّـا البَنَـاتُ فَاسـتَحيُوهُنَّ**][1].

واتـە: دوایـی پادشـای میسـڕ، (حوکمڕانـی میسـڕ) بـە دوو مامانـە عیبڕانییەکانـی، گـوت: (دوو ئافرەتـی مامـان بـوون، ئەوانـەی کاتێـک ئافـرەت منداڵـی دەبـێ، سەرپەرشـتیی دەکـەن، عیبڕانیـی بـوون، هـەر لـە گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل بـوون، بەڵام سـەر بـە فیرعـەون بـوون)، لـە کاتێکـدا سەرپەرشـتیی ئـەوە دەکـەن، کـە ئافرەتـە عیبڕانییـەکان منداڵیـان ببـێ و یارمەتییـان دەدەن بـۆ ئـەوەی منداڵەکەیـان ببـێ، (پێیگوتـن:) ئەگـەر منداڵەکـە کـوڕ بـوو، بیکـوژن، بـەڵام ئەگـەر کـچ بـوو، بیهێڵنـەوە، بـا بـژی.

---

(١) ئـەوە هەمـووی و بڕگەکـەی پێشـەوەش، لـە: (العهـد القديـم، سـفر الخـروج، الإصحـاح: ١، ص: ١٣١)دا هاتـوە.

(مـن هەمووـیـم نەهێنـا، ئەگەرنـا دوایـی دەڵـێ: ئـەو دوو مامانـە، کـە لـە (پەیمانی کـۆن)دا، مامانــەکان ناوەکانیشــیان دێنــێ، بەزەییــان پێیانــدا هــات و، فەرمانەکــەی فیرعەونیــان جێبەجــێ نەکــردو، لێیــان گــەڕان، بــەڵام دەیانگــوت: کــوڕەکان پەنهــان بکــەن، دوایـی کـە فیرعـەون پێیانـی زانـی:) فیرعـەون فەرمانـی دەرکـرد بـۆ هەمـوو گەلەکــەی پێیگوتــن: هەرچــی کــوڕی عیبرانییــە لــە دایــک دەبــێ، (ئەوانــەش کــە دوایـی ئـەوەی پێیزانـی)، هەموویـان فڕێبدەنـە ڕووبـارەوە (ڕووبـاری نیلـەوە)، بـەڵام کچـەکان بهێڵنـەوە بـا بژیـن.

**بڕگەی چوارەم: لە دایک بوونی مووسا ﷺ:**

بابزانیــن (پەیمانــی کــۆن) چــۆن باســی لــە دایــک بوونــی مووســا ﷺ دەکات؟ هەڵبەتــە مــن تێبینییەکانــم لەســەر قســەکانی پەیــمانی کــۆن، لێــرەدا نایانخەمــە ڕوو، ئەگەرنـا بـۆ وێنـە: باسـی مۆمیاکردنـی یوسـوف دەکات، بەڵکـو باسـی مۆمیاکردنـی یەعقووبیـش دەکات! کـە پێـم وانیـە ئـەوە هیـچ ئەصڵـی هەبـێ، بـەڵام بـە هـەر حاڵ مـن تێبینییـەکان ناخەمـە ڕوو و، تەنیـا دەقەکـەی (پەیمانـی کۆن)دێنـم و، پێشـتریش تێبینیــی خــۆم گــوت، کــە جێــی متمانــە نیــە، بــەڵام بەگشــتیی بــۆ بەرچــاو ڕوونیــی، ســوودی لــێ دەبیــترێ.

(پەیمانی کۆن) لە ژێر ناوونیشانی: (**وِلادَةُ مُوسَى**)دا هێناویەتی، دەڵێ:

**أ)- [وَتَزَوَّجَ رَجُلٌ مِن بَيتِ لاوي فَتَاةً ابنَـةَ لاوي، فَحَمَلَتِ المَرأَةُ وَأَنجَبَت ابناً وَإذرَاقَهَا جَمَالُهُ، خَبَأتهُ ثَلاثَةَ أَشهُرٍ، وَلَمَّا لَم تَستَطِع أَن تُخفِيَهُ بَعدُ، أَتَت بِسَفَطٍ مِنَ البُردِيِّ وَطَلَتهُ بِالحُمَرِ وَالزِّفتِ، وَأَضجَعَتِ الطِّفلَ وَوَضَعَتهُ بَينَ الحَلفَاءِ عَلى ضِفَةِ النَّهرِ، وَوَقَفَتْ أُختُهُ مِن بَعِيدٍ لِتَرَى مَا يَحدُثُ لَهُ].**

هەڵبەتــە کــەم و زۆر ئــەوەی لــە (پەیمانــی کۆن)یشــدا هاتــوە، لەگــەڵ ئــەوەی قورئانــدا، تێــک دەکاتــەوە، بــەڵام بــە تەئکیــد هەندێــک شــتی تێدایــە، کــە لــەوەی

قورئـان جیایـە، دیـارە کـە ئـەوان گۆڕیویانـە و دەسـتکارییان کـردوە، بـەڵام لـە هێڵـە گشـتییەکانیدا تێـک دەکاتـەوە، لـە کاتێکـدا کـە (پەیمانـی کـۆن) بـە تەئکیـد هیـچ لـە قورئـان بەهرەمەنـد نەبـوون، ئـەوەی قورئانیـش دەیفەرمـوێ جیایـە و، بە شـێوەیەکی دیکەیـە، واتـە: دوو سـەرچاوەی سـەربەخۆن.

واتـە: پیاوێـک لـە بنەماڵـەی لاویـی کچێکـی هێنـا، کچـی لاویـی، (دیـارە هـەر لـە بنەماڵـەی لاویـی، بابـی ئـەو کچـە نـاوی لاویـی بـووە)و، ئـەو ئافرەتـە دوو گیـان بـوو و، منداڵێکـی بـوو، لەبـەر ئـەوەی کـە جوانییەکـەی سەرسـامی کـرد، (ئـەو ئافرەتـەی دەبێتـە دایکـی مووسـا ﷺ کچـی لاوییـە، لێـرە باسـی نـاوی بابی مووسـا ﷺ نـاکات، کـێ بـووە؟ بـەڵام لـە شـوێنی دیکـەدا دەڵـێ: نـاوی قاهیـف بـووە)، بۆیـە سـێ مانگان شـاردیەوە (دایکـی مووسـا دەبـێ، سـێ مانـگ مووسـای بـە مەلۆتکەیـی شـاردبێتەوە)، بـەڵام دوای ئـەوەی نەیتوانـی چیدیکـە بیشـارێتەوە، صندووقێکـی هێنـا لـە جـۆرە قامێشـێک، بـە قیـرو بـە ماددەیەکـی دیکـە، کـە نەهێڵـێ ئـاوی تێبچـێ، چـەوری کـردو، منداڵەکـەی تێـدا درێژکـردو خسـتیە نێـو لقـەکانی درەختێـک، بـە نـاوی حەلفا[1] لەسـەر کەنـاری ڕووبـار، (ڕووبـاری نیـل)، خوشکەکەیشـی لـە دوورەوە وەسـتا، تاکـو تەماشـا بـکات، داخـۆ چـی لێـدێ و، چـی لـێ ڕوودەدات؟ (ئـەو سـندووقەی مووسـای مەلۆتکـەی بـرای تێدایـە).

ب)- ئنجا هەر لەو سیاقەدا لە ژێر ناوونیشانی: (إِنْقَاذُ مُوسَى) دەربازکردنی مووسادا ﷺ، دەڵێ: {وَأَقبَلَتِ ابنَةُ فِرعَونِ لِتَستَحِمَّ فِي النَّهرِ... فَرَأَتِ السَّفْطَ بَيْنَ الحَلفَاءِ فَأَرسَلَت وَصِيفَتَهَا لِتَأتِيَ بِهِ، فَفَتَحَتهُ وَرَأَتِ الطِّفْلَ وَإِذَا هُوَ يَبْكِي، فَرَقَّت لَهُ وَقَالَت: هَذَا مِنْ أَولادِ العِبْرَانِيِّنَ، فَقَالَت أُختُه لابنَةِ فِرعَونَ: هَل أَذهَبُ وَأَدعُوا لَكِ مُرضِعَةً مِنَ العِبرَانِيَّاتِ لِتُرْضَعَ لَكِ الوَلَدَ؟ فَأَجَابَتها ابنَةُ فِرعَونَ: اذهَبِي، فَمَضَتِ الفَتَاةُ وَدَعَت أُمَّ الصَّبِيِّ، فَقَالَت لَها ابنَةُ فِرعَونَ: خذِي هَذَا الصَّبِيَّ

---

(١) الحَلْفَـاء: نَبْـتٌ أَطرافُـهُ مُحَـدَّدَة كأنَّهـا سَـعْف النَّخْـل والخـوص. المنجـد ص١٤٩ ط٤٣، ٢٠٠٨م (قاموسـە ڕسـتە)ش گوتوویەتـی: حەلفـاء بەکوردیـی (قەفـەزاز)ی پێدەگوتـرێ و گەڵاکانـی وەك هـی دارخورمـا تیـژن ب١ لاپـەڕە: ٥٠٤.

وَارضِعِيهِ لِي وَأَنَا أُعطِيكِ أُجْرَتَكِ، فَأَخَذَتِ المَرْأَةُ الصَّبِيَّ وَأَرضَعَتهُ، وَلَمَّا كَبُرَ الوَلَدُ، رَدَّتهُ إِلى ابنَةِ فِرعَون، فَتَبَنَّتهُ وَدَعَتهُ مُوسَى مَعنَاهُ: (مُنتَشَل) قَائِلَةً: إِنِّي انتَشَلتُهُ مِنَ المَاءِ[1].

واتـە: (دوای ئـەوەی دایکـی مووسـا ﷺ، مووسـای خسـتە صندووقێکـەوە کـە لـە قامیـش (بَردي) دروسـت کرا بـوو، پاشـان چـەوری کـرد بـە قیـرو بـە ماددەیـەک کـە نـاوی نەچێتـە نێـو و، هەندێـک و هەندێـک درەختـی قەفـەزاز (حَلفَاء)یشـی تێـوە پێچـا)، کچێکـی فیرعـەون چـوو کـە لـە ڕووبارەکـە خـۆی بشـوات، دوایـی ئـەو صندووقـەی بینـی لـە نێـو ئـەو گیایـە (حَلفَـاء)دا، کارەکەرەکـەی خـۆی، نـارد تاکـو بـۆی بێنـێ، کـە کردیـەوە، منداڵەکـەی بینـی دەگریـا (دیـارە برسـیی بـووە)، زۆر بەزەیـی پێـدا هاتـەوە، گوتـی: ئـەوە دیـارە لـە منداڵەکانـی عیبرانییەکانـە، (زانیویـەتی لـە ترسـی بابـی خراوەتـە نێـو صنـدووق و بـە ڕووبـاردا دراوە)، ئنجا خوشـکی مووسـا ﷺ بـە کچـی فیرعەونـی، گـوت: ئایا بچـم شـیردەرێکت بـۆ بانـگ بکـەم، لـە ئافرەتە عیبرانییـەکان، تاکـو ئـەو منداڵـەت بـۆ شـیر پـێ بـدات؟ کچـی فیرعـەون، گوتـی: بچۆ، کچەکـە ڕۆیـی، (واتـە: خوشـکی مووسـا ﷺ ڕۆیـی و)، دایکـی منداڵەکـەی، (کـە هـەر دایکـی مووسـایە و دایکـی خۆشـیەتی) بانـگ کـردو، کچـی فیرعـەون پێیگـوت: ئـەم منداڵـە ببـە شـیریم بـۆ پـێ بـدە و، منیـش کرێکەیـت دەدەمـێ، ئافرەتەکـە منداڵەکـەی گـرت و شـیری پێـدا و، کاتێـک منداڵەکـە گـەورە بـوو، گێڕایـەوە بـۆ لای کچـی فیرعـەون و، کـردی بـە کـوڕی خـۆی، ناویشـی لێنـا: مووسـا ﷺ، واتـە: لـە نـاو دەرهێـنراو، (مُنتَشَـل)، گوتـی: مـن بـۆ خـۆم لـە نـاو دەرمهێناوەتـەوە.

هەڵبەتـە ئـەوەی لـە (پەیمانـی کـۆن) لێـرەدا کـە تێکدەگیـرێ لەگـەڵ قورئانـدا، ئەوەیـە کـە دەڵـێ: کچـی فیرعـەون هەڵیگرتۆتـەوە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار لـە قورئانـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ... ﴾، واتـە: ئافرەتەکـەی فیرعـەون گـوتی: مایـەی شـادمانیی مـن و تۆشـە، مەیکـوژن...، ئنجـا لێـرەدا باسـی ئـەوە نـاکات کـە بـە تەمـا بـوون، بیکـوژن، بـەڵام بـە تەئکیـد هاوسـەری

---

(١) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٢، ص: ١٣٢.

فیرعەون بووە، نەک کچەکەی، بە هەرحاڵ لە تەوڕاتدا وا هاتوە، کە بێگومان ئەوە یەکێکە لەو شتانەی گۆڕیویانە.

**بڕگەی پێنجەم: کوشتنی بابای قیبتیی و ڕاکردنی مووسا ﷺ بۆ مەدیەن:**

(پەیمانی کۆن) ئاوای دێنێ: (جَرِيمَةُ مُوسَى وَ هَرَبُهُ)، واتە: تاوانی مووسا ﷺ و هەڵاتنی، تەعبیرەکەیان زۆر تەعبیرێکی بێ نەزاکەتە، خوا ﷻ چۆنی دێنێ، فەرمایشتی خوا ﷻ، هەر دیارە و، قسەی دەستکاریی کراوو گۆڕدراویش، هەر دیارە، ئەگەرنا مووسا ﷺ خراپەو تاوانی نەکردوە، وەختێک بەرگریی کردوە لە بەنوو ئیسرائیلییەکی مەزڵووم، بە دەست فیرعەونییەکی زۆردارەوەو، ویستوویەتی ئێوبژیوانییان بکات، مستێکی لە کابرای فیرعەونیی داوەو، بە مستەکە فەوتاوە، مەبەستیشی نەبووە بیکوژێ، ئنجا لە ژێر ئەو ناوونیشانەدا، دەڵێ:

**{وَحَدَثَ بَعْدَ أَنْ كَبُرَ مُوسَى أَنَّهُ ذَهَبَ لِيَفْتَقِدَ إِخْوَتَهُ الْعِبْرَانِيِّينَ وَيَشْهَدَ مَشَقَّتَهُمْ، فَلَمَحَ رَجُلاً مِصْرِيّاً يَضْرِبُ رَجُلاً عِبْرَانِيّاً، فَتَلَفَّتَ حَوْلَهُ، وَإِذْ لَمْ يَجِدْ أَحَداً هُنَاكَ، قَتَلَ الْمِصْرِيَّ وَطَمَرَهُ فِي الرَّمْلِ، ثُمَّ خَرَجَ فِي الْيَوْمِ الثَّانِي وَإِذَا رَجُلانِ عِبْرَانِيَّانِ يَتَضَارَبَانِ، فَقَالَ لِلْمُسِيءِ: «لِمَاذَا تَضْرِبُ صَاحِبَكَ؟»، فَأَجَابَهُ: «مَنْ أَقَامَكَ رَئِيساً وَقَاضِياً عَلَيْنَا؟ أَعَازِمٌ أَنْتَ عَلَى قَتْلِي كَمَا قَتَلْتَ الْمِصْرِيَّ؟» فَخَافَ مُوسَى وَقَالَ: «حَقّاً إِنَّ الْخَبَرَ قَدْ ذَاعَ»، وَبَلَغَ الْخَبَرُ مَسْمَعَ فِرْعَوْنَ، فَسَعَى إِلَى قَتْلِ مُوسَى، إِلَّا أَنَّ مُوسَى هَرَبَ مِنْ وَجْهِ فِرْعَوْنَ، وَمَضَى لِيُقِيمَ فِي أَرْضِ مِدْيَانَ، فَبَلَغَهَا وَجَلَسَ عِنْدَ الْبِئْرِ}**[1].

واتە: دوای ئەوەی مووسا گەورە بوو، ڕۆژێک ڕۆیی بۆ ئەوەی برا عیبرانییەکانی بەسەر بکاتەوەو ئەو ناڕەحەتییەی تێیدا دەژین و ئەو سۆغرە و بێگارە ببینێ، پیاوێکی میسریی بینی، لە پیاوێکی عیبرانیی دەدات، (سۆغرە و بێگاریان پێکردوە و لێیداوەو بە دەمە قاڵێ هاتوون، بەڵام لە قورئاندا نافەرموێ: لەسەر ئیش و کار بووە)، مووسا ئاوڕی دایەوە لە دەوروبەری خۆی، کە کەسی نەبینی، لەوێ

---

(١) سفر الخروج: ٢، ص:١٢٣.

میسـرییەکەی کوشـت و، لـە بـن لمـدا شـاردیەوە، دوایـی لـە ڕۆژی دووەمـدا، (واتـە: ڕۆژی دواتـر چـۆوە دەرێ)، تەماشـای کـرد دوو پیـاوی عیبرانیـی پێکـەوە لێـک دەدەن، بـە خراپەکارەکـەی گـوت: بۆچـی لـە هاوەڵەکـەت دەدەی؟ ئەویـش وەڵامـی دایـەوە: کـێ تـۆی کـردوە بـە سـەرۆک و دادوەر بەسـەرمانەوە؟ ئایـا بڕیـارت داوە، منیـش بکـوژی، وەک چـۆن میسـرییەکەت کوشـت؟ مووسـاش ترسـاو گوتـی: ڕاسـتە، دیـارە هەواڵەکـە بڵاوبۆتـەوەو، ئـەو هەواڵـە بـە فیرعـەون گەیشـت و، هەوڵـی کوشـتنی مووسـایدا، بـەڵام مووسا ﷺ لـە فیرعـەون ڕایکـردو، ڕۆیشـت تاکـو لەسـەر زەمینـی مەدیـان نیشـتەجێ بـێ و، لـەوێ لەسـەر بیـرە ئاوەکـە دانیشـت.

هەڵبەتـە ئـەوەی کـە لێـرەدا لەگـەڵ قورئانـدا تێـک دەگیـرێ و، دیـارە ئەوەیـە دەڵـێ: دوو کەسـی عیبرانیـی بـوون، بـەڵام لـە قورئانـدا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ ﴾، دوایـی جارێکـی دیکـە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ ﴾، یانـی: بـۆ جـاری دووەمیـش، دیـارە هـەر هەمـان کـەس بـووە، مانـای وایـە هـەر هەمـان بەنـوو ئیسـرائیلیی بـووە، لەگـەڵ یەکێکـی دیکـەی فیرعەونیـی دا تێککیـراوە، بـەڵام پەیـمانی کـۆن لێـرەدا دەڵـێ: هەردووکیان ئیسـرائیلیی بـوون، کـە لـەوەدا بـە هەڵـەدا چـووە.

**بڕگەی شەشەم: هاوسەرگیریی کردنی مووسا ﷺ:**

لە (پەیمانی کۆن)دا، هەر لە ژێر ناوونیشانی: (زَوَاجُ مُوسَى)دا هاتوە:

{وَكَانَ لِكَاهِـنِ مِدْيَـانَ سَـبْعُ فَتَيَـاتٍ فَأَقْبَلْـنَ وَاسْـتَقَيْنَ مَـاءً، وَمَـلأْنَ الأَجْـرَانَ لِيَسْـقِينَ غَنَـمَ أَبِيهِـنَّ، فَـأَتَى الرُّعَـاةُ وَطَرَدُوهُـنَّ، غَـيْرَ أَنَّ مُـوسَى هَـبَّ لِنَجْدَتِهِـنَّ وَسَـقَى غَنَمَهُـنَّ، وَعِنْدَمَـا رَجَعَـتِ الْفَتَيَـاتُ إِلَى رَعُوئِيـلَ أَبِيهِـنَّ سَـأَلَهُنَّ: «مَـا بَالُكُـنَّ بَكَّرْتُـنَّ بِالرُّجُـوعِ الْيَـوْمَ؟»، فَأَجَبْنَـهُ: «رَجُـلٌ مِـصْرِيٌّ أَنْقَذَنَـا مِـنْ أَيْـدِي الرُّعَـاةِ، فَاسْـتَقَى لَنَـا وَلِغَنَمِنَـا أَيْضـاً». فَسَـأَلَهُنَّ: «وَأَيْـنَ هُـوَ؟ لِـمَاذَا تَرَكْـتُنَّ الرَّجُـلَ؟ ادْعُونَـهُ لِيَـأْكُلَ طَعَامـاً». وَقَبِـلَ مُـوسَى أَنْ يُقِيـمَ مَـعَ

الرَّجُلِ الَّذِي زَوَّجَهُ مِنِ ابْنَتِهِ صَفُّورَةَ، فَأَنْجَبَتْ لَهُ ابْناً، دَعَاهُ جِرْشُومَ «وَمَعْنَاهُ غَرِيبٌ» إِذْ قَالَ: «كُنْتُ نَزِيلاً فِي أَرْضٍ غَرِيبَةٍ»[1].

واتە: کاهینی مەدیان (ئەوەی لە بارەیەوە هاتوە: ﴿ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾، کە هەندێک لە ڕوونکەرەوان (مفسّرین) بە هەڵە گوتوویانە: شوعەیب بووە، کە وانیە وەک دوایی باسی دەکەین، ئەو بە کاهینی مەدیەن ناوی دێنێ، (زانای مەدیەن)، ئەوان بە زانایان گوتوە: کاهین)، حەوت کچی هەبوون، هاتن ئاویان هەڵهێنجاو گۆزەکانیان پڕ کردن، تاکو سەرەنجام مەڕی بابیان ئاو بدەن، بەڵام شوانەکان هاتن و دەریانکردن، کەچی مووسا ڕاپەڕی بۆ یارمەتییدانیان و، مەڕەکەی بۆ ئاودان و، کاتێک کچەکان گەڕانەوە بۆ لای بابیان: ڕەعوئیل، (دەبێ ئەو کاهینە ناوی ڕەعوئیل بوو بێ بە حیسابی تەورات)، لێی پرسین: چیتان بوو، ئەمڕۆ زوو گەڕانەوە؟ وەڵامیان دایەوە: پیاوێکی میسریی لە دەست شوانەکان، ئێمەی دەرباز کردو، ئاوی بۆ هەڵێنجاین بۆ خۆشمان و بۆ مەڕەکانیش، لێی پرسین: ئەدی لە کوێیە؟ بۆچی لە پیاوەکە گەڕان، (واتە: لەوێتان جێهێشت؟) بانگی بکەن، با بێ خواردن بخوات، مووساش پەسەندی کرد، کە لەگەڵ ئەو پیاوە نیشتەجێ بێ و، بژی، کە کچەکەی خۆی بە ناوی صەففورەی لێ مارەکردو، کوڕێکی لێی بوو ناوی لێنا: (جِرْشُومَ)، یانی: غەریب، ئاوارە، گوتی: چونکە من لەسەر زەمینێکی غەریب بووم.

ئەوەی لێرەدا لەگەڵ قورئاندا تێک دەگیرێ، ئەوەیە کە قورئان باسی دوو کچەکان دەکات، بەڵام لێرەدا تەورات باسی حەوتان دەکات! ئنجا باسی ئەوە دەکات کە پیاوەکان ئەو کچانەیان دەرکردوون، بەڵام لە قورئاندا بەس ئەوەندە باس دەکات، کە مووسا ﷺ ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، دیارە دەبێ ئەو ئاژەڵ ئاودانە پێویستی بە هێز و توانایەک بووبێ، کە کچەکان لە توانایاندا نەبووە و، واش پێدەچێ شوانەکان نۆرە بڕیان لێکردبن، یاخود کچەکان نەیانویستبێ لەگەڵ

---

(١) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٢، ص:١٢٣.

شـوانەکان تێکـەڵ بـن، وەک دوایـی لـەو بـارەوە وردەکاریـی زیاتـر بـاس دەکەیـن، ئیـدی مووسـا ﷺ مـەڕەکانی بـۆ ئـاو داون.

**بڕگەی حەوتەم: بوونە پێغەمبەری مووسا ﷺ:**

مووسا چۆن بوو بە پێغەمبەر؟ لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ:

**أ- {وَبَعْدَ مُرُورِ حِقْبَةٍ طَوِيلَةٍ مَاتَ مَلِكُ مِصْرَ، وَارْتَفَعَ أَنِينُ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَصُرَاخُهُمْ مِنْ وَطْأَةِ الْعُبُودِيَّةِ، وَصَعِدَ إِلَى اللهِ، فَأَصْغَى اللهُ إِلَى أَنِينِهِمْ، وَتَذَكَّرَ مِيثَاقَهُ مَعَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحقَ وَيَعْقُوبَ، وَنَظَرَ اللهُ إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ «وَرَقَّ لِحَالِهِمْ»}**[1].

دەڵـێ: دوای ماوەیەکـی دوورو درێـژ، پادشـای میسـر مـردو، ناڵەی بەنوو ئیسـرائیل (نـەوەی ئیسـرائیل)، بـەرز بـۆوە و، هـاوار کردنیـان لـە ژێـر بـاری کۆیلایەتییـدا، بـەرز بـۆوە بـۆ لای خـوا ﷻ، خـواش گوێـی لـە ناڵەیـان گـرت، (گوێـی هەڵخسـت بـۆ ناڵەیـان)و، ئـەو پەیمانـەی خـۆی کـە لەگـەڵ ئیبراهیـم و ئیسـحاق و یەعقووبـدا بەسـتبووی، وە بیـری هاتـەوە.

بێگومـان خـوا ﷻ شـتی لـە بیرناچـێ، بـەڵام (پەیمانـی کـۆن) ئـاوا باسـی خـوا ﷻ دەکات، کـە پەیمانەکـەی وە بیـر هاتۆتـەوە، دوای ئـەوەی گوێـی لـە ناڵـە ناڵـی بەنـوو ئیسـرائیل بـوو، ئنجـا پەیمانەکـەی بـە بیرهاتـەوە! کـە ئەمـە شایسـتەی خـوا ﷻ نیـەو، خـوا ﷻ هیچـی لـە بیرناچـێ و هەمیشـە خـوا ﷻ فەرمایشـت و بەڵێنـی خـۆی لـە بیـرە، بـەڵام (پەیمانـی کـۆن) ئـاوا تەماشـای خـوا ﷻ دەکات!

ب- ئنجا لە ژێر ناوونیشانی: (**ظُهُورُ اللهِ لِمُوسى**)، دەرکەوتنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺدا، دەڵێ:

**{وأَمَّـا مُـوسَى فَـكَانَ يَرْعَـى غَنَـمَ حَمِيـهِ يَـثْرُونَ كَاهِـنِ مِدْيَـانَ، فَقَـادَ الْغَنَـمَ إِلَى مَـا وَرَاءِ الطَّـرَفِ الأَقْصَــى مِـنَ الصَّحْـرَاءِ حَتَّـى جَـاءَ إِلى حُورِيـبَ جَبَـلِ اللـهِ، تَجَـلَّى لَـهُ مَـلاكُ الـرَّبِّ**

---

(١) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٢، ص:١٢٣.

**بِلَهِيبِ نَارٍ وَسَطَ عُلَّيْقَةٍ، فَنَظَرَ مُوسَى وَإِذَا بِالْعُلَّيْقَةِ تَتَّقِدُ دُونَ أَنْ تَحْتَرِقَ، ...، وَعِنْدَمَا رَأَى الرَّبُّ أَنَّ مُوسَى قَدْ دَنَا لِيَسْتَطْلِعَ الأَمْرَ، نَادَاهُ مِنْ وَسَطِ الْعُلَّيْقَةِ قَائِلاً: «مُوسَى». فَقَالَ: «هَا أَنَا»، فَقَالَ: «لا تَقْتَرِبْ إِلَى هُنَا: اخْلَعْ حِذَاءَكَ مِنْ رِجْلَيْكَ، لأَنَّ الْمَكَانَ الَّذِي أَنْتَ وَاقِفٌ عَلَيْهِ أَرْضٌ مُقَدَّسَةٌ»)**[1]

دەڵێ: مووسا مەڕی خەزووری یەثرون، کاهینی مەدیەنی دەلەوەڕاند[2]، مەڕەکەی برد، هەتا پشت ئەو پەڕی دووری بیابانەکە، هەتا هاتە لای (حوریب) چیای خوا ﷻ (وا پێدەچێ مەبەستی پێ طوور بێ)و، لەوێ فریشتەی پەروەردگار بۆی دەرکەوت، بە بڵێسەیەکی ئاگرەوە لە نێوەڕاستی عوللەیقەیەک[3]، {(عُلَّيْقَةٍ)، یانی: دڕووە تووترك}، مووسا ﷺ تەماشای کرد، ئەو درەختە (ئەو دڕووە)، دادەگیرسێ، بەبێ ئەوەی بسووتێ، (بڵێسەو مەشخەڵی لێ بەرزدەبێتەوە، هیچ دیاریش نیە، بسووتێ) کاتێک پەروەردگار بینی، مووسا ﷺ نیزیک کەوتۆتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو درەختە چۆنە؟ (دەئایسێ و ناشسووتێ)، لە نێو دڕووەکەوە (لە نێوەڕاستی درەختەکەوە) بانگی کرد: مووسا! ئەویش گوتی: ئەوە منم لێرەم، خوا ﷻ فەرمووی: لێرە نیزیک مەکەوە، پێڵاوەکانت لە پێیەکانت دانێ، چونکە ئەو شوێنەی کە تۆ لێی وەستاوی، سەر زەمینێکی پاکە.

---

(١) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٣، ص:١٣٤.

(٢) دیارە پێشێ کاهینی مەدیەنی بە ناوێکی دیکەوە هێناوە، لێرە دەڵێ: (یَثْرُونَ)، بەلام لە شوێنێکی دیکە دەڵێ: ڕەعونیل. بە هەر حاڵ یەثرون و ڕەعونیل زۆر لێك جیان، ئنجا ئایا ئەمە لەقەبی بووە؟ .

(٣) العُلَّيق والعُلَّيْقى: نباتٌ شائك من فصيلة الورديات زهوره صغيرة بيضاء أو وردية اللّون، يمكن استعماله سياجاً، وله ثمار كثمار التوت تؤكل. المنجد ص٥٢٦ ط٤٣ .
بەكوردی: دڕوو، توترك.

دوایـی لـە درێـژەی قسـەکاندا، هاتـوە، فەرمـووی: ئـەوە مـن پەرسـتراوی ئیبراهیـم و ئیسـحاق و یەعقـووب و بـاب و باپیرانـی تـۆم و، تـۆ دەکەمـە پێغەمبـەرو دەتنێـرم کـە ئـەو گەلـەی خـوا (شَعْبُ الله)یـە، کـە خواپەرسـتن و دەچەوسـێنرێنەوە، لـە میسـر دەربازیـان بکـەی.

ئەوە وردەکارییەکی دیکەی هەیە، بە پێویستم نەزانی، بیهێنم.

هەڵبەتـە ئەمـەش هەندێکـی لەگـەڵ قورئانـدا تێـک دەکاتـەوە، کـە لـە سـوورەتی (طـە)دا، هاتـوە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ۝١٢ ﴾طـە، واتـە: پێڵاوەکانـت دابنـێ تـۆ لـە شـوێنێکی پاککـراوە دای بـە نـاوی: (طـوی)، هەروەهـا لـە سـوورەتی: (النَّازِعات)یـش دا، ئنجـا کـە لێـرەش دەڵـێ: پێڵاوەکانـت دابنـێ، لەوێش فەرموویەتـی: نەعلەکانـت، پێڵاوەکانـت دابنـێ.

ئەمـە کورتەیـەک بـوو لـە ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ لەبـەر ڕۆشـنایی پەیـمانی کۆنـدا، کـە وەک گوتـم: جۆرێـک لەبەرچـاو ڕوونیـی دەداتـە دەسـت مـرۆڤ، بـەڵام بـە تەئکیـد هـەر شـتێک کـە پەنهـان و نادیـارە جگـە لـە وەحیـی پارێـزراوی خـوا ﷻ لـە قورئـان و سـوننەتدا، ئێمـە ناتوانیـن بـە دڵنیایـی و بـە مسـۆگەریی، پشـتی پـێ ببەسـتین، مەگـەر بـەو وەحییـە پارێـزراوەی کـە لـە قورئـان و سـوننەتدا هەیـە، بـۆ شـتی نادیـار (غیـب)، بـەڵام بـۆ شـتی دیکـە کـە لـە ڕووی زانسـتییەوە پێـی دەگەیـن، یـان لـە ڕووی عەقڵییـەوە پێـی دەگەیـن و، لـە ڕووی شـوێنەوار ناسـییەوە پێـی دەگەیـن، ئـەوە شـتێکی دیکەیـە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

دەرسـی یەکەمـمان ئایەتەکانـی: (١ - ٦)، شـەش ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (القَصَـص) دەگرێتـە خـۆی و تێـدا باسـی قۆناغـی یەکەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا و هارِوونـی بـرای (علَيْهِما السَّلام)و، گەلەکەیـان گەلـی بەنوو ئیسـرائیل لەگەڵ فیرعەونـدا، کـراوە، کـە فیرعـەون خەڵکـی میسـرِی بـەش بـەش کـردوە، هەندێکیانـی چەوسـاندۆتەوە، نێرینەکانـی سـەربرِیون و، مێینەکانـی هێشـتوونەوە، بـەڵام خـوا ویسـتی وا بـووە ئـەو حاڵـە بگـۆرِێ و، ئـەو چەوسـێنراوانە دەربـاز بـکات و بـاڵا دەستیشـیان بـکات لـە زەویـداو، ئـەوەی فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانی بیمیـان لێـی هەبـووەو لێـی ترسـاون، کـە بریتـی بـووە لـەوەی لـە لایـەن بەنـوو ئیسـرائیلەوە زیانێکیـان پـێ بـکات، ئەوەیـان پێشـان بـدا، سـەرەنجام بـە هـۆی راوەدوونانیـان بـۆ مووسـا و هـارِوون و گەلەکەیـان، گەلـی سـتەم دیـدەی بەنـوو ئیسـرائیل، کـە بـە دەریـای سـووردا پەرِینـەوەو خـوا دەریـای بـۆ شـەقکردوون، ئەوانیـش لـە ئەنجامـی راوەدوونانیـان بـۆ بەنـوو ئیسـرائیل، لـە دەریـای سـووردا خنـکاون و نغـرۆ بـوون.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

بەناوی خوای بە بەزەیی و بەخشندە

{طـا سـین میـم ﴿١﴾ ئەوانـە ئایەتەکانـی کتێبێکـی ڕوون و ڕۆشـنکەرەوەن (بـۆ هەمـوو ئـەو ڕاسـتییانەی لـە ڕێـی وەحییـەوە نەبـێ نازانرێـن) ﴿٢﴾ بـە شـێوەیەکی هـەق و ڕاسـت بـۆ کۆمەڵێـک بـڕوا بێنـن، لـە هەواڵـی مووسـا و فیرعەونـت، بەسـەردا دەخوێنینـەوە ﴿٣﴾ بـە ڕاسـتیی فیرعـەون لـە زەوی میسـڕدا خـۆی بـەرز کـردەوە، (خـۆی بـە زلگـرت و سـەپاند)و، خەڵکەکەی کـردە دەسـتە دەسـتە (گـرووپ گـرووپ) کۆمەڵێکیانـی دەچەوسـاندنەوە، کوڕەکانیانـی سـەردەبڕین و ئافرەتەکانیانـی بـە زیندوویـی دەهێشـتنەوە، بێگومـان ئـەو (فیرعـەون) لـە تێکـدەران بـوو ﴿٤﴾ ئێمـەش دەمانـەوێ چاکـە لەگـەڵ ئەوانـەدا بکەیـن، کـە لـە زەویـدا چەوسـێندراونەوەو، بیانکەینـە پێشـەوا (حوکمـڕان)و بـە میراتگرانـی ستەمکارانیان بگێڕن ﴿٥﴾ هەروەهـا لـە زەویـدا بـاڵا دەسـتیان بکەیـن و، ئـەوەی فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانیان بیمیـان لێـی هەبـوو، لـە لایـەن ئەوانـەوە پێشـانیان بدەیـن ﴿٦﴾ }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَبَإِ): (نَبَأ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَة عَظِيمَةٍ، يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أَو غَلَبَةُ ظَنٍّ)، (نَبَأ) هەواڵێکـە سـوودێکی مەزنـی هەبـێ، کـە بـە هـۆی ئـەو هەواڵـەوە زانیاریـی جێـی دڵنیایـی، یاخـود گومانێکـی زاڵ پەیـدا ببـێ.

(عَلَا) واتـە: خـۆی بـەرز کـردەوە، خـۆی سـەپاند. (العُلُـوُّ ضِـدُّ السُّـفْلِ، وَالعُلُـوُّ: الإِرتِفَـاعُ، عَـلَا يَعلُـو عُلُـوّاً وَهُـوَ عَـالٍ، وَعَـلِيَ يَعْـلاَ عَـلَاءً فَهُـوَ عَـلِيٌّ)، (عُلُـوّ) پێچەوانـەی (سُـفْل)ە، (عُلُـو) واتـە: بەرزیـی، (سُـفْل) واتە: نزمیـی، (عُلُوّ) بـە مانـای بەرزبوونەوەیە،

دەگوترێ: (عَلَا يَعْلُو عُلُوّاً: وَهُوَ عَالٍ)، بەرز بوو، بەرز دەبێ، بەرزبوونەوە، ئەو بەرزە، (عَلِيَ يَعْلَا عَلَاءً فَهُوَ عَلِيٌّ) هەروەها بەوەش هاتوە کە وەک چۆن (عَلا يَعلُو) هاتوە، (عَلِيَ يَعلا)ش هاتوە، ئەویان چاوگەکەی (عَلاء)ە، ئەوی دیکەیان (عُلُوّ)ە، ئەویان ناوەکەی: (وَهُوَ عَالٍ)، ئەمەیان (وَهُوَ عَلِيٌّ) هەردووکیشیان یانی: بەرز، بڵند.

(شِيَعًا ): (شِيَعُ وأَشْيَاع) هەردووکیان (جَمعُ شِيعَة)، کۆی (شيعة)ن، (شِيعَةُ: مَن يَتَقَوَّى بِهِمُ الإنسَانُ ويَنتَشِرُونَ عَنهُ)، (شِيعة) کۆمەڵێکن کە مرۆڤ بە هۆی وانەوە بە هێز دەبێ و، لەوەوە بڵاودەبنەوە.

(نَّمُنَّ): (المَنُّ: مَا يُوزَنُ بِهِ، وَالمِنَّةُ: النِّعمَةُ الثَقِيلَة، مَنَّ فُلانٌ عَلَى فُلانٍ: أثقَلَهُ بِالنِّعْمَةِ، وَقِيلَ: المِنَّةُ تَهدِمُ الصَّنِيعَة)، (مَنّ) ئەوەیە کە شتی پێ دەکێشرێ، (مِنَّة) بە چاکەیەکی قورس دەگوترێ، دەگوترێ: (مَنَّ فُلانٌ عَلى فُلانٍ) واتە: فڵانکەس منەتی لەسەر فڵانکەس کرد، واتە: بە هۆی چاکەکەیەوە باری قورس کرد، هەڵبەتە منەتکردنی کوردیی یانی: بە چاودادانەوە، بەڵام بە عەرەبیی (مَنَّ فُلانٌ عَلَى فُلَانٍ)، یانی: (أنعَمَ فُلانٌ عَلى فُلانٍ) واتە: فلانکەس هێندەی چاکە لەگەڵ فلانکەس کرد، باری قورس کرد، گوتراوە: (المِنَّةُ: تَهْدِمُ الصَّنِيعَة)، منەتکردن چاکەکردن هەڵدەوەشێنێتەوە، کەسێ چاکە لەگەڵ کەسێ بکات، بەڵام منەتی لەسەر بکات و بە چاوی دابداتەوە، پاداشتەکەی دەڕوا.

(وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ): (نُمَكِّنَ: أي: نَجْعَلُ لَهُمْ مَكَانَاً، أَو مَكَانَةً)، واتە: شوێنێکیان بۆ دادەنێین یاخود پێگەیەکیان پێ دەدەین، (نُمَكِّنَ لَهُم فِي الأَرْض) واتە: دەسترۆیشتوویان دەکەین لە زەویدا.

(يَحْذَرُونَ ): (الحَذَرُ: إحْتِرَازٌ مِنْ مُخِيفٍ)، (حَذَر) بریتیە لە خۆپاراستن لە شتێکی ترسێنەر، مەترسییلێکراو، کەواتە (يَحْذَرُون)، وریان لەوەی لێی دەترسێن و، بیمیان لێی هەیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بسم الله الرحمن الرحيم)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم کارەم دەست پێ دەکەم، یان دەست پێکردنم، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە.

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەش، واتە:

١- ئەم کارە بە ناوی خواوە دەکەم و ئەنجامی دەدەم.

٢- ئەم کارە بۆ ڕازییکردنی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە هەوڵ و توانای خوای پەروەردگار دەکەم.

٤- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوای پەروەردگار دەکەم.

ئنجا قورئان دەخوێنی، یان هەر کارێکی دیکە دەکەی، کە دەڵێی: (بسم الله الرحمن الرحيم)، دەبێ ئەو مەبەستانە لە دڵی خۆت بگری.

﴿طسٓمٓ ①﴾، ئاوا دەخوێندرێتەوە: (طا سیـــن میـــم)، پیتی (طا) تەنیا بە دوو جووڵە (حركة) دەخوێنرێ، بەڵام (سین و میم) یەکی بە شەش جووڵە (حركة) دەخوێنرێن و درێژ دەکرێنەوە، لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، باسێکی سەربەخۆمان کردوە لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، کە لە پێش (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، کە زۆربەیان سوورەتە مەککەییەکانن و دووانیشیان سوورەتە مەدینەییەکانن.

زانایان بۆ ئەوە کە حیکمەت چییە، خوا ﷻ لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئان دا، ئەو پیتە پچڕ پچڕانەی داناون؟! کە هەندێکیان یەک پیتن، وەک: (ن،

قٓ، صٓ )و، هەندێکیان دوو پیتن، وەک: (یٰسٓ، طٰه )و، هەندێکیان سێ پیتن، وەک: (الٓمٓ، الٓر )و، هەندێکیان چوار پیتن، وەک: (الٓمٓر ، الٓمٓصٓ)و، هەندێکیشیان پێنج پیتن، وەک: (كٓهيعٓصٓ)، لە سەرەتای سوورەتی (مَريَم)دا، هەروەها (حمٓ ، عٓسٓقٓ )، لە سەرەتای (الشورى)دا، کە لەوە زیاتریان نیە، لە یەک پیت، تاکو پێنج پیتی هەن.

زانایان زۆر قسەیان لێ کردوە، رەنگە باشترین را ئەوە بێ: کە خوا ﷻ بە مرۆڤەکان دەفەرموێ: ئەو فەرمایشتەی کە لەبەر دەستتانە، کە فەرمایشتی خوایەو بە جبریل دا ناردوویەتی بۆ موحەممەد ﷺ کۆتایی پێغەمبەران، هەر لەو پیت و دەنگانە پێک هاتوە، کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن، ئنجا بەوەدا بزانن، کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، چونکە ئەو کەرەستەی پیت و دەنگانە، لەبەر دەستی ئێوەش دا هەیە، بەڵام ئێوە دەستەوسانن، کە نەک وەک قورئان لەو پیت و دەنگانە پێک بێنن، بەڵکو دە (١٠) سوورەتیشی، بەڵکو وەک سوورەتێکیشی، سوورەتێکی سێ ئایەتیی سوورەتی (العَصر)، یان سوورەتی (الكوثر)، یان سوورەتی (النصر).

کەواتە: بزانن! ئەو کەسەی لەو پیت و دەنگانە، ئەو فەرمایشتە دەستەوسانکەرەی پێک هێناوە و ناردوە، بزانن کە خوایە ﷻ ئەو فەرمایشتەی ناردوە، ئەو کتێبە موبارەکە سەرسوڕهێنەرو دەستەوسانکەرەی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی و، بۆ جندیش دابەزاندوە.

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾، ئەوانە، ئەو ئایەتانە، ئاماژەیە بۆ دوور، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی روونن، واتە: کتێبێکی روونە بۆ هەر کەسێ تەماشای بکات، رۆشنە، دەزانێ کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، یاخود (المُبِين) بە مانای روونکەرەوە دێ، واتە: کتێبێکی روونکەرەوەیە، بۆ هەموو ئەو راستییانەی مرۆڤ پێویستیی پێیانەو، لە رێی وەحییشەوە نەبێ نازانرێن.

خـوا ﷻ هـەم کتێبەکـەی خـۆی بـە (مُبِین) پێناسـە کـردوە: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، هـەم قورئانەکـەی خـۆی بـە (مُبِین) پێناسـە کـردوە: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾، واتـە: قورئـان چ بـە حاڵەتـە خوێنراوەییەکـەی، قورئـان: خوێـنراوە (مَقـرُوء)، چ بـە حاڵەتـە نووسراوییەکـەی (كِتـاب) نـووسراو، خـوا خسـتوویەتە بـەر دەسـتی مـرۆڤ، هـەم وەک بـە خوێنراوەیـی، هـەم بـە نووسراویـی.

ئنجـا ئـەم قورئانـە (مُبِین)ە، بۆچـی خـوا ﷻ وشـەی (مُبِین)ی بەکارهێنـاوە، دەیتوانی بفەرمـوێ: (تِلـكَ آيَـاتُ الكِتَـابِ البَيِّن) یـان (الوَاضِح)، بەڵام بۆچـی (مُبِـین)ی بەکارهێناوە؟!

چونکـە (بَیِّن) یانـی: ئاشـکرا و ڕوون، بـەس ئـەو واتایـەی هەیـە، بـەڵام (مُبِین) دوو واتـای هـەن، چونکـە دەگونجـێ لـە کـرداری (أَبَـانَ)ی (لازِم)ەوە هاتبـێ، وەک: (أَبَـانَ القَمَـرُ) واتـە: مانگەکـە دەرکـەوت، (أَبَانَ المُـدَرِّسُ) مامۆسـتاکە دەرکـەوت، ئنجـا ئەگەر لـە (أَبَـانَ)ی (لازِم)ەوە بـێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتـە: ئەوانـە ئایەتەکانـی کتێبێکـی ڕوونـن، ڕۆشـنن، بـەڵام دەشـگونجێ (مُبِـین) لـە (أَبَـانَ)ی (مُتَعَدِّي)یـەوە هاتبـێ، وەک زۆرجـار گوتوومانـە: (أَبَـانَ المُـدَرِّسُ الـدَّرسَ)، دەرسـبێژەکە دەرسـەکەی ڕوونکـردەوە، ئـەو کاتـە: (أَبَانَ) پێویسـتیی بـە بـەرکار (مَفعُـول بِـهِ) دەکات.

کەواتـە: وشـەی (مُبِـین) لـە زۆربـەی شـوێنەکان دا، هـەم دەگونجـێ بـە (بَیِّن) و (وَاضِـح): ڕوون، تەفسـیر بکـرێ، هـەم دەشـگونجێ بە ڕوونکـەرەوەو ڕۆشـنکەرەوەش، تەفسـیر بکـرێ، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو وشـەیەی کـردوە بـە وەصـف و پێناسـە بـۆ قورئـان و، بـۆ کتێبەکـەی خـۆی، تاکـو هـەم مانـای ڕۆشـنیی بگەیەنـێ، کـە قورئـان بـۆ خـۆی لـە خـودی خۆیـدا ڕۆشـنە، هـەر کەسـێک تەماشـای بـکات، ڕوونـەو تێیـدەگا، مـادام نامـرازی لـێ تێگەیشـتنەکەی پـێ بـێ، کـە بریتیـە لـە شـارەزایی لـە زمانـی عەرەبیـی، ئنجـا وێـڕای ئـەوەی کـە قورئـان خـۆی ڕوونـە و ڕۆشـنەو ئاشـکرایە، ڕوونکـەرەوەو ڕۆشنکەرەوەشـە بـۆ ئـەو مەبەسـتانەو ئـەو ڕاسـتییانەی مـرۆڤ و جنـد پێویسـتیان پێیانـە، لـە ژیانـی دنیـاداو، لـە ڕێـی وەحییشـەوە نەبـێ نازانرێـن.

﴿ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ ﴾، لە هەواڵی مووساو فیرعەونت بە هەق و ڕاستیی بەسەردا دەخوێنینەوە، بەسەر تۆدا یانی: تۆ ئەی موحەممەد ﷺ! بۆ کێ؟! ﴿ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، بۆ کۆمەڵێک بڕوا بێنن، چونکە هەر ئەوان بەهرەمەند دەبن لەو بەسەرهاتانە، کەسێک بڕوای نەبێ، وەک ئەوە وایە کەسێک کە زەوی نەبێ، بناغەی دیوارەکەی لە کوێ دادەنێ؟! لە ڕاستییدا ئیمان بناغەیە، ئنجا دوایی کردەوەکان لەسەر ئیمان هەڵدەچنرێن، کردەوەکان دیوارێکن لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەچنرێن، بەهرەمەند بوون لە بەسەرهاتەکانی قورئان، بەهۆی ئیمانەوە دەبێ، کەسێک ئیمانی نەبێ بەهرەمەند نابێ، هەڵبەتە ئەو بەهرەمەندییەی کە ببێتە مایەی سەرفرازیی، ئەگەرنا هەر کەسێک تەماشای قورئان بکات و لە قورئان ورد ببێتەوە لە ڕووی عیلمییەوە، لە ڕووی مێژوویییەوە، لە ڕووی یاساییەوە، لە ڕووی عەقڵییەوە، هەر لێی بەهرەمەند دەبێ، بەڵام ئەو بەهرەمەندییە، نا، کە خوا مەبەستیەتی، کە بریتیە لەوەی ببێتە مایەی سەرفرازیی دنیا و، بەختەوەریی و بە ئامانج گەیشتنی ڕۆژی دوایی، بە هۆی خوا لە خۆ ڕازیی کردنەوە.

ئنجا دوای ئەم زەمینە خۆشکردنە، کە زانرا: ئەو بەسەرهاتە کێ دەیگێڕێتەوە؟! بۆچی دەگێڕدرێتەوە؟! لە کوێوە هاتوەو سەرچاوەکەی کوێیە؟! دێتە سەر باسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا ﷺ و فیرعەون بە شێوەیەکی ڕاست، (بِالحَق)، یانی: (بِالصِّدق) ڕاست، (حق) یانی: شتێکی چەسپاو، ئنجا لەبەر ئەوەی هەواڵی ڕاست، دەچەسپێ، بەڵام قسەی درۆ وەک دەڵێن: مەیدانی درۆیە کورتەو، زوو خاوەنەکەی بە درۆ دەکەوێتەوە، بۆیە لێرەدا وشەی هەق بە (صِدق) ڕاستیی، تەفسیر دەکرێ.

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بە دڵنیایی فیرعەون لە زەوییدا بەرز بۆوە، واتە: باڵا دەست بوو، خۆی سەپاند، (عَلَا) یانی: (إرتَفَعَ) یاخود بە مانای باڵا دەست بوو (تَسَلَّطَ)، ئنجا کەسێک کە بەرز دەبێتەوە، بەرز دەبێتەوە بەسەر

خەڵکێکـدا کـە لـە خـوار خۆیـەوە دەیانبینـێ، واتـە: ئەوانـی خسـتە ژێـر ڕکێفـی خۆیـەوەو، خـۆی بەسـەردا سـەپاندن و خـۆی بەسـەردا بـەرز کردنـەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، لـە زەوییـدا خـۆی بـەرز کـردەوە یانـی: لـە زەوی میسـڕدا، چونکـە (أل)ی ﴿ٱلْأَرْضِ﴾، ئەلیـف و لامـی (عَهـد)ە، واتـە: لەسـەر زەوییەکـە خـۆی بەرزکـردەوە، لەسـەر زەوی میسـڕ، کـە ئـەو تێیـدا حوکمـڕان بـووە.

ئنجـا بـاسی چۆنیـەتی ئـەو خـۆ بەرزکردنـەوەی فیرعـەون لـە زەوییـدا، دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا﴾، خەڵکـی سـەر ئـەو زەوییەشـی بـەش بـەش کـردن، (شِـيَع) کـۆی (شِـيعَة)یە، یانـی: کۆمەڵـە خەڵکێـک، واتـە: گـرووپ گرووپـی کـردن، بـۆ ئـەوەی کـە لـە ئەنجامـی ناکۆکییەکانـی نێوانیانـدا، بەهرەمەنـد بـێ، تێکیـان بـەرداو هـەر کامێکیـان دژی ئـەوی دیکـە بـێ، وەک کاتـی خـۆی ئینگلیـزەکان سیاسـەتێکیان هەبـووە: پەرتکـەو زاڵبـە (فَرِّق تَسُـد) یانـی: خەڵکەکە پەرتبکـە، ئنجا سـەرۆکایەتییان بەسـەردا بکـە، چـی لـێ دەکـردن؟ ﴿يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ﴾، کۆمەڵێکیانـی دەچەوسـاندنەوە، (ضَعِيـف) یانـی: بێهێـز، بـەڵام (إستِضعَاف) یانـی: بێهێـز کـردن، ﴿يَسْتَضْعِفُ﴾، یانـی: بێهێـزی دەکـرد، یـانی: لـە ئەصڵـدا بێهێـز نەبـوون، بـەڵام بیهێـزی دەکـردن لـە ڕووی ئابوورییـەوە، لـە ڕووی سیاسـییەوە، لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، لـە ڕووی ئەمنییـەوە، ﴿طَآئِفَةً مِّنْهُمْ﴾، کۆمەڵێـک لـەوان، ئـەو کۆمەڵـە لـەوان، دوایـی بۆمـان دەردەکـەوێ کـە مەبەسـت پـێ بەنـی ئیسـڕائیلە، (بني) یـانی: کوڕانـی، یاخـود ڕۆڵەکانـی، ئیسـڕائیل نازنـاوی یەعقووبە ﷺ، بـە عیبریی ئیسـڕائیل واتـە: (عبداللـه)، بەنـی ئیسـڕائیل، یـانی: ڕۆڵەکانـی ئیسـڕائیل بـە کـوڕ و کچـەوە، کـە دوایـی پێیـان گوتـراوە: یەهـوود، بـە کوردیـی: جوولەکـە، هەروەهـا بەنـوو ئیسڕائیلیشـان بـۆ بەکاردەهێـنرێ، ڕۆڵەکانـی یەعقـووب ﷺ کـە دوایـی بـە وردیـی باسـی دەکەیـن، ئـەو بەنـوو ئیسـڕائیلە کـەی چوونـە میسـرو چـۆن بـووە؟ هەرچەنـدە لـە تەفسـیری سـوورەتی (یوسـف)دا بـە تەفصیـڵ لـەو بـارەوە قسـەمان کـردووەو، لـە ڕاسـتییدا، ئـەوێ شـوێنی تایبەتیـی باسـکردنی بەنـوو ئیسـڕائیل و چۆنیەتی

نیشتەجێ بوونیانە لە میسر، بەڵام بە بۆنەی ئەوەوە کە ئێمە پێنج قۆناغی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەم سوورەتی (القَصَص)دا، دەخەینە ڕوو، بەو بۆنەیەشەوە ئاماژەیەکی پێ دەکەین.

دوایی خوا چۆنیەتیی چەوساندنەوەکەی فیرعەونمان بۆ باس دەکات، بۆ ئەو کۆمەڵە، کە مەبەست پێی بەنوو ئیسرائیلە، ڕۆڵەکانی ئیسرائیل: ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ﴾، کوڕەکانیانی سەردەبڕین و، ئافرەتەکانیانی بە زیندوویی دەهێشتنەوە، وشەی: ﴿يُذَبِّحُ﴾، زێدەڕۆیی و مانا بەهێزیی زیاتری تێدایە لە (يَذبَحُ) ئەگەرنا دەشیتوانی بفەرمووێ: (يَذبَحُ أبناءَهُم)، بەڵام ﴿يُذَبِّحُ﴾، یانی: زۆری سەردەبڕین، زۆر بە خەستیی، ﴿وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ﴾: ئافرەتەکانیشیانی بە زیندوویی دەهێشتنەوە، هەر ئەوەندە بوو زیندوو بوون و ژیانیان هەبوو، ئەگەرنا کەرامەت و ڕێز و مافیان پێشێل کرابوو، چونکە ئافرەتەکانیان بە بێ پیاوەکانیان دەهێشتنەوە، دیارە بۆچییان دەهێشتنەوە! ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەو فیرعەونە لە خراپەکاران و تێکدەران بوو، فیرعەون بەو شێوەیە ئەو سیاسەتەی پەیڕەو دەکرد، بەڵام ئەوەی لە لای عەبد خەیاڵە، لە لای خوا بەتاڵە.

فیرعەون لەوێ وایدەکرد، ئەو سەودایەی لە سەردا بوو، کە هەروا بەردەوام بێ: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، بەڵام ئێمە دەمانەوێ چاکە بکەین لەگەڵ ئەوانەدا، کە لەسەر زەمینی میسردا دەچەوسێنرانەوە، ﴿وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ﴾، بیانکەینە پێشەوا و حوکمڕان و، بشیانکەینە میراتگر، ﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، هەروەها لە زەوییدا دەستڕۆیشتوویان بکەین، بەهێزیان بکەین لەسەر زەمینی میسر، یان لەسەر زەمینی شام، ﴿وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم﴾، هەروەها پێشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بدەین، لە لایەن وانەوە واتە: لە لایەن ئەو چەوسێندراوانەوە، ﴿مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ﴾، ئەوەی کە ترس و بیمیان

لێـی هەبـوو، ئـەو تـرس و بیمـەی هەیانبـووە لـە بەنـوو ئیسـرائیلە ئـەوە بـووە کـە لێیـان هەڵگەڕێنـەوە، شۆڕشـیان لـە دژ بکـەن، لێیـان یاخیـی بـن، یاخـود ڕابکـەن و بەجێیـان بێڵـن، خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بـە (فعـل المُضَـارِع) دەیهێنـێ، بـۆ ئـەوەی کـە وێنەکەمـان بخاتـە بەرچـاو، ئەگەرنـا خـوا ویسـتی و جـێ بەجێشـییکرد، لـە جیاتـی ئـەوەی بفەرمـوێ: (أَرَدنَـا أَن نَّمُـنَّ عَـلَى الَّذِيـن اسـتُضعِفُوا فِي الأرض) ویسـتمان چاکـە بکەیـن، لەگـەڵ ئەوانـەی کـە لـە زەویـدا دەچەوسـێندرانەوەو بیانکەینـە حوکمـڕان و، پێشـەوا و بیانکەینـە میراتگـر، دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُرِيدُ ﴾، بـۆ ئـەوەی وێنەکەمـان بخاتـە بەرچـاو (لِاسـتِحضَارِ الصُّـورَة) وێنەکـە بخاتـە بەرچاومـان و، لـە مەشـهەدەکە ڕامێنیـن، هەروەهـا بـۆ ئـەوەش کـە خـوا ﷻ وەک یاسـایەکی گەردوونیـی خـۆی لـە ژیانـی بەشـەردا، بیخاتـەڕوو، واتـە: ئـەوە یاسـایەکی بەردەوامـە، شـتێک نیـە تێپەڕیبـێ و ڕۆیبـێ، ئـەوە کـە خـوا دەیـەوێ چەوسـێندراوان لـە زەویـدا باڵادەسـت بـکات و، بیانکاتـە میراتگری چەوسـێنەرەکانیان، یاسـایەکی خوایـە و بەردەوامـە، بۆیـە بـە (فعـل المُضَـارِع) دەیهێنـێ، یـانی: ئێسـتا و بەردەوامیـش.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**داوای هاتنە مەیدانکردن بە پیتە پچڕ پچڕەکان و، پێناسەی قورئان بە ئایەتە ڕۆشن و ڕوونکەرەوەکانی ئەو کتێبەو، ڕاگەیاندنی گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا و فیرعەون، بە شێوەیەکی ڕاست و هەق:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ طسٓمٓ ١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٣ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ طسٓمٓ ﴾: ئەمانە سێ پیتن: (طا، سین، میم)، پێشتریش گوتمان: لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا کە بە: ﴿ الٓر ﴾، دەست پێدەکات، باسێکی تا ڕاددەیەک تێروتەسەلمان کردوە لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوەو، ڕای زانایان لە بارەیانەوەو، چەند پیتن و، چەند جۆرن و، لە سەرەتای چەند سووڕەت دا هاتوون؟ پۆلێنمان کردوون و، لەو بارەوە قسەی ڕوونمان کردوە.

یەکێک لەو مانایانەی کە هەندێ لە زانایان لێکیان داونەوە، بۆ ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، ئەوەیە کە بۆ ئاگادار کردنەوەن: ﴿ طسٓمٓ ﴾، واتە: ئاگادار بە! وەک چۆن یەکێک بە پەیوەندیی تەلەفۆنیی قسە لەگەڵ یەکێک دادەکات، دەڵێ: ئەلوو، یانی: ئاگادار بە! من قسەت لەگەڵدا دەکەم.

بەڵام مانای بەهێزتر ئەوەیە کە پێشتر گوتمان - لە مانای گشتیی دا - کە مەبەست لەو پیتانە سەرنجڕاکێشانی هەموو لایەکە، کە قورئان هەر لەو

پیـت و دەنگانـە پێکهاتـوە کـە خەڵـک پێیـان دەدوێـن، کەچـی لـە بەرانبەریشـیدا دەستەوسـانن، کەواتـە: بزانـن کـە بێـژەری ئـەو فەرمایشـتە خـوای بـەرزی مەزنـە.

٢)- ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، ﴿ تِلْكَ ﴾، ناوی ئاماژەیە بۆ دوور، (کتاب)یش یانی: نووسراو، (مُبِين)یش دەگونجێ بە مانای ڕۆشن بێ و، دەشگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوە بێ، بۆیە ناوی ئاماژەی دوور، بەکارهێنراوە، چونکە پلە و پایە و پێگەی ئەو ئایەتانە زۆر بەرزە، دەبێ بە ئاماژەی دوور ئاماژەی بۆ بکرێ، ئەو کتێبە، ئەو قورئانە، کە خوا ﷻ هەم بە ناوی قورئان، هەم بە ناوی کتێب بە (مُبِين)ی وەسف کردوە، یانی: هەم ڕوونە مانا و مەبەستەکانی ڕۆشنن، یاخود هەر کەسێک تەماشای بکات، زۆر بۆی ڕوونە کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، هەم ڕوونکەرەوەشە بۆ هەموو ئەو ڕاستییانەو، هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ پێویستیی پێیانەو، لە ڕێی وەحییشەوە نەبێ نازانرێن.

٣)- ﴿ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ ﴾، بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، لە هەواڵی مووسا و فیرعەون، وشەی: ﴿ نَتْلُواْ ﴾، یانی: (نَقْرَأُ) پسپۆڕان دەڵێن: (التِّلَاوَةُ: القِرَاءةُ لِكَلَامٍ مَكْتُوبٍ أَو مَحفُوظ)، (تِلاوَة) بریتیە لە خوێندنەوەی قسەیەک کە نووسرابێ، یاخود لەبەر کرابێ.

٤)- ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾، بەڕاستیی، بەچەسپاویی (الحَقُّ: الثَّابِت والرَّاسِخ المُطَابِق لِلوَاقِع)، (حق) چەسپاو و ڕۆچوو و، لەگەڵ واقیعدا گونجاوو پڕ بە پێست، بەڵام لێرەدا ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾، یانی: (بِالصِّدق)، چونکە وشەی (حق) بە پێی ئەو سیاقانە کە تێیاندا دێ، ماناکەی دیاریی دەکرێ، ئەگەرنا (حق) یانی: چەسپاوو ڕۆچوو، ئنجا هەواڵێک کە دەخوێندرێتەوە، باشترین وەصفێک بۆ ئەو هەواڵە، ئەوەیە کە ڕاست بێ.

هەواڵـی ڕاسـتیش مانـای هەقـەو، هەواڵێـک کـە ڕاسـت بـێ، دەچەسـپێ، بـەڵام کـە درۆ بـێ، ناچەسـپێ و مەیدانـی درۆیـە کورتـە.

٥)- ﴿ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: بۆ کۆمەڵێک بڕوابێنن، (قَوم) یانی: کۆمەڵێک، خەڵکێک، یانی: لە پێناوی کۆمەڵە خەڵکێکدا کە بڕوا دێنن، ئەو ئایەتانە کە هەواڵی مووسا ﷺ و

فیرعەونیان تێدایە، بە شێوەیەکی ڕاست بەسەر تۆیان دا دەخوێنینەوە، چونکە بەس ئەو بڕوادارانە و سوودمەند دەبن لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە.

وشـەی: ﴿ نَبَإِ ﴾، واتـە: (خَـبَرٌ ذُو فَائِـدَةٍ عَظِيمَـةٍ يُفِيـدُ العِلْـمَ أو الظَّـنَّ الرَّاجِـحَ)، دەبـێ هـەواڵ بـێ، سـوودی هەبـێ، سوودەکەشـی مـەزن بـێ، زانیاریـی بگەیەنـێ یاخـود گومانێکـی زاڵ، ئەگـەر ئـەو مەرجانـەی هەمـوو تێـدا نەبـن، بـە وشـەی (نَبَأ) بـاس ناکـرێ.

لێـرەدا خـوا ﷻ، لـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا، زەمینـە خـۆش دەکات بـۆ گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی مووسـا و فیرعـەون، چونکـە تـۆ کاتێـک هەواڵێکـت بەسـەردا دەخوێنرێتـەوە، دەبـێ بزانـی ئـەو هەواڵـە لـە کوێوەیـە؟ چـی گرتۆتـە نێـو خـۆی؟ بۆچـی هاتـووە؟ کـە ئەوانـە هەموویـان خـوا ﷻ ڕوونـی کردوونـەوە:

١- ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتە: ئەوانـە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕوونن، یان ڕۆشنکەرەوەن.

٢- ﴿ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ ﴾ بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، هەڵبەتە جیبریل بەسەریدا خوێندۆتەوە، بەڵام لێرەدا ئەمە پاڵوێدانێکی مەجازییە، یانی: بە هۆی جیبریلەوە بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، کەواتە: سەرچاوەکەی کێیە؟ خوایە ﷻ ئنجا لە بارەی چییەوەیە؟

٣- ﴿ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ ﴾ لە هەواڵی گرنگ و بەسەرهاتی سوودبەخشی مووسا ﷺ و فیرعەون، دوو کەسایەتیی زۆر دیارو ناسراو، مووسا ڕەمزی ئیمان و خواناسیی و خواپەرستیی و، بەرگرییکردن لە ستەم لێکراوان و، بەگژداچوونەوەی ستەم و زۆرو ملهوڕیی، فیرعەونیش ڕەمز و هێمای ملهوڕیی و خۆسەپاندن و، خراپە و خوێنڕێژیی، لە بەسەرهاتی ئەو دوو کەسایەتییە زۆر دژ و پێچەوانەی یەکدییە، بەسەر تۆدا دەخوێنینەوە.

ئەدی شێوازەکەی چۆنە؟

٤- ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ بە شێوەیەکی هەق، ڕاست، چەسپاو.

ئنجا بۆ کێ؟

٥- ﴿لِقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ﴾، بۆ کۆمەڵێک کە بڕوا بێنن.

بەم پێنج بڕگەیە، خوا ﷻ لەم سێ ئایەتەدا، زەمینەی خۆشکرد بۆ ئەوەی لە دوایی دێ، کە بریتییە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا ﷺ و هاڕوونی برای لە خزمەتیدا، پاشان گەلەکەیان لە پشتیانەوە، هەروەها لە بەرانبەریشدا: فیرعەون و داروودەستەکەی، بە تایبەت هامان و قاڕوون و، زلەزلەکان و بڕیار بە دەستانی کۆڕ و مەجلیسەکەی، کە وەک کۆیلە وابوون بۆی، پاشان گەلی میسر کە بێ قەیدو مەرج لە خزمەتی فیرعەون و لە خزمەتی پڕۆژە گڵاوەکانی دابوون، لە دژی گەلی چەوسێنراوەی بەنوو ئیسرائیل.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی خۆ بەرز کردنەوەو خۆسەپاندنی فیرعەون و، بەش بەش کردن و تاقم تاقم کردنی خەڵکی میسرو، چەوساندنەوەی کۆمەڵێکیان و، تێکدان و خراپەکاری کردنی لەسەر زەمینی میسردا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: بە دڵنیایی فیرعەون لەسەر زەوی، سەر زەوی میسردا، خۆی بەرزکردەوە، ﴿ عَلَا ﴾، یانی: (تَكَبَّرَ و تَجَبَّرَ) واتە: خۆی بە زلگرت و ملهوڕیی کرد، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە هەستیکردوە، کە بەرزترە لە خەڵکی دیکە، بە شێوەیەک کە هیچ کەس نایگاتێ، ئەوان لە خوارێن و ئەو لە سەرێیە، ئنجا هەر ئەو هەستەی بووە، وایلێکردوە ئەو هەڵوێستەشی هەبێ، هەمیشە تەصەووڕی ئینسانە کە جۆری تەصەڕروفی دیاریی دەکات، کەسێک پێی وابێ: لە خەڵک بەرزترە، دیارە بە کردەوەش ئەگەر بۆی بگونجێ، خۆیان بەسەردا بەرز دەکاتەوەو فەرز دەکات، بەڵام کەسێک پێی وابێ: ئەخێر هەمووومان بەندەی خواین و پێکەوە براین و، دەبێ پێکەوە تەبا بین، ئەو هەستە وای لێ دەکات، خۆی بەسەر کەسدا هەڵنەکێشێ و، خۆی بەسەر کەسدا فەرز نەکات.

٢)- ﴿ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ﴾، واتە: فیرعەون خەڵکی ئەو سەر زەمینەی، کە سەر زەمینی میسرە، بەش بەشی کردن، (شِيَع) هەروەها (أشياع)یش هەردووکیان کۆی (شِيعَة)ن، واتە: (الجَمَاعَةُ الَّتِي تُشَيِّعُ غَيرَهَا مَا تُرِيد وتُتَابِعُهُ وَ تَنصُرُهُ)، (شِيَعَة) ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە لەگەڵ غەیرێکدا دەڕۆن و، بە دوای دەکەون و سەری دەخەن و پشتی دەگرن، لە ئەصڵدا ئەوە ماناکەیەتی بەڵام لێرەدا: ﴿ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ﴾، یانی: (وَجَعَلَ أَهلَهَا فِرَقاً، وطَوَائِفاً)، خەڵکەکەی کۆمەڵ کۆمەڵ و بەش بەش کردن.

٣)- ﴿ يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ ﴾، کۆمەڵێکیانی لێ دەچەوساندنەوە، کە ئەو کۆمەڵەی دەیچەوساندنەوە، بەنوو ئیسرائیل بوون، ڕۆڵەکانی یەعقووب ﷺ کە لەوێ زۆر بوو بوون و بووبوونە نەتەوەیەک، چی لێ دەکردن و، چۆنی دەچەوساندنەوەو، چۆن بێهێزی دەکردن؟!.

٤)- ﴿ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ﴾، کوڕەکانی سەردەبڕین و ئافرەتەکانی دەهێشتنەوە، کوڕەکانی سەردەبڕین، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پیاو زیاتر هێز و پێز و، توانای ڕووبەڕوو بوونەوەو یاخیی بوون و شۆڕشکردنی هەیە، پیاوان سروشتیان بە لای زبریی و ستەم قبووڵ نەکردن دایە، بەڵام ئافرەتان زیاتر سروشتیان بە لای نەرمیی و خۆگونجاندن دایە، خوا ﷻ وای خوڵقاندوون و هەر کامێکیان سروشتێکی جیا لەوی دیکەی پێداوە، کە بە هەردووکیان یەکدی تەواو دەکەن، چونکە ژیان هەم پێویستیی بە نەرم و نیانیی هەیە، هەم پێویستیی بە زبریی و توندییش هەیە، ئنجا زبریی و توندییەکە، لە پیاواندا پتر بەرجەستەیەو، نەرم و نیانیی و میهرەبانییش زیاتر لە ئافرەتاندا، ژیانیش پێویستیی بە هەردووکیان هەیە.

﴿ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ﴾، (أي: يَستَبقِي حَيَاةَ الإِنَاثِ مِنَ الأَطفَالِ، فَأُطلِقَ عَلَيهِم إِسمَ النِّسَاء بِاعتِبَارِ المَآلِ وَالهَدَفِ المَنشُود)، واتە: ژیانی مێینەکانی دەهێشتەوە لە منداڵەکانیان، بەڵام بۆچی فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ﴾، کە جارێ نەبوونە ئافرەتی گەورە؟! واتە: کچەکانی دەهێشتنەوە بە مەلۆتکەیی، سەری نەدەبڕین، ئەوە ڕەچاو کراوە کە دوایی ئەو کچە گچکانە، ئەو مەلۆتکە گچکانە، کە فیرعەون دەیانهێڵێتەوەو سەریان نابڕێ، دوایی دەبنە ئافرەتی گەورە، بە ئیعتیباری داهاتووەکەیان ئەو ناوەی لێ هەڵداون، چونکە هەر بە گچکەیی وەک پێشتر باسمان کرد، ئافرەتانی بەنوو ئیسرائیل کە منداڵیان دەبوو، کۆرپەیان دەبوو، فیرعەون کەسانێکی تەرخان کردبوون، لە مامانان کە تەماشا بکەن! هەر ئافرەتێکی ئیسرائیلیی منداڵی بوو، ئەگەر کوڕ بوو، یەکسەر سەری ببڕن و، ئەگەر کچ بوو، لێیگەڕێن و بیهێڵنەوە.

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، بە دڵنیایی فیرعەون لە تێکدەران بوو، لە خراپەکاران بوو.

## کورتە باسێک: دە (١٠) هەڵوەستەی گرنگ لەبەردەم ئەو چوار ئایەتەی سەرەتای (القصص)دا

١- وشەی (**فرعون**) نازناوی پادشاکانی میسر بووە، وەنەبێ فیرعەون ناوی تایبەتیی کەسێکی دیارییکراو بێ، ئنجا ئەو فیرعەونەی لە سەردەمی پێش لە دایک بوونی مووسادا ﷺ ئەو سیاسەتەی پەیڕەو دەکرد، کە کوڕەکانی بەنوو ئیسرائیلی سەردەبڕی و کچەکانی دەهێشتنەوە: ڕەعەمسیسی دووەم (**رَعَمسيس الثَّاني**) بووە، کە بە پێی ئەوەی (**مُحَمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: ئەو کاتە سنووری وڵاتی (**رَعَمسيس الثَّاني**) هەموو وڵاتی میسر بووەو، وڵاتی هیندیش تا دەگاتە ڕووباری (کەنەک) لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هەروەها تاکو دەگاتەوە ڕووباری (**طُونة**) لە ئەورووپا، بەو پێیە بێ، هەموو ئەو ناوچەیەی کە ئێستا ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی پێ دەڵێن و، بەشێک لە ڕۆژئاواشی گرتۆتەوە، هەڵبەتە ئەوە (**مُحَمد الطاهر بنُ عاشور**) وا دەڵێ، ئەگەرنا بە پێی زانیاریی من، دەستەڵاتی فیرعەونەکانی میسر، هیچ کامیان لە سنووری وڵاتی میسر نەچۆتە دەرێ، بەڵام ئەویش دەبێ سەرچاوەیەکی هەبێ پشتی پێ بەستبێ، حوکمڕانەکانی میسریش نازناوی پادشایەتییەکەیان بریتی بووە لە (فیرعەون)، وەک چۆن ئێستا هەموو ئەو کەسانەی بۆ وێنە لە عێراق دەستەڵاتی یەکەمیان دەبێ، پێیان دەگوترێ: (سەرۆک کۆمار) ئەوی دیکە (سەرۆک وەزیران)، هەروەها لە وڵاتە ئەورووپاییەکان دەڵێن: (پرێزیدێنت)، لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە هەر وڵاتێک بە پێی زمانی خۆیان نازناوێکی هەیە، ئەوانیش، پادشاکانی میسر، نازناوی پادشایەتییان فیرعەون بووە، ئنجا (**محمد الطاهر**) دەڵێ: (**رَعَمسيس الثَّاني**) وڵاتەکەی دابەش کردبوو بۆ سی و شەش (٣٦) ناوچە، دەڤەر، (**إيالة**)، ئنجا لە هەر ناوچەو دەڤەرێک جێگرێکی خۆی حوکمڕان بووە، وەک پارێزگار.

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج٢٠، ص٦٧.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، (أَي: قَهَرَ النَّاسَ وَ أَذَلَّهُم وَ تَرَفَّعَ عَلَيهِم وَاضطَهَدَ الجَمِيعَ بِالإِدِّعائاتِ الفَارِغَة)، واتە: خەڵکەکەی زەبوون کردوە، ملی پێ کەچ کردوون، خۆی بەسەردا فەرز کردوون و سەپاندوون، هەمووی چەوساندوونەوە بەو لاف لێدانە بۆشانەی کە هەیبوون، گوتوویەتی: ﴿ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾، النّازِعات، ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴿٣٨﴾ ﴾، ئەو لاف لێدانە بۆشانەی بوون و، ئەو خەڵکەی ئاوا چەوساندوونەوە، خەڵکەکەی میسریشی هەر چەوساندۆتەوە، وەنەبێ بەس بەنوو ئیسرائیلییەکان، بەڵام گەلی بەنوو ئیسرائیلی وەک کۆیلە تەماشا کردوەو، نێرینەکانی سەربڕیون و مێینەکانی هێشتوونەوە، ئەگەرنا خەڵکی میسریشی هەموویان وەک کۆیلەو بە پەرستەر(عابد)ی خۆی داناون و، خۆی بە پەروەردگارو پەرستراویان داناوە.

بۆ وێنە: لە تەفسیری نموونە[1]دا هاتوە، کە ئەویش پشت بە کۆمەڵێک سەرچاوەی مێژوویی دەبەستێ، ئەو هەرەمی خۆفۆ، (خۆفۆ ناوی یەکێک بووە لە فیرعەونەکان)، کە هەرەمی خۆفۆ گەورەترین هەرەمە لە میسر، لە ماوەی بیست (٢٠)ساڵدا دروست کراوە، بە شان و پشتی (١٠٠،٠٠٠) کۆیلە بە سۆغرە و بێگار، کە بە تەئکید لەو سەد هەزارە، لانی کەم بەسەدانیان لەو کارە قورسەدا مردوون، ئنجا ئایا ئەو (١٠٠،٠٠٠) کۆیلەیە هەموویان لە بەنوو ئیسرائیل بوون، لە غەیری بەنوو ئیسرائیل بوون و خەڵکی دیکە بوون؟ گرنگ ئەوەیە ئا بەو شێوەیە ئەوانە خۆیان فەرز کردوەو، خەڵکیان بەو شێوەیە بەکارهێناوە.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ﴾، فیرعەون بەو شێوەیە خەڵکەکەی دابڕ دابڕو بەش بەش کردوەو لەنێو یەکدا بەریداونە یەکدی، هەندێکی بە هەندێکیان داداون، وەک سیاسەتە پێشینەکەی ئینگلیز: (پەرت بکە و زاڵ بە)، خەڵکەکە بەش بەش بکە، ئنجا حوکمڕانییان بەسەردا بکە، حوکمڕانە خۆسەپێنەکان وا دەکەن، بەڵام حوکمڕانی صاڵح و چاک، هەمیشە دەیەوێ خەڵک پێکەوە تەبا بێ و ڕێک بێ، ڕێزی یەکدی بگرن، شیرو تیر لە یەکدی نەسوون، سەنگەر لە یەکدی نەگرن، چونکە هەمیشە کەسێک ئامانجی

---

(١) ج١٦، ص١٢.

باشی هەبێ، بۆی بە دوای ئامرازی باشیشدا دەگەڕێ، بەڵام کەسێک ئامانجی خراپ بێ، ئامانجە خراپەکەی پەلکێشی دەکات بۆ ئامرازی خراپ و شێوازی خراپ، وەک لە کتێبی: (گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا) لەو بارەوە قسەم کردوە، هەروەها لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا لەو بارەوە بە تەفصیل قسەم کردوە، کە هەموو ئەوانەی بیانەوێ حوکمڕانییەکی ڕەشید بکەن، بەسەر خەڵک و وڵاتدا، دەشخەفتێن لە شێوازی چاک، لە ئامرازی چاک، لە خەڵکی چاک، بەڵام کەسێک بیەوێ خۆی بسەپێنێ و، خەڵک بچەوسێنێتەوەو، خۆی بەسەر خەڵکدا فەرز بکات، دیارە دەبێ شێواز و ئامرازێکی واش بەکاربێنێ، کە لەگەڵ ئەو ئامانجە ناشەرعییانەدا بگونجێ.

٤- کە دەفەرموێ: ﴿يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ﴾، بە دڵنیایی مەبەست پێی گەلی مووسایە ، کە بەنوو ئیسرائیلن، ڕۆڵەکانی یەعقووب  کە لەوێ زۆربوون، دوای ئەوەی یەعقووب و دوازدە کوڕەکەی، یوسوف و بنیامین و دە (١٠) برایەکانی دیکەیان لە میسر نیشتەجێ دەبن، زاووزێ دەکەن و زۆر دەبن و دەبنە ئەتەوەیەک، مەبەست پێی ئەوانە، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: ﴿يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ﴾؟ بۆچی نافەرموێ: (يَستَضعِفُ بَنِي إسرَائِيلَ)؟ پێم وایە لەبەر دوو هۆیان:

یەک: تاکو بزانرێ کە ئەو گەلی بەنوو ئیسرائیلە، بوونە بەشێک لە کۆمەڵگای میسر، ئەو کاتە، میوان و غەریب نەبوون، بە لای کەمەوە لەو کاتەوە کە لە سەردەمی یەعقووب  نیشتەجێ بوون، تاکو ئەو کاتەی کە مووسا  لە دایک دەبێ (٤٠٠ - ٥٠٠) ساڵی پێچووە، ئنجا (٤٠٠ - ٥٠٠) ساڵ کەسێک لە شوێنێک بێ، هەشت نۆ پشتی لەوێ بڕاونەوە، مانای وایە بوونە بەشێک لە خەڵکی میسر، کەواتە: ﴿يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ﴾، یانی: لە خەڵکی میسر کۆمەڵێکیانی دەچەوساندەوە، کە هەر خەڵکی میسرن.

دوو: بۆیە دەفەرموێ: ﴿يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ﴾، تاکو بزانرێ کە عیبرەت بە ناوەڕۆکە، نەک بە جۆر، داخۆ کێن؟ گرنگ ئەوەیە خەڵکێکن، کۆمەڵە خەڵکێکی میسرن و دەچەوسێترێنەوە، ئنجا ئەگەر ناوەکەیانی هێنابایە، واتە: لەبەر ئەوەی کە

نەوانن! بەڵام نا، کۆمەڵە خەڵکێک بوون، هەر کەسێک بن، بەنوو ئیسرائیلیش نەبن بچەوسێنرێنەوە، هەر خراپە، نەک لەبەر ئەوەی بەنوو ئیسرائیلن، ئەگەر بچەوسێنرێنەوە باشە، ئەگەر خەڵکێکی دیکە بێ، خراپە، نا، هەر کەسێک بچەوسێنرێتەوە، هەر خراپە، بۆیە خوا ﷻ ناوەکەیانی نەهێناوە، گرنگ ئەوەیە پێکهاتەیەکن، کۆمەڵە خەڵکێکن، کۆمەڵە مرۆڤێکن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿يَسْتَضْعِفُ﴾، (أَي: يَجْعَلُهُم ضُعَفَاء)، (إِستِضْعَاف) یانی: (طَلَبُ الضُّعْف)، واتە: داواکردنی بێهێزیی، بێهێزکردن، یانی: لە خۆیاندا بێهێز نەبوون، بەڵام بێهێزکراون، بێهێز و پێزکراون و چەوسێنراونەوە.

٥- کە دەفەرموێ: ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ﴾، کوڕەکانیانی سەردەبڕین، لە سوورەتی (الأعراف) دا دەفەرموێ: ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ﴿١٤١﴾﴾، واتە: کوڕەکانتانیان دەکوشت، نافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە، کەواتە: مەرج نیە تەنیا شێوەی سەربڕین، تاکە شێوەی کوشتنی منداڵە کوڕەکان بووبێ، بەڵکو بە جۆری دیکەش کوشتوویانن، وەک پێشتر لە پەیمانی کۆنەوە هێنامان، کە فیرعەون فەرمان دەکات دەڵێ: بیانخەنە ڕووباری نیلەوە، با بخنکێن، ڕەنگە شێوەی دیکەشیان بووبێ، ئنجا لە زۆربەی شوێنەکان دەفەرموێ: ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ ﴿١٤١﴾﴾، ﴿يُقَتِّلُونَ﴾ یانی: زۆریان دەکوژن، بۆ ئەوەی هەم سەربڕینیش و، هەم غەیری سەربڕینیش بگرێتەوە.

٦- کە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ﴾، واتە: ئافرەتەکانی دەهێشتنەوە، یانی: هەر تەنیا بە زیندوویی دەیانهێشتنەوە، تەنیا ژیانیان لەبەردا هەبوو، وەک بووکە شوشەیەک، کە یاریی پێ دەکرێ، بۆ ڕابواردن دەیانهێشتنەوە.

٧- لە نۆ شوێن دا باسکرانی ئازارو ئەشکەنجەدرانی بەنوو ئیسرائیل لە لایەن فیرعەونەوە:

شایانی باسە: باسکرانی سزا و ئەشکەنجەی فیرعەون بۆ گەلی مووسا ﷺ، ئەوەندەی سەرنجم داوە، بە لای کەمەوە لە نۆ (٩) شوێندا هاتووە، لە نۆ

سـوورەت لـە سـوورەتەکانی قورئانـدا، تەنیـا ئامـاژە بـە ئایەتـەکان دەدەیـن، چونکـە زۆربـەی ئـەو شـوێنانە ئێمـە کاتـی خـۆی لـە بەرگەکانـی ئـەم تەفسـیرەدا، تەفسـیری (قورئانـی بـەرزو بـە پێـز) تەفسـیرمان کـردووە:

١)- لە سوورەتی (البقرة)دا: ﴿ وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ ﴾.

٢)- لە سوورەتی (الأعراف)دا: ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ﴾.

٣)- لە سوورەتی (إبراهيم)دا: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾.

٤)- لە سوورەتی (طه)دا: ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَىٰ ﴿٤٧﴾ ﴾.

٥)- لە سوورەتی (المؤمنون)دا: ﴿ فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

٦)- لە سوورەتی (الشعراء)دا: ﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

٧)- لە سوورەتی (القصص)دا: ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾.

٨)- لە سوورەتی (غافر)دا: ﴿ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿٢٥﴾ ﴾.

٩)- له سووڕەتی (الدخان)دا: ﴿ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾.

لەم نۆ شوێنەدا، ئاماژە کراوە بە سزا و ئەشکەنجەی فیرعەون، بۆ گەلی مووسا عليه السلام.

**٨- ئایا هۆکاری ئەوە چی بووە، فیرعەون بەو شێوەیەی لە بەنوو ئیسرائیل کردوە؟**

زانایان چەند هۆکارێکیان باسکردووون:

١- یەکێک لە کاهینەکان خەونێکی بینیوە، کە منداڵێکی بەنوو ئیسرائیلیی کۆتایی بە حوکمڕانیی فیرعەون و قیبتییەکان، گەلی فیرعەون، دێنێ.

٢- بەنوو ئیسرائیل لەسەر ئایینی ئیبراهیمی خەلیل بوونەو، ئامادە نەبوون وەک فرعەون بتپەرست بن، یان فیرعەون بپەرستن.

٣- بەنوو ئیسرائیل کاتی خۆی کە یوسف عليه السلام خراوەتە چاڵەوە، لە لایەن برایەکانیەوەو، دوایی دەرهێنراوە و، کراوەتە کۆیلە و فرۆشراوەو، لە سجن دا بووە، ئەو کاتە پادشا شوانەکان (مُلوك الرُّعاة) حوکمڕانیی میسریان کردوەو، پێیان گوتراوە: (الهَكسُوس)، ئنجا کاتێک کە حوکمی فیرعەونیی گەڕاوەتەوە، بەنوو ئیسرائیلیان چەوساندۆتەوەو گوتوویانە: ئێوە لەگەڵ حوکمڕانەکانی پێش ئێمەدا بوون، کە ئەو کاتە ماوەی دوو سەد (٢٠٠) ساڵێک - وەک کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (یوسف)دا بە تەفصیلْ باسمان کردوە - پادشا شوانکارەکان (مُلوك الرُّعاة) لە هەکسۆس کە خەڵکێکی دیکەی نامۆ بوون، هاتوون حوکمیان بەسەر میسڕدا کردوەو، میسڕیان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، بەنوو ئیسرائیلیش دیارە لەگەڵ ئەواندا بوون کە حوکمڕانی وڵات بوون، ئنجا کە حوکمی فیرعەونەکان گەڕاوەتەوە، لەسەر ئەوە سزایان داون، گوتوویانە: ئێوە لەگەڵ نەیارەکانی ئێمەدا بوون.

٤- لە تەفسیرەکاندا دەڵێن: فیرعەون خەونی بینی ئاگرێک لە (بَيتُ المَقدِس) لە فەڵەستینەوە هات، ڕووی لە میسڕ کردو، تەنیا قیبتییەکانی میسڕی دەکوشت، بەڵام

بەنوو ئیسرائیلی ئازار نەدەدا، کاتێک ئەو خەونەیان بۆ تەعبیر کرد، گوتیان: لەو وڵاتەوە، یانی: لەو شوێنەوە کە دوایی بەنوو ئیسرائیلی لێ نیشتەجێ دەبن، یەکێک دێ کۆتایی بە موڵک و دەسەڵاتی تۆ دێنێ[1].

٩- لەسەر چۆنیەتیی سەربڕینی فیرعەون بۆ کوڕەکانی بەنوو ئیسرائیل، سێ ڕا هەن:

ڕای یەکەم: دەڵێ: ساڵێکی دیاریکراو بووە، ئەو ساڵەی مووسای تێدا لە دایک بووەو، تەنیا لەو ساڵەدا کوڕەکانی سەربڕیون، ئەگەرنا کۆتاییان پێ دەهات.

ڕای دووەم: دەڵێ: نەخێر، ساڵێک سەری دەبڕین وساڵێک وازی لێ دەهێنان، بۆ وێنە: خەونەکەیان وا بینیوە، ساڵی جووت بووە، یان ساڵی تاک بووە، ئنجا ئەو ساڵە کە خەونی پێوە بینراوە، تێیدا سەریان بڕیون و، لە ساڵەکەی دیکەدا لێیان گەڕاون، مووساش ﷺ لەو ساڵەدا لە دایک بووە، کە بڕیار بووە کوڕە نێرینەکان سەرببڕێن، بەڵام هاڕوون لەو ساڵەدا لە دایک بووە، کە بڕیار بووە سەرنەبڕدرێن، بۆیە هاڕوون بەجێهێڵراوە، بەڵام مووسا لە ترسی سەربڕان، دایکی خستوویەتە نێو سندووقێک و بە ڕووباری نیلی داداوە، بە ئیلهامێک کە خوا بۆی کردوە.

ڕای سێیەم: کە زۆر بەجێیە، دەڵێ: ئەو پرۆسە دڕندانەیە دوای ئەوە بووە کە فیرعەون ئەو خەونەی بینیوە، یاخود کاهینێک ئەو خەونەی بینیوەو پێشتر وانەبووە، ئەگەرنا کۆتاییان پێدەهات.

١٠- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾، واتە: بە ڕاستیی ئەو (فیرعەون) لە تێکدەران بوو، ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین فیرعەون، پێنج جۆرە تێکدان و خراپەکاریی هەبوون لە زەوییدا:

١)- خۆی بەرزکردۆتەوەو ملهوڕیی کردوە، کە ئەو ملهوڕیی و خۆبەزلگرییە، سەرچاوە و کانگای هەموو سیفەتە خراپەکانی دیکەی مرۆڤە، مرۆڤ کە خۆی بە زلگرت و خۆی

---

(١) جامع البيان للطبري: برقم: ٢٧ و ١١٨، مُرسَلًا.

فەرز کردو سەپاند، ئەو خۆبەزلگرییە دەبێتە زبڵدانی تێدا تروکانی گەرای کۆمەڵێک سیفەتی دیکەی خراپ و، کۆمەڵێک کارو کردەوەی زیانبەخش و بە زەرر.

٢)- ئەوە بووە کە خەڵکەکەی بەش بەش کردوە، هەندێکی بە هەندێکیان داداون، لە جیاتی ئەوەی کە هەوڵبدات کۆمەڵگایەکی تەبای پێکەوە گونجاو و رێک و پێک دروست بکات، هەوڵیداوە: خەڵکەکە بەگژ یەکدا بکات، بۆ ئەوەی پێکەوە سەرقاڵی یەکدی بن، ئەوەش یەکێکە لە عادەتی حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، کە خەڵک لە دژی یەکدی هان بدەن بۆ ئەوەی پێکەوە سەرقاڵ بن و، ئاگایان لە حوکمڕانە ستەمکارەکە نەمێنێ.

٣)- کۆمەڵە خەڵکێکی وڵاتەکەی چەوساندۆتەوە، کە وەک گوتمان: مەبەست پێیان بەنوو ئیسرائیلە، کە چوار سەد (٤٠٠) ساڵ پێشتر لە میسر نیشتەجێ بوو بوون، لە ناوچەی جاسان، وەک لە پەیمانی کۆندا هاتوەو پێشتر باسمان کردوە.

٤)- ئەوە بووە کە کوڕەکانی سەربڕیون، چونکە کوڕان پیاوان لە هەموو نەتەوەکاندا بە درێژایی هەموو مێژووی بەشەر، زیاتر هێزی بەرگرییکارو شۆڕشگێڕو خەباتگێڕن، خوا ﷻ حاڵەتی زبریی و توندیی و پتەویی و غیرەت و ئازایەتیی، لە پیاواندا خوڵقاندوەو، کۆمەڵە سیفەتێکی دیکەی بە ئافرەت داون، کە ئەرکە سروشتییەکەی کە بریتیە لە دایکایەتیی و منداڵ بەخێوکردن و، ماڵداریی و کابانداریی، ئەو ئەرکانەش، ئەو جۆرە سروشتە دەخوازن، کە نەرم و نیانیی و میهرەبانیی و ڕەحم و عەتف و سۆزە.

٥)- پێنجەم شێواز لە تێکدان خراپەکاریی فیرعەون ئەوە بووە: ﴿ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ ﴾، ئافرەتەکانی دەهێشتنەوە بە زیندوویی، واتە: کۆرپە مێینەکانی دەهێشتنەوە، تاکو ببنە ئافرەت و سەرەنجام ئەو ئامانجانەیان پێ بهێندرێنە دی، کە بە ئافرەتان دەهێندرێنە دی!

کەواتە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾، فیرعەون ئەم پێنج جۆرە خراپەکاریی و تێکدانەی بوون، لە وڵاتی میسردا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ویستی خوایە کە چەوسێنراوان ڕزگار بکات و بیانکاتە حوکمڕان و میراتگری ستەمکاران و، باڵادەستیان بکات لە زەوییداو، ئەوەی حوکمڕانە خۆسەپێن و هاوکارەکانیان بیمیان لێی هەیە، پێشانیان بدات، لە لایەن چەوسێنراوانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە پێنج بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دەشمانەوێ، چاکە بکەین لەگەڵ ئەوانەدا کە لە زەوییدا چەوسێنراونەوە.**

(و) بۆ گێڕانەوە (عطف)یەو، ڕستەکە دەگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشێ، کە پێشێ باسی چەوساندنەوەی فیرعەون و دارو دەستەکەی کرد بۆ گەلی ستەمدیدەی بەنوو ئیسرائیل، واتە: فیرعەون ئاوا دەکات و بەو شێوەیە دەیویست بیگوزەرێنێ، حوکمڕانیی بکات، ئەو وای دەکرد، بەڵام ئێمەش دەمانەوێ چاکە بکەین لەگەڵ ئەوانەدا کە لە زەوییدا چەوسێنراونەوە.

بێگومان (أل)ی (الأرض) بۆ (عهد)ەو مەبەست لە: ﴿ ٱلْأَرْضِ ﴾، سەر زەمینی میسرە، ئەوەی کە لە ژێر ڕکێفی حوکمڕانیی فیرعەون دا بووە، بە نسبەت ڕواڵەتی ئایەتەکەوە، بەڵام ئەو ئایەتە وێڕای ئەوەی باسی واقیعێکی دیاریکراو دەکات، کە گرفتاربوونی بەنوو ئیسرائیلە بە دەست فیرعەون و هامان و داروودەستەکەیانەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەش: خوا باسی یاسایەکی بەردەوام و گەردوونیی خۆیشی دەکات لە ژیانی بەشەردا، ئەویش ئەوەیە: ویستی خوا،

ویستی دادگەرانە و کاربەجێیانەی خوا ﷻ لە پشت چەوسێندراوان و مافخوراوان و ماف پێشێلکراوانەوەیەو، لە دژی ستەمکاران و خۆسەپێنانە، هەر بۆیەش خوا ﷻ نەیفەرمووە: (وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيل)، دەمانەوێ چاکە لەگەڵ بەنوو ئیسرائیل دا بکەین، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها نەشیفەرمووە: (الذين استُضعِفوا في مصر)، ئەوانەی لە میسردا چەوسێنراونەوە، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەوانەی لە زەویدا چەوسێنراونەوە، ئنجا ئاوایە کە خوا ﷻ وایکردوە: فەرمایشتەکەی چەمک و واتایەکەی زۆر فراوان بێ، ئێستا ئەگەر فەرمووبای: (وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيل الَّذِينَ استُضعِفوا في مصر).

ئەو کاتە چەمک و واتایەکەی قەتیس دەما، لە شوێن و کات و خەڵکێکی دیاریکراودا، هەرچەندە خوا ﷻ باسی بەنوو ئیسرائیلی چەوسێندراوە دەکات بە دەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی، بەڵام فەرمایشتەکە وا داڕێژراوە، کە ببێتە یاسایەکی گشتیی، هەڵبەتە ئێمە دوایی باس دەکەین، کە ئەو منەت کردنەی خوای پەروەردگار چۆن بووە لەسەر بەنوو ئیسرائیل؟ بەڵام وشەی (مَنّ) (المَنُّ: الإنعَامُ)، واتە: چاکە لەگەڵدا کردن، دەگوترێ: (مَنَّ يَمُنُّ مَنًّا)، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ ﴾، کە بە (فعل المُضَارِع) هێناویەتی، بۆ خستنە بەرچاوی دیمەنەکەیە، بۆچی خوا نەیفەرمووە: (وَ أَرَدنَا أَن نَّمُنَّ)، کاتێک کە قورئان دابەزیوە، بە لای کەمەوە دەوری (٢٥٠٠) ساڵ بووە فیرعەون ئەوەی کردوە بە بەنوو ئیسرائیل و، ئەوە کە خوا ﷻ چاکەی لەگەڵ ئەو چەوسێنراوانەدا کردوەو دەربازی کردوون، تێپەڕیوە، بەڵام، خوای کاربەجێ:

أ- دەیەوێ دیمەنەکە بخاتە بەرچاوو ئێوەی ڕابمێنین.

ب- دەیەوێ ئەوە وەک یاسایەکی خۆی، کە بەردەوامیی هەیەو شتێک نیە تێپەڕیبێ و ڕابردبێ، بەڵکو بەردەوامیی هەیە وەک یاسایەکی خوا ﷻ (كَسُنَّةٍ مِنْ سُنَنِ اللهِ فِي حَيَاةِ البَشَر) وەک یاسایەک لە یاساکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا.

٢)- ﴿ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً ﴾، دەمانەوێ بشیانکەینە پێشەواو حوکمڕان، یانی: (وَنُرِيدُ أَن نَجْعَلَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَئِمَّةً)، دەمانەوێ ئەوانەی چەوسێنراونەوە بکەینە پێشەوایان، ﴿ أَئِمَّةً ﴾، کۆی (إمَام)ە، پێشەوا، کە مەبەست پێی حوکمڕان و، کەسێکە غەیری خۆی لە ژێر چاودێریی دابێ، بەڵام نەیفەرمووە: (وَ نَجْعَلَهُم حُكَّامَاً)، چونکە مەرج نیە هەرچی حوکمڕان بوو، باش بێ، بەڵام هەر کەسێک پێشەوا (إمام) بێ، باشە، دەمانەوێ بیانکەینە پێشەوا، واتە: خەڵک چاویان لێبکات و، وابن خەڵک بیانکانە پێشەنگ و سەرمەشقی خۆی لە چاکەدا.

٣)- ﴿ وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴾، هەروەها بشیانکێڕین بە میراتگران، واتە: لە شوێنی ئەو حوکمڕانە ستەمکارانەی کە زوڵمیان لێدەکەن، ئەوجارە ئەوان حوکمڕان و باڵادەست بن.

٤)- ﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾، هەروەها لە زەوییدا دەستڕۆیشتوویان بکەین.

کە بە پلەی یەکەم مەبەست سەرزەمینی میسرە، یانی دەستڕۆیشتوویان بکەین و بیانکەینە خاوەن ئیمکانیەت و پێگە، لە سەرزەمینی میسردا، یاخود سەرزەمینێکی وەک هی میسردا، کە مەبەست پێی (شام)ە، چونکە بەنوو ئیسرائیل دوای ئەوەی لە چەنگی فیرعەون ڕزگاریان بووە، نەگەڕاونەوە بۆ میسر، بۆیە زانایان گوتوویانە: ﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ ﴾، خوا وشەی زەویی ﴿ الْأَرْضِ ﴾ی بە گشتیی هێناوە: لە زەوییدا، بەڵکو کە دەشفەرموێ: ﴿ وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴾، بیانکەینە میراتگران، مەرج نیە تەنیا ئەوەی فیرعەون و دارو دەستەکەی بەجێی دێڵن، بە میراتی بگرن، واتە: شوێنێکیان پێ بدەین، وەک ئەوەی کە لە بەردەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی دا بووە، بەو شێوەیە بێ، کە لە شام بووە.

ئنجا چیدیکەشیان بۆ بکەین؟

٥)- ﴿ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ ﴾، هەروەها پێشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بدەین، لە لایەن ئەوانەوە، [لەلایەن

چەوسێنراوانەوە، ڕاناوی (منهم) بۆ (مُستَضعَفِين) دەچێتەوە]. ﴿ مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾، ئەوەی کە بیمیان لێی هەبوو، لێی دەترسان، کە بریتی بوو لەوەی حوکمڕانییان نەمێنێ، بە هۆی پیاوێک لەوانەوە کە لێیان هەڵدەکەوێ، کە مووسایە ﷺ، وەک فیرعەون یاخود یەکێک لە کاهینەکانی خەونی بینیبوو، وشەی: ﴿ وَنُرِىَ ﴾، بە (وَيَرَى)ش خوێنراوەتەوە: (وَيَرَى فِرْعَوْنُ وَهَامَانُ وَجُنُودُهُمَا مَّا كَانُوا يَحذَرُون)، ئنجا ئەگەر: ﴿ وَنُرِىَ ﴾، بێ (فرعون) دەبێتە بەرکار (مَفعُول بِهِ)، بەڵام ئەگەر بە (وَيَرَى) بخوێندرێتەوە: (وَيَرَى فِرعَونُ وَ هَامانُ وَجُنُودُهُمَا) ئەو کاتە یانی: فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان ببینن، واتە: (فِرعَونُ وَهَامانُ وَجُنُودُهُمَا)، دەبنە بکەر (فاعل)ی (يَرى)، (مِنهُم: أي مِنْ قِبَلِهِم، مِنْ طَرَفِ المُستَضعَفِين)، لە لایەن چەوسێنراوەکانەوە، ئەوە ببینن: ﴿ مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾، ئەمە پەیوەست (صلة)ەکەی قرتێندراوە، یانی: (مَاكَانوا يَحذَرُونَهُ، الَّذي كَانوا يَحذَرُونَهُ)، ئەوەی کە بیمیان لێی هەبوو، کە بریتی بوو لەوەی جێیان پێ لەق بکەن و کۆتایی بە ستەم و زۆردارییان بێنن، (الحَذَرُ: إحتِرَازٌ مِن مُخِيفٍ)، (حَذَر) بریتیە لە خۆپاراستن لە شتێکی ترسێنەر، شتێکی ترسناک.

## چوار نیعمەت و چاکەی گەورەی خوا
## بۆ گەلی چەوساوەی مووسا عليه السلام

لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دەشمانەوێ کە چاکە بکەین و منەت بکەین لەسەر ئەو کەسانەی کە لە زەمیندا دەچەوسێنرانەوە، لە ئەصڵدا مەبەست لە چەوسێندراوان، بەنوو ئیسرائیلەو، مەبەستیش لە: ﴿ ٱلْأَرْضِ ﴾، سەرزەمینی میسرە، بەڵام خوا ﷻ تەعبیرەکەی وا دارشتوە، کە بشێ وەک یاسایەکی گشتیی خوا لە ژیانی بەشەردا بەرجەستە ببێ: ئەوە ویستی خوایە لە پشت چەوسێنراوانەوە لە زەویدا، کە سەریان بخات و، لەگەڵیان بێ و، مشووریان لێ بخوات و، پشتیان بگرێ و، سەرەنجام دەربازیان بکات لەو واقیعە دژوارەی تێیدان و، توانایان پێبدات لە زەوییدا بیانکاتە میراتگرو پێشەواو، پێشانی دوژمنەکانیشیان بدات، ئەوەی کە بیم و ترسیان لێی هەیە لەلایەن ئەوانەوە.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دوایی چوار شتان دەخاتە روو و، ئەو منەت و چاکەیەی خوا لەگەڵ بەنوو ئیسرائیلدا، لەو چوار شتانەدا بەرجەستە دەبێ:

١- ﴿ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً ﴾، بیانکەینە پێشەوا، بیانکەینە ئیمام و سەرکردە، کە مەبەست پێی ئیمام و پێشەوایە لە خێرو چاکەدا، ئەگەرنا وشەی: ﴿ أَئِمَّةً ﴾، بۆ کەسانێکیش بەکارهاتوە، هەر لە قورئاندا، کە خەڵک بەرەو کوفر بانگ دەکەن، خەڵک بەرەو دۆزەخ بانگ دەکەن: ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾القصص - ٤١ -، کە هەر لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

ئنجا ئایا ئەمە کاتێ خۆی لە ژیانی بەنوو ئیسرائیلدا هاتە دی؟ بەڵێ. ئەوە بوو کە دوای ئەوەی لە فیرعەون و دارو دەستەکەی ڕزگاریان بوو و، لە دەریای سوور پەڕینەوە - کاتێ خۆی (بحر القلزم)یان پێگوتوە - دوای ئەوەی لەوێ پەڕینەوە، چوونە شام و، لەوێ خوای باڵا دەست ئەو بەڵێنەی پێیدا بوون، بۆی هێنانەدی.

هەڵبەتە پێشتر عینادیی و سەرەخەرییان کرد، بە قسەی مووسایان ﷺ نەکرد، وەک کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا باسمان کرد، بەڵام دوایی ئەوە بوو کە لەوێ نیشتەجێ بوون و، بوونە خاوەن قەوارەی سیاسیی و خاوەن دەوڵەت و نیمکانیەت، پێشتریش خوا ﷻ شەریعەتێکیشی بە مووسا ﷺدا بوو، کە لە تەوراتدا بەرجەستە بوو، ئنجا بەو تەوراتە: دروشمەکانی دینداریيان، هەروەها ژیانی ئابوورییان و ژیانی کۆمەڵایەتییان و ژیانی سیاسییان ڕێکخراو بوونە ئۆممەتێک، بوونە قەوارەیەکی سیاسیی تۆکمەو بەهێز.

٢- ﴿ وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾، هەروەها بیانکەینە میراتگر، یانی: جێگا و ڕێگەی کەسانێکی دیکەیان پێبدات، کە لێرەدا وشەی (إرث) خوازراوەو مەجازە بۆ ئەوە کە دەبنە جێنیشی کەسانی دیکە، کۆمەڵگا و خەڵکانی دیکە لە شام، وەک لە (پەیمانی کۆن) دا بە تەفصیلی باسکراوەو، مێژووش نووسیویەتی، کە ئەو کاتە لە شام چەند کۆمەڵگا و قەوارەیەکی دیکە هەبوون، کە هۆکارەکانی لە بەین چوون و بێهێزییان تێدا پەیدابوون و، بەنوو ئیسرائیلیش ئۆممەتێکی تازە پێگەیشتوو و، خاوەن شەریعەتێکی خوایی، بوون و، بەهێزترو شایستەتر بوون و، شوێنی ئەو میللەتانەی دیکەیان گرتۆتەوە لە شام، بەپێی یاسای خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾الأنبياء، لە دوای زیکر لە زەبووردا نووسیومانە: بەندە چاکەکانم سەر زەوی بە میرات دەگرن، ئەوانەی کە شایستەن، ئەو کاتەش بەنوو ئیسرائیل لە هەموو کۆمەڵگاکانی دیکەی سەر زەوی شایستەتر بوون، وەک دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾البقرة،

خوا بەسەر هەموو جیهانییاندا هەڵیبژاردوون، ئەو کاتە بەنوو ئیسرائیل لەگەڵ کەم و کورییەکانیشیاندا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەهلی تەوحید بوون و، شوێنکەوتووی پێغەمبەران (عليهم الصّلاةُ وَالسّلام)و، شوێنکەوتووی وەحیی بوون، بە گشتیی لە هەموو کۆمەڵگاکانی سەر ڕووی زەوی، هی ئەو کاتە باشتر بوون.

٣- ﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، بیانکەینە خاوەن تواناو دەستڕۆیشتوویان بکەین لە زەوییدا، کە مەبەست لە زەوی لێرەدا، سەر زەمینی شامە، (التّمكِينُ: جَعْلُ شَيْءٍ فِي مَكَانٍ، أَوْ جَعْلُ شَخْصٍ ذَا مَكَانَةٍ)، (تمكين) دانانی شتێکە لە شوێنێک داو، توانایی و پێگە بەخشینە بە کەسێک، ئەوانیش پێیان چەسپا لە زەوییداو، بوونە خاوەن پێگە و قەوارەی سیاسیی خۆیان.

٤- ﴿ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾، هەروەها پیشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بدەین، لە لایەن ئەوانەوە، ئەوەی کە لێی دەترسان و بیمیان لێی هەبوو، کە هەر واشبوو بینیان، پێشەکییەکانیان بینی، چونکە بەڵێ فیرعەون و دارودەستەکەی خنکان، بەڵام گرنگ ئەوەیە پێشەکیی و زەمینە خۆشکردنەکانیان بینی، کە بەنوو ئیسرائیل دەرباز دەبن و، خۆشیان لە ئاودا دەخنکێن و لەبەین دەچن، ئنجا ئەگەر بە خوێندنەوەی دووەم بێ: (وَ يَرَى فِرعَونُ وَهَامانُ وَجُنُودُهُمَا منهُم مَا كَانُوا يَحْذَرُون)، واتە: فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان لەوانەوە ببینن، ئەوەی کە بیمیان لێی هەیە، کە لە واقیع دا ئەوەی مەترسییان لێی هەبوو، بەسەریان هات.

کەواتە: ئەوە یاسایەکی گشتیی خوایە ﷻ لە ژیانی بەشەردا، کە چەوسێنراوان دەرباز دەکات و، ستەمکاران و ملهوڕان و خۆسەپێنان، لەبەین دەبات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان حـەوت (٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٧ - ١٣)، ئـەم حـەوت ئایەتـە، قۆناغـی دووەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و فیرعەونیـان گرتۆتـە خۆیـان، کـە بریتیـە لـە ئیلهـام کردنـی خـوا ﷻ بـۆ دایکـی مووسـا ﷺ، کـە شـیری پـێ بـدات، دوای ئـەوەی مووسـای دەبـێ، لەسـەر قۆنـداغ بـووە و مەلۆتکـە بـووە، ئنجـا هـەر کاتێـک لێـی ترسـا بکـوژرێ و ئاشـکرا ببـێ، بیخاتـە تابووتێکـەوە، بیخاتـە صندووقێکـەوەو بـە ڕووبـاری نیلـی دابـدات و، دڵنیـاش بـێ کـە خـوا ﷻ دەیگێڕێتـەوە بـۆ لای و، دەشـیکاتە پێغەمبـەر، دوایـی ماڵـی فیرعـەون ئـەو تابووتـەی کـە مووسـای ﷺ مەلۆتکـەی تێدایـە، دەیگرنـەوەو، ژنـی فیرعـەون خـۆشی دەوێ و بەخێـوی دەکـەن.

دوای دڵتەنگیـی دایکیشـی خوشـکەکەی بـە دوادا دەنێـرێ و، سـەرەنجام مووسـای مەلۆتکـە دەگێڕرێتـەوە بـۆ لای دایکـی بـۆ شـیر پێـدان و، بـە خێوکردنـی لـە لای خـۆی، بـەڵام لەسـەر مەسرەفـی ماڵـی فیرعـەون!

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ

وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ فَقَالَتۡ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰٓ أَهۡلِ بَيۡتٖ يَكۡفُلُونَهُۥ لَكُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدۡنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيۡ تَقَرَّ عَيۡنُهَا وَلَا تَحۡزَنَ وَلِتَعۡلَمَ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (بە شێوەی خورپە)، سروشمان بۆ دایکی مووسا کرد کە شیری بدەیە، ئنجا هەر کات مەترسییت لێی بوو (بیکوژن)، (بیخە صندووقێکەوە) و، بە دەریا (ی نیل)ی دابدە و، مەترسێ و دڵتەنگ مەبە، ئێمە بۆ لاتی دەگێڕینەوەو، دەشیکەینە یەک لە ڕەوانەکراوان ﴿٧﴾ (دوای ئەوەی لە صندووقێکدا خستیە نیلەوە) یەکسەر شوێنکەوتووانی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، (کە سەرەنجام) لێیان ببێتە دوژمن و مایەی خەمباریی، بە دڵنیایی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان تاوانبارببوون ﴿٨﴾ (دوای ئەوەی ئەو تابووتەی مووسای تێدابوو، لە ڕووباری نیل دا گیرایەوە، ویستیان بیکوژن)، ئافرەتی فیرعەون گوتی: (ئەو کۆرپەیە) مایەی دڵخۆشیی منیش و تۆشە، مەیکوژن، بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێ (بە خزمەتکردنی)یان بیکەینە کوڕمان، نەشیاندەزانی (دوایی دەبێتە هۆکاری لەبەین چوونی فیرعەون و گەلەکەی) ﴿٩﴾ دایکی مووساش (هۆشی لەلا نەما، لە تاوی مووسا)، عەقڵی خاڵیی بوو (لە هەموو شتێک جگە لە یادی مووسا)، ئەگەر دڵیمان نە بەستبایە، (و بەهێزمان نەکردبایە) نیزیک بوو ئاشکرای بکات (بەڵام دڵیمان بەهێز کرد) تاکو لە بڕواداران (ی خۆڕاگر) بێ ﴿١٠﴾ (دایکی مووسا) بە خوشکەکەیشی (خوشکی مووسا)ی گوت: شوێنی بکەوە، (سۆراغی بکە چی لێ دێ؟)، ئەویش لە دوورەوە دیتی، بێ ئەوەی (فیرعەونییەکان) هەست بکەن ﴿١١﴾ پێشتریش (مژینی مەمکی) شیردەرەکانمان لێ قەدەغە کردبوو، (ئنجا کە

خوشـکەکەی دیتـی، مەمکـی هیـچ شـیردەرێک ناگـرێ) گوتـی: ئایـا خەڵکـی ماڵێکتـان پێشـان بـدەم، لـە حاڵێکـدا کـە بـۆی دڵسـۆزن، بەخێوکردنـی وەئەسـتۆ بگـرن؟ ﴿١٢﴾ ئیـدی سـەرەنجام (بـە هـۆی خوشـکەکەیەوە) گێڕامانـەوە بـۆ لای دایکـی، تاکـو چـاوی پێـی شـادو گـەش بـێ و دڵتەنـگ نەبـێ و، بشـزانێ کـە بەڵێنـی خـوا ڕاسـتە، بـەڵام (خەڵـک) زۆربەیـان (ئـەو ڕاسـتییە) نازانـن ﴿١٣﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( وَأَوْحَيْنَآ ): (أَصْلُ الوَحيِ: الإِشَارَةُ السَّرِيْعَـة)، وشـەی (وحـي) لـە ڕیشـەی زمانـدا بـە مانـای ئامـاژەی خێـرا دێ، لـە قورئانـدا بـە چەنـد مانایـەک هاتـوە:

١- بە مانای ئاماژە: وەک لە باسی زەکەریایدا ﵇ هاتوە، کە موژدەی یەحیای کوڕی پێ دەدرێ، دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُواْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾مريم، ئاماژەی بۆ کردن، کە بەیانیان و ئێواران (خوا) بە پاك بگرن.

٢-بە مانای خوتخوتەو وەسوەسە: وەک خوا ﷻ لە بارەی دنەدان و خوتخوتەی شەیتانەکانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعام.

٣- بە مانای ئیلهامی غەریزیی: وەک خوای پەنهانزان و پەنهانکار لە بارەی فێرکردنی هەنگەوە فەرموویەتی: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ﴿٦٨﴾ ﴾النحل.

٤- بە مانای ئەو پەیامە تایبەتییەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی دەنێرێ: ﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ﴿١٦٣﴾ ﴾النساء.

٥- بە مانای یاسا و بڕیاری خوا دێ، بۆ گەردوون، وەک خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ۝٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا لَهَا ۝٣ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ۝٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥﴾الزلزلة، پەروەردگارت وای پێ ڕاگەیاندوە و، یاسای بەو شێوەیە بۆ داناوە و، ئەو بڕیارەی بەسەردا چەسپاندوە.

(أَرْضِعِيهِ): شیری پێ بدە، (رَضَعَ المَوْلُودُ يَرْضِعُ، وَرَضَعَ يَرْضَعُ، رَضَاعاً وَرَضَاعَةً)، واتە: منداڵەکە مەمکی دایکی مژی، یان هی ئەو کەسەی کە شیری پێ دەدات، ئنجا هەم (رَضَعَ يَرْضَعُ)، هەم (رَضَعَ يَرْضِعُ) هەردووکیان هاتوون، (رضاعة) شیر پێدان.

(فَٱلْتَقَطَهُۥ) واتە: هەڵیانگرتەوە، (الإلتِقَاطُ: افْتِعَالٌ مِنَ اللَّقْطِ، وَهُوَ تَنَاوُلُ الشَّيءِ المُلْقَى فِي الأَرْضِ)، (التِقَاط) لەسەر کێشی (افْتِعَال)ە، لە (لَقْط)ەوە هاتوە، ئەویش بریتیە لەوەی شتێک لەسەر زەوی کەوتبێت، دەست بدرێتێ.

(خَـٰطِـِٔينَ): (خَطِأَ يَخْطِيءُ خِطأً وَخَطَأً: الخَطَأُ التَّامُّ المَأخُوذُ بِهِ الإِنْسَان)، (خَطِأَ يَخْطِيءُ خِطأً وَخَطَأً)، بریتیە لەو هەڵە و تاوانەی کە مرۆڤ بە ئەنقەست دەیکات و، لێپرسینەوە لەگەڵیدا دەکرێ، بەڵام (أَخْطَأَ يُخْطِيءُ خَطَأً)، (أَخْطَأَ) واتە: بە هەڵەدا چوو، هەڵەی کرد، بەڵام (خَطِيءَ) واتە: گوناهی کرد بە ئەنقەست کە دەشیزانی گوناهە، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ﴾، نافەرموێ: (مُخْطِئِين) چونکە ناوی بکەر (إسم فاعل)ی (خَطِيءَ) بریتیە لە (خَاطِيء) بەڵام ناوی بکەر (إسم فاعل)ی (أَخطَأَ) بریتیە لە (مُخطِيء)، بۆیە لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۝٢٨٦﴾البقرة، (أَخْطَأْنَا) واتە: هەڵەمان کرد، نەیفەرموە: (خَطِئْنا).

(قُرَّتُ عَيْنٍ): (قَرَّتْ عَيْنُهُ: سُرَّت، وَقِيلَ لِمَا يَسُرُّ بِهِ: قُرَّتُ عَيْن)، (قَرَّت عَيْنُهُ): ئەو کەسە دڵخۆش کرا بە شتێک کە مایەی دڵ پێخۆش بوون و شادمانی بێ، پێی دەگوترێ: (قُرَّتُ عَيْن) ئەویش لەوەوە هاتوە، (قَرّ) یانی: فێنکایەتیی و ساردیی، وەک (حَرّ) یانی: گەرما، ئنجا لەبەر ئەوەی فرمێسکی شادیی و دڵخۆشیی،

فێنکەو لە دڵێکی خۆشەوە دێ، بۆیە لەوەوە بە دڵخۆشیی گوتراوە: (قُرَّتُ عَيْن) واتە: چاو فرمێسکی شادیی و دڵخۆشیی پێ دادێ، کە ساردە، بەڵام فرمێسکی کاتی دڵتەنگیی و دڵناڕەحەتیی، گەرمە، ئینسان کە دڵ و دەروونی گەرم دەبێ، گریانی دێ و فرمێسکەکەشی گەرمە.

(فُؤَادُ): (الفُؤادُ كَالقَلبِ، لَكِن يُقَالُ لَهُ: فُؤاد إذَا اعتُبِرَ فِيهِ مَعْنَي التفَوُّدِ: والتَّوَقُّد)، واتە: (فُؤاد) وەک دڵ (قلب) وایە، بەڵام بە دڵ دەگوترێ: (فُؤاد) ئەگەر حاڵەتی داگیرسان و گەرم بوونی تێدا ڕەچاو کرا.

بەڵام وەک دوایی باسی دەکەم، پێم وایە (فُؤاد) زیاتر بە عەقڵ دەگوترێ، بەڵێ جاری واش هەیە، بە مانای دڵ بەکاردەهێنرێ، لەبەر ئەوەی ئێستا زانستیش ئەوەی دەرخستوە، کە مرۆڤ تەنیا بە مێشک شت نازانێ، بەڵکو دڵیش ڕۆڵی هەیە لە زانینی شتان دا، بەڵام (فُؤاد) لە ئەصڵدا بە مانای عەقڵ دێ، (قلب)یش بە مانای دڵە، وشەی عەقڵ لە قورئاندا بەکارنەهاتوە بە ناو، تەنیا وەک کردار (فعل) هاتوە و، (يَعْقِلُونَ، تَعْقِلُونَ، عَقَلُوه)، بەڵام وشەی (فُؤاد) بەکارهاتوە لە جیاتی عەقڵ، بەکارهاتوە بە تاک (فُؤاد)و بە کۆ (أفئدة)ش.

(فَرِغًا): (الفَرَاغُ: خِلَافُ الشُّغْلِ)، (فَرَاغ) واتە: بۆشایی، پێچەوانەی ئامادە بوونی شتێکە لە شوێنێک، (فَرَغَ فَرَاغَاً وَفُرُوغَاً وَهُوَ فَارِغٌ)، بەو شێوەیە کردارەکەی دێ: (فَرَغَ يفرغ فَرَاغاً)، خاڵییبوو خاڵیی دەبێ خاڵیی بوون، (فُرُوغاً)یش چاوگە، (فَارِغٌ) ناوی بکەر (اسم فاعل)ەکەیەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا﴾، (كَأَنَّمَا فَرَغَ مِن لُبِّهَا) وەک عەقڵەکەی، یان مێشکی، هۆشی تێدا نەمابێ، بۆیە من بەوە لێکم داوەتەوە: هۆشی لەلا نەما.

(يَكْفُلُونَهُ): وەئەستۆی دەگرن، (الكَفَالَةُ: الضَّمَانُ، أَكْفِلْنِيهَا: اجْعَلْنِي كِفْلاً لَهَا: كَفِيلاً)، کەفالەت بە مانای وە ئەستۆ گرتن دێ، (أَكْفِلْنِيهَا) واتە: منی بکە بە کەفیل، بە منی بسپێرە، ناوەکەی هەم (كِفْل)ی پێ دەگوترێ، هەم (كَفِيل)یش.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

**بەڕێـــزان!**

**سەرەتا دەڵێین:**

**کە ئەمە قۆناغی دووەمی ژیان و بەسەرهاتی مووسایە ، بە پێی دابەش کردنی ئێمە کە هەم لە سووڕەتی (الأعراف)دا باسمان کردوە و، هەم لە سەرەتای ئەم سووڕەتەشدا باسمان کرد، کە ئێمە ژیان و بەسەرهاتی مووسا  دوای لێ وردبوونەوە پێمان وایە، دابەش دەبێ بۆ: سێزدە (١٣) قۆناغ، کە پێشتر باسمان کردوون.**

**ئەم قۆناغی دووەمەش بە پلەی یەکەم، تەنها لێرەدا هاتوە، هەروەک چۆن قۆناغی یەکەمیش بە پلەی یەکەم بەس لەم سووڕەتەدا هاتوە، هەروەها قۆناغی سێیەمیش و چوارەمیش، چونکە ئەوەی لە سووڕەتی (طـه)دا هاتوە، لە سیاقی بیرخستنەوەی خوادایە  بۆ مووسا  کە چۆن بە مەلۆتکەیی دەربازی کردوە و، مشووری لێ خواردوە، ئەمەش دەقی ئەو چوار ئایەتەیە کە لە سووڕەتی (طـه)دا هاتوە:**

﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**دوای ئەوەی مووسا  لە خوا  دەپاڕێتەوە کە کۆمەڵێک داواکاریی ئاڕاستەی خوا  دەکات[1]:**

---

(١) ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى

خـوا فەرمـووی: ئـەوە داواكارییەكـەت بـۆ جێبەجـێ كـرا، ئـەی مووسـا! (واتـە: هەمـوو ئـەو شـتانەی داوات كـرد بـۆت جێبەجـێ كـران)، جارێكـی دیكـەش ئێمـە چاكەمـان لەگـەڵ تـۆ كـردوە، (واتـە: نـەك هـەر ئێسـتا كـە داوا دەكـەی، پێـش ئـەوەی بـۆ خـۆت داوا بكـەی، ئێمـە چاكەمـان لەگـەڵ تـۆدا كـرد)، ئنجـا خـوا ﷻ ڕوونـی دەكاتـەوە ئـەو چاكـە لەگەڵـدا كردنـە چییـە! چـۆن بـووە.

﴿إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾﴾طه، واتـە: كاتێـك كـە سروشـمان كـرد بۆ دایكت، ئـەوەی كـە سروشـمان بـۆ كـرد، ئیلهامـمان بـۆ كـردو خسـتمانە دڵی چـی بكات.

﴿أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ ﴿٣٩﴾﴾، ئەو مەلۆتكەیە كە مووسایە، بیخە نێو سندووقێكەوە.

﴿فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ ﴿٣٩﴾﴾، تابووتەكـەش بخـە نێـو ئـەو ئـاوە زۆرەوە، (ٱلْيَمِّ) بـە مانـای دەریـاش دێ و، بـە مانـای ڕووبـاری گـەورەش دێ، كـە مەبەسـت لێـی ڕووباری نیلـە، واتـە: بیخـە نێـو ڕووبـاری نیلـەوە، ﴿فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ﴾، ئنجـا بـا ئـەو ئـاوە زۆرەش، ڕووبـاری نیلیـش بیخاتـە كەنـارەوە نـەك هـەر بیبا، تاكـو خـوارێ و بیخاتـە نێـو دەریـای سـپی نێوەڕاسـت! چونكـە ڕووبـاری نیـل بـە پێچەوانـەی ڕووبارەكانـی دنیـاوە، لـە خـوارەوەی گـۆی زەوییـەوە دێ، بـەرەو سـەر، بـەرەو دەریـای سـپی نێوەڕاسـت، نـا، بەڵكـو بـا بیخاتـە كەنـار، (بِٱلسَّاحِلِ) واتـە: كەنـاری دەریـا (شـاطىء).

﴿يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ﴾، لەوێـش دوژمنێكـی مـن و دوژمنێكـی خـۆی دەیگرێتـەوە، كـە ماڵـی فیرعەونـە.

﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى﴾، لـە لایـەن خۆمەوەش خۆشەویسـتییم خسـتە سـەر تۆ، هەر كەسـێك مووسـای ﷺ مەلۆتكـەی ببینیایە، خۆشیدەویسـت، ئەگـەر وا نەبووایەو ڕەزا گـران و خوێـن تـاڵ بووایـە، ئـەوە هۆكارێـك دەبـوو كـە بیكـوژن و لـە كۆڵـی بكەنـەوە، بـەڵام هێنـدە خوێـن شـیرین بـووە، خۆشـیان ویسـتوەو هێشـتوویانەتەوە.

---

﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾﴾ طـه: ٢٥ - ٣٦.

﴿ وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴾، تاکو لە ژێر چاودێریی مندا تۆ دروست بکرێی و، پەروەردە بکرێی، خوا ﷻ بە منداڵییش ئاگای لێ بووە.

﴿ إِذۡ تَمۡشِيٓ أُخۡتُكَ فَتَقُولُ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ مَن يَكۡفُلُهُۥۖ ﴿٤٠﴾ ﴾، یەکێک لەو شتانەی کە خوا بۆی ڕەخساند کە لەژێر چاودێریی خوادا و، بە مشوورخۆریی خوا ﷻو بە سەرپەرشتیی خوا ﷻو پەروەردە بێ و، بە خێو بکرێ، ئەوە بوو کە دەفەرمووێ: کاتێک خوشکەکەت دەڕۆیشت دەیگوت: ئایا کەسێکتان پێ بڵێم، وە ئەستۆی بگرێ و بەخێوی بکات؟ چونکە مەمکی کەسی نەدەگرت، ئەویش هەر بە فەرمانی خوا ﷻ بوو، مەمکی کەسی نەدەگرت، وەک دەفەرمووێ: ﴿ وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ ﴾، واتە: پێشتر شیردەرەکانمان لێ قەدەغە کرد بوون، خوا وایکرد بوو مەمکی هیچ شیردەرێ و، هیچ دایکێ نەگرێ.

﴿ فَرَجَعۡنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَيۡ تَقَرَّ عَيۡنُهَا ﴾، ئنجا تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایکت، تاکو دڵخۆش بێ و فرمێسکی شادیی بۆ بێ، ﴿ وَلَا تَحۡزَنَ ﴾، دڵتەنگ و خەمباریش نەبێ.

لێرەدا هەندێک وردەکاریی باسکراون، کە لە سوورەتی (القصص)دا نەهاتوون، دیارە ئایەتەکانی قورئان کاتێک باسی بەسەرهاتێک دەکەن، هەموویان تەواوکارن و یەکدی تەواو دەکەن، هەندێک وردەکاریی لەم چوار ئایەتەی سوورەتی (طه)دا هاتوون، کە لە سوورەتی (القصص)دا، ئەو وردەکاریيانە نەهاتوون.

**ئێستاش با مانای گشتیی ئەو حەوت ئایەتە بکەین:**

خوا ﷻ ئەوەی باس نەکردوە: مووسا ﷺ چۆن لە دایک بوو؟ بابی مووسا ﷺ کێ بوو؟ ڕەچەڵەکیان چییە؟ بۆچی ئەوانەی باس نەکردوون؟ چونکە هیچ ئامانجێک پەیوەست نیە بەوانەوە، یانی: ئەگەر ئێمە نەزانین دایکی مووسا ﷺ کێ بووە؟ ئەگەر نەزانین بابی مووسا کێ بووە؟ وەک لە (پەیمانی کۆن) دا، ناوی بابی مووسا ﷺ هاتوە، بەڵام ناوی دایکی نەهاتوە، ئەگەر نەزانین خوشکەکەی کە سۆراغیی کردوەو بە دوایدا چووە، کێ بووە؟ چ زیانێکمان

پێدەگات؟ یان چ کەلێنێک لەو بەسەرهاتە دەبێ، کە ئێمە ئەوەی پێویستە لێی وەربگرین، لە پەندو عیبرەت و دەرس و لێی فێربین، لێی فێرنەبین؟ هیچ پەرچ و کۆسپێک نایەتە ڕێمان.

بۆیە خوا ﷻ لەم کتێبە موبارەکەی خۆیدا، ئەوەی کە پەکی لەسەر نەکەوتبێ و، پێویست نەبووبێ و، کەلێنێک نەگرێ، خوا ﷻ کتێبی خۆی پێ قەرەباڵغ نەکردوە، ئنجا لێرەدا هەم لەم بەسەرهاتەدا، هەم وەک کاتی خۆی لە بەسەرهاتی نووح دا ﷺ، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (هود)دا، باسمان کرد، کەشتییەکەی نووح چۆن بوو؟ ئەندازەی چەند بوو؟ چەند کەس سوار بوو بوون؟ چەند جۆرە پەلەوەر بوون؟ چەند جۆرە ئاژەڵ بوون؟ لە کوێ بوو، لە کوێ نەبوو؟ تۆفانەکە چەند بەردەوام بوو؟! هەموو ئەو وردەکارییانە کە مەبەستێکی پێویست پێیانەوە پەیوەست نیە، خوا ﷻ باسیان ناکات.

لێرەشدا یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾، واتە: مووسا ﷺ لە دایک بوو، سروشمان کرد بۆ دایکی مووسا ﷺ کە شیری بدەیە، کە بە تەئکید مەبەست لە وەحیی، لێرەدا ئەو مانایەتی کە: خورپە (إلهام)ە، بۆچی؟ چونکە ئێمە دەزانین کە بە مانا زاراوەییەکەی وەحیی، تەنیا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) ئەو پەیامە تایبەتییەیان بۆ هاتوە، کەواتە: ئەوەی ئێرە یەکێکی دیکەیە لە مانایەکانی وەحیی، وەک چۆن پێشتریش باسمان کرد، خوا ﷻ وشەی وەحیی بۆ هەنگیش بەکارهێناوە: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ﴿٦٨﴾ ﴾النحل، کە بە دڵنیایی خوا ﷻ پەیامی وەک هی پێغەمبەرانی بۆ هەنگ نەناردوە، نا! بەڵکو واتە: بە شێوەیەکی تایبەت فێرمان کرد، کە فێرکردنی غەریزەییە، بە نسبەت دایکی مووساشەوە، خوای پەروەردگار خستیە دڵی، کە پێی دەگوترێ: ئیلهام، خورپە، خستنە دڵ، سروشمان بۆ دایکی مووسا ﷺ کرد، لە شێوەی خورپە و ئیلهامدا: ﴿ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾، کە شیری پێ بدە، واتە: بەردەوام بە لەسەر شیر پێدانی، فرچکی بدە، چونکە زانایان دەڵێن: ئەگەر یەکەمجار منداڵ شیری

دایکـی بخـوات، دوایـی زۆر بەرهەڵسـتیی (مناعـة)ی نەخۆشـیی و میکرۆبـی باشـتر دەبـێ، هەروەهـا شـیری پـێ بـدە، چونکـە دوایـی تـۆ بـە ڕووبـاری دا دەدەی، بـەس خـوا دەزانـێ: چەنـدەی پێدەچـێ تاکـو ماڵـی فیرعـەون دەیگرنـەوەو، هەوڵـدەدەن دایەنێـک و شـیردەرێکی بـۆ پەیـدا بکـەن، کـە دوایـیش مەمکـی کـەس ناگـرێ و هـەر دێتـەوە لای خۆیشـی، شـیری پـێ بـدات، ﴿ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ ﴾، ئنجـا ئەگـەر ترسـت لێـی هەبـوو، ترسـت لێـی هەبـوو، ئاشـکرا بـێ، چونکە وەک پێشـتریش باسـمان کردوە: فیرعەونییـەکان ئافرەتانـی بەنـوو ئیسـرائیل هـەر کامێکیـان کـوڕی ببووایـە، مامانـی تایبەتییـان هەبـووە، بەسـەر ئافرەتانـەوە دەگـەڕان، کـێ سـکی هەیـە؟ چاوەڕێیـان دەکـرد، تاکـو منداڵەکـەی کـە دەبـوو، ئەگـەر کـوڕ بووایـە، سـەریان دەبـڕی.

﴿ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ ﴾، فڕێـی بـدە نێـو دەریـاوە، ئایـا هـەر وا بـە مەلۆتکەیـی بیخاتـە نێـو ڕووبـارەوە، بـە ڕووتیـی؟ نەخێـر، بـەڵام لـە سـوورەتی (طـه)دا، خـوا ﷻ ڕوونـی کردۆتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: فڕێیـدە نێـو تابووتێکـەوە، لـە سـندووقێک دا داینـێ، ئنجـا تابووتەکـە (صندووقەکـە) بخـە نێـو ڕووبـاری نیلـەوە، ﴿ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓ ﴾، مەترسـێ و دڵتەنگیـش مەبـە، ﴿ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە بـۆ لای تـۆی دەگێڕینـەوە، ئێمـە گێڕەرەوەینـی بـۆ لای تـۆ، ﴿ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، هەروەهـا گێڕەریشـینی بـە یەکێـک لـە پێغەمبـەران و ڕەوانەکـراوان، یـانی: نـەک هـەر بـە سـەلامەتیی بۆتـی دەگێڕینـەوە، بەڵکـو ئایندەیەکـی زۆر ڕۆشنیشـی دەبـێ، مایـەی سـەربەرزیی، نـەک هـەر بـۆ تـۆ و بابی و بنەماڵەکـەی، بەڵکـو بـۆ هەمـوو نەتـەوەی بەنـوو ئیسـرائیل، بەڵکـو بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتییـش، ئێسـتا مووسـا ﷺ ڕەمـزی خۆڕاگریـی و بەرخـۆدان و خەبـات و شۆڕشـگێڕیی و، قبـووڵ نەکردنـی سـتەم و دەسـتدرێژیی و چەوسـێنرانەوەیە، وەک گوتـراوە: (لِکُلِّ فِرعَونٍ مُوسَى).

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ ﴾، دەسـت و پێوەندو شـوێنکەوتووانی فیرعـەون هەڵیانگرتـەوە، هەڵبەتـە کـە هەڵیانگرتۆتـەوە لـە (پەیمانـی کـۆن)دا، بـاس

دەکات کـە کەنیزەکەکانـی کچەکـەی فیرعـەون هەڵیانگرتۆتـەوە، بـەڵام بەهەرحـاڵ هـەر چۆنێکـی هەڵگیرابێتـەوە، گرنـگ ئەوەیـە دوایـی هاتۆتـە لای هاوسـەری فیرعـەون، (ءَالُ فِرْعَوْنَ ) یانـی: شـوێنکەوتووانی فیرعـەون، ئەوانەی لەگـەڵ فیرعەوندا بـوون و، شـوێنکەوتووی بـوون بـە ڕواڵـەت، یـان بـە ڕواڵـەت و بـە پەنهان، چونکـە بـە نسـبەت هاوسـەری فیرعەونـەوە، بـە ڕواڵـەت شـوێنکەوتووی بـوو، ئەگەرنـا لـە ڕاستییدا بـڕوادار بـووە، وەک لـە سـوورەتی (التحريم)دا، خـوای کارزان بـاس دەکات: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ ﴾، واتـە: خـوا وێنـەی هێنایـەوە بـۆ بـڕواداران، بـە ئافرەتـی فیرعـەون (نەشـیفەرمووە: (زَوجَةُ فِرعَـون)! چونکـە لەگـەڵ ئـەودا هاوکـوف و جـووت نەبـووە، بەڵکـو دەفەرمـوێ: (ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ )، واتـە: ئافرەتـی فیرعـەون)، کاتێـک کـە گوتـی: ئـەی پـەروەردگارم! لـەلای خـۆت لە بەهەشـت کۆشـکێکم بۆ دروسـت بکـەو، لـە فیرعـەون و کردەوەکەی ڕزگارم بکـە.

مانـای وایـە ئافرەتـی فیرعـەون، بـڕوادار بـووە کـە زۆر لـە زانایـان دەڵێـن: نـاوی ئاسـیا بـووە (ئاسـیای کچـی موزاحیـم).

ئنجـا دەفەرمـوێ: نیزیکانـی فیرعـەون و شـوێنکەوتووانی فیرعـەون هەڵیانگرتـەوە: ﴿ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ﴾، تاکـو بۆیـان ببێتـە دوژمـن و مایـەی دڵتەنگیـی.

هەڵبەتـە هیـچ کـەس بـە دەسـتی خـۆی دوژمـن بـۆ خـۆی پەیـدا نـاکات و، مایـەی دڵتەنگیـی بـۆ خـۆی نارەخسـێنێ، بۆیـە زانایـان دەڵێـن: ئـەم (ل)ی (لِيَكُونَ ) (لام العاقبة)یـە، واتـە: سـەرەنجام وای لـێ دێ، سـەرەنجام ئـەو مەلۆتکەیـەی هەڵیدەگرنـەوە، دەبێتـە دوژمنیـان و، دەبێتـە مایـەی دڵتەنگیـی و خەفەتبارییشـیان و موڵـک و دەسـتەڵاتی فیرعـەون لەسـەر دەسـتی ئـەو لەبەیـن دەچـێ، ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴾، بـە دڵنیاییـەوە فیرعـەون و

هامـان و سـەربازەکانیان، تاوانبـار بـوون، گوناهبـار بـوون کـە بـەو شـێوەیەیان لـە بەنـوو ئیسـڕائیل دەکـرد، کـە مووسـای ﷺ مەلۆتکـە لـە ترسـی سـەربڕان، خراوەتـە صندووقێکــەوەو بــە ڕووبــاری (نیــل)دا دراوە و، دوایــی هــەر ماڵــی فیرعــەون گرتوویانەتـەوە، لێـرەدا: (خَـٰطِـِٔينَ) یانـی: لـەوەدا خەتابـارو گوناهبـارو تاوانبـار بـوون، کـە وایـان لـە گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل دەکـرد، کـە ئەگـەر ئـەوە نەبووایـە، هیچ ئافرەتێـک دڵـی لەبـەر مەلۆتکـەی خـۆی نابێتـەوە، بیخاتـە سـندووقەوە بـە ڕووبـاری دابــدات، ﴿ وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ ﴾، ئافرەتــی فیرعــەون گوتــی: مایـەی چـاو ڕوونیـی و چاوگەشـیی و دڵخۆشـیی منـەو تۆشـە، دیـارە ڕووی دواندنـی لـە فیرعـەون بـووە، ﴿ لَا تَقۡتُلُوهُ ﴾، ئنجـا لـەوەڕا دەزانیـن بەتەمـا بـوون بیکـوژن، کـە دەڵـێ: ﴿ لَا تَقۡتُلُوهُ ﴾، ئنجـا تەماشـا بکـەن! خـوا ﷻ چەنـد بـە کـورت و پوختیـی فەرمایشـتی خـۆی دەفەرمـوێ، لـە جیاتـی ئـەوەی بفەرمـوێ: (وَأَرَادوا أَن يَقتُلُوه، فَلَمَّا أَرَادُوا أَن يَذبَحُوهُ أَو يَقتُلُوهُ، قَالَت امرَأَةُ فِرعَونَ: قُرَّتُ عَينٍ لِي وَلَك لا تَقتُلُوهُ)، ئـەوەی پێشـێ بـاس نـاکات، چونکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَا تَقۡتُلُوهُ ﴾، مەیکـوژن، مانـای وایـە، بەتەمـا بـوون بیکـوژن، بۆیـە گوتوویەتـی: مەیکـوژن، ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا ﴾، نیزیکـە، لەوانەیـە سـوودمان پێبگەیەنـێ، یـانی: گـەورەی بکەیـن و، بـە خێـوی بکەیـن، ئەویـش خزمەتمـان بـکات، ﴿ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا ﴾، یاخـود ئەگـەر شایسـتە بـێ، بیکەینـە کـوڕی خۆمـان.

کـە بەپێـی قسـەی کتێبـە مێژوویـیـەکان، مووسـا ﷺ، دوایـی وەک کـوڕی فیرعـەون نـاسراوە و، پێـی گوتـراوە: مووسـای کـوڕی فیرعـەون (مُوسَى ابنُ فِرعَون)، هەندێکیشـیان دەڵێـن: بـەو شـێوەیە نەنـاسراوە، بە هـەر حـاڵ ئافرەتەکـەی فیرعەون، دەڵـێ: یـان ئەوەتـا سـوودمان پێدەگەیەنـێ، دەیکەینـە خزمەتکارێـک و بەردەسـتێک، یاخـود: ئەگـەر شایسـتە بـێ، دەیکەینـە کـوڕی خۆمـان، ﴿ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، لـە حاڵێکـدا ئەوەیـان دەگـوت کـە هەسـتیان نەدەکـرد، کـە دوایـی ئـەو مووسـایە دەبێتـە هـۆی سـەر بـە فەتـارەت چوونـی فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی.

هەڵبەتـە ئافرەتەکـەی فیرعـەون (ئاسـیا)، یـان هـەر ناوێکـی دیکـەی بـوو بـێ (خـوا لێـی ڕازی بـێ) کـە یەکێـک بـووە لـە بـڕواداران، ئـاوا مووسـای حەواندۆتـەوەو پەنـای داوەو پاراسـتوویەتی، بـەڵام بابزانیـن هەواڵـی دایکـی مووسـا چییە؟! ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ﴾، هۆشـی دایکـی مووسـاش ﷺ بـە تـاڵ بـوو، خاڵیـی بـوو، هۆشـی لـەلا نەمـا، (فُؤَادُ) لێرەدا بـە مانـای عەقڵـە، هیـچ گومانـی تێدانیـە، چونکـە خـوا ﷻ دوایـی باسـی دڵ (قَلب)یـش دەکات، ئنجـا نەمبینیـوە توێژەرەوانـی قورئـان کـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر ئـەوە بـاس دەکـەم، ئاماژەیـان بـەوە کـرد بـێ، بۆچـی پێشـێ دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ﴾، بـەڵام دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾؟

کەواتـە: (قلـب) شـتێکەو (فؤاد)یـش شـتێکی دیکەیـە (فـؤاد) شـوێنی بیرو هۆشـەو (قلب)یـش شـوێنی سـۆزو هەسـت و نەسـت و بڕیـارو ئیرادەیـە، بۆیە (فـؤاد)ی دایکی مووسـا واتـە: عەقـڵ و هۆشـەکەی، خاڵیـی بۆتـەوە لـە بیرکردنـەوە، وەک گوتـراوە: هۆشـم لـەلا نەمـا، یـانی: لـە هـەر بیرێـک جگـە لـە بیرکردنـەوەی لـە سـەلامەتیی مووسـا ﷺ، عەقـڵ و هۆشـی خاڵیـی بـوو، لـە هەمـوو شـتێک جگـە لـە بیرکردنـەوە لـە مووسـا ﷺ، ﴿ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ ﴾، نیزیـک بـوو دەریبـڕێ، واتـە: ئـەو دڵتەنگیـی و ناڕەحەتییـەی دەربـبڕێ، ﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾، ئەگـەر دڵیـمان نەبەسـتبایە، یـانی: ئەگـەر دڵیـمان نەبەسـتبایە، دەریدەبـڕی، کەواتـە: ئـەو (قلـب)ەی خـوا بەسـتوویەتی و بەهێـزی کـردوە، جیایـە لـەو (فـؤاد)ەی کـە لـە هەمـوو جـۆرە بیرکردنەوەیـەک بەتـاڵ بـووەو، خاڵیـی بۆتـەوە، جگـە لـە بیرکردنـەوە لە مووسـا ﷺو هۆشـی لـەلا نەمـاوە، ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، دڵیـمان بەسـت و بەهێزمـان کـرد، تاکـو لـە بـڕواداران بـێ، بـڕواداران دەبـێ دڵیـان بەهێـز بـێ، لـە بەرانبـەر بـەڵا و موصیبـەت و ناڕەحەتییەکانـدا کـە دێنـە ڕێیـان.

﴿ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ﴾، دایکـی مووسـا ﷺ بـە خوشـکەکەی مووسـای گـوت: شـوێنی بکـەوە، سـۆراغی بکـە، ﴿ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ ﴾، لـە دوورەوە

چاوی پێکەوت، کە تابووتەکەیان گرتۆتەوە. ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، بەڵام ئەوان هەستیان پێ نەکرد، کە ئەوە خوشکەکەی مووسا پەیسەرو سۆراغی دەکات و بە دوایدا هاتوە. ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾، پێشتریش هەموو شیردەرەکانمان، لێ قەدەغە کردبوون.

لێرەدا مەبەست لە: (حَرَّمْنَا) حەرامکردنی تەکوینییە، نەک تەشریعیی، واتە: وامان کرد بوو کە مووسا ﷺ مەمکی هیچ شیردەرێک نەگرێ، (الْمَرَاضِعَ) کۆی (مُرضِعَة)یە، واتە: ئافرەتی شیردەر، پێشتر لێمان قەدەغە کرد بوو، مەمکی هیچ شیردەرێک بمژێ، دیارە مووسا ﷺ هەر چریکاندوویەتی و وەک مەلۆتکە هاواری کردوە و، زیراندوویەتی، چونکە برسیی بووە، هەرچەند دایەنیان بۆ هێناوەو شیردەریان بۆ هێناوە، مەمکی کەسی نەگرتوە، خوشکەکەی مووساش، نەیانناسیوە لەوێ، کە دەچێ: ئەوە منداڵێک دەچریکێنێ و دەزیرێنێ و مەمکی هیچ ئافرەتێک ناگرێ!

﴿فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ﴾، گوتی: ئایا کەس و کارو خاوەنانی ماڵێکتان پیشان بدەم، کە ئەو مەلۆتکەیەتان بۆ وە ئەستۆ بگرن و بۆشی دڵسۆز بن؟ لە تەفسیرەکاندا دەڵێن: گوتیان: چۆن دەزانی دڵسۆزن و، چۆن بەو ماڵەت زانی؟ تۆ ڕەنگە نیزیکی ئەو بی! بەڵام خوای تاک و پاک ئاماژەی پێ نەکردوە، بە هەرحاڵ ئەویش ڕەنگە لەگەڵ دەستە خوشکان چوو بێ، یان وەک یەک لەو ئافرەتانە چووە، کە بڵێ: با بزانین داخۆ مەمکی ئەویش دەگرێ، ناگرێ؟ دیاریش نیە داخۆ ئەو خوشکەی مووسا، هاوسەری هەبووە، یان هەر کچ بووەو لە ماڵی بابی بووە؟ گرنگ ئەوەیە ئەو پێشنیارەیان بۆ دەکات و، سەرەنجام ئەوانیش پێشنیارەکەی وەردەگرن، هەتا لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: گوتی: ئافرەتێکم پێ شک دێ، هێندە بۆنخۆشە و هێندە باوەش خۆشە، هەر منداڵێک مەمکی بگرێ، شیری دەخوات، دەڵێن: بۆمان بانگ بکە، ئەویش دەچێ دایکی بانگ دەکات، بەڵام نازانن کە دایکیەتی و،

مەمکی وی دەگری، ﴿ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ ﴾، ئنجا گێڕامانەوە بۆ لای دایکی، ﴿ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴾، بۆ ئەوەی دڵخۆش بێ و خەمبار نەبێ، ﴿ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی بزانێ: بەڵێنی خوا ﷻ ڕاستە، کە فەرمووی: ﴿ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵک نازانن، کە بەڵێنەکانی خوا ﷻ هیچ پەرچێک نیە، لە ڕێیاندا و، دێنە دی بە تەواویی.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ئیلهام کردنی خوا ﷻ بۆ دایکی مووسا ؈ کە شیری پێبدات و، هەر کات مەترسیی لێی هەبوو، بیخاتە ڕووباری نیلەوەو، دڵنیاش بێ کە سەلامەت و سەرفراز دەبێ و، هەڵگێرانەوەی لە لایەن ماڵی فیرعەونەوەو، ڕێگر بوونی هاوسەری فیرعەون لە کوشتنی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾، سروشمان بۆ لای دایکی مووسا کرد، (أوحينا)، (أي: أَلْهَمْنَا)، واتە: خورپەمان بۆ کرد، ئیلهاممان بۆ کرد، **(وَالإِلْهَامُ: يُوجَدُ عِنْدَهُ مِنْ انشِرَاحِ الصَّدْرِ مَا يُحَقِّقُ أَنَّهُ خَاطِرٌ مِنَ الوَارِدَاتِ الإِلهِيةِ)**، ئیلهامیش لە کاتێکدا کە دێتە دڵی مرۆڤەوە، مرۆڤ سینەی بۆ گوشاد دەبێ و، دڵی بۆی ئاسوودە دەبێ، دەزانێ کە ئەوە لە خوای پەرستراوەوە هاتوە، ئەگەرنا وەک چۆن خوتخوتەو وەسوەسەی شەیتان دێتە نێو دڵەوە، ئیلهامی فریشتانیش دێتە نێو دڵەوە، بەڵام مرۆڤ چۆنیان جیا دەکاتەوە؟ ئەهلی ئیمان ئەوە جیا دەکەنەوە، ئیلهامیش بۆ لای خەڵکی باش و ئەهلی تەقوا و ئیمان دەکرێ، هەر وەک خوتخوتەی شەیتانەکانیش، زیاتر بۆ ئەهلی کوفرو گوناە و تاوان دەچێ، واتە: خورپە و ئیلهاممان کرد بۆ لای دایکی مووسا ؈:

٢)- ﴿ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾، کە شیری پێبدە، ﴿ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾، ڕوونکردنەوەی ﴿ وَأَوْحَيْنَآ ﴾یە، خورپەو ئیلهامەکە ئەوە بوو کە شیری پێ بدە، واتە: ماوەیەک شیری پێبدە، لە (پەیمانی کۆن)دا، دەڵێ: ماوەی سێ مانگان شیری پێداوە.

٣)- ﴿ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ ﴾، هەر کات مەترسییت لێی هەبوو، یانی: مەترسییت لێی هەبوو، پێی بزانرێ.

٤)- ﴿ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ ﴾، فڕێیبدە نێو ئاوە زۆرەکەوە، (ٱلْيَمِّ) واتە: ئاوی زۆر، بە مانای دەریاش دێ و، بە مانای ڕووبارێکی گەورەش دێ، کە بە دڵنیایی لێرەدا مەبەستی پێ ڕووباری نیلە، لێرەدا دەفەرموێ: یەکسەر فڕێیبدە نێو ڕووبارەکەوە، بەڵام لە سوورەتی (طه)دا، وەک پێشتر باسمان کرد، دەفەرموێ: ﴿ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ ﴿٣٩﴾ ﴾طه، فڕێیبدە نێو صندووقێکەوەو، صندووقەکە فڕێبدە نێو ئاوەکەوە، یانی: هەر ئەگەر تەماشای ئێرە بکەین، وای لێ وەردەگیرێ کە هەر بە ڕووتیی و مەلۆتکەیی بیخاتە نێو ئاوەکەوە! بەڵام بە هۆی سوورەتی (طه)وە دەزانین کە: بیخە صندووقێکەوە (تابووتێکەوە) و دوایی تابووتەکە بخە نێو ئاوەکە، بۆ ئەوەی نەخنکێ.

٥)- ﴿ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ﴾، مەترسێ و خەمباریش مەبە، واتە: بۆ داهاتوو مەترسێ و، خەمیش لە ڕابردوو مەخۆ.

٦)- ﴿ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ ﴾، بێگومان ئێمە گێڕەرەوەی ئەوین بۆ لای تۆ، کەواتە: دڵنیابە کە بەسەلامەتیی دێتەوە بۆ لات.

٧)- ﴿ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، سەرباری ئەوەش: دەشیگێڕین بە یەکێک لە ڕەوانە کراوان و پێغەمبەران.

٨)- ﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ ﴾، ئنجا نیزیکانی فیرعەون، شوێنکەوتووانی فیرعەون، هەڵیانگرتەوە، کە دیارە ماڵ و منداڵەکەشی هەر لە شوێنکەوتووانی بوون، جگە لە هاوسەرەکەی، هاوسەردکەشی ئایا کەنگێ ئیمانی هێناوە؟ وا دیارە دواتر کە مووسا ﵇

گەورە بووە، ئیمانی هێناوە، ئەگەرنا ئەویش (ژنەکەیشی) ئەو کاتە هەر لە شوێنکەوتووان و نیزیکانی فیرعەون بووە.

(اللَّقْطُ: تَنَاوُلُ الشَّيءِ المُلْقَى عَلَى الأرض)، (لَقط) بریتییە لەوەی شتێک کە لەسەر زەوی کەوتووە، هەڵیگریەوە، (إلتِقَاط)یش (إفتِعَال)ە، لە (لقطٌ)، واتە: هەڵگرتنەوەیەک کە جۆرێک لە مشوورخۆریی و بەتەنگەوە بوون و بە خەمەوە بوونی تێدا بێ، کێشی (إفتِعَال) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات.

٩)- ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾، نیزیکانی فیرعەون، شوێنکەوتووانی فیرعەون هەڵیانگرتەوە: تاکو بۆیان ببێ بە دوژمن و دڵتەنگیی، واتە: بۆیان ببێتە دوژمن و، بۆشیان ببێتە مایەی دڵتەنگیی، (وَحَزَنًا) بە (حُزْنًا)یش خوێندراوەتەوە، پسپۆڕانی زمان لێرەدا دەڵێن: ((ل)، (لیکون)، (لام العِلّة أو لامُ العَاقِبَةِ، فَشُبِّهَتِ العَاقِبَةُ بِالعِلّةِ أي: استُعِيرَ الحَرْفُ تَبَعاً لاستِعَارَةِ مَعْنَاهُ)، لەبەر ئەوەی سەرەنجامی هەڵگرتنەوەی مووسا ﷺ ئەوەیە کە دوایی بۆ فیرعەون و نیزیکانی دەبێتە دوژمن و، دەبێتە مایەی دڵتەنگییان، ئنجا (ل)ی سەر (لِيَكُونَ لَهُمْ)، (ل)ی هۆکارە، یان هی سەرەنجامەو شوبهێنراوە، بە هۆکارەوە، واتە: پیتێکە بۆ هۆکارو خوازراوەتەوە بۆ سەرەنجام، یان پیتێکە بۆ سەرنەنجامەو خوازراوەتەوە بۆ هۆکار، بۆیەش مانایەکەی وایە، چونکە سەرەنجامەکەی بەو شێوەیە دەبێ، ئەگەرنا ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبووە، دوژمن بۆ خۆیان پەیدا بکەن، هیچ عاقڵێک شتی وا ناکات.

١٠)- ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان، تاوانبار بوون. سەربازەکانیان، واتە: هەموو ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون، دەست و پێوەندیان بوون و، هاوکارو پشتگیریان بوون، خەڵک و گەلەکە کە لەگەڵیان بوون، ئەوانە هەموویان تاوانبار بوون.

(خَاطِيء: إسم الفَاعِل)ە، لە (خَطِئَ) وەک (فَرِحَ)، (خَطِئَ) واتە: گوناهی کرد، بەڵام (أخطَأ) یانی: بە هەڵەدا چوو، دەفەرموێ: هەموویان تاوانبار بوون، چونکە

بـە هـۆی تاوانـی ئەوانـەوە، دایکـی مووسـا ﷺ ناچـار بـووە، بیخاتـە صندووقێکـەوە فڕێـی بداتـە نێـو ڕووبـاری نیلـەوە.

۱۱)- ﴿وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ﴾، ئافرەتەکەی فیرعەون، گوتی: مایەی چاوگەشیی و دڵخۆشییە بۆ منیش و بۆ تۆش.

۱۲)- ﴿لَا تَقۡتُلُوهُ﴾، مەیکوژن، لێرەدا بە ڕاناوی (کۆ) فیرعەون دەدوێنێ: مەیکوژن، واتە: تۆ مەیکوژە، بەڵام ڕاناوی کۆی بۆ فیرعەون بەکارهێناوە، وەک عادەتی دوێنرانی حوکمڕانان و، فیرعەونیش بەتەما بووە بیکوژێ.

۱۳)- ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ﴾، ڕەنگە، نیزیکە کە سوودمان پێبگەیەنێ.

۱٤)- ﴿أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا﴾، یاخود بیگێڕین بە ڕۆڵەو بیکەین بە کوڕی خۆمان، یانی: یان دەیکەینە خزمەتکار، یان دەیکەینە کوڕی خۆمان، ئەگەر شایستە بێ.

۱٥)- ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، کاتێک ئەو ڕاوێژەیان کرد، کاتێک ئافرەتی فیرعەون ئەو پێشنیارەی کرد، کە هەستیان نەدەکرد دوایی سەرەنجام چی لێ دێ، هەستیان نەدەکرد، بەوەی کە خوا ﷻ نەخشە و بەرنامەی تایبەتیی خۆی هەیە، کە ئەو مووسایە نەک هەر نابێ بکوژرێ، بەڵکو دەبێ خۆشتان بەخێوی بکەن، بە دەستی خۆتان و، دواییش کۆتایی بە خراپەو ستەمی ئێوەش دێ، هەر لەسەر دەستی وی!

عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) دەفەرمـوێ: (**وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ لَوْ أَقَرَّ فِرعَونُ أَنْ يَكُونَ لَهُ قُرَّةَ عَيْنٍ كَمَا أَقَرَّت، لَهَدَاهُ اللهُ بِهِ، كَمَا هَدَى بِهِ امرَأَتَهُ وَلَكِنْ حَرَمَهُ ذَلِك**)[1].

واتـە: سـوێند بـەو زاتـەی سـوێندی پـێ دەخـورێ، ئەگـەر فیرعەونیـش دانـی بـەوەدا هێنابایـە، کـە بـۆی ببێتـە مایـەی چاوگەشـیی و دڵخۆشـیی وەک ئافرەتەکـەی، دانـی بـەوەدا هێنـا، خـوا ﷻ وەک چـۆن ئافرەتەکـەی بەهـۆی مووسـاوە خسـتە سـەر

---

(۱) الجامع البيان برقم: ۲۷۱٤۸.

ڕێـی ڕاسـت، فیرعەونیشـی دەخسـتە سـەر ڕێـی ڕاسـت، بـەڵام خـوا بـێ بەشـی کـرد، لـەوە.

چونکە ئاوا گەشبینانە تەماشای ئەو منداڵەی نەکرد.

(القُرطُبـي) لـە (الأصمَعِـي)ەوە شـتێک دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: گوێـم لـە کچێکـی ئەعرابیـی بـوو، شـیعرێکی دەگـوت[1]:

أستَغفِرُ اللهَ لِذَنبِي كُـــلِّهِ    قَبّلتُ إنــسَاناً بِغَيــــرِ حِلِّهِ

مِثلَ الغَزَالِ نَاعِــماً فِي دَلِّهِ    فَانتَصَفَ اللَّيـلُ وَ لَـــم أُصِلهُ

فَقُلتُ: قَاتَلَكِ اللهُ مَا أفصَحَكِ!

فَقَالَـت: أوَ يُعَـدُّ هَـذا فَصَاحَـةً مَـعَ قَولِـهِ تَعَالَى: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾.

فَجَمَعَ فِي آيَةٍ وَاحِدَةٍ، بَيْنَ أمرَينِ، وَنَهيَينِ، وَخَبَرَينِ، وَبَشَارَتَين.

ئەصمەعیی دەڵـێ: گوێـم لـە کچێکـی عەرەبـی خێڵەکیـی بـوو، شـیعری دەگـوت، شـیعرەکەی دەڵـێ:

داوای لێبـوردن دەکـەم بـۆ هەمـوو گوناهەکـەم    مرۆڤێکـم مـاچ کـرد بـێ ئـەوەی بـۆم حـەڵاڵ بێ

دەتگـوت ئاسـکە لـە نەرمیـی و ناسـکیی و نازیـدا    شـەو بـە نیوەیـی بـوو، بـەڵام هـەر پێی نەگەیشـتم

دەڵێ گوتم: خوا بتکوژێ چەند زمان پاراویی!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٠٢.

ئەویش گوتی: ئایا ئەو شیعرەی من بە زمان پاراویی دادەنری، لەگەڵ فەرمووودەی خوای بەرزدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، لە یەک ئایەتدا خوا ﷻ دوو فەرمان و، دوو قەدەغە و، دوو هەواڵ و، دوو موژدەی، پێکەوە کۆکردوونەوە؟!

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾، ئەوە فەرمانە، ﴿ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ ﴾، ئەوەش فەرمانە ﴿ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ﴾، هەردووکیان ڕێگرییین: مەترسێ و دڵتەنگ مەبە، ﴿ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، ئەم دووەش هەردووکیان هەواڵن و موژدەشن.

**مەسەلەی دووەم:**

**بێ هۆش و گۆش بوونی دایکی مووسا ﷺ لە تاوی کۆرپەکەی و، دڵ بەهێز کرانی لەلایەن خواوە ﷻ و، ناردنی خوشکەکەی مووسا ﷺ بە دوایدا بۆ سۆراغکردنی و، پێشنیارکردنی خوشکەکەی بۆ ماڵی فیرعەون، کە ماڵێکی باش و دڵسۆزی پێ شک دێ، بۆ بەخێوکردنی ئەو مەلۆتکەیە کە مەمکی هیچ شیرەدەرێک ناگرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَاهُ إِلَىٰ أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا ﴾، عەقڵی دایکی مووسا ﷺ خاڵیی و بە تاڵ بوو، بۆش بوو، دواتر باسێک دەکەین، لەو بارەوە کە (فُؤَادُ) لە قورئاندا بە مانای عەقڵ دێ، پێشتریش هەر باسمان کردوە، کە (قَلب) بە مانای دڵ دێ و، ئەو دووانە بە یەک مانا نین، واتە: وشەی هاو واتا (مترادف) نین، بەڵکو لێک جیان، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا ﴾، واتە: دایکی مووسا ﷺ هۆشی لە لای خۆی نەما، چونکە وەختێک عەقڵ، خاڵیی دەبێ لە بیرکردنەوەو هۆش و گۆش، ئەوە لە دوو حاڵان دایە، یان بە دوو شێوەیە:

أ- یان لەبەر ئەوەیە کە زۆر خەفەتبارە و زۆر ترساوەو، هەموو سەرنج و فیکری کەوتۆتە سەر ئەو شتەی لێی دەترسێ، یاخود خەمی بۆ داگرتوە.

ب- یاخود بە هۆی ئەوەوەیە کە توانای بیرکردنەوەی نەماوە، توانای ئەوە کە زانراوەکان لە عەقڵی خۆیدا کۆ بکاتەوە، ئەو توانایەی نەماوە.

کـە ئەمـەش وەک ئـەو فەرمایشـتەی خـوای پـەروەردگارە، کـە لـە سـوورەتی (إبراهِیـم)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ٤٣ ﴾، (أفئِـدة) کـۆی (فُـؤاد)ە، باسـی حاڵەتـی کافـرەکان دەکات لـە ڕۆژی دواییـدا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ﴾، عەقڵەکانیـان بـۆش بـوون، (هَوَآءٞ) یانـی: بـۆش (فَـارِغ)، (الزَّمَخْـشَرِي) ئـاوا تەعبیـر لـەم ڕسـتە قورئانییـە دەکات، دەڵـێ: (لَـمَّا سَـمِعَت بِوُقُوعِـهِ فِي يَـدِ فِرعَـونَ، طَـارَ عَقْلُهَـا لِـمَا دَهَمَهَـا مِـن فَـرْطِ الجَـزَعِ)، واتـە: کاتێـک دایکـی مووسـا بیسـتی کەوتۆتـە دەسـتی فیرعـەون، عەقڵـی فـڕی بـە هـۆی ئـەو هەمـوو ناڕەحەتییـەوە کـە بەسـەریدا هـات.

ئەمە واتایەکی ئەو ڕستە قورئانییەیە:

هەندێکیـش گوتوویانـە: ﴿ وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ﴾، واتـە: (أصبَـحَ عَقْلُهَـا فَارِغَـاً مِـنْ كُلِّ شَيءٍ إلاَّ ذِكْـرُ مُـوسَى)، واتـە: عەقڵـی لـە هەمـوو شـتێک خاڵیـی و بـۆش بـوو، جگـە لـە بیرکردنـەوە لـە مووسـا.

٢)- ﴿ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ ﴾، نیزیک بوو ئاشکرای بکات، یانی: (كَادَت تُبدِيهِ)، نیزیک بوو دەری بخات، ئنجا لێرەدا وشەی: (تُبدِيه: ضُمِّنَ مَعنَى تَبُوحُ لِذَا عُدِّيَ بِالبَاءِ)، وشەی (بَدَا، يَبدُو) بۆ خۆی تێپەڕ دەکات، بۆ بەرکار (مَفعُول بِهِ) پێویستیی بە پیتێکی دیکە نیە، (بَدَا) دەرکەوت، (أبدَاهُ) دەریخست، کەواتە: دەگونجا بفەرموێ: (إن كَادَت لِتُبدِيهِ) نیزیک بوو دەریخات، بەڵام بۆچی بە (بِهِ) تێپەڕی کردوە بۆ بەرکار (مَفعُول بِهِ)؟ بۆ ئەوەی مانای (تَبُوحُ)ی بێتە نێو، واتە: (إن كَادَت لَتَبُوحُ بِهِ) نیزیک بوو کە دەریبڕێ و ئاشکرای بکات، ئنجا ئەم ڕاناوە (بِهِ) دەچێتەوە بۆ شتێک کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، یانی: (إن كَادَت لِتُبدِي بِالمَوضُوعِ)، واتە: خەریک بوو بابەتەکە ئاشکرا بکات، یاخود دەچێتەوە بۆ مووسا، نیزیک بوو کە مووسا ئاشکرا بکات، کە ئەو مەلۆتکەیە هی ئەوە، یان هاوار بکات، بڵێ: کۆرپەکەم ڕۆ، دوایی دەرکەوێ کە ئەو مەلۆتکەیە کە لەو تابووتەدایە و گیراوەتەوە، کۆرپەی ئەو ئافرەتەیە.

**٣)- ﴿ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾، ئەگەر دڵیمان بەهێز نەکردبایەو، دڵیمان نەبەستبایە، (لَوْلَآ) لێرەدا (حَرْفُ امْتِنَاعٍ لِوُجُودٍ)، پیتی نەبوونی شتێکە لەبەر بوونی شتێکی دیکە، یانی: لەبەر ئەوەی خوا ﷻ دڵی بەستوە، بۆیە دایکی مووسا ﷺ هەواڵەکەی ئاشکرا نەکردوە، یان باسی مووسای ئاشکرا نەکردوە.**

**ئنجا لێرە بە ئاشکرا دیارە کە (فُؤاد) جیایە لە (قَلب)، (فُؤاد) شوێنی بیرکردنەوەیەو، چەقی بیرکردنەوەو هۆش و خولیایە، بەڵام (قَلب) شوێنی بڕیارو ئیرادە و خۆشویستن و ڕەفزکردنە، چونکە خوا ﷻ دڵی دایکی مووسای بەهێز کردوە، بۆ ئەوەی عەقڵی کۆنترۆڵ بکات، کەواتە: دڵ چەقی ئیرادە و ویستن و بڕیاردانە، بەڵام (فُؤاد) چەقی بیرکردنەوەیە، خوا ﷻ دەفەرموێ: عەقڵی دایکی مووسا بۆش و خاڵی بوو، خەریک بوو، دەریخات و ئاشکرای بکات، ئەگەر ئێمە دڵیمان بەهێز نەکردبایە.**

**ئنجا پیتی (عَلَىٰ) کە خراوەتە سەر (قَلب): ﴿ رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾، ئەویش دیسان دەگونجا خوا ﷻ بفەرموێ: (رَبَطْنَاهُ)، واتە: (رَبَطْنَا قَلْبَهَا)، دڵیمان بەست، بەڵام: ﴿ رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا ﴾، ئەم (عَلَىٰ)یە واتاکەی بەهێزتر دەکات، یانی: دەستمان بەسەر دڵی داگرت، کە هیچی لێ نەچێتە دەرو ئەو دڵە بەهێز بێ، تاکو عەقڵیشی کۆنترۆڵ بکات و هیچ شتێک نەدرکێنێ، (الرَّبْطُ: التَّوثِيقُ عَن أَن يَضعُفَ)، (رَبْط) بەهێز کردنە لە بەرانبەر بێهێزییدا.**

**٤)- ﴿ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بۆ ئەوەی دایکی مووسا ﷺ لە بڕواداران بێ، (ل) بۆ (تَعلِيل)ە، بۆیە دڵیمان بەست و بەهێز کرد، تاکو لە بڕوادارانی تێرو تەواو بێ، چونکە بڕوادارانی تێرو تەواو، خۆیان زیاتر کۆنترۆڵ دەکەن، عەقڵیان و دڵیان و زمانیان، هیچ شتێک ناڵێن مایەی زیان بێ، چ لە دنیا و چ لە دواڕۆژدا.**

**٥)- ﴿ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ﴾، بە خوشکەکەیشی گوت: سۆراغی بکە، شوێنی بکەوە، دایکی مووسا لەگەڵ ئەوەشدا کە هۆش و گۆشی لە لا نەماوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خوا**

ﷺ دڵی بەهێز کردوە، کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەداوە، بۆیە بە خوشکەکەی گوت، بە خوشکی مووسای ﷺ گوت: (قُصِّيهِ) سۆراغی بکە، شوێنی بکەوە، بە دوایدا بچۆ، چونکە (القَصُّ: إِتِّبَاعُ الأَثَر)، (قَصّ) بریتیە لە شوێنکەوتنی شوێنەوار، واتە: بە دوایدا بچۆو بزانە چی لێ دێ، ئەو مەلۆتکەیە کە خستوومانەتە ئەو صندووقەوە؟!.

٦)- ﴿فَبَصُرَتۡ بِهِۦ عَن جُنُبٍ﴾، لە دوورەوە بەدی کرد، چاوی لێ بوو، کە بەدوایدا چوو، بە دوای تابووتەکەدا، کە ئاوەکە بردوویەتی ئەویش وردە وردە سۆراغ و پەیسەری کردوە.

(عَن جُنُبٍ: عَـن بُعـدٍ)، لـە دوورەوە، (بَـصُرَ بِـه) لـە (أَبـصَرَ) ماناکـەی بەهێزتـرە، کـە دەفەرمـوێ: (فَبَصُرَتۡ بِهِۦ) ئەویـش دیسـان دەگونجـا بفەرمـوێ: (بَصُرَتـهُ)، یانـی: (رَأَتـهُ)، بـەڵام ئـەم (ب)یـە ماناکـەی بەهێـز دەکات، لـەو ڕووەوە کـە ئەگـەر کەسـێک شـتێک ببینێـت و زۆریـش جێـی گرنگیـی و بایـەخ پێدانـی بـێ، ئـەو (ب)یـە، ئـەو مانایـە دەگەیەنـێ.

٧)- ﴿وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، بێ ئەوەی ئەوان هەست پێ بکەن، ئەوان کێن؟ دیارە نیزیکان و شوێنکەوتووانی فیرعەونن، واتە: بێ ئەوەی ئەوان هەست پێ بکەن، کە ئەو خوشکەی مووسا ﷺ سۆراغی دەکات و پەیسەری دەکات و بەدوایدا دەچێ، ئەوان هەستیان بەوە نەکرد کە ئەوە چاودێریی دەکات.

٨)- ﴿وَحَرَّمۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَرَاضِعَ مِن قَبۡلُ﴾، پێشتریش شیردەرەکانمان لێ قەدەغە کرد بوون، (وَحَرَّمۡنَا) یانی: (مَنَعْنَا) لێرەدا مەبەست لە قەدەغەکردن، قەدەغە کردن و نەهێشتنی تەکوینییە، نەک تەشریعیی، واتە: وامان کرد کە شیردەرەکانی لێ قەدەغە بکەین و مەمکی هیچ ژنێکی شیردەر نەمژێ، تاکو بە ناچاریی بیگێڕنەوەو بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی خۆی.

٩)- ﴿فَقَالَتۡ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰٓ أَهۡلِ بَيۡتٖ يَكۡفُلُونَهُۥ لَكُمۡ﴾، (خوشکی مووسا ﷺ) گوتی: ئایاماڵێکتان پیشان بدەم بۆتان وەئەستۆ بگرن؟ لێرە دیار نیە، داخۆ خوشکی مووسا بە کێی گوتوە؟ بەڵام پێشتر کە دەڵێ: ﴿وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي

﴿وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾، کەواتە: دیارە خوشکی مووسا بە ئافرەتەکەی فیرعەونی گوتوەو، بەوانەش کە لە دەوری بوون، قەرەواش و کارەکەر، دیارە شاژنێک کۆمەڵێک ئافرەتی هەر لە دەورن، یاخود ڕاناوی کۆ (جمع)ی بۆ بەکارهێناوە، وەک ڕێز لێگرتن، واتە: بە ئافرەتەکەی فیرعەونی، گوت: یاخود بە دەوروبەرەکەی گوت: ئایا خاوەن ماڵێکتان، یاخود کەسانی ماڵێکتان پێشان بدەم، کە بۆ ئێوەی وە ئەستۆ بگرن و مشووری لێ بخۆن، ئەم (ف)ی سەر (فَقَالَتْ) (فَصِيحَةٌ)، یانی: چەند قسەیەکی پێشتر دەگەیەنێ (تُفصِحُ عمّا قبلها)، واتە: خوشکەکەی مووسا وای دەرخست، کە هەروا ڕێڕەویی بەلایاندا تێپەڕیوە و، کاتێک نەوەشیگوتوە، کە لە نێو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە: ئەوانە دەیانەوێ دایەنێکی بۆ پەیدا بکەن، خەفتانی شیردەرێکی بۆ دەکەن، ئەویش وای پێشان داوە، کە منیش هەر بە دەم ئێوەوە هاتووم، بیستوومە دەتانەوێ دایەنێک، شیردەرێکی بۆ پەیدا بکەن، ئنجا من کەس و کاری ماڵێکم پێ شک دێ، یان: ژنی ماڵێکم پێ شک دێ، کە بۆتان وەئەستۆ بگرن، (يَكفُلُونَهُ لَكُم): (يَتَعَهَّدون بِحِفظِهِ وَ إرضَاعِهِ)، پەیمان بدەن کە هەم بیپارێزن و، هەم شیریشی پێ بدەن.

١٠)- ﴿وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ﴾، ئەوان بۆشی دڵسۆزن، وەک زۆرجار گوتوومانە: (نُصح)، یانی: دڵسۆزیی و بە خەمەوە بوون و بە تەنگەوە بوون، ئنجا لێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە (نُصح) یانی: دڵسۆزیی، نەگەرنا ئامۆژگاریی چی بکەن، هی مەلۆتکە؟ نا، یانی: بۆی دڵسۆزن، ئنجا ئەم تەعبیرە: ﴿وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ﴾، یانی: ئەوانە عادەتیان وایە، کە هەر منداڵێک وە ئەستۆ بگرن و مشووری لێ بخۆن و بەخێوی بکەن، بۆی دڵسۆزن، هەر عادەتیان دڵسۆزییە لە بەخێو کردنی منداڵدا، ئنجا لە تەفسیرەکاندا - وەک پێشتریش ئاماژەم پێدا - هەندێک لە زانایان لە خەیاڵدانی خۆیاندا هەندێک شتیان داهێناوە بۆ وێنە: فیرعەونییەکان، گوتیان: ئنجا تۆ چۆن، دەزانی بۆی دڵسۆزن؟ یان گوتیان: چۆن ئەو ماڵەت پێ شک دێ؟ تۆش ڕەنگە لەوان بی! بەڵام ئایەتەکە ئاماژەی بەو شتانە نەکردوە.

١١)- ﴿فَرَدَدْنَـٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ﴾ ئنجا گێرامانەوە بۆ لای دایکی. لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: ﴿فَرَجَعْنَـٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ﴾، چونکە لەوێ بۆ مووسای دەگێڕێتەوە، واتە: تۆمان

گێڕایەوە بە مەلۆتکەیی بۆ لای دایکت، بەڵام لێرەدا ئەصڵی بەسەرهاتەکەیە: مووسامان گێڕایەوە بۆ لای دایکی.

١٢)- ﴿كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾، تاکو دایکی دڵخۆش بێ، چاوی گەش بێ.

١٣)- ﴿وَلَا تَحْزَنَ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی خەمبارو دڵتەنگیش نەبێ.

١٤)- ﴿وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾، هەروەها تاکو بشزانێ کە بەڵێنی خوا ڕاستە، واتە: چەسپاوە و ڕاستە و دێتە دی.

١٥)- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەیان، زۆربەی مرۆڤەکان نازانن، نازانن کە بەڵێن و گفتی خوا ﷻ چەسپاوە و دێتە دی، ئەوان بە هۆی بێ ئیمانییەوە متمانەیان بە خوا ﷻ نیە، کەواتە: ئینسان تاکو ئیمانی باشتر بێ، متمانەی بە بەڵێن و گفتەکانی خوا ﷻ زیاتر دەبێ.

لێـرەدا زانایـان باسـی ئەوەیـان کـردوە، کـە ئایـا دایکـی مووسـا هەمـوو جارێـک چـووە بـۆ ماڵـی فیرعـەون و شـیری بە مووسـا داوە؟ یاخـود ئـەو کۆرپەیـەی بردۆتەوە ماڵـی خۆیـان و شـیری پێـداوە؟

بــە دڵنیایــی ناگونجــێ هەمــوو ڕۆژێــک دایکــی مووســا ﷺ بچــێ بــۆ ماڵــی فیرعــەون و، لــەوێ شــیر بــە مووســا ﷺ بــدات، ڕەنگــە ماڵیــان دوور بووبــێ و، هەمـوو جارێـک چـوون بـۆ کۆشـکی فیرعـەون، زەحمـەت بـووە، لـە (پەیمانـی کـۆن) دا، هاتـوە، پێشـتر باسـمان کـرد کـە پێیـان گـوت: کرێـت دەدەینـێ و شـیرمان بـۆ پێـی بـدە، ئەویـش شـیری پێـداوە تاکـو گـەورە بـووەو لـە شـیر بڕاوەتـەوە، ئنجـا دوایـی تەسـلیمی ماڵـی فیرعەونـی کردۆتـەوە، کەواتـە: هـەر لـە ماڵـی بـاب و دایکـی خـۆی و هـەر لـە باوەشـی دایکیـداو، مووسـا ﷺ بـە شـیری دایکـی بەخێوکـراوە و پـەروەردە کـراوە و گـەورە کـراوە.

## كورته باسێك:
## ڕوونكردنەوەیەك دەربارەی (فُؤاد) و (قَلب)

سەرەتا دەڵێم:

یەكەمجار ئەو ڕاستییەم لە كاتی ڕامان و بیركردنەوەم دا لە بارەی قورئانەوە، بۆ دەركەوت، كە لە زیندانی ئەمریكادا هەمبوو، هەروەك یەكەمجاریش لەو مەوسووعەیەی كە لە زیندانی ئەمریكییەكاندا نووسیومە، لە كتێبی دووەمدا كە باسی ئیمان دەكات، تۆمارم كرد، ئنجا دەڵێم: وا باوە كە وشەی (فُؤاد) بە مانای (قَلب) دێ، بەڵام من ئەو ڕاستییەم بۆ دەركەوتوە، كە وشەی هاو واتا (مترادف) لە قورئاندا نین، ئنجا خوا ﷻ وشەی (قَلب)ی بۆ دڵ بەكارهێناوە، كە چەقی ئیرادە و ویستن و نەویستن و خۆشویستن و ڕق لێبوونەوەو قبووڵ كردن و ڕەفز كردنە، بەڵام وشەی (فُؤاد)ی لەگەڵ گوێ (سمع)و چاو (بصیر)دا، بەكارهێناوە، كە هەر سێكیان ئامرازو هۆكاری زانین و دەرككردنن.

ئەمەش چەند بەڵگەیەك كە ناگونجێ (فُؤاد) و (قَلب) بەیەك واتا بن:

١- خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: شوێن شتێك مەكەوە كە زانیاریت لە بارەیەوە نیە، (بە دوای شتێكدا مەچۆ، یاخود قسەیەك مەكە، كە زانیاریت لە بارەیەوە نیە)، چونكە بیستن و بینین و عەقڵ، هەر كامێك لەوانە لێیان دەپرسرێتەوە.

وەك دەبینین:

خوا ﷻ پێشتر دەفەرموێ: بە دوای شتێك مەكەوە كە زانیاریت لە بارەیەوە نیە، (وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ)، یانی: (وَلا تَتَّبِع مَا لَيسَ لَكَ بِهِ عِلم)، شوێن

شـتێک مەکـەوە کـە زانیارییـت لـە بارەیـەوە نیـە، ئایـا زانیاریـی بـە چـی پەیـدا دەبـێ؟ ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ﴾، زانیاریـی بـە بیسـتنی ئـەو شـتانەی کـە لـە مـەودای بینینـدا نیـن، لـە ڕێـی هـەواڵ و بیسـتنەوە، دەسـتگیر دەبـن و، بـە بینیـن و، بـە بیرکردنـەوەی عەقـڵ، وەدەسـت دێ.

کەواتـە: ئـەو سـێیە هەرسـێکیان ئامـرازی بەدەسـت هێنانـی زانیارییـن، مێشـک (عەقـڵ) و چـاو و گـوێ، ئنجـا کـە خـوا دەفەرمـوێ: لێیـان دەپرسرێتـەوە، واتـە: لـە خاوەنەکەیـان دەپرسرێتـەوە، بـەو هێـزی بیسـتنە چـی بیسـت؟ بـە کۆئەندامـی بینین، چـی پـێ بینـی؟ کۆئەندامـی عەقـڵ و هـۆش، چـی پـێ دەرک کـردو، چـی پـێ زانـی؟.

٢- لە سوورەتی (النّحل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾﴾، واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێنا، شتێکتان نەدەزانی، بەڵام سێ کۆئەندامی بۆ ڕەخساندوون تاکو زانیاریان پێ بەدەست بێنن، ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾، بیستن و بینینەکان و عەقڵەکانی بۆ ڕەخساندوون، ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن، واتە: بەو سێیانە زانیاریی بە دەست بێنن و، شوکری خوا بکەن، چونکە شوکری هەر نیعمەتێک ئەوەیە کە نیعمەتەکە لە ڕەزامەندیی خوا ﷻ بەکاربێنی.

٣- لە سوورەتی (الأحقاف)یشدا، خوا ﷻ باسی گەلی عاد دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: ئێمە بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانمان پێدا بوون، بەڵام بیستن و چاوەکان و عەقڵەکان هیچ سوودێکیان پێ نەگەیاندن، چونکە نکوڵییان دەکرد، لە نیشانەکانی خوا ﷻ .

لەوێش دیسان هەر سێکیان پێکەوە دێنێ.

٤- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە ئەو ڕستەیەی سوورەتی (القصص)ە، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ﴾، (فؤاد)ی دایکی مووسا ﷺ خاڵیی و بۆش بوو، خاڵیی بوو لە بیرکردنەوەو هۆش و گۆشی لە لا نەما، دوایی باسی دڵ دەکات و دەفەرمویٚ: ﴿ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا ﴾، خەریک بوو دەریخات، ئاشکرای بکات، ئەگەر دڵیمان بەهێز نەکرد بایە، دڵ چەقی ئیرادە و ویستن و نەویستن و بڕیاردانە، ئەگەر دڵ بەهێز بوو، ئەو کاتە عەقڵ و زمانیش کۆنترۆڵ دەبن.

٥- بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە کە خوا ﷻ لە قورئاندا سەرزەنشتی دڵ دەکات و، مەدحیشی دەکات، بۆ وێنە:

أ- لە ڕووی سەرزەنشتەوە دەفەرمویٚ: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴾البقرة، واتە: خوا دڵیانی مۆر کردوە، هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴿١٠٨﴾ ﴾النحل، واتە: خوا نەخشی خراپی لەسەر دڵیان کێشاوە، دیسان دەفەرمویٚ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمد، ئایا لە قورئانەوە ڕانامێنن یان دڵەکان قفڵیان لەسەرن؟.

ب- لە ڕووی مەدحکردنەوەش دەفەرمویٚ: ﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد، واتە: ئاگادار بن! بە یادی خوا ﷻ دڵان ئۆقرە دەگرن.

بەڵام (فُؤاد) و (أفئِدة)، چ بە حاڵەتی تاک و، چ بە حاڵەتی کۆ، نە زەم کراوە و نە مەدح کراوە، بەڵام خاوەنەکەی، مەدح دەکریٚ و، یان زەم دەکریٚ، بۆ وێنە: بە نسبەت کافرەکانەوە دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعًا وَأَبۡصَٰرًا وَأَفۡـِٔدَةً فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ ﴾الأحقاف، واتە: بیستن و دیتنەکان و عەقڵەکانمان پێیان دا بوون، کەچی بیستنیان و دیتنەکانیان و عەقڵەکانیان، هیچ سوودێکتان پێنەگەیاندن...، چونکە دیتن و بیستن و بیرو هۆش، لە خودی خۆیاندا، زەم و مەدح ناکرێن و بێ لایەنن، بەڵام خاوەنەکەیان مەدح دەکریٚ، ئەگەر بۆ چاکە بەکاریان بێنیٚ، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستیی، هەروەها خاوەنەکەیان سەر زەنشت دەکریٚ، ئەگەر ئەرکی سروشتیی خۆیانیان پیٚ ئەنجام نەدات، بەڵام (قَلب) لە هەموو قورئاندا، بەس بە مانای چەقی ویستن و نەویستن و

بڕیاردان بەکارهاتـوەو بـە گوێـرەی ئـەو بڕیـارو نیـازو مەبەسـتانەی دەشـیانگرێتە خـۆی، لـە چـاک و خـراپ، سـتایش یـان سەرزەنشـت کـراوەو دەکـرێ.

کەواتـە: ئـەوە کـە زۆربـەی توێژەرەوانـی قورئـان گوتوویانـە: (فُـؤاد) و (قَلـب) یـەک واتایـان هەیـە، لـە ڕاسـتیدا تێـی نەگەیشـتوون، بەڵـێ جـاری وا هەیـە وشـەی: (قَلـب) بـە مانـای عەقـڵ بەکارهاتـوە، کـە بـۆ زانیاریـی هەمـوو لایـەک: وشـەی عەقـڵ لـە قورئانـدا، وەک نـاو بـەکار نەهاتـوەو، لـە جیاتـی ئـەو (فُـؤاد) بەکارهاتـوە، بـەڵام وشـەی (قَلـب) بەکارهاتـوە، هەروەهـا (قُلُـوب)یـش بەکارهاتـوە، (فُـؤاد)و (أفئِـدة)ش، بـە تـاک و بـە کـۆ بەکارهاتـوون، بـەڵام وشـەی عەقـڵ بەکارنەهاتـوە، وەک نـاو، بـەڵام وەک حاڵەتـی کـردار (فعـل) بەکارهاتـوە، (یَعقِلـون، تَعقِلُـون، عَقَلُـوهُ) بۆچـی؟ پێـم وایـە ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ، کـە عەقـڵ کاتێـک عەقڵـە، لـە حاڵەتـی جووڵـەدا بـێ و، خاوەنەکـەی بـەکاری بێنـێ و، شـتی پـێ بفامـێ و شـتی پـێ دەرک بـکات.

لـە هەندێـک شـوێنی قورئانـدا وشـەی: (قَلـب) یـان (قُلُـوب) بـە مانـای عەقـڵ و ئامـرازی تێگەیشـتن و، دەرک پـێ کـردن، بـەکاردێ، بـۆ وێنـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾الحـج، واتـە: ئایـا بـە زەوییـدا نەڕۆیشـتوون، ئنجـا دڵانێکیـان هەبـێ پێیـان تێبگـەن، یـان گوێیانێـک پێیـان ببیسـتن؟ ئێسـتا زانسـت دەریخسـتوە کـە بەشـێک لـە ئیـدراک و تێگەیشـتن و بیرکردنـەوە، پەیوەندیـی بـە دڵیشـەوە هەیـە، وەک لـە مەوسـووعەی: (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، باسـم کـردوە: بەشـێک لـە بیرکردنـەوەو عەقـڵ و دەرککـردن پەیوەندیی بە دڵـەوە هەیـە، جـاری واش هەیـە دەگونجـێ (فُؤاد)یـش بـە مانـای دڵ بەکارهاتبـێ، بـۆ وێنـە: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ .. ﴾هـود - ١٢٠-، بـە تەئکیـد چەقـی بیرکردنـەوە عەقڵـە، کـە (فُـؤاد)ی بـۆ بەکارهاتـوە لـە قورئانـداو، چەقـی بڕیـاردان و ئیـرادەش دڵـە، کـە لـە قورئانـدا: (قَلـب)ی بـۆ بەکارهاتـوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هەشـت (٨) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (١٤ - ٢١) کـە قۆناغی سـێیەمی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـایان ﷺ تیدایـەو، تیایانـدا باسـی پێگەیشـتن و کامڵبوونـی مووسـا ﷺ کـراوە، هەروەهـا کوژرانـی بابایەکـی قیبتیـی بـە دەسـتی مووسـا، کـە لەگـەڵ پیاوێکی بەنـوو ئیسـرائیلییدا بـە شـەڕ هاتـوون، هەڵبەتـە مووسـا ﷺ بـە مەبەسـتی کوشـتن، مسـتی لێنـەداوە، بۆیـە یەکسـەر کارەکـەی پاڵداوەتـە لای شـەیتان و، داوای لێبوردنـی لـە خـوای میهرەبـان کـردوە.

پاشـان فیرعەونییـەکان کەوتوونـە پشـکنین و گـەڕان بەدوایـدا و، ئەویـش کەوتۆتـە حاڵەتـی خـۆ پەنهانکـردن و بیرکردنـەوە لـە ڕاکـردن و سـەرەنجام بـە پەنهانیـی خـۆی دەربـاز کـردوەو بـەرەو دەڤـەری مەدیـەن ڕۆیشـتوە.

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصۡبَحَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَسۡتَصۡرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيّٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ

لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢١﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[کاتێکیش (مووسا) گەیشتە حاڵەتی پێگەیشتن و تێرو تەواو بوو، حیکمەت و زانستمان پێدا و، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١٤﴾ مووسا لە کاتی خافڵانی خەڵکەکەیدا چووە نێو شارو، دوو پیاوی دیتن شەڕیان پێکەوە دەکرد، ئەمیان لە کۆمەڵەکەی (بەنوو ئیسرائیل) و ئەمیان لە کۆمەڵی دوژمنەکەی، یەکسەر ئەوەیان کە لە کۆمەڵەکەی خۆی بوو، هاواری تێبەست لە دژی ئەوەیان کە لە دوژمنەکەیەتی، مووساش کوڵە مستێکی لێدا و تەواوی کرد (کوشتی)، (دوایی) گوتی: ئەم (مست وەشاندن)ە، لە کردەوەی شەیتان بوو، بێگومان ئەو دوژمنێکی لە ڕێ لادەری ئاشکرایە (بۆ مرۆڤ) ﴿١٥﴾ مووسا پاڕایەوە، گوتی: پەروەردگارم! من ستەمم لە خۆمکرد (کە بە شێوەیەکی هەڵە ئەو کابرایەم کوشت)، ئنجا لێم ببوورە، (خواش) لێیبورد، بە دڵنیایی هەر ئەو (خوا) لێبوردەی بە بەزەییە ﴿١٦﴾ مووسا لەبەر خوا پاڕایەوە گوتی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەو چاکەیەوە کە لەگەڵتدا کردووم، هەرگیز پاڵپشتی تاوانباران نابم ﴿١٧﴾ ئیدی (مووسا دوای ئەوە) کەوتە حاڵەتی ترسان و چاودێریی دەکرد (داخۆ چی لە دژ دەگوزەرێ؟) کت وپڕ ئەو پیاوەی دوێنێ داوای هاوکاریی لێکرد، هاواری لێکرد (پەنای بۆ برد)، (کە دیسان یارمەتیی بدات)، مووساش پێیگوت: بەڕاستیی تۆ بێمرادو سەرگەردانێکی ئاشکرای، (واتە: ئەوەندە خەریکی شەڕو تەشقەڵەی) ﴿١٨﴾ ئنجا کاتێک (مووسا) ویستی دەست لەو کەسە بوەشێنێ، کە دوژمنی هەردووکیانە، گوتی: ئەی مووسا! وەک چۆن دوێنێ کەسێکت کوشت، دەتەوێ منیش بکوژی! تۆ تەنیا مەبەستتە زۆردارێکی دڵڕەق بی لە زەویداو،

ناتـەوێ لـە چاکسـازییکاران بـی ﴿١٩﴾ پیاوێکیـش لەوپـەڕی شـارەکەوە بەخێرایـی هـات، گوتـی: مووسـا! بڕیـار بەدەسـتان (کار بەدەسـتان)، لـە بارەتـەوە کۆبوونـەوەو ڕاوێـژ دەکـەن، تاکـو بتکـوژن، (لـە شـار) بچـۆ دەرێ، من بـۆ تۆ لە دڵسـۆزانم ﴿٢٠﴾ (مووسـاش) بەترسـەوە لێـی چـووە دەرێ و، (شـارەکەی بەجێهێشـت و چاودێریـی دەکـرد)، لەبـەر خۆیـەوە گوتـی: پـەروەردگارم! لـە کۆمەڵـی سـتەمکاران قوتـارم بکـە! ﴿٢١﴾].

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَشُدَّهُۥ): (أَشُـدّ: جَمْـعُ شِـدَّة، مِثْـلُ نِعْمَـة: جَمْعُهَا أَنْعُـم، أَي: القُـوَّةُ وَالكَـمَال)، (أَشُـد) کـۆی (شِـدَّة)یە، وەک چـۆن (أَنْعُـم) کـۆی (نِعْمَة)یـە، ئنجـا مەبەسـت لـە (أَشُـد) هەمـووی بـە یـەک مانـا دێ، واتـە: هێـز و پێـز و تێـرو تـەواو بـوون، هـەم لـە ڕووی جەسـتەیی و، هـەم لـە ڕووی دەروونییـەوە.

(وَٱسْتَوَىٰٓ): (الإِسْتِوَاءُ: إِعْتِـدَالُ الـشَّيْءِ فِي ذَاتِـهِ)، (إستواء) بریتیـە لـەوەی شـتێک لـە زاتـی خۆیـدا تێـرو تـەواو و هاوسـەنگ و ڕێـک بـێ.

(فَٱسْتَغَٰثَهُ): هـاواری تێبەسـت، داوای یارمەتیـی لێکـرد، (الغَـوْثُ فِي النُّـصْرَة)، داوای هاوکاریـی بـۆ سـەر خسـتن، (الإِسْـتِغَاثَةُ: طَلَـبُ الغَـوْثِ، وَهُـوَ التَّخْلِيـصُ مِـنَ الشِّـدة)، (غَـوْث) بەفریـا هاتـن، (إِستغاثة) داوای یارمەتیـی لێکـرد، (إِسْـتِغَاثَة) بریتیـە لـە داوای دەفریاهاتــن (غَـوْث) کـردن، ئەویـش بریتیـە لـە دەربـاز کـردن لـە ناڕەحەتیـی و سـەختیی.

(فَوَكَزَهُۥ): واتـە: مسـتی لێـدا، (الوَكْـزُ: الطَّعْـنُ، وَالـضَّرْبُ بجَميـعِ الكَـفِّ، والدَّفْـع)، (وَكْز) بـەو مانایانـە دێ: بـە مانـای: لێـدان، بـە مانـای: لێـدان بـە کـۆی لەپـە دەسـت و پەنجـەکان کـۆ بکەیـەوە، بـە کوردیـی (مسـت)ی پـێ دەڵێـن، یـان کۆڵـە مسـت، بـە مانـای: پاڵپێوەنانیـش دێ.

(فَقَضَىٰ عَلَيْهِ): تـەواوی کـرد، کوشـتی، (القَضَـاءُ: فَصْـلُ الأَمْـرِ فِعْـلاً كَانَ أَو قَـوْلاً)، (قَضَـاء) بریتیـە لـە ئەنجامدانـی کارێـک، بـە قسـە بـێ یـان بـە کـردەوە.

(ظَهِيرًا): پاڵپشـت، (ظَاهَرْتُـهُ: أَعَنْتـهُ، ظَهِير: مُعِين)، (ظَاهَرْتُـهُ) یارمەتییـم دا لـە دژی لایەنێکـی دی، (ظَهِير)یـش بـە مانـای هـاوکارو پاڵپشـت دێ.

(يَتَرَقَّبُ): (الرَّقِيـب: الحَافِـظ)، (رَقِيـب) چاودێـر، ئنجـا کەسـێ چاودێریـی شـتێک بـکات، دەیپارێـزێ.

(يَسْتَصْرِخُهُ): (الإِسْـتِصرَاخُ: المُبَالَغَـةُ فِي الـصُّرَاخِ أَي: النِّـدَاء)، (يَسْتَصْرِخُهُ) واتـە: زێدەڕۆیـی دەکـرد لـە هـاوار لێکـردن و بانـگ کـردن دا، بـە دەنگـی بـەرز هـاواری تێدەبەسـت.

(لَغَوِيٌّ): (غَـوِي أي: خَائِـب)، واتـە: بێمـراد، سـەرگەردان، (غَـوِي: جَاهِـلٌ بِسَـبَبِ اعتِقَـادٍ فَاسِـد)، (غَوِي) واتـە: نەزانێـک بەهـۆی بـڕوا پێبوونێکـی غەڵەتـەوە، هەروەهـا (غَـوِيَ: فَسَـدَ عَيْشُـهُ)، ژیانەکـەی تێکچـوو بێمـرادو سـەرگەردان بـوو، بـێ نـاکام بـوو.

(يَبْطِشَ): (البَطْـشُ: الأَخْـذُ بِشِـدَّةٍ وَعُنْـفٍ، وَالمُـرَادُ بِـهِ: الـضَّرْبُ)، (بَطـش) بریتیـە لـەوە شـتێک بـە توندیـی بگیـرێ، یـان بـە تونـدو تیژیـی، لێـرەدا مەبەسـت پێـی لێدانـە، وەک زەبـر لـێ وەشـاندن، یـان بـە تیـن و هێـز پردانـە شـتێک.

(جَبَّارًا): (الجَبَّارُ: الَّـذِي يَفْعَـلُ ما يُرِيـدُ مِـمَّا يَضُرُّ بِالنَّـاسِ وَيُؤاخِـذُ النَّـاسَ بِالشِّـدَّةِ)، (جَبَّـار) ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (جابـر)ە، ئەویـش کەسـێکە زۆر لـە کەسـێک دەکات، هەروەهـا (جَبَّارُ) ئـەو کەسـەیە کـە ئـەوەی زیـان بـە خەڵـک دەگەیەنـێ، ئەنجامـی دەدات و، گوێـش ناداتـێ، دیسـان ئـەو کەسـەیە بـە توندیـی خەڵـک دەگـرێ و خـراپ مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکات.

(أَقْصَا): (أَي: أَبْعَـد) لـە دوورترین شـوێنی شـارەکەوە، چونکە (القَصِي: البَعِيد)، وەک دەربـارەی مەریـەم (خـوا لێـی ڕازیبـێ) خـوا فەرموویەتـی: ﴿ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ

﴿مَكَانًا قَصِيًّا ۝٢٢﴾ مريم، واتە: چووە شوێنێکی دوور، کاتێ کە ژانی منداڵبوونی عیسای ؈ هاتێ.

(يَسْعَىٰ): (السَّعِيُ: السَّيْرُ السَّرِيع)، (سَعي) بە مانای ڕۆشتنێکی خێرا دێ، بە بێ ئەوەی کە بکاتە ئەندازەی ڕاکردن، یانی: لە ڕۆیشتنی ئاسایی خێراتر.

(ٱلْمَلَأُ): (الجَمَاعَةُ أُولُوا الشَّأْنِ)، (ملأ) کۆمەڵێکی کار بە دەست و بڕیار بە دەست، کە ئەوان کار هەڵسووڕێنەرن.

(يَأْتَمِرُونَ): (أَي: يَتَشَاوَرُونَ) ڕاوێژ دەکەن، (وَأَصْلُ الإِئْتِمَارِ قُبُولُ أَمْرِ الآخَرِ، فَهُوَ مُطَاوِعُ أَمَرَهُ، ثُمَّ شَاعَ اسْتِعْمَالُهُ فِي التَّشَاوُرِ)، وشەی (إئتمار) لە ئەصڵدا بریتییە لە وەرگرتنی فەرمانی فەرمانکەرێک، (مُطَاوِع أَمَرَ)یە (أَمَرَهُ فَائْتَمَرَ) فەرمانی پێکرد، ئەویش فەرمانەکەی قبووڵ کرد، دوایی بەکارهێنراوە بۆ ڕاوێژکردن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتریش باسمان کرد، ئەم هەشت (٨) ئایەتە، باسی ئاڵقە و قۆناغی سێیەمی ژیانی مووسا ؈ دەکەن، کە تەنیا لێرەدا ئەم ڕووداوە باسکراوە، تەنیا لە سوورەتی (القصص)دا، ئەو ڕووداوە باسکراوە لە سوورەتی (الشعراء)دا، لە ئایەتەکانی: (١٤ و ١٩ و ٢٠)دا، کە فیرعەون بە چاوی مووسای دادەداتەوەو دەڵێ: ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝١٩﴾ الشعراء، دوایی مووساش ؈ دەڵێ: ﴿فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ۝٢٠﴾ الشعراء، لەو سێ ئایەتەدا، تەنیا ئاماژەی پێکراوە، هەروەها لە سوورەتی (طه) لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ﴾ طه، نەفسێکت کوشت، بەڵام تۆمان لە خەم و پەژارە دەرباز کرد، ئەمە تەنیا ئاماژە پێکردنە بە کوشتنی بابای

قیبتیی، بەڵام چۆنیەتیی کوشتنی و هۆکارەکەی، تەنیا لەم سوورەتی (القصص)دا، لەو ئایەتانەی ئێستا خەریکی تەفسیرکردنیانین، هاتوە.

خوا ﷻ لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا ﷺ بەردەوام دەبێ، دیارە لە قۆناغی مەلۆتکەیی کە لە ماڵی فیرعەوندا گیراوەتەوەو، دوایی بە نەخشەیەک کە خوا ﷻ دایناوە، مووسای مەلۆتکە چۆتەوە لای دایکی خۆی و، دایکی شیری پێداوە و بەخێوی کردوە، لەوێ ئەو بەسەرهاتە کۆتایی پێ هێنراوەو، ئەوی دیکە هەمووی پێچراوەتەوە، کە دوایی مووسا ﷺ ئەو کاتە کە پێڕۆچکە بووە، یان ئەو کاتە کە چۆتە قۆناغێکی دیکەی فامیدەیی (تمییز)، دوایی قۆناغی هەرزەکاریی، دوایی قۆناغی گەنجیەتیی یەکەم، دواتریش گەنجیەتیی دووەم، ئەوانە هەموویان پێچراونەوەو، یەکسەر هاتۆتە سەر شوێنی مەبەست:

﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ﴾، هەروەها کاتێک گەیشتە ئەوپەڕی هێزی و پێگەیشت، (و) بۆ یادانەوەو گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەیە، بۆ سەر هی پێشێ، واتە: بەم شێوەیە مووسا ﷺ قۆناغەکانی هەڵبواردن و گوزەراندن و، کاتێک گەیشتە تۆغیانی خۆی و، گەیشتە حاڵەتی پێگەیشتن، ﴿ وَٱسۡتَوَىٰٓ ﴾، یانی: لە رووی جەستەییەوە تێرو تەواو بوو، لە رووی دەروونییشەوە پێگەیشت، کامڵبوو، ﴿ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ ﴾، ئێمە هەم حیکمەت و لێزانییمان پێداو، هەم زانیارییشمان پێدا، حیکمەت و لێزانیی زیاتر پەیوەندیی بە لایەنی کردەییەوە هەیە و، زانیارییش پەیوەندیی بە لایەنی تیۆریی و زانین و ئیدراکەوە هەیە، واتە: هەم لە رووی شت زانین و، هەم لە رووی کارامەیی و شت توانین و هەڵسوکەوت و ئاکاری بەجێوە، ئێمە هەردووکیانمان بە مووسادان ﷺ، هەم حیکمەتمان پێدا و، هەم زانستمان پێدا، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، هەر ئاواش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، واتە: هەر کەسێک چاکەکار بێ، خوا ﷻ بە دەمیەوەیەتی و بە تەنگیەوەیەتی و لە نیعمەتەکانی خۆی پێی دەدات، بە ئەندازەی ئەوە کە لە بارانیدا هەیەو شایستەیەتی.

﴿ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا ﴾، مووسا ﷺ چووە نێو شارەکە، لە کاتێکدا خەڵکەکەی بێ ئاگا بوون، یان لە خەوی نیوەڕۆدا بوون، وەک زۆربەی تەفسیرەکان دەڵێن: لە قەیلوولەدا بوون، سەر خە و شکاندنی نیوەڕۆ و، پێش نیوەڕۆ، دوای نیوەڕۆ، یاخود: ﴿ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا ﴾، خوا ﷻ دیاریی نەکردووە بەگشتیی فەرموویەتی: کاتێک کە خەڵکەکە بێ ئاگا بوون، وا پێدەچێ لە ڕۆژدا بوو بێ، بەڵام لە چ وەختێکی ڕۆژدا بووە؟! ئایا لەبەر ئەوە خەڵکەکە بێ ئاگا بوون، کە بە کارو کاسبییەوە سەرقاڵ بوون؟! یان لە کاتی نوێژی عەسردا بووە؟! یان لە کاتی خەوتن و پشووودانی لای نیوەڕۆدا بووە؟! خوا ﷻ دیاریی نەکردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە خەڵکەکە جۆرێک لە سەرقاڵیی و خافڵانیان هەبووە، ﴿ فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ ﴾، لەو کاتەدا دوو پیاوی دیتن، پێکەوە لە یەکدییان دەدا، ﴿ يَقْتَتِلَانِ ﴾، یانی: (يَتَضَارَبَان) لە یەکدییان دەدا، شەڕیان پێکەوە دەکرد، دەمەقاڵێیان بوو و، بەڵام دەمەقاڵێیەکە بەس بە قسە نەبوو، بەڵکو سەری کێشا بوو بۆ دەست لێک وەشاندن، ﴿ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾، ئەمەیان لە کۆمەڵەکەی خۆی، کە بەنوو ئیسرائیلن و، ئەویدیکەشیان لە دوژمنەکەی، کە قیبتییەکان و فیرعەونییەکانن، ئەوانەی پەیڕەوانی فیرعەون بوون، ﴿ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ ﴾، ئەوەیان کە لە کۆمەڵەکەی خۆی بوو، واتە: لە بەنوو ئیسرائیل بوو (لە نەوەی ئیسرائیل)، هاواری تێبەست، هاواری بۆ برد، ﴿ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾، لە دژی ئەوەی لە دوژمنەکەی بوو، وا دیارە بێچارە بووە لەبەر دەستییداو پێی نەوێراوە، باری وی نەبردوەو، هاواری لە مووسا ﷺ بەستوە، ئنجا هەر ئەوە کە نەوەی ئیسرائیل بووە، هاواری لە مووسا بەستوە، بەڵام ئەمە لێی وەردەگیرێ، کە مووسا ﷺ ئەو کاتە زانراو بووە، لە نێو بەنوو ئیسرائیلدا، کە ئەوە لە خۆیانە، بەڵێ لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بووە، بەڵام کوڕی فیرعەون نیە، بەڵکو لە بەنوو ئیسرائیلییەکانە و، تێیان ڕابینیوە، مەرجیش نیە، ئەمە یەکەم هەڵوێستی جوامێرانەی مووسا ﷺ بووبێ، ئەگەرنا هەر

یەکسەر بەنوو ئیسرائیلییەک کە گرفتار بووە بە دەستی فیرعەونییەکەوە، کە لێی دەدات و ئەزیەتی دەدات، ئەویش هاواری تێ دەبەستێ، دەبێ مووسا ﷺ پێشینەی ئەو هەڵوێستانەی بووبێ، هەندێک لە زانایان ڕستەی، ﴿ فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِی مِن شِیعَتِهِۦ ﴾، یان والێکداوەتەوە کە: مووسا ﷺ جۆرێک لە ڕێکخستنی لە نێو بەنوو ئیسرائیل دا دروستکردوە، کۆمەڵێکی لە نێودا دروست کردوون و هۆشیاری کردوونەوە، بۆ بەرگریی لە خۆ کردن، هەر ئەوە کە ئەو ئیسرائیلییە ئامادە بووە، دەستەوکەر[1] بکات و، بە گژ بابای فیرعەونیی دا بچێتەوە، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە مووسا ﷺ جۆرێک لە هۆشیاریی و جۆرێک لە جورئەت و ئازایەتیی و غیرەتی لە نێو خەڵکەکەی خۆیدا بڵاوکردۆتەوە، کە تەسلیم نەبن و، دەستەوکەر بکەن.

ئنجا دوای ئەوەی کەسێک کە لە کۆمەڵەکەی خۆیەتی، هاواری تێبەست و، پەنای بۆ برد، لە دژی ئەو کەسەی لە دوژمنەکەیەتی، ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ ﴾، بە (ف) ی بەدواهاتن (تعقیب)، یەکسەر مووسا ﷺ مستێکی لێ دا، (وَكْز) بە مانای کوڵە مست دێ و، بە مانای پاڵ پێوەنانیش دێ و، بە مانای لێدانیش دێ، ﴿ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِ ﴾، یەکسەر کۆتایی پێ هێنا، بۆیە نەیفەرموە: (فَقَتَلَهُ)، کوشتی چونکە مووسا ﷺ نەیویستوە بیکوژێ، مستێکی لێ داوە، کە دووری بخاتەوە لەو مەزلوومە، بەڵام مووسا ﷺ پیاوێکی زۆر بەهێز و بەتین و تاقەت بووەو بە مستەکە کوشتوویەتی، هەرچەندە مەبەستی نەبووە بیکوژێ، ﴿ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، مووسا گوتی: ئەمە لە کردەوەی شەیتانە، واتە: ئەوە کە من هەڵچووم و خۆم پێ کۆنتڕۆڵ نەکراو، مستەکەم زۆر بەهێز وەشاند، ئەوە لە کردەوەی شەیتانە، هەندێک لە توێژەرەوان گوتوویانە: یانی: ئەو کابرایە لە کردەوەی شەیتانەو کوڕی بابی خۆی نیە! بەڵام لە ڕاستییدا ئەو مانایە دوورە، بەڵکو یانی: ئەوەی من کردم بە دنەدانی شەیتان بوو، شەیتان ورووژاندمی

---

(١) دەستەوکەر: مُدافِع، لە (دەستکردنەوە)وە هاتوە.

کـە مسـتەکە زۆر بەهێـز بوەشـێنم، ﴿ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴾، بەڕاسـتیی شـەیتان دوژمنێکـی گومڕاکـەری ڕوون و ئاشـکرایە.

ئنجـا مووسـا ﷺ لەبـەر خۆیـەوە پاڕاوتـەوە: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ ﴾، گوتـی: پـەروەردگارم! مـن ستەمم لـە خـۆم کـرد، لێـم ببـووره، ئنجـا خـواش لێیبـورد، خـوا ﷻ چاوپۆشـیی لێکـردوه و لێـی بـوردوه و، لەلایـەن خۆیـەوە، خـوا ﷻ بـەس بـۆ خـۆی دەزانـێ و خـۆی بۆمـان بـاس دەکات، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زۆر لێبوردەیـە و زۆریـش میهرەبانـە.

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ ﴾، مووسـا ﷺ فەرمـووی: پـەروەردگارم! بـە هـۆی ئـەوەوە چاکـەت لەگەڵمـدا کـردوه، ﴿ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾، هەرگیـز مـن نابمـە پشـتیوانی تاوانبـاران.

زۆربـەی توێـژەرەوان وایـان لێکداوەتـەوە کـە مووسـا ﷺ گوتـی: پـەروەردگارم! بـە هـۆی ئـەوەوە کـە تـۆ چاکـەت لەگەڵـم کـردوە، کـە لێمببـووری.

بەڵام ئایا مووسا ﷺ چۆنی زانی، خوا ﷻ لێیبوردوە؟!

بۆیـە پێـم وایـە واتاکـەی وا نیـەو، ئەگـەر وابایـە، دەیفەرمـوو: (بِمَا غَفَرْتَ لِي) بـەڵام فەرموویەتـی: ﴿ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ ﴾، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە چاکـەت لەگـەڵ کـردووم، یـانی: هێـز و پێزێکـی باشـت داومـێ، غیـرەت و ئازایەتییـت پـێ بەخشـیوم، جوامێریـی و بەزەییـت پێـداوم، چونکـە ئـەو نیعمەتانـەت بـە مـن داون، ﴿ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾، مـن هەرگیـز پشـتیوانی تاوانبـاران - وەک ئـەو قیبتییـە - نابـم، کـە سـۆغرە و بێـگار بـە بەنـوو ئیسـرائیلییەکان دەکـەن و دەیانچەوسـێننەوە، مـن هەرگیـز پشـتی ئەوانـە ناگـرم، بەڵکـو لای ئـەو ستەملێکراو و چەوسـاوانە دەبـم.

یاخـود مەبەسـت ئەوەیـە: هەرگیـز جارێکـی دیکـە ئەوانـەی کـە خراپـە دەکـەن، پشـتگیرو هاوکاریـان نابـم، وا پێدەچـێ ئەمـە جۆرێـک لـە گلەیـی بـێ لـە بەنـوو

ئیسرائیلییەکە، کە تۆ مادام باری ئەو قیبتییە نابەی، بۆچی شەڕی لەگەڵدا دەکەی؟! ئاژاوەیەک ساز دەکەی، کە دوایی بەسەر خۆتدا دەشکێتەوە، من جارێکی دیکە پشتیوانی لەو تاوانبارانە ناکەم، کە شەڕێک دەکەن، لە توانای خۆیاندا نیە، یان بەگژ کارێکدا دەچن، کە بڕست و توانایان لە بەرانبەریدا نیە.

﴿ فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ﴾، ئیدی مووسا لە شارەکەدا کەوتە حاڵەتی ترسان و، چاودێریی دەکرد، چاودێریی دەکرد بزانێ، داخۆ لە بارەی ئەوەوە چی دەگوترێ و، چی ناگوترێ؟ ئەفەرێکی کوشتوە، بزانێ داخۆ چ دەرەنجامێکی دەبێ و چ دەرکەوتەیەکی دەبێ؟! ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴾، یەکسەر کت و پڕ بینی: ئەو کەسەی دوێنێ داوای یارمەتیی لێکردو، مووساش یارمەتییەکی باشی داو، کابرای دوژمنی بە کوڵە مستێک کوشت، ﴿ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴾، دیسان هاواری تێدەبەست و داوای یارمەتیی لێ دەکرد، ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴾، مووساش ﷺ پێی فەرموو: بە دڵنیایی تۆ بابایەکی بێمرادو سەرگەردانی ڕوون و ئاشکرای، واتە: دوێنێ تۆ شەڕو گێچەڵێکت کردو، بەهۆی تۆوە ئەفەرێکم کوشت، ئەمڕۆ دەبوو خۆت بپارێزی، کەچی دیسان گێچەڵ و ئاژاوەیەکی دیکەت، ساز کردووەو، هاواریش لە من دەبەستی؟! تۆ ئەگەر خۆت شەڕەکەت پێ ناکرێ، بۆچی دەیکەی؟! ئنجا مووساش ﷺ بەهۆی ئەو ئەفەرەوە کە کوشتوویەتی، کەوتۆتە حاڵەتی چاودێریی و ترسەوە، پێی ناخۆش بووە، کە ئەگەر دیسان ئەو کابرا قیبتییەش بە دەستی بکوژرێ، دەکاتە دوو قەتڵ و زیاتر دەکەوێتە حاڵەتی چاودێریی و ترسان و دڵەڕاوکەوە، بۆیە پێیگوتوە: تۆ بابایەکی سەرگەردان و بێمرادی ڕوون و ئاشکرای.

﴿ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا ﴾، ئنجا کاتێک مووسا ﷺ ویستی زەبر بوەشێنێ، لەو کەسەی دوژمنی هەردووکیانە، واتە: زەبر لە قیبتییەکە، لە فیرعەونییەکە، بوەشێنێ و لێی بدات، وا دیارە ئیسرائیلییەکە باری نەبردوەو، لەبەر دەستیدا زەبوون بووە، ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ﴾،

گوتی: ئەی مووسا! دەتەوێ منیش بکوژی، وەک چۆن دوێنێ کەسێکت کوشتوە؟! ئەمە وا پێدەچێ قسەی کابرای قیبتیی بوو بێ، ئەوەی دوژمنیان بووە، چونکە مووسا ﷺ پەلاماری داوەو، بۆی چووە، ئەویش گوتوویەتی: دەتەوێ منیش بکوژی، وەک چۆن یەکێکی دیکەشت کوشت؟! هەندێکیش دەڵێن: ئەمە قسەی ئیسرائیلییەکە بووە، چونکە مووسا سەر زەنشتی کردوە و، قسەی پێگوتوە، دوایی بە تووڕەیی پەلاماری داوە و، ئەویش وایزانیوە مووسا دەیەوێ سزای بدات، کە بۆچی دوێنێ گێچەڵێکت کردوەو، بە هۆی ئەوەوە نەفەرێک کوژراوە و، ئەمڕۆش دیسان شەڕو ئاژاوەیەکی دیکەت ساز کردوە؟ وایزانیوە لەگەڵ ویەتی، دەڵێن: ئەو قسەیە، قسەی وی بووە، چونکە کابرای قیبتیی نەیزانیوە مووسا ﷺ ئەو نەفەرەی کوشتوە، بەڵام ئیسرائیلییەکە زانیویەتی کە دوێنێ مووسا ﷺ لەسەر وی نەفەرێکی کوشتوە، بە هەر حاڵ ئەمەش ڕێی تێدەچێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ، قسەی قیبتییەکە بووبێ، ئنجا پێی دەڵێ: ﴿إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، تۆ بەس دەتەوێ خۆسەپێن بی و مل پێکەچکەر بی، لە زەوییدا، یانی: شەقاوە بی لەسەر زەمینی میسرِدا! ﴿وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾، تۆ ناتەوێ لە چاکسازییکاران بی.

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە مووسا ﷺ دەبێ ناو و ناوبانگی وا ڕۆیشتبێ، کە لە چاکسازییکارانە و، لە کەسانێکە کە گرفت و کێشە چارەسەر دەکات و، بەشێک نیە لە گرفت و کێشە، بۆیە کابرا دەیەوێ پێی بڵێ: تۆ وەک ناوت ڕۆیشتوە کە لە چاکسازییکارانی، وانی، بەڵکو دەتەوێ لە خۆسەپێنەران و مل پێکەچکەران بی.

لێرەدا خوا ﷻ کۆتایی بە باسی ئەو شەڕو گێچەڵە دێنێ، کە پێویستیی نەکردوە مووسا ﷺ دەست لە کابرای قیبتیی بوەشێنێ، یاخود لە کابرای ئیسرائیلی، بەپێی ڕای دووەم و، خۆیان لێکبوونەتەوە.

﴿ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ ﴾، پیاوێکیش لەوپەڕی شارەکەوە هات، ئایا هەر لەو کاتەدا، لەو ئان و ساتەدا، یاخود ماوەیەکی پێچووە، چونکە نەیفەرمووە: (فَجَاءَ) تاکو بڵێین: ئەگەری هەیە (ف)ی بەدواداهاتن (تعقیب)بێ، چونکە ئەگەر وای فەرمووبایە، یانی: یەکسەر دوای ئەوە، پیاوێکیش هات، نا، بەڵکو دەفەرموێ: (وَجَآءَ)، ڕەنگە ماوەیەکی پێچووبێ، پیاوێک هات لەو پەڕی شارەوە، لە شوێنێکی دوورە دەستی شار، (يَسْعَىٰ) بە خێرایی دەڕۆیی، بەڵام نەدەگەیشتە ڕاددەی ڕاکردن و غاردان(١)، پیاوێک بە خێرایی دەهات، لەو پەڕی شارەوە، دیارە زۆر بە خەم مووساوە بووە، ﴿ قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ﴾، گوتی: ئەی مووسا! بڕیار بە دەستان و کار بەدەستانی شار، ڕاوێژ دەکەن، لە دژی تۆ، تاکو بتکوژن، لە تەگبیرو ڕاوێژ کردن و کۆبوونەوەدان، پیلانێکت لە دژ دابنێن، بۆ کوشتنت، ﴿ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴾، ئنجا بڕۆ دەر، بڕۆ وەدەرکەوە، لە شار، من لە دڵسۆزانم بۆ تۆ، واتە: هێندە بۆ تۆ دڵسۆز و بەتەنگەوەم، چوومە نێو قەدی دڵسۆزانەوە.

ئنجا ئایا ئەو پیاوە کێ بووە؟!

هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو پیاوە بڕواداره بووە کە لە سوورەتی (غافر)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ ﴿٢٨﴾ ﴾غافر، واتە: پیاوێکی ئیماندار کە ئیمانەکەی خۆی پەنهان دەکرد، لە دارو دەستەی فیرعەون، گوتی: ئایا

---

(١) بە زاراوی خەڵکی هەولێر، نەك بە زاراوی خەڵکی سلێمانیی، کە ئەوان غار تەنیا بۆ وڵاخ بەکاردێنن، بەڵام من پێم وایە لە ڕووی زمانی کوردییەوە، وشەی غار دەگونجێ، بۆ مرۆڤیش بەکار بێ و، دەشگونجێ بۆ وڵاخیش بەکار بێ، چونکە لە سلێمانیی وشەی (ڕاکردن) بەکاردێنن، لە جیاتی (غاردان)، بەڵام لە ڕاستیدا ڕاکردن ئەوەیە کە ئینسان لە شتێك ڕابکات، دەڵێ: بۆی چووم و ڕایکرد، ڕاکردن، واتە: هەڵاتن، بەڵام غاردن بریتیە لە ڕۆیشتنێکی خێراتر لە ڕۆیشتنی خێرا، هەڵبەتە جاری واشە وشەی (ڕاکردن - رکض) بە مانای غاردان بەکاردێ.

پیاوێــک دەکــوژن، هــەر لەبــەر ئــەوەی دەڵــێ: پــەروەردگارم خوایــە؟! بەرگریــی دەکات لـە مووسـا ﷺ، ئەگەریشی هەیـە ئـەو بووبـێ، چونکـە ئـەو کەسـەی کـە لـەو پـەڕی شـارەوە بـێ، دیـارە هەواڵەکـەی بـە مسـۆگەریی زانیـوە، بۆیـە ناگونجـێ کەسێکی ئاسایی بووبێ، ئەگـەر ئـەو پیاوە بـڕوادارەش نەبـوو بـێ، کـە ئیمانەکـەی شـاردۆتەوەو، بەرگرییەکـی جوامێرانـەی لـە مووسـا ﷺ کـردووەو، واش پێدەچـێ سـەری خـۆی لەسـەر دانابـێ، بـە تەئکیـد کەسـێک بـووە کـە ئـاگای لـەو دەنـگ و باسـە بـووە، کەسـێک بـووە شـارەزا بـووە و، لەوانەیـە کەسـێک بووبـێ، کـە لـە نێـو دام و دەزگای حوکمڕانیــی فیرعەونــدا بووبــێ و، ئــاگاداری شــتەکە بــووە، بۆیــە وا بـە مسـۆگەریی و دڵنیایـی، دەڵـێ: ئەوانـە لـە کۆبوونـەوەدان، نەفەرێکـی بەنـوو ئیسـرائیلیی، کـە سـۆغرەو بێگاریـان پێکـراوە، ئـاگای لـە کۆبوونـەوەی بڕیـار بـە دەسـتانی کـۆڕو مەجلیسـی فیرعـەون نەبـووە.

کەواتـە: دەبـێ کەسێکی نیزیـک لـە فیرعـەون بـوو بـێ و، کەسێکی ئاشـنا بـە کۆبوونەوەکانیـان بـوو بـێ، بـە چ مەعلوومـە کـە هـەر لـە نێـو کۆبوونەوەکـەش دا نەبـووە! گرنـگ ئەوەیـە زانیاریـی تـەواوی لـە بـارەی کۆبوونەوەکـەوە هەبـووە، کـە لـە دژی مووسـا ﷺ دەکـرێ، تاکـو بیکـوژن.

﴿ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ ﴾، مووسـاش یەکسـەر بـە ترسـانەوە لێـی چـووە دەرێ، مووسـا ﷺ دیـارە متمانـەی تـەواوی بـەو کەسـە بـووە، بۆیـە بـە (ف)ی بەدواداهاتن (تعقیـب) هێناویـەتی، یەکسـەر دوای ئـەوەی ئـەو هەواڵـەی پێگەیانـد، لێـی چـووە دەرێ، لـە شـارەکە چـووە دەرێ، (خَآئِفٗا) لـە حاڵەتێکـدا کـە دەترسـا ﴿ يَتَرَقَّبُ ﴾، هەروەهـا چـوار چـاو بـوو، چاودێریـی دەکـردو کەوتبـووە حاڵەتـی خـۆ پەنهـان کردنـەوە، ﴿ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، گوتـی: پـەروەردگارم! لـە کۆمەڵـی ستەمکاران دەربـازم بکـە.

کاتێـک مووسـا لـە شـار چۆتـە دەرێ، لـە حاڵەتـی ترسـان و چـوار چاویـی و چاودێریـی کردنـدا بـووە، ڕەنگـە بۆسـەیان بـۆ دانـا بـن، ڕێگاکانیـان لێگرتـوون،

بازگەکانیان مەحکەم کردوون، بۆ ئەوەی مووسا لە هەر شوێنێکەوە دەرچوو، بیگرن، بەڵام وا پێدەچێ بەر لەوەی ئەوان کاری خۆیان بکەن و نەخشەکەیان جێبەجێ بکەن، مووسا ﷺ خەمی خۆی خواردوە، ئەو پیاوەش کە لەو پەڕی شار هاتوە و، بە دڵسۆزیی هەواڵەکەی پێگەیاندوە، سوودێکی باشی پێگەیاندوە و، بۆتە هۆی دەرباز بوونی.

هەر بۆیەش مرۆڤی باش، لە شوێنی خراپ و، لە شوێنێک کە جێگای مەترسییە بۆ هەر کەس، مرۆڤی باش لەو شوێنانە، دەگونجێ سوودی گەورە بگەیەنێ، زانیاریی و هەواڵ بگەیەنێ و، مرۆڤ ئاگادار بکاتەوە لەو مەترسییەی کە چاوەڕێی دەکات و لەڕێی دایەو، ئەو هەستی پێ ناکات.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**تێگەیشتن و کامڵبوونی مووسا و، حیکمەت و زانست فێرکرانی لەلایەن خوای میهرەبانەوەو، لە کاتی خافڵانی خەڵکی شارەکەدا، چوونە شارەوەو، کوشتنی کابرایەکی قیبتیی، دوای هاوار بۆ لابردنی کابرایەکی ئیسرائیلیی و، دان بە هەڵەی خۆدا هێنانی و، داوای لێبوردن کردنی لە خوا ﷻ و، بڕیاردانی کە هەرگیز پشتی تاوانباران نەگرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، کاتێک گەیشتە ئەو پەڕی توانایی و کامڵ بوو، تێرو تەواو بوو، پێشتریش گوتمان: وشەی (أَشُدّ) کۆی (شِدَّة)ە، وەک (أَنعُم) کۆی (نِعمَة)ە، (أَشُدّ)یش حاڵەتێکە بە مانای هێزو پێزو، دوایی وەک تاک مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، نەک وەک کۆیەک، کە لە چەند تاکێک پێک هاتوە، لە کوردەواریی دا دەڵێن: گەیشتە توغیانی خۆی، گەیشتە ئەو پەڕی توانا و هێزی جەستەیی خۆی، ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، (الإِسْتِوَاءُ: كَمَالُ البُنْيَة)، (إستواء)

ئەوەیە کە جەستەی تێرو تەواو بوو بێ، وەک لە سووڕەتی (الفتح)دا، هاتوە، باسی ڕووەک دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ ﴿٢٩﴾ ﴾، درەختەکە پتەوو قەبە بوو، چڕوپڕ بوو، ئنجا لەسەر قەدەکەی خۆی ڕاوەستا. بەڵام من پێم وایە: ﴿ بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، یانی: لە ڕووی جەستەییەوە گەیشتە حاڵەتی ئەو پەڕی هێزی جەستەیی خۆی، ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، یانی: لە ڕووی دەروونییەوە، تێرو تەواو بوو، مرۆڤی وا هەیە لە ڕووی جەستەییەوە، تێرو تەواوە، تەماشای دەکەی: پیاوێکی پڕ بە کراسە! بەڵام عەقڵ و سروشت و دەروونی کامڵ نەبووە، هەندێک شت دەکات منداڵانەیە! بۆیە منداڵێک کە لە ڕووی جەستەییەوە، زوو گەشە دەکات و کامڵ دەبێ، هێندەی پیاوێک، بەڵکو لە پیاوێکی ئاسایی گەورەترە، بەڵام لەبەر ئەوەی تەمەنەکەی کەمە، جارێ لە ڕووی دەروونیی و سروشت و هەڵسوکەوت و عەقڵ و سەلیقەوە، تەواو نەبووە، زۆرجار بەوانە دەڵێم: فڵانکەس جەستەکەی زوڵمی لە تەمەنەکەی کردوە، یان جەستەکەی زوڵمی لە عەقڵی کردوە، خەڵک بە پیاوێکی تێرو تەواوی تێدەگات، بەڵام هەڵس وکەوتی منداڵانەیە، لەبەر ئەوەی عەقڵەکەی کامڵ نەبووە، کەواتە: لەو کاتەدا مووسا ﷺ هەم لە ڕووی جەستەیی و، هەم لە ڕووی دەروونیی و عەقڵ و سەلیقەوە، پێگەیشتوەو تێرو تەواو بو وە.

٢)- ﴿ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، ئێمە حیکمەتمان پێدا و زانیاریشمان پێدا، بە دڵنیایی مەبەست لە حوکم: لێرەدا حیکمەتە، لە چەند شوێنێک لە قوڕئاندا، حوکم بە مانای حیکمەت هاتوە، وەک لە بارەی یەحیاوە ﷺ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ ﴾مریم، یانی: هەر بە منداڵیی حیکمەتمان پێبەخشیبوو.

هەروەها دەربارەی یوسوف ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴿٢٢﴾ ﴾یوسف، کاتێک گەیشتە ئەوپەڕی توانای خۆی، حیکمەت و عیلممان پێدا، جێی سەرنجە کە بە نیسبەت یوسوفەوە ﷺ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾یوسف.

بەڵام لێرەدا لە بارەی مووساوە ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، لەو بارەوە زۆر تەماشای تەفسیرەکانم کرد، بۆ حیکمەتی ئەو جیاوازییە، سەرەتا

ڕایەکـی خـۆم دێنـم لـە بـارەی هـەردووک وشـەی (أشدّه)و (استوی)وەو، دوایـش قسـەی یەکێـک لـە زانایـان دێنـم بـۆ حیکمـەتی ئـەو جیاوازییـە: ئـەو دوو وشـەیە: ﴿ بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾ و ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، هەردووکیـان پەیوەندییـان بـە حاڵەتـی جەستەییەوە نیـە، بەڵکـو:

١- یەکەمیان (أشدّه) پەیوەندیی بە حاڵەتی جەستەیەوە هەیە، واتە: گەیشتە ئەو پەڕی تین و تاقەتی جەستەیی خۆی، ئنجا ئایا مەبەست پێی تەمەنی (٣٠) یان (٣٣) یانً (٣٤) ساڵییە؟ یان (٤٠) ساڵییە؟ ئەو ڕایانە هەموویان هەن.

٢- دووەمیان ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾، یانی: لە ڕووی دەروونیی و ڕووحیی و لە ڕووی عەقڵ و سەلیقە و کەسایەتیی مەعنەوییەوە، پێگەیشت و، تێرو تەواو بوو.

ئنجا جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە لـە بـارەی یوسـوفەوە ﷺ، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾یوسـوف، لەوێـدا وشـەی ﴿ وَٱسْتَوَىٰٓ ﴾ی تێـدا نیـە، تەماشـای تەفسـیرەکانم کـرد، ئـەو سـەرنجەی (ابـن عجيبـة)م لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1]، پـێ جـوان بـوو، کـە لـەو بـارەوە دەڵـێ:

{فَـإِن قُلـتَ: لِـمَ ذَكَـرَ الحَـقُّ جَـلَّ جَلالُـهُ الإستِوَاءَ فِي حَـقِّ سَـيِّدِنَا مُـوسى ﷺ وَلَـم يَذكُـرهُ فِي حَـقِّ سَـيِّدِنَا يوسُـف ﷺ؟ فَالجَـوَابُ: أَنَّ سَـيِّدَنَا يوسُـف تَـرَبَّى فِي السِّـجْنِ وَفِي نَـارِ الجَـلالِ، وَكُلُّ مِحنَـةٍ تَزِيـدُهُ تَهذِيبَـاً وَتَدرِيبـاً، فَـمَا بَلَـغَ الأَشُـدَّ حَتَّـى وَقَـعَ لَـهُ الإستِكمَالُ والإستِوَاءِ، بِخِـلافِ سَـيِّدِنَا مُـوسى، فَإِنَّـهُ تَـرَبَّى فِي العِزِّ وَالجَـمَالِ، فَاحتَـاجَ إِلَى تَربِيـةٍ وَتَهذِيـبٍ بَعـدَ كَـمَالِ الأَشُـدِّ، فَلَـم يَحصُـل لَـهُ كَـمَالُ الأَدَبِ، إِلَّا بَعـدَ الإستِواءِ الَّـذي يَلِيـقُ بِـهِ فَلِذَالِـكَ ذَكَـرهُ فِي حَقِّـه}.

دەڵـێ: ئەگـەر گوتـت: بۆچـی خـوا جَـلَّ جَلالُـهُ وشـەی (إستِواءِ)ی لـە بـارەی گەورەمـان مووسـا ﷺ باسـکردوە، بـەڵام لـە بـارەی گەورەمـان یوسـوف ﷺەوە باسـی نەکـردوە؟ وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە گەورەمـان یوسـوف ﷺ لـە زینـدانـدا

---

(١) البَحرُ المَديد فِي تَفسيرِ القُرآن المَجيد: ج٥، ص٢٥٥.

پـەروەردە بـووە و، بـە ئاگـری سـیفەتی شـکۆ (جـلال)ی خـوا ﷻ پـەروەردە بـووە، ئنجـا هـەر بەڵایـەک کـە بەسـەری هاتـوە، زیاتـر پاڵفتـەی کـردوە و، زیاتـر ڕایهێنـاوە مەشـقی پێکـردووە، کاتێـک کـە لـە ڕووی جەسـتەییەوە، گەیشـتۆتە حاڵەتـی پێگەیشـتن و تێـرو تـەواو بوونـی جەسـتە، یەکسـەر حاڵەتـی تێـرو تەواویـی بـاری دەروونیـی و کەسایەتیی ڕووحیشـی، بـۆ تـەواو بـووە، جیـا لـە حاڵەتـی گەورەمـان مووسـا ﷺ کـە ئـەو لـە حاڵەتـی عیـززەت و جەمالـدا، پـەروەردە بـووە، [واتـە: خـوا ﷻ بـە سـیفەتی جەمالـی خـۆی، بەخێـوی کـردوە لـە ماڵـی فیرعەونـداو، لـە هیـچ شـتێک پەکـی نەکەوتـوەو تووشـی میحنـەت و ناڕەحەتیـی نەبـووە]، بۆیـە پێویسـتی بـە پەروەردەکـردن و پاڵفتـە کـردن هەبـووە، دوای ئـەوەی لـە ڕووی جەسـتەییەوە پێگەیشـتوە، ئـەدەب و ئـاکاری تـەواوی بـۆ پەیـدا نەبـووە، مەگـەر دوای ئـەو حاڵەتـی پێگەیشـتنە دەروونییـەی کـە شایسـتەیەتی، بۆیـە خـوا ﷻ لـە بـارەی ئـەوەوە وێـڕای (أَشُدّ) باسـی (إستِواءِ)یشـی کـردوە.

بەڕاستیی تێبینیەکەیم زۆر پێ جوانە، خوا ﷻ پاداشتی بداتەوە.

٣)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، کەواتە: مووسا ﷺ هەر بە گەنجییش، دوای ئەوەی کە چاکە و خراپەی لێک کردوونەوە، هەر لە چاکەکاران بووە، خوای پەروەردگاریش هەر کەسە، لە قەدەر خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

٤)- ﴿ وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا ﴾، لە کاتی خافڵانی خەڵکەکەشی دا، وەژوور شارەکە کەوت، مووسا ﷺ ئەوە دیارە، تێرو تەواو بووە، لە ڕووی جەستەیی و، لە ڕووی دەروونیی و، لە ڕووی عەقڵیی و، لە ڕووی ڕووحییەوە، ئنجا دوای ئەوە چووە نێو شارەکەوە، لە کاتی خافڵانی خەڵکەکەیدا، ئەو شارە دەبێ کام شارە بوو بێ؟! خوا ﷻ باسی نەکردوە بەڵام لە تەفسیرەکاندا هاتوە کە: شاری (مەنفیس) بووە، کە پایتەختی باکووری میسر بووە، ﴿ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا ﴾، واتە: لە کاتی خافڵان و سەرقاڵیی

خەڵکەکەدا، کە لە کاتی سەر خەو شکاندنی نیوەڕۆدا بووە، یاخود کاتێک سەرگەرمی کارو کاسبیی بوون، گرنگ ئەوەیە حاڵەتێک بووە کە شار مەیلەو چۆڵ بووەو، خەڵکەکە خافڵاو بووە.

٥)- ﴿ فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ ﴾، لە نێو شارەکەدا، دوو پیاوی دیتن پێکەوە بەشەڕ هاتبوون، لەیەکدییان دەدا.

٦)- ﴿ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ ﴾، ئەمەیان لە کۆمەڵەکەی خۆی بوو، کە بەنوو ئیسرائیلن، واتە: ئەو کۆمەڵەی کە بەنوو ئیسرائیلن و هی ئەون، یاخود مووسا ﷺ دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوان و ئینتیمای ئەتەوەیی بۆ لایان هەیە.

٧)- ﴿ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ﴾، ئەمەشیان لە دوژمنەکەی، یانی: لەو کۆمەڵە خەڵکەی دژایەتیی ئەو خەڵکەی مووسایان ﷺ دەکرد.

ئنجا ئەمە - وەک پێشتریش ئاماژەم پێکرد - لێی وەردەگیرێ کە:

أ- بۆ گەلی بەنی ئیسرائیل ئاشکرا بووبێ و زانراو بووبێ، کە مووسا ﷺ لە خۆیانە و، کوڕی فیرعەون نیە، بەڵێ لە کۆشکی فیرعەوندا گەورە بووە و، ڕەنگە فیرعەون کردبێ بە کوڕی خۆشی، وەک لە هەندێک گێڕدراواندا، دەڵێ: پێی گوتراوە: مووسای کوڕی فیرعەون، بەڵام بەنوو ئیسرائیل زانیویانە کە کوڕی ئەو نیە.

ب- هەروەها لێشی وەردەگیرێ کە مووسا ﷺ دەبێ خەڵکێکی لە بەنوو ئیسرائیلیەکان، لە گەلە چەوساوەکەی خۆی هۆشیار کردبێتەوە، ڕەنگە ڕێکی خستبن و جۆرێک لە ڕێکخراوێک، حیزبێکی لێ دروست کردبن، کۆمەڵێکی لێ دروست کردبن، وا پێدەچێ، ئەگەرنا بێ پێشینە ئەو کەسە کە لە بەنوو ئیسرائیلە، یەکسەر هاوار لە مووسا ﷺ نابەستێ، ئەگەر ئاشنایەتییەکی پێشترو پێشینەیەکی پێشتری نەبووبێ.

٨)- ﴿ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ ﴾، ئەوەیان کە لە کۆمەڵەکەی خۆی بوو، هاواری تێبەست.

٩)- ﴿ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ ﴾، لە دژی ئەوەی لە دوژمنەکەیەتی.

(إستغاثة) بریتیە لە داواکردنی (غَوث)، (غَوث)یش بریتیە لە دەرباز کردن لە سەغڵەتیی و، لە توندو تیژیی، یاخود هاوکارییکردن بۆ بەرپەرچدانەوەی ناڕەحەتییەک لە کەسێک، بۆ وێنە: کەسێک دەکەوێتە نێو ئاوەوەو خەریکە بخنکێ، هاوار لە کەسێک دەکات، یاخود کەسێک تووشی دڕندەیەک دێت و خەریک دەبێ بیخوات، هاوار لە کەسێک دەکات.

١٠)- ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ ﴾، یەکسەر مووسا مستێکی لێدا، بە (فَاء التَّعْقِيب) یانی: یەکسەر کە ئەو هاواری تێ بەست، زوو مووسا ﷺ بە هاواریەوە چوو، چوو بۆ یارمەتییدانی و کۆڵە مستێکی لێدا، لەو کەسەی دوژمنەکەیان بوو.

(وَكْـز) واتە: لێدان بە دەست لە حاڵێکدا کە پەنجەکانی هاتوونەوە یەک، (الضَّرْبُ بِجُمْعِ أَو بِجَمعِ أَصَابِعِهِ)، پەنجەکانی هێنابنەوە یەک، یاخود (بِجُمْعِ) واتە: دەستی کۆکردبێتەوە، (وَكْـز) هەم بە مانای لێدان دێ، هەم بە مانای پاڵ پێوەنان دێ.

١١)- ﴿ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِ ﴾، یەکسەر تەواوی کرد، ﴿ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِ ﴾، (أي: أجهَزَ عَلَيهِ)، واتە: کۆتایی پێ هێنا، تەواوی کرد، بۆچی نافەرموێ: (قَتَلَهُ)؟! چونکە مووسا ﷺ مەبەستی نەبووە بیکوژێ، ئەگەر فەرمووبای: (فَوَكَزَهُ مُوسى فَقَتَلَهُ)، واتە: مووسا ﷺ مستێکی لێدا و کوشتی، مانای وایە مەبەستی بووە بیکوژێ، بەڵام مووسا مەبەستی نەبووە بیکوژێ، بەڵکو مەبەستی بووە پاڵێکی پێوە بنێ و، ئەو پیاوە ئیسرائیلییە ستەم لێکراوەی لەبەر دەست دەربهێنێ.

١٢)- ﴿ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾، یەکسەر مووسا ﷺ گوتی: ئەوە لە کردەوەی شەیتانە، واتە: ئەو زۆر تووڕە بوونەم، یاخود ئەو لێدانەم وا بە توندیی، لە کردەوەی شەیتانە، شەیتان وا خوتخوتەی بۆ کردم، کە زۆر بە توندیی لێی بدەم، یان زۆر تووڕەی کردم و ورووژاندمی کە بە هەموو توانای خۆم، لێی بدەم، ئەگەرنا مەبەستم نەبوو بیکوژم.

١٣)- ﴿ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴾، بە دڵنیایی شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەرو سەر لێ شێوێنەری ئاشکرایە، واتە: شەیتان بەهۆی خوتخوتە کردن و، دنەدنەدانیەوە، منی لاداو گومڕا کرد، لە هەڵسوکەوتی ڕاست و دروست، کە بریتی بوو لەوەی تەنیا پاڵی پێوەبنێم و دووری بخەمەوە، نەک مستێکی وای لێدەم بیکوژم، ئەم قسەیەی مووسا ﷺ: ئەوە دەگەیەنێ، کە گومان.

١٤)- ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي ﴾، مووسا گوتی: پەروەردگارم! من ستەمم لە خۆم کرد، ئنجا لێم ببوورە.

١٥)- ﴿ فَغَفَرَ لَهُۥٓ ﴾، پەروەردگاریشی لێیبورد.

١٦)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر لێبوردەی بە بەزەییە.

١٧)- ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ ﴾، مووسا ﷺ فەرمووی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوە کە تۆ چاکەت لەگەڵ کردم.

١٨)- ﴿ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾، من هەرگیز پاڵپشت و پشتیوانی تاوانباران نابم.

## سێ هەڵوەستەی گرنگ

**یەک:** زانایان زۆر مشت و مڕیان کردوە، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەبێ پارێزراو بن لە گوناح، بەڵام ئەوەتا مووسا ﷺ ئەفەرزێکی کوشتوەو، داوای لێبوردنیشی لە خوا ﷻ کردوە، کەواتە: دیارە گوناهی کردوە!! پێم وایە پێویست بەو هەموو خۆ مەشغووڵ کردنە ناکات، وەڵامەکەی بە کورتیی ئەوەیە کە ئەو کاتە مووسا ﷺ پێغەمبەر نەبووە، کە پێغەمبەریش نەبووە، واتە: پارێزراو نەبووە لە گوناهو لە هەڵە، ئنجا ئەوەی مووسا ﷺ لە ڕاستییدا بە گوناهیش لە قەڵەم نادرێ، چونکە مووسا ﷺ مەبەستی نەبووە بیکوژێ و، مەبەستی ئەوە بووە پاڵی پێوە بنێ و دووری بخاتەوە لێی، عادەتیش نیە کابرا بە مستێک تەواو بێ، بەڵام ئەو فیرعەونییە بە مستێک تەواو بووە، بۆیەش مووسا ﷺ پاڵیداوەتە لای شەیتان، واتە: شەیتان منی هانداو ورووژاندمی، کە زیاد لە پێویست قوەت بەکاربێنم لە مست وەشاندنەکەمدا، ئەگەرنا نیازی ئەوە نەبووە بیکوژێ.

**دوو:** کە مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ ﴾، هەندێک لە توێژەرەوان دەڵێن: مووسا ﷺ زانی کە خوا لێیبوردوە، بۆیە گوتوویەتی: خوایە! بەهۆی ئەوەی تۆ چاکەت لەگەڵ کردم، چاو پۆشییت لە من کرد، منیش لەمەودوا هاوکاری تاوانباران نابم.

بەڵام پێم وایە لێبوردنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺ بە هۆی وەحییەوە نەبێ نازانرێ و، مووساش ﷺ جارێ وەحیی بۆ نەهاتوە، چۆنی زانی خوا لێیبوردوە؟! نا، مووسا ﷺ گوتوویەتی: ﴿ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ ﴾، ئەگەر مەبەست پێی لێبوردن بووایە، دەیفەرموو: (رَبِّ بِمَا غَفَرْتَ لِي) بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ ﴾، پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە تۆ چاکەت لەگەڵ من کردوە، واتە: حیکمەتت پێداوم، عیلمت پێداوم و، توانای جەستەییت پێداوم،

خوایە بەهۆی ئەو نیعمەتانەوەو، بەهۆی ئەو چاکەیەوە، کە تۆ لەگەڵ منت دا کردوە، پەروەردگارم! بە هۆی ئەو چاکانەی تۆوە، دەبێ سوپاسگوزار بم، بۆیە من هەرگیز پشتیوان و هاوکاری تاوانباران نابم، واتە: هەرچەندە ئەو کابرایەم بەدەست کوژرا، کە من دیفاعم لە مەزڵوومێک کرد، بەڵام ئەی پەروەردگارم! ئەو چاکە و نیعمەتانەی بە منت داون، هەرگیز بەکاریان ناهێنم بۆ بەرگریکردن لە تاوانبارانی وەک دارو دەستەی فیرعەون کە زوڵم دەکەن، لە نەتەوەیەکی دیکە، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: کە جارێکی دیکە بابایەکی سەر بە گێچەڵ و شەڕخواز و سەر بە تەشقەڵە، بەرگریی لێ ناکەم.

سێ: زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە حەرامە و قەدەغەیە، مرۆڤ هاوکاریی تاوانباران و ستەمکاران بکات و، لە ژێر ڕکێفیان دابێ، بە شێوەیەک لە شێوەکان کارێک بکات، ببێتە هۆی بەهێز بوونیان و بەردەوام بوونیان، بێگومان هەم ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، هەم ئایەتی دیکەی قورئان لەو بارەوە یەکجار زۆرن.

**مەسەلەی دووەم:**

**کەوتنە حاڵەتی ترس و لەرزی مووسا لە شاردا و، دووبارە هاوار تێبەستانی لە لایەن بابای بەنوو ئیسرائیلییەوە، سەرزەنشتکردنی مووسا بۆی و، گلەیی کردنی بابای قیبتیی بەشەڕ هاتوو، لە مووسا ﷺ کە دەیەوێ ببێتە خۆسەپێن و ملپێکەچکەر، نەک چاکسازیکارو، هەواڵپێدرانی مووسا ﷺ لە لایەن پیاوێکی دڵسۆزەوە، کە بڕیار بەدەستان لە ڕاوێژی کوشتنی دان و، سەرەنجام دەرچوونی مووسا ﷺ لە شارەکە، بە ترسەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

مووسا ﷺ دوای ئەوەی کابرای قیبتیی بە دەست فەوتا، کە مەبەستی نەبوو بیکوژێ، بەڵام بەو کوڵە مستەی لێیدا، گیانی سپاردو، داوای لێبوردنی لە خوا کردو، خوا ﷻ چاوپۆشیی لێکرد، لەبەر ئەوەی کە بەرگریی کرد بوو لە ستەم لێکراوێک، پاشان مەبەستیشی نەبوو بیکوژێ، دوای ئەوە:

١)- ﴿ فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ﴾، دوای ئەوە (مووسا) کەوتە حاڵەتی ترس و لەرزەوە لە شارەکەدا، چوارچاو بوو، چاودێریی کرد، (**أي: أَصْبَحَ خَائِفاً مِنْ أَن يُطَالَبَ بِدَمِ القِبْطِي**)، واتە: کەوتە حاڵەتی ترسان، لەوە کە داوای خوێنی قیبتییەکەی لێ بکرێ و بکوژرێتەوە لە بەرانبەر کوشتنی بابای قیبتییدا.

﴿ يَتَرَقَّبُ ﴾، حاڵەتی (تَرَقُّب) یانی: چوار چاو بوون و، کەوتنە حاڵەتی ترس و بیم و لەرز، (أَي: يُرَاقِبُ مَا يُقَالُ فِي شَأنِهِ، لِيَكُونَ مُتَحَفِّزاً لِلإختِفَاءِ أَو الخُرُوجِ فِي المَدِيْنَةِ)، واتە: چاودێریی دەکردو، چوار چاو بوو: لە بارەی ئەوەوە چی دەگوترێ؟ تاکو ئامادە بێ، یان بۆ خۆ پەنهان کردن، یاخود بۆ دەرچوون لە شار.

٢)- ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴾، کت و پڕ ئەوەی کە دوێنێ داوای سەرخستن و یارمەتیی لێکرد، هاواری تێدەبەست، بە دەنگی بڵند بانگی دەکرد کە هاوکاریی بکات.

﴿ يَسْتَصْرِخُهُۥ ﴾، (الإستِصْرَاخُ: المُبَالَغَةُ فِي الصُّرَاخِ، وَهُوَ النِّدَاءُ وَطَلَبُ الغَوثِ بِصَوْتٍ عَالٍ)، (إستصْرَاخ) بریتیە لە زێدەڕۆیی کردن لە (الصُّرَاخ)دا کە بریتیە لە بانگ کردن و داوایی یارمەتییکردن بە دەنگی بەرز، واتە: هاوار کردن، یانی: ئەو کەسەی دوێنێ داوای یارمەتیی لێکردووەو لەسەر وی، کابرای قیبتیی بە کۆڵە مستێک کوشت، بینی ئەوە ئەمڕۆش هاواری تێدەبەستێ و بانگی دەکات بە دەنگی بەرز: مووسا فریامبکەوە!

٣)- ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴾، مووسا ﷺ بە کابرای هاوار تێبەستووی گوت، (بەو کابرایەی دوێنێ ئەفەرێکی لەسەر وی کوشتوە گوت:) بێگومان تۆ بابایەکی بێمرادی ئاشکرای.

(غَوِي)، (الغَوِيُّ: الشَّدِيدُ الغَوَايَةِ، وَهِيَ الضَّلَالُ وَسُوءُ النَّظَرِ)، (غَوِي) بریتیە لە کەسێک کە زۆر غەوایەتیی هەبێ، ئەویش بریتیە: لە گومڕایی و تێنەگەیشتن، یاخود لە نیشانە نەدان.

بەڵام وەک زۆرجار گوتوومە: (غَيّ) بریتیە لە ئەنجامی گومڕایی، کە بریتیە لە بەمراد نەگەیشتن و بێئاکام بوون، واتە: تۆ بابایەکی سەرگەردان و بێمرادو بێ ئاکامی، ﴿ مُّبِينٌ ﴾، ڕوون و ئاشکرا، یانی: زۆر ڕوونە کە تۆ بابایەکی سەرگەردان و بێمرادی، چونکە هەر ڕۆژە گێچەڵێک دەکەی و، هەر ڕۆژە خۆت دەخەیە شەڕو ئاژاوەیەکەوە، وا پێدەچێ ئەو کەسە کەمتەرخەم بوو بێ، کە دوێنێ ئەفەرێکی

لەسەر کوژراوە، دەبووایە چەند ڕۆژێک هەر خۆی پەنهان بکات و خۆی بشارێتەوە، نەک دیسان گێچەڵێکی دیکە بنێتەوە، بۆیە مووسا وای پێگوتوە، دیارە شایستەی ئەو سەرزەنشت و قسە پێگوترانە بووە.

٤)- ﴿ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا ﴾، ئنجا کاتێک مووسا ﷺ ویستی: زەبر لەو کەسە بدات، کە دوژمنی هەردووکیانە، واتە: لە بابای قیبتیی، (البَطْش: الأخْذُ بِعُنْفٍ، والضَّرْبُ)، (بَطش) واتە: گرتنی کەسێک بە توندیی و، بە کوردیی زەبر لێ وەشاندنی پێدەڵێن، یان پەلاماردان، کاتێک ویستی پەلاماری ئەوە بدات، کە دوژمنی هەردووکیانە، واتە: زەبری لێ بوەشێنێ، دەستی لێ بوەشێنێ.

٥)- ﴿ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِ ﴾، گوتی: ئەی مووسا! ﷺ دەتەوێ بمکوژی، وەک چۆن دوێنێش کەسێکت کوشت؟، ئایا ئەمە قسەی بابای قیبتیی بووە، کە مووسا پەلاماری داوە و، بەرەو ڕووی چووە زەبری لێ بدات؟ یاخود قسەی بابای ئیسرائیلیی بووە، کە هاواری لە مووسا ﷺ بەستوەو، ڕۆژی پێشتر مووسا ﷺ کەسێکی لەسەر وی کوشتوە؟! هەردوو ڕایەکان هەن:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: کابرای قیبتیی ئاگادار نەبووە کە مووسا ﷺ ئەو قیبتییەی کوشتوە، بۆیە ئەوە قسەی کابرای ئیسرائیلییە، ئەو ئاگادار بووە کە دوێنێ مووسا کەسێکی لەسەر وی کوشتوە، ئنجا کە مووسا سەر زەنشتی کردوە و گوتوویەتی: تۆ بابایەکی سەرگەردانی ڕوون و ئاشکرای و بابایەکی بێمرادی تەشقەڵەچیی، کە سەر زەنشتی کردوە، وایزانیوە کە پەلاماری ئەویش دەدات، بۆیە گوتوویەتی: ﴿كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِ ﴾، ئەی مووسا ﷺ! وەک دوێنێ کەسێکت کوشت، دەتەوێ ئەمرۆش من بکوژی؟!.

ب- هەندێکیش دەڵێن ئەوە قسەی کابرای قیبتییە، دەبێ بووبێتە قا وو بڵاو بووبێتەوە، کە مووسا ﷺ دوێنێ کەسێکی قیبتیی کوشتوە، بۆیە گوتوویەتی: وەک چۆن دوێنێ کەسێکت کوشتوە، لە قیبتییەکان، دەتەوێ ئەمرۆش من بکوژی؟! هەردوو ڕایەکان هەن، بەڵام ڕای دووەمیان وێچووتر و گونجاوترە و، قسەکانی دواییش پشتگیریی دەکەن.

٦)- ﴿إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، تۆ بەس دەتەوێ ببیە خۆسەپێن لە زەوییدا، (الجَبَّارُ: المُتَعالِي عن قُبُولِ الحَقِّ، وَالشَّدِيدُ فِي الظُّلْمِ وَالبَاطِلِ)، (جَبَّار) کەسێکە لە بەرانبەر هەقدا سەرکەشیی بکات، خۆی بە بەرز بگرێ، مل بۆ هەق کەچ نەکات و، لە ستەم کردن و زەبر وەشاندندا توندوتیژ بێ.

٧)- ﴿وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾، تۆ ناتەوێ لە چاکسازییکاران بی، ئەم قسانە وایان لێ دەخوێندرێتەوە، کە دەبێ ئەوانە هەموویان قسەی بابای قیبتیی بن، دوورە لە عەقڵەوە، کە بابای ئیسرائیلیی ئەو هەموو قسانە بە مووسا ﷺ بڵێ، کە زانیویەتی دوێنێش کەسەکەی کوشتوەو، بەرگریی کردوە لە ستەم لێکراوێک، بە دوور دەزاندرێ هەر لە سەر ئەوەندە سەر زەنشتکردنەی، ئەو هەموو قسانە بۆ مووسا ﷺ ڕیز بکات، بۆیە زیاتر وا پێدەچێ قسەی بابای قیبتیی بن، کە ئەو گومانە خراپەی بە مووسا ﷺ بردوە، لەوانەیە کە دوێنێش مووسا کابرای قیبتیی کوشتوە، ئەم قیبتییەی ئەمڕۆ نەیزانیبێ، کە قیبتییەکەی دوێنێ ستەمی کردوە، لە کابرای ئیسرائیلیی و، مووسا ﷺ بەرگریی لە ستەم لێکراوێک کردوە، بۆیە ئاوا تۆمەتباری دەکات بەوە کە تۆ دەتەوێ خۆسەپێن بی لە زەوییدا، لە وڵاتی میسڕداو، ناتەوێ لە چاکسازییکاران بی.

٨)- ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ﴾، پیاوێکیش لەو پەڕی شارەوە هات، بەخێرایی دەڕۆیی، ئەو شارەی کە ئەو ڕووداوەی تێدا قەوماوە، کە وا پێدەچێ پایتەختی میسڕ بوو بێ، پیاوێک لەو پەڕی شارەوە هات، دەبێ ئەو پیاوە کێ بووبێ؟! توێژەرەوان لەو بارەوە چەند ڕایەکیان هەن و قورئان دیاریی نەکردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: هەمان ئەو پیاوەیە کە لە سوورەتی (غافر)دا، بە: ﴿رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾، ناوی هاتوە: ﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ ﴿٢٨﴾﴾غافر، پیاوێک لە دارو دەستەکەی فیرعەون کە ئیمانەکەی خۆی پەنهان کرد بوو، گوتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ ﴿٢٨﴾﴾غافر، بەرگریی لە مووسا ﷺ دەکات و دەڵێ: ئایا پیاوێک هەر لەبەر ئەوە دەکوژن، کە دەڵێ: پەروەردگارم خوایە؟.

ب- هەندێکیان گوتوویانە: پیاوێکی دیکەی بڕوادار بووە لە دارودەستەی فیرعەون، بەڵام هەر لە بەنوو ئیسرائیل بووە، وەک نەتەوە، چونکە کەسێک ئاگای لە ڕاوێژکردنی کار بە دەستانی فیرعەون بێ، لە بارەی کوشتنی مووساوە، دەبێ کەسێکی نیزیکی خۆیان بێ، ئەگەرنا بابایەکی بەنوو ئیسرائیلیی چەوسێنراوە، ئاگای لە کۆڕو مەجلیسی بڕیار بەدەستانی دەوری فیرعەون نیە.

ج- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: پیاوێکی دیکەی قیبتیی بڕواداری دڵسۆز بووە، مەرج نیە ئەو پیاوە بڕوادارەی نێو دام و دەزگا و دارو دەستەی فیرعەون بووبێ.

بەڵام ڕای یەکەمیان زیاتر پێدەچێ، چونکە پیاوێکی دیکەی دڵسۆز، کەسێک کە نیزیک نەبووبێ لە دام و دەزگای حوکمڕانیی فیرعەون و لە بڕیار بەدەستان، ئاگای لە کۆبوونەوەو لە ئامانجی کۆبوونەوەی بڕیار بەدەستان و کاربەدەستانی دەوری فیرعەونیش نابێ، واتە: ئەگەر ئەو پیاوە بڕوادارەش نەبێ، کە بڕوای خۆی شاردۆتەوە، دەبێ هەر پیاوێکی دیکەی وەک ئەو بووبێ، لە نێو دارو دەستەی بڕیار بە دەستانی فیرعەوندا بووبێ، بەڵام ئیمانەکەی خۆی پەنهان کرد بێ، ئنجا ئەو پیاوە لەوپەڕی شارەوە بە خێرایی هات.

﴿يَسْعَىٰ﴾، (السَّعي: المَشيُ السَّريعُ، وَهُوَ دُونَ العَدْوِ، وَيُستَعْمَلُ لِلجِدِّ في الأَمرِ خَيْراً كانَ أو شَرّاً)، (سَعي) بریتیە لە ڕۆیشتنێکی خێرا، بەڵام نەگاتە ئەندازەی ڕاکردن و غاردان، بەکاریش دەهێنرێ بۆ ئەوە کە مرۆڤ شتێکدا بە جیددیی بیکات و مکوڕ بێ لەسەری و، بە عەزیمەتەوە بیکات، ئنجا ئەو کارە خێر بێ، یاخود شەڕ بێ، خراپ بێ، یاخود چاک بێ.

٩)- ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ﴾، گوتی: ئەی مووسا! ﷺ بڕیار بە دەستان و کار بەدەستان، لە بارەتەوە ڕاوێژ دەکەن، (المَلأُ: الجَمَاعَةُ أُولُوا الشَّأنِ)، (ملأ) کۆمەڵێک کە خاوەن کار بن، خاوەن بڕیار بن، بۆیە بە: بڕیار بە دەستان و کار بە دەستان لێکمداوەتەوە، واتە: بڕیار بە دەستان و کاربەدەستان، ﴿يَأْتَمِرُونَ بِكَ﴾، ڕاوێژت لە بارەوە دەکەن، بێگومان بۆ پیلانگێڕان.

١٠)- ﴿ لِيَقْتُلُوكَ ﴾، تاكو بتكوژن.

هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: ئـەو پیـاوە بـڕوادارەی ئێـو بڕیـار بـە دەسـتانی فیرعـەون، نـاوی (حزقیـل) بـووە، بـەڵام لـە قوڕئانـدا نـاوی نەهاتـوە.

١١)- ﴿ فَٱخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾، بۆیە دەربچۆ، لە شار دەرچۆ، من لە دڵسۆزانم، لە بە تەنگەوە بووان و مشوورخۆرانم بۆ تۆ.

١٢)- ﴿ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ﴾، یەكسەر مووسا بە ترسەوە لێی دەرچوو، چاوەڕێی دەكرد.

مووسـاش ﷺ قسـەكەی لـێ وەردەگـرێ، كـە بـە دڵنیایـی ئەمـە ئـەوە دەگەیەنێ: دەبـێ مووسـا ﷺ پێشـتر ناشـنایەتیی لەگەڵـی بووبـێ و یەكدییـان ناسـیبێ و، نـاگای لـە مشـوورخۆریی و دڵسـۆزییەكەی بـوو بـێ، بۆیـە یەكسـەر متمانـەی پێكـردوە و قسـەكەی لێوەرگرتـوە، یاخـود دەبـێ ئـەو پیـاوە، پیاوێـك بووبـێ كـە جێـی متمانـە بووبـێ و، مووسـاش ﷺ خـوای پـەروەردگار خسـتوویەتیە دڵـی و كـە متمانـەی پـێ بـكات، بۆیـە یەكسـەر پێشـنیارەكەی لـێ وەرگرتـوەو تەبەنێیشـی كـردوە، ﴿ فَخَرَجَ مِنْهَا ﴾، لێـی چـووە دەر، لـە شـارەكە چـووە دەر، ﴿ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ﴾، ﴿ خَآئِفًا ﴾، حاڵـە، لـە حاڵێكـدا كـە دەترسـا، بـە ترسـەوە لێـی چـووە دەر، ﴿ يَتَرَقَّبُ ﴾، چاوەڕێـی دەكـرد، (الرقـب: الإنتظـار)، (تَرَقُّـب) لەسـەر كێشـی (تَفَعُّـل)ە، دەگوتـرێ: (رَقَـبَ إذَا نَظَـرَ أحـوالَ شَيءٍ)، (رقـب) یـانی: تەماشـای حـاڵ و باڵـی شـتێكی كـردو، چاودێریـی كـرد، چـوار چـاو بـوو، بزانـێ چـی لـێ پەیدادەبـێ.

١٣)- ﴿ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، (مووسا پاڕایەوە) گوتی: پەروەردگارم! لە كۆمەڵی ستەمكاران دەربازم بكە، بەر پەلیان نەكەوم و، نەتوانن بمدۆزنەوەو بمگرن، لەبەر ئەوەی زانیویەتی كە بڕیاری یەكجارەكیان داوە، لەسەر كوشتن و سزادانی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە ئایەتەکانی: (٢٢ - ٢٨) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: لـە حـەوت (٧) ئایـەت پێکهاتـوە و، ئـەم دەرسـەمان قۆناغـی چوارەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ دەگرێتـە خـۆی و، باسـی بـە ڕێکەوتنـی مووسایە بـەرەو وڵاتـی مەدیـەن و، هاوکاریی کردنـی دوو ئافـرەت بـۆ ئاودانـی ئاژەڵەکانیـان.

پاشـان ئاشـنابوونی بـە بابـی دوو کچەکـەو، هاوسـەرگیریی کردنـی لەگـەڵ یەکێکیانـدا، لـە بەرانبـەر (٨ - ١٠) سـاڵ، شـوانییدا، لەسـەر بناغـەی سـەودا و گرێبەسـتێک لەگەڵ بابیانـدا، کـە پیاوێکـی پیـری بـە تەمەن بـووە، کە وەک پێشـتریش باسـمان کـرد: زۆربـەی توێژەرەوانـی قورئـان دەڵێـن: ئـەوە شـوعەیب ﷺ بـووە، بـەڵام پێشـتریش باسـمان کـردو، دواتریـش بـە چەنـد بەڵگەیەکـی یەکلاییکـەرەوە دەیسـەلمێنم، کـە ناگونجـێ ئـەو پیـاوە شـوعەیب بووبـێ، ئـەو شـوعەیبەی ﷺ کـە خـوا بـۆ گەلـی مەدیەنـی ناردوە و، بـە ماوەیەکـی زۆر لـە پێـش پەیـدا بوونـی مووسـادا ﷺ بـووە.

﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ

ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَـٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِى ثَمَـٰنِىَ حِجَجٍ ۖ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ ۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ ۚ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ ۖ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَىَّ ۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{کاتێکیش (مووسا) ڕووی کردە لای مەدیەن (بەرەو لای وێ کەوتە ڕێ) گوتی: نیزیکە پەروەردگارم ڕاستە ڕێم پێشان بدات ﴿٢٢﴾ کاتێکیش چووە سوێ ئاوی مەدیەن، کۆمەڵە خەڵکێکی لەسەر دیتن، ئاژەڵیان ئاو دەدا، لە خوارووانیشەوە دوو ئافرەتی دیتن، ئاژەڵەکانیان ڕادەگرت (کە جارێ ئاو نەخۆنەوە) گوتی: ئەوە چیتانە (ئاژەڵەکانتان لەگەڵ هی خەڵکەکە ئاو نادەن؟!) گوتیان: هەتا شوانەکان (ئاژەڵەکانیان ئاو نەدەن و) نەڕۆن، ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین و، بابیشمان پیرەمێردێکی بە تەمەنە (بۆیە ئێمەی ناردوە و خۆی نەهاتوە) ﴿٢٣﴾ یەکسەر (مووسا) ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، دوایی بەرەو لای سێبەرەکە گەڕایەوە گوتی: پەروەردگارم! من ئاتاجی هەر خێرو چاکەیەکتم بۆم دابەزێنی ﴿٢٤﴾ ئیدی یەکیان (لە دوو کچەکان) هاتە لای بە شەرمەوە دەڕۆیی، گوتی: بە دڵنیایی بابم بانگت دەکات، تاکو کرێی ئەوە کە ئاژەڵەکانمانت ئاودا، بە پاداشت بتداتێ، ئنجا کە مووسا هاتە لای (بابیان) و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، بابیان گوتی: مەترسە! لە کۆمەڵی ستەمکاران ڕزگارت بووە (لەم دەڤەرە دەستەڵاتیان نیە) ﴿٢٥﴾ یەکێکیان (لە دوو کچەکان) گوتی: ئەی بابی خۆم! بە کرێی بگرە (بۆ شوانیی) بێگومان بابای بە هێزی ئەمیندار، باشترین کەسە کە بە کرێی دەگری (بۆ شوانیی) ﴿٢٦﴾ (بابی کچەکان) گوتی: من دەمەوێ یەکێک لەم دوو کچەمت

لێ مارە بکەم، کە ماوەی هەشت ساڵان کرێکارم بی (بۆ شوانیی) ئنجا ئەگەر دە ساڵت تەواوکردن، ئەوە (چاکەیەکە) لە خۆتەوەیە و، ناشمەوێ (ئەو کارە) لەسەرت قورس و زەحمەت بکەم، بێگومان ئەگەر خوا بیەوێ لە چاکانم دەبینی (لە مامەڵەدا) ﴿٢٧﴾ مووسا گوتی: ئەو (بەڵێن)ە، لە نێوان من و تۆدایە، هەر کام لە دوو ماوەکەم تەواو کردن، نابێ سنوور شکێنییم لە دژ بکرێ و، خواش شایەدە لەسەر ئەوەی دەیڵێین ﴿٢٨﴾].

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَوَجَّهَ): واتە: ڕووی کردە، (وَاجَهْتُ فُلَانَاً: وَجَهْتُ وَجْهِي تِلْقَاء وَجهِهِ، تَوَجُّهُ: أَقبَلَ)، دەگوترێ: (وَاجَهْتُ فُلَانَاً) واتە: ڕووی خۆم کردە ڕووی ئەو، (تَوَجَّهُ) واتە: ڕووی تێکرد، بەرەو ڕووی چوو.

(تِلْقَآءَ): (مَصْدَر عَلَى وَزْنِ التِّفْعَال، وَلَيْسَ لَهُ نَظِيرٌ فِي كَسْرِ التَّاءِ غَيْرَ تِمْثَال، وتِلْقَاءُ: اللِّقَاءُ وَالمقَارَبَة، أي: لَمَّا تَوَجَّهَ جِهَةُ تُلَاقِي مَدْيَنَ)، وشەی (تِلْقَاء)، چاوگە لە سەر کێشی (تِفْعَال)، تەنیا وشەیەکی دیکەی هاو وێنەی هەیە، لەوەدا کە حاڵەتی چاوگی بە ژێری تائەکە بێ، ئەویش بریتییە لە وشەی (تِمْثَال)، واتە: پەیکەر، کەواتە: ﴿تِلْقَآءَ﴾، واتە: پێکگەشتن و لێ نیزیک بوون، ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ﴾، واتە: کاتێک ڕووی کردە شوێنێک، کە بەرەو لای مەدیەن بوو.

(وَرَدَ): چووە سەری، یان چووە سوێی، (الورُودُ: أَصْلُهُ: قَصْدُ الماء)، (وڕود) لە ئەصڵدا بە مانای ڕووکردنە ئاوە، بۆ ئاوهێنان، (وَرَدْتُ مَاءَ كَذَا: إذَا حَضَرْتَهُ وَإِنْ لَمْ تَشْرَعْ فِيهِ)، ئەگەر بڵێی (وَرَدْتُ مَاءَ كَذَا) واتە: ئامادە بووم لە لای ئەو ئاوە، با نەچووبیە نێویشی.

(تَذُودَانِ): (تَطْرُدَانِ: وَالذَّودُ مِنَ الإِبِلِ: إِلَى العَشَرَةِ)، (تَذُودَانِ) دەریان دەکرد، ئاژەڵەکەیان دەردەکرد، لێرەدا خوا ﷻ دەری نەخستوە ئەو ئاژەڵە، کە ئاویان داوە، مەڕ و بزن بووە، ئاژەڵی ورد، یاخود ڕەشەوڵاخ بوون، واتە: گا و مانگا، یاخود حوشتر بوون؟ دەری نەخستوە، بەڵام لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: مەڕ بوون، وشەی (ذَودْ)یش کە بۆ حوشتر بەکاردێ، سێ هەتا دە (١٠) دانە، پێیان دەگوترێ: (ذَودْ).

(مَا خَطْبُكُمَا): واتە: چیتانە؟! (الخَطْبُ: الأَمْرُ العَظِيمُ الَّذِي يَكْثُرُ فِيهِ التَّخَاطُب)، (خَطْب) بریتیە لە کارێکی مەزن کە قسە و باسی زۆر تێدا دەکرێ، کەواتە: ﴿مَا خَطْبُكُمَا﴾، یانی: چییە حاڵتان؟! ئەو حاڵەتەی ئەو ئاژەڵانەی خۆتان جارێ ڕادەگرن و دووریان دەخەنەوەو، ئاویان نادەن، لەگەڵ هی شوانەکانی دیکە.

(حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ): تاکو شوانەکان لێ نەبنەوەو ناو نەدەن و نەڕۆن، (صَدَرَ: إِذَا عُدِّيَ بِـ «عَنْ» اقْتَضَى الإِنصِرَافَ ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا ﴿٦﴾﴾الزلزلة)، وشەی (صَدَرَ) ئەگەر بە پیتی (عَنْ) بەرەو بەرکار تێپەڕ بکات، مانای لێ بوونەوەو واز لێهێنان دەگەیەنێ، مانای ڕۆیشتن دەگەیەنێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا ﴿٦﴾﴾الزلزلة، ئا لەو ڕۆژەدا خەڵک دەردەچن و دەگەڕێنەوە.

(ٱلرِّعَآءُ): (الرِّعَاء) کۆی (رَاعِي)ە، شوان، کە لە زمانی عەرەبییدا وشەی (رَاعِي) کە بە (رِعَاء)و بە (رُعَاة)یش کۆدەکرێتەوە، هەم بەرانبەر شوانی کوردیی کە بۆ مەڕو بزن و ئەوانە بەکاردێ و، هەم بۆ گاوان کە بۆ ڕەشەوڵاخ بەکاردێ، هەم بۆ حوشترەوان، هەموویان دەگرێتەوە، واتە: وشەی (راعي) لە زمانی عەرەبیی دا: (رَاعِيَ الإِبِلِ و رَاعِيَ الغَنَمِ و رَاعِيَ البَقَرِ)، هەمووی پێی دەگوترێ، بەڵام لە زمانی کوردییدا: وشەی شوان بۆ کەسێک کە مەڕ و بزن دەلەوەڕێنێ بەکاردێنین و، وشەی گاوان بۆ کەسێک کە ڕەشەوڵاخ دەلەوەڕێنێ، بەکاردێنین، هەڵبەتە حوشتریش لە

وڵاتـی تێمـە نەبـووە، ئەگەرنـا ڕەنگـە وشـەیەکی تایبەتیشـیان بـۆ حوشـتر لەوەڕێنیش بەکارهێنابایە.

(ٱلْقَصَصَ): (القَـصُّ: تَتَبُّـعُ الأثَـرِ، وَالقَصَصُ: الأثَرُ، وَالقَصَصُ: الأَخْبَارُ الْـمُتَتَبَّعَةُ)، وشـەی (قَـصُّ) بـە مانـای بـە دوای شـوێنەوارکەوتن دێ، (قَصَـص) بریتیـە لـە شـوێنەوارەکە، هەروەهـا (قَصَـص) بریتیـە لـەو هەواڵانـەی کـە مـرۆڤ شـوێنیان دەکـەوێ و بـە دوایانـدا دەچـێ، بـەڵام (قِصَـص) کـۆی (قِصَّة)یـە واتـە: بەسـەرهات و چیـرۆک.

(حِجَجٍ): (جَمْـعُ حِجَّـة: السَّـنَة، مُشْـتَقَّةٌ مِـنَ الحَـجِّ، لِأَنَّ الحَـجَّ يَقَـعُ كُلَّ سَـنَةٍ)، (حِجَـجْ) کـۆی (حِجَّة)یـە، کـە ئەویـش بـە مانـای سـاڵ دێ، لـە حەجـەوە وەریانگرتـوە، چونکـە حـەج سـاڵانە دووبـارە دەبێتەوە.

(وَكِيلٌ): واتـە: کارپێسـپێردراو، بـە کوردییـش بـەکاری دێنیـن، دەگوتـرێ: فلانکـەس وەکیلـی فلانکەسـە، (التَّوْكِيـلُ: أَنْ تَعْتَمِـدَ عَـلَى غَيْـرِكَ وَتَجْعَلَـهُ نَائِبَـاً عَنْـكَ، وَالوَكِيـلُ فَعِيـلٌ بِـمَعْنَى مَفْعُـول)، (تَوْكِيـل) وەکیـل گرتـن، ئەوەیـە کـە تـۆ پشـت بـە جگـە لـە خـۆت ببەسـتی و بیکـەی بـە جێگـری خـۆت، (وكيـل)، لەسـەر کێشـی (فَعِيـل)ە، بـەڵام بـە مانـای (مَفعُـول)ە، (الوكيـل)، یانـی: (المَوكُـولُ إِلَيْـهِ) کەسـێک کـە کاری پـێ سـپێردراوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئـەم قۆناغـەش کـە قۆناغـی چوارەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـایە ﷺ تەنیا لـەم سـوورەتەدا هاتـوە، نەوەنـدە هەیـە لـە سـوورەتی (طـه) لـە ئایەتـی ژمـارە (٤٠) دا، ئاماژەیەکـی کورتـی پـێ کـراوە، لەبـەر ئـەوەی پێشـتر بـە تەواویـی باسـکراوە، کـە دیـارە ئـەم سـوورەتە پێـش سـوورەتی (طـه) هاتـوە، بۆیە لـە ئایەتی (٤٠)ی سـوورەتی (طـه)دا، خـوا ﷻ وەک بیـر خسـتنەوەی ئـەو ڕاسـتییە بـۆ مووسـا ﷺ باسـی دەکات، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَا مُوسَىٰ ﴿٤٠﴾﴾، واتـە: کەسـێکت کوشـت تۆمـان لـە خـەم و پـەژارە دەربـاز کـردو، تۆمـان بـە چەنـدان جـۆر تاقیکـردەوە، ئنجـا سـاڵانێک لـە نێـو خەڵکـی مەدیەنـدا مایـەوەو، دوایـی لـە کاتێکـی ئەندازەگیرییکـراودا، هاتـی ئـەی مووسـا! ﷺ، واتـە: هاتـی بـۆ ئـەو شـوێنە کـە پەیـام و وەحیـی خـوای پـەروەردگارت پـێ بـدرێ و بکرێیـە پێغەمبـەر، کـە ئـەوە تەنیـا ئاماژەیـە، لەبەر ئـەوەی لە سـوورەتی (القصـص)دا، مانـەوەی مووسـا ﷺ لـە نێـو خەڵکـی مەدیەنـداو، شـوانیی کردنـی بـە تەفصیـڵ باسـکراوە و هاتـوە.

دیـارە خـوا ﷻ پێشـتر باسـیکرد، کـە مووسـا ﷺ دوای ئـەوەی ئـەو پیـاوە بـڕوادارە، یـان ئـەو پیـاوە دڵسـۆزە، کـە لـەو پـەڕی شـارەوە هـات بـە خێرایـی و، هەواڵـی پێـدا، کـە دارو دەسـتە و کار بەدەسـتانی فیرعـەون، تەگبیـر دەکەن و، نەخشـە دادەنێـن و، پیـلان دادەنێـن و، تاکـو تـۆ بگـرن و بتکـوژن، مووسـا ﷺ بـە ترسـەوە، لە شـار دەرچـوو، بـە چـوار چاویـی و لـە خـواش پاڕایـەوە گوتـی: خوایـە! لـە کۆمەڵـی سـتەمکاران دەربـازم بکـە، ئێمـەش لێـرە بەخێرایـی بەسـەر تەفسـیری ئایەتەکانـدا دەڕۆیـن:

﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ ﴾، کاتێک ڕووی کردە لای مەدیەن، وڵاتی مەدیەن: ﴿ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، گوتی: نیزیکە پەروەردگارم ڕێی ڕاستم پیشانبدا، ڕێی ڕاست: لێرەدا مەبەست پێی ڕێی ڕاستە کە بیگەیەنێ بەو ئامانجەی کە بریتیە لە خۆ پەنهان کردن و خۆ پەنادان و، دەرباز بوون لە فیرعەون و دارو دەستەکەی. ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ ﴾، ئنجا کاتێ چووە سەر ئاوی مەدیەن، ئاوێکیان هەبووە: ئایا ڕووبار بووە؟! کانیی و سەرچاوە بووە؟! بیر بووە، ئاوەکەیان هەڵهێنجاوە؟! گۆماوێک بووە؟! باس نەکراوە، کۆمەڵە خەڵکێکی لەسەر بینی ئاژەڵیان ئاو دەدا، ﴿ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ ﴾، لە خوارروانەوە، یان جیا لەوان، دوو ئافرەتی دیتن، ئاژەڵەکانی خۆیان دوور دەخستنەوەو، حەپس دەکردن، جارێ تێکەڵ نەبن لەگەڵ ئاژەڵی شوانەکان، ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا ﴾، گوتی: چیتانە؟! ﴿ قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ ﴾، گوتیان: ئێمە ئاژەڵەکامان ئاو نادەین، تاکو هەموو شوانەکان نەڕۆن، تاکو شوانەکان هەموو ئاژەڵەکانیان ئاو نەدەن و نەڕۆن، ئێمە ئاژەڵەکامان ئاو نادەین، ﴿ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾، بابیشمان پیاوێکی بە تەمەنی بەساڵدا چوویە، یانی: بۆیە ئەو نەهاتوەو ئێمە دوو ئافرەتین، هاتووین.

﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ ﴾، ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، دوایی گەڕایەوە بەرەو سێبەرەکە، دیارە پێشتر لە سێبەری درەختێک دانیشتوەو چۆوە بۆ ئەوێ، ﴿ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾، گوتی: پەروەردگارم! من بۆ هەر چاکەیەک کە بۆم دابەزێنی، ئاتاجم، واتە: پێویستییم بە هەموو خێرو چاکەیەکی تۆ هەیە، وا پێدەچێ مەبەستی پێ حەوانەوەو خواردن و خۆراک و پێداویستییەکانی ژیان بووە.

﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ ﴾، لە دوو (کچ)ەکان یەکێکیان هاتە لای بە شەرمەوە دەڕۆیی، ﴿ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴾، گوتی: بابم بانگت دەکات، تاکو ئەوە کە ئاژەڵت بۆ ئاو داوین، کرێیەکەت بە

پاداشت بداتەوە، ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ ﴾، ئنجا کاتێک مووسا ﷺ هاتە لای پیاوە بە تەمەنەکە، بابی دوو کچەکەو، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ﴿ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، گوتی: مەترسە، لە کۆمەڵی ستەمکاران دەرباز بووی، واتە: تێرە لە ژێر ڕکێفی فیرعەون و دارو دەستەکەیدا نیە و، ئەوان دەستیان ناگاتە ئێرە.

﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾، یەکێک لە دوو کچەکان، گوتی: ئەی بابە! بە کرێی بگرە، باشترین کەسێک کە تۆ بە کرێی بگری، بابایەکی بەهێزی ئەمیندارە، ئەو مووسایەش ﷺ ئەو دوو سیفەتەی تێدان.

﴿ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ ﴾، بابیان پێشنیاری کچەکەی وەرگرت، گوتی: دەمەوێ یەکێک لەم دوو کچەمت لێ مارە بکەم، ﴿ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖ ﴾، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تۆ هەشت ساڵان کرێکارم بی، واتە: شوانم بی، ئاژەڵەکانم بۆ بلەوەڕێنی، ﴿ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَ ﴾، ئنجا ئەگەر دە (١٠) ساڵت تەواو کردن، ئەوە لە لایەن خۆتەوەیە و چاکەی خۆتە، ئەگەرنا بڕیارەکە هەشت (٨) ساڵە، ﴿ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَ ﴾، ناشمەوێ لەسەرت وەزەحمەت بخەم، بە بڕو بیانوو نیم، ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ لە چاکانم دەبینی، لە مامەڵە و هەڵسوکەوتدا.

مووساش ﷺ ئاوا وەڵامی دایەوە:

﴿ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ ﴾، گوتی: ئەو بڕیارە لە نێوان من و تۆدا بێ، ﴿ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ ﴾، هەر کام لە دوو کاتەکەم تەواو کرد، هەشت ساڵەکە، یان دە ساڵەکە، دەستدرێژیی نەکرێتە سەرم و هەڵنەپێچرێم، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴾، خواش لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین، کار پێسپێردراومان بێ و، چاودێر بێ بەسەرمانەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بەڕێ کەوتنی مووسا ﷺ بەرەو لای مەدیەن و، لە خوا ﷻ پاڕانەوەی کە ڕاستە ڕێی بکات و، پاش گەیشتنی بە ئاوی مەدیەن، هاوکاریی کردنی بۆ دوو ئافرەتەکە، کە ئاژەڵەکانی خۆیان ڕاگرتبوون، تاکو شوانەکان لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان دەبنەوە، پاشان گەڕانەوەی بۆ ئەو سێبەرەی پێشتر لێیبوو بوو و، ئنجا لە خوا ﷻ پاڕانەوەی کە بۆ هەر خێرو چاکەیەکی وی ئاتاجە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ ۖ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا ۖ قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ ۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ﴾، کاتێک (مووسا) ڕووی کردە لای مەدیەن، پێشتر هەم وشەی: ﴿تَوَجَّهَ﴾مان شیکردەوە، هەم ﴿تِلْقَآءَ﴾، ﴿وَلَمَّا﴾ ئەم (و)ە، بۆ بادانەوەو گێڕانەوە (عطف)یە، ئەم ڕستەیە بادەداتەوەو دەیگێڕێتەوە بۆ سەر چەند ڕستەیەک کە پێشتر باسکراون و، هەندێکیش کە قرتێنراون، لەبەر ئەوەی بە سەلیقە و عەقڵ دەزانرێن، واتە: (**وَلَمَّا خَرَجَ مِنَ الْمَدِينَةِ هَائِماً عَلَى وَجهِهِ، فاتَّفَقَ أَن كَانَ مَسِيرُهُ فِي طَرِيقٍ يُؤَدِّي إِلى أَرْضِ مَدْيَن، حِينَئِذٍ تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَديَن**)، لە قورئاندا هەمیشە خوا ﷻ ئەوەی کە بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکاندا، یاخود لە کاتی ڕاگەیاندنی ڕاستییەکاندا، خوا

ﷺ کتێبی موبارەک و بە پیت و پێزی خۆی پێ قەرەباڵغ نەکردووەو قرتێندراوە، لێرەشدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ ﴾، یانی: دوای ئەوەی کە لە شار دەرچوو، نەیدەزانی بۆ کوێ دەچێ! بەڵام وابوو کە دەرچوونەکەی بەرەو ئاقاری مەدیەن بوو، ڕێگاکەی ڕوو بە لای مەدیەن بوو، (مەرج نیە مووسا ﷺ شارەزا بووبێ، کە بەس خوا دەزانێ ماوەی چەند بەڕێوە بووە)، ئنجا ڕوویکردە لای مەدیەن، لەو کاتەدا:

٢)- ﴿ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، گوتی: نیزیکە پەروەردگارم ڕاستە ڕێم بکات، لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست لە ڕاستە ڕێ، واتە: ئەو ڕێیەی کە ڕێک دەمگەیەنێ بەو ئامانجەی کە بۆی دەچم، نەک مەبەست پێی ڕێی مەعنەویی بێ، واتە: ڕێی پێدا ڕۆیشتن، بەڵام کە ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ، ئەوەش دەگرێتە خۆی، کە ئەو پاڕانەوەیەی مووسا ﷺ: ﴿ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، ئەوەش دەگرێتە نێو خۆی کە خوای پەروەردگار لە ڕووی دیندارییشەوە، ڕاستە ڕێی بکات و هیدایەتی بدات و عەقڵ و دڵی بەرەو ڕەزامەندیی خۆی پەڵکێش بکات.

ئەگەرنا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، واتە: نیزیکە پەروەردگارم بمخاتە سەر ڕێیەکی ڕاست، کە هیچ قۆرت و پێچی تێدا نەبێت و، ڕێک بمگەیەنێ بەو شوێنەی کە ئامانج و مەبەستمە، کە بریتیە لەوەی بگەمە شوێنێک، تێیدا دڵنیاو بێ ترس بم، لە فیرعەون و دارو دەستەکەی.

٣)- ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ ﴾، کاتێک گەیشتە لای ئاوی مەدیەن.

پێویستە بزانرێ: (وُرُود) جاری وایە بە مانای چوونە نێو (دُخُول)ە، بەڵام زیاتر بە مانای چوونە سەر سوێ (إشراف)دێ، واتە: کاتێک مووسا ﷺ گەیشتە سوێ و قەراغ ئاوی مەدیەن، چونکە لە شوێنێکی دیکە لە سوورەتی مەریەم دا، وشەی (ورود) بەکارهاتووە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴿٧١﴾ ﴾مریم، هیچ کامێک لە ئێوە نیە، مەگەر (ورود)ی دەبێ بۆ دۆزەخ، ئایا یانی: هیچ کامێک لە ئێوە نیە، مەگەر دەچێتە نێو دۆزەخ؟! بە تەنکید نەخێر، یانی: دەچێتە سوێی و دەچێتە

قـەراغ (وَإن مِنْكُم إلَّا يُشْرِفُ عَلَيها)، هیـچ کام لـە ئێـوە نیـە مەگـەر پێیـدا دەڕوانـێ و دەچێتـە سـوێی، کاتـی خـۆی لـە تەفسیری سـوورەتی (مریـم)دا، بـە تەفصیـڵ باسـی ئەوەمـان کـردوە و، ئـەم ئایەتەشـمان بـە بەڵگـەی ئـەوێ هێناودتـەوە کـە مووسـا ﷺ نەچۆتـە نێـو ئاوەکـە، گۆماوێـک بـووە، بیرێـک بـووە، سـەرچاوەیەک بـووە، یاخـود ڕووبارێـک بـووە، بەوێـدا هاتـوە مووسـا ﷺ چۆتـە سـەر سـوێی ئاوەکـە، نیزیـک ئاوەکـە، نـەک چووبێتـە نێـوی، ئەگەرنـا خـوا ﷻ دەیفەرمـوو: (وَلَـمَّا دَخَـلَ مَـاء مَديـن).

وشـەی ( وَلَمَّا)، دەڵـێ: (حَـرْفُ تَوْقِيْـت وُجُـود شَيءٍ بِوجُـود غَـيرِه)، (لَـمَّا) پیتێکـە بەکاردەهێـنرێ بـۆ دیاریـی کردنـی کاتێـک بـۆ شـتێک، بـە بوونـی شـتێکی دیکـە، کاتێـک چـووە سـوێی ئـاوی مەدیـەن:

٤)- ﴿وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ﴾، کۆمەڵە خەڵکێکی لەسەر بینی، ئاویان دەدا، لێرە فەرموویەتی: کۆمەڵە خەڵکێک، بەڵام دوایی بۆمان دەردەکەوێ ئەو کۆمەڵە خەڵکە شوان بوون، بە چی بۆمان دەردەکەوێ؟! بە قسەی دوو ئافرەتەکە کە دەڵێن: ﴿لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُ﴾، هەتا شوانەکان لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان لێ نەبنەوە، ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین، کەواتە: ئەو کۆمەڵە خەڵکە شوان بوون و ئاژەڵیان ئاوداون.

﴿يَسۡقُونَ﴾، واتـە: ئاویـان دەدان، (أي يَسْـقُونَ «مَـا» مِـن شَـأْنِهِ أَنْ يُسْـقَى)، شـتێکیان ئاویـان دەدا، کـە بگونجـێ (یاخـود پێویسـت بـێ) ئـاو بـدرێ، ئنجـا ئەمـە دەگونجـێ مـەڕ بووبـن، دەگونجـێ بـزن بووبـن، یـان مـەڕو بـزن بووبـن، پێکـەوە، دەگونجـێ ڕەشـە وڵاخ بووبـن، دەگونجـێ هێسـترو مایـن، یـان ئەسـپ و کـەر بـوو بـن و، دەگونجـێ حوشـتر بـوو بـن، خـوا ﷻ دیاریـی نەکـردوە، بـەڵام وەک پێشـتریش گوتمـان: لـە پەیمانـی کۆنـدا هاتـوە کـە مـەڕ بـوون.

٥)- ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِ﴾، لە خواروانەوە، یان جیا لەوان دوو ئافرەتی لێ هەڵکەوتن، ڕێگرییان دەکرد لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان، دووریان دەخستنەوە.

(مِن دُونِهَا) واتە: جیا لە خەڵکەکە، دوور لە خەڵکەکە، چونکە وشەی (دون)، یانی: (المَكَانُ الأَسْفَل أَو الأَبْعَدُ كَأَنَّه يَنْزِلُ إِلَيْهِ المَاشِي)، کە دەفەرموێ: (دون)ی ئەوان، یانی: لە خوارەوانەوە، یاخود دوورو جیا لەوان، چونکە (دون) یانی: شوێنێکی خوارتری دوورتر، وەک بابای ڕۆیشتوو دایدەبەزێتێ.

تەعبیری (دون)ی بەکارهێناوە لەبەر ئەوەی شوانەکان ئاژەڵەکانی خۆیان ئاوداون، دوو ئافرەتەکەش ئاژەڵەکانی خۆیان ڕاگرتوون، کەواتە: لە پلەیەکی خوارەوەوە بوون، چ لە ڕووی جوگرافیی و، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە، دەری نەخستوە ئایا ئەو دوو ئافرەتانە ژن بوون، کچ بوون، کێ بوون؟ بەڵام دوایی بۆمان دەردەکەوێ، کە دوو کچ بوون.

﴿ تَذُودَانِ ﴾، (أَي: تَطْرُدَانِ أَو تَمْنَعَانِ إِبِلاً أَو غَنَماً أَو مَاشِيَةً مِنَ المَاء)، واتە: ڕێگرییان دەکرد، لە ئاژەڵەکانیان، (حوشتر یان مەڕ یان ڕەشە وڵاخ) دووریان دەخستنەوەو ڕایان دەگرتن، نەیفەرموە لە چی؟ بەڵام بە سیاق دیارەو وشەی (ذَادَهُ، يَذُودُهُ)، یانی: ڕێی لە ئاژەڵ گرت، ڕێی لێدەگرێ کە بلەوەڕێ، یاخود ئاو بخواتەوە، واتە: ئاژەڵەکانی خۆیان ڕێ لێ دەگرت، کە تێکەڵ بن، لەگەڵ ئاژەڵەکانی دیکە، ڕەنگە شوانەکان گوتبیان: ئێوە بۆتان نیە جارێ ئاژەڵی خۆتان ئاو بدەن، وا دیارە هەر بنچینەیان وا بوو بێ، نەک هەر ئەو ڕۆژە وابوو بێ.

٦)- ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا ﴾، مووسا گوتی: ئەوە چیتانە؟ یانی: بۆچی ئاژەڵەکانتان ڕادەگرن؟ مووسا ﷺ کاتێک ئەو دیمەنە دەبینێ، ئەوە دوو کچ، دوو ئافرەتی ڕوو سوور، کە دیارە بە شەرم و شکۆ بوون و، پۆشتەو بە حەیا و ئەدەب بوون، کە ئەوەمان دوایی بۆ دەردەکەوێ، ﴿ فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ ﴾، تەماشا دەکات ئەو دوو ئافرەتە ئاژەڵەکانی خۆیان ڕاگرتوون و، ناهێڵن بچن سەر ئاو، دیارە ئاژەڵەکان تینوو بوون و، ڕەنگە پەلکێشییان کرد بێ و، پرکێشیان کردبێ، بچن بۆ ئاو خواردنەوە، ئەوانیش ڕایانگرتوون و نەیانهێشتوە، ئەوەش دیارە بنچینەیەک بووە ئەو شوانانە مامەڵەیان پێ

لەگەڵ ئەو دوو ئافرەتەو ئاژەڵەکانیاندا کردوە، کە نابێ ئێوە ئاژەڵی خۆتان ئاو بدەن، تاوەکو ئێمە لێ نەبینەوە، ئنجا ئەگەر بیر بووە و ئاوەکەیان هەڵهێنجاوە و، بۆیان لە گۆلاوێک کردوون، ئەگەر هەر گۆلاوێک بووە، ڕووبارێک بووە، کانیی و سەرچاوەیەک بووە، گرنگ ئەوەیە ئەو دوو ئافرەتەی ئاوا بینین، ڕێ لە ئاژەڵەکانیان دەگرن، حەپسیان دەکەن، جارێ نەچن ئاو بخۆنەوە.

﴿مَا خَطْبُكُمَا﴾، ئـەوە چیتانـە؟! (الخَطْـبُ: الشَّـأْنُ وَالحَـدَثُ المُهِـم يَلـزَمُ فيـه التخاطـب)، (خطـب) کارێکـی گرنـگ، پێویسـت بـکات قسـەی تێـدا بکـرێ.

٧)- ﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ﴾، هەردووکیان گوتیان: ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین، تاکو شوانەکان نەڕۆن، وشەی ﴿يُصْدِرَ﴾، (أَصْدَرَ، يُصْدِرُ)، خوێندراویشەتەوە: (حَتَّى يَصْدُرَ)، (صَدَرَ، يَصدُرُ)، (الإصدَارُ وَالصُّدُورُ: الإرْجَاعُ مِنَ السَّقِي)، (إصدَارُ وَصُدُورُ) بریتین لە گێڕانەوەی ئاژەڵ لە ئاودان، واتە: ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین، تاکو شوانەکان ئاژەڵەکانیان ئاو نەدەن و لێ نەبنەوەو نەڕۆن.

(الرِّعَـاءُ: جَمْـعُ رَاعـي، الرِّعَـاءُ وَالرُّعَـاةُ وَالرِّعيَـانُ جَمْـعُ رَاعٍ)، (راعـي) بـە سـێ جـۆر کۆدەکرێتـەوە، بـە (الرِعَـاء) و بـە (الرُعَـاةُ) و بـە (رِعيـانُ) هەرسـێکیان کـۆی (راعـي) یـن، (راعـي)ش جـاری وایـە حاڵەتـە ئیعرابییەکـەی وایـە، (ي)ەکـەی لەگەڵـدا دەبـێ، جـاری واش هەیـە، حاڵەتـە ئیعرابییەکـەی وایـە (ي)ەکـەی دەقرتێـنرێ، (راعـي) یـان (راعٍ) هەردووکیـان بـە مانـای شـوان دێـن.

بـۆ مووسـایان ڕوونکـردەوە، بۆیـە ئاژەڵەکانیـان ڕادەگـرن، تاکـو شـوانەکان، شـوانە پیاوەکان لـە ئـاودانی ئاژەڵەکانیـان دەبنـەوەو دەڕۆن، کـە لەمـەوەش دەردەکـەوێ کـە ئەوانـە خەڵکێکـی بـێ بەزەیـی بـوون و، خەڵکێـک بـوون ڕێـزی ئافرەتیـان نەگرتـوە، ڕێـزی خەڵکـی بێهێزیـان نەگرتـوەو، وەک بنەمایەکـی هەمیشـەیی بـووە، مامەڵەیـان پـێ لەگـەڵ ماڵـی ئـەو پیـاوە بـە تەمەنـەدا کـردوە، کـە ناچـار بـووە کچەکانـی بنێـرێ بـۆ ئـاودان و لەوەڕاندنـی ئاژەڵـەکان، بۆیـە دوایـی ڕوونـی دەکەنـەوە دەڵێـن:

٨)- ﴿وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾، بابیشمان پیاوێکی بە تەمەنی گەورەیە، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەوەیە: بۆچی خۆتان هاتوون بۆ ئاودانی ئاژەڵەکان؟! دەڵێن: بابیشمان پیاوێکی بە تەمەنی بەساڵدا چوویە، ﴿شَيْخٌ﴾، یانی: بە تەمەن ﴿كَبِيرٌ﴾، یانی: بەساڵدا چوو، زۆر کەوتۆتە تەمەنەوە، ئەمە پۆزش هێنانەوەیە، کە بۆچی بابیان ئامادە نەبووە بۆ ئاودانی ئاژەڵەکان؟

٩)- ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾، مووسا یەکسەر بۆی ئاودان، ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، واتە: (فَسَقَى لَهُمَا الْمَسْقِيَّة)، ئەوەی دەبێ ئاو بدرێ، بۆی ئاودان، ئنجا مەڕ بووە و، بزن بووە و، مەڕو بزن بوون و، حوشتر بوون و، ڕەشەوڵاخ بوون! گرنگ ئەوەیە بۆی ئاودان.

١٠)- ﴿ثُمَّ تَوَلَّىٰ إِلَى ٱلظِّلِّ﴾، دوایی گەڕایەوە بۆ سێبەرەکە، (التَّوَلِّي: الرُّجُوعُ عَلَى طَرِيقِه)، (تَوَلِّي) بریتیە لەوەی ئینسان بەڕێی خۆیدا بگەڕێتەوەو، لە شوێنێکەوە هاتبێ، بەوێدا بگەڕێتەوە، ﴿إِلَى ٱلظِّلِّ﴾، بەرەو لای سێبەرەکە، (أل)ی سەر ﴿ٱلظِّلِّ﴾، بۆ (عهد) ە، سێبەرەکە ئەو سێبەرەی کە پێشتر لێی بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێشتر لە سێبەرێک دانیشتووە تەماشای ئەو دیمەنەی کردووە، وەک پێشینانی خۆمان دەڵێن: تیغی ڕەسەن خۆی لە کالانێدا ڕاناگرێ، کە دەبینێ دوو ئافرەتی ڕوو سوور، ئاژەڵەکانی خۆیان حەپس کردوون، تاکو پیاوەکان لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان دەبنەوە، غیرەت و جەوهەری قبووڵی نەکردوە، لەو دیمەنەوە ڕامێنێ، بە مەزڵوومی زانیون، بۆیە یەکسەر چووە، دیارە گۆچانێک، دارێکی لێ بەدەستەوە گرتوە و، چووە ئاژەڵەکانی ئاوداون و، بێ منەتیش بووە لە شوانەکان، ئنجا لێرەدا زانایان زۆر قسەیان کردوە لەو بارەوە، کە ئایا مووسا ﷺ چۆنی ئاژەڵەکان بۆ ئاوداون؟! هەندێکیان گوتوویانە: بەردێک لەسەر زاری بیرەکە بووە، بە دە کەسان لابراوە، هەندێک دەڵێن: بە چل (٤٠) کەس، ئەو بە تەنیا لایبردوە، هەندێک دەڵێن: پێویستیی بە ئاو هەڵهێنجان بووە، کە دۆلکەکە بە ئافرەتەکان بە زەحمەت هاتۆتە سەرێ، بەڵام ئەو بە یەک دۆلکە، دوو دۆلکە، ئەو حەوزەی بۆ پڕ کردوون و ئاژەڵەکانیان لێ ئاوداوە، بەڵام ئەو وردەکارییانە لە قورئاندا نەهاتوون، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان، دوایی چوو گەڕایەوە بۆ سێبەرەکە.

١١)- ﴿ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾، گوتی: ئەی پەروەردگارم! من هەر چاکەیەکم بۆ دابەزێنی، پێویستم پێیەتی، ئەمە هەم جۆرێکە لە مەدح و ستایشی خوا ﷻ، کە خوا چاوگ و سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشیی و چاکەیەکە بۆ مرۆڤ، هەم زۆر بە ئەدەبەوە داوا کردنە لە خوا ﷻ، کە پێویستیی بە هاوکاریی خوا هەیە و، پێویستیی بە خێرو چاکەی خوا هەیە، ئنجا ئەو خێرو چاکەیە، زادو نان و زەخیرەیە، هەرچی هەیە، لێرەشدا توێژەرەوانی قورئان بەسەرهاتی عەجایب لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە نەقڵ دەکەن و لە کەسی دیکەوە، دوایی یەکیان دێنین، کە گوایە مووسا ﷺ ئەو ماوەیە: مانگێک بووە، یان کەمتر بووە، کە بەڕێوە بووە، هەر گیای خواردوە و، ئەو شتانەی خواردوون کە لە زەوی دا دەڕوێن، هەتا دەڵێن: دوایی ئەوەندە لاواز بووە، لە ڕیخۆڵەکانیەوە ئەو خواردنە دیار بووە کە تەماشات کردوە!! کە ئەوە زێدەڕۆیی (مبالغة)یە، بەڵام بە تەئکید مووسا ﷺ پێویستیی بە خواردن و خۆراک بووە و، پێویستیی بە شوێنی حەوانەوە بووە و، پێویستیی بە دڵنیایی و هێمنییش بووە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾، هەر خێرو چاکەیەک لە تۆوە بێ و، هەر بەرژەوەندیی و سوودێک لە تۆوە بێ، من پێویستییم پێیەتی، (الخَيْرُ: مَا فِيهِ نَفْعٌ وَمُلَائَمَةٌ لِمَنْ يَتَعَلَّقُ هُوَ بِهِ، فَمِنهُ خَيرُ الدُّنيَا، وَمِنْهُ خَيرُ الآخِرَة، وَأَحْسَنُ خَيرٍ للغَرِيبِ: وُجُودُ مأوى يَطعَمُ فِيهِ، وَيَبِيتُ، وَزَوجَةٌ يَأنِسُ إِلَيْهَا وَيسكن، فَكَانَ استِجابَةُ اللهِ أَن أَلهَمَ الشَّيخَ الكَبِير، فأرسل اليه إحدى ابنتيه)، وشەی (خَيْر) هەر شتێکە کە سوودی بۆ مرۆڤ تێدا هەبێ و، لەگەڵی بگونجێ، لەگەڵ ئەو کەسەدا کە داوای دەکات، چ چاکەی دنیا، چ هی دواڕۆژ، باشترین چاکەش بۆ بابای ئاوارە و غەریب کە لە شوێنێکی دیکەوە هاتوە، ئەوەیە کە شوێنێک، پەنایەک هەبێ خواردنی لێ بخوات، شوێنێک هەبێ شەوی تێدا بکاتەوەو، هاوسەرێک هەبێ، بۆی ببێتە مایەی ئارامیی و کابانەتیی بۆ بکات، بۆیە خوا ﷻ یەکسەر وەڵامی پاڕانەوەکەی مووسای ﷺ دایەوە، کە زۆر بە ئەدەبەوە لە خوا پاڕایەوە، خورپەی خستە دڵی پیاوە پیرە بە تەمەنەکەوە، کە یەکێک لە دوو کچەکانی لە دوا بنێرێ.

پێویستە بگوترێ: ﴿ مَدْيَنَ ﴾، ناوی شارو وڵاتێک بووە، بەڵام بە ناوی گەلی مەدیەنەوە ناونراوە، ئەو گەلەش لە وەچەی میدیانی کوڕی ئیبراهیم بوون ﷺ،

کە ئێمە لە سووڕەتی ئیبڕاهیمدا، بە تەفصیل باسمان کردوە، ئیبڕاهیم جگە لە ئیسحاق و ئیسماعیل، کوڕێکیشی بووە بە ناوی میدیان، بەڵکو (پەیمانی کۆن) باسی کوڕی دیکەش دەکات، ئنجا دەڵێ: ئەو گەلی مەدیەنە، لە میدیانی کوڕی ئیبڕاهیم پەیدابوون، سەر زەمینی مەدیەنیش دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای دەریای سوورو، لە میسرەوە نیزیکەی (٨٥٠) میلە، کە دەکاتە (١٣٦٧کم)، ئنجا بەو پێیە بێ، واتە: مووسا ﷺ بە پێیان (١٣٦٧کم)ی بڕیوە، ئەگەر هەر ڕۆژەی پەنجا کیلۆمەتر (٥٠ کم)ی بڕیبێ، (٢٨) ڕۆژی پێچوون، تاکو لە میسرەوە گەیشتۆتە مەدیەن، یانی: دەوری مانگێکی پێ چووە، هەڵبەتە ئەگەر هەر ڕۆژەشی (١٠٠ کم)ی بڕیبێ، واتە: نیوەی: دەوری (١٤، ١٥) ڕۆژی پێچوون.

**مەسەلەی دووەم:**

**بـە دوای مووسـادا هاتنـی یەكێـك لـە دوو كچـەكان بـە قسـەی بابـی و، چوونـی مووسـا ﷺ بـۆ لای پیـاوە بەتەمەنەكـە و، گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی خـۆی بـۆی و، دڵنیـا كردنـەوەی پیـاوە بەتەمەنەكـە بـۆ مووسـا، كـە نەترسـێ و، پێشـنیار كردنـی لـێ مارەكردنـی یەكێـك لـە دوو كچەكـەی، لەسـەر پێشـنیاری یەكێـك لـە دوو كچـەكان، لـە بەرانبـەر هەشـت سـاڵ شـوانیی كردنیـدا بۆیـان و، ئەگـەر كردیشـیە دە سـاڵ، ئـەوە چاكـەو پیاوەتیـی خۆیەتـی:**

خـوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ ﴾، یەكێك لە دوو كچەكان (كە ئاژەڵەكانی پێشتر بۆ ئاودا بوون)، بە شەرمەوە دەڕۆیی و هات بۆ لای.

نـەك بـە نـاز و لەنجـەو لارەوە، نـەك بـە شـێوەیەك كـە جەسـتەی خـۆی نمایـان بـكات، بەڵكـو هـەم لـە ڕووی پۆشـاكەوەو، هـەم لـە ڕووی شـێوازی ڕۆیشـتنیەوە، بـە شـەرم و شـكۆوە دەڕۆیـی، (ف) كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَجَآءَتۡهُ ﴾، بـۆ دواداهاتـن (فـاء التَّعقیـب)ە، پیـاوە پیـرە بـە تەمەنەكـە، بـە خێرایـی یەكێـك لـە دوو كچەكانـی

ناردوە، خوا ﷻ بە خێرایی پاڕانەوەکەی مووسای ﷺ گیرا کردوە، لە میانی ئیلهام کردن بۆ ئەو پیاوە بە تەمەنەدا، کە یەکێک لە کچەکانی بەدوایدا بنێرێ و، چیدیکە بە برسیەتیی لە ژێر سێبەری ئەو درەختە دانەنیشێ، ئنجا سێبەری درەخت بووە و، سێبەری ئەشکەوتێک بووە و، سێبەری چیایەک بووە و، گرنگ ئەوەیە چیدیکە لەوێ نەبێ.

٢)- ﴿قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾، کە هاتوە دەستی نەکردوە بە حیکایەت و قسەی ناپێویست، یەکسەر قسەی مەبەستی کردوە، کە جێی مەبەستە: گوتی: بە دڵنیایی بابم بانگت دەکات، تاکو کرێی ئەوەت بە پاداشت بداتەوە، کە تۆ ئاژەڵەکانت بۆ ئێمە ئاوداوە.

لێرەدا مەبەست لە (کرێی ئەوەت بە پاداشت بداتەوە)، واتە: لە بەرانبەری ئەوەدا کە تۆ چاکەت لەگەڵ ئێمە کردوە، ئەویش دەیەوێ چاکەت لەگەڵ بکات، نەک: ها بگرە ئەوە کرێی کارەکەت!

﴿أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾، وشەی (أجر) یانی: پاداشت، کرێ، شتێک لە بەرانبەر شتێک دا بێ، ﴿لِيَجْزِيَكَ﴾: (لِيُعطِيَكَ) بتداتێ، (جَزَاء) بریتیە لە قەرەبوویەک بەرانبەر کارێکی چاک یاخود خراپ، (الأجرُ: التَّعويضُ عَلَى عَمَلٍ نَافِعٍ لِلمُعَوَّض)، (أجر)یش بریتیە لە قەرەبوویەک لەسەر کارێکی بەسوود، بۆ بابای قەرەبوو بۆ کراوە، مەبەست پێی ئەوە بووە: تۆ چاکەت لەگەڵ ئێمەدا کردوە و، هاوکارییت کردووین، بابیشم دەیەوێ هاوکارییت بکات و، چاکەت بداتەوە.

٣)- ﴿فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ﴾، کاتێک هاتە لای، (هاتە لای پیاوە بە تەمەنەکە، بابی کچەکە)و، هەواڵی پێدا، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، (القَصَصُ: الخَبَر)، ئەلیف و لامی سەر (ٱلْقَصَصَ)، بۆ ناساندنە، (أي: قَصَصَهُ)، بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، لێرەدا (التَّعريف عِوضٌ عَنِ المُضَاف إليه)، ناساندن قەرەبووی پاڵوەلادرا، (المُضَاف إليه)ە، یانی: (فَلَمَّا جَاءَ وَقَصَّ عَلَيهِ قَصَصَهُ)، لە جیاتی بفەرموێ: (قَصَصَهُ) دەفەرموێ: ﴿ٱلْقَصَصَ﴾، ئەلیف و

لامی ناساندنی خستۆتە سەر، یاخود ﴿ ٱلۡقَصَصَ ﴾، ئەلیف و لامەکە بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ (عهد)ە، واتە: بەسەرهاتە گۆڕینەکەی، بەسەرهاتە زانراوەکەی خۆی کە زانراوە و ناسراوە، بۆی گێڕایەوە.

٤)- ﴿ قَالَ لَا تَخَفۡ ﴾، گوتی: مەترسێ، واتە: تۆ ئێستا لە ژێر ڕکێفی حوکمی کەنعانییەکان دای و، لە ژێر ڕکێفی حوکمی فیرعەونییەکاندا نەماوی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کاتە حوکمی فیرعەون، لە سنووری وڵاتی میسردا بووە و، نەگەیشتۆتە لای شام و، مەدیەن و ...هتد، ئەو فیرعەونەی کە ئەو بەسەرهاتە لە ڕۆژگاری دابووە، ئنجا ئەگەر حوکمی فیرعەونەکانی پێشتر، یان دواتر، فراوانتر بووبێ، وەک پێشتر باسمان کرد، ئەوە حیسابێکی دیکەیە، بەڵام لەو کاتەدا حوکمی ئەو فیرعەونەی کە مووسا ﷺ لە ماڵیاندا گەورە بووە و، لە ڕۆژگاری ئەودا مووسا ڕایکردوە، لە وڵاتی بەو لاوە نەبووەو نەگەیوەتە مەدیەن.

٥)- ﴿ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، دەرباز بووی لە کۆمەڵی ستەمکاران، کە فیرعەون و دارو دەستەکەینی، واتە: حوکمی ئەوان ناگاتە ئێرەو، ئێرە لە ژێر ڕکێفی ئەواندا نیە.

٦)- ﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ ﴾، یەکێکیان (لە دوو کچەکان) گوتی: هەر ئەو دوو کچەی کە مووسا ﷺ ئاژەڵەکانی بۆ ئاوداون، یەکیان گوتی: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ ﴾، ئەی بابە گیان! بە کرێی بگرە، ﴿ يَٰٓأَبَتِ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (يَا أَبَتَ) بە کرێی بگرە، یانی: بۆ شوانیی، ﴿ يَٰٓأَبَتِ ﴾و (يَا أَبَتَ): (التَاء عِوَضٌ عَنْ يَاءِ المُتَكَلِّمِ فِي النِّدَاء خَاصَّةً)، پیتی (ت) جێگرەوەی (ي)یە، بۆ بابای قسە بێژ، بە تایبەت لە کاتی بانگکردن دا، لە جیاتی بڵێ: (أَبِي) دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ﴾، یاخود (يَا أَبَتَ).

٧)- ﴿ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾، بێگومان باشترین کەسێک کە تۆ بەکرێی بگری، (بۆ شوانیی، بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانمان)، کەسێکە بە هێزیش بێ و ئەمینداریش بێ، ﴿ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾، ئەم (ال)ی سەر ﴿ ٱلۡقَوِيُّ ﴾و ﴿ ٱلۡأَمِينُ ﴾، هەردووکیان بۆ ناساندنن، واتە: ناساندنەکە بۆ جینسەو مەبەست پێی گشتییە، یانی: (التَّعرِيفُ للجِنْسِ المُرَادُ بِهِ العُمُوم، أَي إِذَا اسْتَأْجَرْتَ، فَهذَا الرَّجُلُ هُوَ المَوصُوفُ بالصِّفَاتِ

(اللّازِمة)، ئەگەر بتەوێ کەسێک بە کرێ بگری بۆ شوانیی، ئەم پیاوە خاوەنی ئەو سیفەتە پێویستانەیە، کە بۆ کارەکەمان پێویستن، کە بریتیە لە هێز و ئەمینداریی.

ئایا ئەو کچە لە چی هەڵیهێنجاوە، کە مووسا (عليه السلام) هەم بەهێزە و هەم ئەمینداریشە؟ هەر لە هەڵسوکەوتەکانی مووسادا ئەوەی هەڵهێنجاوە، هێزەکەی لەوەدا کە بە تەنیا ئاژەڵەکانی ئاوداوە و، گوێی نەداوەتە ئەو شوانانەی لەوێن و، ئەمینیش بووە، کاتێ کە لەگەڵیدا هاتوە، یاخود کاتێک کە چووە ئاژەڵەکانی بۆ ئاوداون، چاوی تێنەبریون و، تەماشایان کردوە پیاوێکی نەجیبە، پاکە، بە عیففەتە، ئەمانەتەکەشی لەوە هەڵهێنجاوە.

٨)- ﴿قَالَ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ﴾، (پیاوە بە تەمەنەکە) گوتی: من دەمەوێ یەکێک لەم دوو کچانەمت لێ مارە بکەم، بیکەمە هاوسەرت، لێرەدا خوا (جل جلاله) بەسەرهاتەکە زۆر کورت دەکاتەوە، ئەگەرنا بە تەئکید دوای ئەوەی مووسا (عليه السلام) گەیشتۆتە ئەوێ، خواردنیان پێداوە و پشووی داوە و ئیسراحەتی کردوە، ئنجا مەرج نیە هەر لە هەمان کۆڕو مەجلیسدا، کچەکە بە بابی گوتبێ: بابە ئەم پیاوە بە کرێ بگرە، پیاوێکی بەهێز و ئەمیندارە، بەڵکو لە مەقامێکی دیکەدا، بە تایبەتیی لەگەڵ بابیان دانیشتوون، هەروەها لەگەڵ دایکیانداو، کەوتوونەتە ڕاوێژ: چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکەن؟ ئەو کاتە کچەکە پێشنیاری کردوە، ئنجا دواییش ئایا هەر ئەو ڕۆژە بووە، یاخود پێی چووە، بابەکە پێشنیار دەکات، دەڵێ: ﴿إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ﴾، من دەمەوێ یەکێک لەم دوو کچەمت لێ مارە ببڕم، ئەو دوو کچەی تۆ ئاژەڵەکانت بۆ ئاوداون، هەڵبەتە ئەمە سەرپشککردنی مووسا (عليه السلام) بووە، کە یەکێک لەو دووانە هەڵبژێرێ، کامیانی بە دڵە، سەر پشکە، بەڵام ئەوە بە گرێبەستی هاوسەرگیریی دانانرێ، بەڵکو تەنیا سەر پشککردنە، بەڵام دوای ئەوەی دیاریی دەکات، ئنجا لێی مارە دەبڕێ، لە بەرانبەر چییدا؟!

٩)- ﴿عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ﴾، له بەرانبەر ئەوەدا، کە تۆ کرێکارم بی ماوەی هەشت ساڵان، ﴿تَأْجُرَنِي﴾، (مُضَارِعُ أَجَرَهُ، مِثْلَ نَصَرَهُ، إِذَا كَانَ أَجِيراً لَه)، ﴿أَن تَأْجُرَنِي﴾، یانی: (أَنْ تُصبِحَ أَجِيراً لِي)، واته: ببیه کرێکاری من، کارم بۆ بکەی، ماوەی چەند؟!

﴿ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ﴾، ماوەی هەشت ساڵان، ﴿حِجَجٍ﴾، (جَمعُ حِجَّةٍ أَي: سَنَة)، لەبەر ئەوەی حەج لە ساڵدا تەنیا جارێک دەکرێ، بۆیە کە گوتوویانە: (حِجَّةٌ)، یانی: (سَنَةٌ).

١٠)- ﴿فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ﴾، ئنجا ئەگەر دە ساڵت تەواو کردن، ئەوە لەلایەن خۆتەوەیەو، چاکەو پیاوەتیی خۆتەو پێیەوە پابەند کراو (مُلزَم) نی.

ئەمە دیارە هەمووی دانوستان بووە، لەگەڵ مووسادا ﷺ و ڕێککەوتن بووەو پێشنیارکردن بووە بۆی، کە دەڵێ: ﴿فَمِنْ عِندِكَ﴾، (أَي تَفَضُّلٌ مِنكَ) ئەوە چاکەیەکە و زیادەیەکە لە لایەن خۆتەوە.

١١)- ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ﴾، ناشمەوێ بارگرانییت بخەمە سەر، یانی: لێت بە برو بیانوو نیم، هەموو ڕۆژێ پرتە و بۆڵەت لەسەر ناکەم و مامەڵەم خۆشە لەگەڵتدا.

١٢)- ﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ لە چاکان دەمبینی، لە مامەڵە کردن و هەڵس وکەوتدا، ئینسانێکی باشم دەبینی، لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا، ئومێدم وایە، ئەگەر خوا ﷻ حەز بکات، لە چاکان بم، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، دەفەرموێ: [رَحِمَ اللهُ رَجُلًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى، وَإِذَا اقْتَضَى]، (أخرجه البخاري: ٢٠٧٦)، واته: خوا بەزەیی بە مرۆڤێکی تەبا و گونجاو دابێ، لە کاتێکدا کە دەفرۆشێ و، کاتێک کە دەکڕێ و، لە کاتێکدا کە لەگەڵ کەسێک دەبێتە کێشەیەک و دەچنە دادوەرییەوە.

ئنجا ئەوە پێشنیار خستە ڕووی پیاوە بە تەمەنەکە بوو، با بزانین وەڵامی مووسا ﷺ چی دەبێ؟!

١٣)- ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ ﴾، گوتی: ئەوەی گوترا، لە نێوان من و تۆدا بێ، ئەمە قبووڵ کردن و پەسەند کردن و، وەڵام دانەوەیە لە مووساوە ﷺ، واتە: ئەوەی گوتت، ئەوە لە بەینمان دابێ.

١٤)- ﴿ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ ﴾، هەر کام لە دوو کاتەکان، (هەشت ساڵەکە، یاخود دە ساڵەکە)م تەواو کردن، دەستدرێژیی و سنوور شکێنییم، بۆ لانەکرێ، ﴿ ٱلْأَجَلَيْنِ ﴾، کە مەنصووبە بە: ﴿ قَضَيْتُ ﴾، مەنصووبە، (أيُّ: اسمُ مَوصُولٍ مِثْلُ ما، وَزِيدَت بَعدَهَا، ما، لِلتَّأكِيد، لِيصِيرَ المَوصُولُ شَبِيهاً بِأسْمَاءِ الشَّرطِ).

(أيٌّ) وەک (ما) ناوی (موصول)ەو، (ما)شی لە دواوە زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، تاکو ئەو ناوی (موصول)ە، وەک ناوەکانی مەرج بچێ.

﴿ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ ﴾، نابێ دەستدرێژییم بۆ لا بکرێ و سەغڵەت بکرێم، یانی: تێم هەڵنەپێچرێ و تەشقەڵەم پێ نەکرێ، ئەگەر هەشت ساڵەکەم تەواو کردن، ئەوە ئەوەیە کە لەسەری ڕێککەوتووین، ئەگەر دە ساڵەکەشم تەواو کردن، ئەوە چاکەو پیاوەتیی خۆمە، نەک دوای هەشت ساڵەکە، بڵێن: دەبێ دوو ساڵی دیکەش شوانیی بکەی، دوو ساڵە زیادەکە چاکە و پیاوەتی خۆمە، ئەگەر ویستم دەیکەم، ئەگەرنا من پابەند نەکراوم بەوەوە.

١٥)- ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾، خواش لەسەر ئەوەی دەیڵێین، کار پێسپێردراوە و چاودێرمانە، یانی: هەر کەسێک مەرجەکە جێبەجێ نەکات، خوا ﷻ لێی دەپرسێتەوە.

لێرەدا (ضُمِّنَ الوَكِيلُ مَعْنَى الشَّاهِدِ فَعُدِّيَ بِحَرْفِ عَلَى)، یانی: ئەگەر فەرموو بای: (وَاللهُ وَكِيلٌ مَا قُلْنَا)، هەر تەواو بوو، بەڵام بەهۆی بەرکار خواستنی (وكيل)ەوە بە پیتی (على) مانای شایەدیشی تێواخن کراوە، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾،

لێرەدا وشەی وەكیل وێڕای مانای خۆی كە كارپێ سپێرراو (موكول إليه)ە، مانای شایەدیشی تێخراوە، یانی: (وَاللهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا نَقُول)، واتە: خوا شاهیدو چاودێرە لەسەر ئەوەی دەیڵێین، دیارە هەم مووسا ﷺ بابایەكی خواناس و لە خوا ترس بووە و، هەم پیاوە بەتەمەنەكەش، بۆیە خوایان لەسەر خۆیان كردۆتە وەكیل و چاودێرو شاهید.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە حـەوت (٧) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (٢٩ - ٣٥)، کـە قۆناغـی پێنجەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـای ﷺ گرتۆتـە خـۆی، کـە باسـی گەڕانـەوەی مووسایە لـە مەدیەنـەوە بـۆ میسـڕ بـۆ سـەردانی ماڵەوەیـان و، بەڕێـوە دوێنرانیەتـی لەلایـەن خـوای بـەرز و بـێ وێنـەوە، کرانە بـە پێغەمبـەرو، ڕەوانەکردنی بـۆ لای فیرعـەون و گەلەکـەی، دوای پێدرانـی دوو بەڵگـە و موعجیـزە سـەرەکییەکەی:

١)- گۆچانەکەی، کە دوای فڕێدانی دەبووە حەزیا و، هەژدیهایەکی گەورە.

٢)- دەستی، کە کاتێک دەیخستە بن قۆڵی، دەدرەوشایەوە.

هەروەهـا لەسـەر داوای خۆیشـی: هاڕوونـی برایشـی لەگەڵـی کراوەتـە پێغەمبـەر بـۆ پاڵپشـتییکردنی.

﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ مِن شَٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْءَامِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ۖ فَذَٰنِكَ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِى هَٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّى لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِىَ

رِدْءًا يُصَدِّقُنِىٓ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ۚ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئنجا کاتێک مووسا ماوەکەی (کە بڕیار بوو) تەواوی کردو، لەگەڵ خێزانەکەی دا (لە مەدیەنەوە بەرەو میسر)، ڕۆیشت، لە تەنیشت طوورەوە، ئاگرێکی بەدیکرد (کە مایەی هۆگریی و دڵنیایی بوو)، بە خێزانەکەی گوت: لێرەبن (مەجووڵێن) من ئاگرێکم دیوە (هۆکاری دڵنیاییمە)، بەڵکو هەواڵێکتان لە لایەوە بۆ بهێنم، یان بزووتێکتان لە ئاگرەکە بۆ بێنم، بەڵکو ئاگری پێ بکەنەوەو خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە ﴿٢٩﴾ ئنجا کاتێک هاتە لای (ئاگرەکە) لە قەد پاڵی ڕاستی دۆڵەکەوە، لە زەوییە بە پێزەکەدا، لە درەختێکەوە، بانگ کرا کە: ئەی مووسا! بە دڵنیایی من خوام پەروەردگاری جیهانییان ﴿٣٠﴾ (هەروەها بانگ کرا) کە گۆچانەکەت فڕێدە! ئیدی کە گۆچانەکەی فڕێدا، دیتی وەک تیرە مار هەڵدەبەزی، بە پشتتێکردنەوە ڕایکردو (ئاوڕی نەدایەوەو) نەگەڕایەوە، خوا فەرمووی: ئەی مووسا! وەرە پێش و مەترسە، بێگومان تۆ لە دڵنیاکراوانی (کە سەلامەت دەبی) ﴿٣١﴾ دەستی (ڕاست)یشت بخە یەخەتەوە، بە بێ نەخۆشیی و زیان، بە سپێتیی (درەوشاوەیی) دێتە دەرێ و، لە کاتی سام ڕێنیشتنیش دا، قۆڵت بە (سینە یان تەنیشتی) خۆتەوە بنووسێنە (هێمن دەبیەوە)، ئەم دووانە (گۆچان و دەستت) دوو بەڵگەی درەوشاوەن لە پەروەردگارتەوە، بۆ لای فیرعەون و بڕیار بە دەستەکانی، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی لادەرن ﴿٣٢﴾ مووسا گوتی: لەبەر ئەوەی کەسێکم لێ کوشتوون، دەترسم بمکوژن ( و پەیامەکەتم بۆ نەگەیەنرێ) ﴿٣٣﴾ بۆیە هارۆونی براشم، کە ئەو لە من زمان پاراوترە، بە پاڵپشتێک کە بە ڕاستم دابنێ، لەگەڵم بنێرە، من دەترسم بە درۆم دابنێن ﴿٣٤﴾ خوا فەرمووی:

بێگومـان (پشـت و) بـازووت بـە برایەکـەت بەهێـز دەکەیـن و، دەسـتەڵاتێکتان بـۆ دەڕەخسـێنین (کـە دەسـتیان نەتانگاتـێ بـۆ زیانلێدان و)، بـە دڵنیایـی پێتـان ناگـەن و، خۆتـان و ئەوانـەی شـوێنتان کەوتـوون، زاڵ و سـەرکەوتوون ﴿٣٥﴾].

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ): واتـە: هاوسـەرەکەی لەگـەڵ خـۆی بـرد، ئنجـا هاوسەرەکەشـی، ئایـا منداڵیـان بـوون؟! وەک لـە پەیمانـی کۆنـدا، دەڵـێ: دوو کوڕەکـەی، یاخـود هیـچ منداڵیـان نەبـوون، یاخـود نەخێـر، زیاتـر لـە دوو کـوڕ بـوون، کـوڕو کـچ بـوون؟ ئێمـە هیچـی لـێ نازانیـن، وشـەی (أهل)یـش بـە پلـەی یەکـەم ژن دەگەیەنـێ بـۆ پیـاو، وەختـێ دەگوتـرێ: (أهـل) واتـە: ژن لـە ماڵـدا، کـە دیـارە بـە پێـی سـیاق ئەویـش دەزانـرێ، بـەڵام منـداڵ ناگەیەنـێ، مەگـەر بەڵگـە هەبێ لەسـەر ئـەوەی کـە منداڵیش لەگـەڵ ئـەو ژنـەدا هـەن.

(السَّيْرُ: المُضِيُّ فِي الأَرْضِ، رَجُلٌ سَائِرٌ وَسَيَّارٌ، وَالسَّيَّارَةُ: الجَمَاعَةُ)، (سَیر) بریتیـە لـە ڕۆیشـتن بـە زەویـدا، دەگوتـرێ: (رَجُلٌ سَائِرٌ وَسَيَّارٌ) پیاوێـک کـە ڕۆیشـتوە بـە پێـڕۆ (سَيَّارٌ)، یانـی: زۆر دەڕوات، (السَّيَّارَةُ) واتـە: کۆمەڵـە کەسـێک کـە بەڕێـدا بـڕۆن، کاروان یـان پێـڕۆ.

(ٱمۡكُثُوٓاْ): واتـە: بمێننـەوە، ڕاوەسـتن، (المُكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ انْتِظَارٍ، مَكَثَ، مُكْثاً، وَمَكْثاً)، (مُكْث) بریتیـە لـە چەسپاندن لەگـەڵ چاوەڕێ کردنـدا، دەگوتـرێ: (مَكَثَ، مُكْثاً، وَمَكْثاً) هەردووکیـانی بـۆ بـەکاردێ، هـەم (مَكْث)، هـەم (مُكْث) یانـی: ڕاوەسـتان و چـاوەڕێ کـردن و مانـەوە لـە شـوێنێک.

(جَذۡوَةٍ): (الجَذْوَةُ وَالجِذْوَةُ وَالجُذْوَةُ)، واتـە: هـەم بەسـەرر، هـەم بـە بـۆر، هـەم بـە ژێـر، (الَّذِي يَبْقَى مِنَ الحَطَبِ بَعْدَ الإِلْتِهَابِ، وَالجَمعُ: جِذىً)، (جَذوة، جِذوة،

جُـذوَةٌ)، بریتیـە: لـە دارێـک کـە سـووتا بـێ و، ئـەوەی کـە لێـی دەمێنێتـەوە، پێـی دەگوتـرێ: (جَـذوة أو جِـذوة أو جُـذوَةٌ ) و، بـە (جِـذی) کـۆ دەکرێتـەوە، بەکوردیـی پێـی دەڵێـن: بـزووت، بـزووت بریتیـە لـە دارێـک کـە سـەرێکی ئاگـر بـێ و لایەکـەی دیکەشـی ئاگـر نەبـێ و بگیـرێ.

(شَـٰطِىِٕ): (شَـاطِئُ الـوَادِي: جَانِبُـهُ، وَ شَـطءُ الـزَّرْعِ: فُـرُوعُ الـزَّرع)، (شَـٰطِىِٕ) واتـە: قـەد پـاڵ، لاپـاڵ و لایەکـی شـیوەکە (شَـطءُ الزَّرعِ)، واتـە: ئـەو لقانـەی لـەو ڕووەکەن، کـە دەڕوێ لـق و پـۆپ دەکات، لـق و پۆپەکانـی پێیـان دەگوتـرێ: (شَـطء)، ﴿أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ ﴿٢٩﴾﴾الفتـح.

(ٱلۡبُقۡعَةِ): (القِطۡعَـةُ مِـنَ الأَرۡضِ الۡمُتَمَيِّـزَةُ عَـنۡ غَيۡرِهَـا)، (بُقۡعَـة) بریتیـە لـە پارچـە زەوییـەک، کـە جیابـێ لـە دەورووبـەری، واتـە: دیـار بـێ.

(وَلَمۡ يُعَقِّبۡ ): واتـە: ئـاوڕی نەدایـەوە، یاخـود نەگەڕایـەوە، چونکـە (العَقِـبُ: مُؤَخَّـرُ الرِّجۡـلِ، وَقِيۡـلَ: عَقۡـب، وَجَمۡعُـهُ أَعۡقَـاب)، وەک لـە فەمـوودەدا هاتـوە: {وَيـلٌ لِلأَعۡقَـابِ مِـنَ النَّـارِ} (أخرجـه مسـلم: ٢٤١)، واتـە: سـزای سـەخت بـۆ ئەوانـەی پاژنـە پێیـان ناشـۆن، کەواتـە: (عَقِـب) واتـە: پاژنـە، گوتراویشـە: (عَقۡـب) واتـە: بـە زەنـە (سـكون)، نـەک بـە ژێـر (كسرة)، هەردووکیـان هـەن، (عَقِـب) یـان (عَقۡـب) بـە (أَعقـاب) کۆدەکرێتـەوە (پاژنەکان).

کەواتـە: ﴿وَلَمۡ يُعَقِّبۡ ﴾، واتـە: کـە ڕۆیشـت، لەسـەر پاژنـە پێـی، نەگەڕایـەوە، واتـە: ئـاوڕی نەدایـەوە: (لَـمۡ يَلۡتَفِـت)، یاخـود (لَـمۡ يَرۡجِـع)، نەگەڕایـەوە.

(ٱلۡأٓمِنِينَ ): (الأَمۡـنُ: طُمَأۡنِينَـةُ النَّفۡـسِ وَزَوَالُ الخَـوۡفِ)، (أَمۡـن) بریتیـە لـە دڵ ئارامیـی و نەمانـی تـرس و بیـم، کەواتـە: ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ﴾، واتـە: تـۆ لـە بـێ ترسـان و لـە دڵنیاکراوانـی کـە هیـچ زیانێکـت پـێ نـاگات.

( ٱسۡلُكۡ يَدَكَ ): دەسـتت بخـە نێـو، (السُّـلُوكُ: النَّفَـاذُ فِي الطَّرِيـقِ)، (سُـلُوك) بریتیـە لـەوە کـە ئینسـان بەڕێیەکـدا بـڕوا (سَـلَكَهُ)، یانـی: (أَدۡخَلَـهُ).

(جَيۡبِكَ): (جَيب) بریتیە لە دابڕاوایی کراس، ئەو شوێنەی کە سەر لێوەی دەچێتە نێو کراس، کە یەخەی کراسە، واتە: دەستت بخە نێو یەخەی کراست و بیخە بن هەنگڵت لە یەخەتەوە.

(جَنَاحَكَ): (جَنَاحُ الطَّائِرِ)، باڵی باڵندە، (جَناحَا الإنسَانِ: جَانِبَاهُ، جَنَاحَكَ أي: يَدَكَ)، کە دەگوترێ: (جَنَاحَي الإنْسَانِ)، واتە: دوو لا تەنیشتەکانی (جَناح)، بە مانای دەستی مرۆڤ دێ، کەواتە: (جَنَاحَكَ)، واتە: (يَدَكَ) کە وەک باڵی باڵندە وایە.

(ٱلرَّهۡبِ): (الرَّهْبَةُ وَالرُّهْبُ وَالرَّهَبُ: مَخَافَةٌ مَعَ تَحَرُّزٍ وَاضطِرَابٍ)، (رَهْبَةُ) و (رُهْب) و (رَهَب) هەرسێکیان بریتین، لە ترس لەگەڵ خۆپاراستندا، ترسێک کە وریایی و جۆرێک لە بیم و داچڵەکانی لەگەڵدا بێ.

(أَفۡصَحُ): (فَصُحَ الرَّجُلُ: جَادَت لُغَتُهُ)، پیاوەکە زمان پاراو بوو، بە ڕوونیی قسەی دەکرد، خەڵک باش لێی تێ دەگەیشت، ﴿هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا﴾، واتە: زمانی وی لە هی من پاراوترە، ئەو لە من زمان پاراوترو قسە ڕوونترە.

(رِدۡءٗا): (الرِّدءُ: الَّذِي يَتبَعُ غَيرَهُ مُعِيناً لَهُ)، (رِدْء) بریتیە لەوەی کە بە دوای کەسێک دەکەوێ و، هاوکاری دەبێ و پشتیی دەگرێ.

(عَضُدَكَ): ﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾، (عَضُد: مَا بَيْنَ المِرْفَقِ إلى الكَتِفِ)، (عَضُد) لە نێوان نانیشکەوە تاکو شان، بە کوردیی قۆڵی پێ دەڵێین، کەواتە: (عَضُد)، یانی: قۆڵ، کە بەوێ ئینسان زیاتر کار دەکات، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾، قۆڵت بە برایەکەت بەهێز دەکەین، (عَضَدْتُهُ: أَخَذْتُ عَضُدَهُ وَقَوَّيتُهُ، وَيُستَعَارُ العَضُدُ لِلمُعِينِ)، (عَضَدْتُهُ) واتە: قۆڵیم گرت و بەهێزم کرد، وشەی (عَضُد) بۆ هاوکارو یارمەتییدەریش دەخوازرێتەوەو بەکاردێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

**ئـەم قۆناغــی پێنجەمــەی ژیــان و بەســەرهاتی مووســا ﷺ، لــە زۆر شــوێنی قورئانـدا، ئامـاژەی پێکـراوە و، لـە چەنـد شـوێنێکدا بـە درێژیـی باسـکراوە، بـۆ وێنـە:**

**١- لە سوورەتی: (طه)دا، ئایەتەکانی: (٩ - ٤٨).**

**٢- لە سوورەتی: (النمل)دا، ئایەتەکانی: (٨ - ١٢).**

**٣- لە سوورەتی: (الشعراء)دا، ئایەتەکانی: (١٠ - ١٧).**

**٤- لە سوورەتی: (النازعات)دا، ئایەتەکانی: (١٥ - ١٩)، هەموویان باسی ئەم قۆناغەی پێنجەم لە ژیانی مووسا ﷺ دەکەن و، ئێمەش بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین:**

**﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا ﴾، دوای ئـەوەی مووسـا ﷺ کاتەکـەی تـەواو کـرد، هەشـت سـاڵەکە، یـان دە سـاڵ شـوانییەکە، کـە زیاتـر واپێدەچـێ دە سـاڵەکە بـێ و، لەگـەڵ ژنەکەیـدا ڕۆیشـت لـە تەنیشـتی طوورەوە، کـە چیایەکـی دیارییکـراوە، ئاگرێکـی بـەدی کـرد، ﴿ قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓاْ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، بـە هاوسـەرەکەی گـوت: بمێننـەوە لێـرە، ڕاوەسـتن، مـن ئاگرێکـم بـەدی کـردوە، کـە مایـەی هۆگرییمـە، ﴿ لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾، بەڵکـو لـە لای ئـەو ئاگـرەوە، هەواڵێکتـان بـۆ بێنـم، وا دیـارە ڕێیـان لـێ تێکچـووە، یاخـود بزووتێکتـان لـە ئاگـر بـۆ بێنـم، ئاگـری پـێ بکەنـەوە، بەڵکـو گـەرم ببنـەوە، دیـارە شـەوێکی سـاردی زسـتان بـووە و، ڕێشـییان لـێ تێکچـووە و سەرماشـیان بـووە.**

**﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ مِن شَـٰطِىِٕ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَـٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، ئنجـا کاتێـک مووسـا ﷺ چـووە لای ئاگرەکـە، لـە قـەد پاڵـی لای ڕاسـتی دۆڵەکـە، لـە پارچـە زەوییـە بـە پیرۆزەکـەدا، لـە**

درەختەکـەوە، بانـگ کـرا: ئـەی مووسـا! منـم، خـوا پـەروەردگاری جیهانییـان، واتـە: لـە درەختەکـەوە بانگکـراوەو، درەختەکـە لـە پارچـە زەوییەکـی پـڕ پیـت و پێـزدا بـووە، لـە لای ڕاسـتی دۆڵەکـە، لـە تەنیشـت چیـای طـوور، خـوا ﷻ پێـی فەرمـوو: ﴿ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ﴾، گۆچانەکەشـت فـڕێ بـدە! ﴿ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴾، کاتێـک مووسـا گۆچانەکـەی دی، هەڵدەبـەزی و دادەبـەزی، وەک تیـرە مـار، وەک مـاری گچکـە، کـە لـە گەورەییـدا، زۆر گـەورە بـووە، بـەڵام لـە جووڵەشـدا، زۆر خێـرا بـووە، وەک تیـرە مـار، یـان وەک مـاری گچکـە، مووسـا ﷺ پشـتی تێکـرد، ﴿ وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴾، ئاوڕیشـی لـێ نەدایـەوەو، زۆر لێـی ترسـا، ﴿ يَـٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ﴾، خـوا ﷻ فەرمـووی: ئـەی مووسـا! وەرە و مەترسـێ، ﴿ إِنَّكَ مِنَ ٱلْـَٔامِنِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ لـە دڵنیـا کراوانـی و، هیـچ زیانێکـت پـێ نـاگات، ﴿ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ﴾، ئـەوە نیشـانە و موعجیـزەی یەکـەم: گۆچانەکەتـە، ئنجـا هـی دووەمیشـیان: دەسـتت بخـە یەخەکەتـەوەو دێتـەوە دەرێ، بـێ ئـەوەی نەخـۆش بـێ، یـان زیانـی پێگەیبـێ، بـە سـپیەتیی واتـە: بـە درەوشـاوەیی دێتـە دەر، ﴿ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ﴾، لـە کاتێکیشـدا کـە تـرس و لـەرزت هاتـێ، دەسـتت بـە تەنیشـتی خۆتـەوە بنووسـێنە، واتـە: وەک چـۆن باڵنـدە باڵەکانـی بەخۆیـەوە دەچەسـپێنێ، تـۆش دەسـتت بەخۆتەوە بنووسـێنە، بـۆ ئـەوەی ترسـت نەمێنـێ، ﴿ فَذَٰنِكَ بُرْهَـٰنَانِ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئـەو دووە: گۆچانەکـە و دەسـتت، دوو بەڵگـەی ڕۆشـنن لـە پەروەردگارتـەوە، ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ ﴾، بـۆ لای فیرعـەون و بڕیـار بەدەسـتەکانی دەوروبەرەکـەی و دارو دەسـتەکەی، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان، کۆمەڵێکـی لاڕێ و لادەرن، بچـۆ بەڵکـو بیانهێنیـەوە سـەر ڕێ، ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّى قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴾، مووسـا ﷺ فەرمـووی: پـەروەردگارم! مـن کەسـێکم لـێ کوشـتوون، دەترسـم بمکـوژن، واتـە: دەترسـم بمکـوژن و پەیامەکـەی تـۆم پـێ نەگەیەنـرێ، نەگەرنـا لـە کوشـتنەکەی خـۆی نەترسـاوە، ﴿ وَأَخِى هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّى لِسَانًا ﴾، هاڕوونـی براشـم، ئـەو لـە من

زمـان پاراوتـره، ﴿ فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ ﴾، لەگەڵمـی بنێـره، پاڵپشـت بـێ و، بـه ڕاسـتم دابنـێ، ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾، مـن دەترسـم کـه بـه درۆم دابنێـن، پەیامەکـەی تـۆم لـێ وەرنەگـرن.

خـوا ﷻ وەڵامـی دایـەوە: ﴿ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا ﴾، فەرمـووی: قۆڵـت بەهـۆی برایەکەتـەوە بەهێـز دەکەیـن، واتـە: پشـتت دەگریـن و دەسـتەڵاتێکتان پـێ دەدەیـن، ﴿ فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ﴾، کە دەسـتیان نەتانگاتـێ و، زیانتان پـێ نەگەیەنـن، ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، بەهـۆی نیشـانەکانمانەوە، ئێـوە هەردووکتـان و، ئـەو کەسـانەش کـە لەگەڵتـان دەبـن و، بڕواتـان پـێ دێنـن، زاڵ دەبـن بەسـەر فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیدا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

دوای تەواوکردنی ماوەی شوانییەکەی، مووسا ﷺ خێزانەکەی برد (بەرەو میسر) و، لە ڕێگادا لە تەنیشت طووڕ ئاگرێکی بەدی کردو، بە خێزانەکەی گوت: لێرە بوەستن، بەڵکو لە لای ئەو ئاگرەوە هەواڵێکی ڕێیەتان بۆ بێنم، یاخود بزووتە ئاگرێک، کە ئاگری پێ بکەنەوەو پێی گەرم ببنەوە، بۆتان بێنم:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ ﴾، دوای ئەوەی مووسا ﷺ کاتەکەی تەواو کرد، (أي لَمّا أتَمَّ المُدَّةَ المُؤَجَّلَةَ لِلرَّعي)، دوای ئەوەی ئەو ماوەیەی دیاریی کرا بوو بۆ شوانییەکەی، تەواوی کرد، یان هەشت ساڵەکە، یان دە ساڵەکە، دیاریی نەکراوە، چونکە ئامانجێکی پێوە نەبەستراوە، بەڵام ڕای زاڵتر ئەوەیە، وەک پێشتر باسمان کرد، کە دە ساڵەکەی تەواو کردبن، ئەوە شایستەی مووسایە ﷺ کە پیاوە بەتەمەنەکە پێی دەڵێ: ﴿ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ ﴾، ئەگەر دە ساڵت تەواو کردن، ئەوە لە لایەن خۆتەوەیە، واتە: چاکە و پیاوەتیی و جوامێرییەکە، بە مسۆگەریی ئەو گەورە پیاوانەی خواش کاتێک دوو شتیان هاتبنە پێش، یەکێکیان چاکە و جوامێریی زیاتری تێدا بووبێ، بێگومان ئەوەیان هەڵبژاردوە.

٢)- ﴿ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ﴾، بەخێزانەکەیەوە ڕۆیشت، ﴿ وَسَارَ ﴾، یانی: ڕۆیشت، بە زەویدا ڕۆیشت، ﴿ بِأَهْلِهِۦٓ ﴾، (أهل) لێرەدا بە مانای (زَوجة) هاوسەر دێ، وەک لە سوورەتی (هود)دا هاتوە: ﴿ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ ﴿٧٣﴾ ﴾، فریشتەکان قسە لەگەڵ سارە خاتووندا دەکەن، دەڵێن: ئایا لە کاری خوا ﷻ سەرت سوڕ دەمێنێ؟! کە موژدەی ئیسحاق و یەعقووبتان پێ دەدەین؟ ﴿ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ ﴿٧٣﴾ ﴾، بەزەیی و پێزی خوا لەسەر ئێوە بێ، ئەی خەڵکی ئەم ماڵە، ژنیش خاوەنی ماڵە و، ماڵ بە ژنەوە ماڵە، ئەو کابانێتیی دەکات و سەرپەرشتیی ماڵ دەکات، هەروەها لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەسەرهاتی کە بوختان بە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کراوە، فەرموویەتی: {وَاللهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلاَّ خَيْرًا}[1]، واتە: سوێند بە خوا جگە لە چاکە، لە هاوسەری خۆمم، نەزانیوە.

وەک پێشتریش باسمان کرد، لە پەیمانی کۆندا، هاتوە، کە دەڵێ: لەگەڵ دوو کوڕەکەی دا، بەڵام نازانین ئایا مووسا ﷺ وێڕای ژنەکەی و دوو کوڕیشی لەگەڵ بوون؟! کە دەبێ کوڕەکانی تەمەنیان لە دە (١٠) ساڵ کەمتر بوو بێ، چونکە ئەگەر لە سەرەتای شوانییەکەشیەوە، ئەو هاوسەرگیرییەی کردبێ، گەورەکەیان دەبێ (٨ - ٩) ساڵ بێ، بە هەرحاڵ دیار نیە، ئایا هەر کوڕ بوون و، یاخود کچیشی بوون؟! دووان بوون، یاخود زیاتر بوون، یاخود منداڵیان نەبوون؟ پەیمانی کۆنیش ئەوەی لەو بارەوە گوتوویەتی، بۆ بەر چاو ڕوونیی باشە، بەڵام شایستەی پشت پێبەستن نیەو لێی دڵنیانین.

ئنجا کاتێک مووسا ژنەکەی لەگەڵ خۆی بردوە، نەیفەرمووە بۆ کوێ؟ بەڵام دیارە کە بەرەو ماڵ گەڕاوەتەوە، بەرەو میسر، ئەوە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، دەڵێ: (مووسا گوتی: دەچمەوە سەردانی خوشکەکەم دەکەم و، ئیزنی لە خەسوو و خەزووری خواست)، ئەو وردەکارییانە لە قورئاندا نەهاتوون، بەڵام دیارە کە

---

(١) صحيح البخاري: ٢٥١٨، وصحيح مسلم: ٢٧٧٠.

بـەرەو میسـر گەڕاوەتـەوە، بـۆ سـەردانی دایکیـی و بابـی و خوشـکی و بـرای کـە هاڕوونـە، ئـەو کاتـە دەبـێ هـەر لـەوێ بـوو بـێ و، ڕەنگـە بـرای دیکەشـی بووبـن.

٣)- ﴿ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا ﴾، لە تەنیشتی طوورِ ئاگرێکی بەدیکرد، ﴿ ءَانَسَ ﴾، یانی: (رَأى)، بەڵام دیتنێک کە مایەی هۆگریی بێ، (مُؤنِس) کەسێکە (أُنس) هۆگریی بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، دەگوترێ: (هُوَ رَجُلٌ مُؤنِسٌ لِي)، ئەو بۆ من پیاوێکە مایەی دڵنارامیی و هۆگرییە، بۆ من خەم ڕەوێنە و مایەی ئولفەت پێوەگرتنە، ئەو ئاگرەی کە بەدی کردوە، ئاگرەکە مایەی هۆگریی و دڵنیایی بوو، کە بەڕاستییش ئەو ڕووناکییە، کە ئەو بە ئاگری تێکەیشتوە، مایەی دڵنیایی بووە.

٤)- ﴿ قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ ﴾، بە هاوسەرەکەی، گوت: بمێننەوە، (أمكثوا) یانی: (تَوَقَّفُوا) یان (أُثْبُتُوا هُنا)، لێرە ڕابوەستن، یان چیدیکە مەڕۆن، لێرە چاوەڕێبن.

٥)- ﴿ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، من ئاگرێکم بەدی کردوە، مایەی هۆگریی و دڵخۆشییمە، لە سووڕەتی (النَّمل)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ۝٧ ﴾النَّمل، مووسا ﷺ بە هاوسەرەکەی گوت: من ئاگرێکم بەدی کردوە، بەڵام لێرەدا لە سووڕەتی (القصص)دا، هەر دەفەرموێ: ﴿ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، هەروەها لێرەدا (ٱمْكُثُوٓا۟ )ی لێ زیاد کراوە.

دیسـان لـە سـووڕەتی (القصـص)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾، بەڵکـو لـەو ئاگـرەوە هەواڵێکتـان بـۆ بێنـم (هەواڵـی ڕێـگا)، یاخـود بزووتێکتـان لـە ئاگرەکـە بـۆ بێنـم، بەڵکـو گـەرم ببنـەوە، واتـە: ئاگـری پـێ بکەنـەوەو خۆتـان بـە ئاگرەکـە گـەرم بکەنـەوە، بـەڵام لـە سـووڕەتی (النَّمـل)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ۝٧ ﴾، بـە دڵنیایـی لـە لای ئـەو ئاگـرەوە هەواڵێکتـان بـۆ دێنـم، یاخـود بزووتێکتـان بـۆ دێنـم و، بڵێسـە ئاگرێـک کـە سـەرێکی دار بـێ، بـۆ ئـەوەی ئاگـری پـێ بکەنـەوەو خۆتانـی پـێ گـەرم بکەنـەوە.

واتـە: تەعبیـرەکان جییـان، بـەڵام هـەر یـەک نێوەڕۆکیـان هەیـە، ئنجـا وا پێدەچێ مووسـا ﷺ وەک لـە شـوێنی دیکـەش گوتوومانـە: ئـەوەی لێرەش هاتـوە، فەرموویەتی و، ئـەوەی لـە سـوورەتی (النَّمل)یـش دا هاتـوە، فەرموویەتـی، ئینسـان جاری وایـە قسـە دەکات بـە تەعبیرێـک دەیڵـێ، دواتـر بـە تەعبیرێکـی دیکـە دەیڵـێ.

ئنجـا ئەمـە هـەم بـۆ ئێرەش وایـە و، هـەم بـۆ شـوێنەکانی دیکـەش، کـە خـوا ﷻ جـاری وا هەیـە، بەسـەرهاتێک دەگێڕێتـەوە دەفەرمـوێ: یەکێـک لـە کارەکتـەرەکان ئـاوای گـوت، دوایـی لـە شـوێنێکی دیکـە دەفەرمـوێ: ئـاوای گـوت، لـە تەعبیـرو شـێوەی دەربڕینەکـەدا، جیـاوازن، واتـە: هـەم ئەوەشـی گوتـوە و، هـەم ئەویشـی گوتـوە، یاخـود خـوا ﷻ مەبەسـتی گەیاندنـی نێوەڕۆکەکەیەتـی، هـەر جـارە بـە تەعبیرێکـی جیـاواز، وەک: هونـەر نوانـدن لـە قسـەکردندا (التَّفَنُّنُ فِي الـكَلام).

٦)- ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾، بەڵکو لە لای ویەوە هەواڵێکتان بۆ بێنم، ﴿مِّنْهَا﴾، (أي: مِنْ عِنْدِ النَّارِ وَأَهْلِهَا الَّذِينَ أَوقَدُوها)، واتە: لە لای ئەو ئاگرەوەو، ئەو خەڵکەی کە ئاگرەکەیان کردۆتەوە، هەواڵێکتان بۆ بێنم.

٧)- ﴿أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾، یاخود (بەڵکو) بزووتێکتان لە ئاگر بۆ بێنم، (جَذوة، وَجِذوة، وَجُذوَةٌ)، یانی: (العُودُ الغَلِيظُ المُشتَعِلُ)، یاخود (عُودٌ فِي رَأْسِهِ نَارٌ)، واتە: دارێک کە پتەو بێ و بنایسێ، دەبێ لایەکیشی ئاگری پێوە نەبێ، بۆ ئەوەی هەڵبگیرێ، یاخود: دارێک کە سەرێکی ئاگر بێ، کە پێی دەگوترێ: بزووتە ئاگر، واتە: دارێک کە سەرێکی ئاگر بێ و لایەکەی دیکەی بگیرێ.

٨)- ﴿لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾، بەڵکو گەرم ببنەوە، (الإصْطِلاءُ: إفْتِعَالٌ مِنَ الصَّلِي)، (صَلي) واتە: خستنە نێو ئاگر، (إصطِلاء): (إفتِعَال)ە، واتە: بزووتێکە دێنم و، ئاگری پێ بکەنەوەو پێی گەرم ببنەوە.

لـە پەیمانـی کـۆن (سـفر الخـروج)دا، تەعبیرەکـە ئـاوا هاتـوە: (إنَّ مـوسى استَأذَنَ صِهـرَهُ فِي الذَّهَـابِ إلى مِـصْر لافتِقَـادِ أُختِـهِ وَ آلِـهِ...)، واتـە: مووسـا ﷺ مۆڵەتـی لـە

خـەزووری خواسـت، کـە بچێتـەوە بـۆ میسـڕ، تاکـو هەواڵـی خوشـکی و نیزیـکانی و ماڵەوەیـان بزانـێ.

ئێمـە دوایـی لـە پەنـدو حیکمەتەکانـدا، زیاتـر تیشـک دەخەینـە سـەر هەندێـک واتـای دیکـە، کـە ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە دەیانگەیەنـن، بۆیـە لێـرەدا تەنیـا بایـی ئەوەنـدە کـە ئایەتـەکان چەمـک و واتاکەیـان، ڕۆشـن بـێ، قسـەیان لـە بـارەوە دەکەیـن.

**مەسەلەی دووەم:**

**دوای ڕۆیشتنی مووسا ﷺ بۆ لای ئاگرەکە، لە درەختێکەوە کە لە تێو پارچە زەوییەکی بە پێزی قەد پاڵی لای ڕاستی دۆڵەکە بوو، بانگ کرا: مووسا! بێگومان من خوام پەروەردگاری جیهانییان، ئنجا گۆچانەکەت فڕێدە! ئیدی کە فڕێیدا، بوو بە مارێکی بێڕەزای لە جووڵەدا خێرا، وەک تیرە مار، مووساش ترسا و ڕایکرد، خواش بانگی کرد: بگەڕێوە و مەترسە، دەستی ڕاستیشت بخە یەخەتەوە، بە درەوشاوەیی دێتە دەرێ و، لە کاتی ترس و لەرزیشدا، باڵت بە تەنیشتتەوە بنووسێنە، ئەوە دوو بەڵگەی ڕوونی پەروەردگارتن، بۆ لای فیرعەون و گەلە یاخییەکەی و دارو دەستە یاخییەکەی:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا ﴾، کاتێک چووە لای، ڕاناوەکە (ها) بۆ ئاگرەکە دەچێتەوە، ئەگەر یەکێک بڵێ: ئاگر نەبووە! دەڵێین: گرنگ ئەوەیە مووسا پێی وابووە ئاگرە، ئەگەرنا ئاگر نەبووە و، ڕووناکییەک بووە، ڕووناکییەکی تایبەت بووە، لە سوورەتی (النّمل)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهَا ﴿٨﴾ ﴾، ئەمە هونەر کارییە، لە قسەکردندا، (جَاءَ) و (أَتَى) یەک واتایان هەیە، لەگەڵ تۆزێک جیاوازییدا، گرنگ ئەوەیە یەک تێوەڕۆک دەگەیەنن، ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا ﴾، کاتێک چووە لای ئاگرەکە، یان ئەوەی ئەو بە ئاگری لێ حاڵیی بووە.

٢)- ﴿ نُودِىَ مِن شَٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ ﴾، بانگ کرا (لە کوێوە بانگ کرا؟!)، لە قەد پاڵی ڕاستی دۆڵەکەوە، لە درەختەکەوە، کە لە پارچە زەوییەکی بە پێزدا بوو.

واتە: مووسا لە درەختێکەوە بانگ کرا، کە لە پارچە زەوییەکی بەپێزدا بوو، لە قەد پاڵی لای ڕاستی ئەو شیو و دۆڵە، کە چیای طووری لێیە، یانی: درەختێک لە پارچە زەوییەکی دیاریکراودا، کە بە پێزە، ڕواوە، ڕووناکییەکی تێدا بووە، ئنجا لە ڕووناکیی ئەو درەختەوە، کە لە نێو ئەو پارچە زەوییەدا ڕواوە و، ئەو پارچە زەوییەش لە لای ڕاستی شیوەکە بووە، لەوێوە بانگ کرا.

لێرە دەفەرموێ: ﴿ نُودِىَ مِن شَٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرموێ: ﴿ نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ ﴾، بانگ کرا کە پێزدار بێ ئەو کەسەی لە نێو ئاگرەکەدایەو، ئەوەی لە دەوریەتی و، پاکیی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، بەڵام لێرەدا لە سوورەتی (القصص)دا، زیاتر دیاریی کراوە، ئەو بانگ کرانەی مووسا ﷺ لە کوێوە بووە؟ لە درەختێکەوە بووە، کە لە پارچە زەوییەکی بە پیت و پێزدا، ڕوواوە، کە لە قەد پاڵی لای ڕاستی شیوەکەدا بووە، لە لای ئەو چیایەی بە طوور ناوبراوە، (بُقْعَة) بە (بِقَاع) کۆ دەکرێتەوە، (البُقْعَةُ: قِطعَةٌ مِنَ الأرْضِ مُتَمَيِّزَةٌ عَمَّا حَولَهَا)، (بقعة) پارچە زەوییەکە، کە لە چاو ئەو زەوییانەی دەوروبەری دیارەو جیا کراوەیە.

﴿ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ ﴾، لە درەختەکەوە، (ألْ)ی، سەر (شَجَرَة) بۆ ناساندنە، بەڵام (التَّعرِيفُ لِلجِنسِ وَالعُدولُ عَنِ التَّنكِيرِ، إشَارَةٌ إلى أنَّهَا شَجَرَةٌ مَقصُودَةٌ، وَلَيْسَ التَّعرِيفُ لِلعَهدِ، لإنَّهُ لَم يَجرِ ذِكرُ الشَّجَرَةِ سَابِقاً)، ناساندن (تعريف) لە زمانی عەڕەبییدا یان بۆ تێکڕا (جِنس)ە، یان بۆ (عَهد)ە، کە (عَهد) لە کوردیی دا دەکەوێتە شوێنی: (کە)، یانی: ئەگەر من گوتم: کتێبەکە، واتە: ئەو کتێبەی

کە ناسراو (مَعهود)ەو دەزانین کامەیە، بەڵام لێرەدا بۆ تێکڕا (جِنس)ە، چونکە پێشتر باسی ئەو درەختە نەکراوە، تاکو بفەرمووێ: درەختەکە، ئنجا بۆچی بە (ال)ی ناساندن (تَعرِیف) هاتووەو، بە نەناسراو (نَکِرَة) نەهاتووە؟ ئاماژەیە بەوە کە ئەو درەختە، درەختێکی دیاریکراو و بە ئامانج گیراو و ناسراو بووە.

ئنجا ئایا بانگ کردنەکە چۆن بوو؟

٣)- ﴿أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾، کە ئەی مووسا! بە دڵنیایی من خوام، پەروەردگاری جیهانییان، ئا ئەوە نێوەڕۆکی بانگکردنەکە بوو، لە سوورەتی (النمل) دا، دەفەرمووێ: ﴿يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾﴾النمل، ئەی مووسا! بە دڵنیایی منم، خوای زاڵی کارزان، کەواتە: خوا ﷻ ئەمەشی فەرمووە و، ئەوەشی فەرمووە، یاخود: نێوەڕۆکی ئەو دووەی فەرمووە، بەڵام خوا ﷻ لە سوورەتی (القصص)دا، هەندێکی فەرمووە بە تەعبیرێک و، لە سوورەتی (النّمل)دا هەندێکی دیکەی فەرمووە، بە تەعبیرێک، واتە: خوا ﷻ دابەشی کردوە بەسەر ئەو دوو سوورەتەدا.

٤)- ﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾، (خوا ﷻ پێی فەرموو:) کە گۆچانەکەت فڕێ بدە، لە سوورەتی (النّمل)دا، دەفەرمووێ: ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ ﴿١٠﴾﴾، واتە: گۆچانەکەت فڕێ بدە، (أَن)کەی لەگەڵدا نیە.

٥)- ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾، کاتێک گۆچانەکەی بینی دەجووڵایەوەو هەڵدەبەزیی و دادەبەزیی، وەک تیرە مار، یان وەک مارێکی گچکە، پشتی هەڵکردو ڕۆیی و ئاوڕی نەدایەوە، لە سووڕەتی (النّمل)یشدا بە هەمان تەعبیر هاتوە.

٦)- ﴿يَـٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ﴾، (خوا ﷻ فەرمووی:) ئەی مووسا ﷺ! بگەڕێوە و مەترسێ، بەڵام لە سوورەتی (النّمل)دا دەفەرمووێ: ﴿يَـٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾﴾، (خوا ﷻ فەرمووی:) ئەی مووسا! ﷺ مەترسە، ڕەوانە کراوان لە لای من ناترسن، مەگەر کەسێکیان ستەمی کرد بێ و، دوایی چاکەی لە شوێنی خراپەکە دانا بێ، ئەوە بە دڵنیایی

من لێبوردەی میهرەبانم، واتە: لە سووڕەتی (النَّمل)دا زیاتر ڕوونکراوەتەوە کە خوا ﷻ چۆن مووسای دڵنیا کردۆتەوە، بەڵام لە سووڕەتی (القصص) دەفەرموێ: ﴿أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ﴾، ڕوو لە لای من بکەو مەترسێ.

٧)- ﴿إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە دڵنیا کراوانی، تۆ لە بێ زیانانی، (آمِن) پێچەوانەی (خَائِف)ە، (خَائِف) یانی: کەسێک بترسێ و ترس و لەرزی هەبێ، بەڵام (آمِن) واتە: بێ ترس و دڵنیا.

٨)- ﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ﴾، دەستت بخە نێو یەخەتەوە، لێرەدا بە بێ (و)ی بادانەوە (عطف) هاتوە، بەڵام لە سووڕەتی (النَّمل)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ ﴿١٢﴾﴾، هەروەها دەستیشت بخە یەخەتەوە، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿اسْلُكْ يَدَكَ﴾، (اسْلُكْ) لەگەڵ (وَأَدْخِلْ) هەر یەکن، واتە: دەستت بخە یەخەتەوە.

٩)- ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾، بەسپێتیی دێتە دەرێ بەبێ زیان (و نەخۆشیی).

لە سووڕەتی (النَّمل)یشدا، بە هەمان شێوە هاتوە، واتە: بە سپیەتیی دێتە دەرێ بێ زیان، یانی: بێ ئەوەی نەخۆش بێ، نەخۆشیی بەڵەکیی گرتبێ، یان بێ ئەوەی زیانێکی پێگەیشتبێ، بە درەوشاوەیی دەدرەوشێتەوە، نەک بسووتێ یاخود زیانی پێ گەیبێ، یان نەخۆشییەکی گرتبێ.

١٠)- ﴿وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ﴾، ئەمە بەس لێرەدا هاتوەو لە سووڕەتی (النَّمل)دا، نەهاتوە، واتە: لە کاتی ترس و لەرزدا، باڵت بەخۆتەوە بنووشتێنە، بە خۆتیەوە بنووسێنە، زانایان گوتوویانە: (تَمثيلٌ بِحالِ الطَّائِرِ، بَدَلاً مِنْ أَن تطيرَ خَوفاً)، باڵندە ئەگەر بترسێ، یەکسەر باڵی لێک دەدات و دەفڕێ، بەڵام باڵندە ئەگەر نەترسێ، باڵەکانی دێنێتەوە یەک، باڵەکانی بەخۆیەوە دەنووسێنێ، واتە: تۆش باڵت بەخۆتەوە بنووسێنەو مەترسێ، دڵنیابەو هیچ ترست نەبێ، بۆیە زانایان گوتوویانە: (وَالمَعنى: إِنكَفِف عَنِ التَّخَوّفِ مِنْ أَمرِ الرِّسَالَة)، واتە: هیچ ترست نەبێ لە گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ، بە ئاسانیی بۆت دەگات و بێ زیان دەبێ.

١١)- ﴿ فَذَٰنِكَ بُرْهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئەم دووانە، (گۆچانەکەت و دەستەکەت)، دوو بەڵگەی ڕوون و ئاشکران، لە لایەن پەروەردگارتەوە.

١٢)- ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴾، بەرەو لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، بێگومان ئەوان کۆمەڵێکی لاڕێن.

کەواتـە: بچـۆ، بیانهێنـەوە سـەر ڕێـی ڕاسـت، لـە سـووڕەتی (النَّمـل)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴿١٢﴾ ﴾، واتـە: لـە نێـو نـۆ بەڵگـە و نیشـانەدا، بچـۆ بـەرەو لای فیرعـەون و گەلەکـەی، لـەوێ دەفەرمـوێ: گەلەکـەی، بـەڵام لـە (القصـص)دا دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ ﴾، لێـرەدا باسـی نـۆ نیشـانەکان نـاکات، بـەڵام لـە سـووڕەتی (النَّمـل)دا، باسـیان دەکات، واتـە: ئـەم دووە بەڵگـەن، حـەوت دیکەشـیان لەگەڵـدان، دەبنـە نـۆ، هەروەهـا لـە سـووڕەتی (الإسراء)یشـدا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ ﴿١٠١﴾ ﴾، نـۆ نیشـانەمان بـە مووسـا ﷺ دابـوون، لە بەنـوو ئیسـڕائیل بپرسـە؟ کاتێـک کـە مووسـا چـوو بـۆ لایـان (بـە نـۆ بەڵـگەو نیشـانەکانەوە).

وشـەی (فَذَٰنِكَ) بـە (فَذَانِّـك)ەش، خوێندراوەتـەوە واتـە: نوونەکـەی بـە گیرەدارکـراو (مُشَـدَّد)یی خوێندراوەتـەوە، ئـەوەش جـۆرە خوێندنەوەیەکـی دیکەیـەو، هـەر هەمـان واتاشـی هەیـە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**مەترسیی دەربڕینی مووسا ﷺ لە فیرعەون و دەستەو دایەرەکەی، کە لەسەر بابای قیبتیی بیکوژنەوەو، داواکردنی لە خوا ﷻ کە هاڕوونی برایشی چونکە لەو زمان پاراوترە، لەگەڵی بنێرێ بۆ پاڵپشتیی و، بەڵێ، فەرموونی خوا ﷻ، بۆ داواکارییەکەی و، دڵنیا کردنیشی لە پارێزران و سەرکەوتنیشی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴾، (مووسا ﷺ) فەرمووی: پەروەردگارم! من کەسێکم لێکوشتوون، ئنجا دەترسێم بمکوژن، لە سوورەتی (الشُّعراء) دا، بەو شێوەیە هاتوە: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَارُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: (مووسا ﷺ) فەرمووی: پەروەردگارم! من دەترسم بە درۆم دابنێن و، سینەشم تەنگ بێ و زمانیشم گۆ نەکات، بۆیە بنێرە بە دوای هاڕوونیش دا، (ئەویش ڕەوان بکە، لەگەڵم)، هەروەها گوناهێکیشیان لەسەرمە (بە لای خۆیانەوە، تاوانێکم بەرانبەر کردوون)، دەترسم بمکوژن.

٢)- ﴿ وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا ﴾، هاڕوونی براشم، ئەو زمانی لە من پاراوترە و ڕوونترە.

٣)- ﴿ فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي ﴾، ئەوم لەگەڵدا بنێرە، وەک پاڵپشت، با بەڕاستم دابنێ.

٤)- ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾، من دەترسم بە درۆم دابنێن.

لێـرە تەعبیرەکـە ئـاوا هاتـوە، بـەڵام لـە سـووڕەتی (الشُّـعراء)دا، بـە جۆرێکـی دیکـە هاتـوە، لـە ئایەتـەکانی: (١٢و ١٣و ١٤)دا کـە پێـش تۆزێـک هێنامانـن، لـە سـووڕەتی (طـه)ش دا، ئـاوا هاتـوە: ﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ ﴾طـه، واتـە: وەزیرێکیشـم لـە بنەماڵـەی خـۆم، بـۆم بڕەخسـێنە، ئەویـش هاڕوونـی بـرام بـێ، پشـتمی پـێ بەهێزبکـەو، لـە کارمـدا هاوبەشـی بکـە، بـۆ ئـەوەی زۆر یـادت بکەیـن و، زۆر بـە پاکـت بگریـن، بێگومـان تـۆ بینـەری ئێمـەی.

بـا تەماشـا بکەیـن! لـەم سـووڕەتی (القصـص)دا، بـە جۆرێکـەو، لـە سـووڕتی (الشُّـعراء)دا و، لـە سـووڕەتی (طـه)ش دا، هـەر کامیـان جۆرێکـە، بـەڵام نێوەڕۆکـی هەموویـان یەکـە، لـە سـووڕەتی (الشـعراء)دا مووسـا ﷺ مەترسـیی ئـەوەی دەربڕیوە کـە بیکـوژن و، بـە درۆی دابنێـن و، زمانـی گـۆ نـەکات و، سـینەی تەنـگ بـێ، داوای کـردوە، کـە هاڕوونـی بـرای لەگـەڵ بنێرێ، وەک پاڵپشـت، بـەڵام لـە (القصـص)دا، بـە جۆرێکـی دیکـە تەعبیـری لـێ کـردوە، چونکـە ئـەوەی زیاتـر جێـی گرنگیـی و بایەخـی مووسـا بـووە، بەپێـی ئـەو سیاقەی کـە لێـرە دەیخـوازێ، ئـەوە پێشـخراوە، کـە ئـەوە بـووە، بیکـوژن، ترسـی هەبـووە بیکـوژن.

هەڵبەتـە ترسـی لـە خـودی کوشـتنەکە نەبـووە، ئەگـەر بیکـوژن لـە پێنـاوی خـوادا شـەهید دەبـێ، بەڵکـو ترسـی لـەوە بـووە، کـە بیکـوژن و نەتوانـێ پەیامـی خـوا ﷻ بگەیەنـێ، بۆیـە مووسـا ﷺ لەبـەر ئـەوەی ڕەوانەکـراوی خوایـە، دووربینیـی کـردوە، کـە بتوانـێ بـە تەواویـی پەیامـی خـوا بگەیەنـێ، هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتن بـۆ گەیاندنـی ئـەو پەیامـەو، گەیاندنـی پەیامەکـە پەکـی لەسـەریان کەوتوە، هەموویـانی داوا کـردوون، ئنجـا کەسـێکیش بـە تەمـای کارێـک بـێ، بیـکات، بێگومـان دووربینیـی تێـدا بـە خـەرج دەدات و، هـەوڵ دەدات پێداویسـتیەکانی بـۆ دابیـن

بکات، نەک هەروا بە لام سەر لایی بەتێو بکەوێ، بەڵام وەک گوتمان لە هەر شوێنە، خوا ﷻ شتێک پێش دەخات و، شتێک زیاتر دەردەخات، کە ئەو کەش و هەوایەی، ئەو بەسەرهاتەی تێدا هاتوە، یاخود ئەو کاتەی ئەو سوورەتەی تێدا دابەزیوە، خواستوویەتی.

ئنجا دوای ئەوەی مووسا ﷺ قسەکانی خۆی تەواو کردن، خوا ﷻ وەڵامی دایەوە:

٥)- ﴿ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ ﴾، (خوا) فەرمووی: بە دڵنیایی قۆڵت بە هۆی برایەکەتەوە بەهێز دەکەین، وەک گوتمان (عَضُد)، واتە: قۆڵ (نێوان ئانیشک و شان)، ﴿ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ ﴾، (أَي: نُقَوِّيك) بەهێزت دەکەین، (الشدُّ: الرَّبطُ)، بەستن، قایم کردن.

٦)- ﴿ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا ﴾، دەستەڵاتێکتان پێ دەدەین بە هەردووکتان، (السُّلْطَانُ: مَصْدَرُ تَسَلُّطَ عَلَى القُلُوبِ وَالنُّفُوس، أَي: مَهَابَةً وَرُعباً فِي قُلُوب الأَعْدَاء)، واتە: (سلطان) چاوگی (تسلُّط)یە، یانی: دڵەکان و دەروونەکانی خستنە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، یانی: سام و هەیبەت و دەستەڵاتێکتان پێ دەدەین، کە ڕێگر بێ لەوەی ئەوان زیانتان پێبگەیەنن.

٧)- ﴿ فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ﴾، ئنجا ئەوان دەستیان پێتان نەگات، کە زیانتان پێ بگەیەنن و بتانکوژن، یاخود زیانتان پێ بگەیەنن، (أَي: لاَ يُؤْذُونَكُما بِسوءٍ)، کە هیچ زیانێکتان پێ نەگەیەنن، کوشتن و کەمتر لە کوشتنیش.

٨)- ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، هەردووکتان و ئەوانەش کە شوێنتان کەوتوون، بەهۆی نیشانەکانمانەوە، زاڵن، لە سوورەتی (طه)دا، لە وەڵامی هەموو ئەو داواکارییانەی مووسادا ﷺ کە لەوێ ڕیزیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: داواکارییەکەت پێدرا، ئەی مووسا! بەڵام لێرەدا خوا ﷻ چۆنیەتیی داوا جێبەجێ کردنەکەی، ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ۚ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾.

ئـەم سیاقە وایخواسـتوە کـە خـوا ﷻ شـیی بکاتـەوە، دیـارە لـە ئەصڵـی ئاخاوتنـی نێـوان خـوا ﷻ و پێغەمبــەرە هەڵبژاردەکەیـدا: مووسـا ، ئــەو وتــو و وێــژ و قسـە و باسـانە، هەموویـان بـوون، ئنجـا خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (طـه)دا، چۆنیەتیـی وەڵامدانەوەکـەی کـورت دەکاتـەوەو، لـە سـوورەتی (الشُعراء)دا، بە جۆرێـک دەیهێنێ و، لـە سـوورەتی (القصـص)دا بـە جۆرێـک و، لـە سـوورەتی (النمـل)دا، بـە جۆرێـک، بـەڵام هەمـان نێـوەڕۆک لـە هەموویانـدا هاتـوە، هەرچـارە و بـە دەربڕینێـک.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴾، ئــەم ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، زانایـان چەنـد واتایەکیـان بـۆ لێکداونـەوە:

أ- (إذهَبا بِئايَاتنا) بە ئایەتەکان و نیشانەکانی ئێمەوە بچن.

ب- هەندێکیان ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿ فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَا بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، یانی: (يُصرَفُون عَنكُمَا بِئايَاتنا)، دەستیان ناتانگاتێ، بەهۆی نیشانەکانمانەوە، بەهۆی بەڵگە و موعجیزەکانمانەوە، واتە: لێتان لادەدرێن، بە هۆی ئەو بەڵگە و موعجیزانەوە، کە ئێمە پێماندراون.

ج- (وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلطَاناً بِئايَاتنا)، ئەمە ڕستەیەکی ئێواخنە، واتە: ئێمە دەستەڵاتتان پێ دەدەین، بە هۆی نیشانەکان و موعجیزەکانی خۆمانەوە، کە پێمان داون.

د)- یاخود ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، پەیوەست دەبێ بەدوای خۆیەوە: ﴿ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴾، ئێوە زاڵ دەبن بەهۆی نیشانەکانمانەوە، هەردووکتان و ئەو کەسانەش کە شوێنتان دەکەون.

واتـە: ئـەو ڕسـتەیە چـوار جـۆرە ئەگـەری هـەن و، چـوار جـۆرە واتـای هـەن و واتایەکانیـش لێـک نیزیکـن.

ئەمـە ئـەو سـێ مەسـەلەیە بـوون، کـە تەرخانمان کردبـوون بـۆ زیاتر شـیکردنەوەی چەمـک و واتـای ئـەو حـەوت (٧) ئایەتـە موبارەکـەی، کـە قۆناغـی پێنجەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا  پێـک دێنێ.

## حوكم و حیكمەت و پەندەكانی
## ئەم پێنج قۆناغەی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام

ئـەم پێـج قۆناغـەی كـە باسـكران لـە میانـی ئـەم ئایەتانـەدا كـە ڕابـردن، ئێمـە سـەرجەم شەسـت و یـەک (٦١) دەرس و پەندمـان لـێ هەڵهێنجـاون، كـە بـە تەئكیـد دەگونجـێ زیاتریشـیان لـێ هەڵبهێنجرێـن، بـەڵام ئەوەنـدەم بـە پێویسـت زانیـون:

**١- نەخشـەی خـوای كارزان لـە گـەردوون و ژیانـی مرۆڤـدا، زۆر وردو كارزانانـە و پەنهـان و پـڕ حیكمەتـە:**

بـۆ وێنـە: (القرطبي) ئـەو قسـەیە لـە وەهەبـی كـوڕی مونەببیهـەوە دێنـێ، كـە یەكێـک بـووە لـە زانایانـی جوولەكـە و، مسـوڵمان بـووە، گوتوویـەتی: (**بَلَغَنـي أَنَّ فِرعَـونَ ذَبَـحَ فِي طَلَـبِ مُـوسى سَـبعِينَ أَلـفَ وَلِيـد**)[1].

وەهەبـی كـوڕی مونەببیـە دەڵـێ: پێـم گەیشـتوە كـە فیرعەون لـەوەدا كە سـۆراغی مووسـای كـردوەو بـە دوای مووسـادا گـەڕاوە، كـە چنگـی بكـەوێ و لـە بەینـی ببات، حەفتـا هـەزار (٧٠،٠٠٠) منداڵـی سـەربڕیوە، كەچـی ئـەو حەفتـا هـەزارەی بەبـێ هـۆكار سـەربڕیون و، هیچیـان مووسـا عليه السلام نەبـوون، بـەڵام ئـەو مووسـایەی كـە ئـەو لێـی ترسـاوە و، ئـەو حەفتـا هـەزارەی لەبـەر وی سـەربڕیون، دوایـی هاتۆتـە ماڵـی خـۆی، هـەر بـۆ خۆشـیی بەخێـوی كـردوە!

تەماشـای نەخشـەی خـوا ﷻ بكـەن! كـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ ﴾الطـارق، ئـەوان پـیلان دەگێـڕن و منیـش نەخشـە دادەنێـم، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾آل عمـران، واتـە:

---

[1] الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٠٢.

ئـەوان فێڵیـان کـردو خـواش نەخشـەی دانـا، خـواش ﷻ پلانـی دانـا و خـوا ﷻ باشـترین پـلان دانـەرە، ئنجا لـە پەنـدی عەرەبییـدا هاتـوە: (العبـد یُدَبِّرُ، وَاللهُ یُغَیِّرُ)، عەبـد نەخشـە دادەنـێ و، خـوا دەیگـۆڕێ، یـان لـە کوردەواریـی خۆمانـدا دەڵێـن: ئـەوەی لـە لای عەبـد خەیاڵـە، لـە لای خـوا بەتاڵـە.

ئنجـا ئـەو نەخشـە و بەرنامەیـەی خـوای کارزان کـە لـە ژیانـی مووسـادا ﷺ بەرجەسـتە بـووە، دیـارە ئـەوە نموونەیەکـە، لـە نەخشـەی خـوا ﷻ، ئەگەرنـا هـەر کامێـک لـە ئێمـە، ئەگـەر لـە ژیانـی خـۆی ورد بێتـەوە، ئـاوا نەخشـەی خـوا ﷻ لـە ژیانـی خۆیـدا دەبینـێ، هـەر کەسـە لـە قـەدەر خـۆی.

بێگومـان قەناعەتـم وانیـە فیرعـەون حەفتـا هـەزار منداڵـی سـەربڕیبێ، بـەڵام بـە تەئکیـد دەبـێ ژمارەیەکـی زۆری سـەربڕیبێ، چونکـە ئایەتەکـە وا دەفەرمـوێ: ﴿ یُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ ﴾، هـەم کـە دەفەرمـوێ: (یُذَبِّحُ) لـە جیاتـی (یَذبَـحُ)، (یَذبَـحُ)، واتـە: سـەری دەبـڕی، بـەڵام (یُذَبِّحُ) واتـە: زۆری سـەر دەبڕیـن، هـەم کـە دەفەرمـوێ: ﴿ یُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَکُمۡ ﴾الأعـراف، یانـی: زۆری دەکوشـتن، لەوێـش دەیتوانـی بفەرمـوێ: (یَقتُـلُ)، بـەڵام (یُقَتِّـلُ) یانـی: زۆری لـێ دەکوشـتن، ئنجـا وەک پێشـتریش باسـم کـرد: کـە دەفەرمـوێ: (یُذَبِّحُ)، دواییـش دەفەرمـوێ: (یُقَتِّـلُ) لەبـەر ئەوەیـە کـە هەمـوو لەبەیـن بردنەکانـی فیرعـەون بـۆ نێرینەکانـی گەلـی مووسـا، بەنـوو ئیسـرائیل، وا نەبـووە کـە بـە شـێوەی سـەربڕین بـن، وەک لـە (پەیمانـی کۆن)یشـدا هێنامـان، بەڵکـو هەندێـک جـار، یەکسـەر خسـتوویاننە نێـو دەریـاوەو خنکاندوویانـن، یـان بـە شـێوەی دیکـە لـە بەینیـان بـردوون.

**٢- حیکمەتی زۆرجار دووبارەبوونەوەی بەسەرهاتی مووسا و فیرعەون:**

بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ و فیرعـەون لـە قورئانـدا، بۆیـە زۆرجـار دووبـارە کراوەتـەوە، کـە هەمـووی دەوری بیسـت و سـێ (٢٣) جـار، لـە بیسـت و سـێ شـوێنی قورئانـدا هاتـوە، چونکـە کۆمەڵگاکانـی بەشـەریی، هەمیشـە ئـەو حاڵەتەیـان

تێـدا دووبـارە دەبێتـەوە، هەمیشـە حوکمڕانێـک، فیرعەونانـە حوکـم دەکات و، خـۆی دەسـەپێنێ و، خـزم و حیـزب و دەوروبـەرو وابەسـتە و دابەسـتەکەی خـۆی، بەسـەر کۆمەڵـگادا دەسـەپێنێ و قۆرخکاریـی دەکات و، خراپـەو سـتەم دەکات و، خەڵکەکـەش بێچـارە دەکات، سـەرەنجام لەنێـو ئـەو خەڵکـەدا ڕاپەڕیـن، دروسـت دەبـێ، یەکێـک پێشـیان دەکـەوێ کـە غیرەتـی دەجووڵـێ چیدیکـە، ئـەو سـتەمە قبـووڵ نەکـەن، هەمیشـە ئـەو سیناریۆیەو، ئـەو حاڵەتـە دووبـارە دەبێتـەوە، بۆیـە خـوا ﷻ بەسـەرهاتی مووسا ﷺ و فیرعەونـی زۆر لـە قورئانـدا دووبـارە کردۆتـەوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەم حاڵەتـە: حاڵەتـی هەبوونـی سـتەم و، دوایـی ڕاپەڕیـن لـە دژی سـتەم و، کۆتایـی پـێ هێنانـی سـتەم و، شـۆڕش کـردن لـە دژی، هەمیشـە لـە ژیانـی بەشـەردا دووبـارە دەبێتـەوە،

هێنـدە گێڕانـەوەی ئـەو بەسـەرهاتە، یـانی: هـەر کاتێـک کەسـێک هەبـوو فیرعەونانـە حوکمـی کـرد، ئێـوەش مووسـایانە لێـی ڕاپـەڕن، بۆیـە گوتـراوە: (لِـكُلّ فِرعَـونٍ مُـوسى)، هـەر فیرعەونێـک مووسـایەکی بـۆ دەبـێ، دیـارە لـە کاتێکـدا کـە کۆمەڵـگا زینـدوو بـێ و خـاوەن ئیـرادە بـێ، مووسـایەکیان هـەر تێـدا هەڵدەکـەوێ، کـە بەرۆکـی ئـەو فیرعەونـە بگـرێ، یەخـەی بگـرێ و ئـەو خەڵکـە، ئـەو کۆمەڵـگا مەزڵـوم و بەشـخوراو و سـەرکوتکراو و مـاف پێشـێل کـراوە، دەربـاز بـکات، لـە چنگـی ئـەو فیرعەونـە خـۆ بـە پـەروەردگار زان و، خـۆ بـە پەرسـتراو زانـە، کـە ئێسـتا بـە داخـەوە بـە تایبـەت لـە وڵاتانـی مسوڵماننشـین دا، حوکمـی فیرعەونانـە زۆر زۆرە.

هەڵبەتـە کەسانێکیش هـەن وەک مووسا ﷺ ڕاپەڕیـون، بـەڵام مـەرج نیـە وەک مووسـایان بـۆ ڕەخسـابێ، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە ئینسـان هەوڵـدەدات، لـە ڕاستییدا هـەر کاتێـک فیرعەونایەتیـی هەبـوو، دەبـێ مووسـایانەش لـە دژی ئـەو حوکمـی فیرعەونایەتیـی و خۆسـەپاندنە ڕاپەڕیـن بکـرێ.

**٣- بێگومان بەنوو ئیسرائیل، ڕۆڵەکانی یەعقووب ﷺ کە دوایی بوونە گەل و نەتەوەیەک، بە ناوی گەلی جوولەکە، کاتی خۆی لە ئایینی ئیبراهیم ﷺ لایانداوە:**

چونکە بەنوو ئیسرائیل، یانی: ڕۆڵەکانی ئیسرائیل، ئیسرائیل نازناوی یەعقووبە، یەعقووب کوڕی ئیسحاقە، ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە، ئەوانەش خۆیان لەسەر ئایینی ئیبراهیم بینیوە، بەڵام لایانداوە، بۆیە خوا ﷻ فیرعەونی تێبەرداون، بەڵگەشمان ئەو هەموو بەهانە گرتنانەن کە دوایی بە مووساو هاروونی برایان گرتوون، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا عزوجل بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ﴾الأعراف، واتە: گوتیان: مووسا ﷺ پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، وەک چۆن ئەوانە چەند پەرستراوێک دەپەرستن، مانای وایە لادان و لە ڕێ هەڵە بوون، لە نێو گەلی بەنوو ئیسرائیلدا، زۆر هەبووە، ئەگەرنا داوای وا چۆن لە مووسا ﷺ دەکەن؟ پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، وەک چۆن ئەو خەڵکە چەند بت و صەنەمێک دەپەرستن، وەک لە سوورەتی (الأعراف)دا، هاتووە با ئایەتەکان هەموویان ببینین:

﴿وَجَـٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۚ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَـٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾﴾.

واتە: بەنوو ئیسرائیلمان لە دەریا تێپەڕاندن، گوزەرمان پێ کردن، (دەریامان بۆ شەق کردن و پەڕینەوە)، بە لای کۆمەڵێکدا تێپەڕین کە لەسەر چەند بت و پەیکەرێک خۆیان حەپس کرد بوو و، دەیانپەرستن، گوتیان: ئەی مووسا! ﷺ پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، وەک چۆن ئەوان ئەو پەرستراوانە دەپەرستن، فەرمووی:

بە دڵنیایی ئێوە کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن، ئەوانە ئەوەی تێیدان لەبەین دەچێ و فەوتاون و، ئەو کردەوەی دەیکەن، پووچە و بەتاڵە، ئایا جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەتان بۆ پەیدابکەم، لە حاڵێکدا کە ئێوەی بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردوە، (جیهانییانی ڕۆژگاری خۆتان)، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) یادیش بکەنەوە کاتێک ئێوەمان لە نیزیکان و پەیڕەوانی فیرعەون دەرباز کرد، کە سزایەکی زۆر خراپیان پێ دەچێژتن، کوڕەکانتانیان دەکوشت، ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوەو، لەوەشدا تاقیکردنەوەیەکی مەزن هەبوو لە پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە.

(کە ئەو بەڵایەتان بەسەر هاتبوو، یاخود کە بەو شێوەیە دەربازی کردن).

ئەوە یەکێکە لە نموونەکان، کەواتە: وەک پێشینان گوتوویانە: (چ عەلەم بێ قەلەم نین)، خوا ﷻ لە گۆترە کەس سزا نادات، خوا لە گۆترە وەزعی خراپ و، حاڵی خراپ بەسەر کەسدا ناهێنێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾الأنفال، خوا ﷻ ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە چاکەیەک خوا لەگەڵ کۆمەڵێک دەیکات، ئەو چاکەیان لێ لانابات، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن.

بەنوو ئیسرائیل پێشێ لە میسر زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە ژیاون، بەڵام دوایی کە نا بەو شێوەیە کراون بە کۆیلە و، نێرینەکانیان سەربڕدراون و ئافرەتەکانیان هێڵدراونەوەو، ئاوا سۆغرە و بێگاریان پێ کراوە، دیارە کۆمەڵێک ڕەفتاری وایان کردوون، کە خوای دادگەر بەو شێوەیە سزایان بدات و، ئەو فیرعەونەیان تێ بەربدات و خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ.

وێنەیەکی دیکە: ئەو کاتەی مووسا ﷺ دەچێت تەورات وەربگرێ، خوا ﷻ ژوانگەی بۆ دادەنێ و، دەچێ تەورات وەربگرێ و چل شەو کاتی بۆ دادەنێ و، هاڕوون بەجێ دەهێڵێ، کەچی هەتا دەگەڕێتەوە لایان دەبینێ دەستیان داوەتە گوڵک پەرستیی، هەرچەندە هاڕوون زۆر ئامۆژگارییان دەکات، وەک دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ ﴾طـه.

کـە کاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (طـه)دا، بـە تەفصیـلّ باسـمان کـردوە، کـە سـامیریی گۆلکێکـی زێـری بـۆ دروسـت کـردوون و، زۆربەیـان دەسـتیان کـردوە بـە پەرسـتنی، هارِوونیـش زۆر ئامۆژگاریـان دەکات و دەڵـێ: ئێـوە بـەوە تاقیکراونـەوەو پـەروەردگاری ئێـوە تەنیـا خـوای خـاوەن بەزەییـە، شـوێنم بکـەون و فەرمانبەرییـم بـۆ بکـەن، ئەوانیـش دەڵێـن: نەخێـر، هـەر دەیپەرسـتین تاکـو مووسـا دەگەڕێتـەوە بـۆ لامـان!

**٤- هـەر چـۆن بـێ دیـارە ئـەو کاتـە لـە نێـو مرۆڤایەتیـدا، هیـچ گـەل و کۆمەڵێـک لـە بەنـوو ئیسـرائیل باشـتر نەبـووە، لەبـەر ئـەوە خـواش ﷻ:**

أ- هەم لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەی وەچەی ئیسرائیل! یادی چاکەی من بکەن، بەسەر خۆتانەوە کە لەگەڵمدا کردوون و، ئەوە کە من بەسەر جیهانییاندا هەڵمبژاردوون.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یشدا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾، واتە: مووسا گوتی: ئایا پەرستراوێکی دیکەتان بۆ پەیدا بکەم، لە حاڵێک دا ئەو ئێوەی بەسەر جیهانییاندا بەرز کردۆتەوە؟

کەواتـە: خـوا ﷻ کـە لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا و، لـە سـوورەتی (البقـرة)دا و، لـە جێـی دیکـەدا، وەک لـە سـوورەتی (یونـس) و (الجاثیة)شـدا هاتـوە، دەفەرمـوێ: بەنـوو ئیسـرائیلمان بـە سـەر جیهانییانـدا بـەرز کردوونـەوە، واتە: بە گشـتیی باشـترین کۆمـەڵ بـوون لـە ڕۆژگاری خۆیانـداو لەنێـو هەمـوو بەشـەرییەتدا بەگشـتیی باشـترین کۆمـەڵ بـوون، بـەڵام دیـارە کۆمەڵێـک خاڵـی بێهێزیشـیان هەبـوون.

**٥- خۆ بەرزکردنەوەی فیرعەون و ستەم و زۆرەکەی، هۆکاری فەوتانی بوو:**

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾، ئەو خۆ بەرزکردنەوەو خراپەو ستەمەی، بوو بە هۆی ئەوە کە مووسایەک خوا ﷻ بیرەخسێنێ، لە نێو ئەو گەلە ستەم دیدەیەدا و، سەرەنجام بیکاتە پێغەمبەرو، بینێرێ بۆ ئەوەی ئەو گەلە ستەمدیدەیە، ئەو گەلە سۆغرە و بێگار پێکراوەو بە کۆیلە کراوە، دەرباز بکات، یانی: ستەم و خۆ بەرزکردنەوەکەی فیرعەون و خۆ سەپاندنەکەی، بوو بە هۆی لەبەین چوونی و، سەر بە فەتارەت چوونی خۆشی و سوپایەکەیشی و گەلەکەشی کە لەگەڵی بوون.

**٦- فیرعەون و سوپا و گەلەکەی، لە لایەکەوە بەڵایان بۆ هات، کە هەر حیسابیان بۆ نەدەکرد:**

یانی: ئەوان هیچ حیسابیان بۆ ئەوە نەکرد بوو، کە ئەو بەنوو ئیسرائیلە کە سۆغرە و بێکاریان پێ دەکرێ و بە کۆیلە کراون و، نێرینەکانیان سەر دەبڕدرێن، مووسایەکیان تێدا هەڵکەوێ، مەلۆتکەیەک بێ، دایکی لە ترسی سەربڕان، بیخاتە صندووقێکەوەو بە ڕووباری نیلی دابدا، دوایی بچێتە ماڵی فیرعەون و، لە ماڵی خۆیاندا بە خێوی بکەن، ئەمەش خوا ﷻ دەیەوێ بە هەموو چەوساوانی سەر زەوی بڵێ کە:

أ- خواو پەروەردگارێک هەیەو، مشوورخۆرێکتان هەیە لە پشتتانە و، ئەگەر ئێوە هەبن خوای پەروەردگار خەمتان لێ دەخوات و، مشوورتان دەخوات و، سەرتان دەخات و، ئاگای لێتانە.

ب- هۆشدارییشە بۆ هەموو حوکمڕانە خۆسەپێنە، بە زەبرو زۆرەکان، کە دنیا شاری بێخاوەن نیە، خوا ﷻ لەگەڵ ئەو چەوساوەو ستەمدیدانەدایە، کە ئێوە دەیانچەوسێننەوەو ستەمیان لێ دەکەن و مافەکانیان پێشێل دەکەن و، سزای خواش ﷻ بۆتان لە بۆسە و کەمیندایە.

**٧- لە بەین بردنی فیرعەون و سوپا و گەلە یاخییەکەی، بەو شێوە پلە پلەیە حیکمەتی گەورەی تێدایە:**

مووسا ﷺ بە ڕووبار دادە درێ و، لە ترسی سەربڕان دەچێتە ماڵی فیرعەون و هەڵدەگیرێتەوەو بەخێو دەکرێ، لە ماڵی ئەواندا چەند ساڵان دەمێنێتەوە، دوایی مووسا ﷺ ئەو نەفەرەی بە دەست دەکوژرێ، کە ئەویشی هەر لە جوامێریی و ئازایەتییەوە بووەو غیرەتی قبووڵی نەکردوە، ئێوە ڕامێنن: کابرایەکی فیرعەونیی ستەم بکات، لە کابرایەکی بەنوو ئیسرائیلیی، کە بە تەئکید دایکی بۆی باسکردوە، بابی و خزمەکانی بۆیان باس کردوە، کە ئەی مووسا ﷺ! بۆ زانیاریت! تۆ کوڕی فیرعەون نی و، تۆ لە گەلی ستەم دیدەی بەنوو ئیسرائیلی، حەتمەن دایکی بۆی باسکردوە: ڕۆڵە! تۆم بە مەلۆتکەیی بە ڕووباردا داوە، لە ترسی سەربڕان، خوا ئیلهامی بۆ کردووم و خستوویەتە دڵمەوە، دوایی لە ماڵی فیرعەون گیراویەوەو، ئەوان بەخێویان کردووی، ئێستا تۆ کوڕی ئەوان نی! ئنجا کە مووسا ﷺ ئەو ئیسرائیلییە دەبینێ و، ئەو فیرعەونییە ستەمی لێ دەکات، خۆی ڕاناگرێ و مستێکی لێ دەدات و دەیکوژێ، ئەوەشی هەر جوامێریی و غیرەت بووە، ئنجا دوای ئەوە مووسا ﷺ لە ئەنجامی ئەو قەتڵەدا دەچێ بۆ مەدیەن، لەوێ خۆی پەنادەدا و، ماوەیەک لەوێ شوانیی دەکات، ئنجا دوایی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردانی دایک و خوشک و خزمانی و، لە ڕێگادا خوا ﷻ دەیکاتە پێغەمبەر.

کەواتە: ئەوە نەبووە خوا ﷻ بەڵایەکی کتوپڕ بنێرێ بۆ فیرعەون و سوپا و گەلەکەی، بەڵکو هەمووی بە پلە پلەیی بووە، دواییش کە مووسا ﷺ دێت لەگەڵیان ڕووبەڕوو ببێتەوە، بەس خوا ﷻ دەزانێ چەند ساڵی پێ چوون؟ ئەو هەموو موعجیزانەیان پێشان دەدات، بەس خوا دەزانێ چەندان ساڵی پێ چوون؟ ئنجا دوایی خوا ﷻ هەر نایانفەوتێنێ، هەتا سەرەنجام بە دوای ئەو مەزلوومانە دەکەوێ و، کە دەیانەوێ خۆیانیان لێ دەرباز بکەن، هەڵدێن لە دەستیان و، خواش ﷻ دەریا بۆیان دەقڵیشێنێ، ئەوانیش بە دوای ئەواندا دەچنە

نێو دەریا، هەر ئەو دەریایەی کە بۆوان قڵیشاو، بووە هۆی دەرباز بوونی بەنوو ئیسرائیل، هۆی فەوتانی فیرعەون و سوپا ستەمکارەکەشی بوو!!.

ئەمە مەبەست پێی ئەوەیە کە مسوڵمانانیش پەروەردە بن، هەم هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ و، هەم مسوڵمانان لە هەر ڕۆژگارێکدا، کە ئێوەش وردە وردە دەتوانن کار بکەن، لەسەر خۆ پەروەردە کردن، وەک چۆن مووسا ﷺ وردە وردە پێگەی بەرزو دیار بووەو، گەلەکەی خۆشی وردە وردە هۆشیار کردۆتەوە، بە تایبەت دوای ئەوە کە خوا ﷻ پەیامی بۆ ناردوە، ئێوەش ئەگەر کار لەسەر خۆتان بکەن و خۆتان پەروەردە بکەن، کاتێک دێ لە چەوسێنرانەوە دەرباز بن!

**٨- هەبوونی مرۆڤی چاک لە نێو خەڵکی خراپ و، لە شوێنی خراپدا، ئەگەر ئەو مرۆڤە چاکە، هیممەتی هەبێ، سوودێکی زۆر دەگەیەنێت:**

ئەوەتا ژنەکەی فیرعەون - کە لە تەفسیرەکاندا دەڵێن: ناوی ئاسیا کچی موزاحیم بووە - سوودێکی زۆری گەیاندوەو ئەگەر ئەو نەبووایە، بە ڕواڵەت ئەو مووسا مەلۆتکەیەش سەر دەبڕا، بەڵام خوا ﷻ نەخشەکەی وا داناوە، دەبێ هەر ئافرەتەکەی فیرعەون بیپارێزێ، کە ژن و مێرد لە هەموو کەس لێک نیزیکترن، کەچی خوا ﷻ هەر بە دەستی ئافرەتەکەی فیرعەون، مووسا ﷺ دەپارێزێ و، ئەوەش لووت شکاندنێکە بۆ فیرعەون، کە ئەی فیرعەون! تۆ ئەو گەلە دەچەوسێنیەوەو، نێرینەکانیان سەردەبڕی، چونکە کاهینەکان پێیان گوتووی، یان خۆت خەونت دیوە، کە کۆتایی موڵک و دەسەڵاتی تۆ لەسەر دەستی منداڵێک دەبێ، کە لە بەنوو ئیسرائیلە، ئەوەتا دەبێ هەر خۆشت ئەو منداڵە بە خێوی بکەی!

هەروەها لە سووڕەتی (غافر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ

مِن رَّبِّكُمْ ﴾، خوا ﷻ لە میانی بیست و چوار ئایەتدا، باسی هەڵوێستی ئەو پیاوە بڕواداره دەکات، کە لە نێو دارو دەستەی فیرعەونیشدا بووەو، بەرگرییەکی زۆر جوامێرانە لە مووسا ﷺ دەکات! کەواتە: مرۆڤی باش ئەگەر هیممەتی هەبێ، لە شوێنی خراپدا، دەتوانێ سوودی زیاتر بگەیەنێ، لەوەی لە شوێنێکی چاک بێ، یان شوێنێکی ئاسایی بێ، بەڵام بە مەرجێک بەو شێوەیە بێ، کە پێشینان گوتوویانە: (تیغی ڕەسەن خۆی لە کالاندا ڕاناگرێ)و، لە کاتی پێویستدا خۆی ئاشکرا بکات.

**٩- مرۆڤ هەتا ئیمانی پتەوتر بێ، زانیاریی و یەقینی بە هاتنە دی بەڵێنەکانی خوا ﷻ زیاتر دەبێ:**

وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بۆ ئەوەی دایکی مووسا بزانێ کە بەڵێنی خوا ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: لە ئەنجامی بێ ئیمانییدا نازانن کە بەڵێنی خوا ﷻ ڕاستە، کەواتە: ئینسان هەتا ئیمانی باشتر بێ، بە تەئکید متمانەی زیاتری دەبێ بە بەڵێنی خوا و، زانیاریی زیاتری دەبێ بە کاروباری خوا ﷻ.

**١٠- لێزانیی و کارامەیی و، بە نەخشە و بەرنامە کارکردن، پیشەی پێغەمبەران و بۆ خوا صوڵحاوان بووە:**

ئەوەتا دایکی مووسا ﷺ بە نەخشە کاری کردوە: مووسای خستۆتە نێو صندووقێکەوە، بە تایبەتیی لە پەیمانی کۆندا کە وردەکارییەکان باس دەکات، ئەو صندووقەی لە جۆرە تەختەیەکی تایبەت دروستکردوە، ئنجا دوایی کەلێنەکانی ئەو تەختەیە دەگرێ - کە بێگومان دەبێ لای سەرەوە بۆش بووبێ، تاکو هەوای بۆ بێ - بۆ ئەوەی ئاوی نەچێتە پاڵ، دوایی کە بە ئاوەکەشی دا دەدات، خوشکی مووسا ڕادەسپێرێ کە: بڕۆ بەدوای بکەوەو، سۆراغی بکە، نەک هەر لێیگەڕێ و تەواو! بێگومان بە ئیلهامی خوا ﷻ، وەک لە سوورەتی (طه) دا دەفەرموێ: ﴿ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ ﴾، هەمووی

نەخشەی خوایە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەسەر دەستی دایکی مووسا نەخشە و بەرنامەکە داندراوە و جێبەجێ کراوە.

**١١- خوای میهرەبان لە تەنگانانـدا ئاگای لە بەندەکانیەتی و، دڵ و دەروونیان بەهێز دەکات لە بەرانبەر گرفت و کێشە و بەڵایەکاندا:**

وەک دەفەرموێ: ﴿إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، خەریک بوو دایکی مووسا ﷺ هەواڵەکەی مووسا دەربخات و ئاشکرای بکات، ئەگەر ئێمە دڵمان بەهێز نەکردبایە، بۆ ئەوەی لە بڕواداران بێ، کەواتە: بڕواداران دڵیان بەهێزە لە بەرانبەر بەڵا و موصیبەتەکاندا.

**١٢- مرۆڤی بڕواداریش لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بەڵا و موصیبەتتدا، ئەندازەیەک هاوسەنگیی خۆی لە دەست دەدات و، ناڕەحەت دەبێ:**

واتە: ناڕەحەت بوون و، فیکر مەشغوڵ بوون و، سەراسیمە بوون، شتێکی ئاساییە، لە کاتێکدا ئینسان لەگەڵ بەڵا و گرفتارییدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەدات و، لە خۆی وریابێ، خوا ﷻ ئاوا باسی دایکی مووسا ﷺ دەکات: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا﴾، هۆش و عەقڵی دایکی مووسا ﷺ خاڵیی بوو لە هەر شتێک، جگە لە بیرکردنەوە لە مووسا، یان: خاڵیی بوو لەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بیر بکاتەوە، کەواتە: لە کاتی بەڵا و موصیبەتدا شتێکی ئاساییە کە ئینسانی ئیمانداریش ئەندازەیەک هاوسەنگیی خۆی لە دەست بدات، بەڵام بە هۆی ئیمانەکەیەوە دڵی بەهێز دەبێ و، دوایی دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی ئاسایی.

**١٣- هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لە کاتی پێگەیشتنی جەستەیی و عەقڵیی و دەروونییدا، وەحییان بۆ هاتوە:**

ئەمە لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾.

واتـە: کاتێـک کـە گەیشـتە ئـەو پـەڕی توانـای و پێگەیشـت و ڕێـک بـوو، یـانی: لـە ڕووی جەسـتەییەوە گەیشـتە ئەوپـەڕی گەشـە و توانایـی، لـە ڕووی دەروونیـی و عەقڵییـەوەش پێگەیشـت و ڕێـک بـوو، ئێمـە حیکمـەت و زانیارییـمان پێـداو، هـەر تـاواش پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە.

هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، لـەو پـەڕی تێـرو تەواویـی جەسـتەیی و عەقڵیـی و دەروونییـدا بـوون، کاتێکیـش گەیشـتوونە قۆناغـی تێگەیشـتوویەتیی و پێگەیشـتوویەتیی، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو پەیـام و بەرنامەیـەی خـۆی پـێ سـپاردوون، وەک پیرەمێـردی شـاعیر دەڵـێ:

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا        تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

**١٤- خـوا ﷻ هـەر کەسـێک بیـەوێ لـە بەندەکانـی خـۆی هەڵیدەبژێـرێ و پەیامـی خـۆی، یـان هـەر ئەرکێکـی دیکـەی پـێ دەسـپێرێ:**

یەکێـک لـە خەسـڵەتە بەرزەکانـی کـە مووسـا ﷺ هەیبـووە، ئـەوە بـووە، کـە زۆر بـە لای توندیـی و عەزیمـەت و هێـز و پێـزدا بـووە، یانـی: کـە تەماشـای کـۆی هەڵوێسـتەکانی مووسـا ﷺ دەکەیـن، هەمیشـە بـەلای سـەختیی و توندیـی و عەزیمـەت و پتەوییدایـە، چونکـە خـوا ﷻ پێغەمبەرێـک بنێـرێ، بەگـژ فیرعەونیـدا بـکات، فیرعەونێـک کـە لافـی خوایەتیـی لـێ دەدات، دەبـێ پێغەمبەرێکـی لـە قـەدەر خۆیشـی بـۆ بنێـرێ، بـەڵام دواییـش خـوا ﷻ هارونـی براشـی دەکات بـە وەزیـرو پاڵپشـتی، کـە هـارون بـە لای سـەماحەت و نەرمییـدا بـووە، تاکـو ببێتـە جۆرێـک لـە کەمکـەرەوەی ئـەو سـەختیی و توندیـی و پتەویـی و هێـز و پێـزەی مووسـا ﷺ و، لـە سـنوور دەرنەچـێ، هەڵبەتـە مووسـا ﷺ هیـچ بەتەمـا نەبـووە، خـوا ﷻ بیکاتـە پێغەمبـەرو پەیامـی خـۆی بـۆ بنێـرێ، بـەڵام خـوا کاربەجێیـە، پەیامـی خـۆی و، ئەرکێـک کـە بیـەوێ لـە پێغەمبـەران و غەیـری پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، بـە کەسـانێکی دەسـپێرێ کـە بـە شایسـتەیان بزانـێ، کەسـێک کـە خـوا ﷻ بـە شایسـتەی بزانـێ، دیـارە شایسـتەیە.

**١٥- خـوا هــەر كات ويســتی كارێــک بــكات، بــەو پــەڕی لێزانيــی و نەخشــە و بەرنامــەی وردەوە هۆكارەكانــی بــۆ ســاز دەكات:**

وەک دەبينيـن مووسـا ﷺ کـە خـوا ﷻ دەيـەوێ تێيبگەيەنێ و پێی بگەيەنێ، تەماشـا دەكەيـن: بەڵـێ: لـە كۆشـكی فيرعەونـدا پێـدەگات، بـۆ ئـەوەی چاک شـارەزای سروشـت و پاشـخانی فيكريـی و كۆمەڵايەتيـی، فيرعـەون و دارو دەسـتەكەی بـێ، چونكـە لەگەڵيانـدا ڕووبـەڕوو دەبێتـەوەو، دەبـێ بزانـێ چ ماڵێكـن و چ مەعدەنێكـن؟ پاشـان مووسـا لـە گەلـی سـتەم لێكراويـی بەنـوو ئيسـرائيلە، تاكـو بزانـێ خەڵكەكـەی و گەلەكەشـی لـە چ حاڵێكـی ناخۆشـدان و، بزانـێ چـۆن دەربازيـان بـكات و، بزانـێ ئەوانيـش ديسـان حاڵـی دەروونيـان چۆنـەو پاشـخانی فيكرييـان چۆنـە، عەيـب و كـەم و كورييەكانيـان چيـن؟ ئنجـا مووسـايەک ﷺ کـە لـەو كـەش و هەوايـەدا، پێگەيشـتوە و گـەورە بـووە، خـوا ﷻ ئـەوە دەنێـرێ بـە گـژ فيرعـەون و دارو دەسـتەكەيدا دەكات و، دەيـكات بـە ئەركـی سـەر شـانی، كـە ئـەو گەلـە سـتەملێكراو و سـتەمديدەيە، ڕزگار بـكات، وەک دەفەرمـوێ: ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ...﴾ طـه -٤٧-، ئنجـا بەنـی ئيسـرائيلم لەگـەڵ بنێـرە و چيديكـە مەيانچەوسـێنەوەو، سـۆغرە و بێگاريـان پێمەكـە.

**١٦- دەربازكردنی خوا ﷻ بۆ بەندەكانی، نيشـانەی دۆسـتايەتيی و سەرپەرشتياريیەتی بۆيان:**

خـوا ﷻ بەندەكانـی خـۆی لـە تەنگانـە دەربـاز دەكات و لـە فريايان دێ، ئنجـا چ وەک خورپـە (إلهـام) بيخاتـە دڵيـان كـە چـی بكـەن؟ چ لـە دەرەوەی خۆيـان هۆكاريـان بـۆ بڕەخسـێنێ، ئەگـەر تەماشـای ژيانـی مووسـا ﷺ بكەيـن: وەک پێشـتريش باسـمان كـرد، هـەر بـە گچكەيـی دياره خـوا ﷻ چـی بـۆ ڕەخسـاندوە! پاشـان كـە گـەورەش دەبـێ، خوا ﷻ هـۆكاری بـۆ دەڕەخسـێنێ، چ لـە زاتـی خۆيـدا كـە كاتێـک تووشـی گرفتێـک دێ، بيـر بكاتـەوە چـۆن لێـی دەربـاز بـێ، چـۆن لـە خـوا ﷻ بپاڕێتـەوەو، پەنـا بـە خـوا بـەرێ و، پاشـان كەسـانێكی بـۆ بڕەخسـێنێ، كـە ڕاوێژيـان پـێ بـكات، ياخـود پێشـنياری بـۆ بكەن و، دڵسـۆزانە ڕێـی پـێ نيشـان بـدەن، وەک ئـەو پيـاوە بـڕوادارو، دڵسـۆزە، كـە لـەو پـەڕی

شارەوە دێ و، زۆر بە جیددیی مووسا ئاگادار دەکاتەوە، لە پیلانگێڕیی فیرعەون و دارو دەستەکەی لە دژی، هەڵبەتە خوا ﷻ خەم لە دۆستانی خۆی دەخوات، بەندەکانی خۆی مشووریان لێ دەخوات و بە تەنگیانەوەیە و بە دەمیانەوەیە، بەپێی حیکمەتی بێ سنووری خۆی، کاتێک کە دەکەونە نێو تەنگ و چەڵەمە و گرفت و کێشەیەک، خوا ﷻ دەربازیان دەکات و دەرگای خێریان لێ دەکاتەوە.

**١٧- پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، پێش پێغەمبەرایەتییش خاوەنی کرداری چاک و پەرێزی پاک بوون:**

یەکێک لە خەسڵەتە بەرز و پەسندەکانی مووساش ﷺ پێش پێغەمبەرایەتیی، بریتی بووە لە بەرگریی لێکردنی ستەمدیدە و چەوساوان: کاتێک مووسا ﷺ دەبینێ کابرایەکی قیبتیی ئازاری کەسێکی بەنوو ئیسرائیلیی دەدات، یەکسەر دەچێ لەسەری دەکاتەوەو بەرگریی لێ دەکات، دوای ئەوەی کابرا هاواری تێ دەبەستێ و، دەبێ قیبتییەکە لێی دابێ، ڕەنگە لە کاتی سۆغرە و بێگار پێکردندا بووبێ، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان زوڵمی لێکردبێ و لێی دابێ، ئەویش دیارە بێ دەسەڵات و دەستەپاچە بووە لە بەرانبەریدا، یان لەبەر ئەوەی ئەو قیبتییە، لە گەلی فیرعەونە، ئەویش لە بەنوو ئیسرائیل، کە گەلێکی ستەم دیدە و بن دەست بوون، یاخود هەر ڕەنگە لە ڕووی جەستەییەوە، هاوکوف و هاوتای نەبوو بێ، مووسا ﷺ بەرگریی لێ دەکات.

دواییش کە مووسا ﷺ دەڵێ: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ﴾، پەروەردگارم! بە هۆی ئەوەوە کە تۆ چاکەت لەگەڵ مندا کردوە، نابمە پاڵپشت و هاوکاری تاوانباران.

وەک پێشتریش گوتمان: ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە مووسا ﷺ سوپاسی خوای کردوە، لەسەر ئەوەی هێز و پێز و توانایەکی داوەتێ، کە دەتوانێ بەرگریی بکات لە ستەملێکراوان، ئنجا دەڵێ: پەروەردگارم! کە تۆ ئەو توانایەت پێداوم، هەروەها حیکمەتت پێداوم و، زانیاریت پێداوم و، لە ڕووی

ماددیی و مەعنەوییەوەو، لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە، چاکەت لەگەڵ کردووم، منیش پشتگیرو هاوکاری تاوانبارانی وەک فیرعەون و قیبتییەکان و سوپایەکەی فیرعەون و دارو دەستەکەی نابم، بەڵکو بەرگرییکار دەبم لە ستەم لێکراوان و ستەمدیدان، پێشتریش گوتمان: ئەم واتایە زیاتر لەگەڵ سیاقەکەدا دەگونجێ، نەک ئەوە کە مووسا ﷺ بڵێ: جارێکی دیکە بەرگریی لە هیچ ستەم لێکراوێک و هیچ بەنوو ئیسرائیلییەک ناکەم، هەرچەند قیبتییەکان بیانچەوسێننەوە! چونکە هەر ڕۆژی دواتر مووسا ﷺ کە دەبینێت قیبتییەکی دیکە، بەگژ بابایەکی بەنوو ئیسرائیلیدا چووە، بەڵێ سەر زەنشتی کابرای بەنوو ئیسرائیلی دەکات، لەو بارەوە کە ڕەنگە کەمتەرخەم بوو بێ، لە دروستکردنی ئەو هەرا و کێشە و گێچەڵەدا، بەڵام دیسان دەیەوێ پەلاماری کابرای دیکە بداتەوە، کە ئەمە بە دوور دەزانرێ، دوێنێ مووسا ﷺ بەڵێن و پەیمانی بە خوا ﷻ دابێ، کە بەرگریی نەکات لە کەسانێک کە تووشی شەڕو گێچەڵ دەبن، با بەنوو ئیسرائیلییش بن، کەچی ئەمڕۆ بەرگریی لێ بکات!! نا، مووسا ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە من هەر ناوا داکۆکییکار دەبم، لە مافی چەوساوان و بەرگرییکار دەبم لە ستەملێکراوان و، هەرگیز پشتی تاوانباران ناگرم.

**١٨- مرۆڤ هەتا نیعمەت و چاکەی خوای زیاتر هەبن، پێویستە وریاترو پارێزکارتر بێ و، تاکو خوا ﷻ زیاتر مرۆڤی بەهرەمەند کرد بێ، لە چاکەکانی خۆی، دیارە ئەوە باری شانی قورستر دەکات:**

وەک مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ﴾، پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەی کە تۆ چاکەت لەگەڵمدا کردوە، هاوکارو پشتگیری تاوانباران نابم، (مُجْرِمین) بە تەئکید مەبەست پێی فیرعەون و گەلەکەی و سوپاکەی بووە، نەک بابایەکی بەنوو ئیسرائیلیی کە مووسا ﷺ بەڵێ سەرزەنشتی دەکات و، پێی دەڵێ: ﴿إِنَّكَ لَغَوِيّٞ مُّبِينٞ﴾، تۆ بابایەکی سەرگەردان و بێمرادی ئاشکرای، بەڵام بابای سەرگەردان جیایە لە بابای تاوانبارو ستەمکار.

**١٩- بە هیچ شێوەیەک دروست نیە، هاوکاریی تاوانباران بکرێ لەسەر تاوانکردن، بەڵام بۆ گێڕانەوەیان لە تاوانباریی و لە ستەم و لە خراپە، پێویستە مرۆڤ دڵسۆزییان بۆ بە خەرج بدات:**

وەک مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ﴾، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە بە هیچ جۆرێک دروست نیە، ئینسان بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوکارو پشتیوان و پشتگیری تاوانبارو ستەمکاران بێ، بۆ ستەم و تاوانەکەیان، بەڵام بۆ گێڕانەوەیان لە ستەم و تاوان، ئەگەر دڵسۆزییان بۆ بنوێنێ و، دەستیان بگرێ و، نەهێڵێ زوڵم بکەن، ئەوە دیارە ئەرکێکی شەرعییە، وەک فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا**)[1]، واتە: برایەکەت سەربخە، ستەمکار بێ، یان ستەم لێکراو بێ، هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێن: ئەگەر ستەملێکراو بێ، دەزانین دەبێ یارمەتیی بدەین و، نەهێڵێن ستەمی لێ بکرێ، بەڵام ئەگەر ستەمکار بێ، چۆن یارمەتیی بدەین؟ فەرمووی: دەستی بگرن و مەهێڵە زوڵم بکات، [ئەوە یارمەتییدانی ئێوەیە بۆی].

ئنجا کە دەفەرموێ (**أَخَاكَ**) دەگونجێ مەبەست پێی برایەتیی ئایینیی بێ و، دەشگونجێ مەبەست برایەتیی ئینسانیی بێ، مرۆڤ ئەگەر زاڵمیش بێ، هەر براتە، وەک مرۆڤێک و تۆ دەبێ سەری بخەی و پشتی بگری، لەوەدا کە نەهێڵێ ستەم و تاوان و خراپە بکات.

**٢٠- دەبێ پارێز بکرێ لە هاوکاریی کردنی کەسانێکی ئاژاوەچیی (مشاغِب)، کە بەهرەی خراپ لەو هاوکارییە وەربگرن:**

وەک مووسا ﷺ کە بۆ ڕۆژی دووەم تەماشا دەکات: بابای بەنوو ئیسرائیلیی دووبارە چۆتە نێو تەشقەڵە و گێچەڵێکی دیکەوە، سەر زەنشتی دەکات و دەڵێ:

---

(١) [عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «أُنْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا نَنْصُرهُ مَظْلُومًا، فَكَيْفَ نَنْصُرهُ ظَالِمًا؟ قَالَ: تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ] أخرجه البخاري: ٢٤٤٣، والترمذي: ٢٢٥٥، وابن حبان : (٥١٦٧) و (٥١٦٨) ، والطبراني في «الصغير»: ٥٧٦.

﴿ إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ ﴾، بێگومـان تـۆ بابایەکـی سـەرگەردان و بێمـرادی ڕوون و ئاشـکرای، کـە دیـارە مووسـا ﷺ زانیویەتـی بابایەکـی سـەر بـە گێچەڵـە و ئاژاوەچییـە، ئنجـا چ لـە ڕووی ئـەوەوە کـە ناسـیویەتی، ئـەوەی هەڵهێنجابـێ، کـە تـۆ دوێنـێ نەفەرێکـت لەسـەر کـوژراوە و، دەبووایـە ئەمـڕۆ هـەر لـە مـاڵ نەیـە دەرێ، یـان خـۆت پەنهـان بکـەی، نـەک دووبـارە بچیـەوە نێـو گێچـەڵ و تەشـقەڵەیەکی دیکـە، بۆیـە مـرۆڤ دەبـێ وریـا بـێ، کەسـانێک هـەن، هاوکاریـی کرانیـان، خـراپ بەکاردەهێنـن، بـۆ ئـاژاوە و گێچـەڵ و هـەرا نانـەوە، مـرۆڤ دەبـێ لـەوە وریـا بـێ و، بەهـرەی خـراپ لـە هاوکارییەکـەی وەرنەگیـرێ، لـە لایـەن کەسـانێکی ئاژاوەچیـی و، ئاشـووب گێڕەوە.

**٢١- ترسـان و چـوار چاویـی و وریایـی و خـۆ پەنهانکـردن و ڕاکـردن و هەڵاتنیـش، لـە کاتـی مەترسـییدا، شـتانێکی شـەرعیی و زگماگـن و، عەقـڵ و زگـماک دەیانخوازێ:**

ئەوەتـا مووسـا ﷺ دوای ئـەوەی بابـای قیبتیـی بەدەسـت کـوژراوە، کەوتۆتـە حاڵەتـی تـرس و بیمـەوەو، حاڵەتـی چوارچاویـی و وریـا بوونـەوە، دواییـش داوای لـە خـوای پـەروەردگار کـردوە، کـە دەربـازی بـکات لـە کۆمەڵـی سـتەمکاران، کەواتـە: ئـەوە حاڵەتێکـە کـە عەقـڵ و زگـماک دەیخـوازن و، حاڵەتێکـی شەرعییشـەو، بـە ترسـنۆکیی و بـێ غیرەتیـی لـە قەڵـەم نـادرێ، ئـەو حاڵەتـە شـتێکی سروشـتییە کـە مـرۆڤ لـە کاتـی مەترسـییدا، تـرس و دووربینیـی هەبـێ و، بکەوێتـە حاڵەتێکـی نائاسـایی دەروونییـەوە، ئـەوە شـتێکی ئاسـاییە.

**٢٢- هەمیشـە لـە کاتـی مەترسـیی سـتەمکاراندا، دەبـێ پەنـا بـە خـوا بـبردرێ و، پشـت بـە خـوا ببەسـترێ:**

ئەوەتا مووسـا ﷺ دەڵـێ: ﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، پـەروەردگارم! دەربازم بکـە، لـە کۆمەڵـی سـتەمکاران، کاتێـک دڵنیـا بـووە ڕاوێژیـان کـردوەو، پیلانیـان گێـڕاوە بـۆ گرتنـی و کوشـتنی، پەنـا بـە خـوا ﷻ دەبـات، بـەس خـوا پەنـای پەنـا پێبەرانـە و، تەنیـا خـوا پەنـای ترسـاوێنراوان و سـتەملێکراوانە، مـرۆڤ دەبـێ هیـچ کاتێـک لـەوە

غافڵ و بێ ئاگا نەبێ، کە خوا ﷻ سەرپەرشتیی ئیمانداران دەکات و لەگەڵ ستەملێکراواندایەو، لەگەڵ بەشخوراوان و مافخوراوان دایە، تەنانەت ئەگەر ئەو بەشخوراو و مافخوراو و ماف پێشێلکراو و چەوسێنراوانە، ئەهلی ئیمانیش نەبن و مسوڵمانیش نەبن و خواناسیش نەبن، خوا ﷻ هەر لەگەڵ مەزڵوومانداییە، لە بەرانبەر زاڵماندا، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

{اتَّقُوا دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، وَإِنْ كَانَ كَافِراً، فَإِنَّهُ لَيْسَ دُونَهَا حِجَابٌ} **(أخرجه أحمد: ١٢٥٧١، قال الهيثمي: فيه أبو عبد الله الأسدي، لم أعرفه، وبقية رجاله رجال الصحيح، والضياء: ٢٧٤٨،الطبراني في الدعاء: ١٣٢١، عَنْ أَنَسِ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني في الصحيحة: ٧٦٧، قال: وله شاهد بلفظ: دعوة المظلوم مستجابة وإن كان فاجراً؛ ففجوره على نفسه).**

واتە: خۆتان بپارێزن لە پاڕانەوەی بابای ستەملێکراو، ئەگەر بێبڕواش بێت، چونکە لە نێوان پاڕانەوەی ستەملێکراو و خوای پەروەردگاردا، پەردە نیە، واتە: ڕێک پاڕانەوەکەی و هاوارکردنەکەی بەرەو لای خوا ﷻ بەرز دەبێتەوە.

**٢٣- پشت بە خوا بەستن و پەنا پێبردنی و، دەست بە هۆکارەوە گرتن، دژی یەکدی نین:**

دەبینین: مووسا ﷺ وێڕای ئەوە کە پەنا بە خوا دەبات: ﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بەڵام هۆکارەکانیشی پشت گوێ نەخستوون: ﴿ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ ﴾، لە شارەکە چووە دەر، لە حاڵەتی ترس و بیمداو، لە حاڵەتی چوار چاویی و وریاییدا، ئائەوە دەست بە هۆکار گرتنە، هەم لە ڕووی جەستەییەوە، چووە دەر لە شارەکەو حاڵەتی وریایی و چوار چاویی بوو، لە ڕووی دەروونییشەوە، حاڵەتی دوور بینیی و ترسی بە خۆیەوە بینی، نەک پشتێنی لێ بکاتەوەو بێ باک بێ، بەڵام تەنیا بە دەست بە هۆکار گرتن، ئیکتیفای نەکرد، بەڵکو پەناشی برد بۆ خوا ﷻ و، پشتیشی بە خوا بەست: ﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بەڵێ: پەنا بە خوا بردن، لەگەڵ دەست بە هۆکار گرتن، دوو حاڵەتی تەولوکاری یەکدین و، پەیوەندییەکی تەولوکارییان پێکەوە هەیە، نەک پەیوەندییەکی دژیەکیی و تێکگیران.

**٢٤- پشت بە خوا بەستنی مووسا عليه السلام لەو کۆچ و سەفەرەی دا:**

وەک لەم ڕستەیەدا دیارە: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾، کاتێک ڕۆیی بەرەو لای مەدیەن، گوتی: نیزیکە پەروەردگارم ڕێی ڕاستم پێشان بدات، ڕاستە ڕێم بکات، واتە: ڕێی پێدا ڕۆیشتن، چونکە ئەو شتەی ئەو کاتە مووسا عليه السلام پێویستیی بووە، ئەوە بووە کە بە ڕێیەکی ڕاستدا، بڕوات، نەک بە ڕێیەکی لاردا، یاخود نەک بە ڕێیەکی هەڵەدا بیباتەوە بەردەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی، کە بە تەئکید بۆسەیان بۆ داناون و دەروازەکانی شاریان لێ گرتوون و، جاسووس و سیخوڕیان داناون، لەملاولایان، بۆیە مووسا عليه السلام لەو کاتەدا ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر بۆی ئاتاج بووە، ڕێیەکی ڕاست بووە، لە هەموو شتێک زیاتر پێویستی بەوە بووە، کە بە ڕێیەکی ڕاستدا بڕوات، بیگەیەنێ بەو ئامانجەی دەیەوێ، پێشەوا تەبەری لەوبارەوە ئەم دەقەی هێناوە:

[عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: خَرَجَ مُوسى مُتَوَجِّهاً إلى مَدْيَن، وَلَيْسَ لَهُ عِلْمٌ بالطَّرِيقِ إلاّ حُسنُ ظَنِّهِ بِرَبِّهِ، فإنَّهُ قَالَ: ﴿عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾]، (جَامِعُ البَيان: ٢٧٣٦٥).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: مووسا ڕۆیی و ڕووی کردە لای مەدیەن، شارەزای ڕێش نەبووە، جگە لە گومان چاکی بە پەروەردگاری، بۆیە گوتی: نیزیکە پەروەردگارم ڕاستە ڕێم بکات و، بمخاتە سەر ڕێیەک کە بە ئامانجم بگەیەنێ.

**بیرەوەرییەکی خۆم:**

لە کتێبی: (چەند مەڵۆیەک لە خەرمانی تەمەنم)دا باسم کردوە، کە منیش لە ساڵی (١٩٨١)ی زایینی کاتێک کە لە قۆناغی دووەمی کۆلێژی فیقە بووم، لە

نەجەف، هەواڵم پێدرا کە ڕژێم بڕیاری دەستگیرکردنمی داوە، لەوێوە هاتمەوە بەغداو بە شەو، دۆست و هاوەڵەکانم ئاگادار کردەوە، کە حاڵ و حسابێکی وا هەیە و، یەکسەر گەڕامەوە بەرەو سلێمانیی و دوایی هاتمەوە بۆ ڕانیە، بۆ ماڵی بابم و دایکم (ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، ئاگادارم کردنەوەو لەوێ موختاری شاری ڕانیە، مام صاڵح ڕەحمەتی خوای لێ بێ، ئاگاداری کردمەوە، کچێکی خۆی نارد بوو بۆ ماڵمان، کە دائیرەی ئەمن سۆراغی فلانکەس دەکەن و، لە منیان پرسیوە: ماڵەکەیان لە کوێیە؟ دیارە نیازیان خراپە، بێگومان یەکسەر لە بەغداوە ئەمریان بۆ هاتوە...

ئیدی ئەوە بوو من چەند ڕۆژێک لە ڕانیە مامەوە، وەک حاڵەتی خۆ پەنهان کردن، دوایی ئەوە بوو دەرچووم لە زێی گچکە پەڕیمەوە بەرەو گوندی سەرسیان و، پاشان بەرەو دێیەکانی بەردەکۆز و قەرەتەپە و مەمەنداوە، کە ئەو کاتە من تەمەنم (١٩ - ٢٠) ساڵ بوو، تاکو ئەوێ شارەزا بووم، لەوێ بەولاوە هیچی شارەزا نەبووم، ئنجا ئەوە بوو کە بەرەو لای بنگرد ڕۆیشتم، پاشان گوندەکانی (شارەستێن) و (دۆڵەبی)، دوایی لەوێوە بەرەو (مالوومە)و (قزلەر)و، دواییش (وڵاخلوو)و، ئنجا دوایی لە چۆمی (هەرزنێ) پەڕیمەوە هەر لە زێی گچکە، بەڵام لە لای گوندی هەرزنێ، شەوێش لە گوندی (نەشکان) بووم، دوایی گەیشتمە سەردەشت.

ئنجا ئەو قاچاغ بوون و دەرچوونی بەندەش لەو کاتەدا، کە ڕژێم ئەمری دەستگیرکردنمی دەرکرد بوو، زۆر دەشوبهێتە ئەم بەسەرهاتەی مووسا ﷺ چونکە منیش بێجگە لە لوتف و کەرەمی خوا ﷻ، پشتم بە هیچ شتێکی دیکە نەبەستبوو، بە تاقی تەنیا بووم و سەرەتای تەمەنم بوو، شارەزای ڕێ نەبووم، بەڵام بە تەنکید هەر کەسێک پشتی بە خوا قایم بێ، خوا زایەی ناکات و خوای پەروەردگار لەگەڵیدا دەبێ، لە یادمە لە لای گوندی (شارەستێن)، لە شارەستێن تێپەڕ بوو بووم بەرەو گوندی (دۆڵەبی) دەچووم، گەیشتمە پیاوێک

سواری ئەسپێک بوو، گوتی: کاکە بۆ کوێ دەچی؟! گوتم: دەچم بۆ لای گوندی (دۆڵەبی)، گوتی: ئەدی دوایی، بەس دەچی بۆ ئەوێ؟! گوتم: نا، لەوێشەوە دەمەوێ بچم بەرەو کوردستانی ئێران، گوتی: بۆچی؟! گوتم: حاڵ و حیسابم وایە، لە دووی زانکۆ بووم، بەڵام ئەمری دەستگیرکردنم لەلایەن ڕژێمەوە دەرچووەو، دەمەوێ خۆم دەرباز بکەم.

ئێستاش لە یادمە پێم وایە کابرا ناوی (موحەممەد) بوو، گوتی: تۆ کێی و چ کەسی؟! منیش بۆم باسکرد کوڕی فڵانکەسم و عەشیرەتی میراودەلیین و...هتد، ئنجا ئەو کابرایەش هەر عەشیرەتی میراودەلیی بوو، لە میراودەلییەکانی (بەری مەرگە) بووە، وەک لە یاداشتەکاندا باسم کردوە، گوتی: باشە ئەگەر چووی و لە چۆمی (هەرزنێ) پەڕییەوە، کەس دەناسی؟! گوتم: نەخێر هیچ کەس ناناسم، گوتی: لە چۆمی هەرزنێ کە پەڕییەوە، گوندی (هەرزنێ) هەیە، دوایی لەوێ تێدەپەڕی، گوندی (ئەشکان) هەیە، ئەگەر چووی، لەوێ من ماڵە خزمێکم هەیە، ماڵی (بابەکر ئاغا)، ئەوانیش میراودەلیین، تۆ حەوجێت بە خانە خوێیەک دەکات، لەوێ بچۆ ماڵی بابەکر ئاغا و، بڵێ: فڵانکەس دەناسم و فڵانکەسی کوڕی فڵانکەسم و، پێیان بڵێ: کە من تۆم ڕێنمایی کردوە، گوتم: باشە، هەڵبەتە ئەو کاتە من بە هەندیشم هەڵنەگرت، گوتم: کێ دەڵێ: پێویستیم بەوێ دەبێ! بەڵام دوایی ئەوە بوو، پاش چەند شەو و ڕۆژان، کە گەیشتمە ئەوێ، پەکم لەسەر ئەوە کەوتبوو، بچمە ماڵێک.

لەوێ کە گوتیان: ئێرە گوندی ئەشکانە، یەکسەر ماڵی (بابەکر ئاغا)م هاتەوە بیرو ئامۆژگاریی و ڕێنمایی ئەو ئەسپ سوارەشم، هاتەوە یادو، چوومە ماڵەکە و، زۆر باش خزمەتیان کردم و، حەواندمیانەوەو، بە کەڵکم هاتن و، ئەو شەوە خانە خوێیەکی زۆر باش و نەجیب بوون، چونکە من درەنگ گەیشتمە جێ، شەو درەنگ بوو، یەکسەر مریشکێکیان سەربڕی و سازیان کرد، هەروەها بۆ ئەوەش بە کەڵکم هاتن کە دیسان جارێکی دیکە حیزبی دیموکراتیش نامناسێ و بۆ

ئـەوە نەمگـرێ. ئنجـا ئـەوان کوڕێکیـان کادیـر یـان پێشـمەرگەی حیزبـی دیموکـڕات بـوو، لەگەڵـم هـات، بـە چیـای (زەرتـک)دا سـەرکەوتین، هەتـا گونـدێ (دەرمانـاوێ) لـەوێ چایخانەیەکـی لـێ بـوو، لەوێـش پـارەی عێراقییـم پـێ بـوو، بـۆی گۆڕیمـەوە بـە تومـەن و، سایەقێکیشـی تێکەیانـد، کاکـە ئـەم گەنجـە لەگـەڵ خـۆت بـەرەو، پێـش ئـەوەی بگەیـە بازگـەی حیـزب دایبەزێنـە، نـەوەک تەشـقەڵەی پـێ بکـەن، پێشـیگوتم: ئنجـا کـە دایـان بەزانـدی، بەوێـدا بچـۆ خـوار بـۆ لای گونـدی (کانـی ڕەش) و، لەوێـوە هەڵگەڕێـوە بـەرەو (سەردەشـت)، ئەگـەر تـۆ دەڵێـی: دەمـەوێ بچـم بـۆ لای حکوومـەت، بەڵکـو دەرفەتـم بـێ بخوێنـم، خوێندنـی زانکـۆ تـەواو بکـەم، ئـاوا بچـۆ، ئیـدی ئـەو چۆنـی ڕێنمایـی کـرد بـووم، ئـاوا چـووم...

مەبەسـتم ئەوەیـە کـە بەنـدە جـاری وایـە، زۆر شـت نازانـێ، بـەڵام خـوا ﷻ هـۆکاری وای بـۆ دەڕەخسـێنێ، کـە بـۆ خـۆی بـە خەیاڵیـدا نەهاتبـێ، هەڵبەتـە خـوا ﷻ خـوای هەمـوو لایەکـە، وەک چـۆن پـەروەردگاری مووسـا بـووە و، پـەروەردگاری ئێمەشـە و، پـەروەردگاری غەیـری ئێمەشـە، پـەروەردگاری مـارو مێـرووە و، وەک کوردەواریـی خۆمـان دەڵێـن: «خـوا ڕزقـی مـارو مێـروو دەدات»، بـەڵام دیـارە خـوا ﷻ بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە مـرۆڤ پشـتی پـێ دەبەسـتێ و، دڵـی پـێ خـۆش دەکات و، پێـی نومێـدەوار دەبـێ، خـوا ﷻ بـە دەنگیـەوە دێ و، مشـووری لـێ دەخـوات، وەک لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە فەرمایشـتی قودسـییدا، هاتـوە، خـوا دەفەرمـوێ: [أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي]، (أخرجـه أحمـد: ٩٣٤٠، والبخـاري: ٦٩٧٠، ومسـلم: ٢٦٧٥)، واتـە: مـن بـە پێـی گومانـی بەندەکەمـم بەرانبـەر بـە مـن، گومانـی بەرانبـەر مـن چـاک بـێ، چاکـی بـۆ دەکـەم، گومانـی خراپیـش بـێ، خراپـی بەسـەر دێ.

**٢٥- جوامێریـی و لـە بێهێـز و چەوسـاوان ڕانەمـان، سـیفەتێکی بـەرز و پەسـندی مووسـا بـووە و، هـی هـەر کەسـێکی دیکەشـە، کـە مـەردو جوامێـر بـێ:**

﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ﴾، یەکسـەر مووسـا بـۆ دوو ئافرەتـەکان ئاژەڵەکانـی بـۆ ئـاودان، وەک پێشـینان خۆمـان دەڵێـن: (تیغـی ڕەسـەن خـۆی لـە کالانـدا ڕاناگـرێ)، مووسـا

ﷺ کاتێک دەبینێ ئەو دوو کچە ئاژەڵەکانی خۆیان حەپس کردوە و ڕایاندەگرن، تاکو شوانەکان لێ دەبنەوە، لەو دیمەنەوە ڕانەماوە، یەکسەر ڕاپەڕیوەو چووە ئاژەڵەکانیان بۆ ئاو بدات و نەهێڵێ، ئەو ستەمەیان لێبکرێ، کە بریتیە لەوەی لەو ئاوە شلوێ و قوڕاوەی، شوانەکان ئاژەڵەکانیان لێ ئاوداوە، ئەوان ئاژەڵەکانی خۆیانی لێ ئاوبدەن، یاخود ئەوان هەموویان کاری خۆیان تەواو بکەن، ئنجا ئەو ئافرەتانە بچن ئاژەڵەکانیان ئاو بدەن، نەخێر، با یەکسەر لەگەڵ ئەوان دا ئاژەڵەکەیان ئاو بدەن.

مرۆڤ دەبێ کاتێک کە ستەملێکراوێک دەبینێ و ناهەقییەک دەبینێ، لە ستەملێکراوەکە، ڕانەمێنێ و لە ناهەقەکەشەوە ڕانەمێنێ و، بە پێی توانای خۆی، ناهەقیی دوور بخاتەوەو لایبەرێ و، ستەملێکراویش پشت بگرێ و هاوکاری بێ.

**٢٦- پێویستە مرۆڤ لە کاتی زۆر ناچاریی و سەغڵەتیی دا، تەنیا پەنا بە خوا ببات و، داوای هاوکاریی لێ بکات:**

مووسا ﷺ لەو کاتەدا، هەر خوا دەزانێ دەبێ چەند برسیی بوو بێ و، تینو و و ناڕەحەت و، ماندوو بوو بێ، جگە لە ترس و لەرزی فیرعەون و دارو دەستەکەی کە نەیزانیوە، ئایا ئەو شوێنەش هەر لە ژێر ڕکێفی فیرعەون و نەواندایە، یاخود نا؟ بەڵام لەو کاتەدا مووسا ﷺ دەڵێ چی؟! ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾، پەروەردگارم! من بۆ هەر چاکەیەک کە تۆ بۆم دابەزێنی، ئاتاجم، واتە: پێویستیم بە هەموو هاوکارییەکی تۆ هەیە، حەوجێی هەموو نیعمەتێکی تۆم: خواردن و خۆراک، بەرگ و پۆشاک، جێگاو ڕێگای تێدا حەوانەوە، دەربازبوون لە ترس و لەرز و، نەمین بوون لە خۆم، ماڵ و حاڵێک کە ببێتە مایەی سوکناییم، پێویستییم بە هەموو خێرو چاکەیەکی تۆ هەیە، بۆیەش خوا ﷻ بە پێی چاوەڕوانیی مووسا ﷺ، لەگەڵ مووسادا ڕەفتاری کردوە، بە پێی ئومێدی خێرێک کە مووسا ﷺ بەرانبەر بە پەروەردگاری هەیبووە، مامەڵەی لەگەڵدا کردوە، هەموو ئەو شتانەی بۆ ڕەخساندوون، هەم خواردن و

خۆراک، هەم جێگای حەوانەوە، هەم ماڵ و حاڵ و منداڵ، هەم کارو کاسبیی، هەم دڵنیا بوون لە ترس و لەرز.

ئنجا با ئەم نەقڵەش لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە بێنین کە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەیهێنێ لەو بارەوە کە مووسا ﷺ چەندە برسیی بووە و، چەندە ناچار بووە و، چەندە نارەحەت بووە!! کە لێرەدا مووسا دەفەرموێ: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾، مووسا ﷺ لە شێوەی موناجات و لە ڕاز و نیاز لەگەڵ خوادا، پێویستییەکەی خۆی دەردەبڕێ، ئەم نەقڵە کە دەیهێنین لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە، ئەوەمان بۆ بەرجەستە دەکات: **(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: سَارَ مُوسَى مِنْ مِصْرَ إِلَى مَدْيَنَ لَيْسَ لَهُ طَعَامٌ إِلَّا الْبَقْلَ وَوَرَقَ الشَّجَرِ، وَكَانَ حَافِيًا، فَمَا وَصَلَ إِلَى مَدْيَنَ حَتَّى سَقَطَتْ نَعْلُ قَدَمَيْهِ، وَجَلَسَ فِي الظِّلِّ وَهُوَ صَفْوَةُ اللهِ مِنْ خَلْقِهِ، وَإِنَّ بَطْنَهُ لَلَاصِقٌ بِظَهْرِهِ مِنَ الْجُوعِ، وَإِنَّ خُضْرَةَ الْبَقْلِ لَتُرَى مِنْ دَاخِلِ جَوْفِهِ، وَإِنَّهُ لَمُحْتَاجٌ إِلَى شِقِّ تَمْرَةٍ).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: مووسا لە میسرەوە چوو بەرەو مەدیەن، هیچ خۆراکێکی نەبوو، جگە لە گەڵای درەخت و لە دانەوێڵەیەک کە لە دەشت و دەر دەڕوێ، هەروەها پێخواسیش بوو، هەتا گەیشتە مەدیەن، پێستی پێیەکانی ڕۆیشت و، بە پێخواسیی و لە سێبەرێ دانیشت، کە مووساش باشترین دروستکراوی خوا بوو، لەو ڕۆژگارەدا، لە حاڵێکدا کە سکی بە پشتییەوە نووسا بوو لە برسان و، سەوزایی گەڵای درەخت و ئەو دانەوێڵانەی خوارد بوونی، لە سکییدا دەبینرا و، پێویستیی بە لەتکە خورمایەک بوو.

هەڵبەتە پێم وایە ئەمە جۆرێک لە زێدەڕۆیی تێدا هەیە، چونکە سەوزایی گەڵای درەخت و دانەوێڵە لە سکی ئینساندا، زۆر زەحمەتە ببینرێ، بەڵام بە تەنکید دیارە زۆر برسیی و ماندوو بووە، هەروەها ئەوەش کە پێخواس بووە، ئایا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) چۆنی هەڵهێنجاوە؟! یان هەر

---

(١) تفسیر ابن کثیر: ج٣، ص٣٨٣.

زیاتر بۆ بەرجەستەکردنی ناتاجیی و نارەحەتیی مووسا بووە، ئەگەرنا رەنگە پێڵاوێکی هەر لە پێ بووبێ، بە تایبەتیی کە مووسا ﷺ لە کۆشک و لە ماڵی فیرعەوندا گەورە کراوە، پێم وانیە بێ پێڵاو بوو بێ، بەڵام بە تەئکید زۆر برسیی و زۆر ماندوو و نارەحەت بووە.

دەشگونجێ ئەو قسەیەی پاڵدراوەتە لای (عبدالله بن عباس) هی وی نەبێ و (سند)ی ڕاست نەبێ.

**٢٧- زۆربەی توێژەرەوانی قورئان پێیان وایە ئەو: ﴿ شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴾ە، شوعەیب بووە، بەڵام وانییە:**

کە دوو کچەکان، دەڵێن: ﴿ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴾، دەڵێن: ئەو پیاوە پیرە بەساڵدا چووە، شوعەیب ﷺ بووە، ئەو پێغەمبەرەی، خوا بۆ (**أهل مَدْین**)و بۆ (**أَصْحَابُ الأَيْكَة**)، ڕەوانی کردوە، زۆربەیان ڕایان وایەو لە تەفسیرەکاندا هێناویانە.

بەڵام دوای لێ وردبوونەوەی زۆرو بەدواداچوونی زۆر، بۆم دەرکەوتوە، کە ئەو ڕایە ڕاست نیە و، هیچ بەڵگەیەک لەسەر ئەوە نیە، کە ئەو پیاوە بەساڵدا چووە، (واتە: بابی دوو کچەکان)، شوعەیب بوو بێ، ئنجا (**الطَّبري**) لەو بارەوە دوای هێنانی ئەو سێ ناوە:

**١)- (يَثْرُونُ ابْنُ أَخِي شُعَيْبٍ عَلَيْهِ السَّلَامُ).**

**٢)- (يَثْرَى صَاحِبُ مَدْيَنَ).**

**٣)- (هُوَ شُعَيْبٌ النَّبِيُّ ﷺ).**

گوتوویەتی: ئەو سێیانە ئەگەری هەیە، یەکێکیان ئەو بووبن، کە یەکێکییان شوعەیبە، دوایی گوتوویەتی: (**وَهَذَا مِمَّا لَا يُدْرَكُ عِلْمُهُ إِلَّا بِخَبَرٍ، وَلَا خَبَرَ بِذَلِكَ تَجِبُ حُجَّتُهُ، فَلَا قَوْلَ فِي ذَلِكَ أَوْلَى بِالصَّوَابِ مِمَّا قَالَهُ اللهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ**)[1].

---

(١ ) جامع البيان: ج٢٠، ص٦٤.

واتە: کامیان لەو سێیانە: ئایا ئەو پیاوە بەساڵدا چووەی بابی دوو کچەکان شوعەیب بووە، یان (یَثْرَی)، بووە، یان (یَثْرُونُ) بووە؟! دەڵێ: ئەوە شتێکە زانیارییەکەی بە هەواڵێک نەبێ نازانرێ و، هەواڵێکیش لەو بارەوە نیە، کە بەڵگەکەی پێویست بێ، (واتە: بەڵگەیەک پشتڕاستی بکاتەوە، مەبەستی پێ هەواڵی ئاسمان (وحي)یە)، بۆیە هیچ قسەیەک لەو بارەوە لە ڕاستییەوە نیزیکتر نیە، لەوەی کە خوا ﷻ فەرموویەتی، واتە: خوا لەسەر زاری دوو کچەکان فەرموویەتی: ﴿ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾، بابیشمان پیاوێکی بە تەمەنە، کەواتە: (الطَّبري)یش دانی بەوەدا نەهێناوە، ئەو پیاوە بە تەمەنە شوعەیب بوو بێ، بەڕاستیی (الطَّبري) بە ناهەق ناو نەنراوە (إمامُ المُفَسِّرين) پێشەوای ڕوونکەرەوانی چەمک و واتای ئایەتە موبارەکەکانی قورئان.

ئنجا ئێمە دەتوانین لەو بارەوە چەند بەڵگەیەک بێنین، کە ناگونجێ ئەو پیاوە بەتەمەن و بەساڵدا چووە، شوعەیب بووبێ:

یەک- لە نێوان ڕۆژگاری شوعەیب و مووسادا (عَلَيْهِما الصَّلاة السَّلام)، ماوەیەکی زۆر هەبووە، وەک قسەی شوعەیب بەرانبەر بە گەلەکەی لە سوورەتی (هود)دا هاتوە، دەڵێ: ﴿ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ ﴾هود، شوعەیب بە گەلەکەی خۆی (گەلی مەدیەن و ئەصحابی ئەیکە)، دەڵێ: گەلی لووطیش لە ئێوە دوور نین، مەبەستی ئەوە بووە لە ڕووی ڕۆژگارەوە، لە مێژ نیە و، دوور نیە، کە گەلی لووط فەوتاون، ئەم قسەیەش ئاماژە بەوە دەکات کە شوعەیب لە سەردەم و ڕۆژگاری لووط نیزیک بووە، ئنجا بێگومان ئیبراهیم و لووطیش مام و برازا بوون و، بەلای کەمەوە ئەوانیش (٤٠٠ - ٥٠٠) ساڵیان بەین بووە، لەگەڵ گەلی مووسا و ڕۆژگاری مووسادا ﷺ.

دوو- گەلی شوعەیب هەموویان فەوتێنراون و کەمینەیەکی بڕواداریان ماون و، ناگونجێ لە تەمەنی شوعەیبدا، ئەو کەمینەیە هێندە زۆر بوو بن، کە شوعەیب لە نێویان دا باڵا دەست بووبێ و، بە مووسا بڵێ: ﴿ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

سێ- ناگونجێ لە ڕۆژگاری شوعەیبدا مووسا چوو بێتە ئەوێ، کە دوایی خوا قڕە بڕی کردوون، ئنجا ئەگەر مووسا لە ڕۆژگاری شوعەیبدا چووبایە بۆ وێ، خوا ﷻ باس و خواسێکی دەکرد، هەروەها ئەو شوعەیبە کە پێغەمبەر بووە، باس و خواسێکی لەگەڵ مووسادا دەکرد: مووسا! وەرە من پێغەمبەری خوام و بڕوا بێنە و، حاڵی واو حیسابی وا، بەڵام ئەو پیاوە پیرە بەس داوای شوانیەتیی لێ دەکات، کەواتە: دیارە پیاوێکی بەساڵدا چووی ئاسایی بووە، بەڵێ خواناس بووە و خواپەرست بووە، بەڵام پێغەمبەری خوا نەبووە و، خاوەن پەیامێک نەبووە کە بیگەیەنێ.

چوار- ناگونجێ خوا ﷻ باسی شوعەیب نەکات و، ناوی نەهێنێ لە بەسەرهاتی مووسا و فیرعەونـدا، چونکە ئەو بەڵایەی بەسەر مەدیەن و (أَصحَابُ الأَيكَة)دا، هاتوە، ترسێنەر بووە بۆ فیرعەون، واتە: ئەگەر مووسا ﷺ و فیرعەونیش لە ڕۆژگاری شوعەیبدا بوونایە، خوا ﷻ باسی فەوتێندرانی گەلی شوعەیبی کە خەڵکی مەدیەن و (أَصحَابُ الأَيكَة)ن، دەکرد، چونکە ئەو ڕووداوێکی زۆر ترسێنەرو ڕاچڵەکێنەر دەبوو بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی.

ئـەم بەڵگانـەم بـە تـۆزێ دەسـکارییەوە لـە تەفسـیری (رَشـيد الخَطيـب الموصـلي) [1] وەرگرتـوون و، پێشـم وایـە بەڵگـەکان بەجێـن، بۆیـە بـە هیـچ جۆرێـک ناگونجـێ بگوتـرێ کـە ئـەو پیـاوە بـە تەمەنـەی بابـی دوو کچـەکان، شـوعەیب بـووە ﷺ، وەک (الطَّـبري) گوتوویەتـی: خـوا ﷻ چۆنـی فەرمـووە، هـەر وایـەو پیاوێکـی بـە تەمـەن و بەسـاڵداچوو بـووە و تـەواو.

٢٨- وەرگرتنی چوار حوکمی شەرعی لە فەرمایشتی خوا: ﴿وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾:

ئەم بەشەی ئەو دوو ئایەتە موبارەکە، چوار حوکمی شەرعیی لێ وەردەگیرێن:

یەک- کاری دەرەوەی ماڵ بۆ نموونە: شوانیی و گاوانیی، ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سەرما و گەرما، کاری پیاوانە، بەپێی فەرمایشتی خوا: ﴿وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ﴾،

---

(١) أولى مَا قيل فِي آياتِ التَّنزيل: ج٥، ص٤٨٤،٤٨٥.

دوایی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو کۆمەڵە لە خەڵک، کە ئاو دەدەن، یەکەم: ئاژەڵ ئاو دەدەن.

**دووەم:** ئەو کۆمەڵە، چەند شوانێکی پیاون، چونکە دوایی دوو کچەکان دەڵێن: ﴿حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ﴾، تاکو شوانەکان، ئاژەڵەکانیان ئاو دەدەن و دەڕۆن.

**دوو-** کاتێک ئافرەت ناچاری کاری دەرەوەی ماڵ دەبێ، پێویستە خۆی لە تێکەڵیی پیاوان بپارێزێ، ﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ﴾، گوتیان: ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین، تاکو ئەوانە ئاژەڵەکانیان ئاو دەدەن و دەڕۆن، لە ئاودان دەگەڕێنەوە.

**سێ-** ئافرەت ئەگەر لە ماڵیدا پیاوێک نەبێ، یان هەبێ، بەڵام توانای کارکردنی نەبێ، بۆی هەیە لە دەرەوەی ماڵ بە ئەندازەی پێویستیی کار بکات، چونکە دوو کچەکان پاساو بەوە دێننەوە: ﴿وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾، واتە: بۆیە ئێمە هاتووین بۆ ئاودانی ئاژەڵەکان، چونکە بابمان پیاوێکی بە تەمەنی بەساڵدا چووە، یانی: ئەگەر بە تەمەن و بەساڵداچوو نەبووایە، خۆی دەهات ئاژەڵەکانی ئاو بدات.

**چوار-** پیاوانی جوامێرو مەرد، بە بێ بەرانبەر لە کاتی کارکردنندا، هاوکاریی ئافرەتان دەکەن: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾، مووسا ﷺ هیچ چاوەڕوانییەکی لەو دوو ئافرەتانە نەبوو، واتە: ئافرەتان کاتێک کە کاریش دەکەن، لە کۆمەڵگادا، پێویستە پیاوان بۆ کارێک کە ئافرەتەکان لە بەرانبەریدا دەستەپاچە دەبن، یاخود کەم توانا دەبن و، هاوکاریان بن، بە بێ بەرانبەر.

**٢٩- ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾، یەکێک لە دوو کچەکان هات بە شەرمەوە دەڕۆیی:**

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئافرەت لە کاتی چوونە دەرو بەڕێدا ڕۆیشتنیدا، پێویستە وێڕای پۆشاکی شەرعیی، بە ئەدەب و ڕەوشتیی بەرزیش خۆی بپێچێتەوەو خۆی جوان بکات، واتە: وێڕای پۆشاکی ڕواڵەتیی، پۆشاکی مەعنەوییش کە بریتیە لە شەرم و شکۆ و ئەدەب و حورمەت، خۆی بەوەش جوان بکات و بپێچێتەوە،

چونکە ئەو ئافرەتە: بە شەرمەوە دەڕۆیی، واتە: بە شەرم و شکۆوە، هەڵبەتە چۆنیەتیی هەڵس و کەوتی مرۆڤیش، کەسایەتیی دەناسێنێ، بۆ وێنە: ئایا ئافرەت بە لەنجەو لار دەڕوات و دەیەوێ ئەندامەکانی خۆی نمایان بکات، یاخود بە شێوەیەک دەڕوات کە وەک مرۆڤێک بێتە بەرچاو، نەک وەک مێینەیەک؟.

**٣٠- ڕستەی: ﴿إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾، بە دڵنیایی بابم بانگت دەکات، تاکو پاداشتی ئەوە کە ئاژەڵەکانت بۆ ئاودایـن، بتداتـەوە:**

لێی وەردەگیرێ کە ئافرەت لە کاتی قسەکردنی لەگەڵ پیاواندا، بە ئەندازەی پێویست و گەیاندنی مەبەست بدوێ و، هەر ئەوەندەی کە پێویستە قسە بکات، نەک بکەوێتە نێو وردەکارییەکەوە، کە پێویست ناکات.

ئنجا ئەوەش کە گوتراوە: مووسا ﷺ کاتێک کە لەگەڵ کچەکەدا ڕۆیشتوە بۆ لای بابی، پێی گوتوە: تۆ لە پشتمەوە بڕۆ، لەبەر ئەوە کە کاتێک کچەکە لە پێشەوە دەڕۆیشت، با لە کراسەکەی دەدات و بە بەدەنیەوە دەچەسپا و ئەندامەکانی بەرجەستە دەکردن، هەڵبەتە هەر ئەوە شایستەی پیاوێکی جوامێرو مەردی وەک مووسایە ﷺ، پێش پێغەمبەرایەتییش، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، ئەوەش هەر زیاتر خەیاڵ و ئەندێشەی زانایان، دروستیکردوە، بە تەئکید ڕەوشتێکی جوانی شایستەی مووسایە ﷺ، بەڵام ئایەتەکان ئەوە ناگەیەنن.

**٣١- ئەدەبێکی بەرزی خانەخوێیی لە ڕستەی: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، واتە: کاتێک مووسا هات بۆ لای و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە باس و خواسی خۆی، بۆ کرد، گوتی: مەترسێ دەربازت بووە لە کۆمەڵی ستەمکاران:**

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە پێویستە بابای خانە خوێ و پەنادەر، میوانەکەی دڵخۆش بکات و ترس و بیمی بڕەوێنێتەوەو، شادمانی بکات و، دڵنیای بکات لە کاتێکدا ئەو میوانە پێویستی بەوە بێ.

**٣٢- چاکەو جوامێریی بەکرێ و بەرامبەر ناکرێ:**

**(القُرطُبي) دەڵێ: دوای ئەوەی پیاوە ساڵحەکە، خواردن بۆ مووسا ﷺ ساز دەکات، مووسا ﷺ دەڵێ: (لا آكلُ نَحْنُ أَهْلُ بَيْتٍ لا نَبيعُ دِينَنا بِملءِ الأَرضِ ذَهَباً)[1]، واتە: ناخۆم چونکە ئێمە بنەماڵەیەکین، لە ماڵێکدا پەروەردە کراوین، کە دینەکەمان بە پڕی زەوی زێڕ ناگۆڕینەوە، واتە: من کە هاوکاریی ئەو دوو کچەی تۆم کردوە، وەک دینداریی کردوومە، وەک ئەرکێکی شەرعیی و دینیی و، بە بەرانبەر نەمکردوە، تاکو ئێستا نان لە ماڵی تۆ بخۆم، بۆیە ئەویش پێی دەڵێ: لە بەرانبەر هاوکارییەکەتدا نیە، ئێمە عادەتمان میوانداریی کردن و خواردن پێدانی بابای غەریبە.**

**هەڵبەتە هەم قسەکەی مووسا، شایستەی مووسایەو، هەم قسەکەی دیکەش، شایستەی ئەو پیاوە بەتەمەن و بەساڵداچووەیە، بەڵام دیسان ڕواڵەتی نایەتەکان ئەوە ناگەیەنن و، ئەوە زیاتر هەڵهێنجانێکە، بەڵام بە دڵنیایی هەم لەگەڵ کەسایەتیی مووساداو، هەم لەگەڵ کەسایەتیی ئەو پیاوە ساڵحە بەتەمەندا چووەدا، گونجاوە.**

**٣٣- وەرگرتنی ڕەوایی کارکردن بەکرێ، لە ڕستەی: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ﴾، کچەکە بۆ بابی پێشنیار دەکات و دەڵێ: ئەی بابە گیان! بە کرێی بگرە، واتە: بیکە بە شوان:**

**لێی وەردەگیرێ کە (إجارة) واتە: بە کرێ کار کردن، لە هەموو بەرنامەکانی خوادا ڕەوا بووە و، ئەوە پێویستییەکی ژیانی مرۆڤایەتییە کە مرۆڤەکان پێویستیان بە هاوکاریی یەکدییە و، کەسێک کە توانای ماددیی هەیە و، پێویستیی بە کەسێک هەیە، کاری بۆ بکات، ئەو توانا ماددییەکەی لە خزمەت ئەو کەسەدا دادەنێ، کە کاری بۆ دەکات، لە بەرانبەرەکەی کارو لەویش پارە، یاخود مەسرەف کێشان و پێداویستیی دابینکردن، ئەوە هەم شتێکی ڕەوایە و، هەم شتێکە کە عەقڵ و زگماکی سەلیم دەیخوازێ.**

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢١٧.

**٣٤- حەزنەکردنی ئافرەت وەک خوازسک لە کاری دەرەوەی ماڵ :**

هەروەها ڕستەی: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ﴾، ئەوەش دەگەیەنێ کە دوو کچەکان، وەک شتێکی زگماکیی حەزیان لە دەرەوە نەبووە بۆ کاسبیی کردن و، خۆزگەیان خواستوە ئەو کارەیان لە کۆڵ بکەوێ، چونکە هەر لەگەڵ مووسایان بینیوە کە بە کەڵکی کارەکەی ئەوان دێ، کە وەک ڕستەکەی دوایی دەیگەیەنێ: هەم بەهێزە بۆ ئەنجامدانی کارەکە، هەم ئەمینداریشە، دەست پاکە و جێی دڵنیاییە، یەکسەر بۆ بابیان پێشنیار کردوە، کە بە کرێی بگرێ و بیکاتە شوان.

**٣٥- ڕستەی: ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾، بە دڵنیایی باشترین کەسێک تۆ بە کرێی بگری، (بیکەیە شوان) بە هێزی ئەمیندارو دەست پاکە:**

لێی وەردەگیرێ کە: هێز و دەستپاکیی (القوة والأمانة) دوو مەرجی سەرەکیی هەر کارێکن، دیارە هەر کارەش، ئەو سیفەتانەی کە ئەنجامدانی ئەو کارە پەکی لەسەریان کەوتوە، تێیدا بە مەرج دەگیرێن، کە هێز و پێز و توانا بۆ ئەنجامدانی کارو، ئەمینیی و دەستپاکیی، دوو مەرجن زۆربەی هەرە زۆری کارو چالاکییەکان پێویستییان پێیانە.

**٣٦- هێز و دەستپاکی دوو سیفەتی گەورە و گرنگی کار پێ سەپێررانن :**

هەروەها ئەو ڕستەیە: ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾، لێی وەردەگیرێ کە کچە پێشنیارکەرەکە، هەر کام لە: هێز و دەستپاکیی، لە مووسادا عليه السلام دیون، بۆیە وادەڵێ، ئنجا لەو بارەشەوە قسە زۆرن، گوایە بابی لێی پرسیوە: چۆن دەزانی بەهێزە؟! ئەویش بۆی باس دەکات کە چۆن بە تەنیا ئاژەڵەکانی بۆ ئاوداون، کە یان زۆر بەهێزەو ئاوی لە بیرەکە هەڵهێنجاوە، بە دۆڵچە، یان بەردەکەی لەسەر زاری بیرەکە لابردوەو، مەڕەکانی باش خڕکردوونەوە سەر یەک و، هێناونی و بردوونی و ئاوی داون، هێز و پێزی پێوە بینیوە، هەروەها ئەمانەتیشی پێوە بینیوە، ئەمانەتەکەش وا پێدەچێ هەر لە خودی ئاژەڵ ئاودانەکەدا بینیبی،

کە زۆر چاک لێ دەگەڕێ ئاژەڵەکان ئاو بخۆنەوەو، بە پاکیی و چاکیی کارەکە ئەنجام دەدات.

هەندێکیش دەڵێن: کچەکە گوتوویەتی: لەوەوە بۆم دەرکەوتوە ئەمین و دەستپاکە - کە دیارە پێچەوانەی ئەمانەت، خیانەتە - کاتێک من کەوتمە پێشی بۆ ماڵێ، بۆ ئەوەی بێینەوە، ئەو گوتی: تۆ بکەوە دوام، بەڵام لە دوامەوە ڕا ئاماژەم بۆ بکە، لە کوێوە بڕۆم؟ چونکە با لە پۆشاکەکەیداوە و بە بەدەنیەوە چەسپاندوویەتی! گرنگ ئەوەیە ئەو کچە پێشنیارکەرە، هەر کام لەو دوو سیفەتەی لە مووسادا بەدی کردوون، ئنجا جێی سەرنجیشە کە نەیگوتوە: (هذا الرَّجُلُ قَوِيٌّ أَمِين)، بەڵکو دەڵێ: ﴿إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾، باشترین کەسێک کە بە کرێی بگری بۆ شوانیی، ئەوەیە بەهێز بێ و ئەمیندار بێ، بۆ ئەوەی نەبێتە ستایشی ڕووبەڕوو، پاشان ئەوەی لێ وەربگیرێ کە ئەو کچە تەماعی لە مووسا کردوە، چونکە ئەوەی بە لایانەوە گرنگ بووە، ئەوە بووە، شوانێکیان بۆ پەیدا بێ.

**٣٧- ڕستەی: ﴿إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ﴾، من دەمەوێ یەکێک لەم دوو کچانەمت لێ مارە بکەم، بیکەمە هاوسەرت، بناغەی هاوسەرگیریی دیاریی دەکات:**

ئەو ڕستەیە لێی وەردەگیرێ کە بناغە لە مارەکردنی ئافرەتدا، بابە، سەرپەرشتیاری ئافرەت، بە پلەی یەکەم، بابە، ئنجا ئەگەر باب نەبوو، مام و، برا، وەک لە کتێبە فیقهییەکاندا باسکراوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئافرەت خاوەن ڕا و ڕەزامەندیی نەبێ لە هاوسەرگیرییدا و، پێشنیاری کچەکەش ڕەزامەندیی کچەکەی دەرخستوە، کە کچەکە پێشنیار دەکات، دیارە کچەکانیش بێ هاوسەر بوون و، کاتی شووکردنیشیان بووە، ئنجا گەنجێکیش هەڵکەوێ لەو ماڵەدا شوانییان بۆ بکات، ماوەی (٨ - ١٠) ساڵ، عەقڵ و مەنتیق وا دەخوازێ کە ببێتە مەحرەمی ئەو ماڵە، واتە: پێشنیارکردنی کچەکە ئەوەش دەگرێتە نێو خۆی و، ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەوە زەمینە خۆشکردنە بۆ هاوسەرگیریی.

**٣٨- ئایا بەکارهێنانی وشەکانی (إنكَاح) و (تَزويج) مەرجی مارەکردنن؟!**

ڕستەی پێشوو کە دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ﴾، پێشەوا شافیعیی کردوویەتی بە بەڵگەی دانەمەزرانی هاوسەرگیریی، بە جگە لە وشەکانی: (**التَّزويج والإنكَاح**)، کە ئەوە ڕای ڕەبیعە و ئەبوو سەور و ئەبوو عوبەیدو داوودو مالیکیشە، لەگەڵ ڕاجیاییدا، بەڵام زانراو لە مەزهەبی ئیمام مالیکدا ئەوەیە کە: (**يَنعَقِدُ النِّكاحُ بِكُلِّ لَفظٍ**) گرێبەستی هاوسەرگیریی بە هەر بێژەیەک دادەمەزرێ و، ئەبوو حەنیفەش گوتوویەتی: (**يَنعَقِدُ بِكُلِّ لَفظٍ يَقتَضِي التَّمليكَ على التَّأبيد**)، گرێبەستی هاوسەرگیریی بە هەر بێژەیەک دادەمەزرێ، کە کردنە خاوەن بخوازێ بۆ هەمیشەیی، کردنە خاوەن بەو واتایە کە ئەو پیاوە دەبێتە خاوەنی ئەو ئافرەتە و، هەروەها ئەو ئافرەتەش بە هەمان شێوە دەبێتە خاوەنی و، دەبێتە هاوسەری ئەو پیاوە، ئەمە هەمووی (**القُرطُبِي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، هێناویەتی.

بەڵام بە ڕای من ڕای ڕاست ئەوەیە کە ئەم بێژانە: (**تزويج، إنكاح، هبة، تمليك**)، مەگەر واتایەکانیان نەگەرنا خودی بێژە (**لفظ**)ەکان، بە مەرج نەگیراون، ئەم مەسەلەیە پەیوەستە بە کلتوورو نەریتی کۆمەڵگایەکانەوە، گرنگ ئەوەیە بزانرێ کە ئەو ئافرەت و پیاوە دەبنە هاوسەرو حەڵاڵی یەکدی، واتە: تەعبیرێک بەکاربهێنرێ و، بێژەیەک بەکاربهێنرێ کە ئەوە بگەیەنێ، نەگەرنا بابایەکی هیندیی کە هاوسەرگیریی دەکات، یاخود ڕووسییەک، یاخود ئینگلیزێک، یاخود یابانییەک، یان چینییەک، ناچێ وشەی تەزویج و ئینکاح بەکاربێنێ و هەر تێشیناگەن، کەواتە: لە ڕاستییدا ئەگەر بۆ ئێمە وەک کورد یان فارس یان تورک، وشەی زەواج و نیکاح، یان تەزویج و ئینکاح، وشەی بەکارهێنراو و بیستراون، بەڵام بۆ ئەو گەل و نەتەوانەی دیکە، ئەو وشانە زۆر شتی نامۆ (غریب)ن، کەواتە: ئەصڵ ئەوەیە وشەیەک و تەعبیرێک بەکاربهێنرێ، بە ڕوونیی ئەوە بگەیەنێ کە

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢١٨.

ئەو ئافرەتە دەخوازرێ بۆ ئەو پیاوەو، ئەو ئافرەتە دەبێتە هاوسەری ئەو پیاوە و دەبنە ژن و مێرد.

**٣٩- پێشنیارکردن جیایە لە لێ مارەکردن:**

بێگومان قسەی پیاوە بە تەمەنەکە، **(الشَّيخُ الكَبير)** کە دەڵێ: ﴿إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ﴾، یەکێک لەم دوو کچەمت لێ مارە بکەم، ئەمە پێشنیارێک بووە و سەر پشککردنی مووسا بووە نەک مارەکردن، چونکە مارە کردن دەبێ دیاریی کردن (تَعيين)ی تێدا بێ، بەڵام جارێ دیار نیە کامیانە، کەواتە: ئەوە سەرپشککردنی مووسا بووە، کە ئەو دوو کچە تەماشا بکە، کامیان دڵت بیگرێ، من دەمەوێ لە تۆی مارە بکەم و، دوای ئەوەی مووسا دیاریی دەکات، ئنجا لێی مارە دەکات، شەرعزانان **(فقهاء)** دەڵێن: ئەگەر کەسێک لە نێوان سێ ئافرەتدا بڵێ: یەکێکیانت لێ مارە دەکەم، هەتا یەکیان دیاریی نەکرێ، بە مارەکردن لە قەڵەم نادرێ.

**٤٠- پێشنیارکردنی مرۆڤ بۆ کچەکەی، یانی: مرۆڤ کچی خۆی پێشنیار بکات، بۆ پیاوێکی شایستە، شتێکی ڕەوا و ڕێپێدراوە و نەریتێکی لە مێژینەیەو، ئەمە هەر بووە (القُرطُبي)[1] دەڵێ:**

**(عَرَضَ صَالِحُ مَدْيَنَ ابْنَتَهُ عَلَى صَالِحِ بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَعَرَضَ عُمَرُ ابن الْخَطَّابِ ابْنَتَهُ حَفْصَةَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُثْمَانَ، وَعَرَضَتِ الْمَوْهُوبَةُ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَمِنَ الْحَسَنِ عَرْضُ الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ، وَالْمَرْأَةُ نَفْسَهَا عَلَى الرَّجُلِ الصَّالِحِ، اقْتِدَاءً بِالسَّلَفِ الصَّالِحِ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَمَّا تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ قَالَ عُمَرُ لِعُثْمَانَ: إِنْ شِئْتَ أُنْكِحُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ..[2]).**

واتە: لەم ئایەتە، لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ کە بابای سەرپەرشتیاری ئافرەت، بۆی هەیە کچی خۆی پێشنیار بکات بۆ پیاوێک و، ئەمەش ڕێوڕەسمێکی بەردەوام بووە، ئەوەتا پیاوە چاکەکەی مەدیەن، کچەکەی خۆی پێشنیار دەکات بۆ

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢١٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٠٠٥.

پیاوە چاکەکەی بەنوو ئیسرائیل (کە مووسایە)، عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) کچەکەی خۆی پێشنیار کردوە بۆ ئەبوو بەکرو عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها ئەو ئافرەتە کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ دەکات، خۆی بۆ ئەو پێشنیار کردوە، بۆیە وا باشە پیاو، ئافرەتێک کە لە ژێر چاودێریی دایە، پێشنیاری بکات بۆ پیاوێکی شایستە، هەروەها ئافرەتیش بۆی هەیە خۆی پێشنیار بکات بۆ پیاوی چاک، وەک شوێنکەوتنی پێشینی چاک، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: کاتێک حەفصە بێوەژن بوو، حەفصەی خوشکی، عومەر بە عوسمانی گوت: ئەگەر دەتەوێ با حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە بکەم، هەم بۆ عوسمانی پێشنیار کردوە، هەم بۆ ئەبوو بەکر، بەڵام هەردووکیان وەڵامەکەیان، یان بێدەنگیی بووە، یاخود پۆزش هێنانەوە بووە، دوایی عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) بۆی دەرکەوتوە کە ئەبوو بەکرو عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویانە: ئێمە لە پێغەمبەری خوامان ﷺ بیستبوو، کە باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە وەڵاممان نەدایەوە، نەدەگونجا نهێنیی پێغەمبەر بدرکێنین، ئەگەرنا ئەگەر زانیبامان پێغەمبەر ﷺ بەتەما نیە هاوسەرگیریی لەگەڵ دا بکات، ئێمە هاوسەرگیریمان لەگەڵ دا دەکرد، ئەوکاتە دیارە عومەر (خوا لێی ڕازیبێ) دڵی چاک بۆتەوە، ئەگەرنا شتێکی چۆتە دڵ، کە بۆچی دەبێ پێشنیارەکەم وەرنەگرن؟!

**٤١- ناوی دوو کچەکان و مووسا کامیانی هێناوە؟زانایان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە کە:**

**أ)- دوو کچەکان ناویان چی بووە؟!**

**ب)- مووسا کامیانی مارە کردوە؟!**

جارێ لە بارەی ناویانەوە گوتوویانە: لیا و صەفووریا، یاخود (صفورة) بوون و، مووسا ﷺ صەفووریای هێناوە، کە کچە گچکەکەیان بووە، هەندێکیش گوتوویانە: نەخێر، بەڵکو صەفووریا کچە گەورەکەیان بووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لەو بارەوە نیە، شایانی پشت پێبەستن بێ و، ئەوە هەمووی لە پەیمانی کۆن،

لـە تـەورات (سـفر الخـروج) کـە یەکێکـە لـە چـوار سـیفرەکەی تـەورات، لـەوێ وەرگیـراوە، قسـەی خـاوەن کتێبانیـش، جوولەکـەو نەصرانییـەکان، بـۆ بەرچـاو ڕوونیـی بەکاردەهێـنرێ، بـەڵام پشـتی پێنابەسـترێ و، لێـی دڵنیـا نیـن کـە وایـە، مەگـەر لەگـەڵ قوڕئانـدا، یـان لەگـەڵ سـوننەتی پێغەمبـەردا ﷺ بگونجـێ، یاخـود عەقڵـی سـەلیم بیخـوازێ، یاخـود واقیـع ئـەوە بگەیەنـێ.

٤٢- نارەوایی شیر بەها و، ڕەوایی کارکردنە مارەیی:

ڕسـتەی: ﴿ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِى ثَمَٰنِىَ حِجَجٍ ﴾، کـە بـە کـرێ کارم بـۆ بکـەی، مـاوەی هەشـت سـاڵان، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە: (الإِجَارَةُ المَذْكُورَةُ جُعِلَت مَهْرًا لِلبِنْتِ)، ئـەو بە کـرێ گرتنـە ناوبـراوە، کراوەتـە مارەیـی ئافرەتەکـە، ئنجـا لێـرەدا زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە ئیشـکالی تێدایـەو، ئیشـکالەکەش ئەوەیـە: چـۆن دەبـێ بـاب، لـە بەرانبـەر مارەکـردنی کچەکەیـدا بەهرەمەنـد ببـێ؟! واتـە: ئـەوە جۆرێکـە لـە کـچ فرۆشـتن، بەڵکـو مارەیـی دەبـێ بـدرێ بـە ئافرەتەکـە خـۆی، نـەک بابـی و دایکـی و خزمانـی کـە بـە کوردیـی (شـیر بەهـای) پێدەڵێـن! زانایـان لێـرەدا سـێ وەڵامیـان داونـەوە:

وەڵامـی یەکـەم: دەڵێـن: کچەکـە ڕازیـی بـووەو، پێشـتر لەگـەڵ بابـی دا ڕێـک کەوتـوە، شـوانیی کردنەکـەی مووسـاش ﷺ بـۆ ئـەو ماڵـە، هـەم بـە قازانجی کچەکـە تـەواو بووە، ئـاژەڵ لەوەڕانـدن و شـوانییەکەی لـە کـۆڵ کەوتـوە، هـەم بـە قازانجـی بابـی و، هـەم بـە قازانجـی خوشـکەکەی و، دایکیـان و هەمـوو ئەوانەشـی کـە لـە ماڵەکـەدا بـوون، ئەو کچە ئـەو کارەی لـە کـۆڵ ماڵـێ خسـتوە و، شـوانێکی بـۆ بابـی پەیداکـردوەو لە مافەکـەی خۆی و، خۆیشـی لێـی بەهرەمەنـد بـووە و، مـاڵ و دایـک و بابیشـی بەهرەمەند کـردوە.

وەڵامـی دووەم: ئەوەیـە کـە لە شـەریعەتی ئـەوان دا، دروسـتبووە بـاب و، ئەندامانی مـاڵ، لـە مارەیـی ئافـرەت بەهرەمەنـد بن.

وەڵامـی سـێیەم: چونکـە پێکـەوە ژیـاون، هەرچەنـدە بـە ڕواڵـەت بابـی وایگوتـوە، بـەڵام هەموویـان لـە کرێکارییەکـەی مووسـا بەهرەمەنـد بـوون، کـە ئـەوەش لـە

یەکەمەوە نیزیکەو، بەتەئکید مرۆڤ کاتێک لە مافێکی خۆی خۆش دەبێت، ئەگەر هەر مارەیی ڕووتیش بێ، ئەو کچە کە لەسەری مارە دەکرێ، دوایی بیبەخشێ بە بابی، بە دایکی، بە خزمێکی، بە برای، یان بە کەسێکی، بە دەستە خوشکێکی، یان بە هەژارێک، ئەوە مافی خۆیەتی و دەتوانێ بیبەخشێ.

**٤٣- مارەیی ئافرەت مەرج نیە تەنیا پارە و سامان بێ:**

ڕستەی: ﴿ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ ﴾، کە ماوەی هەشت ساڵان بە کرێ کارم بۆ بکەی، لێی وەردەگیرێ، کە ئەگەر ڕاست بێ: **(شَرْعِ مَنْ قَبْلَنَا شَرْعٌ لَنَا)** شەرعی ئەوانەی پێشێ، بۆ ئێمەش شەرعە: مارەیی ئافرەت دەگونجێ ئیش و کارێک بێ، نەک ماڵ و سامانێکی دیاریکراو، وەک ئەم دەقەش دەیگەیەنێ:

**{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ لَكَ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ: رَجُلٌ زَوِّجْنِيهَا، قَالَ: قَدْ زَوَّجْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ} (أخرجه البخاري: ٢١٨٧).**

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! خۆم پێشکەشی تۆ کرد، پیاوێکیش لەوێ گوتی: لە منی مارە بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر ئەوەی لە قورئان دەیزانی، لێمان مارە کردی (واتە: فێری قورئانی بکە).

**٤٤- ئایا مووسا ﷺ دە ساڵەکەی تەواو کردن، یان تەنیا هەشت ساڵەکە؟!**

لە ڕاستیی دا هیچ بەڵگەیەک لەسەر هیچ کامیان نیە و، زانایان زۆریان قسە کردوە.

بەڵام بە پێی گومانی چاک بە مووسا ﷺ بردن و، بە پێی ئەو جوامێریی و مەردایەتییەی کە لێی دەرکەوتوە، دەبێ دە (١٠) ساڵەکەی تەواو کردبن و، لەو بارەشەوە ئەم دەقە هەیە، بەڵام زانایان لەسەر سەنەدەکەی مشت ومڕیان هەیە:

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَجَلَيْنِ قَضَى مُوسَى؟ قَالَ: «أَوْفَاهُمَا وَأَبَرَّهُمَا «قَالَ» وَإِنْ سُئِلْتَ: أَيُّ الْمَرْأَتَيْنِ تَزَوَّجَ؟ فَقُلِ الصُّغْرَى مِنْهُمَا»، وَهِيَ الَّتِي جَاءَتْهُ فَدَعَتْهُ، هِيَ الَّتِي قَالَتْ: يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ} (أخرجه الطبراني في الصغير: ٨١٥، والبزار: ٢٢٤٤، وأخرجه أيضًا الطبراني في الأوسط: ٥٤٣٠)[1].

واتە: ئەبوو ذەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر پرسیارت لێ کرا: مووسا کام لە دوو کاتەکەی تەواو کرد، دە ساڵەکە یان هەشت ساڵەکە؟ بڵێ: باشترینیان و تەواوترینیان، واتە: (دە ساڵەکەی تەواو کرد)و ئەگەر پرسیارت لێ کرا: کام لە دوو ئافرەتەکانی خواست و بوو بە هاوسەری؟ بڵێ: گچکەکەیان، ئەو بوو کە لە دوای چوو، ئەویش بوو کە پێشنیاری کرد، گوتی: ئەی بابە! بە کرێی بگرە بۆ شوانیی، باشترین کەس کە بە کرێی بگری، بابایەکی بەهێزی ئەمیندارە.

**٤٥- شوێنی دواندنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺ و کردنی بە پێغەمبەر:**

ئەگەر سەرنجی کۆی ئەو ئایەتانە بدەین، کە لەو بارەوە هاتوون، بە باشی دیمەنی ئەو شوێنە و، وردەکارییەکانی ئەو ڕووداوە مەزنەمان، بۆ ڕوون دەبێتەوە:

**أ)- لە سووڕەتی (طه)دا، ئایەتەکانی: (٩ - ١٦)، خوا ﷻ لە میانی ئەو ئایەتانەدا، هەندێک وردەکاریی دەخاتە ڕوو لە بارەی ئەو ڕووداوەوە، کە بریتیە لە دواندنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺ کە لە شوێنەکانی دیکەدا، نەهاتوون، با تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، کە تیشکی باش دەخەنە سەر ئەو ڕووداوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ ﴾، ئەی موحەممەد ﷺ! ئایا بەسەرهاتی مووسات پێگەیشتووە؟ ﴿ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ ﴾، کاتێ ئاگرێکی بینی، بە هاوسەرەکەی گوت: لێرە بمێننەوە، ﴿ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا ﴾، من

---

(١) قال الهيثمي (٢٠٤/٨): في إسناد الطبراني عويد بن أبي عمران الجوني، ضعفه ابن معين وغيره ووثقه ابن حبان، وبقية رجال الطبراني ثقات.

ئاگرێکم بەدی کردوە، مایەی هۆگرییمە، ﴿ لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ ﴾، بەڵکو لەو ئاگرەوە بڵێسەیەک یاخود بزووتێکتان بۆ بێنم، ﴿ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴾، یاخود لەسەر ئاگرە، لە لایەن کەسانێکەوە کە ئەو ئاگرەیان کردۆتەوە، ڕێنماییەکتان بۆ بێنم، دەربارەی ڕێیەکە (دیارە ڕێیان لێ تێکچوە)، ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾، کاتێک چووە لای ئاگرەکە، ئەوەی کە مووسا ﷺ بە ئاگری تێگەیبوو، ئەگەرنا ڕووناکیی بوو، ڕووناکییەکی تایبەت بوو، بانگ کرا: ئەی مووسا! ﴿ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ ﴾، بە دڵنیاییی من پەروەردگارتم، ﴿ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ﴾، ئنجا پێڵاوەکانت دابنێ، ﴿ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ ﴾، بە دڵنیاییی تۆ، لە دۆڵی بە پاکگیراو دای، کە پێی دەگوترێ: ﴿ طُوًى ﴾، لە جێیەکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ فِي ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ ﴿٣٠﴾ ﴾القصص، ﴿ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ ﴾طه، منیش تۆم هەڵبژاردوە، بۆیە گوێ هەڵبخە، بۆ ئەوەی سروش دەکرێ، ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ ﴾، (نێوەڕۆکی وەحییەکە ئەوەیە): بە دڵنیاییی منم خوا ﷻ، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ ﴾، جگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ فَٱعْبُدْنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾، ئنجا بمپەرستە و نوێژ بۆ یادکردنی من بەرپا بکە، ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا ﴾، بە دڵنیاییی ئاخیر زەمان (ٱلسَّاعَةَ)، (ئەو کاتەی دنیایی تێدا کۆتایی دێ)، هاتوویە، خەریکم پەنهانی بکەم لە خۆشم، ئەوەندە کاتەکەی پەنهانە، کەس نایزانێ، ﴿ لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسِۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ ﴾، بۆ ئەوەی هەر کەسە بەپێی ئەوە کە کۆششی کردوە و، هەوڵیداوە، سزا یاخود پاداشت، بدرێتەوە، ﴿ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾، ئنجا با کەسێک کە بڕوای پێی نیەو، شوێن ئارەزووی خۆی کەوتوە، تۆ نەگێڕێتەوە لە بڕوا پێ هێنانی، ﴿ فَتَرْدَىٰ ﴾، ئەگەرنا تۆ دەفەوتێی و بە هیلاک دەچی، بە هۆی بێ بڕواییەوە، تووشی سزا دەبی.

ب)- لە سوورەتی (مریم)یش دا، ئایەتەکانی: (٥١ - ٥٣)، هەر باسی ئەو ڕووداوە دەکەن: ﴿ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ

ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: لە کتێب دا یادی مووسا بکە، کە هەم ڕەوانەکراو بوو، هەم هەواڵ پێدراو بوو، ﴿ وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ ﴾، لە لای ڕاستی چیای طووڕەوە بانگمان کرد، ﴿ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا ﴾، لە خۆمان نیزیکمان خستەوەو، دواندمان بە شێوەی تایبەت، ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴾، بە هۆی بەزەیی خۆمانەوە، هاڕوونی برایمان پێدا، وەک پێغەمبەر (لەسەر داوای ئەو بۆتە پێغەمبەر).

ج)- لە سووڕەتی (النمل)دا هەمان بابەت بە تەعبیرێکی دیکە، دەیهێنێ: ﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک مووسا ﷺ بە هاوسەرەکەی گوت: من ئاگرێکم بەدی کردوە، بە دڵنیایی لەلای ئەو ئاگرەوە هەواڵێکتان بۆ دێنم، یاخود بزووتێکتان بۆ دێنم (بڵێسە ئاگرێک بە دارێکەوە)، بەڵکو ئاگری پێ بکەنەوەو گەرم ببنەوە.

د)- لە سووڕەتی (القصص)یش دا، ئەوە دیارە وەک پێشتر هێنامان، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

هـ)- لە سووڕەتی (النازعات)یش دا، دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: ئایا هەواڵی مووسات پێ نەگەیشتوە، کاتێک پەروەردگاری بانگی کرد، لە شیوی بە پاکگیراوی طوادا، لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُبَٰرَكَةِ ﴿٣٠﴾ ﴾القصص، پڕ پیت و پێز، ﴿ طُوًى ﴾، چیایەکە ناوی (طُوًى) بووە، یاخود (طُوًى) یانی: چەند جارێک.

ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ، کـە مووسـا ﷺ دەبـێ ڕوو بـە کەعبە ڕاوەسـتا بـێ و، لای ڕاسـتی بۆتـە خۆرئـاوا و، لای چەپـی خۆرهـەڵات، عـەرەب عادەتیـان وابـووە کەعبـە بکەنـە چـەق، کەسـێک ڕوو بـە کەعبـە ڕادەوەسـتێ، ئنجـا لای ڕاسـت و چەپـی و

باکوورو باشووری، دیاریی دەکرێ، تۆ دەبێ شوێنێک ببێتە چەق، ئنجا تێ دەگەی داخۆ لای ڕاست دەبێتە کوێت و، لای چەپ دەبێتە کوێ و...هتد، ئێستا ئەگەر ئینسان بەرەو باکوور بوەستێ، لای ڕاستی دەبێتە خۆرهەڵات و، لای چەپی دەبێتە خۆرئاوا، بەڵام ئەگەر بەرەو باشوور بوەستێ، بە پێچەوانەوە دەبێ و، ئەگەر بەرەو کەعبە بوەستێ، جۆرێک دەبێ.

کەواتە: شوێنی دواندنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺ و کردنی بە پێغەمبەر لە کۆی ئەو ئایەتانە، بۆمان دەردەخات، کە دەبێ ڕوو بە کەعبە وەستابێ، لای ڕاستی بۆتە خۆرئاوا، ئنجا لە لای ڕاستی کێوی طوورەوە، پارچە زەوییەک بووە، درەختێکی تێدا بووەو لەو درەختەوە بانگ کراوە.

**٤٦- چۆنیەتی دواندنی خوا ﷻ بۆ مووساو، پێدانی دوو موعجیزەکەی:**

ئەمیش خوا ﷻ لە کۆی ئەو ئایەتە موبارەکانەدا، کە باسی ئەوە دەکەن، ڕوونی کردۆتەوە: چۆن مووسای ﷺ دواندوەو دوو موعجیزەکەی چۆن پێدان؟

أ- لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ١٣ ﴾، واتە: من تۆم هەڵبژاردوە، گوڵبژێر کردوە، گوێ هەڵبخە بۆ ئەوەی بۆت سروش دەکرێ.

ب- لە سوورەتی (الفُرقان)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلۡنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرٗا ٣٥ فَقُلۡنَا ٱذۡهَبَآ إِلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرۡنَٰهُمۡ تَدۡمِيرٗا ٣٦ ﴾، واتە: بە دڵنیایی کتێبمان بە مووسادا و، هارِوونی برایمان لەگەڵی کردە وەزیر، (واتە: پاڵپشت) و، پێمان گوتن: بڕۆن هەردووکتان بەرەو لای ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ داناون، سەرەنجام ئێمە کاولمان کردن، بە کاولکردن و تەختمان کردن.

ج- لە سوورەتی (الشُّعراء)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، بەم شێوەیە خوا ﷻ ئەو مەسەلەیە باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئۡتِ ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ ١١ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ١٢ وَيَضِيقُ صَدۡرِي

وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿١٧﴾ ﴾، لێرەدا چۆنیەتیی کرانی مووسا ﷺ بە پێغەمبەرو دوێندرانیی و، نێوەڕۆکی پەیامەکەشی چی بووە، خوا ﷻ دەیخاتە ڕوو.

د- لە سوورەتی (النمل)دا، خوا ﷻ ئەو مەسەلەیە بەم شێوەیە دەخاتەڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: دەستیشت بخە یەخەتەوە بەسپێتی و بێ نەخۆشیی و زیان دێتەدەرێ، بە نۆ نیشانە و بەڵگەوە بچۆ بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی بە دڵنیایی ئەوان گەلێکی لادەرو لاڕێن.

هـ- لە سوورەتی (القصص)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ مِن شَاطِئِ الْوَادِ الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَىٰ إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾، لەم ئایەتەدا وەک گوتمان: لە هەموو شوێنەکان وردتر، باری جوگرافیی ئەو شوێنە، کە مووسای لێ کراوەتە پێغەمبەرو دوێنراوە، ڕوون کراوەتەوە.

و- لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ کۆی بەسەرهاتەکەی مووساش، وێڕای چۆنیەتی ناردنی، لە دوو توێی سێ ئایەت دا، دەخاتە ڕوو.

وەک پێشتر گوتمان و لێرەش دووبارە پێویست دەکات، دووبارەی بکەینەوە: خوا ﷻ لەو سوورەتە، موبارەکانەدا لە هەر سوورەتێکدا، بەپێی کەش و هەوایەک کە سوورەتەکەی تێدا دابەزیوە و، بەپێی سیاقێک کە ئایەتەکان فەرمایشتی خوای تێدا ڕوون دەکەنەوە، خوا ﷻ چ بەسەرهاتی مووسا ﷺ، چ هەر بەسەرهاتێکی دیکە، بە شێوەیەکی هونەرکارانە ئەوەی کە زیاتر پێویست، بەوە بکات، لەوێ دەربخرێ، دەریدەخات و، لە کوێ زیاتر پێویستیی پێ بکات، ڕوون بکرێتەوە،

ڕوونـی دەکاتـەوە، لـە کـوێ پێویسـت بـکات بـە کورتیـی بـاسی بـکات، بـە کورتیـی دەیفەرمـوێ و، لـە کوێـش پێویسـت بـکات بـە درێژیـی بـێ، بـە درێژیـی، هەروەهـا: دابـەش کردنـی کـۆی بابەتەکـە، بەسـەر هەمـوو ئـەو شـوێنانەدا، لـە هـەر شـوێنە و بەپێـی سیاقی خـۆی و کـەش و هـەوای خـۆی.

**٤٧- چۆنیەتیی بیستنی مووسا ﷺ بۆ فەرمایشتی خوا ﷻ، بۆ ئێمە شتێکی زانراو نیە:**

زانایـان لـەو بـارەوە زۆریـان قسـە کـردوە: کـە ئایـا مووسـا ﷺ چـۆن گوێبیسـتی فەرمایشـتی خـوا ﷻ بـووە؟ بـە گوێیەکانـی، یـان بـە هەمـوو جەسـتەی؟ یـان بـە ڕووح و ناخـی؟ ئایا فەرمایشـتی خـوا ﷻ بـۆ مووسـا ﷺ بـە دەنـگ بیسـتی، یاخـود چـۆن بـوو؟ یانـی: ئایـا مووسـا ﷺ گوێـی لـە دەنگێـک بـوو، یاخـود چـۆن بـوو، ئایـا خـوا ﷻ کـە مووسـا ﷺی دوانـد، بـە هەمـوو خانەکانـی جەسـتەی بیسـتی، بـە ڕووح و جەسـتەی بیسـتی، یاخـود بـە ئەندامـی بیسـتنی بیسـتی، یـان خـوا ﷻ دەنگێکـی خوڵقانـدو، ئـەو دەنگـەی بیسـت، یاخـود ئـەو فەرمایشـتە بـێ وێنەیـەی خـوای پـەروەردگاری بیسـت؟!

لـە وەڵامـدا دەڵێیـن: ئـەوە هیچـی بـۆ ئێمـە دیـار نیـەو، پێـم وایـە لـەو بـارەوە خـۆ مانـدوو کـردن، بـێ سـوودە، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾الشـوری، واتـە: (خـوا) بەدیهێنـەری ئاسـمانەکان و زەوییـە، لـە خۆتـان جووتـی بـۆ دروسـت کـردوون، ئاژەڵەکانیشـی بـە جـووت دروسـت کـردوون، ئێـوە و ئاژەڵـەکان بـەو حاڵەتـی جووتییەتیـە (نێـرو مـێ)، وەچەتـان پـێ دەخاتـەوەو، زۆرتـان دەکات، هیـچ شـتێک وەک وێنـەی وی (خـوا) نیەو ئـەو بیسـەری بینـەرە.

بەداخـەوە زۆرێـک لـە زانایانـی ئیسـلام، شـتێک کـە لـە مـەودای عەقڵـی بەشـەردا نیـە، لـە مـەودای پێنـج هەسـتەکانیدا نیـە، لـە مـەودای تواناکانـی کـە بـە بەشـەر

دراون دا، نیـە، زۆر قسـەیان لێکـردوە، سـەرەنجامیش بـە دەسـتی خاڵیـی گەڕانـەوەو، شـتێکی زۆریـان بەرهـەم هێنـاوە، کـە هیـچ کەلێنێـک بـۆ ئێمـە ناگـرێ، بـەڵام ئـەو شـتانەی لـە مـەودای عەقڵـی بەشـەردان و، مـرۆڤ زیاتـر پێویسـتیی پێیـان بـووە، کەمـتر کاریـان لەسـەریان کـردوە!! ئەویـش ڕەنگـە هۆکارەکـەی ئـەوە بـێ، کـە دەسـتەڵات نەیهێشـتوە، وەرە هـەزار سـاڵ قسـە بکـە، لـە بـارەی ئـەوەوە: خـوا ﷻ چـۆن فەرمایشـتی لەگـەڵ مووسـادا ﷺ کـرد؟ مووسـا ﷺ چۆنـی بیسـت؟ چونکـە زەڕی نیـە، بـۆ پەزەکانـی دەسـتەڵات و حوکمڕانانـی ستەمکارو خۆسـەپێنی، کاتـی خـۆی: ئومەویـی و عەبباسـیی و عوسـمانیی و، ئـەو حوکمڕانـە خۆسـەپێنانەی ئێسـتاش، کـە لـە دەوڵەتۆکەکانـی کەنـداودا، حوکمـی میراتیـی و بنەماڵەیـی و، لـە شـوێنەکانی دیکـەدا حوکمـی عەسـکەرتاریی و خۆسـەپاندن، بەسـەر موسـوڵماناندا، کراوەتـە عـادەت و نەریتێکـی نەفامانـە، هـەزار سـاڵ قسـە لـەوە بکـە، ئایـا قورئـان مەخلووقـە یـان مەخلـووق نیـە؟ خـوای پـەروەردگار چـۆن فەرمایشـتی لەگـەڵ مووسـادا ﷺ کـرد، چۆنـی نەکـرد؟ مووسـا چۆنـی بیسـت، چۆنـی نەبیسـت؟ زەرەری نیـە بـۆ ئـەو دەسـتەڵاتدارانە، بۆیـە ئـەو ڕژێمـە میراتیـی و بنەماڵەییانـە، ئـەو ڕژێمـە خۆسـەپێن و زۆردارانـە، زۆر جـار خەڵـک هـان دەدەن، کـە سـەرگەرم بـن، بـەو بـاس و خواسـانەوە، کـە زیانیـان نیـە بـۆ بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانی ئـەوان و، خەڵکیـش سـەرقاڵ دەکات و، بـێ ئاگاشـیان دەکات لـە هەندێـک شـت، کـە پێویسـتە قسـەی لـێ بکـەن: بـۆ وێنـە:

١- ئایا ڕەوایە حوکمڕانیی، بە شێوەی میراتیی و بنەماڵەیی بێ، یاخود بە ڕاوێژ؟ ئایا دەستەڵات هی خەڵکە، یان هی عەشیرەت و هۆزێکە، یان بنەماڵەیەکە، کە قۆرخیان کردوە بۆ خۆیان؟.

٢- هەروەها ئایا: ئەو خێرو بێرەی خوا ﷻ خوڵقاندوویەتی لە زەوییدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة.

هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴿٢٠﴾ ﴾لقمان، ئایا دواندنەکەی خوا لەگـەڵ بنەماڵەیەکیەتی؟ یـان لەگـەڵ تونژێکیەتـی؟ یان لەگـەڵ حزبێکیەتی؟ یان لەگـەڵ هەمـوو مرۆڤەکانیەتی؟.

٣- هەروەها لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴿١٣﴾ ﴾الحجرات، واتە: هەروەها کێڕاومانن بە چەندان گەل و هۆز تاکو پێک ئاشنابن، بێگومان بەڕێزترتان لە لای خوا پارێزکارترینتانە...

کەواتـە: تـۆ ئـەوەت لـە کـوێ هێنـا، کە دەبـێ ئالی فلانکـەس، خـاوەنی هەموو شـتەکان بـێ؟ فـڵان بنەماڵەیـە و، فـڵان عەشـیرەتە، دەبـێ خاوەنـی هەمـوو شـتێک بـێ و، خەڵکـی دیکـە هەمـووی وەک کۆیلـە و ژێـر دەسـت و دیـل بـن لەبـەر دەسـتیان، ئـەوەت لـە کـوێ هێنـا؟ ئـەوە لـە کوێـی قورئـان و سـوننەتدایە؟ ئائـەوە دەبـێ قسـەی لـێ بکـرێ، بـەڵام ئـەوە هەمـووی کـراوە بـە ناوچـەی قەدەغـە کـراو (منطقـة مُحرَّمـة)، بـەڵام وەرە بـۆ خـۆت لـە بـارەی شـتی دیکـەوە قسـە بکـە: مەسـەلەی چوونـە سـەر عەرشـی خـوا ﷻ، سیفەتە خەبەرییـەکان و، ئـەو شـتانە کـە زانایـان مشـت ومڕیـان لەسـەریان بـووە و، لـە مـەودای عەقڵـی بەشـەردا نیـن و، هەرگیـز بەشـەر تێیانـدا ناگاتـە ئەنجامێـک کـە بوەسـتێ!!

ئنجـا بەداخـەوە کاتـی خـۆی و ئێسـتاش، ئـەو بـاس و خواسـانە کـە وەک گوتـم: زیاتـر هـۆی خافڵاندنـی مسـوڵمانان و سـەرقاڵ کردنیانـن و، هـۆکاری لادانیانـن لـە ڕاسـتە شـەقامی ئیسـلام، ئـەو مەسـەلانە زیاتـر ڕەواجیـان پـێ دەدرێ لەلایـەن ئـەو دەسـتەڵاتانەوەو، لەلایـەن ئـەو مـەلا سـەر بـە دەسـتەڵاتانە (وعّـاظ السـلاطين)ی، کار دەکـەن بـۆ ئـەوەی حوکمـە بنەماڵەیـی و میراتییـە خۆسـەپێن و دیکتاتـۆرەکان، درێژەیـان ببـێ و بمێننـەوەو، مسـوڵمانان هـەر بـە چەواشـە کراویـی، دینداریـی بکەن!

لێـرەدا بـە پەسـەندی دەزانـم لـەو بـارەوە چەنـد قسـەیەکی زانـای نـاودار (رشـيد الخطيـب الموصـلي) بێنـم کـە لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1]، دەڵـێ: (وَالمُـرادُ بِهـذا النِّـداءِ:

---

(١) أولى ما قيل في آيات التنزيل: ج٥، ص٤٨٨.

نِـداءُ الوَحـيِ، وَقَـد تَيَقَّنَـهُ مـوسى وَإن لم يَعلَـم كُنهَـهُ، لإنَّ التَّصديـقَ بالـشَّيءِ لا يَتوقَّـفُ على مَعرِفَتِـهِ وكَيفيَّتِـهِ، فَإنَّ أكثَرَ مَا نُصـدِّقُ بِـهِ تَصديـقَ يَقينٍ، لا نَعـرِفُ كُنهَهُ ولا كَيفيَّةَ تَكوينِـهِ وَإيجَادِهِ: فهـذه عَمَلِيَّةُ النَّوْمِ وَالتَّيَقّـظ، وَهـذهِ عَمَليـةُ التَّذكـيرِ «لا يُعلَـمُ كَيـفَ تَتِـمَ»، وَهـذه حَبَّـةُ الـبُرِّ مَثـلاً وَنَبتُهـا وَاسـتِواؤُها عَـلى سُـوقِهَا، وَبَـذرَةُ التِّـينِ وَتَشـجُّرُهَا وَإثمَارُهَـا، فَكُلُّ ذَلِـكَ نُصَـدِّقُ تَصديـقَ يَقـينٍ، أَو نُشـاهِدُهُ مُشـاهَدَةَ عَيـانٍ دون أن يتَوَقَّـفَ ذَلِـكَ عَـلَى مَعرِفَـةِ كَيفيَتِـهِ وَكُنـهِ حَقِيقَتِـهِ، وهـذا المِذيـاعُ نَتَيقَّـنُ نَقلَـهُ للأخبـار، دونَ أن يَتَوَقَّـفَ عِلمُنَـا عَـلَى كَيفيَّـةِ ذَلِـكَ مِنـهُ، فأَكثَرُ السَّـامِعينَ لا يعلمـون الكَيفيَّـةَ).

واتـە: مەبەسـت لـەم بانگکردنـە (کـە خـوا ﷻ مووسـای ﷺ بانگکـرد)، بریتیـە لـە بانگکردنـی سروش، کـە مووسـا ﷺ لێـی دڵنیـا بـوو، (هەرچەنـدە نەیدەزانـی چییەتەکـەی چۆنـە؟، بـەڵام لێـی دڵنیا بـوو، کـە ئـەوە بانگکردنـی خوایـە ﷻ)، چونکـە بەڕاستدانانی شـتێک، پەکـی لەسـەر ئـەوە نەکەوتـوە، چۆنیەتیەکـەی بزانـی، زۆربـەی ئـەو شـتانەی ئێمـە لێیـان دڵنیایـن، چۆنیەتییەکەیـان نازانیـن و، چییەتییەکەیـان نازانیـن و، چۆنیەتیـی دروسـت بوونیـان نازانیـن، بـۆ وێنـە: پرۆسـەی خەوتـن و، بێـدار بوونـەوە، هەروەهـا پرۆسـەی بیرکردنـەوەو، وەبیرهاتنـەوە، نازانـرێ، چـۆن پێـک دێ؟ هەروەهـا دەنکـە گەنمێـک، بـۆ وێنـە: کـە دەڕوێ و دوایـی بـەرز دەبێتـەوە لەسـەر قەدەکـەی و، هەروەهـا دەنکـە هەنجیرێـک کـە دوایـی دەبێتـە درەخـت و بـەر دەردەکات، هەمـوو ئـەوە ئێمـە لێـی دڵنیایـن و بـە ڕاسـتی دەزانیـن، یاخـود بەچـاو دەیبینیـن، بـێ ئـەوەی پەکـمان لەسـەر ئـەوە کەوتبـێ بزانیـن چۆنییەتەکـەی چۆنـە و، چییەتەکـەی چۆنـە؟! هەروەهـا ڕادیـۆ کـە هەواڵـەکان دەگوازێتـەوە (ئـەو کاتـە ڕۆژگاری ئینتەرنێـت نەبووە)، ئێمـە لێـی دڵنیایـن، بـێ ئـەوەی بشـزانین چـۆن دەگوازرێتـەوە، زۆربـەی بیسـەران چۆنییەتەکـەی نازانـن، بـەڵام دڵنیاشـین کـە ئـەوە هەواڵـەو ئـەو ڕادیۆیـە دەیگوازێتەوە.

مەبەسـتی ئەوەیـە: کـە بانگکردنـی خـوا ﷻ بـۆ مووسـا ﷺ جۆرێـک بـووە لـە وەحیـی پەنهـان، کـە مـەرج نیـە مووسـاش ﷺ حەقیقـەت و چییەتەکـەی زانیبـێ، بـەڵام لێـی دڵنیابـووە کـە ئـەوە، بانگکردنـی خوایـە ﷻ و، ئێمـە زۆربـەی

دروستکراوەکانیش، کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین، چییەت و چۆنیەتییەکەیان نازانین، بەڵام لێشیان دڵنیاین.

**٤٨- دوور بینیی مووسا ﷺ و، ئامادە سازیی وردی، بۆ گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ بووە، نەک لە ترسیی کوژران و مردن:**

مووسا ﷺ کە لە چەند شوێنێک، لە سوورەتەکاندا دووبارە بۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴾، واتە: پەروەردگارم! من کەسێکم لێ کوشتوون، دەترسم بمکوژنەوە، یان کە دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾، واتە: پەروەردگارم! من دەترسم، بە درۆم دابنێن و، هەروەها لێرەدا لە سوورەتی (**القصص**)دا، ئەوە هەمووی دووربینیی مووسا ﷺ بووە، بۆ ئەوەی بتوانێ پەیامی خوا ﷻ بگەیەنێ، نەگەرنا ئەوە نەبووە کە بترسێ لەوەی لە پێناوی خوادا بکوژرێ، چونکە ئێمە جگە لە پێغەمبەرانیشمان بینیون و دەبینین، کە لە پێناوی خوادا، پێشوازیی لە مەرگ و لە کوژران و، لە بەجێهێشتنی ئەم دنیایە پێنج و دوو ڕۆژییە، دەکەن، چ جای پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام**)! کەواتە: ئەوەی مووسا ﷺ فەرموویەتی، وەک دوور بینیی بووەو، بۆ ئەوە بووە بتوانێ پەیامیی خوا ﷻ بگەیەنێ و، کارەکەی لێ نیوەچڵ نەبێ، بۆ وێنە:

أ- ئایەتەکانی سوورەتی (**طه**)، دوای ئەوەی کە خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: ﴿اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾﴾طه، دوایی مووسا ﷺ چەند داواکارییەک دەکات:

﴿قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ اشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: خوایە سینەم فراوان بکەو، کارم ئاسان بکە، گرێی زمانم بکەوە، تاکو لێم تێبگەن، لە نیزیکانی خۆشم وەزیرێکم بۆ بڕەخسێنە، با ئەویش

هارۆونی برام بێ، پشتمی پێ بەهێز بکەو، لە کارەکەم بەشداری بکە، تاکو تۆ زۆر بە پاک بگرین و، زۆرت یاد بکەین، تۆ بینەری حاڵ و باڵی ئێمەی (کە پێویستیمان بەو هاوکاریی و پێداویستیانە هەیە، بۆمان دابین بکرێن)، خواش ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾طـه، ئەی مووسا! ئەوەی داوات کردوە، هەموویت پێدرا، لێرەدا مووسا ﷺ لەبەر ئەوەی زۆر جیددیی بووەو ویستوویەتی پەیامی خوا ﷻ چاک بگەیەنێ، زانیویەتی پێویستیی بەو شتانە هەموویان دەکات.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الشعراء)، لە ئایەتەکانی: (١٢و ١٣و ١٤)دا، وەک پێشتر باسمان کرد، مووسا ﷺ چەند شتێک دەڵێ، لە بازنەی زەمینەسازیی و دوور بینیی دا بۆ باشتر گەیاندنی پەیامی خوا.

ج- هەروەها لە سوورەتی (القصص)دا، چەند داواکارییەک دەکات و چەند شتێک دەخاتە ڕوو، هەمووی مەبەست پێی ئەوەیە ئامادە سازیی ورد بکات، زەمینە خۆش بکات بۆ گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ، ئنجا بێگومان کەسێک بیەوێ کارێک بکات، باش خۆی بۆ ساز و ئامادە دەکات و، پێداویستییەکانی بۆ دابین دەکات، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (التوبة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ ﴿٤٦﴾ ﴾، ئەگەر (دڵنەخۆشەکان) ویستبایان دەربچن، [ئەگەر ویستبایان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆ جەنگی تەبووک دەربچن]، ئامادە سازییان بۆ دەکردو، ئەوەی کە پێویستە لە پێداویستییەکان، بۆیان دابین دەکرد.

**٤٩- مووسا ﷺ دڵ و دەروونێکی زۆر پاک و چاکی هەبووە، کە داوای کردوە، هارۆونی برایشی لەگەڵیدا پێغەمبەر بێ و پاڵپشت و هاوکاری بێ:**

أ)- وەک لە سوورەتی (مریم)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ ﴾، کە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (مریم)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە، لێرەدا خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە هارۆونی بە مووسا ﷺ بەخشیی، وەک پێغەمبەر، لەسەر داوای خۆی.

ب)- لە سووڕەتی (طه)ش دا، دەڵێ: ﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ٣٢ ﴾، واتە: لە نیزیكانی خۆم، وەزیرێكم بۆ بڕەخسێنە، با ئەویش هاڕوونی برام بێ، پشتمی پێ بەهێز بكە و، لە كارەكەمدا بەشداری بكە.

هەموو كەس ئەو دڵ و سینە صاف و پاك و چاكەی نیە، كە پێی خۆش بێ، غەیری خۆی با براشی بێ، لە كارەكەیدا بەشداربێ و، ئەو پاداشتەی كە ئەو دەیبێت، ئەویش بیبێت!

ج)- هەروەها لە سووڕەتی (الشعراء)، ئایەتەكانی: (١٢ و ١٣)داو، لە سووڕەتی (القصص) ئایەتی (٣٤)دا، دیسان مووسا ﷺ داوا دەكات و، مەدحیشی دەكات، هی هاڕوونی برای و دەفەرموێ: ئەو زمانی لە هی من پاراوترە، كە ئەمە تەعبیرەكەیەتی، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ١٢ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ١٣ ﴾، واتە: فەرمووی: من دەترسم بە درۆم دابنێن و، سینەم تەنگ بێ و زمانم گۆ نەكات (زمانم باش قسە نەكات)، بۆیە بە دوای هاڕوونیشدا بنێرە، یانی: هاڕوونیش ڕەوان بكە، ئنجا لێرە باسی نەكردوە، لە سووڕەتی (القصص)یش دا، دەفەرموێ: ﴿ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ٣٤ ﴾، واتە: هاڕوونی براشم ئەو زمانی لە هی من پاراوترو گۆیاترە، وەك دەبینین: مەدحی هاڕوون دەكات و دەڵێ: فەزیلەتێك كە لە هاڕووندا هەیە، لە مندا نیە، ئەویش ئەوەیە كە ئەو زمانی زۆر پاراو و ڕوونە.

**٥٠- مووسا ﷺ خەصڵەتە باشەكانی هاڕوونی برای ستایش دەكات:**

وەك لە سووڕەتی (القصص)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ٣٤ ﴾، واتە: هاڕوونی براشم بنێرە، ئەو زمانی لە هی من پاراوترە، بۆ ئەوەی بەرگریم لێ بكات و بەڕاستم دابنێ، من دەترسم بە درۆم دابنێن، پشتم بەهێز بكە بە هاڕوونی برام، مانای وایە: هاڕوون پیاوێكە پشتی پێ ببەسترێ و، پیاوێكە هاوكارو پشتگیر بێ و، زمانێكی فەصیح و گۆیاو ڕەوانیشی هەیە.

**٥١- مووسا ﷺ خاڵە بێ هێزەکانی خۆی زانیون و لە خوای داوا کردوە، بۆی چارەسەر بکات:**

وەک لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ ﴾، مانای وایە مووسا ﷺ زانیویەتی پێویستیی بەوە هەیە، کە خوا ﷻ سینەی فراوان بکات (تەنگە پرێسکە نەبێ)، دڵی گچکە نەبێ، پاشان کاری ئاسان بکات (کارەکانی لێ نە ئاڵقێن)، دوایی گرێی زمانی بکاتەوە، بۆ ئەوەی لێی تێبگەن، پاشان پێویستیی بە هاوکارێکی دیکە هەیە، کە هاروونی برایەتی، کەواتە: گرنگە ئینسان خۆی بناسێ و، خاڵە بەهێز و بێ هێزەکانی خۆی بزانێ، بۆ ئەوەی هەوڵ بدات، خاڵە بێ هێزەکانی خۆی چارەسەر بکات.

**٥٢- مووسا ﷺ هێندە لە لای خوا ﷻ بەڕێز بووە، هاروونی برای وەک پێغەمبەرێکی پاڵپشت پێدراوە:**

ئەوە پلەیەکی زۆر ناوازە و بەرزی یەکێک لە پێغەمبەرانە لە لای خوا ﷻ، ئێمە هیچ پێغەمبەرێکی دیکەمان پێ شک نایەت، داوای کردبێ و لەسەر داوای وی کەسێکی دیکە کرابێتە پێغەمبەر، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ ﴾مريم، واتە: هەروەها لە بە بەزەیی خۆمانەوە، هاروونی برایمان بە پێغەمبەر پێ بەخشی، ئەمەش بەرزیی پلە و پایە و پێگەی مووسا ﷺ دەگەیەنێت لە لای خوا ﷻ.

**٥٣- مێرد بۆی هەیە، هاوسەری بۆ هەر شوێنێک بە بەرژەوەندیی بزانێ، سەفەری پێ بکات، مەگەر لەسەری بە مەرج گیرا بێ، کە لە شوێنێکی دیاریکرا و و لە شارێکی دیاریکراو، نەیجووڵێنێ:**

ئەمەش لەوە وەردەگرین، کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ﴾، مووسا ﷺ خێزانەکەی خۆی لەگەڵ خۆی برد، (القُرطُبِي) لەوبارەوە گوتوویەتی:

(﴿ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ﴾: قِيلَ: فِيهِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الرَّجُلَ يَذْهَبُ بِأَهْلِهِ حَيْثُ شَاءَ، لِمَا لَهُ عَلَيْهَا مِنْ فَضْلِ الْقَوَامِيَّةِ، وَزِيَادَةِ الدَّرَجَةِ، إِلَّا أَنْ يَلْتَزِمَ لَهَا أَمْرًا، فَالْمُؤْمِنُونَ عِنْدَ شُرُوطِهِمْ، وَأَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوَفَّى بِهِ، مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ)[1].

واتـە: ڕستەی ﴿ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ﴾: (ژنەکەی لەگەڵ خۆی بـرد)، گوتـراوە: بەڵگەی لەسـەر ئـەوە تێدایە، کە پیاو بـۆی هەیـە، ژنـی خـۆی بـۆ هـەر شـوێنێک کـە بیەوێ، ببـات، چونکـە پیـاو پلـەی سەرپەرشـتیاریەتیی هەیـەو، پلەیەکـی زێـدەی بەسـەر ئافرەتـدا هەیـە، (کـە ئەویـش هـەر پلـەی سەرپەرشـتیاریەتیيە)، مەگـەر پیاوەکـە (مێردەکـە) پابەنـد بـێ، بـە مەرجێکـەوە کـە ئافرەتەکـە لەسـەری بـە مـەرج گرتـوە، ئـەو کاتـە بـڕواداران پابەنـد دەبـن بـە مەرجەکانـی خۆیانـەوەو، شایسـتەترین مـەرج، کـە دەبـێ جێبەجـێ بکـرێ، ئـەو مەرجانـەن کـە ئافـرەت بـۆ پیـاو حـەڵاڵ دەکـەن، (واتـە: لـە کاتـی گرێبەسـتی هاوسـەرگیریدا، بـە مـەرج دەگیرێـن).

٥٤- فەرمایشتکردنی خوا ﷻ لەگەڵ مووسادا ؑ، یەکێکە لە سێ شێوەکەی وەحیی:

لـە سـووڕەتی (الشـوری)، ئایەتـی ژمـارە (٥١)دا، خـوا ﷻ شـێوەکانی سروشـکردن و پەیامـی پەنهـان ناردنـی بـۆ پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لـە سـێ شـێوازدا کـورت هەڵهێنـاون، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾الشـوری، واتـە: هیـچ مرۆڤێـک بـۆی نیـە خـوا بیدوێنـێ مەگـەر:

١- بە وەحیی، واتە: بیخاتە دڵی.

٢- یان لە پشت پەردەوە بیدوێنێ، وەک مووسا ؑ.

٣- یاخود نوێنەرێک بنێرێ و بە فەرمانی خوا ﷻ ئەوە بگەیەنێ کە دەیەوێ، وەک: جبرییل کە هاتوە لە شێوەی خۆیدا، یان لە شێوەی پیاوێکدا، ئەوەی کە خوا ﷻ پێیدا ناردوە بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ گەیاندوە. ﴿ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴾، بێگومان خوا بەرزی کارزانە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٢٥.

کەواتە: وەحیی ئەو سێ حاڵەتەی هەن:

أ- یان خوا ﷻ دەیخاتە دڵی ئەو مرۆڤەوە، بێ ئەوەی فریشتەیەک دەوری تێدا ببینێ.

ب- یاخود لە پشت پەردەوە خوا ﷻ ئەو مرۆڤە دەدوێنێ، وەک مووسای ﷺ دواندوە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾النساء، هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۘ مِّنۡهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُۖ وَرَفَعَ بَعۡضَهُمۡ دَرَجَٰتٖۚ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ ٢٥٣﴾، واتە: ئەو پێغەمبەرانە هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا بەرزکردوونەوە، هەیانبووە خوا ﷻ دواندوویەتی و، هەشیانە خوا ﷻ چەندان پلە بەرزی کردۆتەوەو، کوڕی مەریەمیشمان بە (روح القُدُس)، (جیبریل) بەهێز کرد، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یش دا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ ١٤٣﴾، واتە: کاتێک مووسا بۆ ژوانگەکەی ئێمە هات و، پەروەردگاری دواندی، گوتی: پەروەردگارم! خۆتم پێشان بدە! تەماشات بکەم.

ج- حاڵەتی سێیەمی ناردنی وەحیی، ئەوەیە: ﴿أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ﴾، کە بەزۆریی وابووە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نوێنەرێک هاتۆتە لای کە جیبریل بووە و، بە فەرمانی خوا ﷻ ئەوەی کە خوا پێیدا ناردوە، پێیڕاگەیاندوە.

ئنجا ئایا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ وەک چۆن خوا ﷻ مووسای ﷺ دواندوە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾النساء، ئایا بەو شێوەیەش موحەممەدی ﷺ دواندوەو فەرمایشتی لەگەڵدا کردوە؟ وا پێدەچێ، هەڵبەتە زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، بەڵام ئەو ڕایە زیاتر زاڵە کە خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ دواندبێ، لە سەفەری شەو ڕۆ و بەرزبوونەوە (الإسراء والعروج)دا، بە بەڵگەی ئەوە کە لەو فەرموودەیەی باسی شەوڕۆو بەرزبوونەوەدا، هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرزکرامەوە بۆ لای (سِدرةُ المُنتهى) و، خوا پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم، دوایی هاتمەوە لە ئاسمانی شەشەم گەیشتمە مووسا ﷺ... هەتا کۆتایی فەرموودەکە، کە (بخاري و مسلم) هێناویانە.

هەروەها ئایەتەکانی: (١ - ١٨) سووڕەتی (النجم)یش، ئاماژەی پێ دەکەن، کە خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ دواند بێ، هەروەها ئەو فەرموودەیەش هاتوە لەوبارەوە:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: لَوْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: عَنْ أَيِّ شَيْءٍ كُنْتَ تَسْأَلُهُ؟ قَالَ: كُنْتُ أَسْأَلُهُ هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ أَبُو ذَرٍّ: قَدْ سَأَلْتُ، فَقَالَ: «رَأَيْتُ نُوراً»} (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ٤٤٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق[1] دەڵێ: بە ئەبوو زەڕی غیفارییم گوت خوا لێی ڕازی بێ: ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ بینیبایە پرسیارم لێ دەکرد، ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ گوتی: لە بارەی چییەوە پرسیارت لێ دەکرد؟ گوتی: لەو بارەوە لێم دەپرسی: ئایا پەروەردگاری خۆتت بینیوە؟ ئەبوو زەڕی غیفارییش گوتی: من لەو بارەوە لێم پرسی، فەرمووی: ڕووناکییم بینی.

ئەمانە لێیان وەردەگیرێ، کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لەو سەفەرە موبارەکەیدا خوای پەروەردگاری دواندبێتی، بەڵکو ڕاجیایی لەسەر ئەوە هەیە، کە ئایا پێغەمبەری خاتەم ﷺ خوای پەروەردگاری بینیوە لە شەوی بەرزبوونەوەدا یان نەیبینیوە؟ کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پەروەردگاری بینیوە، بەڵام دایکمان عائیشە نکووڵیی لەوە کردوەو گوتوویەتی: نەیبینیوە، بە هەرحاڵ ئەوە یەکێکە لەو بابەتە عەقیدەییانەی کە ڕاجیایی و مشت ومڕی زانایانی هاوەڵان و پێشینیان لەسەر بووەو، تاکو ئێستاش ئەو ڕاجیاییە هەر هەیە.

**٥٥- ئەو کاتەی کە مووساو هاوسەری لە مەدیەنەوە گەڕاونەوە بەرەو میسر، شەویان بەسەردا هاتوە و شەوەکەش سەرما و زستان بووە و، ڕێشییان لێ ونبووە:**

هەم شەویان لێ بەسەردا هاتوە و، شەوەکەش سەرماو سۆڵە بووە و، هەم ڕێشییان لێ ونبووە، ئایا ئەمە لە چی وەردەگیرێ؟ لە بەسەرهاتەکەو لە دەقی

---

(١) کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین، واتە: ئەو جیلەی لە دوای هاوەڵانەوە هاتوون.

ئایەتـەکان وەردەگیـرێ، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (طـه)دا دەفەرمـوێ: ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ١٠﴾، دوای ئـەوەی ئاگرەکـە بـەدی دەکات، (کـە بـەلای ئـەوەوە ئاگر بـووە، ئەگەرنا ئاگـر نەبـووە، ڕووناکییەکـە)، بەخێزانـی دەڵـێ: لێرە بـە، بەڵکـو بچـم بزووتێکتـان لـەو ئاگـرە بـۆ بێنـم، بـۆ ئـەوەی ئاگـری پـێ بکەنـەوەو خۆتانـی پـێ گـەرم بکەنـەوە، وەک لـە شـوێنی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٧﴾النمـل، یاخـود لەسـەر ئـەو ئاگـرە ڕێنماییـەک ببینـم، واتە: کەسـانێکی لـێ ببینم، ڕێنماییـم بکـەن، کـە ڕێیەکەیـان هەڵـە بـووە، چۆنـی بدۆزنـەوەو بـە کوێـدا بـڕۆن؟ هەروەهـا لە سـوورەتی (النمـل)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٧﴾، واتـە: یـاد بکەوە کاتێک مووسـا بـە خێـزانی گـوت: مـن ئاگرێکـم بـەدی کـردوە، هەواڵێکتـان لێـی بـۆ دێنـم (هەواڵـی ڕێیەکـە)، یاخـود بڵێسـەی بزووتێکتـان بـۆ دێنـم، بەڵکـو خۆتـان گـەرم بکەنـەوە، (ئاگری پێ بکەنـەوەو خۆتانـی پـێ گـەرم بکەنـەوە)، لـە سـوورەتی (القصص)یـش ئایەتـی (٢٩) دا دەفەرمـوێ: ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ﴾، بەڵکـو هەواڵێکتـان بـۆ بێنـم، یاخـود بزووتێکتـان لـە ئاگرەکەوە بـۆ بێنم، بەڵکـو خۆتانی پـێ گـەرم بکەنـەوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە:

١- شەو بووە، بۆیە ئاگری بەدی کردوە.

٢- ڕێیان لێ ون بووە.

٣- سەرماشیان بووە، سەرما و سۆڵە بووە.

**٥٦- ئەگەر خوای بەخشەر، ویستی ببەخشێ، هۆکاری گچکەش بێ، دەیکاتە ڕێخۆشکەر:**

خـوا ﷻ ئەگـەر ویسـتی شـتێک بـۆ یەکێـک لـە بەندەکانـی خـۆی بـکات، هۆکارێکـی گچکـەش دەکاتـە زەمینـە خۆشـکەر بـۆ ئـەو بەخشـینەی خـۆی:

أ- مووسا ﷺ بەدەم ئاگرێکەوە چووە، کە ئەو پێی وابووە ئاگرە، بەڵام ڕووناکیی هیدایەتی خوای دەستکەوتوە، ئەو چووە کە بزووتێک ئاگر بێنێ، یان هەواڵێک لەلایەن

ئەو کەسانەوە بێنێ کە ئەو ئاگرەیان کردۆتەوە، بۆ ئەوەی ڕێی میسری پێ بدۆزێتەوە، کەچی لەوێ لەجیاتی ئەوەی بزووتە ئاگرێکی چنگ بکەوێ، هیدایەت و ڕووناکیی پەیامی خوای ﷻ چنگ کەوتوە!

ب- مووسا ﷺ ویستوویەتی ڕێی میسر بدۆزێتەوە، بەڵام خوا ﷻ ڕێی بەرەو خوا چوون و، خۆ و خەڵک دەربازکردنی بۆ ئاچووغ و تەخت کردوە!

ج- مووسا ﷺ ویستوویەتی گرفتی خۆی و هاوسەری چارەسەر بکات، هەم ڕێیەکە بدۆزێتەوە، هەم خۆیان گەرم بکەنەوە، سەرمایان بووە، بەڵام خوا ﷻ گرفت و کێشەی ئۆممەتێکی پێ چارەسەر کردوە!

٥٧- خوا ﷻ هیچ ئەرکێک بە کەسێک ناسپێرێ، تاکو پێداویستییەکانی ئەنجامدانی ئەو کارەی بۆ ئەڕەخسێنێ:

لە سوورەتی (طـە)، لە ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤١)دا، دوای ئەوەی مووسا ﷺ کۆمەڵێک داواکاری پێشنیار دەکات و، دەخاتە ڕوو بۆ خوا ﷻ، خوا لە کۆتایی دا پێی دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾طـە، واتە: ئەی مووسا ﷺ ئەوەی داوات کرد، پێت درا، هەمووی جێبەجێ بوو، دواییش دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: جارێکی دیکەش چاکەمان لەگەڵ تۆدا کردوە، کاتێک سروشمان کرد بۆ دایکت، کە بیخە نێو سندووقێکەوەو سندووقەکە بخە نێو ئاوە زۆرەکەوە، (کە ڕووباری نیلە)، ئنجا با ئاوەکەش بیخاتە کەنارەوە، ﴿ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ ﴾، دوژمنێکی من و دوژمنی خۆی بیگرێتەوە (و لە ماڵی خۆیدا بە خێوی بکات و پەروەردەی بکات)، خۆشەویستییەکیشم خستە سەرت و، بۆ ئەوەی لەبەر چاوی منیش دروست بکرێی و پەروەردە ببی.. واتە: ئەی مووسا! ﷺ ئەوە بێنەوە بیری خۆت، ئنجا بۆت دەردەکەوێ کە ئەو کاتەی داوات

لـە پـەروەردگارت نەکـردوە، هەمـوو شـتێکی بـۆ ڕەخسـاندوی، ئێسـتا کـە داوای لـێ دەکـەی، بـە تەئکیـد ئـەو داواکاریيانـەت پـێ دەدات کـە بـۆ کارەکـەت پێویسـتن.

**٥٨- وا دیـارە ئــەوەی مووسـا ﷺ دیتوویەتـی، ئاگـری ئاسـایی نەبـووە، نەگەرنـا هاوسـەرەکەشـی دەیبینـی:**

ئەمـە (الشـعراوي)[1] هێناویەتـی، تێبینییەکـی جوانیشـە، واتـە: کاتێـک مووسـا ﷺ دەفەرمـوێ: هاوسـەرەکەم! تـۆ لێـرە بـە مـن ئاگرێکـم بـەدی کـردوە، ئەگـەر ئاگـری ئاسـایی بووایـە، هاوسەرەکەشـی دەیبینـی، بـەڵام مووسـا ﷺ دەڵـێ: ئاگرێکـم بـەدی کـردوە، بۆتـە مایـەی هۆگرییـم، کەواتـە: دوایـی دەرکەوتـوە کـە ئاگـر نەبـووە و ڕووناکیـی بـووە، ڕووناکییەکـی تایبـەت بـووەو، تەنیـا مووسـا ﷺ بینیویەتـی.

**٥٩- حیکمەتـی ئـەوە کـە مووسـا ﷺ گۆچانەکـەی بـۆ کراوە بـە حەزیـا و ئەژدیهاو، دەسـتیشـی بە درەوشـاوەیی پێشـاندراوە، مەشـق پێکردنی مووسـا ﷺ بووە:**

واتــە: کــە خــوا ﷻ بــەر لــەوەی مووســا لەگــەڵ فیرعەونــدا ڕووبەڕووبێتــەوە، گۆچانەکـەی بـۆ دەکاتـە مـارو، دەسـتی درەوشاوەیشـی پێشـان دەدات، ئـەوە هەمـووی مەشـق پێکردنـی مووسـا بـووە، تاکـو کـە دوایـی لـەلای فیرعـەون گۆچانەکـەی فـڕێ داو بـوو بـە مارێکـی هێنـدە گـەورە، بـۆ خۆشـی لێـی نەترسـێ، خـوا ﷻ مەشـقی پێکـردوە و، ڕایهێنـاوە، کـە دواییـش چـۆن گۆچانەکـە بگرێتـەوە! چـۆن دەسـتی بـۆ گۆچانەکـە بـەرێ و بیگرێتـەوەو، ببێتـەوە بـە گۆچانـی ئاسـایی؟ ئاکـرێ هـەر ئەژدیهـا بـێ و، شـت هەڵلووشـێ و مووسـاش هیچـی بـۆ لەگـەڵ نەکـرێ و، لـە دەسـتی ویـش دەربچـێ.

**٦٠- جیاوازیـی تەعبیـرەکانی بـاسی بوونـە مـاری گۆچانەکـەی مووسـا، لەبـەر جـۆراو جـۆری حاڵەتەکانیـەتی:**

خـوا ﷻ لـە شـوێنێک لـە بـارەی گۆچانەکەیـەوە، دەفەرمـوێ بـوو بـە مـار (حَيَّـة)، بـۆ وێنـە:

---

(١) تفسير الشعراوي: ج١٧، ص١٠٩١٢.

أ- لە سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ ﴾... خوا فەرمووی: ئەی مووسا! ﷺ فڕێیدە، ئنجا فڕێیدا، یەکسەر بوو بە مارێک کە بە خێرایی دەڕۆیشت.

ب- لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَأَلْقِ عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴿١٠﴾ ﴾، (خوا ﷻ فەرمووی:) گۆچانەکەت فڕێبدە! ئنجا بینی دەڕواو هەڵدەبەزێتەوە، وەک تیرە مارێک، یان وەک ماری گچکە، مووسا بەپشتتێکردنەوە ڕۆیشت و ئاوڕی نەدرایەوە.

ج- لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ ﴾، ئنجا گۆچانەکەی فڕێ دا یەکسەر بوو بە (نێرە) مارێکی گەورەی ئاشکراو ڕوون.

ڕەنگە یەکێک بڵێ: لە شوێنێک خوا دەفەرموێ: (حَيَّةٌ)و، لە شوێنێک دەفەرموێ: (ثُعْبَانٌ)و، لە شوێنێکیش دەفەرموێ: (كَأَنَّهَا جَآنٌّ)؟ کە (جَآنٌّ)، بە (جِنّان) کۆ دەکرێتەوە، واتە: تیرە مار، یاخود ماری گچکە، یاخود ماری خێرا، ئنجا ئایا ئەمە چۆنە؟!

وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە: کە ئەوانە سێ حاڵەتی جۆراو جۆری گۆچانەکەن، ئەو گۆچانە کە فڕێیدا وە بۆتە مارو لە شکڵ و شێوەدا ماری ئاسایی بووە، لە ئەصڵدا مار (حيّة) بووە، بەڵام مارێکی زۆر گەورە بووە (ثُعْبَانٌ) یانی: نێرە مارێکی گەورە، پاشان لە خێرایی جووڵە کردن و هەڵبەز و دابەزیدا، وەک تیرە مار، یاخود مارێکی گچکە (جانّ) بووە، کەواتە: تێکگیرانیان لە نێواندا نیە، بەڵکو هەر کام لەم وشانە: (حَيَّةٌ)، (ثُعْبَانٌ) و (جَآنٌّ) تەعبیر دەکات لە حاڵەتێکی ئەو مارە.

**٦١- چێژی دواندن لە خزمەت خوادا ﷻ هێندە بێ وێنەیە، مووسا ﷺ حەزی کردوە زۆر لە خزمەتیدا بدوێ:**

ئەمەش لەوە وەریدەگرین کە خوا ﷻ لە سوورەتی (طه)، لە ئایەتەکانی: (١٧ و ١٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئەوە چییە

بـە دەسـتی ڕاسـتەوەیە، ئـەی مووسـا؟ خـوا لـە خـۆی چاکـتر دەزانـێ ئـەوە چییـە، بـەڵام پێـی خـۆش بـووە، خـۆی بیڵـێ: ﴿ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ ﴾، مووسـا ﷺ فەرمـووی: ئـەوە گۆچانەکەمـە، خۆمـی دەدەمـە سـەری، (شـوان کـە پشـتی دێشـێ، خـۆی دەداتـە سـەر گۆچانەکـەی، بـۆ ئەوەی پشـتی ئیسـراحەت بـکات)، ﴿ وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى ﴾، ((الهَشُّ يُقـارِبُ الهَزَّ فِي التَّحْرِيـكِ، وَيَقَـعُ عَـلَى الـشَّيءِ اللَّـيِّنِ، مثـل: هَـشَّ الـوَرَقَ، أي: خَبَطَـهُ بالعَـصَى))، (هَـشّ) لـە (هَـزّ)ەوە، نزیکـە لـە جووڵاندنـدا و، زیاتـر بـۆ شـتی نـەرم بەکاردەهێـنرێ، وەک وەراندنـی گـەڵا، (هَـشَّ الـوَرَقَ)، واتـە: گەڵایەکـەی وەرانـد)، بـە گۆچانەکەشـم گـەڵا بـۆ مەڕەکانـم دەوەرێنـم، بـۆ ئـەوەی بیخـۆن، ﴿ وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴾، چەنـدان کاری دیکەشـم بـەو گۆچانـەم هـەن، چەنـدان کاری دیکـەی پـێ ئەنجـام دەدەم، ڕەنگـە کارەکانـی دیکەشـی ژماردبـن، بـەڵام لێـرەدا خـوا ﷻ کورتـی کردوونـەوە، دیارە مووسـا ﷺ هـەر دەیتوانـی بڵـێ: ﴿ هِىَ عَصَاىَ ﴾، ئـەوە گۆچانەکەمـە، بـەڵام:

أ- ویستوویەتی زۆر لە خزمەت خوادا فەرمایشت بکات.

ب- کاتێک خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوە چییە بە دەستتەوەیە؟ مووسا ﷺ دەزانێ خوا لە خۆی باشتر دەزانێ، ئەوە گۆچانە، لەوانەیە گوتبێتی، خوا ﷻ بۆیە لێم دەپرسێ، تاکو ئەرکەکانی گۆچانەکەم بڵێم، هەڵبەتە ئەو ئەرکانەی مووساش بەو گۆچانەی ئەنجامی داون، ئەو ئەرکانەن کە هەموو شوانێک بە گۆچانی خۆی ئەنجامیان دەدات: خۆی دەداتە سەرێ، گەڵای درەختەکانی بۆ مەڕو بزنەکانی پێ دەوەرێنێ و، کارەکانی دیکەی پێ دەکات، مارێکی پێ بکوژێ، یان هەر شتێکی پێ بکات، گۆچانێک کە مووسا ﷺ بەدەستیەوەیەتی، ئەو کارانەی پێ دەکات، کە هەموو شوانەکان پێی دەکەن، بەڵام دوایی خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: ئەو گۆچانەی تۆ دەتوانی هەر ئەوەندەی پێ بکەی، بەڵام خوا ﷻ دەتوانێ وای لێ بکات، شتی زۆر لەوە گەورەتری پێ بکەی، کە بە خەیاڵتدا نایەت، ئەویش ئەوەیە کە جادووی فیرعەونی پێ هەڵبوەشێنێتەوەو فێڵ و پیلانی فیرعەونی پێ لەبێخەوە بێنێ.

ئێمە لێرە کۆتایی بە توێژینەوەمان لە بارەی پێنج قۆناغی ژیان و بەسەرهاتی مووساوە ﷺ دێنین و، بەم جۆرە هەر سێزدە قۆناغەکەی ژیان و بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای و گەلەکەیان (بەنوو ئیسرائیل) و، فیرعەون و دەستە و دایەرە و گەلەکەی، کۆتایی دێ، چونکە:

لە سووڕەتی (الأعراف)دا، لەبەر تیشکی ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)، واتە: شەست و نۆ (٦٩) ئایەت دا، هەشت قۆناغەکانی: (٦ - ١٣)ی ژیان و بەسەرهاتی مووسامان توێژینەوەو، لێرەش پێنج قۆناغەکەی دیکە: (١ - ٥)، کەواتە: (٨ + ٥ = ١٣).

شایانی باسیشە: ئەم پێنج قۆناغەی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ گرنگییەکی تایبەتییان پێدان، چونکە ئەمانە بناغەی قۆناغ و بەسەرهاتەکانی دیکەن، بە تایبەت لە بەرانبەر: (حوکم و حیکمەت و پەندەکان)ی، ئەم پێنج قۆناغەی بەسەرهاتی مووسادا ﷺ هەڵوەستەی باشمان کردو، سەرەنجام بە هەر پێنج قۆناغەکە شەست و یەک (٦١) حوکم و حیکمەت و پەندمان لێ وەرگرتوون بەم شێوەیە:

١)- قۆناغی یەکەم: حەوت (٧) حوکم و حیکمەت و پەند.

٢)- قۆناغی دووەم: پێنج (٥) حوکم و حیکمەت و پەند.

٣)- قۆناغی سێیەم: یازدە (١١) حوکم و حیکمەت و پەند.

٤)- قۆناغی چوارەم: بیست و یەک (٢١) حوکم و حیکمەت و پەند.

٥)- قۆناغی پێنجەم: حەڤدە (١٧) حوکم و حیکمەت و پەند،

کەواتە: (٧ + ٥ + ١١ + ٢١ + ١٧ = ٦١)، هەڵبەتە هەر کاتێکیش بویسترێ ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەم تەفسیرە دەربهێنرێ، پێویستە سەرەتا تەفسیری ئایەتەکانی: (١ - ٣٥)ی سووڕەتی (القصص)، دابنرێ لە پێشەوە، پاشان تەفسیری ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)ی سووڕەتی: (الأعراف) دابنرێ، کەواتە: کۆی

ئەو ئایەتانەی بۆ بەسەرهاتی مووسا ﷺ تەرخانکراون، لە هەردوو سووڕەتی: (القصص والأعراف)دا، بریتین لە سەدو چوار (١٠٤) ئایەت.

پێشتریش باسمانکرد: بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ بەندە صاڵح و چاکەکەدا، کە لە سووڕەتی (الکهف)دا، هاتوە، هەروەها بەرگرییکردنی پیاوە بڕوادارەکە کە لە دەستەو دایەرەی فیرعەون بووەو، ئیمانەکەی شاردۆتەوە کە لە سووڕەتی (غافر)دا هاتوە، ئەوانەش دوو بەسەرهاتن، بەڵام ئێمە نەمانخستنە نێو سێزدە (١٣) قۆناغەکەی ژیان و بەسەرهاتی مووساوە ﷺ، لەبەر ئەوەی یەکەمیان بەسەرهاتێکی لاوەکییە و، بەشێک نیە لەو ڕووداو و پێشهاتانەی کە لە ژیانی مووسادا ﷺ بوون، کە پەیوەست بێ بە گەلەکەیەوەو بە هاڕوونی برایەوە، یان بە فیرعەون و دەستە و دایەرەکەیەوەو، تایبەت بووە بە خۆیەوە، ئەویدیکەشیان زیاتر پێشاندانی ڕۆڵی پیاوێکی بڕوادارە، کە ئیمانەکەی خۆی پەنهان کردوە، بەڵام لە کاتی پێویستدا وەک دەڵێن: (تیغی ڕەسەن خۆی لە کالاندا ڕاناگرێ)، خۆی ئیعلان کردوە و بەرگرییەکی باشی لە مووسا ﷺ کردوە، ئەویش زیاتر پەیوەستە بەو پیاوەوەو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، پەیوەستە بە ژیانی مووساوە ﷺ کە بە دڵنیاییی ئەویش لەو کاتەدا بووە، کە مووسا ﷺ لەگەڵ فیرعەونـدا ڕووبەڕوو بۆتەوەو، فیرعەون هەڕەشەی کوشتنی لێ کردوە.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەکانـی: (٣٦ - ٤٢) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: لـە حـەوت (٧) ئایەتـان پێـک دێ، پوختەیەکـی قۆناغـی شەشـەمی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـاو گەلەکـەی و، فیرعـەون و دارو دەستەکەی و گەلـە گومڕایەکـەی تێدایـە، کـە بریتیـە لـە ڕووبـەڕوو بوونەوەیـان و، ئاماژەیەکیشـە بـە قۆناغـی نۆیەمـی ژیـان و بەسـەرهاتی مووسـا و فیرعـەون، کـە باسـی سـەر بـە فەتـارەت چوونـی فیرعـەون و سـوپاکەیەتی، بـە فڕێدانـە نێـو دەریـای سـوورو دەربـاز بوونـی مووسـا ﷺ و گەلەکـەی، صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر مووسـا و هاڕوونـی بـرای بـێ و، خـوا ﷻ لـە گەلـە بڕوادارەکـەی ڕازیبـێ.

﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئنجا کاتێک مووسا نیشانەو بەڵگە ڕۆشنەکانمانی بۆ هێنان (بۆ گەلی فیرعەون) گوتیان: ئەمە تەنیا جادوویەکی (بەناوی خواوە) هەڵبەستراوە و، ئەمەمان لە باب و باپیرانی پێشوومان‌دا نەبیستوە ﴿٣٦﴾ مووساش گوتی: پەروەردگارم بەو کەسە زاناترە کە ڕێنمایی لەلای ویەوە هێناوە و، کێش سەرەنجامی (چاکی) مەنزڵگای (دواڕۆژی) دەبێ، بە دڵنیایی ستەمکاران سەرفراز نابن (بە ئامانج ناگەن) ﴿٣٧﴾ فیرعەونیش گوتی: ئەی کاربەدەستان! جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شک نایەت! دەجا هامان ئاگرم بۆ لەسەر قوڕێ داگیرسێنە (خشتی سوورکراوەم بۆ دروست بکە) و کۆشکێکی بڵندم، بۆ دروست بکە، بەڵکو بچمە سەری و، ئاگاداری پەرستراوی مووسا بم و ببینم، هەرچەندە پێشم وایە لە درۆکەرانە (ئەو پەروەردگارەی ئەو بوونی نیە) ﴿٣٨﴾ سەرەنجام فیرعەون خۆی و سەربازەکانی لە زەوی (میسر)دا بە ناهەق خۆیان بەرزکردەوە (خۆیان بەسەر خەڵکدا سەپاند) و پێیان وابوو بۆ لامان ناگێڕدرێنەوە ﴿٣٩﴾ (بۆیە) لە ئاکامدا خۆی و سەربازەکانیمان گرت و فڕێماندانە دەریا(ی سوور)ەوە، دەجا سەرنج بدە! ئاکامی ستەمکاران چۆن بوو! ﴿٤٠﴾ (فیرعەون و دارودەستەکەی و سەربازەکانی) گێڕاشیانمانن بە پێشەوایانێک کە (خەڵک) بۆ لای ئاگر (ی دۆزەخ) بانگ دەکەن و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سەرناخرێن (هاوکاریی ناکرێن بۆ دەرباز بوون لە سزای خوا) ﴿٤١﴾ لەم (ژیانی) دنیایەشدا نەفرینمان شوێن خستن و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە دزێو و ڕووڕەشانن ﴿٤٢﴾}.

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَنَبَذْنَٰهُمْ): (النَّبْذُ: إلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ بِقِلَّةِ الإعْتِدَادِ بِهِ)، (نَبْذ) بریتیە لە فڕێدانی شتێک و، هەڵدانی بە شێوەیەک کە کەم بایەخیی تێدا بخوێنرێتەوە، لەو فڕێدانەدا، وەک یەکێک بە یەکێک دەڵێ: دوایی بە دوو پێتکان دەتگرم و فڕێت دەدەم، واتە: شتێکی بێ بایەخە.

(ٱلْمَقْبُوحِينَ): ناشیرین کراوان، یان ڕوو ڕەشان، (القَبِيحُ: مَا يَنْبُو عَنْهُ البَصَرُ مِنَ الأَعْيَان، وَمَا يَنْبُو عَنْهُ النَّفْسُ مِنَ الأَعْمَالِ وَالأَحْوَالِ)، (قَبيح) هەر شتێکە کە لە شتە بەرجەستەکان چاو لەسەری هەڵبنگوێ و، مرۆڤ حەز نەکات چاوی لێ بکات و چاوی تێبڕێ، لە کردەوان و لە حاڵەتانیش ئەوەیە کە نەفس بۆی نەچێ و کەیفی پێی نەیەت (بێزی لێبێتەوە).

(فَأَوْقِدْ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ): یانی: خشتی سوورم بۆ دروست بکە، بەڵام خوا ﷻ چۆنیەتی دروست کردنی خشتی سوور (پرۆسەکە)یش لەو تەعبیرەدا دەخاتە ڕوو، کە قوڕ دەبێ ئاگری بخرێتە سەرو، ئەو قوڕە بە شێوەیەکی تایبەت لە ئاگرەکەدا سوور بکرێتەوە، ئنجا دەبێتە خشتی سوور، یاخود دەفری لێ دروست دەکەن، وەک دیزە و گۆزە و کیتەڵە و کووپەو ...هتد.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا ئەوەی لەم حەوت (٧) ئایەتە موبارەکەدا هاتووە، پوختە و گوشراوی قۆناغی شەشەمی بەسەرهاتی مووسا ﷺ و فیرعەونە، وێڕای ئاماژەیەکی کورت بە قۆناغی نۆیەم بەپێی ئەو نەخشەیەی کە بەندە داینـاوە، بۆ خستنە ڕووی ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ کە سێزدە قۆناغە، ئنجا لەبەر ئەوەی ئێمە لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (الأعراف)دا لە سەرەتای ئەو ئایەتانەوە، کە بەسەرهاتی مووسا و فیرعەون دەخەنە ڕوو، کە ئاوا دەست پێ دەکەن:

﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ ﴾الأعراف، ... هتد، بە تایبەت ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٢٩)، لەوێ بە ڕوونیی و بە وردیی، قسەمان لەسەر ئەو قۆناغە کردوە، بۆیە لێرەدا بەخێرایی بەسەر تەفسیرکردنیاندا دەڕۆین.

شایانی باسیشە: ئەم قۆناغی شەشەمە لە بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و، گەلی بەنوو ئیسرائیل لە لایەک و، فیرعەون و دەستە و دایەرەکەی بە هامان و قاڕوونیشەوە، لە لایەکی دیکەوە، لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتوە، کە دەتوانین ئاماژە بە یازدە شوێن بکەین، لەو یازدە شوێنەدا، بە شێوەی بنەڕەتیی باسی ئەو قۆناغی شەشەمە کراوە، کە قۆناغێکی یەکجار گرنگ و هەستیارە، قۆناغی ڕووبەڕوو بوونەوەی مووسا و هاڕوونی برای (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەگەڵ فیرعەون و دەستە و دایەرەکەی دا:

١- سووڕەتی (یونس) ئایەتەکانی: (٧٥-٩٣)دا، واتە: نۆزدە (١٩) ئایەتی بۆ تەرخانکراون[١].

٢- سووڕەتی (الإسراء) ئایەتەکانی: (١٠١ - ١٠٣)دا، واتە: سێ ئایەتی بۆ تەرخانکراون.

٣- سووڕەتی (طه) ئایـەتەکانی: (٤٢-٧٦)دا، واتە: بیست و چوار (٢٤) ئایەتی بۆ تەرخانکراون.

٤- سووڕەتی (المؤمنون) ئایەتەکانی: (٤٥ - ٤٩)دا، واتە: پێنج ئایەتی بۆ تەرخانکراون.

٥- سووڕەتی (الشعراء) ئایەتەکانی: (١٠- ٦٨)دا، واتە: پەنجا و نۆ (٥٩) ئایەتی بۆ تەرخانکراون[٢].

٦- سووڕەتی (النمل): ئایەتەکانی: (٧ - ١٤)دا، واتە: هەشت ئایەتی بۆ تەرخانکراون.

٧- سووڕەتی (القصص) ئایەتەکانی: (٣٦-٤٢)دا، واتە: حەوت ئایەتی بۆ تەرخانکراون.

٨- سووڕەتی (غافر) ئایەتەکانی: (٢٣ - ٤٦)دا، واتە: بیست و چوار (٢٤) ئایەتی بۆ تەرخانکراون[٣].

٩- سووڕەتی (الزخرف) ئایەتەکانی: (٤٦ -٥٦)دا، واتە: یازدە (١١) ئایەت تەرخان کراون.

١٠- سووڕەتی (الدخان) ئایەتەکانی: (١٧-٢٣)دا، واتە: حەوت ئایەت تەرخانکراون.

١١- سووڕەتی (النازعات) ئایەتەکانی: (١٥ - ٢٦)دا، واتە: دوازدە (١٢) ئایەت تەرخانکراون.

کۆی هەموویان: سەدو حەفتاو نۆ (١٧٩) ئایەت.

هەڵبەتـە ئێمـە لـە تەفسـیری ئـەو سـووڕەتانەدا کـە هەتـا ئێسـتا ڕابـردوون، ئـەو ئایەتانەمـان تەفسـیرکردوون، کـە لـە بـارەی بەسـەرهاتی مووسـاوە ﷺ هاتـوون،

---

(١) کاتـی خـۆی بـە وردیـی لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (یونـس)دا، کـە بەرگـی نۆیەمـی ئـەم تەفسـیرە، پێـك دێنـێ، قسـەمان لێکـردووە.

(٢) وردەکارییەکانـی ئـەم قۆناغـە، بـە زۆریـی لـە سـووڕەتی (الشـعراء)، لـە ئایەتەکانـی: (١٠ - ٦٨)دا، هاتـوە و، ئـەو وردەکاریيانـەی لـە سـووڕەتی (الشـعراء)دا، هاتـوون، وەك کاتـی خـۆی تەفسـیرمان کـرد، لـە هیـچ کام لـە سـووڕەتەکاندا ئـەو وردەکاریيانـە نەهاتـوون.

(٣) هـەر بـۆ ئـەم قۆناغـی شەشـەمەیە، کـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی مووسـایە ﷺ لەگـەڵ فیرعەونـدا، کـە لـە سـووڕەتی (غافـر)دا، پیاوێکـی بـڕواداری ئیمانـی خۆپەنهانکـەر، لـە دەسـتەو دایـەرەی فیرعـەون، موڕافەعەیـەك و بەرگرییەکـی بـاش لـە مووسـا ﷺ دەکات و، بەرپەچییەکـی باشـی فیرعـەون دەداتـەوەو، تەنیـا لـە سـووڕەتی (غافـر)دا، ئـەوە بـەو شـێوەیە هاتـوە.

بـە تایبـەت تـەم قۆناغـەی شەشـەم، کـە زۆر ئایەتـی لـە بـارەوە هاتـوون، ئـەو سـوورەتانەش کـە مـاون و باسـی ئـەو قۆناغـی شەشـەمە دەکـەن، ئەگـەر خـوا ﷻ تەمەنمـان پێبـدا، کاتێـک پێیـان دەگەیـن، خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ، لـەوێ لـە کاتـی تەفسـیرکردنیاندا، ئـەو ئایەتـە موبارەکانـەش تەفسـیر دەکەیـن.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ ﴾، ئنجـا کاتێـک مووسـا نیشـانە ڕوونەکانمـانی بـۆ هێنـان، بـۆ گـەلی فیرعـەون، کـە مەبەسـت دەسـتی ڕاسـتیی و گۆچانەکـەی و حـەوت نیشـانەو بەڵگـەی دیکـەن، سـەرجەم نـۆ بەڵگـەو نیشـانە.

﴿ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٦ ﴾، گوتیـان: ئەمـە تەنیـا جادوویەکـی هەڵبەسـتراوەو، لـە بـاب و باپیـرانی پێشـوومان دا شـتی وامـان نەبیسـتوە، شـتێکی داهێـنراوە.

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ ﴾، مووسـاش گـوتی: پـەروەردگارم بـەو کەسـە زاناتـرە کـە ڕێنمایـی لەلایـەن ویـەوە هێنـاوەو، کێـش سـەرەنجامی (چاکـی) مەنزڵـگای (دواڕۆژی) دەبـێ!

﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٣٧ ﴾، بـە دڵنیایـی سـتەمکاران سـەرفرازو بـە ئامانـج گەیشـتوو نابـن، کـە بێگومـان مەبەسـتی مووسـا لـە سـتەمکارانی بێمـرادو بـێ نـاکام: فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیەتی.

﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴾، فیرعەونیـش گـوتی: ئـەی بریـار بـە دەسـتان! جگـە لـە خـۆم پەرسـتراوێکی دیکـەم بۆتـان نازانـم، پێـم شـک نایـەت! یـانی: جگـە لـە مـن هیچکـەس پەرسـتراوتان نیـەو، بـە قسـەکانی مووسـاو هـاڕوون فریـو مەخـۆن.

﴿ فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا ﴾، ئنجـا ئـەی هامـان! ئاگـرم بـۆ بخـە سـەر قـوڕ، (خشـتی سـوورم بـۆ دروسـتبکە)، ئنجـا کۆشـکێکم بـۆ سـاز بکـە (لـەو خشـتە سـوورانە).

﴿ لَعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ ﴾، بەڵكو لەسەر ئەو كۆشكەوە پەرستراوی مووسا - لە ئاسمانێ - بەدی بكەم، چونكە ئەوە دیارە لەسەر زەوی نیە، ئەگەرنا دەمانبینی!.

﴿ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ۝٣٨ ﴾، پێشم وایە، وا گومان دەبەم (مووسا) لە درۆكەرانیش بێ، پەرستراوەكەی لە ئاسمانیش نەبێ!.

﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ۝٣٩ ﴾، ئەو (فیرعەون)و سەربازەكانیشی بە ناهەق لەسەر زەمین - ی میصر - دا، خۆیانیان بە زلگرت و پێیان وابوو بۆ لامان ناگێڕرێنەوە، بۆ سزاو لێپرسینەوەو وەك بەرزەكی بانان بۆی دەردەچن.

﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠ ﴾، ئێمەش یەكسەر خۆی و سەربازەكانیمان گرتن و فڕێماندانە دەریاوە، ئنجا سەرنج بدە، سەرەنجامی ستەمكاران چۆن بوو! چۆن قڕەبڕ بوون و فریای هیچ شتێك نەكەوتن.

﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ۝٤١ ﴾، گێڕاشمانن بە پێشەوایانێك (خەڵك) بەرەو ئاگری دۆزەخ بانگ دەكەن (لە دنیادا) و، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا، سەرناخرێن و پشتیوانیی ناكرێن.

﴿ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ۝٤٢ ﴾، لەم ژیانی دنیایەدا نەفرینمان شوێنخستن و، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا هەر ئەوان لە ناشیرینكراوان و تەڵخ و ڕوو ڕەشكراوانن.

بەسەرنجدانە ئەم ئایەتانەش زۆر جوان دیارە، كە فیرعەون و دارو دەستەو شوێنكەوتووانی، خراپترین سەرەنجامی تێرەو ئەو لایەن هەیە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**چوونی مووسا ﷺ بە نیشانە و بەڵگە ڕۆشنەکانەوە بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی و، تۆمەتبارکرانی بە جادووگەرو، وەڵامدانەوەی مووسا ﷺ کە خوا ﷻ زاناترە، بەو کەسەی ڕێنمایی لە خواوە هێناوە (کە مووسایە)و، سەرەنجامی دوارۆژیشی خێر دەبێ (ئەو کەسەی هیدایەتی لە خواوە هێناوە)، ستەمکارانیش بێمرادو بێ ئاکامن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٦ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٣٧ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ ﴾، واتە: کاتێک مووسا ﷺ نیشانە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، جێی سەرنجە کە لێرەدا باسی هاڕوون نەکراوە (لێرە و لە زۆر شوێنی دیکەش)، لەبەر ئەوەی هاڕوون هاوکارو یارمەتیدەری مووسا و شوێنکەوتووی مووسا بووە.**

مەبەست لە: ﴿ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ ﴾، نیشانە ڕۆشنەکانمان، ئەو نۆ بەڵگەو نیشانەیەن، کە هەم لە سوورەتی (النمل)دا، لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ١٢ ﴾، هەروەها لە سوورەتی (**الإسراء**) یش دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ فَسۡـَٔلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِذۡ جَآءَهُمۡ فَقَالَ لَهُۥ فِرۡعَوۡنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا ١٠١ ﴾، ئەو نۆ موعجیزەیەش، هەر نۆیان یاسادڕ (**خارق العادة**) بوون و، زانایان لە سەرژمێریی کردنیان و، لە

دیاریکردنیانـدا ڕاجیاییـان هەیـە، بـەڵام وەک لـە تەفسـیری سـووڕەتی (الأعـراف)دا، باسـمان کـردوە، وا پێدەچێ ئـەم نۆیـە بـن:

١- گۆچانەکەی کە بۆتە هەژدیها و مارێکی گەورە.

٢- دەستی ڕاستیشی کە لە یەخەیەوە خستوویەتە بن قۆڵی و دەریهێناوە و، درەوشاوەتەوە.

دووی دیکەشـیان لـەم ئایەتـە وەردەگریـن: ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ١٣٠ ﴾الأعـراف: واتـە: ئێمـە فیرعـەون و شـوێنکەوتووانی فیرعەونمـان سـزادان، بـە سـاڵان (سـاڵانی گرانیـی و قـات و قڕیـی)و، کەمیـی لـە بەروبـووم و میـوەکان دا:

٣- ﴿ بِٱلسِّنِينَ ﴾، (سِنِين) کۆی (سَنَة)یە، واتە: ساڵی گرانیی و قات و قڕیی.

٤- ﴿ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، کەمیی بەروبووم، کشتوکاڵ و بەروبوومیان کە دەیانەویست ڕەنێوی بێنن، بەرهەمی بێنن، هیچی لێ پەیدا نەدەبوو.

ئەمانـەش دوو لـەو موعجیـزەو یاسـادڕانە بـوون، کـە مووسـا ﷺ پێـی بـوون، هەڵبەتـە مووسـا ﷺ ئـاگاداری کـردوون کـە ئەگـەر وەڵامـم نەدەنـەوەو واز لـە زوڵم و سـتەم نەهێنـن، ئەگـەر واز لـەوە نەهێنـن، کـە: سـۆغرە و بێـگار بکـەن بـە گەلـی سـتەمدیدەی بەنـوو ئیسـرائیل، خـوا ﷻ ئـەو بەڵایەتـان بەسـەر دێنـێ، پێشـتر پێـی فەرمـوون، ئنجـا کـە وەڵامیـان نەداوەتـەوە، بەڵاکەیـان بەسـەر هاتـوە، بـە تایبـەت سـاڵانی گرانیـی، هەروەهـا لـە دەسـت دانـی بەروبوومـی کشـتوکاڵ.

ئەمـە چـوار لـە نـۆ (٩) بەڵگـەو نیشـانەکانی مووسـا، پێنجەکـەی دیکـەش لـەو ئایەتـەدان کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ ١٣٣ ﴾الأعـراف، واتـە: ناردمانـە سـەریان:

٥- ﴿ ٱلطُّوفَانَ ﴾، ڕووباری نیل، هەڵدەستا هەموو شتیان ژێر تاو دەکەوت.

٦- ﴿ وَٱلۡجَرَادَ ﴾، کوللە، تاکەکەی (جرادة)یە، کە بەروبوومی دەخواردن.

٧- ﴿ وَٱلْقُمَّلَ ﴾، کۆی (قَمل)ە، ئەسپێ یاخود کێچ، ئنجا چ ئەوەی کە لە جەستەی مرۆڤ دەدات، کێچ و ئەسپێ، چ ئەوەی لە دەغڵ و دان دەدات.

٨- ﴿ وَٱلضَّفَادِعَ ﴾، بۆق (ضِفْدَع) کۆی (ضِفْدَعة)یە، بۆقەکان هێندە زۆر دەبوون، ژیانی لێ تاڵ کرد بوون، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا، باسمان کردوە، کە هەندێک لە توێژەرەوان دەڵێن: کاتێ یەکێکیان زاری هەڵدێنا قسە بکات، بۆق خۆی فڕێدەدا نێو زاری! ئەوەش ڕەنگە جۆرێک لە زێدەڕۆیی بێ.

٩- ﴿ وَٱلدَّمَ ﴾، خوێن، خوێنیان دەپژا، یاخود دەڵێن: دەیانویست ئاو بخۆنەوە، ئاوەکە دەبوو بە خوێن، بەهەرحاڵ خوا ﷻ باسی خوێن دەکات، ئیدی ئایا خوێنی خۆیان بووە پژاوەو خوێنییان لێ هاتوە (نەزیف بوون)، یاخود ئاوەکەیان بۆتە خوێن؟

مـن وای تێدەگـەم کـە ئـەو نۆیـە بـن، ئـەو نیشـانانە، چونکـە هەندێـک لـە توێـژەرەوان باسـی ئەوەیـان کـردوە: شـەق بوونـی دەریـا، ئـاو دەرقوڵیـن لـە گا بەردێـک، لـە لەتکـە چیایـەک، هەروەهـا سـێبەر لێکرانیـان لـە دەشـتی سـینادا، هەروەهـا دابارینـی گـەزۆ و باڵنـدەی (شـێلاقە)، بەڵـێ ئەوانـە موعجیـزە و یاسـادڕ (خـارق العـادة) بـوون، بـەڵام ئەوانـە دوای دەربازبوونـی بەنـوو ئیسـڕائیل بـوون لـە فیرعـەون، بـەڵام لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، یـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء.

کەواتـە: ئـەو نـۆ نیشـانەیە، کاتێـک بـوون کـە جـارێ بەنـوو ئیسـڕائیل هـەر لـە میسـڕ بـوون و، بـۆ ئـەوە بـووە پێشـانی فیرعـەون و دارو دەسـتەی فیرعـەون و گەلـی سـتەمکارییان بـدات، ئنجـا دیـارە هەندێک لـە ڕوونکەرەوەکانـی مانا و مەبەسـتەکانی قورئـان، بـاش دیقەتیـان نەداوەتـە هەندێـک لـە تەعبیرەکانـی قورئـان، هەڵسـاون موعجیـزەکانی پێـش دەربازبوونـی بەنـی ئیسـڕائیل و هـی دوای دەربازبوونیـان، تێکـەڵ کـردوون و نۆیـان لـێ هەڵبـژاردوون! کـە بێگومـان ئـەوە ڕاسـت نیـە، چونکـە

مووسا بەو نۆ ئایەتانەوە، بەو نۆ نیشانە ڕۆشنانەوە چۆتە لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، وەک لە سوورەتی (الإسراء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾..... فیرعەون پێی گوت: ئەی مووسا! ﷺ من پێموایە تۆ جادووت لێکراوە، هەروەها لە سوورەتی (النمل)دا کە دەفەرموێ: ﴿ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ﴿١٢﴾ ﴾، با ئەو دوو نیشانەیەت پێ بن، ئەو دوو بەڵگەیە: کە گۆچانەکەت و دەستتن، لە نێو نۆ موعجیزەدا، بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی، کەواتە: هەموو ئەو نۆیە هی قۆناغێک بوون کە جارێ مووسا ﷺ لە میسر بووەو لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕوو بۆتەوە.

٢)- ﴿ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى ﴾، کاتێک مووسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکان و نیشانە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، گوتیان: ئەمە بەس جادوویەکی هەڵبەستراوە، (**المُفْتَرَى: الكَذِبُ المُخْتَلَق، أي: سِحْرٌ مُفْتَرىً عَلَى الله**)، (**مُفْتَرَى**) یانی: درۆی هەڵبەستراو، واتە: ئەمە جادوویەکە بەناوی خواوە هەڵبەستراوە و هیچ پەیوەندیی بە خواوە نیە.

٣)- ﴿ وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەمەمان لە باب و باپیرانی پێشوومان، نەبیستوە، (**بِهَٰذَا**): (**أي: إدِّعَاءُ الرِّسَالَة**)، یانی: ئەو لاف لێدانی ڕەوانە کران لە لایەن خواوە، لە باب و باپیرانی پێشووماندا نەمانبیستوە.

ئەوەش درۆیەک بووە کردوویانە:

أ- یان دەبێ باب و باپیرانی پێشووشیان، هەر کەسێک لە پێغەمبەران هاتبێ بۆ لایان، بە جادووگەریان دانا بێ و، بە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایان دانەنابێ.

ب- یاخود ماوەیەکی پێچووەو، ئەوانەی مووسا ﷺ بۆ لایان ڕەوانکراوە، باس و خواسی پێغەمبەرانی پێشوویان لەلا نەماوە.

ج- یاخود هەر درۆیان کردووەو پێویست ناکات پاساویان بۆ بێنینەوە، درۆیان کردووە کە وایانگوتوە، باس و خواسیشیان بیستوە لە باب و باپیرانی پێشووشیانداو پێغەمبەریشیان بۆ هاتوە، بەڵام نکوولییان لێکردوە و درۆیان کردوە.

٤)- ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ ﴾، مووساش عليه السلام فەرمووی: پەروەردگارم زاناترە، بەو کەسەی ڕێنمایی لە لای ویەوە هێناوە، ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ ﴾، ئەمە دوو خوێندنەوەی هەن: بە بێ (و): (قَالَ مُوسَى)و، بە (و)ەکەشەوە: ( وَقَالَ مُوسَىٰ ).

ئنجا ئەگەر (و)کەی لەگەڵدا بێ، ئەوە بۆ بەراوردکردنی هەردوو بەڵگەی مووسا عليه السلام لەلایەک و، دارو دەستەکەی فیرعەون، کە بە جادووی هەڵبەستراوی دەزانن بە ناوی خواوە، لەلایەکی دیکەوە، یانی: ئەوان وایان گوت و، مووساش عليه السلام ئاوای فەرموو، ئەوان ئەوە بەڵگەیان بوو، کە ئەوە جادوویەکی هەڵبەستراوە بە ناوی پەروەردگارەوە، بە بەڵگەی ئەوە کە لە باب و باپیرانی پێشوویان دا شتی وایان نەبیستوەو، مووساش عليه السلام گوتی: پەروەردگارم زاناترە بەوەی کێ ڕێنمایی لە لایەن خواوە هێناوە، کەواتە: ئەمە ڕێنمایی خواو بەرنامەکەیەتی.

ئەگەر (و)ەکەشی لەگەڵدا نەبێ، ئەمە وەک ئەصڵی خۆیەتی بەسەرهاتە و دەگێردرێتەوە، هەموو جارێک پێویست ناکات (و)ی بادانەوەو گێڕانەوە بەکاربێ.

﴿ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾، بەو کەسەی ڕێنمایی هێناوە، ئایا کێ ڕێنمایی هێناوە؟ بێگومان مووسا عليه السلام بۆیەش بە (فعل الماضي) هێناویەتی، چونکە هاتنی ڕێنماییەکە، تێپەڕیوە و هاتۆتە دی.

﴿ مِنۡ عِندِهِۦ ﴾، (أي: مِنَ اللهِ تَعَالى)، لە لایەن خوای بەرزەوە، کە بە شێوەیەکی تایبەت ناردوویەتی.

٥)- ﴿ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾، هەروەها خوا زاناترە، بەوەی کێ سەرەنجامی مەنزڵگای (ڕۆژی دوایی) لە گرەودایە، کێ سەرەنجامی خێری مەنزڵگای ڕۆژی دوایی بە

قسمەت دەبێ، دەشکونجێ ﴿ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾، یانی: (عَاقِبَةُ الدَّارِ الدُّنيَا)، کێ سەرەنجامی خێری مەنزڵگای دنیای بە قسمەت دەبێ و، لە دنیادا سەرفراز دەبێ، پێشێ بۆ هیدایەتەکە، بە کرداری ڕابردوو: ﴿ بِمَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، بەڵام بۆ سەرەنجامی خێر: ﴿ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾، بە (فعل المضارع) چونکە جارێ ئەو سەرەنجامە نەهاتوە، (عَٰقِبَةُ): (الحَالَةُ العَاقِبَةُ التِي تَعْقُبُ أَيْ: تَجِيءُ عَقِبَ غَيرِهَا)، (عَاقِبَة) ئەو حاڵەیە کە دێ، لە دوای جگە لە خۆیەوە دێ، بە زۆری وشەی (عَاقِبَة) بۆ خێرو چاکە بەکارهاتوە.

٦)- لە کۆتاییدا مووسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ستەمکاران سەرفراز نابن، بە مراد ناگەن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بێگومان مەبەستی پێ فیرعەون و گەلەکەیەتی، بەڵام بۆچی بە: (ٱلظَّٰلِمُونَ) ناویان دێنێ؟ لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾، بێبڕوایەکان هەر ئەوان ستەمکاری ڕاستەقینەن، هەروەها لوقمان کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، هاوبەش بۆ خوا دانان، ستەمێکی گەورەیە.

ئنجا شیرک و کوفرەکەی فیرعەون و دارو دەستەکەی دیار بووەو، پەروەردگار ویستوویەتی ئەم مۆری زوڵم و ستەمیشیان بەنێو چاوانەوە بنێ، یانی: وێڕای ئەوەی کافرن و موشریکن، ستەمکاریشن، کە هەم ستەمیان لە گەلی بەنوو ئیسرائیل کردووەو، هەم ستەمیان لە خۆیان کردوە و، هەم ستەمیان لە مووسا و هاروون کردوە و، هەم ستەمیان لە پەیام و بەرنامەی خوا و لە هیدایەتی خوا کردوە و، ستەمیان لە گەلە چەواشە کراوەکەی خۆشیان کردوە، کە قیبتییەکانی میسر بوون، ئەو کات.

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین:

مووسا ﷺ زۆر میهرەبان و نەرم و نیان بووە، ئەوان دەڵێن: ئەوە جادوویەکی هەڵبەستراوەو شتی وامان لە باب و باپیرانی پێشوومانداا نەبیستوە،

بەڵام مووسا ﷺ چەند بە نەرمیی وەڵام دەداتەوە: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾، مووسا ﷺ فەرمووی: پەروەردگارم زاناترە، بەو کەسەی کە ڕێنمایی لە خواوە هێناوە، ناڵێ من ڕێنمایيم لە خواوە هێناوە، بەڵکو دەڵێ: پەروەردگارم زاناترە، ئنجا وەرن، سەرنج بدەن: ئایا ئێوە لەسەر ڕێنمايين لە خواوە، یان من؟ ﴿ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾، ئایا کێ سەرەنجامی مەنزڵگای دنیا (یاخود دواڕۆژ)ی بە قسمەت دەبێ، من یان ئێوە؟ ناڵێ مسۆگەر من سەرفرازم و، ئێوەش بەد بەخت و ماڵوێرانن، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ستەمکاران سەرفراز نابن، ناڵێ ئێوە ستەمکارن، هەر کامێک لە ئێمە ستەمکار بێ، سەرفراز نابێ.

(ئەحمەد شەوقی) شاعیر، قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: (**النُّصحُ ثَقِيلٌ فَلاَ تُرسِلهُ جَبَلاً، وَلاَ تَجعَلهُ جَدَلاً**)، (**نُصح**) یانی: دڵسۆزیی نواندن، بەڵام ئەو لێرەدا مەبەستی پێ (ئامۆژگاریی)یە، ئامۆژگاریی قورسە، وەک چیایەک مەینێرە بە قورسیی و، مەیکە شوێنی مشت و مڕو شەڕە قسەش، بەڵکو بە نەرمیی و میهرەبانیی بە بەرانبەرەکەتی بڵێ، هەروەها گوتراوە: (**الحَقَائِقُ مُرَّةٌ فاستَعِيرُوا لَهَا خِفَّةَ البَيَان**)، واتە: ڕاستییەکان تاڵن، ئێوەش ڕوونکردنەوەیەکی ڕووح سووکیان بۆ بخوازن، واتە: بە شێوەیەکی جوان و لە قاڵبێکی باشدا ئەو ڕاستییانە بخەنە ڕوو.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیاندنی فیرعەون بۆ ئەوە کە جگە لە خۆی پەرستراوێکی دیکەی بۆ بڕیار بەدەستان و گەلی میسر، پێ شک نایەت و، فەرمانکردنی بە هامان کە کۆشکێکی لە خشتی قوڕی سوورکراوەی بۆ دروست بکات، تاکو سەرکەوێتە سەری و لەوێوە لە سەریەوە سۆراغی پەرستراوی مووسا ﷺ بکات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

**١)- ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ﴾، فیرعەون گوتی، ئەی بڕیار بە دەستان! ئەم (و)ی (وَقَالَ) بۆ گێڕانەوەو بادانەوەی بەسەرهاتێکە بۆ سەر بەسەرهاتێکی دیکە، بۆیەش (و)ی بادانەوەو گێڕانەوە بەکارهاتوە، چونکە لێرەدا قسەکە لە مەقامی گفتوگۆ و وتووێژدا نیە، لەگەڵ مووسادا ﷺ، ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ﴾، یانی: وەک چۆن ئەوەی ڕابردوو بوو، ئەمەشی هاتە سەرێ.**

**﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ﴾، ئەی بڕیار بەدەستان! پێشتر گوتوومانە: (ٱلْمَلَأُ) (أي: الَّذِينَ يَمْلَئُونَ القُلُوبَ مَهابَةً)، ئەوانەی دڵی خەڵک پڕ دەکەن لە سام و هەیبەت، ئێمە بە بڕیار بەدەستان و، بە کاربەدەستان، بە ئەوانەی فیرعەون پشتی پێبەستوون، فیرعەونیش بە ناوونیشانی، حوکمڕانیی بانگیان دەکات، دەڵێ: ئەی بڕیار بەدەستان!.**

**٢)- ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى﴾، بۆ ئێوە نەمزانیوە پەرستراوێکی دیکە، جگە لە خۆم هەبێ.**

ئـەم تەعبیـرە ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە مـن هەمـوو شـتێک دەزانـم، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی مـن نەمزانیـوە، پەرسـتراوێکی دیکـە هەبـێ، جگـە لـە خـۆم، کەواتـە: بوونـی نیـە، یـانی: بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە مـن نەمزانیـوە پەرسـتراوێکی دیکـەی، جگـە لـە خـۆم بـۆ ئێـوە هەبـێ، بـەو بەڵگەیـە ئـەو پەرسـتراوە بوونـی نیـە، بۆیـە کـە مووسا دەڵـێ: جگـە لـە تـۆ پـەروەردگارو پەرسـتراوێکی دیکـە هەیـە، ڕاسـت نـاکات!.

ئنجا فیرعەون کە ئەو لافە لێ دەدات، دەیەوێ بەڵگەش بێنێتەوە:

٣)- ﴿ فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ ﴾، ئەی هامان! ئاگرم بۆ بخە سەر قوڕ، زانایان دەڵێن: (هامان) نازناوی وەزیریی فیرعەون بووە، یاخود (هامان) هەر ناو بووە، یانی: دەگونجێ هەموو وەزیرەکانی فیرعەون، هەر کەسە بە نۆرەی خۆی پێیگوترابێ: (هامان)، ئەمە ناوی ئەرک (وظیفة) بێ، نەک ناوی کەسیی، دەشگونجێ هەر ناوی کەسیی بێ.

ئنجا کـە دەڵـێ: ﴿ فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ ﴾، ئـەی هامـان! ئاگـرم بـۆ بخـە سـەر قـوڕ (أَي: إطبَخُـوا لِيَ الطِّـينَ ، وَأَوقِـدوا عَلَيْـهِ النَّـارَ لِصُنـعِ الآجُـرِّ)، واتـە: قـوڕم بـۆ بسـووتێنە، ئاگـری بخـە سـەرێ و، سـووری بکـەوە، تاکـو خشـتی سـوور دروسـت ببـێ، لێـرەدا چۆنیەتـی دروسـتبوونی خشـتی سـووریش دەخرێتـە ڕوو.

٤)- ﴿ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا ﴾، دوای ئەوەی خشتی سوورت دروستکرد، کەرەستەکەت دروستکرد، ئنجا کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، (الصَّرْحُ: أَي البِنَاءُ العَالِي، أَو القَصْرُ المُرتَفِع)، (صَّرح) خانووی بڵندە، یان کۆشکی بەرزە، یانی: کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە.

٥)- ﴿ لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ ﴾، بەڵکو بڕوانمە پەرستراوی مووسا ﷺ، یانی: بچمە سەر کۆشکەکەو لەوێوە تەماشا بکەم.

لەبـەر ئـەوەی وای وێنـا کـردوە کـە خوا لەسـەر زەوی بوونـی نیە، ئەو پەرسـتراوەی مووسـا، لەسـەر زەوی دیـار نیـە، ئنجـا ئەگـەر هەبـێ دەبـێ لـە ئاسـمان بـێ، بۆیـە

کۆشـکێکی بـەرزم بـۆ دروسـت بکـە، بـا بچمـە سـەر ئـەو کۆشـکە بـەرزەو تەماشـای ئاسـمان بکـەم، داخـۆ لەوێیـە؟!

٦)- ﴿ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، بە دڵنیایی پێشموایە (مووسا ﷺ) لە درۆکەرانە، لە ئاسمانیش بوونی نیە، واتە: پێموایە مووسا ﷺ لەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە پیشە و عادەتیان، بریتیە لە درۆکردن، ﴿ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، ئەوە مانای بەهێزترە، لەوە کە بگوترێ: (إِنِّي لأظُنُّهُ يَكذِبُ)، یاخود: (لأَظُنُّهُ كَاذِباً)، پێم وایە درۆ دەکات، پێم وایە درۆکارە، بەڵام ئەم تەعبیرە، یانی: هێندەی درۆ کردوە، چۆتە نێو قووڵایی ئەو کەسانەوە کە عادەتیان وایە، پیشەیان وایە درۆ دەکەن.

لێـرەدا چەنـد ڕایـەک هـەن، لـەو بـارەوە کـە ئایـا فیرعـەون ئـەو بینایـەی دروسـت کـردوە، یـان نـا؟

١- هەندێک گوتوویانە: ئەوە مەبەست پێی هەڕەمەکانە، کە بە عەرەبیی (هَرَمْ) بە (أهرام) کۆ دەکرێتەوە، هەڕەمەکان کە کاتی خۆی لە میسر دروست کراون، ئێستاش ماون، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە هەڕەمەکان هەر کامێکیان گۆڕی فیرعەونێک بووە، واتە: هەر فیرعەونێک ئەو هەڕەمەی بۆ خۆی دروستکردوەو دوایی کە مردوە، گوتوویەتی: بمخەنە ئەوێ، لاشەکانیان لەوێدا نێژراون، دوای ئەوەی مۆمیا کراون.

٢- هەندێ گوتوویانە: دروستیکردوەو سەرکەوتۆتە سەریشی و تەماشای ئاسمانی کردوە، هەندێکیش گوتوویانە: بینایەکەی دروستکردوە و چۆتە سەری، بەڵام ڕووخاوە و بۆ خۆشی فەوتاوە و، خەڵکێکی زۆریش لەوێدا فەوتاوە!

٣- هەندێکیش گوتوویانە: نەخێر، کە بینایەکەی دروستکردوە، ڕووخاوە و وخەڵکێکی زۆر لەوانەی کە کاریان تێدا کردوە لە ژێریدا فەوتاون، بەڵام بۆ خۆی جارێ نەچۆتە سەری.

٤- منیش پێموایە: ئەوە هەمووی سەفسەتەیەک و چەواشەکارییەک بووە، فیرعەون کردوویەتی، ئەگەرنا نە بینا دروستکراوە و بەرزکراوەتەوەو، نە فیرعەون چۆتە سەری،

بەڵكو فیرعەون مەبەستی بووە بۆ چەواشەكردنی خەڵك بڵێ: پەروەردگاری مووسا لەسەر زەوی نیە، دەبێ لە ئاسمان بێ، لە ئاسمانیش دیار نیە، ئەگەر بچینە سەر كۆشكی بەرزیش، تەماشا بكەین، هەر دیار نابێ، كەواتە: مووسا ﷺ ڕاست ناكات، كە پەرستراو و پەروەردگارێكی جگە لە من هەبێت، یانی: ئەگەر پەرستراو و پەروەردگاری مووسا ﷺ هەبێ، دەبێ ببینرێ و بەرهەست بێ، ئنجا لەسەر زەوی نایبینین، كەواتە: ئەگەر هەبێ دەبێ لە ئاسمان بێ، لەبەر ئەوەش كە دەرفەتمان نیە، بچینە ئاسمان، كەواتە: بەڵگەیەكمان نیە لەسەر بوونی پەرستراو و پەروەردگاری مووسا، پێموایە ئەوە مەبەستەكەی فیرعەونە.

ئنجا ئەو ئایەتە موبارەكە، وەك ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (غافر)وایە، كە خوا ﷻ تێیان دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: فیرعەون گوتی: ئەی هامان! كۆشكێكم بۆ دروستبكە، بەڵكو بگەمە ڕێیەكان، ڕێیەكانی ئاسمان، لەوێوە تەماشای پەرستراوی مووسا بكەم، پێشموایە درۆكارە، (خوا ﷻ دەفەرموێ:) ئاوا بەو شێوەیە كردەوە خراپەكەی فیرعەون بۆ فیرعەون ڕازێندرایەوەو، لە ڕاستە ڕێ لادرا (لە لایەن شەیتانەوە)و، پیلان و فێڵی فیرعەونیش هەر بەشی سەر بە فەتارەت چوون و لەبەین چوون بوو.

ئەم تەعبیرە كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾[1] غافر، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوتمان، چونكە لێرەدا خوا ﷻ ناوی لەو قسانەی فیرعەون ناوە (كَید)، پیلان، فێڵ، تەڵەكە، كەواتە: ئەو قسانە پیلان و تەڵەكەیەك بوون بۆ چەواشەكردنی خەڵك، بەو نێوەڕۆكە، كە گوتمان: فیرعەون ویستوویەتی بە خەڵكەكە بڵێ: هەر شتێك هەبێ، دەبێ بەرهەست بێ و ببینرێ، پەروەردگارو

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (غافر)دا بە درێژیی تەفسیری ئەو ئایەتانەمان كردوە.

پەرستراوی مووساش ﷺ لەسەر زەوی نابینرێ، کەواتە: دەبێ لە ئاسمان بێ، ڕێشمان نیە، بچینە ئاسمان، کەواتە: بەڵگەیەک نیە، لەسەر بوونی، ئەوە هەر هەمان قسەی مولحیدەکانی ئەم ڕۆژگارەیە، کە دەڵێن: هەر شتێک بە پێنج هەستەکان، دەرک نەکرێ، نیە، کە ئێمە لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحییدا)، زۆر باش هەم ئەو شوبهە و تۆمەتە، هەم سەرجەم ئەو شوبهە و تۆمەتانەی کە لە بارەی بوونی خواوە ﷻ، مولحیدەکان دەیانخەنە ڕوو، لە بیخ و بنج و بنەوانەوە هەڵمانتەکاندوون، هەروەها لە کۆمەڵێ لە کتێبەکانی دیکەی پێشووشماندا، وەک بەرگی دووەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)، هەروەها لە: (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی)داو، لە کتێبی: (ئیسلام و ڕێچکان، لە وتوێژی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا)، هەروەها لە کتێبی: (خواناسیی ئایینی ئیمان: درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ڕێچکان)، بە تایبەت لە بەشی یەکەمی دا: (خواناسیی)، ئەو تۆمەت و شوبهانەی مولحیدەکانمان، لە هەموو ئەو کتێبانەدا بەرپەرچداونەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خۆ بەزلگرتنی فیرعەون و سەربازەکانی لەسەر زەمینی میسردا بە ناهەق و، خەیاڵکردنی ئەوە کە ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا و، سەرەنجام سزادرانیان لە لایەن خواوە و، فڕێدرانیان بۆ نێو دەریای سوورو، نەفرین شوێنخرانیان لە دنیادا و، لە دوارۆژیشدا ڕوو ڕەش بوون و سەربەهەش بوونیان:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، واتە: خۆی و سەربازەکانی لە زەوییدا، لە سەرزەمینی میسردا، بە ناهەق خۆیان بە زلگرت، (الإِستِكبَارُ: التكَبُّرُ الشَّدِيد)، (إِستِكْبَار) لەسەر کێشی (اسْتِفْعَال)ە، (كِبر و تكَبُّر)، یانی: خۆبەزلگریی و خۆبەزلگرتن، بەڵام (إِستِكْبَار) یانی: زۆر خۆبەزلگرتن، بۆچی خوا ﷻ بەو تەعبیرەی هێناوە؟ چونکە بە خەیاڵ ویستوویەتی بکاتە پەروەردگاری مەزن، یاخود لەبەر ئەوەی نکووڵییکردوە لە بوونی خوای پەروەردگار ﷻ .

﴿ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، (التَّعرِيفُ فِي الأَرضِ لِلجِنسِ، أَي: عَالَمِ الأَرض، إذْ كَانُوا ذَلِكَ الحِين أَعْظَمَ أُمَمِ الأَرض)، وشەی (ٱلۡأَرۡضِ) کە ناسێنراو (مُعَرَّف)ە، ناساندنەکەی بۆ (جِنس)ە، واتە: هەموو سەر زەوی، چونکە لەو کاتەدا فیرعەون و دارو دەستەکەی مەزنترین ئۆممەتانی سەر زەوی بوون، حوکمڕانییەکی زۆر فراوانیان هەبووەو، زۆربەی سەرزەمینی گرتۆتەوە، ئەمە ڕایەکە.

بەڵام ئەوەی لە قورئاندا دەردەکەوێ، ئەوەیە کە بەس ئەو وڵاتەی کە ئێستا میسری پێ دەڵێن، دەستەڵاتی فیرعەون تەنیا ئەوێی گرتۆتەوە، کەواتە: ئەلیف و لام (ال)ەی ناساندنەکە بۆ (عَهد)ە: واتە: لەسەر زەمینی میسردا خۆیان بە زلگرت.

﴿ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، بێگومان خۆ بەزلگرتن هەر بە ناهەقە، بەڵام ئەم وەسفە بۆ ڕوونکردنەوەیە نەک بۆ خۆپاراستن (احتراز)، واتە: بۆ ئەوەیە کە بزانرێ ئەو خۆ بەزلگرییە بە ناهەق بووەو، بۆ زیاتر وەسفکردنی خۆبزلگرتنەکەیان و، ناشیرینکردن و ناشیرین خستنە بەر چاویەتی، ئەگەرنا خۆبەزلگرتن هەر بە ناهەقەو، خۆبەزلگرتنی بە هەق، بوونی نیە، واتە: بۆ ئەوە نیە کە جیای بکاتەوە لە خۆبەزلگرتنێکی دیکە، کە بە هەقە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە ناقۆڵایی و ناشیرینیی ئەو خۆبەزلگرییە، زۆر جوان بەرجەستە بکات و پێشانی بدات.

٢)- ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴾، واتە: پێیان وابووە بۆ لای ئێمە ناگێردرێنەوە، (أي: ظَنُّوا عَدَمَ الرُّجوعِ إلى الله)، پێیان وابوو: ناگێردرێنەوە بۆ لای خوا ﷻ، ناچنەوە بۆ خزمەتی، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴾؟ چونکە نکووڵییان کردوە لە بوونی خوا ﷻ، لە بوونی پەروەردگار، بۆیە فیرعەون گوتوویەتی: بەس من پەرستراوتانم و نکووڵییکردوە لە بوونی خوای پەروەردگار، کە پەرستراوی بە هەقە، ئنجا کە نکووڵیی لە بوونی خوا کرد، مانای وایە دەبێ ئەو بپەرستێ! بۆیەش هەمیشە حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ بە پەروردگارو بە پەرستراو زانەکان، ڕەواج بە کوفرو ئیلحاد دەدەن، تاکو زەمینە خۆش بێ بۆ شیرک و، زەمینە خۆش بێ بۆ کوفرو، سەرەنجام زەمینە خۆش بێ بۆ پەرستنی ئەوان، وەختێک خواپەرستیی و خوا بە یەکگرتن لە دڵ و عەقڵی خەڵکدا نەما، زەمینە خۆش دەبێ بۆ ئەوەی جگە لە خوا ﷻ، شتانێکی دیکە بپەرستێ، ئنجا خۆیان وەک پەرستراو و پەروەردگار بۆ پێشنیار دەکەن و دەخەنە ڕوو.

٣)- ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ ﴾، واتە: خۆی و سەربازەکانیمان گرت.

٤)- ﴿ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ﴾، ئنجا بە بێ بایەخییەوە فڕێماندانە دەریاوە.

لێرەش و لە سووڕەتی (الذاریات)یش دا دەفەرموێ: ﴿ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ﴿٤٠﴾ ﴾ الذاریات، واتە: فڕێماندانە نێو دەریا، کە مەبەست پێی دەریای سوورە، (اليَمّ) بە مانای دەریا دێ و، بە مانای ئاوێکی زۆریش دێ، چ ڕووبارێکی گەورە بێ، چ دەریا بێ.

٥)- ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، یانی: ستەمیان کردو ستەمەکەیان بەردەوام بوو، چونکە (ظَالِم) کۆیەکەی (ظَالِمِين)ە، یان (ظَالِمون)ە، کە (اسم فاعل)ە، کەواتە: ستەمەکەیان بەردەوام بووە، چونکە ناو (إسم) چەسپاویی و بەردەوامیی دەگەیەنێ.

٦)- ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، کردمانن بە پێشەوایانێک کە خەڵکیان بۆ لای ئاگر (ئاگری دۆزەخ) بانگ دەکرد.

٧)- ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا سەر ناخرێن، پشتیوانیی ناکرێن و یارمەتیی نادرێن.

٨)- ﴿ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ﴾ لەم دنیایەدا نەفرینمان شوێن خستن و دووریی ئەوانمان لە بەزەیی خوا ﷻ، کردە شتێکی پەیوەست، پێیانەوە لە ژیانی دنیایاندا، واتە: کە دروستکراوەکان نەفرینیان لێ بکەن و دوورخرانەوە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا ﷻ ببێتە پشک و بەشیان، ﴿ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ ﴾، واتە: نەفرینمان بە دوا خستن، نەفرینەکە گرتنی و پێیانەوە لکا.

٩)- ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴾، واتە: لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا ئەوان لە ناشیرینان و، لە ڕوو ڕەشان و سەر بەهەشانن، (المَقبُوحُ: المَشْتُومُ بِكَلِمَةِ قَبِيح: قَبَّحَهُ الله)، یانی: ڕوو ڕەش و ناشیرین و، قێزەون و دزێو، لە ڕۆژی دواییشدا لەوانن، (مقبوح)یش کەسێکە بە وشەی ناشیرین جنێوی پێدرابێ.

لێرەدا وشەی: ﴿أَئِمَّةً﴾، بەكارهاتوە، كە كۆی (إمام)ە، پێشەوا، كەسێك كە لە پێش خەڵكیكەوەیە، ئیمام هەر كەسێكە چاوی لێ بكرێ و، بكرێتە سەرمەشق لە كاری خێر یاخود شەڕدا، ئنجا لێرەدا دەفەرموێ: ئەوانمان كردە پێشەوا، پێش خەڵك دەكەون بەرەو ئاگری دۆزەخ، ئەمە یانی:

١- لە دنیادا پێشیان دەكەون، بە ڕێی كوفرو شیرك و ئیلحاددا، كە سەرەنجام تووشی ئاگری دۆزەخ دەبن.

٢- یاخود هەر لە ڕۆژی دواییدا، پێش خەڵكەكە دەكەون و بانگیان دەكەن، بەرەو لای ئاگری دۆزەخ.

هەردوو واتایەكەی هەن، بەڵام واتای یەكەمیان وێچووترو بەهێزترە، یانی: ئەوانەمان والێكردن لە دنیادا خەڵك بانگ بكەن بۆ لای ئاگری دۆزەخ و، لە ڕۆژی دواییشدا سەر ناخرێن و پشتیوانی ناكرێن و، لەم ژیانە دنیاییەدا نەفرینمان شوێن خستن و پێوەلكاندن و، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا ئەوانە لەنێو كەسانێكدان كە ڕوو ڕەش و سەربەهەش و، ناشیرین و قێزەونن.

# کورتە باسێک لە سێ سەرنج دا

١)- پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا، کە لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، لە فەرموودەیەکی قودسیدا، دەفەرموێ: خوا فەرموویەتی: [**الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي ، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا، قَذَفْتُهُ فِي النَّارِ**]، (**أخرجه أحمد: ٩٣٤٨، وأبو داود: ٤٠٩٠، وابن ماجه: ٤١٧٤، ابن حبان: ٥٦٧١، عَنْ أَبِي هريرة** ﷺ)، واتە: خوا ﷻ دەفەرموێ: گەورەیی پۆشاکمەو مەزنیی کراسمە، هەر کەسێک مشت و مڕم لەگەڵ بکات، لەسەر یەکێک لەو دووانە، دەیخەمە نێو ئاگر.

کە دەفەرموێ: (رِدَائِي وَإِزارِي)، واتە: وەک چۆن کەسێک کە پۆشاکێک لەبەر دەکات، تایبەتە بەوەوە، خوای پەروەردگاریش ئەو دوو سیفەتە تایبەتن بەوەوە، وەک چۆن پۆشاکی کەسێک تایبەتە بەو کەسەوە، ئەو دوو سیفەتەش تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوە، هەر کەسێک خۆی بەزلبگرێ، یان خۆ بە مەزن بگرێ، شایستەی سزای خوای دادگەر دەبێ و فڕێدەدراتە نێو ئاگرەوە، چونکە گەورەیی و مەزنیی تایبەتن بە خواوە ﷻ.

٢)- (**الرَّازي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[١]، دەڵێ: (**قَالَ الْجُبَّائِيُّ الْآيَةُ تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ تَعَالَى مَا أَعْطَاهُ الْمُلْكَ، وَإِلَّا لَكَانَ ذَلِكَ بِحَقٍّ، وَهَكَذَا كُلُّ مُتَغَلِّبٍ، لَا كَمَا ادَّعَى مُلُوكُ بَنِي أُمَيَّةَ عِنْدَ تَغَلُّبِهِمْ أَنَّ مُلْكَهُمْ مِنَ اللَّه تَعَالَى، فَإِنَّ اللَّه تَعَالَى قَدْ بَيَّنَ فِي كُلِّ غَاصِبٍ لِحُكْمِ اللَّه، أَنَّهُ أَخَذَ ذَلِكَ بِغَيْرِ حَقٍّ، واعلم أن هذا ضعيف لأن وصول ذلك الملك إليه، إما أن يكون منه، أو من الله تعالى، أو لا منه، ولا من الله تعالى، فإن كان منه، فلِمَ لَمْ يَقدِر عليه غيره، فربما كان العاجز أقوى وأعقل بكثير من المتولي للأمر؟ وإن كان من الله تعالى، فقد صَحَّ الغرض، وإن كان من سائر الناس فلم اجتمعت دواعي الناس على نصرة أحدهما وخذلان الآخر؟ واعلم أن هذا أظهر من أن يرتاب فيه العاقل**).

---

(١) التفسيرُ الكَبير: ج٢٤، ص٢٢٩، ٢٣٠.

سـەرەتا دەڵێـم: جێـی خەفـەت و دڵتەنگییـە کـە زۆرجـار ڕوونکەرەوانـی مەبەسـتەکانی قورئـان، بـە تایبـەت فەخرەددینـی ڕازیـی، هەروەهـا لـە تەفسـیرەکانی دیکەشـدا کـەم و زۆر ئـەوە هەیـە، ئایەتەکانیـان تەفسـیر کـردوون، لـە بـەر ڕۆشـنایی قوتابخانـە و مەشـڕەبە فیکرییەکانـی ڕۆژگاری خۆیانـدا، ئێسـتا (ڕازیـی) لێرەدا دەڵـێ:

جوببائیـی گوتوویەتـی: ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە خـوای بـەرز، ئـەو موڵـک و دەسـەڵاتەی نەدابـوو بـە فیرعـەون، ئەگەرنـا ئەگـەر پێیدابایـە بـە هـەق دەبـوو، (واتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، دەڵـێ: بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، چونکـە دیـارە خـوا پێینـەداوە)، هەروەهـا هـەر خۆسـەپێنەرێک کـە خـۆی دەسـەپێنێ بەسـەر خەڵـک و وڵاتـدا، مانـای وایـە حوکمڕانییەکـەی بـە ناهەقـە و خـوا پێینـەداوە، نـەک وەک پادشـاکانی بەنـوو ئومەییـە کاتێـک زاڵبـوون، لافیـان لێـدا کـە موڵـک و حوکمڕانییەکەیـان لـە خـوای بەرزەوەیـە، چونکـە خـوای بـەرز ڕوونـی کردۆتـەوە کـە هـەر داگیرکەرێـک بـۆ حوکمـی خـوا ﷻ، مانـای وایـە بـە ناهـەق ئـەو حوکمـەی وەرگرتـوە.

[(الجبـائي) دەیـەوێ بیرۆکـەی موعتەزیلـە بـاس بـکات، کـە ئـەوە کـردەوە خراپـەکان، خـوا ﷻ نایانخوڵقێنـێ، بەڵکـو مرۆڤـەکان بـۆ خۆیـان دەیانهێننـە دی و، خۆیـان پەیدایان دەکـەن، کـە بـە حیسـاب ئـەوە بەرگرییکردنـە، لـە دادگەریـی خـوا.

ئنجـا (فەخرەددینـی ڕازیی)یـش بـەو لادا دەچـێ، کـە دیـارە ئەویـش تەبەننیـی بیرۆکـەی ئەشـاعیرەی کـردوە، کـە نەخێـر هەمـوو شـتێک خـوا ﷻ بەدیهێنەریەتـی، بۆیـە دەڵـێ:] بزانـە کـە ئـەو ڕایـە بێهێـزە، چونکـە ئـەو حوکمڕانییـە کـە گەیشـتۆتە دەسـتی فیرعـەون، لـە سـێ حـاڵان بـەدەر نیـە:

أ- یان بۆ خۆی بەدەستی هێناوە.

ب- یان لە خواوەیە.

ج- یان نە لە خۆیەوەیەو نە لە خواوەشە.

ئەگەر لەوەوە بێ، باشە بۆچی ئەو توانی دەستەڵات بەدەستەوە بگرێ و، بۆچی خەڵکێکی دیکە نەیتوانی؟ چونکە جاری وا هەیە بابایەکی بێ توانا، بەهێزترە و، عاقڵترە لە زۆر لەوانەی کە حوکمڕانن، [کەسێک کە حوکمڕان نیە، هەیە عاقڵترە و بە تواناتریشە و، وریاتریشە لەو کەسەی کە حوکمڕانە، ئەگەر بەلێزانیی و بە عەقڵ و توانا بووایە، دەبووایە ئەو بووبایە بە حوکمڕان]، ئەگەر لە خوای بەرزیشەوە بێ، ئەوە ئامانجەکە هاتە دی [کە خوا ﷻ ئەو دەسەڵاتەی پێداوەو، هەر کەسێکی دیکەش کە دەبێتە حوکمڕان، خوا ﷻ پێی دەدات]، ئەگەر لە خەڵکیشەوە بێ، دەپرسین: بۆچی هاندەرەکان بۆ خەڵک کۆبوونەوە، کە یارمەتیی ئەویان بدەن، کە بۆتە حوکمڕان و یارمەتیی ئەوی دیکە نەدەن، کە نەبۆتە حوکمڕان؟ بشزانە کە ئەمە لەوە ئاشکراترە هیچ عاقڵێک تێیدا دوو دڵ بێ.

[دەڵێم: بۆ وێنە:

یارمەتیی (أَبو عبّاس السَّفّاح وَأَبو جَعفرِ المَنصور) بدەن، بەڵام یارمەتیی (حسین بن علي) و (عبدالرحمن بن الأَشعَث) و (زيد بن علي بن الحسين)و ئەوانە نەدەن (خوا لێیان ڕازی بێ)].

منیش دەڵێم:

مەرج نیە هەر شتێک بە ویستی خوا بوو، بە پێی ڕەزامەندیی خوا و، بە پێی شەریعەتەکەشی بێ، کەواتە: هیچ کام لە جوبباتیی و ڕازیی نەیانپێکاوە و، زۆریش جێی داخە کە (قَدَرِیة) و (أَشاعِرة) و (حَنابِلة) و (شِیعة)و... هتد، ئایەتەکانی قورئانیان بە پێی زاراوە و چەمک و بۆ چوونە حیزبییەکانی خۆیان، تەفسیر کردوون، ئنجا لە ڕاستییدا وەک زۆرجاری دیکە گوتوومە: کردەوەکانی مرۆڤ دروستکراو نین، تاکو پێویست بکات خوا ﷻ پەیدایان بکات، وەک ئەشعەرییەکان و جەبرییەکان گوتوویانە، یاخود مرۆڤ ئەو کردەوانە بە دیبێنێ، وەک موعتەزیلە و قەدەرییە، گوتوویانە، بەڵکو کردەوەکانی مرۆڤ، وەدەستهێنراون و، ئەنجامدراو {(مَكسوب)و

(مَفعول)ن و، مرۆڤیش خوا ئەو توانایەی پێداوە بتوانێ کردەوەکانی خۆی وەدەست بێنێ، وەک بە دەقی ئایەت، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾البقرة - ٢٨٦- واتە: مرۆڤ بەهرەمەندە لەوەی کە بە دەستی دێنێ لە چاکەو، زەرەرمەندە لەوەی بەدەستی دێنێ لە خراپە، کەواتە: مرۆڤ دەتوانێ خێر بە دەست بێنێ و، شەڕیش بەدەست بێنێ و، لەسەر ئەوەش پاداشتی هەیە و، سزاشی هەیە و، خوا ﷻ دروستکردن(خلق)ی تایبەت کردوە بەخۆیەوە، هەروەها فەرمان (أمر)یشی تایبەت کردوە بە خۆیەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴿٥٤﴾ ﴾الأعراف، واتە: ئاگادار بن! بەدیهێنان و بڕیاردان، هی ویە، بڕیاردان بە مانای بڕیاری تەکوینیی، خوا ﷻ گەردوون دەسووڕێنێ و، گەردوونی هێناوەتە دی و، کۆتایی پێ دێ، لە کاتی دیاریکراودا، ئەوە هەمووی بە دەست خوایە، هەروەها بەدیهێنانیش بەدەست خوایە، بەڵام ئەنجامدان: (فِعل) و (عَمَل) و (کَسب) و (إقتِراف) و (اجتِراح) و (جَعل)، ئەوانە هەموویان خوا ﷻ بۆ کردەوەکانی مرۆڤی بەکارهێناون، وەک لە (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طحاویی)دا، گوتوومانە و، لە مەوسووعە عەرەبییەکەماندا: (الإسلامُ كَما يَتَجَلّى في كِتابِ اللهِ)، لە کتێبی دووەمدا باسمان کردوە و، بەوەش لەو گێرە و کێشەی بەینی جەبرییە و قەدەرییە، یاخود موعتەزیلە و ئەشاعیرە، دەرباز دەبین و، هیچ ناچار نابین کە بڵێین: کردەوەکانی مرۆڤ، یان دەبێ خوا ﷻ بیانخوڵقێنێ، کە ئەو کاتە مرۆڤ هیچی بۆ نامێنێتەوە، یان مرۆڤ بۆ خۆی دەیانخوڵقێنێ، کە ئەو کاتەش وێڕای خوا کە بەدیهێنەر (خالق)ە، مرۆڤیش خەڵق و وەدیهێنانی پاڵدەدرێتە لاو ئەوەش نەگونجاوە.

بەڵکو دەڵێین: کردەوەکانی مرۆڤ بەدیهێنراو (مخلوق) نین، تاکو پێویستییان بە بەدیهێنەر (خالق) بێ، بەڵکو ئەنجامدراو (مفعول)ن و، تەنیا بە ئەنجامدەر (فاعل) دێنە دی و، وەدەستهێنراو(مکسوب)ن و، تەنیا پەکیان لەسەر (كاسِب) و وەدەستهێنەرێک کەوتوە، نەک پەیداکەرێک، چونکە لە نەبوونەوە نەهاتوونە دی، ئایا مرۆڤ کە نوێژێک ئەنجام دەدات، یان کەسێک کە فەتڵێک دەکات، یان

زینا دەكات، یان شەراب دەخوات، یان حەج دەكات، یان عەمرە دەكات، شتێكی نەبوو، پەیدا بووە؟ نەخێر، هەر ئەندامەكانی كە خوا ﷻ دروستیكردوون، دەیانجووڵێنێ و، هەست و نەستەكانی ئاراستەی كردەوەكان دەكات و، شتێك پەیدا نەبووە كە لە نەبوون (عَدَم)ەوە، هێنرابێتە دی، تاكو یەكێ لەسەر بەدیهێنەر بكەوێ، بەڵكو ئەو شتە لە وێ دەگوازێتەوە بۆ ئەوێ، ئەو ئەندامە بەو شێوەیە دەیجووڵێنێ، یانی: هەر كردار (فِعل)و وەدەستهێنان (كسب) لە ئارادا هەیە، ئنجا مرۆڤیش هەم (فاعِل)ە و، هەم (جَاعِل)ە و، هەم (كَاسِب)ە و، هەم (مُكتَسِب)ە.

٣)- كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذْنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ ﴾، واتە: خۆی و سەربازەكانیمان گرت، ﴿ فَنَبَذْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، فڕێماندانە نێو دەریاوە، خاوەنی تەفسیری (الكَشَّاف) زەمەخشەریی، لە تەفسیرەكەی خۆیدا، وەك فەخرەددینی رازیی[1] لێی دەخوازێتەوە، ئاوا ئەم ڕستە قورئانییە شیی دەكاتەوە، دەڵێ: (فَهُوَ مِنَ الْكَلَامِ الْمُفَخَّمِ الَّذِي دَلَّ بِهِ عَلَى عِظَمِ شَأْنِهِ وَكِبْرِيَاءِ سُلْطَانِهِ، شَبَّهَهُمْ اسْتِحْقَارًا لَهُمْ وَاسْتِقْلَالًا لِعَدَدِهِمْ، وَإِنْ كَانُوا الْكَثِيرَ الْكَثِيرَ وَالْجَمَّ الْغَفِيرَ، بحصيات أَخَذَهُنَّ آخِذٌ فِي كَفِّهِ فَطَرَحَهُنَّ فِي الْبَحْرِ).

دەڵێ: ئەم قسەیە كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذْنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ﴾، ئەمە جۆرە قسەیەكی زۆر ئاست بەرزە، كە ئەو تەعبیرە دەلالەت دەكات، لەسەر مەزنیی پێگەی خوا ﷻ و، گەورەیی دەستەڵاتی خوا ﷻ، كە فیرعەون و سەربازەكانی دەچوێنێ، لە ڕووی بە كەم تەماشا كردن و، لە ڕووی بە كەم دانانی ژمارەكەیانەوە، هەرچەندە گەورەش بوون و زۆریش بوون، دەیانشوبهێنێ بە چەند دەنكە چەوێكەوە، كە بابایەك دەیانخاتە لەپە دەستی خۆی و فڕێیان دەداتە نێو دەریاوە.

بەڕاستیی تەعبیرەكەی زۆر جوانە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) التفسير الكبير: ج٢٤، ص٢٣٠.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان سـێزدە (١٣) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٤٣ - ٥٥)، لـەو سـێزدە (١٣) ئایەتـەدا، خـوا ﷻ چەنـد ڕاسـتییەکی گـەورە و گرنـگ، لـە بـارەی قورئانـەوە دەخاتـەڕوو، کـە ناگونجـێ قورئـان لـە لایـەن جگـە لـە خـواوە بـێ، چونکـە ئـەو وردەکاریيانـەی لـە بـارەی مووسـا ﷺ و گەلـی مەدیەنـەوە گرتوونیـە خـۆی، موحەممـەد ﷺ لـەو کاتـەدا، لـەو شـوێنانە نەبـووە، کـە خـوا ﷻ مووسـای ﷺ تێـدا دوانـدوون و، پەیامـی خـۆی بـۆ نـاردوە، هەروەهـا کـە گەلـی مەدیـەن، شـوعەیب ﷺیـان بـۆ ڕەوانکـراوە.

پاشـان خـوا ﷻ بـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری کۆتایـی دەفەرمـوێ: کـە بـە جوولەکـەکان، بڵـێ: ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن، قورئـان لـە لایـەن خـواوە بـۆ پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ دانەبەزێـنراوە، بـا کتێبێکـی دیکـەی پـڕ هیدایەتـر لـە قورئـان و تـەورات، لـە خـواوە بهێنـن!

دواییـش باسـی هەڵوێسـتی بڕوادارانـە و بەویژدانانـەی، کۆمەڵێـک لـە خـاوەن کتێبـەکان دەکات و، بـە کۆمەڵێـک سـیفەتی گـەورە و پەسـند وەسـفیان دەکات.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِىِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم

مِن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە دڵنیایی دوای ئەوەی سەدە (كۆمەڵگا) پێشووەكانمان فەوتاندن، كتێب (تەورات)مان، دا بە مووسا، بەرچاوڕوونییەكانی بۆ خەڵكی تێدا بوون و، ڕێنمایی و (مایەی) بەزەیی (خوا) بوو، بۆیان، بەڵكو پەند وەربگرن ( و ڕاستییەكانیان بیر بكەونەوە) ﴿٤٣﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ!) لەو كاتەدا كە كاری (پەیام ناردنمان بۆ لای) مووسا تەنجام دا، تۆ لە تەنیشت ڕۆژئاوا (ی چیای طوور) نەبووی و لەوێ ئامادە نەبووی (تاكو بزانی چی لەگەڵ مووسادا گوزەراوە و، ئاوا بە وردیی بۆیان باسبكەی) ﴿٤٤﴾ بەڵكو (هۆی نامۆ بوونەوەی گەلەكەت بە

وەحیـی پێغەمبـەران نەوەیـە کـە)، ئێمـە چەنـدان سـەدەمان پێکەیانـدن و، (ئـەو کۆمەڵکایانـە) تەمەنێکـی زۆریـان بەسـەردا ڕۆیـی (تاکـو شـوێنەواری پێغەمبەرانیـان لـە دڵ و هۆشـدا کـز بـوو، بۆیـە تۆمـان ڕەوانکـرد)، هەروەهـا تـۆ لـە نێـو خەڵکـی مەدیەنـدا، نیشـتەجێ نەبـووی (تاکـو لـەو بـارەوە) ئایەتەکانـی ئێمەیـان بەسـەردا (بەسـەر خەڵکەکـەت دا) بخوێنیـەوە، بەڵکـو تەنیـا خۆمـان نێـرەرو ڕەوانەکـەر (ی تۆ) بوویـن ﴿٤٥﴾ هەروەهـا (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) لـەو کاتـەدا کـە بانـگ (ی مووسـا) مـان کـرد، لـە نیزیـک طـوورەوە، تـۆ ئامـادە نەبـووی (تاکـو ئـاوا بـە وردیـی ئـەوەی لـەوێ گـوزەراوە، باسـی بکـەی)، بەڵکـو ئـەم (پەیـام و قورئـان)ە، بەزەییـەک بـوو لـە پەروەردگارتـەوە، تاکـو کۆمەڵێکـی پـێ بترسێنی و هۆشـیار بکەیـەوە، کـە بـەر لـە تـۆ هیـچ ترسـێنەریان بـۆ نەهاتـوون، بەڵکـو بیریـان بکەوێتـەوەو پەنـد وەربگـرن ﴿٤٦﴾ ئەگـەر لەبـەر ئـەوەش نەبووایـە، کاتێـک بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەسـتەکانیان پێشـی دەخـەن (لـە کوفـرو خراپـە) بەڵایەکیـان بەسـەر دێ، بڵێـن: پەروەردگارمـان! خۆزگـە پێغەمبەرێکـت بـۆ لا ناردبایـن، کـە شـوێن ئایەتەکانـت بکەویـن و، لـە بـڕواداران بیـن، (لەبـەر ئـەوە نەبووایـە تۆمـان بـۆ لایـان ڕەوان نەدەکـرد، بـەڵام ناردمانـی تاکـو ئـەو بیانـوو و پاسـاوەیان نەبـێ) ﴿٤٧﴾ کەچـی کاتێکیـش (تۆمـان نـاردو) هەقیـان لەلایـەن ئێمـەوە (بـە هـۆی تـۆوە) بـۆ هـات، (لـە جیاتـی وەرگرتنـی) گوتیـان: دەبووایـە (موحەممەدیـش) هەمـان شـت (لـە موعجیـزە بەرهەسـتەکان) کـە بـە مووسـا دراوە، پێـی بـدرێ، ئـەدی بـەوەش کـە پێشـتر بـە مووسـا درابـوو، بێبـڕوا نەبـوون! گوتیـان: (مووسـا و هـاڕوون) دوو خـاوەن جادوون، پشـتگیریی یەکدییـان کردوە (لـە دژمـان) و گوتیـان: بـە هـەر کامێکیـان بێبڕوایـن؟ ﴿٤٨﴾ (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) بڵـێ: ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن: کتێبێکـی دیکـەی ڕێنماییکارتـر لـەو دووانـە (قورئـان و تـەورات) لـە لایـەن خـواوە بهێنـن، شـوێنی دەکـەوم ﴿٤٩﴾ ئنجـا ئەگـەر وەڵامیـان نەدایـەوە (بـۆ جێبەجێکردنـی ئـەو داوایـە)، بـە دڵنیایـی بزانـە کـە ئـەوان تەنیـا دوای ئارەزووەکانیـان دەکـەون و، ئایـا کێـش لـەو کەسـە گومڕاتـرە کـە بەبـێ ڕێنمایـی لـە

خـواوە، شـوێن نـارەزوو (ی خـۆی یـان خەڵـک) دەکـەوێ؟ بێگومـان خـوا کۆمەڵـی ستەمکاران ڕاستەڕێ ناکات ﴿٥٠﴾ بـە دڵنیاییـش ئێمـە فەرمایشـتی خۆمانمـان بـۆ بـەردەوام و پەیوەسـتکردن (سروش و پەیامـی خۆمانمـان بـە بەردەوامیـی بـۆ نـاردن و نەمـان پچڕانـد)، بەڵکـو بیریـان بکەوێتـەوە ﴿٥١﴾ ئەوانـەی پێـش ئـەم (قوڕئـان)ە، کتێبمـان پێـداون، هـەر ئەوانە (کۆمەڵێکیـان)، بەڕاسـتیی بڕوای پێ دێنـن ﴿٥٢﴾ کاتێکیش بەسـەریاندا بخوێنرێتـەوە دەڵێـن: بڕوامـان پێیهێنـا، بـە دڵنیایـی ئـەم (قوڕئـان)ە، هـەق و ڕاستە لـە پەروەردگارمانـەوە، بـە دڵنیایـی ئێمـە پێـش ئـەوەش ملکـەچ بوویـن (بـۆ پەیـام و بەرنامـەی خـوا، کـە بـە پێغەمبەرانـی پێشـوودا نێردرابـوون) ﴿٥٣﴾ ئـا ئەوانـە دوو کەڕەتـان پاداشـتیان دەدرێتـەوە، بەهـۆی ئـەوەوە کـە خۆڕاگرییـان کـردو، بـە چاکـە خراپـە پـاڵ پێوەدەنێـن (و لـە بەرانبـەر خراپـەدا چاکـە دەکـەن)و، لـەوەی پێمان داون دەبەخشـن ﴿٥٤﴾ کاتێکیـش قسـەی پـووچ دەبیسـتن، پشـتی تێدەکـەن و دەڵێـن: کـردەوەی خۆمـان بـۆ خۆمـان و، کـردەوەی خۆتـان بـۆ خۆتـان، سـەلامتان لـێ بـێ (خـوا حافیزتـان بـێ)، ئێمـە خوازیـاری نەفامـان نیـن (قسـە و بـاس و خواسـیان لەگـەڵ بکەیـن) ﴿٥٥﴾}.

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بَصَآئِرَ) : (جَمْعُ بَصِيرَة: وَهِيَ إِدْرَاكُ العَقْلِ، سُمِّيَ بَصِيرَةً اشْتِقَاقاً مِنْ بَصَرِ العَيْنِ، فَكَأَنَّ الآيَاتِ هِيَ أَنْفُسُهَا بَصِيرَةٌ، فَوُضِعَ السَّبَبُ مَكَانَ المُسَبَّبِ)، وشـەی (بَصَائِر) کـۆی (بَصِيرَة)یـە، کـە بریتیـە لـە دەرککردنـی عەقـڵ، بۆیـە نـاوی لێـنراوە: (بَصِيرَة)، وەرگیـراوە لـە دیتنـی چـاو، (وەک چـۆن چـاو دەبینـێ، عەقڵیـش دەبینـێ، چـاو شـتە بەرهەسـتەکان دەبینـێ، عەقـڵ شـتە نابەرهەسـتەکان دەبینـێ)، ئنجـا بۆیـە نیشـانەکانی خـوا ﷻ ناونـراون (بَصَائِر)، وەک خۆیـان بریتـی بـن لـە دیـتن و بینایـی، لێـرەدا هـۆکار لـە شـوێنی دەرەنجـام (پەیداکـراو) دانـراوە.

ئەگەرنا (بَصِيرَة) هۆكاری بینینە، بەڵام ئایەتەكان كراون بە (بَصَائِر)، بەو واتایە كە لە ئەنجامی ئایەتەكاندا دیتن (بَصِيرَة)، پەیدادەبێ، بەڵام وەك ئایەتەكان خودی دیتنەكە بن.

(فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۚ): (طَالَ: تَطَاوَلَ) واتە: درێژ بۆوە، ئنجا (تَطَاوَلَ: أَبْلَغُ لِزِيَادَةِ التَّاءِ وَالأَلِفِ)، (طَالَ) واتە: درێژ بۆوە، بەڵام (تَطَاوَلَ) هەم پیتی (ت)، هەم (ا)ی خراوەتە سەر، بۆتە (تَطَاوَلَ)و، ماناكەی زیاترە، چونكە (زِيَادَةُ المَبْنى تَدُلُّ عَلى زِيَادَةِ المَعْنَى)، وشەیەك پیتەكانی زیاتر بن، هەر لە خودی خۆی، ئنجا بەهۆی (ت)و (ا)ەوە، بەهۆی (س و ت)وە بێ، (إسْتَغْفَرَ) یان (اسْتَجَابَ) لە جیاتی (أَجَابَ)، ماناكەی تۆختر دەبێ.

(ٱلۡعُمُرُ): (المُدَّةُ التي يُمضِيهَا الإنْسَانُ فِي حَيَاتِهِ، أو الأُمَّة)، (عُمُر) بریتیە لەو ماوەیەی كە مرۆڤ لە ژیانیدا دەیگوزەرێنێ، یاخود ئۆممەتێك، كۆمەڵگایەك دەیگوزەرێنێ، (وَالعُمُرُ: الأَمَدُ)، وەك خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓ ﴿١٦﴾﴾يونس، (عُمُر) یانی: ماوە، كات، وەك لە سوورەتی (یونس)دا، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: كە بە هاوبەشدانەرەكان بۆ خوا، بڵێ: پێش ئەوەی (قورئان)م، بۆ بێ، تەمەنێكم لە نێو ئێوەدا گوزەراندووەو ماومەوە.

(ثَاوِيٗا): (مُقِيماً): (ثَوَى بِالمَكَانِ: أَقَامَ)، لە جێیەكە مایەوە، نیشتەجێ بووە.

(يَتَذَكَّرُونَ): (تَذَكُّر) یانی: بیركەوتنەوە، ئنجا لە ئەنجامی بیركەوتنەوەدا، مرۆڤ پەند وەردەگرێ و، كاری باش دەكات، بۆیە جاری وا هەیە (يَتَذَكَّرُونَ) هەر بە مانای خودی مانا ڕواڵەتەكەی: (بیریان بكەوێتەوە)و جاری واشە بە مانای (بیر بكەنەوە)، لە ئەنجامی بیركەوتنەوەدا ئینسان بیردەكاتەوە، جاری وایە بە مانای (پەند وەربگرن) چونكە لە ئەنجامی بیركەوتنەوەدا، ئینسان پەند وەردەگرێ.

(تَظَـٰهَـرَا): (تَعَاوَنـا وَتَعَاضَـدا)، واتـە: پشـتیوانیی یەكدیـان كـردو، هاوكاریـی یەكدیـی بـوون.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

هـۆی هاتنـە خـواری ئـەم ئایەتـە موبارەكانـە: (٥١ - ٥٤)، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

لەوبارەوە دوو بەسەرهات هەن، ئاماژەیان پێدەكەین:

١)- {عَنْ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ قَالَ: نَزَلَتْ نَزَلَت هذهِ الآيَةُ: فِي عَشْرَةٍ أَنَا أَحَدُهُمْ} (أخرجه الطَّبَري: ٢٧٤٦٦، والطَّبَرَاني في الكَبير: ٤٥٦٤، وابن أَبِي حَاتم: ١٦٩٧٣)[1].

واتـە: (رِفَاعَـةَ الْقُرَظِـيِّ) كـە یەكێكـە لـە جوولەكـەكان و مسـوڵمان بـووە، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە، (واتـە: ئـەم ئایەتانـە)، لـە بـارەی دە (١٠) كەسـانەوە هاتنـە خـوار، (لـە خـاوەن كتێبـەكان كـە مسـوڵمان بـوون)، مـن یەكێكیـان بـووم.

٢)- ئەم بەسەرهاتەش هەیە، بە پێویستی دەزانم بیگێڕمەوە، هەرچەندە سەنەدەكەی مشت و مڕی لەسەرە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەرس و پەندی زۆری لێوەردەگیرێن و، بەسەرهاتێكی سەرنجڕاكێشە، بە چاكی دەزانم بیگێڕمەوە، كە لە كتێبی: (الإستِيعَاب فِي بَيَانِ الأسبَاب)دا[2] هاتوە:

---

(١) قال مؤلفا الإستِيعَاب: قُلْنَا وَهَذَا سَنَدٌ صَحِيحٌ رِجَالُهُ ثِقَاتٌ، ج٣، ص٢٧.

(٢) ج٣، ص٢٩ -٣٢.

## چیرۆکی مسوڵمانبوونی سەلمانی فارسیی

{عَنْ سَلَامَةَ الْعِجْلِيِّ قَالَ: جَاءَ ابْنُ أُخْتٍ لِي مِنَ الْبَادِيَةِ، يُقَالُ لَهُ قُدَامَةُ، فَقَالَ لِي ابْنُ أُخْتِي: أُحِبُّ أَنْ أَلْقَى سَلْمَانَ الْفَارِسِيَّ، فَأُسَلِّمَ عَلَيْهِ، فَخَرَجْنَا فَوَجَدْنَاهُ بِالْمَدَائِنِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ عَلَى عِشْرِينَ أَلْفًا، وَوَجَدْنَاهُ عَلَى سَرِيرٍ يَسُفُّ خُوصًا، فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ، قُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ! هَذَا ابْنُ أُخْتٍ لِي قَدِمَ عَلَيَّ مِنَ الْبَادِيَةِ فَأَحَبَّ أَنْ يُسَلِّمَ عَلَيْكَ، قَالَ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ، قُلْتُ: يَزْعُمُ أَنَّهُ يُحِبُّكَ، قَالَ: أَحَبَّهُ اللهُ، فَتَحَدَّثْنَا وَقُلْنَا لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ! أَلَا تُحَدِّثُنَا عَنْ أَصْلِكَ، وَمِمَّنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَمَّا أَصْلِي وَمِمَّنْ أَنَا فَأَنَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ رَامَهُرْمُزَ، كُنَّا قَوْمًا مَجُوسًا، فَأَتَانَا رَجُلٌ نَصْرَانِيٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَزِيرَةِ كَانَتْ أُمُّهُ مِنَّا، فَنَزَلَ فِينَا وَاتَّخَذَ فِينَا دَيْرًا، قَالَ: وَكُنْتُ فِي كُتَّابِ الْفَارِسِيَّةِ، وَكَانَ لَا يَزَالُ غُلَامٌ مَعِي فِي الْكُتَّابِ يَجِيءُ مَضْرُوبًا يَبْكِي، قَدْ ضَرَبَهُ أَبَوَاهُ، فَقُلْتُ لَهُ يَوْمًا: مَا يُبْكِيكَ؟ قَالَ: يَضْرِبُنِي أَبَوَايَ، قُلْتُ: وَلِمَ يَضْرِبَانِكَ؟ قَالَ: آتِي صَاحِبَ هَذَا الدَّيْرِ، فَإِذَا عَلِمَا ذَلِكَ ضَرَبَانِي، وَأَنْتَ لَوْ أَتَيْتَهُ سَمِعْتَ مِنْهُ حَدِيثًا عَجِيبًا، قُلْتُ: فَاذْهَبْ بِي مَعَكَ، فَأَتَيْنَاهُ فَحَدَّثَنَا عَنْ بَدْءِ الْخَلْقِ، وَعَنْ بَدْءِ خَلْقِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَعَنِ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، قَالَ: فَحَدَّثَنَا بِأَحَادِيثَ عَجَبٍ، قَالَ: وَكُنْتُ أَخْتَلِفُ إِلَيْهِ مَعَهُ، قَالَ: فَفَطِنَ لَنَا غِلْمَانٌ مِنَ الْكُتَّابِ، فَجَعَلُوا يَجِيئُونَ مَعَنَا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ أَهْلُ الْقَرْيَةِ أَتَوْهُ، فَقَالُوا لَهُ: يَا هَذَا، إِنَّكَ قَدْ جَاوَرْتَنَا، فَلَمْ تَرَ مِنْ جِوَارِنَا إِلَّا الْحَسَنَ، وَإِنَّا نَرَى غِلْمَانَنَا يَخْتَلِفُونَ إِلَيْكَ، وَنَحْنُ نَخَافُ أَنْ تُفْسِدَهُمْ عَلَيْنَا، اخْرُجْ عَنَّا، قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ لِذَلِكَ الْغُلَامِ الَّذِي كَانَ يَأْتِيهِ: اخْرُجْ مَعِي، قَالَ: لَا أَسْتَطِيعُ ذَاكَ، وَقَدْ عَلِمْتَ شِدَّةَ أَبَوَيَّ عَلَيَّ، قُلْتُ: لَكِنِّي أَخْرُجُ مَعَكَ، وَكُنْتُ يَتِيمًا لَا أَبَ لِي، فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَأَخَذْنَا جَبَلَ رَامَهُرْمُزَ، فَجَعَلْنَا نَمْشِي وَنَتَوَكَّلُ، وَنَأْكُلُ مِنْ ثَمَرِ الشَّجَرِ، حَتَّى قَدِمْنَا الْجَزِيرَةَ، فَقَدِمْنَا نَصِيبِينَ، فَقَالَ لِي صَاحِبِي: يَا سَلْمَانُ إِنَّ هَهُنَا قَوْمًا هُمْ عُبَّادُ أَهْلِ الأَرْضِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْقَاهُمْ، قَالَ: فَجِئْنَا إِلَيْهِمْ يَوْمَ الأَحَدِ وَقَدِ اجْتَمَعُوا، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ صَاحِبِي فَحَيَّوْهُ، وَبَشُّوا بِهِ، وَقَالُوا: أَيْنَ كَانَتْ غَيْبَتُكَ؟ قَالَ: كُنْتُ فِي إِخْوَانٍ لِي مِنْ قِبَلِ فَارِسَ فَتَحَدَّثْنَا مَا تَحَدَّثْنَا، ثُمَّ قَالَ لِي صَاحِبِي: قُمْ يَا سَلْمَانُ انْطَلِقْ، فَقُلْتُ: لَا، دَعْنِي مَعَ هَؤُلَاءِ، قَالَ: إِنَّكَ لَا تُطِيقُ مَا يُطِيقُ هَؤُلَاءِ، يَصُومُونَ الأَحَدَ إِلَى الأَحَدِ، وَلَا يَنَامُونَ هَذَا اللَّيْلَ، وَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ مِنْ أَبْنَاءِ الْمُلُوكِ، تَرَكَ الْمُلْكَ

وَدَخَلَ فِي الْعِبَادَةِ، فَكُنْتُ فِيهِمْ حَتَّى أَمْسَيْنَا، فَجَعَلُوا يَذْهَبُونَ وَاحِدًا وَاحِدًا إِلَى غَارِهِ الَّذِي يَكُونُ فِيهِ، قَالَ: فَلَمَّا أَمْسَيْنَا، قَالَ ذَلِكَ الرَّجُلُ الَّذِي مِنْ أَبْنَاءِ الْمُلُوكِ: مَا هَذَا الْغُلَامُ، لَا تَضَعُوهُ لِيَأْخُذَهُ رَجُلٌ مِنْكُمْ، فَقَالُوا: خُذْهُ أَنْتَ، فَقَالَ لِي: هَلُمَّ يَا سَلْمَانُ، فَذَهَبَ بِي مَعَهُ حَتَّى أَتَى غَارَهُ الَّذِي يَكُونُ فِيهِ، فَقَالَ: يَا سَلْمَانُ هَذَا خُبْزٌ، وَهَذَا أُدْمٌ فَكُلْ إِذَا غَرِثْتَ، وَصُمْ إِذَا نَشِطْتَ، وَصَلِّ مَا بَدَا لَكَ، وَنَمْ إِذَا كَسِلْتَ، ثُمَّ قَامَ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمْ يُكَلِّمْنِي إِلَّا ذَلِكَ، وَلَمْ يَنْظُرْ إِلَيَّ، فَأَخَذَنِي الْغَمُّ تِلْكَ السَّبْعَةَ أَيَّامٍ لَا يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ، حَتَّى كَانَ الأَحَدُ، فَذَهَبْنَا إِلَى مَكَانِهِمُ الَّذِي كَانُوا يَجْتَمِعُونَ، قَالَ: وَهُمْ يَجْتَمِعُونَ كُلَّ أَحَدٍ يُفْطِرُونَ فِيهِ، فَيَلْقَى بَعْضُهُمْ بَعْضًا، فَيُسَلِّمُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ، ثُمَّ لَا يَلْتَقُونَ إِلَى مِثْلِهِ، قَالَ: فَرَجَعْنَا إِلَى مَنْزِلِنَا، فَقَالَ لِي مِثْلَ مَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ: هَذَا خُبْزٌ وَأُدْمٌ، فَكُلْ مِنْهُ إِذَا غَرِثْتَ، وَصُمْ إِذَا نَشِطْتَ، وَصَلِّ مَا بَدَا لَكَ، وَنَمْ إِذَا كَسِلْتَ، ثُمَّ دَخَلَ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيَّ، وَلَمْ يُكَلِّمْنِي إِلَى الأَحَدِ الآخَرِ، وأَخَذَنِي غَمٌّ، وَحَدَّثْتُ نَفْسِي بِالْفِرَارِ، فَقُلْتُ: أَصْبِرُ أَحَدَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً، وَلَمَّا كَانَ الأَحَدُ رَجَعْنَا إِلَيْهِمْ فَأَفْطَرُوا وَاجْتَمَعُوا، فَقَالَ لَهُمْ: إِنِّي أُرِيدُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ، فَقَالُوا لَهُ: وَمَا تُرِيدُ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: لَا عَهْدَ لِي بِهِ، قَالُوا: إِنَّا نَخَافُ أَنْ يَحْدُثَ بِكَ حَدَثٌ فَيَلِيَكَ غَيْرُنَا، وَكُنَّا نُحِبُّ أَنْ نَلِيَكَ، قَالَ: لَا عَهْدَ لِي بِهِ، فَلَمَّا سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ ذَلِكَ فَرِحْتُ، قُلْتُ: نُسَافِرُ وَنَلْقَى النَّاسَ، فَيَذْهَبُ عَنِّي الْغَمُّ الَّذِي كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَهُوَ، وَكَانَ يَصُومُ مِنَ الأَحَدِ إِلَى الأَحَدِ، وَيُصَلِّي اللَّيْلَ كُلَّهُ، وَيَمْشِي النَّهَارَ، فَإِذَا نَزَلْنَا قَامَ يُصَلِّي، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ، وَعَلَى الْبَابِ رَجُلٌ مُقْعَدٌ يَسْأَلُ النَّاسَ، فَقَالَ: اعْطِنِي، فَقَالَ: مَا مَعِي شَيْءٌ، فَدَخَلْنَا بَيْتَ الْمَقْدِسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَهْلُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ بَشُّوا إِلَيْهِ، وَاسْتَبْشَرُوا بِهِ، فَقَالَ لَهُمْ: غُلَامِي هَذَا فَاسْتَوْصُوا بِهِ، فَانْطَلَقُوا بِي فَأَطْعَمُونِي خُبْزًا وَلَحْمًا، وَدَخَلَ فِي الصَّلَاةِ فَلَمْ يَنْصَرِفْ إِلَيَّ حَتَّى كَانَ يَوْمُ الأَحَدِ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ لِي: يَا سَلْمَانُ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَضَعَ رَأْسِي، فَإِذَا بَلَغَ الظِّلُّ مَكَانَ كَذَا وَكَذَا فَأَيْقِظْنِي، فَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ، فَبَلَغَ الظِّلُّ الَّذِي قَالَ، فَلَمْ أُوقِظْهُ مَأْوَاةً مِمَّا رَأَيْتُ مِنِ اجْتِهَادِهِ، وَنَصَبِهِ، فَاسْتَيْقَظَ مَذْعُورًا، فَقَالَ: يَا سَلْمَانُ، أَلَمْ أَكُنْ قُلْتُ لَكَ: إِذَا بَلَغَ الظِّلُّ كَذَا وَكَذَا فَأَيْقِظْنِي؟ قُلْتُ: بَلَى، وَلَكِنْ إِنَّمَا مَنَعَنِي مَأْوَاةً لَكَ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ دَأْبِكَ، قَالَ: وَيْحَكَ يَا سَلْمَانُ إِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَفُوتَنِي شَيْءٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ أَعْمَلْ فِيهِ لِلَّهِ خَيْرًا، ثُمَّ قَالَ لِي: يَا سَلْمَانُ اعْلَمْ أَنَّ أَفْضَلَ دِينِنَا الْيَوْمَ النَّصْرَانِيَّةُ، قُلْتُ: وَيَكُونُ بَعْدَ الْيَوْمِ دِينٌ أَفْضَلُ مِنَ النَّصْرَانِيَّةِ؟ كَلِمَةٌ أُلْقِيَتْ عَلَى لِسَانِي، قَالَ: نَعَمْ، يُوشِكُ أَنْ يُبْعَثَ نَبِيٌّ يَأْكُلُ الْهَدِيَّةَ، وَلَا يَأْكُلُ الصَّدَقَةَ، بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، فَإِذَا أَدْرَكْتَهُ فَاتَّبِعْهُ وَصَدِّقْهُ، قُلْتُ:

وَإِنْ أَمَـرَنِي أَنْ أَدَعَ النَّصْرَانِيَّـةَ؟ قَـالَ: نَعَـمْ، فَإِنَّـهُ نَبِـيٌّ لَا يَأْمُـرُ إِلَّا بِحَـقٍّ، وَلَا يَقُـولُ إِلَّا حَقًّـا، وَاللـهِ لَـوْ أَدْرَكْتُـهُ ثُـمَّ أَمَرَنِي أَنْ أَقَـعَ فِي النَّـارِ لَوَقَعْتُهَـا. ثُـمَّ خَرَجْنَـا مِـنْ بَيْـتِ الْمَقْـدِسِ، فَمَرَرْنَـا عَـلَى ذَلِـكَ الْمُقْعَـدِ، فَقَـالَ لَـهُ: دَخَلْـتَ فَلَـمْ تُعْطِنِـي، وَهَـذَا الْخُـرُوجُ فَأَعْطِنِـي، فَالْتَفَـتَ فَلَـمْ يَـرَ حَوْلَـهُ أَحَدًا، قَـالَ: فَأَعْطِنِـي يَـدَكَ، فَأَخَـذَهُ بِيَـدِهِ، فَقَـالَ: قُـمْ بِـإِذْنِ اللـهِ، قَـالَ: فَقَـامَ صَحِيحًـا سَـوِيًّا، فَتَوَجَّـهَ نَحْـوَ أَهْلِـهِ، فَأَتْبَعْتُـهُ بَـصَرِي تَعَجُّبًـا مِـمَّا رَأَيْـتُ، وَخَـرَجَ صَاحِبِـي فَـأَسْرَعَ الْمَـشْيَ، وَتَبِعْتُـهُ فَتَلَقَّـانِي رُفْقَـةٌ مِـنْ كَلْـبِ أَعْـرَابٌ، فَسَـبَوْنِي، فَحَمَلُـونِي عَـلَى بَعِـيرٍ، وشَـدُّونِي وَثَاقًـا، فَتَدَاوَلَنِـي الْبِيَّـاعُ حَتَّـى سَـقَطْتُ إِلَى الْمَدِينَـةِ، فَاشْـتَرَانِي رَجُـلٌ مِـنَ الأَنْصَـارِ فَجَعَلَنِـي فِي حَائِـطٍ لَـهُ مِـنْ نَخْـلٍ، فَكُنْـتُ فِيـهِ، قَـالَ: وَمِـنْ ثَمَّـةَ تَعَلَّمْـتُ عَمَـلَ الْخُـوصِ، أَشْـتَرِي خُوصًـا بِدِرْهَـمٍ، فَأَعْمَلُـهُ فَأَبِيعُـهُ بِدِرْهَمَـيْنِ، فَـأَرُدُّ دِرْهَـمًا فِي الْخُـوصِ، وأَسْـتَنْفِقُ دِرْهَـمًا، أُحِـبُّ أَنْ آكُلَ مِـنْ عَمَـلِ يَـدِي، وَهُـوَ يَوْمَئِـذٍ أَمِـيرٌ عَـلَى عِشْرِيـنَ أَلْفًـا، فَبَلَغَنَـا وَنَحْـنُ بِالْمَدِينَـةِ، أَنَّ رَجُلًا قَـدْ خَـرَجَ بِمَكَّـةَ يَزْعُـمُ أَنَّ اللـهَ عَـزَّ وَجَـلَّ أَرْسَـلَهُ، فَمَكَثْنَـا مَـا شَـاءَ اللـهُ أَنْ نَمْكُـثَ، فَهَاجَـرَ إِلَيْنَـا وَقَـدِمَ عَلَيْنَـا، فَقُلْـتُ: وَاللـهِ لأُجَرِّبَنَّـهُ، فَذَهَبْـتُ إِلَى السُّـوقِ، فَاشْـتَرَيْتُ لَحْـمَ جَـزُورٍ بِدِرْهَـمٍ ثُـمَّ طَبَخْتُـهُ، فَجَعَلْـتُ قَصْعَـةً مِـنْ ثَرِيـدٍ، فَاحْتَمَلْتُهَـا حَتَّـى أَتَيْتُـهُ بِهَـا عَـلَى عَاتِقِـي، حَتَّـى وَضَعْتُهَـا بَـيْنَ يَدَيْـهِ، فَقَـالَ: «مَـا هَـذِهِ، أَصَدَقَـةٌ أَمْ هَدِيَّـةٌ؟» قُلْـتُ: بَـلْ صَدَقَـةٌ، فَقَـالَ لأَصْحَابِـهِ: «كُلُـوا بِسْـمِ اللـهِ» ، وَأَمْسَـكَ وَلَـمْ يَـأْكُلْ، فَمَكَثْـتُ أَيَّامًـا، ثُـمَّ اشْـتَرَيْتُ لَحْـمًا أَيْضًـا بِدِرْهَـمٍ فَأَصْنَـعُ مِثْلَهَـا، فَاحْتَمَلْتُهَـا حَتَّـى أَتَيْتُـهُ بِهَـا فَوَضَعْتُهَـا بَـيْنَ يَدَيْـهِ، فَقَـالَ: «مَـا هَـذِهِ، هَدِيَّـةٌ أَمْ صَدَقَـةٌ؟» قُلْـتُ: لَا بَـلْ هَدِيَّـةٌ، فَقَـالَ لأَصْحَابِـهِ: «كُلُـوا بِسْـمِ اللـهِ» وَأَكَلَ مَعَهُـمْ، قُلْـتُ: هَـذَا وَاللـهِ يَـأْكُلُ الْهَدِيَّـةَ، وَلَا يَـأْكُلُ الصَّدَقَـةَ، فَنَظَـرْتُ فَرَأَيْـتُ بَـيْنَ كَتِفَيْـهِ خَاتَـمَ النُّبُـوَّةِ مِثْـلَ بَيْضَـةِ الْحَمَامَـةِ، فَأَسْـلَمْتُ ثُـمَّ قُلْـتُ لَـهُ ذَاتَ يَـوْمٍ: يَـا رَسُـولَ اللـهِ، أَيُّ قَـوْمٍ النَّصَـارَى؟ قَـالَ: «لَا خَـيْرَ فِيهِـمْ» ، وَكُنْـتُ أُحِبُّهُـمْ حُبًّـا شَـدِيدًا لِـمَا رَأَيْـتُ مِـنِ اجْتِهَادِهِـمْ، ثُـمَّ إِنِّي سَـأَلْتُهُ بَعْـدَ أَيَّـامٍ: يَـا رَسُـولَ اللـهِ أَيُّ قَـوْمٍ النَّصَـارَى؟ قَـالَ: «لَا خَـيْرَ فِيهِـمْ وَلَا فِيمَـنْ يُحِبُّهُـمْ» ، قُلْـتُ فِي نَفْسِـي: فَأَنَـا وَاللـهِ أُحِبُّهُـمْ، قَـالَ: وَذَاكَ وَاللـهِ حِـينَ بَعَـثَ السَّرَايَـا، وجَـرَّدَ السَّـيْفَ، فَسَرِيَّـةٌ تَدْخُـلُ، وَسَرِيَّـةٌ تَخْـرُجُ وَالسَّـيْفُ يَقْطُـرُ، قُلْـتُ: يُحَـدِّثُ بِيَ الآنَ أَنِّي أُحِبُّهُـمْ، فَيَبْعَـثُ إِلَيَّ فَيَـضْرِبَ عُنُقِـي، فَقَعَـدْتُ فِي الْبَيْـتِ، فَجَـاءَنِي الرَّسُـولُ ذَاتَ يَـوْمٍ فَقَـالَ: يَـا سَـلْمَانُ أَجِـبْ، قُلْـتُ: مَـنْ؟ قَـالَ: رَسُـولَ اللـهِ ﷺ، قُلْـتُ: هَـذَا وَاللـهِ الَّـذِي كُنْـتُ أَحْـذَرُ، قُلْـتُ: نَعَـمْ حَتَّـى أَلْحَقَـكَ، قَـالَ: لَا وَاللـهِ حَتَّـى تَجِـيءَ، وَأَنَـا أُحَـدِّثُ نَفْسِـي أَنْ لَـوْ ذَهَـبَ أَنْ أَفِـرَّ، فَانْطَلَـقَ بِي فَانْتَهَيْـتُ إِلَيْـهِ، فَلَـمَّا رَآنِي تَبَسَّـمَ وَقَـالَ لِي: «يَـا سَـلْمَانُ أَبْـشِرْ، فَقَـدْ فَـرَّجَ اللـهُ عَنْـكَ»، ثُـمَّ تَـلَا عَـلَيَّ هَـؤُلَاءِ الآيَـاتِ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَـٰهُمُ

ﭐلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: لَوْ أَدْرَكْتُهُ فَأَمَرَنِي أَنْ أَقَعَ فِي النَّارِ لَوَقَعْتُهَا، إِنَّهُ نَبِيٌّ لَا يَقُولُ إِلَّا حَقًّا، وَلَا يَأْمُرُ إِلَّا بِالْحَقِّ}[1].

واتـە: سـەلامەتی عەجەلیـی دەڵـێ: خوشـکەزایەکم لـە بیابانـەوە (لـە دەشـتەوە) هاتبـوو، پێـی دەگوتـرا: قودامـە، پێـی گوتـم، (واتـە: خوارزایەکـەم پێـی گوتـم): حـەز دەکـەم سـەلمانی فارسـیی ببینـم، سـڵاوی لـێ بکـەم، ئێمـەش چووینـە لای (نەیگوتـوە: لـە کـوێ و چـۆن)، لـە مەدائیـن بـوو (مەدائیـن ئێسـتا «سـەلمان پاکـی» پـێ دەگوتـرێ، لەبـەر ئـەوەی سـەلمانی فارسـی دوایـی لـەوێ بـە خـاک سـپێردراوە)، کـە ئـەو کاتـە بەرپرسـی بیسـت هـەزار (٢٠٠٠٠) کـەس بـوو، (وا پێدەچـێ (٢٠٠٠٠) سـەربازی لەبەردەسـتدا بـوو بێـت)و، کـە چووینـە لای تەماشـامان کـرد لەسـەر تەختێـک دانیشـتبوو، شـتێکی دەچنـی، لـە پووشـی دارخورمـا {(خـوص) بـەوە دەگوتـرێ: کـە لـە پووشـی دارخورمـا، یـان لـە لقەکانـی دارخورمـا، دەچنـرێ، وەک چـۆن لـە کوردەوارییـدا سـەبەتە و بەرچنـە و ئەوانـە لـە شـووله دار دەچنرێـن}، سـڵاومان لێکـرد، گوتـم: ئـەی ئەبـوو عەبدوڵـڵا! ئەمـە خوارزایەکمـە (خوشـکەزایەکمە) لـە بیابانـەوە، هاتـوە بـۆ لای مـن، حـەزی کـرد سـڵاوت لـێ بـکات، گوتـی: (وَعَلَيـهِ السَّلام وَرَحمَـةُ اللـه)، سـەلام و ڕەحمەتـی خـوا لەویـش بـێ، گوتـم: دەڵـێ: کـە تـۆی خۆشـدەوێ، ئەویـش گوتـی: (أَحَبَّـهُ اللـه)، خـوا خۆشـی بـوێ، دەڵـێ: قسـەمان کـرد، پێـمان گـوت: ئـەی ئەبـوو عەبدوڵـڵا! ئایـا لـە بـارەی بنەچەکـەی خۆتـەوە، تـۆ لـە کێـی و لـە کوێـوە هاتـووی، بۆمـان بـاس ناکـەی؟ دەڵـێ: گوتـی: بنەچەکـەی مـن، مـن لـە کێـم، مـن پیاوێکـم خەڵکی ڕامهورمـوز (شـارێکە ئـەو کاتـە لـە ئێـران بـووە) و، ئێمـە خەڵکێکـی

---

(١) أخرَجَهُ الطَّبَراني في الكَبير: ج٦، ص: ٢٤١ -٢٤٥، برقم: ٦١١٠.

مەجووسیی بووین، پیاوێکی نەصرانیی کە خەڵکی جەزیرە بوو [کاتی خۆی (جَزیرَةُ ابن عمَر) مەشهور بووە]، لە جەزیرەوە هات، (واتە: لە باکووری کوردستانەوە)، کە دایکی لە ئێمە بوو، (باپی ئەو پیاوە نەصرانییە، ئافرەتێکی لە ڕامهورموز خواستوە)، لە لامان دابەزی، (لە لای ئێمە نیشتەجێ بوو)، دێرێک (پەرستگایەک)ی دروستکرد، کە تەنیا خۆی خوا پەرستیی تێدا بکات، من قوتابیی بووم بە فارسیی دەمخوێند، مێرد منداڵێکم لەگەڵدا بوو، لەوانەی دەیویست فێری خوێندن و نووسین بێ، هەموو ڕۆژێک کە دەهات لێیدرابوو دەگریا، باب و دایکی لێیان دابوو.

ڕۆژێک پێم گوت: چ شتێک دەتگریەنێ؟

گوتی: باب و دایکم لێم دەدەن.

پێمگوت: بۆچی لێت دەدەن؟

گوتی: دەچمە لای خاوەنی ئەو دێرە، (ئەو کەسە نەصرانییە)، کاتێک باب و دایکم بزانن، چووم بۆ لای لێم دەدەن (لەبەر ئەوەی ئەوان مەجووسیی بوون و، کابراش نەصرانیی بووە، نەوەک بکەوێتە ژێر کاریگەریی).

ئنجا (ئەو مێرد منداڵە، کوڕە گەنجە)، پێی گوتم: ئەگەر بچیە لای قسەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری لێ دەبیستی، (شتێکی لێ دەبیستی، کە ئێمەی مەجووسیی ئەوە نازانین).

گوتم: لەگەڵ خۆتم بەرە بۆ لای، چووین بۆ لای، لە بارەی سەرەتای دروستبوونی دروستکراوەکانەوە، قسەی بۆ کردین، لە بارەی سەرەتای دروست بوونی ئاسمان و زەوی، لە بارەی بەهەشت و دۆزەخ، (وەک لە وەحیی پێغەمبەراندا هاتوە)و، چەند قسەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری بۆ کردین (بەلای ئەوانەوە جێی سەرسوڕمان بووە، شتی وایان نەبیستوە).

منیش ئاوا بەو شێوە هاموشۆم دەکرد، دەچووم بۆ لای، ئنجا کۆمەڵێک لەو منداڵانە (لەو کوڕە گەنجانە)ی خەریکی خوێندن بوون، هەستیان پێکردین، ئەوانیش لەگەڵمان دەهاتن، کاتێک خەڵکی ئاوەدانییەکە پێیان زانی، هاتن بۆ لای و، پێیان گوت: فڵانکەس! تۆ بووی بە دراوسێی ئێمە، لە دراوسێیەتیی ئێمە بەس چاکەت بینیوەو، ئێمە دەبینین کە مێرد منداڵەکانمان هاموشۆت دەکەن، ئێمەش دەترسین بیری مێرد منداڵەکانمان تێک بدەی، (واتە: وەک خۆتیان لێ بکەی و لە بیری مەجووسیی هەڵیانگێڕییەوە)، بۆیە بڕۆ لە ئێومان بچۆ دەرێ، گوتی: بەڵێ.

ئنجا بابای نەصرانیی (کە دیارە زانایەکی نەصرانیی بووە)، بەو مێرد منداڵەی هاموشۆی دەکرد، پێی گوت: لەگەڵم وەرە با بڕۆین، گوتی: ناتوانم، دەزانی باب و دایکم چەند لەسەر من توندن، (سەلمان دەڵێ:) گوتم: بەڵام من لەگەڵت دێم بۆ دەرەوە، منیش منداڵێکی هەتیو بووم (بابم نەبوو)، لەگەڵی ڕۆیشتم، بە چیای ڕامهورمـوزدا ڕۆیشتین، پشتمان بە خوا بەستبوو و، لە بەرو میوەی درەختەکان دەمانخـوارد (دەبێ کەشەکە هاوین بووبێ، کە درەختی بەردار، میوەیان پێوە بووە، ئنجا هەنجیرە کێویلکە بووە، توو بووە)، ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە جەزیرە، (واتە: شارەکەی خۆی شاری زانا نەصرانییە)، چووینە نەصیبین (جەزیرە بە هەموو دەڤەرەکە گوتراوەو نەصیبین شارێک بووە لەوێ)، هاوەڵەکەم (زانا نەصرانییەکە) پێیگوتم: ئەی سەلمان! لێرە کۆمەڵێک هەن، کە لە هەموو خەڵکی سەر زەوی و خواپەرستترن و، حەز دەکەم پێیان بگەم (بچمە لایان)، ڕۆژێکی یەکشەممە بوو چووینە لایان، هەموویان کۆببووبوونەوە، [نەصرانییەکان وەک چۆن مسوڵمانان لە ڕۆژانی جومعەدا کۆدەبنەوە، ئەوانیش لە یەکشەممماندا کۆدەبنەوەو جوولەکەکانیش لە شەممماندا]، (ئەو زانا نەصرانییە) هاوەڵەکەم سڵاوی لێکردن، ئەوانیش سڵاویان لێکردەوەو، لە ڕوویدا زۆر گەش بوون، (دڵخۆش بوون)، گوتیان: ئەو هەموو ماوەیە کە دیار نەبووی، لە کوێ بووی؟ ئەویش گوتی: لە لای هەندێک لە برایەکانم بووم

لـە وڵاتـی فـارس، دەڵـێ: ئـەوەی باسـمان کـرد، (قسـە و باسـیان کـردوەو بەسـەرهاتی خـۆی بـۆ گێڕاونـەوە)، باسـمانکرد، دوایـی هاوەڵەکـەم پێـی گوتم: ئەی سـەلمان! هەڵسـە با بڕۆیـن، منیـش پێـم گـوت: نـا! لێمگـەڕێ با لەگـەڵ ئەوانـەدا بـم، (زۆر خوا پەرسـت و دینـدار بـوون)، ئەویـش پێـی گوتـم: ئـەوەی ئەوانـە لـە توانایانـدا هەیـە، تـۆ لـە تواناتدا نیـە، ئەوانـە لـە یەکشـەممەوە تاکـو یەکشـەممە بـەڕۆژوو دەبـن، (یـەک هەفتـە هیـچ ناخـۆن)، شـەوگاریش ناخـەون (وا دیـارە شـەوگار هـەر خواپەرسـتییان کـردوە)، تەماشـام کـرد پیاوێـک لـە پادشـازادەکانیان لـە نێـودا بـوو، وازی لـە حوکمڕانیـی هێنابـوو، چـوو بـووە نێـو ئـەو خواپەرسـتییەوە، لـە نێویانـدا مامـەوە، تاکـو ئێوارەمـان کـرد (گەیشـتینە ئێـوارە)، ئیـدی هەرکامێکیـان یـەک لـە دوای یـەک چـوو بـۆ ئـەو ئەشـکەوتەی کـە خۆی تێیـدا بـوو، پێشـتر خواپەرسـتیی تێـدا دەکـرد، (هـەر کامێکیـان ئەشـکەوتێکی هەبـووە، پەناپەکـی هەبـووە)، ئنجـا کاتێـک ئێوارەمـان کـردەوە ئـەو پیـاوەی کـە پادشـازادە بـوو (لـە کوڕانـی پاشـایان بـوو)، گوتـی: ئـەو کـوڕە کێیـە و چـی دەکات؟ (دیـارە لـە زانـا نەصرانییەکـەی پرسـیوە)، بـا یەکێـک لـە ئێـوە لەگـەڵ خـۆی بیبـات، گوتیـان: تـۆ بیبـە، لەگـەڵ خۆتـی بـەرە، بیحەوێنـەوە، پێـی گوتـم: سـەلمان هەڵسـە، لەگـەڵ خۆیـدا بردمـی تاکـو چـوو بـۆ ئەشـکەوتەکەی کـە تێیدا بـوو، گوتی: ئـەی سـەلمان! ئەمە نانـە و ئەمەش پێخـۆرە، هـەر کاتێـک زۆرت برسـییبوو، لێـی بخـۆ و، هـەر کاتێـک کـە سـەرحاڵ بـووی توانـات هەبـوو بـەڕۆژوو بـە و، ئەوەنـدەی کـە بـۆت دەکـرێ، نوێـژان بکـە و، هـەر کاتێـک کـە تەنبـەڵ بـووی، (چیدیکـە نەتتوانـی) بخـەوە، (خـواردن و خواردنەوەکـەت، دەبـێ بـە ئەنـدازەی زۆر پێویسـتیی بـێ و، هەروەهـا خەویشـت)، دوایـی هەڵسـا بـۆ خواپەرسـتییەکەی، تەنیا ئەوەنـدە قسـەی لەگەڵـم کـرد، (تەنیـا ئەوەنـدە دواندمـی)و، تەماشـای نەکردمـەوە، خەمێکـی زۆر دایگرتـم، چونکـە لـە مـاوەی ئـەو حـەوت ڕۆژەدا، هیـچ کەسـێک منـی نەدوانـد، هـەر کەسـە خەریکـی خواپەرسـتیی خـۆی بـوو، تاکـو یەکشـەمی داهاتـوو، ئـەو پادشـازادەیە هاتـە لام و چووینـەوە، بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە لێـی کۆدەبوونـەوە، کـە هەمـوو ڕۆژانێکـی یەکشـەم لـەوێ کۆدەبوونـەوەو، لـەوێ

ڕۆژوویـان دەشـكاند، (تاكـو ئـەو یەكشـەممەیە كـە لـەوێ كۆدەبوونـەوە، بـە ڕۆژوو دەبـوون)، هەندێكیـان بـە دیـداری هەندێكیـان دەگەیشـتن و سـڵاویان لـە یەكـدی دەكـرد، دوایـی تاكـو یەكشـەممەی داهاتـوو یەكدییـان نەدەبینیـەوە، ئێمـەش گەڕاینەوە بـۆ مەنزەڵەكـەی خۆمـان و، وەک جـاری یەكـەم، دووبـارە پێـی گوتمـەوە: ئەمـە خواردنـە و، ئەمـەش پێخـۆرە، هـەر كاتێـک زۆرت برسـییبوو، بخـۆ و، هـەر كاتێـک كـە توانیـت بـەڕۆژوو بـە، (دیـارە وەک خۆیانیـان ئەركـدار نەكـردوە، كـە لـە یەكشـەم تاكـو یەكشـەم بـە ڕۆژوو بـێ، گوتوویانـە: هـەر كاتێـک كـە زۆرت برسـی بـوو، بخـۆ و، ئەگـەر توانیـت بـەڕۆژوو بـە، ئەوەنـدەی كـە دەتوانـی نوێـژ بكـە و، هـەر كاتێـک نەتوانـی بخـەوە)، دوایـی دووبـارە بـۆ هەفتـەی دووەم چـۆوە نێـو خواپەرسـتییەكەی و، ئـاوڕی لـێ نەدامـەوە، تاكو یەكشـەممەی داهاتـوو، نەیدواندمـەوە، منیـش خەمێكـی زۆر دایگرتـم و زۆر دڵتەنـگ بـووم و، لـە دڵـی خۆمـدا بڕیـاری ڕاكردنـم دا، گوتـم: بـڕۆم، بـەڵام گوتـم: بـا دوو یەكشـەممە، سـێ یەكشـەممەی دیكـە چـاوەڕێ بكـەم، (دوو هەفتـە، سـێ هەفتـە)، كاتێـک كـە یەكشـەم داهاتـەوە، چووینـەوە بـۆ لایـان، دووبـارە كۆبوونـەوەو ڕۆژوویـان شـكاند، ئـەو پیـاوە كـە پادشـازادە بـوو، پێیگوتـن: مـن دەمـەوێ بچـم بـۆ (بَیتُ المَقدِس)، ئەوانیـش پێیـان گـوت: بۆچـی دەچـی بـۆ ئـەوێ، چیـت دەوێ؟ گوتـی: نەمبینیـوە، دەمـەوێ بچـم (بَیتُ المَقدِس) ببینـم، گوتیـان: ئێمـە دەترسـین كـە شـتێكت لـێ بـێ و، دوایـی جگـە لـە ئێمـە ببێتـە سەرپەرشـتیارت و، ئێمـە دەمانـەوێ خۆمـان لـە خزمەتتـدا بیـن، گوتـی: ئاخـر لەبـەر ئـەوەی (بَیْتُ المَقدِس)م، نەبینیـوە، دەبـێ بچـم، كاتێـک كـە بیسـتم باسـی ئـەوەی كـرد، زۆر دڵخـۆش بـووم و، گوتـم: پێكـەوە بە سـەفەر دەچیـن و خەڵـک دەبینیـن، ئـەو خـەم و دڵتەنگییـەی دایگرتبـووم، لێـم لاچـوو.

ئیـدی مـن و ئـەو دەرچوویـن و، ئـەو بەڕێـوەش لـە یەكشـەممەوە تاكـو یەكشـەممە بـەڕۆژوو دەبـوو، شەوەكەشـی هـەر شـەو نوێـژی دەكـردو ڕۆژەكەشـی دەڕۆیشـت، [هەڵبەتـە دەبـێ جـار جـار سـەرخەوێكی شـكاند بـێ، بـەڵام سـەلمان ئـاوای گێڕاوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی كـە بـە زێدەڕۆییـەوە خـوا پەرسـتیی و ڕۆژوو گرتـن

و عیبادەتەکەی وێنا بکات، ئەگەرنا بە تەئکید یان شەو، یان ڕۆژ سەرخەوێکی شکاندوە، چونکە مرۆڤ ناتوانێ بەبێ خەو و پشوودان، بەردەوام بێ]، کاتێک کە دادەبەزین، هەڵدەستا نوێژی دەکردن، ئیدی هەر بەو شێوەیە بوو، تاکو چووینە لای (بَيتُ المَقدِس)، پیاوێکی ئیفلیج لە دەرگا دانیشتبوو، داوای لە خەڵک دەکرد، کە بەلایدا تێپەڕین، بەو پیاوە کە من لەگەڵیدا بووم پێیگوت: پێم ببەخشە، (هاوکاریم بکە)، ئەویش گوتی: هیچ شتێکم نیە بتدەمێ، چووینە نێو (بَيتُ المَقدِس)ەوە، (دیارە ئەو کاتە مزگەوت بووە)، کاتێک کە خەڵکی (بَيتُ المَقدِس) بینییان، زۆر پێی دڵخۆش بوون و، بە ڕووی خۆش و گەشەوە پێشوازییان لێکرد، ئەویش گوتی: ئەمە غوڵامی منە، (واتە: ئەو کوڕە گەنجە لەگەڵ منە)، ئاگاتان لێی بێ و، چاودێریی بکەن، ئەوانیش لەگەڵ خۆیان بردیانم و، نان و گۆشتیان دامێ، ئەویش چۆوە نێو نوێژەکەی، (نێو خواپەرستییەکەی)، ئاوڕی لێ نەدامەوە تاکو یەکشەممەی داهاتوو، دوایی ئاوڕی لێ دامەوە گوتی: ئەی سەلمان! من دەمەوێ سەرخەوێک بشکێنم، هەر کاتێک سێبەر گەیشتە ئێرە و ئێرە، هەڵمستێنە، ئیدی سەری خستە سەر زەوی و خەوت، کاتێک سێبەر گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەیگوت، هەڵم نەستاند، بەزەییم پێداهات لەبەر ئەوەی زۆر ماندوو بوو، پێویستی بە پشوودان بوو، هەڵمنەستاند، دوایی کە هەڵسا بە شپرزەیی هەڵسا، گوتی: ئەی سەلمان! ئەدی پێم نەگوتی: ئەگەر سێبەر گەیشتە ئێرە و ئێرە، هەڵمستێنە؟ گوتم: با! بەڵام لە ڕووی بەزەیی پێدا هاتنەوەوە، کە بینیم زۆر ماندووی و، زۆر خۆت ماندوو دەکەی و ڕەنج دەدەی، هەڵمنەستاندی، گوتی: بێ قەزا بی سەلمان، من حەز ناکەم هیچ کاتێک لە ڕۆژگارم لەدەست بچێ، کە چاکەیەکم بۆ خوا تێدا ئەنجام نەدابێ، دوایی پێیگوتم: ئەی سەلمان! بزانە کە باشترین ئایینی ئەمڕۆمان لەم ڕۆژگارەماندا، بریتیە لە نەصرانییەت، گوتم: ئایا لەمڕۆ بەدواوە، ئایینێکی دیکەی باشتر لە نەصرانییەت پەیدادەبێ؟ ئەوە هەر وشەیەک بوو، کەوتە سەر زمانم، (نازانم چۆن بوو ئەو قسەیەم

بـەزاردا داهـات)، گوتـی: بەڵـێ! نیزیکـە پێغەمبەرێـک بـێ، ڕەوانـە بکـرێ کـە دیاریـی دەخـوات، بـەڵام شـتی خێـرو صەدەقـە ناخـوات و، لـە نێـو دوو شـانەکانی دا مـۆری پێغەمبەرایەتیـی هەیـە، هـەر کاتێـک ئـەوت بینـی، شـوێنی بکـەوەو بەڕاسـتی بزانـە، گوتـم: ئەگـەر فەرمانیشـم پـێ بـکات، کـە واز لـە نەصرانییـەت بێنـم؟ گوتـی: بەڵـێ، چونکـە ئـەو پێغەمبەرێکـە، تەنیـا فەرمـان بـە هـەق دەکات و، تەنیـا هـەق دەڵـێ، سـوێند بـە خـوا ئەگـەر ببینـم و فەرمانـم پـێ بـکات بچمـە نێـو ئاگـر، دەچمـە نێـوی.

دوایـی ئێمـە ویسـتمان لـە (بَيتُ الْمَقْدِس) بچینـە دەر، بـەلای ئـەو نیفلیجـەدا ڕۆیشـتین، دووبـارە پێیگوتـەوە: تـۆ چوویـە نێـو ژووری مزگـەوت و هیـچ شـتێکت نەدامـێ و، ئێسـتاش دەچیـە دەرێ، شـتێکم بدەیـە، نـاوڕی دایـەوە کەسـی لـەو دەورە نەبینـی، گوتـی: دەسـتم وێبـدە، دەسـتی وێـدا، ئەویـش دەسـتی گـرت و گوتـی: هەڵسـە بـە ئیزنـی خـوا، هەڵسـا! ڕێـک و سـاغ بـوو، (واتـە: حاڵەتـە نیفلیجییەکـەی نەمـا)، ڕۆیشـتەوە بـەرەو لای مـاڵ و منداڵـی، منیـش هـەروا چـاوی خـۆم بـە دوا خسـت و تەماشـام دەکـرد، زۆر سـەرم سـوڕما لـەوەی کـە بینیـم و، هاوەڵەکەشـم بـە خێرایـی ڕۆیـی، منیـش شـوێنی کەوتـم، (دیـارە دەبـێ ئـەو تـۆزێ ڕەت بووبـێ)، کۆمەڵێـک لـە عەشـیرەتی کەلـب (واتـە: لـە عەڕەبـە خێڵەکییـەکان) پێمگەیشـتن و، منیـان بـە دیـل گـرت و سـواری حوشـترێکیان کـردم و کەلەبچەیـان کـردم، [گرتوویانەو ئـەو کاتـە یەکێـک لـەو ڕێیانـەی کـە خەڵکـی لێـوە کـراوە بـە کۆیلـە، بەدیـل گرتنـی خەڵـک بـووە]، هەروەهـا فرۆشـیاران دەسـتا و دەسـتیان پـێ کـردم، تاکـو گەیشـتمە مەدینـە، پیاوێـک لـە پشـتیوانەکان منـی کـڕی و، منـی لەسـەر باخێکـی دارخورمـا دانـا، (کـە خزمەتـی ئـەو باخـە دارخورمایـە بکـەم)، لەوێـش فێـری چنینـی ئـەو شـتانە بـووم، (ئەگـەر حەسـیر بـووە، ئەگـەر بەرچنـە بـووە، بـەڵام لـە پووشـی دارخورمـا لـە لقەکانـی دارخورمـا چـۆن سـەبەتە و بەرچنـە و سـەوە، لـە کوردەواریـی خۆمانـدا لـە شـولکەداری بـی و سـپیدارو جـۆرە درەختەکانـی دیکـە دەچنرێـن)، ئـەوە بـوو کـە من پووشـی دارخورمـام بـە درهەمێـک دەکـڕی و، دوایـی دروسـتم دەکـرد، (شـتێکم لـێ

دروست دەکرد بە کەڵکی شتتێکردن بێ، وەک دەفر، یان وەک حەسیر ڕابخرێ)، بە دوو درهەم دەمدا، دوایی درهەمێکم دووبارە دەدایەوە، بە پووشی دارخورما و، درهەمێکیشم خەرج دەکرد، چونکە حەز دەکەم لە کردەوەی دەستی خۆم بخۆم، ئنجا ئەو کاتە کە بەردەوام بوو لەسەر دروستکردنی ئەو شتانە، لە پووشی دارخورما، فەرماندەی بیست هەزار (٢٠٠٠٠) کەس بوو، بەڵام دەیگوت: ئێستاش دەمەوێ لە کردەی دەستی خۆم بخۆم، (ئەو کاتە فێری ئەوە بووە لە کاتێکدا کە ئەو باخەی بۆ ئەو نەنصارییە سەرپەرشتییکردوە و خزمەت کردوە)، ئەو کاتەی ئێمە لە مەدینە بووین، پێمان گەیشت کە پیاوێک لە مەککە پەیدابووە، پێی وایە خوا (عَزَّ وَجَلَ) ڕەوانیکردوە بە پێغەمبەر، ئێمە ماوەیەک کە خوا بیەوێ ماینەوە، پێیچوو، دوایی کۆچی کرد بۆ لامان، (دیارە سەلمان پێشتر هەواڵ و دەنگوباسی پێغەمبەری ﷺ بیستوە)، گوتم: سوێند بە خوا، دەبێ تاقیی بکەمەوە، چووم بۆ بازاڕ گۆشتی حوشترم کڕی بە درەمێک، دوایی کوڵاندم و، قاپێک تشریبم لێ دروستکرد (واتە: گۆشت و نان پێکەوە)و، بۆیم برد (دەبێ لە مەنجەڵێک، دەفرێک، کیتەڵەیەک، گۆزەیەکدا بووبێ)، لەسەر شانی خۆمم دانا و بۆم برد، تاکو لە پێش دەستیم دانا، ئەویش فەرمووی: ئەمە چییە؟ ئایا صەدەقەیە، یاخود دیارییە؟ گوتم: بەڵکو صەدەقەیە، بە هاوەڵانی فەرموو: بخۆن بە ناوی خوا، بۆ خۆی دەستی گرتەوەو نەیخوارد، چەند ڕۆژێک مامەوە، دوایی دووبارە جارێکی دیکە بە درەمێک گۆشتم کڕی، وەک پێشێ کردم بە تێکوشین و هەڵمگرت و بۆم برد، لە پێشیم دانا، ئەویش فەرمووی: ئەمە چییە؟ دیارییە، یاخود خێرو صەدەقەیە؟ گوتم: بەڵکو دیارییە، بە هاوەڵانی فەرموو: بخۆن بە ناوی خوا و، لەگەڵی خواردن، گوتم: سوێند بە خوا ئەمە ئەوەیە، کە دیاریی دەخوات، بەڵام خێرو صەدەقە ناخوات، دوای تەماشام کرد مۆری پێغەمبەرایەتییم لەنێو هەردوو شانی دا بینی، وەک هێلکە کۆترێک بوو، (واتە: ئەو دوو نیشانەیەی کە کاتی خۆی زانا نەصرانییەکە پێیگوتبوون، هەردووکیان

تێدا دیتن)، بۆیە مسوڵمان بووم، ڕۆژێک پێمگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ نەصرانییەکان چ جۆرە خەڵکێکن؟ فەرمووی: خێریان پێوە نیە، منیش زۆر زۆرم خۆشدەویستن، بە هۆی ئەوەوە کە لە خۆماندووکردن و تاعەت و عیبادەتیانم بینیبوو، دوای چەند ڕۆژێک گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ نەصرانییەکان چ جۆرە خەڵکێکن؟ فەرمووی: خێریان پێوە نیە و، کەسێکیش خۆشییبوێن خێری پێوە نیە، لە دڵی خۆمدا، گوتم: دە سوێند بە خوا من خۆشمدەوێن، ئەویش کاتێک بوو کە پێغەمبەر ﷺ سووپایەکانی دەناردن و، شمشێری لە کالان دەرهێنا بوو، لە دژی ئەهلی کوفر کە شەڕیان پێ دەفرۆشت، مەفرەزەیەک دەڕۆیی، مەفرەزەیەک دەهاتەوە، (یانی: بەشێک لە سووپا دەچوو بەشێک دەهاتەوە) و شمشێر خوێنی لێ دەتکا، گوتم: ڕەنگە ئێستا وەحیی بۆ بێ، کە من خۆشمدەوێن و، کەسێک بنێرێ و لە گەردنم بدات، بۆیە لە ماڵێ دانیشتم، ڕۆژێک نوێنەر هات بۆ لام، (پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد بۆ لام)، گوتی: سەلمان وەڵام بدەوە، گوتم: وەڵامی کێ بدەمەوە؟ گوتی: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا ئەوە بوو کە لێی دەترسام، گوتم: باشە بڕۆوە، منیش ئێستا پێت دەگەم، ئەویش گوتی: نەخێر سوێند بە خوا دەبێ لەگەڵ خۆمدا بێی، منیش وام بیر لێ کرد بۆوە، کە ئەگەر ئەو بڕوات، منیش ڕابکەم، بەڵام لەگەڵ خۆیدا بردمی، تاکو بردمی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کاتێک پێغەمبەر ﷺ منی بینی، بە زەردەخەنە پێکەنیی و فەرمووی: ئەی سەلمان! موژدەت لێ بێ خوا ﷻ دەرووی لێکردیەوە، دوایی ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندمەوە:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

واتـە: ئەوانـەی پێشـتر کتێبـمان پێـداون، ئـا ئەوانـە بـڕوای پێدێنـن (بـە قورئـان)، (کـە سـەلمان یەکێکیـان بـووە)و، کاتێـک بەسـەریاندا بخوێندرێتـەوە دەڵێـن: بڕوامـان پـێ هێنـا، کـە ئـەوە هەقـە لـە پەروەردگارمانـەوە، ئێمـە پێشـتریش ملکـەچ بوویـن (شـوێن کتێبـە پێشـووەکانی خـوا کەوتبوویـن و شـوێن پێغەمبەرانـی پێشـووی خـوا کەوتبوویـن) ﴿٥٣﴾ ئـا ئەوانـە دوو جـاران پاداشـتیان دەدرێتەوە بەهـۆی خۆڕاگرییانەوە (لەسـەر ئـەوە کـە واز دێنـن لـە ئاییـن و بەرنامـەی پێشـوویان و، بـڕوا دێنـن بـە ئایین و بەرنامـەی کۆتایـی خـوا ﷺ کـە ئـەوە خۆڕاگریـی دەوێ، هەروەهـا خۆڕاگرییـان لەسـەر بەرنامـە پێشـووەکە، تاکـو بەرنامـەی کۆتایـی هاتـوە، ئـەوەی هـەق بـووە، هەروەهـا خۆڕاگرییـان لەسـەر ئـەوەی توانـج و پلاریـان تێدەگیـرێ کـە واز لـە ئایینـی پێشـوویان دێنـن، هەمـووی دەگرێتـەوە) و، لـە بەرانبـەر خراپـەدا چاکـە دەکـەن، (بـە چاکـە خراپـە پـاڵ پێوەدەنێـن)و، لـەوەی کـە پێمانـداون، دەبەخشـن ﴿٥٤﴾ کاتێـک کـە قسـەی پـووچ دەبیسـتن، وازی لـێ دێنـن، (پشـتی تێدەکـەن)و، دەڵێـن: کـردەوەی خۆمـان بـۆ خۆمـان و کـردەوەی خۆشـتان بـۆ خۆتـان، سـەلامتان لـێ بـێ، ئێمـە خوازیـاری نەفامـان نیـن (قسـەیان لەگەڵـدا بکەیـن).

ئەمە مانای دەقی ئایەتەکان بوو.

(ئنجـا سـەلمان بەسـەرهاتەکەی خـۆی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ گێڕاوەتـەوە، دەڵـێ:) گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ سـوێند بـەو کەسـەی تـۆی بـە هـەق ناردوە، لێـم بیسـت کـە دەیگـوت (ئـەو زانایـەی کـە سـەلمان لەسـەر دەسـتی بۆتـە نەصرانیـی)، ئەگـەر بیگەمـێ و فەرمانـم پێبـکات بچمـە نێـو ئاگـر، دەچمـە نێـو ئاگـر، چونکـە ئـەو پێغەمبەرێکـە کـە تەنیـا هـەق دەڵـێ و، تەنیـا فەرمـان بـە هـەق دەکات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە چـل و دوو (٤٢) ئایەتـی پێشـوودا، شـەش قۆنـاغ لـە بەسـەرهاتی مووسـا و هاروونـی بـرای (عَلَيْهِـما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لەگـەڵ گەلەکەیـان بەنـوو ئیسـرائیل و، دوژمنـە ناحەزەکانیـان: فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی و گەلەکـەی دا، خسـتنە ڕوو، لـە کۆتایـی ئـەوەدا دەفەرمـوێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ ﴾، (خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:) بـە دڵنیایـی ئێمـە کتێبـمان بـە مووسـا ﷺدا، دوای ئـەوەی سـەدە پێشـوەکانمان فەوتانـدن، واتـە: ئـەو کۆمەڵگایانـەی کـە لـەو سـەدە پێشـووانەدا، دەژیـان فەوتاندمانــن، ﴿ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ ﴾، بەرچــاو ڕوونییەکانــی بــۆ خەڵکــی تێدابــوون، ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةً ﴾، هەروەهــا ڕێنمایــی و بەزەییــش بــۆ خەڵــک، ﴿ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بۆیــە کتێبــمان بــە مووســادا: بەڵکــو خەڵــک بیریــان بکەوێتــەوە، ڕاستییەکانیان بیـر بکەوێتـەوە، کـە لـە زکماکیانـدا دانـراون و، پەنـدو دەرس وەربگـرن.

ئنجـا خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و، لـە پشـت ئەویشـەوە، ڕوو دەکاتـە بـڕواداران، هەروەهـا مرۆڤـەکان بـە گشـتیی، تاکـو بۆیـان بخاتـە ڕوو، کـە ناگونجـێ ئـەم قوڕئانـە لـە جگـە لـە خـواوە سـەرچاوەی گرتبـێ و، لـە جگـە لـە خواوە هاتبـێ، چونکـە پـڕە لـە نهێنیـی و، ئـەو نهێنییانـەش تەنیـا لـە لای خـوای پـەروەردگارو خاوەنـی گـەردوون و، خاوەنـی ڕابـردوو و، داهاتـوو و، زانیـار، پارێـزراون، بەشـێک لـەو نهێنییانـەش، ئـەو نهێنییانـەن، ئـەو وردەکارییانـەن، کـە لـە ژیانـی پێغەمبەرانـدا بـوون (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئەگـەر مووسـا و هاروونـن، ئەگـەر شـوعەیبە لەگـەڵ خەڵکـی مەدیـەن، ئەگـەر پێغەمبەرانـی دیکـەن، کـە خـوا ﷻ ئـەو وردەکارییانـەی لـە بەسـەرهاتی ئـەو پێغەمبەرانـەدا بـووە، لەگـەڵ گەلەکانیـان، وەک خۆیـان بـۆ

موحەممەدیان ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو نهێنیی و وردەکاریيانەی بۆ خستوونە دوو توێی ئەم قورئانەوە، ئەو نهێنیی و وردەکاریيانەی لە قووڵایی و لە تاریکاییەکانی مێژوو و ڕابردوودان و، تەنیا لەلای خوان ﷻ.

کەواتە: ئەم قورئانە کەسێک ناردوویەتی کە ئاگاداری ڕابردووی ژیانی بەشەر، قۆناغە پێشووەکان و سەدە پێشووەکان و، کۆمەڵگا پێشووەکان و وردەکارییەکانی ژیانی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بۆیە ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەروەها لە پشت ئەویشەوە ڕوو دەکاتە هەموو مرۆڤایەتیی و دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ ﴾، واتە: تۆ لە لای ڕۆژئاوا نەبووی (واتە: لە لای ڕۆژئاوای طوور)، کاتێک کە پرۆسەی وەحیی ناردنمان بۆ مووسا ﷺ ئەنجام دا، کارەکەمان بۆ تێپەڕاند، ﴿ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، هەروەها تۆ لە چاودێران و ئامادەبووان نەبووی، تاکو ئەو وردەکاریيانە بزانی، کە خوا ﷻ چۆن وەحیی بۆ مووسا نارد؟ وەک لە دەرسەکانی پێشوودا باسمان کرد، کە چ لە ڕووی جوگرافییەوە، چ لە ڕووی چۆنیەتییەوە، خوا ﷻ زۆر بەوردیی دیمەنی وەحیی ناردن و، فەرمایشتکردنی خۆی لەگەڵ مووسادا ﷺ بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوە، بەڵکو ئەوە ئێمەین کە ئەو وردەکاریيانەمان بۆ تۆ ناردوون و، ئەو نهێنییانەمان بۆ تۆ کەشف کردوون، یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا کە گەلەکەی تۆ ماوەیەک بووە بێ خەبەر بووە، لە هەواڵ و دەنگ و باسی وەحیی ناردنی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەران، بۆیە ئێمە ئەو وەحییەمان بۆ تۆ ناردوە، ﴿ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا ﴾، بەڵام ئێمە چەند سەدەیەکمان پێکهێناندن لە ڕابردوودا، ﴿ فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ﴾، ئنجا ئەو خەڵکەی کە تۆ لە نێویاندا ڕەوانکراوی، تەمەنێکی درێژیان بەسەر بردو سەدەکان تێپەڕین، بێ ئەوەی وەحیی بێ، ﴿ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ﴾، هەروەها تۆ نیشتەجێ نەبووی لە نێو خەڵکی مەدیەندا، ﴿ تَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾، کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنیەوە، بەسەر خەڵکی مەدیەندا، ﴿ وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾، بەڵکو هەر ئێمە نێرەربووین،

کە شوعەیبمان ﷺ؟ نارد بۆ لای خەڵکی مەدیەن و، ئێستا کە بەسەرهاتی شوعەیب و خەڵکی مەدیەن بۆ تۆ دەگێڕینەوەو، چۆنیەتیی فەرمایشتکردنمان لەگەڵ مووسادا ﷺ، بۆ تۆ دەگێڕینەوە، ئەوە ئێمەین ئەگەرنا تۆ لەوێ نەبووی و، هیچ کەسیش لەوێ نەبوو، لەوانەی ئێستا هەن، تاکو دەنگ و باس و هەواڵەکە، ئاوا بەوردیی بگێڕنەوە.

﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا ﴾، هەروەها تۆ لە تەنیشت طووڕ نەبووی، کاتێک کە بانگمان کرد، بانگی مووسامان کرد: ﴿ أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، کە ئەی مووسا! دڵنیابە من خوام پەروەردگاری جیهانییان، کاتێک ئاوا بانگمان کرد، تۆ لە تەنیشت طووڕ نەبووی، ﴿ وَلَـٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾، بەڵکو ئەو پەیام و وەحییەمان بۆ تۆ نارد، وەک بەزەییەک لە پەروەردگارتەوە، ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾، تاکو کۆمەڵێک بترسێنی، وریا بکەیەوە، کە لە پێش تۆدا، هیچ ترسێنەرو وریاکەرەوەیان بۆ ڕەوان نەکراون، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵکو پەند وەربگرن و بیریان بکەوێتەوەو، ڕاستە ڕێ بگرن و واز لە هی چەوت بێنن.

﴿ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَـٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە بەڵایەکیان تووش بێ، بە هۆی ئەوەوە دەستەکانیان پێشیدەخەن، کە کوفرو گوناهو تاوان و لادانە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، بەڵایەکیان تووش بێ بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، ئەوەی دەستەکانیان ئەنجامی دەدەن، ئنجا ئەو کاتە بڵێن: پەروەردگارمان! بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ لا نەناردین، ﴿ فَنَتَّبِعَ ءَايَـٰتِكَ ﴾، کە شوێن ئایەتەکانت بکەوین، ﴿ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، سەرەنجام لە بڕواداران بین! ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، کە ئاوا بڵێن، دوای ئەوەی بەڵایان بەسەر دێ، تۆمان بۆلا ڕەوان نەدەکردن، بەڵام بۆ ئەوەی بیانوو براویان بکەین و بەڵگەیان لەسەر تەواو بکەین، بۆیە تۆمان نارد.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا ﴾، کەچی دوای ئەوەی هەقیان لەلای ئێمەوەش بۆ هات، ﴿ قَالُواْ لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓ ﴾، گوتیان: دەبووایە هەمان شت کە بە مووسا دراوە، پێی بدرێ، مەبەست ئەو موعجیزە بەرهەستانەیە، کە بە مووسا درابوون، بە تایبەت گۆچانەکەی و دەستی، هەروەها نیشانە و موعجیزە پاسا درەکانی دیکە، ﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُ ﴾، ئەدی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون بە تۆ، پێشتر بەوەی کە بە مووساش درابوو، بێبڕوا نەبوون؟ واتە: کوفر هەمووی یەک میللەتە، وەک چۆن ئەو کافرانە ئێستا بە تۆ بێبڕوان، کاتی خۆی کافرەکانیش لە ڕۆژگاری مووسادا ﷺ، بە مووسا بێبڕوا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو موعجیزانەشی پێدرابوون؟ ﴿ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا ﴾، کە بە خۆی و بە هاڕوونی براییان گوت: دوو جادووگەرن، پشتی یەکدیی دەگرن، ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ ﴾، گوتیشیان: ئێمە بە هەرکامێکیان بێبڕواین، واتە: ئەگەر مەسەلە موعجیزە و بەڵگەی پاسا دڕ بێ، کاتی خۆی کافرەکانی ڕۆژگاری مووساش، بە مووسا بێبڕوا بوون، هەرچەندە ئەو هەموو موعجیزە پاسا دڕانەشی پێدرا بوون و، خۆیشی و هاڕوونی برایشیان تۆمەتبار کرد، بەوەی کە دوو جادووگەرن، پشتی یەکدیی دەگرن.

﴿ قُلۡ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ أَتَّبِعۡهُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: تۆ پێیان بڵێ: کتێبێک لەلایەن خواوە بێنن، کە پڕ هیدایەتتر بێ، لەو دووانە (واتە: لە قورئان و لە تەورات)، تاکو شوێنی بکەوم، ئەگەر ڕاست دەکەن، یاخود پڕ هیدایەتتر بێ لە (تەورات و ئینجیل)، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست (قورئان و تەورات) بێ، ئەگەر ڕاست دەکەن، فەرموون کتێبێکی دیکە بێنن، هیدایەتی زیاتری تێدا بێ، زیاتر مایەی هیدایەت و بەرچاو ڕوونکردنەوە بێ، ﴿ فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ ﴾، بەڵام ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە، نەیانهێنا (کتێبێکی وایان نەهێنا) کە ناشیهێنن، ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴾، دەجا بزانە کە ئەوانە شوێن ئارەزووەکانیان

دەکەون، لە جیاتی کەوتنە شوێن (هُدی)، کەوتوونە شوێن (هَوی)، (وَمَنِ اتَّبَعَ الهَوی فَقَد هَوی)، هەر کەسێک بەدوای ئارەزوو بکەوێ، دەکەوێ، ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ئایا کێش گومڕاترە لە کەسێک، بە دوای ئارەزووی خۆی دەکەوێ، بەبێ ڕێنمایییەک لە خواوە؟ بە دوای پێخۆش بوون و ئارەزووی خۆی دەکەوێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران، ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لێرەدا (لَا يَهْدِى) بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، خوا ﷻ ڕێنمایی هەموو کەسی کردوە، لێرەدا هیدایەت، یانی: خستنە سەر ڕاستە ڕێ، خوا ﷻ ڕاستەڕێیان ناکات، بە تۆبزیی بیانخاتە سەر ڕێی ڕاست، بەس ڕێیەکەیان دەخاتە بەرچاو، چونکە ئەگەر ڕێیان نەخاتە بەرچاوو ڕێنماییان نەکات، ڕێیان پیشان نەدات، بەڵگە و بیانوویان دەبێ، بەڵام خوا ﷻ ڕێیان پیشان دەدات، ئەمما بە تۆبزیی ملیان ناگرێ بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە قسەمان بۆ پەیوەست کردوون، بەڵکو پەند وەربگرن، واتە: ڕێنمایی خۆمامان لێ نەپچڕاندوون، بەردەوام کتێبەکانمان بۆ دابەزاندوون و، پێغەمبەرانمان پەیتا پەیتا بۆ ناردوون، وەک لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ﴿٤٤﴾﴾، واتە: دوایی پێغەمبەرانمان پەیتا پەیتا (یەک لە دوای یەک) ناردن، بەڵێ جار جار ماوە و دابڕانێکیان کەوتۆتە نێوان، تاکو زیاتر قەدری نیعمەتی خوا بزانن، بەڵام ئەوە نەبووە کە خوا ﷻ مرۆڤایەتیی لە هیدایەت و ڕێنمایی خۆی بێبەش بکات، کەواتە: ﴿وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ﴾، (وَصَّلْنَا) واتە: فەرمایشتی خۆمامان پەیوەستکردوە، یەک لە دوای یەک، نەک بیپچڕێنین، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن و، بیریان بکەوێتەوە.

ئنجا خوا ﷻ ستایشی ئەوانە دەکات، لە خاوەن کتێبەکان، کە بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناوە، کە کەسانێکی دیاریکراو بوون: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ﴾، ئەوانەی کە پێش وی (پێش قورئان) کتێبمان پێدابوون، یان (مِن قَبْلِهِۦ)، پێش وی (پێش موحەممەد ﷺ) کتێبمان پێدا بوون،

﴿ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئـا ئەوانـە بەڕاسـتیی بـڕوای پـێ دێنـن، واتـە: بـڕوا بـە قورئـان دێنـن، یـان بـڕوا بـە موحەممـەد ﷺ دێنـن، زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی قورئـان بـێ، ﴿ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴾، کاتێـک ئـەو کتێبەشـیان بەسـەردا بخوێندرێتـەوە، کـە قورئانـە، ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ ﴾، گوتیـان: بڕوامـان پێـی هێنـا، ﴿ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوە هەقـە، چەسـپاوە، ڕاسـتە، لـە پەروەردگارمانەوەیـە، ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە پێـش ئەویـش (واتـە: پێـش هاتنـی قورئانیـش) هـەر ملکـەچ بوویـن بـۆ خـوا، شـوێن کتێبەکانـی دیکـەی خـوا کەوتبوویـن و، شـوێن پێغەمبەرانـی پێـش موحەممـەد ﷺ کەوتبوویـن، بـۆ خـوا ﷻ ملکـەچ بوویـن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ ﴾، ئـا ئەوانـە دوو جـاران پاداشـتیان دەدرێتـەوە، جارێکیـان لەسـەر شـوێنکەوتنی کتێبـە پێشـووەکان و، پێغەمبەرانـی پێشـوو (ئەگـەر بەڕاسـتیی شـوێنیان کەوتـبن و لایـان نەدابـێ)و، جارێکیـش لەسـەر شـوێنکەوتنی کتێبـی کۆتایـی و پێغەمبـەری کۆتایـی کـە قورئـان و موحەممـەدن ﷺ، ﴿ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە کـە خۆڕاگـر بـوون، لەسـەر ئایینـە پێشـووەکەیان و، کتێبـە پێشـووەکەیان و، گرتنـی ڕێبـازی پێغەمبـەرە پێشـووەکەیان، هەروەهـا خۆڕاگریـش بـوون لەسـەر ئـەوە کـە ئامادەبـوون دەسـتبەرداری کتێـب و بەرنامـە پێشـووەکەیان بـبن، کـە کتێبێکـی باشـترو، پـڕ بـە پێسـتی واقیـع و، پێغەمبەرێکـی پایـە بەرزتـرو گەورەتـر، کـە بـۆ هەمـوو بەشـەرییەت نێـردراوە، بۆیـان هاتـوە، کـە بـە تەئکیـد ئـەو قورئانـە کـە هاتـوە، دوا کتێبـی خوایـەو، ئـەو پێغەمبـەرە کۆتاییـەو ئـەو کتێبـە کۆتاییـە، هەردووکیـان: پێغەمبەرانـی پێـش خۆیـان و، کتێبـەکانی پێـش خۆیـان بـە ڕاسـت دادەنێـن، هەرچـی هـەق لـە کتێبـە پێشـووەکانداو، لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەرە پێشـووەکان، هاتـوە، لـەم قورئانەشـدا هەیـە، ئـەم قورئانـە گرتوویەتـە خـۆی و، هـەر هەڵـە و کەموکورییەکیـش، خرابێتـە نێـو کتێبەکانـەوە، خرابێتـە نێـو ڕێبـازی پێغەمبەرانـەوە، ڕاسـتی دەکاتـەوە، کەواتـە: هەقـی موتڵـەق و سـاغ و بـێ خڵتـە لـەم قورئانـەدا هەیـە، هەرچـی هەقێـک کـە

لە کتێبە پێشووەکاندا هەیە، ئەم قورئانە گرتوویەتە خۆی و بێ نیازتان دەکات، لەوان، بەڵام کتێبەکانی پێشوو ئەوان بێ نیازتان ناکەن، لەم قورئانە، هەروەها موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بۆ هەموو مرۆڤەکان بە پانایی زەمین، بە درێژایی زەمان، بەڵام هەر کام لە پێغەمبەرانی پێشوو، بۆ گەلێکی دیارییکراوو بۆ قۆناغێکی دیارییکراوو بۆ کاتێکی دیارییکراو، ڕەوان کراون.

﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، هەروەها ئەو بڕوادارانە لە خاوەن کتێبە پێشووەکان، بە چاکە، خراپە پاڵ پێوەدەنێن، لە بەرانبەر خراپەدا، چاکە دەکەن، ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەش کە پێماندداون، دەبەخشن، لەوەی کە پێماندداون لە شتی مەعنەویی، وەک: زانست و عەقڵ، وەک سومعە و ئیعتیبارێک، کە هەیانە دەبەخشن، بەکاری دێنن بۆ سوودی خەڵک، هەروەها لە شتە ماددییەکان: ماڵ و سامان، بەرگ و پۆشاک، زادو زەخیرە، هەرچی پێمانداون، لێی دەبەخشن، ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ ﴾، کاتێک گوێیان لەقسەی پووچ دەبێ، (ٱللَّغْوَ) واتە: قسەی پووچ، هەروەها بە مانای کردەوەی پووچیش دێ، بەڵام لێرەدا مادام دەفەرموێ: ﴿ سَمِعُوا۟ ﴾، بەس قسە دەگرێتەوە، قسەی پووچیش واتە: شتێک کە سوودی نەبێ، سوودی نەبێ بۆ لای خوا ﷻ و، بۆ ڕۆژی دوایی و، مرۆڤ لێی بەهرەمەند نەبێ بۆ ژیانی دنیای، ئەوە بە پووچ لە قەڵەم دەدرێ، کاتێک کە قسەی پووچ دەبیستن، قسەی بێ کەڵک دەبیستن، ﴿ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ ﴾، پشتی تێدەکەن، ڕووی لێ وەردەگێڕن، ﴿ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾، بەوانەی کە قسەی پووچ و بێ کەڵک دەکەن، دەڵێن: کردەوەکانی خۆمان بۆ خۆمان، ئێوەش کردەوەکانی خۆتان بۆ خۆتان، ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾، واتە: ئاشتی لەسەر ئێوە بێ، لە لایەن ئێمەوە، ئێوە سەلامەتن، ئەگەر ئێمە سەلامەت نین لە دەست و زمانی ئێوە، ئێوە سەلامەتن و بەرپەرچتان نادەینەوە، یاخود: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾، یانی: خوا حافیز، وازتان لێ دێنین و قسەتان لەگەڵ ناکەین، ﴿ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، ئێمە خوازیاری نەفامان نین، قسەیان لەگەڵدا بکەین و،

شەڕە قسە و شەڕە دەندووکەیان لەگەڵ بکەین، ئێمە ئەوەندە سەرقاڵین بە قسەی باش و کردەوەی چاکەوە، نامان پەرژێتە سەر شەڕە دەندووکەو قسەی پووچ و، کرداری پووچ.

دیارە ئەوەی کە لە مانای گشتیی دا خستمانە ڕوو، لە تەفسیری ئەو سێزدە ئایەتەدا، دەتوانین بڵێین: ئەوە هەمووی ئەنجامگیرییە لە بەسەرهاتی مووسا ﷺو هاروونی برای ﷺ، لەگەڵ گەلەکەیان بەنوو ئیسرائیل و، لە بەرانبەریان دا، دوژمنە ناحەزەکانیان، فیرعەون و دارو دەستەکەی و، گەلە یاخییەکەی، ئەوە هەمووی ئەنجامگیرییەو، شیکردنەوەیەکە لە بارەی ئەوەوە کە ڕابرد، چی لێ وەردەگیرێ، چ دەرس و پەندێکی لێ وەردەگیرێ، پێویستە مرۆڤ چی لێ فێر بێ؟ خستنە ڕووی ئەوەیە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خـوای کارزان دوای ئـەوەی کۆمەڵـگا پێشـووەکانی فەوتانـدن، تەوڕاتــی دا بــە مووسـا ﷺ، کـە بـۆ خەڵکـی بەرچـاو ڕوونیـی و ڕێنمایـی و مایـەی بەزەیـی خـوا بـوو:**

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی کتێبمان بە مووسا دا، ئەم جەختکردنەوەییە بۆ ئەوەیە، کە خەڵک دڵنیا بکرێتەوە، خوا ﷻ پێغەمبەرانی ناردوون و، کتێبەکانی دابەزاندوون، لە نێویاندا کتێبەکەی مووسا، کە تەوڕاتە، ئەمەش وەک بەرپەرچدانەوەی کافرەکانە، کە نکووڵییان دەکرد لەوەو دەیانگوت: ﴿ وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾القصص:٣٦، واتە: شتی وامان نەبیستوە لە نێو باب و باپیرانی پێشووماندا، (خوا ﷻ کتێب دابەزێنێ و پێغەمبەر بنێرێ و، خوا ﷻ دەستوەربداتە، ژیانی مرۆڤ و، بیەوێ ژیانی بۆ ڕێک بخات)، چونکە ئەوانە نکووڵییان لە بوونی خوا نەکردوە، بەڵام گوتوویانە: خوا ﷻ مرۆڤی بۆ خۆی لێگەڕاوە، ژیانی خۆی چۆن ڕێک دەخات، عایدی خۆی کردوە، ڕێک وەک عەلمانییەت (سیکۆلاریزم) کە دەڵێ: خوا دەستوەرنادات ژیانی مرۆڤ، یان بۆی نیە دەستوەربداتە ژیانی مرۆڤ، بەڵکو مرۆڤ بۆ خۆی ژیانی خۆی ڕێک دەخات، ژیانی خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و، ئابووریی خۆی ڕێکی دەخات، هەروەها بەرپەرچدانەوەیە بۆ کافرەکان (کافرەکانی مەککە)،

هەروەها بۆ هەندێک لە جوولەکەکان کە وەک کاردانەوەو وەک سواربوونی سۆز و عاتیفە، لە نکوولّیکردندا لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو وەحییەی بۆی دێ، دەیانگوت: خوا هیچ کتێبێکی دانەبەزاندوە بۆ سەر هیچکەس، وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا، خوای پەروەردگار لێی گێڕاونەوە کە دەفەرموێ:

﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾، واتە: وەک پێویست ڕێزی خوایان نەگرت، کە گوتیان: خوا ﷻ هیچ شتێکی دانەبەزاندۆتە سەر هیچ مرۆڤێک (دەگونجێ ئەوانە جوولەکەکان بووبن، ئەو قسەیان کردبێ، دەشگونجێ هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکانی کۆمەڵگای پێغەمبەرو دەوروبەری بووبن، کە نکوولّیان کرد لەوە کە خوا هیچ وەحییەکی ناردبێ و هیچ کتێبێکی دابەزاندبێ و هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانەکردبێ)، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ ﴾الأنعام، بڵێ: ئەدی کێ ئەو کتێبەی دابەزاندوە کە بۆ سەر مووسا ﷺ دابەزێنرا؟ ﴿ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ﴿٩١﴾ ﴾الأنعام، ڕووناکیی و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵک. ﴿ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ ﴿٩١﴾ ﴾الأنعام، کە ئێوە دەتانکردە بەش بەش، نامیلکە نامیلکە، (قَرَاطِيسَ) کۆی (قِرْطَاس)ە، واتە: پەڕ پەڕ دەتاننووسی، وەک چۆن ئێستا خەڵک کتێب و نامیلکە، دەنووسێ، یاخود قورئان کە کراوە بە سی (٣٠) بەش (جزء)، یانی: بەش بەشتان دەکرد. ﴿ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ﴿٩١﴾ ﴾الأنعام، هەندێکتان ئاشکرا دەکردو زۆریشتان پەنهان دەکرد (ئەوەی لە بەرژەوەندییان بوو، ئاشکرایان کردوەو ئەوەشی لە زیانیان بووە، پەنهانیان کردوە). ﴿ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ﴿٩١﴾ ﴾الأنعام، بەهۆی کتێبەکانی خواوە، شتانێکتان فێر کرا، کە خۆتان و باب و باپیرانتان نەدەگونجا بیانزانن و لە جگە لە ڕێی وەحییەوە، نازانرێن، چونکە خوای پەروەردگار بۆیە وەحیی ناردوە بۆ پێغەمبەران، ئەو شتانەی پێدا ناردوون کە لە مەودای عەقڵی

بەشـەردا نیـن، ئەگەرنـا شـتێک کـە بەشـەر عەقڵـی پـێ بشـکێ، خـوای زانـاو شـارەزا نەیخسـتۆتە دوو توێـی وەحییەکـەی خۆیـەوە، هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە لـە مـەودای عەقڵـی مـرۆڤ دان و مـرۆڤ دەتوانـێ بـۆ خـۆی پەیـان پـێ ببـات و بیانزانـێ، بـۆ عەقڵـی بەشـەر لێیـان گـەڕاوە)، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾الأنعام، بڵـێ: خـوا ﷻ (ئـەو کتێبـەی دابەزانـدوە)، دوایـی لێـی بگـەڕێ بـا لـە یاریـی و گەمـەی خۆیانـدا سـەرقاڵ بـن.

ئنجـا کـە لێـرە دەفەمـوێ: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ﴾، بـە دڵنیایـی کتێبـمان بـە مووسـا ﷺ دابـوو، ئـەوە بـۆ بەرپەرچدانـەوەی هەمـوو ئـەو قسـە و قاڵانـە و، بـۆ دڵنیـا کردنـەوەی مرۆڤایەتییـە، کـە خـوا مرۆڤەکانـی وێـڵ نەکـردوون، لەنێـو ئـەو گەلانـەدا کـە خـوا ﷻ پەیـام و وەحیـی بـۆ نـاردوون، گەلـی بەنـوو ئیسـرائیل بـووە و، گەلـی میسـر بـووە و، کـە خـوا ﷻ کتێبـی بـە مووسـا ﷺ دابـوو، بۆیـان.

٢)- ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ﴾، دوای ئەوەی سەدە پێشووەکانمان فەوتاندن، (ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ) یانی: گەلی نووح و گەلی عادو، گەلی ثەموودو گەلی مەدیەن و گەلی لووط، (ٱلۡقُرُونَ) کۆی (قَرْن)ە، (قَرْن) یانی: سەدە، زانایان دەڵێن: سەدە، یان سەد (١٠٠) ساڵە، یان حەفتا (٧٠) ساڵە، بەڵام بە زۆریی لەسەر سەد (١٠٠) ڕێککەوتوون و، لێرەش مەبەست سەد (١٠٠) ساڵەکان نین، سەد (١٠٠) ساڵەکان نافەوتێن، یانی: ئەو خەڵکانەو ئەو کۆمەڵگایانەی لەو سەد ساڵانەدا ژیاون، لەو سەدانەدا ژیاون.

٣)- ﴿بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ﴾، ئەو کتێبەی بە مووسامان دابوو، پێبینەرەکان (بَصَآئِرَ) بوو بۆ خەڵک، (بَصَائِر جَمْعُ بَصِيرَة: مَا يُبْصَرُ بِهِ أَي: الحُجَجُ البَيِّنَةُ الّتِي يُبْصَرُ بِهَا الحَقُّ، وَيُمَيَّزُ بِهَا بَيْنَ الحَقِّ وَالبَاطِل)، (بَصَائِر) کۆی (بَصِيرَة)یە، کە بریتیە لەوەی شتی پێ ببینرێ، هۆکاری بینین بێ، کە مەبەست بەڵگە ڕۆشنەکانن کە هەقیان پێ دەبینرێ و، هەق و ناهەقیان پێ لێک جیا دەکرێنەوە.

٤)- ﴿ وَهُدًى ﴾، ڕێنمایی بوو.

٥)- ﴿ وَرَحْمَةً ﴾، بەزەیی بوو (بۆ خەڵک).

٦)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵکو بیریان بکەوێتەوەو پەند وەربگرن، (يَتَذَكَّرُون: **أَي يَتَذَكَّرُونَ الحَقائِقَ المَرْكُوزَةَ فِي فِطَرِهِم وَعُقُولِهِم، إِذِ الرُّسُلُ أُرْسِلُوا لِيُثِيرُوا دَفَائِنَ العُقُولِ، فَالحَقَائِقُ وَالأَحْكَامُ الَّتِي يَتَضَمَّنُهَا كِتَابُ اللهِ لَيْستْ غَرِيبَةً عَنِ العُقُولِ وَالفِطَرِ**)، ئەمە تەعبیرو داڕشتنی خۆمە.

(**يَتَذَكَّرُون**) یانی: ئەو ڕاستییانەی کە خوا ﷻ لە عەقڵ و زگماکی مرۆڤەکاندا دایکوتاون، (داینـاون)، ئەوانەیان بکەوێتەوە بیر، چونکە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام**)، هاتوون تاکو ئەوەی لە عەقڵەکاندا شێردراوەتەوەو دانراوە، وەدەربێخەن، چونکە ڕاستییەکان و حوکمە شەرعییەکان، کە کتێبی خوا گرتوونیە خۆی، شتی نامۆ نین بە عەقڵەکان و زگماکەکان.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ ﴾، لەو بارەوە گێردراوەیەک هاتوە، بە ڕای هەندێک لە زانایان فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ و بەبەرز کراوە (**مَرْفُوع**)ی هاتوە، هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر هەر قسەی ئەبوو سەعیدی خودرییە و، دەقێکی وەستێنراو (**مَوْقُوف**)ە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

[**مَا أَهْلَكَ اللهُ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ وَلَا قَرْنًا مِنَ القُرُونِ، وَلَا قَرْيَةً مِنَ القُرَى، لَا مِنَ السَّمَاءِ وَلَا مِنَ الأَرْضِ، مُنْذُ أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، غَيْرَ القَرْيَةِ الَّتِي مَسَخَهُمُ اللهُ قِرَدَةً، أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ:** ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾]، (**أخرجه الحاكم: ٣٥٣٤، وقال: صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: على شرط البخاري ومسلم، وذكره السيوطي في الدر المنثور: (٤١٧/٦) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، وعزاه للبزار وابن المنذر والحاكم وصحَّحه وابن مردويه**).

واتـە: خـوای بـەرز هیـچ سـەدەیەکی لـە سـەدەکان بـە سـزایەک لـە ئاسـمانەوە، یاخـود لـە زەوییـەوە نەفەوتانـدوە، لـەو کاتـەوە کـە تەوراتـی ناردۆتـە خـوار، جگـە لـەو شـارەی کـە خـوا (مَسـخ)ی کـرد، کردنیـە مەیمـوون، سـەرنجی قسـەی خـوای بـەرز بـدە، کـە دەفەرمـوێ: دوای ئـەوەی سـەدە پێشـووەکانمان فەوتانـدن، کتێبـمان (تەوراتمـان) بـۆ مووسـا ﷺ دابەزانـد، (واتـە: دوای ئـەوەی کتێـب بـۆ مووسـا ﷺ دابەزێـنراوە، خـوا ﷻ هیـچ گـەل و کۆمەڵگایەکـی بـە سـزایەکی لەسـەرێوە هاتـوو، یـان لـە خوارێـوە پەیـدا بـوو، نەفەوتانـدوە).

دەڵێـم: زۆر پێدەچـێ ئایەتەکـە - هەروەهـا دەقەکـەی سـوننەتیش - ئاماژەبـێ بـە یاسـایەکی گەردوونیـی خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا، کـە لـە دوای دابەزانـدنی تـەورات، خوا سـزادانی بنبڕکـردن و قەلاچۆکـردنی گـەل و کۆمەڵگایـەکانی ڕاگرتبـێ. بـەڵام بێگومـان جـۆرەکانی دیکـەی سـزادان هـەر مـاون، بـەڵام سـزای فەوتانـدنی گشـتیی ڕاگیـراوە تاکـو ئاخیـر زەمـان دێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە تاکە نەگەری ڕاست بۆ زانینی موحەممەد ﷺ و، ئاشنایی بەو هەواڵانەی لە بارەی مووساوە، باسکران، تەنیا ئەوەیە کە خوا ﷻ بۆی سروش کردوون و بۆی ناردون، چونکە موحەممەد ﷺ خۆی لەو شوێنانە ئامادە نەبووە، کە تێیاندا پەیامی خوا ﷻ بۆ مووسا ﷺ نێردراوە و، ڕەوانە کراوە بۆ لای فیرعەون و گەلی میسر، هەروەها لە نێو گەلی مەدیەن دا نەبووە، کاتێک کە خوا ﷻ شوعەیبی بۆ لا ڕەوان کردوون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ﴾، (ئەی موحەممەد!) تۆ، لە تەنیشتی ڕۆژئاوا نەبووی (لە نیزیک ڕۆژئاوا نەبووی)، زانایان گوتوویانە: ئەم تەعبیرە **(هذا مِن إضَافَةِ المَوْصُوفِ إلى صِفَتِه)**، ئەمە لە پاڵدانی وەسفکراو **(مَوْصُوف)**ە، بۆ لای سیفەتەکەی، **(أَي: الجَانِبِ الغَرْبِيِّ مِنَ الطُّور)**، تۆ لە لای ڕۆژئاوای طووڕ نەبووی، (بِجَانِبِ) یانی: نیزیک و تەنیشت، (ٱلْغَرْبِيِّ) یانی: ڕۆژئاوا، کەواتە: دەبێتە: **(بِجَانِبِ الطُّورِ الغَرْبِيِّ)**، واتە: لەلای ڕۆژئاوای طووڕ، کێوی طووڕ کە ناوی هەر چیایەکە، یاخود ناوی چیایەکی تایبەتە.

٢)- ﴿إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ﴾، کاتێک کە کارەکەمان بۆ مووسا ﷺ نارد، پرۆسەکەمان لەگەڵ مووسادا ﷺ ئەنجام دا، کە بریتی بوو لە فەرمایشت لەگەڵدا کردنی و، ناردنی بە

پێغەمبەر، (الأَمْرُ المَقْضِيُّ: أَمرُ الوَحيِ إلى مُوسَى)، ئەو کارەی کە ئەنجامدراوە، بریتی بووە لە سروش ناردن بۆ مووسا ﷺ، لە ڕێی دواندنیەوە، کە خوا ﷻ مووسای ﷺ دواندووەو ڕاستەوخۆ فەرمایشتی لەگەڵدا کردوە، ﴿إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ﴾، (أَي: كَلَّفْنَاهُ وَأَلْزَمْنَاهُ بِالأَمرِ)، کاتێک کارەکەمان نارد بۆ مووسا و، مووسامان پێ ئەرکدار کردو، پێوەی پابەندمان کرد.

٣)- ﴿وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾، تۆ لە چاودێران نەبووی، یاخود تۆ لە ئامادەبووان نەبووی، (شَاهِد) دەگونجێ بە مانای ئامادە (حَاضِر) بێ، دەشگونجێ بە مانای بینەر (رَائِي) بێ، یانی: تۆ لەوێ نەبووی کە دیمەنەکە ببینی، هەروەها لەوێش ئامادە نەبووی، تاکو دوایی بەو شێوە وردەکارییە کە خوا ﷻ گێراویەتەوە، بیگێڕیەوە، کەواتە: دیارە لە خواوەیە ئەو هەواڵە وردانە، ئەو وردەکارییانە و، چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو پرۆسەی دواندنی خوا ﷻ بۆ مووساو وەحیی ناردنی خوا بۆ مووسا، بگێڕێتەوە.

٤)- ﴿وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ﴾، بەڵام چەند سەدەیەکمان پێکەیاندن تەمەنێکی درێژیان بەسەردا تێپەڕی.

(إسْتِدْرَاكٌ لِبَيَانِ تَوضِيحِ عِلَّةِ إِنْكَارِ الكُفَّارِ لِلوَحْيِ وَالنُّبُوَّةِ، بِأَنَّ السَّبَبَ هُوَ مُضِيُّ مُدَّةٍ طَوِيلَةٍ دُونَ إِرْسَالِ رُسُلٍ بَعْدَ مُوسَى ﷺ)، ئەمە (بەڵام)ێکە، {(إسْتِدْرَاك) یانی: بەڵام}، بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکاری نکووڵیکردنی کافرەکان لە وەحیی و پێغەمبەرایەتیی، کە هۆکارەکە ئەوەیە، ماوەیەکی درێژ تێپەڕیوە بەسەر ناردنی پێغەمبەراندا، دوای مووسا ﷺ، بۆیە ئەوانە نکووڵیی لێ دەکەن.

واتە: ناگونجێ ڕوونکردنەوەی ئەو وردەکارییانەی کە لە قورئاندا هاتوون، دەربارەی وەحیی ناردن بۆ مووسا ﷺ و، دەربارەی بەسەرهاتی شوعەیب لەگەڵ گەلی مەدیەندا، ناگونجێ لە جگە لە خواوە بێ، بەڵام ئەوانە بۆیە نکووڵیی لێ دەکەن، چونکە ماوەیەکی زۆر تێپەڕیوە.

﴿ فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ ﴾، واتـە: تەمەنێکـی زۆر درێژیـان تێپەڕانـد، (أي: طَالَـت عَلَيهِـمُ المُهْلَـة وَتَمَـادَى عَلَيهِـمُ الأمَـد)، ماوەیەکـی زۆر تێپـەڕی و، ژیانێکـی زۆریـان بەڕێ کـرد، بـێ ئـەوەی هیـچ پێغەمبەرێکیـان بـۆ بـێ، یـانی: بـاس و خواسـی پێغەمبەرایەتیی و پەیامـی خـوا، لـە هۆشـدان (ذَاكِـرَة)ی ئەوانـدا سـڕا بـۆوە، کاڵ بـوو بـۆوە، بۆیـە نکووڵییـان کـرد، ئەگەرنـا نەدەبـوو عەقـڵ و هۆشـیان هێنـدە نەبـێ، کـە دڵنیابـن لـەوەی ئـەو وردەکاریيانـە، ئـەو بـاس و خواسـانە کـە قورئـان گرتوونیـە خـۆی، وەک چۆنیەتـی وەحیـی ناردن بـۆ مووسـا ﵇و، بەسـەرهاتەکانی دیکـەی پێغەمبـەران، دەبـوو بزانـن کـە بێجگـە لـە خـوا ﷻ، هیـچ کـەس ئـەو وردەکاریيانـە نازانـێ و، هیـچ کـەس ناتوانـێ ئـەو بـاس و خواسـانە بـەو شـێوەیە ڕوون بکاتـەوە، چونکـە تـۆ ئـەی موحەممـەد! لـەوێ نەبـووی و ئامـادەو بینـەر نەبـووی، تاکـو ئـەو بەسـەرهاتانەیان ئـاوا بـۆ بگێڕیـەوە، چ دەربـارەی مووسـا ﵇، چ دەربـارەی شـوعەیب و خەڵکـی مەدیـەن، بـەڵام بۆیـە نکووڵییلێدەکـەن، نـەک لەبـەر ئـەوەی کـە سروشـتی قورئـان جێـی نیشـکال و گومـان بـێ، بەڵکـو بەهـۆی ئـەوەوە کـە ماوەیەکـی زۆریان بەسـەردا تێپەڕیـوەو، وەحیـی و پەیامـی خوایـان لـەلا نامـۆ بۆتـەوە.

٥)- ﴿ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ﴾، هەروەها تۆ نیشتەجێ نەبووی لە نێو خەڵکی مەدیەندا، ئایەتەکانمانیان بەسەردا بخوێنیەوە.

یاخـود ئایەتەکانـی ئێمـە بەسـەر خەڵکەکەتـدا، خەڵکـی ڕۆژگاری خۆتـدا بخوێنیەوە، کـە بەسـەرهاتی مەدیـەن و شـوعەیبیان ﵇ گرتوونـە خۆیان.

٦)- ﴿ وَلَكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾، بەڵکو ئێمە هەر نێرەر بووین، ڕەوانەکەر بووین، کەواتە: ئاگادارکردنەوەی تۆو شارەزایی تۆش لەو هەواڵە وردانە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە تۆ خوا ﷻ ناردوویی، چونکە تۆ لەوێ نەبووی، لە نێو خەڵکی مەدیەندا، تاکو ئێستا ئەو ئایەتانە بۆ خەڵکی ڕۆژگاری خۆت بخوێنیەوە، کە باسی بەسەرهاتی مەدیەن کە شوعەیبی برایان بۆ لایان ڕەوانەکرا وە، دەکەن، هەروەها چۆنیەتی وەحیی ناردن بۆ

مووسا ﷺ، بەو وردەکارییە دەکەن، تۆ لەوێ ئامادە نەبووی، بەڵام هەر ئێمەین نێرەر، ئێمەین کە تۆمان ڕەوان کردوە، ئەو وردەکارییانەشمان لە بارەی ئەو پێغەمبەرانەوە، لە بارەی ئەو گەلە پێشووانەوە، بۆ تۆ ناردوون، کە بێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەسی دیکە ئاگاداری ئەو مێژووە دوورە، ئەو تاریکاییانەی مێژووی بەشەر نیە.

٧)- ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا ﴾، هەروەها تۆ لە تەنیشت و نیزیک طووڕ نەبووی، کاتێک کە بانگمان کرد، واتە: بانگی مووسامان ﷺ کرد.

٨)- ﴿ وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾، بەڵام ئەوە بەزەیی بوو لە پەروەردگارتەوە.

یانی: ئەو کاتە کە ئێمە بانگی مووسامان کرد، تۆ لە نیزیک کێوی طووڕ نەبووی، تاکو بۆیان بگێڕیەوە چۆنمان بانگ کردو، گوتمان: پێڵاوەکانت دانێ و، لە شوێنێکی پاکی و، من پەروەردگارتم و، ئاوا مووسامان دواند، تۆ لەوێ نەبووی، بەڵام ئەوەی کە بۆمان ناردووی، کە ئەو ڕاستییانەی گرتوونە خۆی، ئەوە بەزەییە لە پەروەردگارتەوە، (وَلـــكن فَعَلْنَا ذَلِكَ وَأَوحَينا إِلَيْكَ رَحِمنَاكَ رَحمَةً)، بۆیە وامانکرد چونکە بەزەییمان لەگەڵ تۆدا، لەگەڵ گەلەکەت دا، لەگەڵ مرۆڤایەتییدا نواند، یاخود: ﴿ رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾، دەگونجێ بەرکاری ڕەها (مفعول مطلق) بێ، (أي: رَحِمنَا رَحْمَةً)، بە بەزەیی ڕەها بەزەییمان نواند، دەشگونجێ (مفعولٌ من أجله) بێ، واتە: بە هۆی ئەوەوە کە ویستمان بەزەیی بنوێنین، ئەوەمان نارد.

٩)- ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ ﴾، تاکو کۆمەڵێک بترسێنی و وریا بکەیەوە، کە لە پێش تۆدا هیچ ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکیان بۆ نەهاتوە، وەک خوا لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ٦ ﴾یس، تاکو کۆمەڵێک بترسێنی کە باب و باپیرانیان نەترسێنراون، بۆیە بێ ئاگان، هەروەها لە سووڕەتی (السجدة)دا دەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ٣ ﴾، واتە: تاکو کۆمەڵێک وریا بکەیەوەو بترسێنی، کە لە پێش تۆدا هیچ

ترسێنەرو ورياكەرەوەيان بۆ نەهاتوون، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن، كەواتە: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَـٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ﴾، يانى: تاكو كۆمەڵێک بترسێنی (كە خەڵكی ڕۆژگاری خۆتن و)، لە پێش تۆدا هیچ ترسێنەرو وریاكەرەوەیان بۆ نەهاتوون.

١٠)- ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾، بەڵكو (ئومێد وایە كە) وەبیریان بێتەوە، پەند وەربگرن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**خـوا موحەممـەدی ﷺ بـە دوا نوسـخەی هیدایەتیـی خۆیـەوە، بـۆ مرۆڤایەتیـی نـاردوە، تاکو بەڵگـە و بیانوویـان نەمێنـێ، کەچـی دوای ئـەوەی هەقـی بـۆ هێنـان، کەوتنــە بــڕو بیانــوو، کــە بۆچــی شــتی وەک هــی مووســای ﷺ پــێ نــەدراوە؟ بەرپەرچدانەوەشــیان بــەوە کــە کاتــی خــۆی مووســا و هارووونیشــیان بــە دوو جادووگـەر تۆمەتبارکـردن، ئەگـەر ڕاسـتیش دەکـەن، بـا کتێبێکـی هیدایـەت بەخشـتر لـە قورئـان و تـەورات بێنـن، ئەگەرنـا دیـارە شـوێنکەوتووی ئارەزوویانـن:**

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَيَقُولُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓۚ أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۖ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلۡ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ أَتَّبِعۡهُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيۡرِ هُدٗى مِّنَ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە بەڵایەکیان تووش بێ، بەهۆی ئەوەوە کە دەستەکانیان پێشیان خستوە (لە خراپەو تاوان).**

**(لَـولا: حَـرْفُ امتِنَـاعٍ لِوُجُـود)، (لـولا) لێـرەدا پیتـی نەبوونـە، لەبـەر بـوون، یـانی: لەبــەر بــوونی خۆزگــە خواســتنیان بــە نــاردنی پێغەمبــەر، ســزامان نــەدان.**

وەڵامەکەی قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزاندرێ، یانی: (لَولا إِصَابَتُهُم بِمُصِيبَةٍ يَعْقُبُهَا قَولُهُم: ﴿رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾، مَا عَبَثْنَا بِإِرْسَالِكَ إِلَيْهِم لأَنَّهُم أَهْلُ عِنَادٍ)، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، بەڵایەکیان تووش ببێ و، لە ئەنجامی بەڵا تووش بوونەکەدا، بڵێن: پەروەردگارمان! دەبووایە پێغەمبەرێکت بۆ نارد باین، تاکو شوێن ئایەتەکانت بکەوین و، ببینە بڕوادار، لەبەر ئەوە نەبووایە، ئێمە گرنگییمان نەدەدا، بایەخمان نەدەدا، بە ناردنی تۆ بۆ لایان، لەبەر ئەوەی ئەوانە ئاوا کەللەڕەق و نەسەلمێنن.

(المُصِيبَةُ: مَا يُصِيبُ الإنسَانَ وَغَلَبَت عَلَى الأَذَى)، (مصيبة) هەر شتێکە کە تووشی مرۆڤ دێ، لە خێرو شەڕ، بەڵام زیاتر کە دەگوترێ: (مُصِيبَة) - کە لەسەر کێشی (مُفْعِلَة)یەو، بە مانای ناوی بکەر (اسم فاعل)ە، یانی: ئەو شتەی کە تووش دێ - زیاتر بۆ ئەو شتانەی کە ناخۆشیی و ئازارو ناڕەحەتییین و، تووشی مرۆڤ دێن، بەکارهاتوە، ئەگەرنا (مُصِيبَة)، یانی: هەر شتێک کە تووشی مرۆڤ دێ، لە خێرو شەڕ.

﴿بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾، بەهۆی ئەوەی کە دەستەکانیان پێشی دەخەن، ئەنجامی دەدەن لە کوفرو تاوان و خراپە، لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ بە زۆریی بە دەستەکانی کردەوەکان ئەنجام دەدات، ئەگەرنا، یانی: ئەوەی کە ئەنجامیانداوە، ئنجا چ پەیوەندیی بە عەقڵ و هۆشیانەوە هەبێ، وەک موعتەقەداتی پووچ و خراپ، چ پەیوەندیی بە دەربڕینەکانی زمانیانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە کردەوەی ئەندامەکانی دیکەیانەوە هەبێ، هەمووی دەگرێتەوە.

٢)- ﴿فَيَقُولُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾، دوای ئەوەی ئەو بەڵایەیان تووش دێ، بڵێن: پەروەردگارمان! دەبووایە پێغەمبەرێکمان بۆ لا بنێری، ئەم (لَوْلَآ)یە پیتی هاندان (حَرْفُ تَحْضِيضٍ)ە، یانی: (هَلَّا) دەبووایە پێغەمبەرێکمان بۆ لا بنێری.

٣)- ﴿فَنَتَّبِعَ ءَايَـٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، ئنجا شوێن ئایەتەکانت بکەوین و، لە بڕواداران بین، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە بەڵایان تووش بێ و دوایی ئاوا بڵێن،

تۆمان نەدەنارد، ئەم (فَنَتَّبِعَ)ە، (مَنصوب)ە، بە (أن)ێکی مەزەندەکراو، یانی: (بِأَن نَتَّبِعَ)، کە ئەم (أن)ە، مەزەننە (تقدیر) دەکرێ و شێرراوە (مُضمَر)یەو، پێویستە بشێردرێتەوە، لە وەڵامی (لَوۡلَآ)دا.

٤)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا ﴾، ئنجا کاتێک هەقیان لە لایەنی ئێمەوە بۆ هات، واتە: بیانوومان بۆ نەهێشتنەوەو پێغەمبەرمان بۆ لا ناردن.

کەچی دوای ئەوەی پێغەمبەرمان بۆ لا ناردن:

٥)- ﴿ قَالُواْ لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓ ﴾، گوتیان: دەبووایە، وێنەی ئەوەی بە مووسا دراوە، پێی بدرێ، (لَوۡلَآ) دیسان بۆ هاندان (تَحۡضِیض)ەو، بە واتای (هَلَّا)یە، یانی: (هَلَّا أُوتِيَ مِثۡلَ مَا أُوتِيَ مُوسَى) دەبووایە ئەوەی پێ بدرێ کە بە مووسا دراوە، کە مەبەستیان ئەو موعجیزە بەرهەستانەن، مووسا ﷺ پێی دراون، وەک گۆچانەکەی و، دەستی و، یاسا درەکان کە مووسا ﷺ بۆ ئیقناعکردنی خەڵکی رۆژگاری خۆی، پێویستی پێیان بووە، بەشەرییەتیش ئەو کاتە لە قۆناغێکدا بووە، زیاتر تەماشای شتی بەرهەستی کردوە، ئەوانە نەیانزانیوە کە خوا کارزان و کاربەجێیە، بەشەرییەت کاتێک کە لە قۆناغێکی ساواتردا بووە، خوا ﷻ ئەو جۆرە موعجیزانەی بۆ پێغەمبەرانی تەرخانکردوون، موعجیزەی هەر کام لە پێغەمبەران، لە قەدەر خەڵکی رۆژگاری خۆی و عەقڵییەت و، پاشخانی فیکریی و، ئاستی رۆشنبیرییاندا بووە، بەڵام دوای ئەوەی مرۆڤایەتیی گەیشتۆتە قۆناغی کامڵ بوون، دەبێ لە رێی عەقڵەوە بدوێنرێ، هەروەها موعجیزەیەکیش کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی کە موحەممەدە ﷺ تەرخان دەکرێ، لە قەدەر ئاستی عەقڵ و هۆش و کامڵ بوون و گەشەکردنی مرۆڤایەتیی بێ، دەبێ مرۆڤایەتیی لەمەودوا لەرێی عەقڵەوە بدوێنرێ، نەک لە رێی هەستەوەرەکانیەوە.

٦)- خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوە، ئەوانەی دەڵێن: دەبووایە ئەوە بە موحەممەد ﷺ بدرێ، کە بە مووسا درابوو، دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُ ﴾، ئایا کافرەکانی رۆژگاری مووسا بێبڕوا نەبوون، بەوەی کە پێشتر بە مووسا درابوو؟ دەگونجێ

یەکێک لێرەدا بڵێ: کافرەکانی قوڕەیش نەبوون، کە بێبڕوا بوون بەوەی پێشتر بە مووسا درابوو؟ بەڵکو قیبتییەکانی ڕۆژگاری مووساو ڕۆژگاری فیرعەون بوون؟! دەڵێین: ڕاستە، بەڵام کوفر هەمووی یەک کۆمەڵن، خوای پەروەردگار وەک یەک کۆمەڵ وێنایان دەکات، لەبەر ئەوەی لە هۆکارەکانی کافر بوونیاندا یەکن، (مُتَمَاثِلُونَ فِي سَبَبِ كُفْرِهِم)، ئەویش ئەوەیە کە نکووڵیی دەکەن، ئنجا وەک چۆن قیبتییەکان نکووڵییان لە موعجیزەکانی مووسا ﷺ کرد، ئەوە نیە کافرەکانی قوڕەیش و، کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ نکووڵیی دەکەن لە قورئان، هەرچەندە لە بەرانبەریشی دا دەستەوسان و دەستەپاچەن!

٧)- ﴿قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا﴾، کافرەکانی ڕۆژگاری مووسا ﷺ گوتیان: ئەوە دوو جادوون، پشتی یەکدییان گرتوە.

(سِحْرَانِ) بە (سَاحِرَانِ)یش، خوێندراوەتەوە، (سَاحِرَانِ تَظَّاهَرَا)، ئەگەر (سِحْرَانِ) بێ، یانی: (ذَوَا سِحْرَانِ) ئەوانە خاوەنی دوو جادوون، پشتی یەکدییان گرتوە، کە مەبەستیان پێیان مووسا و هاروون بووە، یاخود (سِحْرَانِ) یانی: دوو جادوون، کە ئەو کاتە مەبەست پێی قورئان و تەوراتە، یان قورئان و ئینجیلە، یان تەورات و ئینجیلە، یان مەبەستیان: مووساو موحەممەدە ﷺ، یاخود مووسا و هاروونە ﷺ، واتە: وەک هەر خودی جادوو بن، مووسا و هاروون!! ئەوە ئەگەر جۆری خوێندنەوەی: (سِحْرَانِ)بێ، یانی: ئەوانە دوو جادوون، دوو بەرجەستەکەری جادوون و، جادوویان لە خۆیاندا بەرجەستە کردوە، بەڵام ئەگەر خوێندنەوەی: (سَاحِرَانِ) بێ، واتە: ئەوانە یانی: مووساو هاروون، یان: مووساو عیسا، یان: مووساو موحەممەد، دوو جادووگەرن، ﴿تَظَٰهَرَا﴾، پشتی یەکدییان گرتوەو هاوکاری یەکدیین.

٨)- ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ﴾، هەروەها گوتیان: ئێمە بە هەرکامیان بێبڕواین، تەنوینی سەر ﴿بِكُلٍّ﴾، پێی دەگوترێ: (عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ أَي: بِكُلٍّ مِنَ السَّاحِرَينِ أَو بِكُلِّ رَسُولٍ)، یانی: قەرەبوو، جێداری پاڵدراو، واتە: بە هەر کامێک لە دوو جادوو گەرەکان، یان بە هەر کامێک لە دوو ڕەوانەکراوەکان، بێبڕواین.

٩)- ﴿ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ ﴾، بڵێ: دەجا کتێبێک لەلایەن خواوە بێنن، لەوان پڕ ڕێنماییتر بێ، شوێنی دەکەوم، لە وەڵامی ئەوەدا کە گوتوویانە: دەبووایە ئەوە کە بە مووسا ﷺ دراوە، بەویش بدرێ، خوا ﷻ وەڵامی دانەوە: کە ئەدی کاتی خۆی بێبڕوا نەبوون بەوەی کە پێشتر بە مووسا درابوو؟ گوتیان: ئەوە دوو جادوون، یان دوو جادووگەرن، پشتی یەکدیان گرتوە، گوتیان: ئێمە بە هەردووکیان بێبڕواین؟ ئنجا دوایی خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: بڵێ: کتێبێک لە لایەن خواوە بێنن، لەو دووانە (تەورات و قورئان) ڕێنماییکارتر بێ، شوێنی دەکەوم.

یانی: ئەگەر بە تەورات و قورئان ڕازیی نین، دەجا کتێبێکی لەوان باشترم لەلایەن خواوە بۆ بێنن لە ڕووی ڕێنماییکارییەوە، بە دڵنیایی شوێنی دەکەوم.

١٠)- ﴿ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، ئەگەر ڕاست دەکەن و لە هەق دەگەڕێن، فەرموون کتێبێکی دیکە لە لایەن خواوە بێنن، کە هیدایەت و ڕێنمایی زیاتری لە قورئان و لە تەورات تێدابێ.

١١)- ﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ ﴾، ئنجا ئەگەر وەڵامتیان نەدایەوە، لەوەدا کە کتێبێک لە لایەنی خواوە بێنن، پڕ هیدایەتترو ڕووناکیی بەخشتر بێ لە قورئان و لە تەورات.

١٢)- ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ﴾، دەجا بزانە! کە تەنیا شوێن ئارەزووەکانیان دەکەون و، لە هەق ناگەڕێن، مەبەستیان نیە هەق بدۆزنەوەو شوێنی بکەون، بەڵکو هەر بە دوای ئارەزووی خۆیان دەکەون.

١٣)- ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا کێ گومڕاترە لەو کەسەی شوێن ئارەزووی خۆی دەکەوێ، بەبێ ڕێنماییەک لە خواوە؟! لێرەدا وشەی (مَن) لە: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ ﴾دا، (اسمُ اسْتِفْهَامٍ عَنْ ذَاتٍ مُبْهَمَةٍ وَهُوَ اسْتِفْهَامُ إِنْكَارٍ)، ناوی پرسیار کردن (اسْتِفْهَام)ە، کە مانای نکووڵیلێکردنیش دەگەیەنێ، واتە: هیچ کەس گومڕاتر نیە، لەو کەسەی کە شوێن ئارەزووی خۆی دەکەوێ.

﴿بِغَيۡرِ هُدٗى مِّنَ ٱللَّهِۚ﴾، بەبێ ڕێنماییەک لە خواوە، ئنجا بە تەئکید شوێنکەوتنی ئارەزوو، هەر بەبێ ڕێنماییە لە خواوە، بەڵام ئەمە لێرەدا زیاتر بۆ زەقکردنەوەی شوێن کەوتنی ئارەزووەکەیانە، ئەگەرنا هەر کەسێک شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێ، بە دڵنیایی پشتی لە ڕێنمایی و بەرنامەی خوا کردوە، چونکە خوا ﷻ لە هیدایەتی خۆیدا نەیناردوە، کە خەڵک شوێن ئارەزووی بکەوێ، بەڵام بۆ زیاتر ناشیرین پێشاندانی حاڵەتەکەیانە.

١٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ کۆمەڵی ستەمکاران ناخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ڕێی پێشانداون، بەڵام نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئنجا بۆیە کەسێک کە شوێن ئارەزووی خۆی دەکەوێ، لە هەموو کەس گومڕاترە، چونکە هەواو ئارەزوو، خاوەنەکەی بەرەو زۆر هەڵدێر دەبات و، پێشتریش باسمان کرد کە ئەو بروبیانووانەی کافرەکان گرتبوویانن، لە ڕاستییدا لەوەوە سەرچاوەیان گرتوە، کە نەیان ویستوە: مل بۆ هەق کەچ بکەن و، لە هەق نەگەڕاون، بەڵکو لە بیانوو گرتن گەڕاون، ئەگەرنا جۆرو چۆنیەتی موعجیزەکانی هەر کام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، گونجاو بووە، لەگەڵ بارودۆخی خۆیاندا، لەگەڵ پاشخانی فیکریی و، ئاستی ڕۆشنبیریی کۆمەڵگاکانیاندا، ئنجا کاتێک مرۆڤایەتیی گەیشتۆتە قۆناغێک، کە دەبێ لەمەودوا لەڕێی عەقڵیەوە بدوێندرێ، کە مرۆڤ بە عەقڵ لە ئاژەڵان جیادەبێتەوە، ئەگەرنا هەستەوەرەکان خاڵی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵانن، لەو کاتەوە: خوا ﷻ موعجیزەیەکی فیکریی و، عیلمیی و، ئەدەبیی ناردوە، کە زگماک و عەقڵەکان دەدوێنێ، ئنجا ئەگەر موعجیزەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بووایە، بە تایبەت وەک موعجیزەکانی مووسا ﷺ، ئەو کاتە وەک چۆن موعجیزەکانی مووسا ﷺ لەگەڵ کۆچی دوایی خۆیدا کاریگەرییان نەماو، ئێستا وەک بەسەرهات بۆمان دەگێڕدرێنەوە، ئەگەر موعجیزەی پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ شتێکی وا بووایە، بە کۆچی دوایی خۆی کۆتایی پێ دەهات، بەڵام ئەم قورئانە، وەک چۆن بۆ پێغەمبەر ﷺ موعجیزە و بەڵگە بووە، بۆ ئۆممەتەکەشی، بۆ ئێمە و مانانیش، هەمان بەڵگە و موعجیزە لەبەردەستماندایە، لەبەر

ئەوەی موعجیزەیەكی فیكریی و، عیلمییە و، خودی بەرنامەكەیە، یانی: قورئان، هەم بەرنامەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، هەم موعجیزە و بەڵگەشیەتی، بۆیە هەم بەرنامەكە دەبێ بەردەوام بێ بۆ مرۆڤایەتیی، هەم بەڵگەكەشی كە لەنێو خۆیدایە، پێویستە ئەویش بەردەوام بێ، بەڵام پێغەمبەرانی پێشوو، بەرنامەكەیان تایبەت بووە بە گەلەكەی خۆیان و قۆناغەكەی خۆیانەوە، بۆیە بەڵگەكانیشیان، موعجزەكانیشیان تەمەنیان لەگەڵ بەرنامەكانیاندا بوون، كاتێک بەرنامەكانیان دوای خۆیان كۆتاییان هاتوە، بەڵگەكەش كۆتایی هاتوە، بەڵام هی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ، بەرنامەكەی بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، بەڵگەكەشی دەبێ لەگەڵی بەردەوام بێ، تاكو ئەو بەرنامەیە بمێنێ.

مەسەلەی چوارەم:

**جەختکردنەوە لەسەر حیکمەتی بەردەوام ناردنی خوا ﷻ بۆ پەیامەکانی بە پێغەمبەراندا و، مەدحکردنی کەسانێکی بەویژدان لە خاوەن کتێبە پێشووەکان، کە بڕوا بە پەیامی پێغەمبەری کۆتایی دێنن ﷺ و، وەسف کردنیان بە دە (١٠) لە خەسڵەتە پەسندەکانیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ﴾، بە دڵنیاییش ئێمە قسەمان بۆیان پەیوەست کردوە، (وَصَّلْنَا) خوێندراویشەتەوە: (وَصَلْنَا)، دیارە (وَصَلْنَا) یانی: گەیاندوومانە، بەڵام (وَصَّلْنَا) یانی: زۆر بە تۆخیی و زۆر بە مەحکەمیی گەیاندوومانە، یانی: پەیام و فەرمایشتمان بۆ گەیاندوون، (**التَّوْصِيلُ: مُبَالَغَةٌ فِي الوَصْلِ وَهُوَ ضَمُّ بَعْضِ الشَّيْءِ إلى بَعْضٍ وَالمُرَادُ بِهِ: القُرْآنُ، فَالتَّعْرِيفُ لِلعَهدِ، أَو وَاصَلْنا الرِّسَالاتِ**)، (تَوْصِيل) زێدەڕۆییکردنە لە (وَصل)دا، (وَصل) یانی: گەیاندن، (تَوْصِيل) یانی: زۆر گەیاندن، یان بە مەحکەمیی گەیاندن، کە بریتیە: لەوەی شتێک بە شتێکەوە بلکێندرێ، کە لێرەدا مەبەست پێی قورئانە، کەواتە: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ﴾، ئەلیف و لامی سەر (ٱلْقَوْلَ) بۆ ناساندن (تَعريف)ە و، ناساندنەکەش:

أ- مەبەست پێی (عَهْد)ە، واتە: قسەکەمان بۆ گەیاندوون، فەرمایشتەکەمان بۆ گەیاندوون، یانی: قورئانمان پەیتا پەیتا بۆ ناردوون، سوورەت لە دوای سوورەت، ئایەت لە دوای ئایەت، ناردنی قورئانمان بە یەکەوە بۆ پەیوەست کردوون، نەک دابڕان و پچڕانی بێتە نێو.

ب- یاخود مەبەست لە (ٱلْقَوْلَ)، (أل)ە‌كە بۆ ناساندن (تَعريف)ە، بەڵام مەبەست پێی (جِنس)ە، واتە: (جِنسُ القَول) فەرمایشتی خوا، كە مەبەست پێی پەیامە ئاسمانییەكانی خوایە ﷻ كە بە پێغەمبەراندا ناردوونی، واتە: یان مەبەست پێی ئەوەیە كە قورئانمان پەیتا پەیتا و، سوورەت سوورەت و، ئایەت ئایەت بە دوای یەكدا، بەبێ ئەوەی كە دابڕان ببێ لە نێوانیاندا بۆ ناردوون، یاخود مەبەست ئەوەیە: كتێبەكانمان و، پەیامی پێغەمبەرانمان، پەیتا پەیتا بۆ ناردوون.

٢)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵكو بیریان بكەوێتەوە، پەند وەربگرن و، بێنەوە سەر ڕاستە ڕێ، واز لە ڕێی چەوت و لار بێنن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی كەسانێك لە خاوەن كتێبان كە بە ویژدانن و، لە بەرانبەر هەقدا تەسلیمن، مەبەستیشمان لە هەق: پەیامی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەدە ﷺ كە قورئانە:

٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەوانەی كە كتێبمان پێداون، لە پێش ویدا، ئەوان پێی بڕوادارن، واتە: لە پێش قورئاندا، یاخود لە پێش موحەممەددا ﷺ كە بە پلەی یەكەم ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، ئەوانەی كە كتێبمان پێداون، جوولەكە و نەصرانییەكان دەگرێتەوە، بەڵام جگە لەوانیش دەگرێتەوە، هەموو ئەوانەی كە خۆیان بە خاوەنی كتێبی خوایی و ئاسمانیی دەزانن، ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِهِۦ ﴾، ئەوانەی كە پێش وی، پێش قورئان، یان پێش موحەممەد ﷺ، كتێبمان پێداون.

﴿ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەوان بەڕاستیی بڕوای پێ دێنن، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا: ئەوانە كۆمەڵێكی تایبەت بوون، ئەگەرنا هەرچی كە خاوەن كتێبە پێشووەكانن، بڕوایان بە قورئان و موحەممەد ﷺ نەهێناوە، تاكو هەموویان بگرێتەوە، یانی: كۆمەڵێكی دانستە و تایبەت، ئا ئەوانە بەڕاستیی بڕوای پێ دێنن، بڕوا بە قورئان، یاخود بە موحەممەد دێنن ﷺ، بەڵام زیاتر مەبەست پێی قورئانە، چونكە دوایی دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ ﴾، کاتێک ئەو کتێبەیان، ئەو فەرمایشتەیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە، گوتیان: بڕوامان پێی هێنا.

﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ ﴾، گوتیان: بڕوامان پێی هێنا، واتە: بڕوامان پێی هێناوە، پێش ئەوەی دابەزێ، یاخود لەبەر ئەوەی کە لە کتێبەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا، هەواڵی پێدراوە، مژدە دراوە بە هەموو خاوەن ئۆممەتەکان کە پێغەمبەری کۆتایی دێ و، خوا دوا کتێبی خۆی و دوا پەیامی خۆی پێدا دەنێرێ، پێش ئەوەی دابەزێ، بڕوامان پێهێناوە، یاخود دوای ئەوەی کە دابەزی، بڕوامان پێهێناوە.

٥)- ﴿ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە، هەقە لە پەروەردگارمانەوە، یاخود: لەبەر ئەوەی ئەو قورئانە هەقە و چەسپاوە لە پەروەردگارمانەوە، چونکە دەشگونجێ: ﴿ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ ﴾، وێڕای ژێری هەمزە ﴿ إِنَّهُ ﴾، بەسەر (أَنَّهُ)ش بخوێندرێتەوە: (آمَنَّا بِهِ أَنَّهُ الحَقُّ مِن رَّبِّنَا) بڕوامان پێ هێنا، لەبەر ئەوەی هەقە لە پەروەردگارمانەوە.

٦)- ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴾، ئێمە پێش ویش لە ملکەچان بووین، واتە: پێش ئەوەی قورئانیش دابەزێ و، پێش ئەوەی موحەممەدیش ﷺ ڕەوانە بکرێ، ئێمە هەر ملکەچ بووین، لێرەدا (مُسْلِمِينَ) بە مانا عورفیی و باوەکەی نیە، بەڵکو بە مانا ڕاستەقینە و زمانەوانییەکەیەتی، چونکە پێش ئەوەی کە قورئان دابەزێ و موحەممەد ﷺ بێ، مسوڵمانەتیی بە مانا باو و عورفییەکەی کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی، نەبووە، بەڵام لێرەدا بە مانا زمانەوانیی و ڕاستەقینەکەیەتی: ئێمە ملکەچ بووین بۆ خوا، پێش ئەوەی قورئانیش دابەزێ، چونکە پابەند بووین بە کتێبە پێشووەکانەوەو، شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی پێشوو بووین.

٧)- ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، ئا ئەوانە دوو کەڕەتان پاداشتیان دەدرێتەوە، بەهۆی ئەوەوە کە خۆیان ڕاگرتوە.

﴿ مَّرَّتَيْنِ ﴾، دەشگونجێ مەبەست لە دوو کەڕەتان، ئەوە بێ: دوو قات پاداشتیان دەدرێتەوە، تەعبیر لە دوو قاتکرانەوە، بە: (مَّرَّتَيْنِ) دوو کەڕەتان کراوە،

لـە جیاتـی بفەرمـوێ: (ضِعْفَیْنِ) فەرموویەتـی: (مَّرَّتَيْنِ)، ئەگەرنـا مەبەسـت پێـی دوو قاتـە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی دوو کـەڕەت بـێ:

أ- جارێکیان لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەری پێشوو، پاداشتیان دەدرێتەوە.

ب- جارێکیشیان لەسەر ملکەچ بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ و کتێبی کۆتایی خوا ﷻ، کە موحەممەد ﷺ و قورئانن.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرمایشتێکی هەیە، دەفەرموێ:

**{ثَلَاثَـةٌ يُؤْتَـوْنَ أَجْرَهُـمْ مَرَّتَـيْنِ: ١- رَجُـلٌ مِـنْ أَهْـلِ الْكِتَـابِ آمَـنَ بِنَبِيِّـهِ، وَأَدْرَكَ النَّبِـيَّ ﷺ فَآمَـنَ بِـهِ وَاتَّبَعَـهُ وَصَدَّقَـهُ، فَلَـهُ أَجْـرَانِ، ٢- وَعَبْـدٌ مَمْلُـوكٌ أَدَّى حَـقَّ اللـهِ تَعَـالَى وَحَـقَّ سَيِّدِهِ، فَلَـهُ أَجْـرَانِ، ٣- وَرَجُـلٌ كَانَـتْ لَـهُ أَمَـةٌ فَغَذَاهَـا فَأَحْسَـنَ غِذَاءَهَـا، ثُـمَّ أَدَّبَهَـا فَأَحْسَـنَ أَدَبَهَـا، ثُـمَّ أَعْتَقَهَـا وَتَزَوَّجَهَـا، فَلَـهُ أَجْـرَانِ}. (أخرجـه أحمـد: ١٩٦٥١، والبخـاري: ٢٨٤٩، ومسـلم: ١٥٤، والترمـذي: ١١١٦، والنسـائي: ٣٣٤٤، وابـن ماجـه: ١٩٥٦).**

واتـە: سـێ کـەس دوو جـاران پاداشـتیان دەدرێتـەوە، یاخـود پاداشـتیان دوو قـات دەدرێتـەوە:

١- یەکێکیان پیاوێک لە خاوەن کتێبان کە بڕوای بە پێغەمبەرەکەی خۆی هێناوەو، دواتر گەیشتوە بە پێغەمبەر (ی کۆتایی)یش بڕوای پێهێناوەو شوێنی کەوتوەو بە ڕاستی داناوە، ئەوە دوو پاداشتی هەن.

٢- کۆیلەیەکی خاوەندار، مافی خوای بەرزو، مافی گەورەو خاوەنەکەیشی جێ بە جێ دەکات، ئەویش دوو پاداشتی هەن.

٣- پیاوێک کەنیزەکێکی هەبێ، خواردنی پێبدات، باش خۆراکی پێبدات، ئنجا پەروەردەی بکات، باش ئەدەبی جوانی فێر بکات، دوایی ئازادی بکات و هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات، ئەویش دوو پاداشتی هەن.

﴿ بِمَا صَبَرُوا ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە کـە خۆیـان ڕاگـرت، خۆیـان لەسـەر چـی ڕاگـرت و لەسـەر چـی خۆڕاگـرو پشـوو درێـژ بـوون؟ چەنـد واتایەکـی هـەن:

أ- خۆڕاگرو پشوو درێژ بوون، لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەری پێشوو و کتێبی پێشوو.

ب- خۆڕاگر بوون لەسەر ئەوەی واز لە شوێنکەوتنی بەرنامە و کتێبی پێشوویان بێنن، دوای ئەوەی دوا کتێبی خوا و، دوا پێغەمبەری خوا هات.

ج- هەروەها خۆڕاگر بوون لەسەر ئەوەی دەستبەرداری ئەو بەرژەوەندییە نا شەرعییانە بن، یاخود ئەو بەرژەوەندییانە بن، کە بەهۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری پێشووو کتێبی پێشووەوە بۆیان دەستەبەر دەبوون، دەستبەرداری ئەو بەرژەوەندییانە بوون.

د- خۆڕاگر بوون لە بەرانبەر توانج و پلاری خەڵکدا کە: ئەها واز لە ئایینی خۆیان دێنن! ئەها واز لە پێغەمبەری پێشوو دێنن! کە لە ڕاستییشدا وانیە، چونکە ئەوانەی کە بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دێنن و، بڕوا بە دوا کتێبی خوا ﷻ دێنن، هەم موحەممەد ﷺ، هەم قورئان، فەرمانیان پێ دەکەن: کە دەبێ بڕوادار بن، بە کتێبە پێشووەکان و، بە پێغەمبەرانی پێشووش، واتە: کەسێک کە بڕوا بە موحەممەد ﷺ و بڕوا بە قورئان دێنێ دەستبەرداری کتێبە پێشووەکە و پێغەمبەری پێشووی نابێ، بەڵکو دوا کتێبی خوا و کۆتا پێغەمبەری خوا ﷻ فەرمان دەکەن، بەوانەی پێشتر شوێنکەوتووی پێغەمبەران و، کتێبە پێشووەکانی خوا ﷻ بوون، کە هەر پێیان بڕوادار بن، بەڵام بە ئەصڵەکەیان، نەک بەوەی ئێستایان کە گۆڕدراوە و تێکدراوە، ئنجا ئەوانە کە خۆڕاگر بوون، پاداشتیان دوو قات دەدرێتەوە، یاخود دوو کەڕەتان.

٨)- ﴿ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە: بە چاکە، خراپە، پاڵ پێوەدەنێن، وەک لە سوورەتی (فصلت)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: چاکە و خراپە یەکسان نین، بەو سیفەتەی کە چاکترە، خەسڵەتێک کە خراپە، پاڵی پێوە بنێ، یەکسەر ئەو کەسەی لە نێوانی تۆ و ئەودا، دژایەتییەک هەیە، دەبێتە دۆستێکی

نیزیک و دڵسۆز، لە ئەنجامی ئەوەدا کە تۆ منەتبارو قەرزداری خۆتی دەکەی و، لە بەرانبەر خراپەکەیدا، چاکەت لەگەڵدا کردوە.

٩)- ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە: لەوەی پێمانداون دەبەخشن، (رَزَقْنَٰهُمْ) یانی: (أَعْطَيْنَاهُم مِن نِعَمِنَا)، یانی: لەو نیعمەتانەی کە پێمان داون، نیعمەتی عیلمە، نیعمەتی عەقڵە، نیعمەتی ماڵ و سامانە، نیعمەتی خزم و خوێش و قەڕەباڵغییە، لەو نیعمەتانە بەکاردێنن بۆ سوود گەیاندن بە خەڵک و ڕازیکردنی خوا ﷻ.

١٠)- ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ ﴾، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە: کاتێک کە گوێیان لە (لَغْو) دەبێ، گوێبیستی قسەی پووچ دەبن، وازی لێ دێنن و پشتی تێدەکەن، (اللَّغْو: هُوَ العَبَثُ الَّذِي لاَ فَائِدَةَ مِنهُ قَوْلاً كَانَ أَو فِعْلاً)، (لَغْو) بریتیە لە هەر شتێکی پووچ، چ قسە بێ، چ کردەوە، لە ئەصڵدا ئاوایە، بەڵام لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ ﴾، کاتێک گوێبیستی (لَغْو) بوون، کەواتە: لێرەدا یانی: قسەی پووچ، ئەگەرنا وشەی (لَغْو) هەم کرداری پووچ، هەم قسەی پووچ دەگرێتەوە.

﴿ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ ﴾، پشتی تێ دەکەن، ڕووی لێ وەدەچەرخێنن، وازی لێ دێنن.

١١)- ﴿ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾، پێیان دەڵێن، [بە بەرانبەرەکانیان دەڵێن، بەوانەی لەگەڵیاندا نەیارو ناکۆکن، ئنجا چ لە خاوەن ئایینی خۆیان، چ لە ئەوانی دیکە، پێیان دەڵێن:] کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کردەوەی خۆشتان بۆ خۆتان.

واتە: بۆ هەر کامێکمان ئەو کردەوانەی کە شایستەینی، تایبەتن پێیەوە، کە ئەمە زۆر شت لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێ:

أ- واتە: ئێوە کە توانج و پلارمان تێدەگرتن و قسەمان پێدەڵێن و تانەمان لێدەدەن، دیارە ئەو جۆرە ڕەفتارە شایستەی ئێوەیەو لێتان دەوەشێتەوە، ئێمەش کە سەبر دەگرین و وەڵامتان نادەینەوەو، پشتتان تێدەکەین، ئا ئەوەش شایستەی ئێمەیە.

ب- واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ئەو خراپانەی ئێوە دەیانکەن، شایستەی ئێوەن و، کردەوە چاکەکانی خۆشمان، شایستەی ئێمەن.

ج- واتایەکی دیکەی: ئێوە کردەوەکانی خۆتان، چاک بن، یان خراپ بن، تایبەتن بە خۆتانەوە، لە دنیادا و لە دوارِۆژیشدا، کە لە دنیادا کردەوەی چاک مایەی سەربەرزییە و، کردەوەی خراپ مایەی سەرشۆڕییە و، لە دوارِۆژیشدا کردەوەی چاک مایەی پاداشتە و، کردەوەی خراپ مایەی سزایە و، ئێمەش کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، لە چاک و خراپ.

١٢)- ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ﴾، سەلامتان لێ بێ، یانی: (سَلَامٌ مُتَارَكَةٍ وَمُوَادَعَةٍ)، سەلامی خواحافیزیی و، لێ دوورکەوتنەوەیە، ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ﴾، واتە: ئێمە لەگەڵ ئێوە پێوە ناچین و، لە وەڵامی قسە خراپەکانتاندا، ئێمە وەک ئێوە ناڵێین، بەڵکو دەڵێین: سەلام.

١٣)- ﴿لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾، واتە: ئێمە نەفامان ناخوازین، واتە: ناخوازین کە لەگەڵ نەفاماندا تێکەڵ بین و، لەگەڵیاندا تووشی شەڕە قسە و شەڕە دەندووکە بین، لەگەڵیان دا بچینە تەرازوو و هاوکوفیی ئەوان بین، ئێمە خۆمان لەوە ناوەشێنینەوە.

## کورتە باسێک: ئەم ئایەتانە بەسەر کێدا دەچەسپن؟!

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

بێگومان مەبەست بەم ئایەتانە تێکڕای خاوەن کتێبان نیە، بەڵکو کەسانێکی دیاریکراوو تایبەتن، بۆ وێنە: وەرەقەی کوڕی نەوفەل، کوڕە پووری خەدیجە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ وەحیی بۆ دابەزێنرا، بردی بۆ لای و ڕاوێژی پێکرد، هەروەها سەلمانی فارسیی و، صوهەیبی ڕۆمیی و، ڕیفاعە کوڕی ڕیفاعە قوڕەزیی، لە مەککە مسوڵمان بوون پێش کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە، سەلمانیش پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچ بکات لە مەککەوە بۆ مەدینە، بە دەنگ و باس و خواسی ئەوەوە هاتوەو، دوایی بڕوای پێهێناوە، کە بەڵگە و نیشانەکانی بۆ دەرکەوتوون.

هەندێکیش گوتوویانە: ئەوانە وەفدێکی نەصرانییەکانی حەبەشە بوون، دوازدە (١٢) پیاو بوون، نەجاشیی ناردوونی بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو، بە نوێنەرایەتیی و، خۆی مسوڵمان بوون، هەر چۆن بێ ئەوانە دیارە کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو و تایبەت بوون، ئەگەرنا مەبەست پێی هەموو خاوەن کتێبەکان، نیە[1].

---

(١) بڕوانە: الإستیعاب في بیان الأسباب، ج٣، ص ٣٤-٣٥، کە سێ گێڕراوە (روایة)ی لەو بارەوە هێناون، کە ئەمەیان لە ڕووی (سند)ەوە لە هەموویان ڕاستترە: عن مجاهد: ( وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ ...)، قال: أناسٌ من أهل الكتاب أسلموا فكان أناس من اليهود، إذا مَرُّوا عليهم سَبُّوهم، فأنزل الله هذه الآية فيهم.

أخرجه ابن حاتم في تفسيره (٢/٢٩٩٣)، قلنا: وهذا مرسل صحيح الإسناد، وذكره السيوطي في

بـە نسـبەت ڕۆژگاری پێغەمبـەرەوە ﷺ، کەسـانێکی دیارییکـراو و تایبـەت بـوون و، لە دوای ڕۆژگاری پێغەمبەریشـەوە ﷺ، هـەر کەسـانێکی تایبەتـن و دیارییکـراون، لـە خاوەن کتێبـەکان، چ جوولەکـە، چ نەصرانیـی، کـە عەقڵ و ئینصـاف زاڵ دەکـەن، بەسـەر هـەواو ئـارەزوو، بەرژەوەندییـەکان و، دەمارگیرییـان بـۆ بەرنامـەی خۆیانـداو، مسـوڵمان دەبـن، هەڵبەتـە وەک جـاری دیکـەش گوتوومانـە: ئـەو کەسـەی ئیمان بـە ئایینـی موحەممـەد ﷺ دێنـێ، مووسـا و عیسـا و کتێبەکانـی ئەوانیـش لـە دەسـت نـادات، بەڵکـو باشـتر ئیـمان بـە مووسـا دێنـێ، وەک شایسـتەی مووسـایە و، ئیـمان بـە تـەورات دێنـێ، وەک شایسـتەیە بـۆ تـەورات و، ئیـمان بـە عیسـا و ئینجیـل دێنـێ، وەک شایسـتەیە بۆ عیسـا و بـۆ ئینجیـل، نـەک وەک ئـەوەی کـە واقیعـی ئێسـتای مووسـا و عیسـا (سـەلامی خوایـان لێبـێ)، هەروەهـا پێغەمبەرانـی پێشـوو، چ ئەوانـەی کـە ناویـان لـە قورئانـدا هاتـوە و، چ ئەوانـەی کـە ناویـان نەهاتوە و، کتێبە پێشـووەکان، نـەک وەک واقیعی ئێسـتایان، کە زۆر تێکـدراون و شـێوێندراون و گەڵێنـدراون، کەسـێک کـە ئیـمان بـە موحەممـەد ﷺ و بـە قورئـان دێنـێ، ئیمانەکـەی بـە مووسـا و بـە عیسـاش ڕاسـت دەکاتـەوەو، پاکـی دەکاتەوە لـەو خڵتـەو خـاڵ و ژەنـگ و ژارەی کـە خاوەن کتێبـەکان تێیـان خسـتوە، کەواتـە: ئیـمان هێنـان بـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری کۆتایـی، وەک لـە زیندانیـی ئەمریکاییەکانـدا پێمدەگوتـن: ئـەو کەسـەی کـە ئیـمان بـە موحەممـەد ﷺ دێنـێ و، دێتـە نێو ئیسـلامەوە، جووایەتیـی و نەصرانییەتیـش لەدەسـت نـادات و، مووسـاو عیسـاو تـەورات و ئینجیلیش لـە دەسـت نـادات، هەروەهـا زەبـووری داوودو صوحوفـی ئیبراهیمیـش لەدەسـت نادات، بەڵکـو بـە پێچەوانـەوە: بەهـۆی قورئانـەوە، ئیـمان هێنان بـەو کتێبە پێشـووانەو، بـەو پێغەمبـەرە پێشـووانە، زیاتـر سـاغ دەکاتـەوەو، پاکـی دەکاتـەوەو، چاکـی دەکات، بـە شـێوەیەک کـە شایسـتەی ئـەو پێغەمبەرانـە بـێ و، شایسـتەی ئـەو کتێبـە پێشـووانە بـێ، کـە خـوا ﷻ هـەر کامێکیانـی بـۆ ڕۆژگارێکـی تایبـەت و، بـۆ کۆمەڵگایەکـی تایبـەت و، بـۆ چارەسـەری کۆمەڵـە کێشـە و گرفتێکـی تایبـەت نـاردوون، نـەک وەک قورئـان کـە

---

(الدار المنثور)، (٤٢٧/٦)، وزاد نسبته لعبد بن حميد.

بۆ هەموو مرۆڤایەتیی و، بۆ چارەسەری هەموو کێشەکانی بەشەر بنێری، هەر بۆیەش خوا ﷻ هیچ کامێکیانی نە پاراستوە، لە دەستکارییکران و تێکدران، بەڵام کتێبی کۆتایی خۆی کە قورئانە بۆ خۆی پاراستنی وەئەستۆ گرتوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾ الحجر، واتە: ئێمە خۆمان دابەزێنەری کتێب (ذکر)ین و، خۆشمان پارێزەرینی، شتێکیش خوا ﷻ بیپارێزێ، دەپارێزرێ، ئەم قورئانەش پارێزراوە، وەک زۆر جاری دیکە گوتوومانە: نە پیتێکی و، نە وشەیەکی، لێ کەم و زیاد کراوە، چ جای سوورەتێک و چ جای ئایەتێک، بە پێچەوانەی کتێبەکانی دیکەوە، کە زۆر گۆڕدراون و دەستکارییکراون و شێوێندراون، لەبەر ئەوەی حیکمەتی خوا ﷻ نەیویستوە خۆی ڕاستەوخۆ بیانپارێزێ، پاراستنی عایدی مرۆڤەکان کردوە، وەک لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوار، ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدایە، ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆ خوا ﷻ ملکەچ بوون، حوکمیان پێدەکرد، هەروەها ڕەببانییەکان و ئەحبار، (ئەو زانایانە خاوەنی حوکمڕانیی بوون و، ئەو زانایانەش کە خاوەن دەسەڵات نەبوون، ئەوانەش حوکمییان پێ دەکرد)، ﴿لِلَّذِينَ هَادُوا۟﴾، بۆ جوولەکەکان، ﴿بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾، واتە: (بِمَا وُكِّلَ إِلَيهِم حِفظُ كِتَابِ الله) بە هۆی ئەوەوە کە پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێردرا بوو، کەواتە: پاراستنی تەورات و، کتێبەکانی دیکە، بە مرۆڤەکان و بە زانایان سپێردراوە، ئنجا مرۆڤیش زانا بێت، یاخود هەر کەسێک بێت، توانایەکەی سنووردارەو، ئەو شتەی پێی دەپارێزرێ لە قەدەر خۆی پێی دەپارێزرێ، خواش ﷻ توانایەکەی بێ سنوورەو، ئەو شتەی کە دەیپارێزێ لە قەدەر خۆی دەیپارێزێ، وەک پێویست.

## دە (١٠) سیفەتی ئەو خاوەن کتێبانەی کە خوا ﷻ باسیان دەکات

ئـەو دە (١٠) سـیفەتەی کـە ئـەو خـاوەن کتێبانـە، کـە بـڕوا دێنـن بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺو، پاداشـتیان دوو قـات دەدرێتـەوە، ئەمانـەن:

١)- ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ ﴾، گوتیان: بڕوامان پێی هێنا.

٢)- ﴿ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە هەقە لە پەروەردگارمانەوە، ئێمە پێش دابەزینی ئەم قورئانەش، یان: پێش موحەممەدیش ﷺ بۆ خوا ﷻ ملکەچ بووین، واتە: بۆ خوا ملکەچ بووین کە هەر کاتێک کۆتا کتێبی خوا هات و کۆتا پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بڕوایان پێ دێنین.

٣)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ ﴾، ئەوانە دوو کەڕەتان، یاخود دوو قات، پاداشتیان دەدرێتەوە.

٤)- ﴿ بِمَا صَبَرُواْ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە خۆڕاگر بوون، لەسەر زۆر شت خۆڕاگر بوون، وەک پێشتر چەمکەکەیمان باسکرد.

٥)- ﴿ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، بە چاکە خراپە پاڵ پێوەدەنێن، لە بەرانبەر خراپەدا، چاکە دەکەن.

٦)- ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەی پێمانداون دەبەخشن، لەوەی کە پێمانداون مەرج نیە هەر شتی ماددیی بێ، بەڵکو شتی مەعنەوییش دەگرێتەوە: عەقڵێک کە خوا پێیداون، خەڵکی لێ بەهرەمەند دەکەن، زانیارییەک کە خوا پێیداون، خەڵکی لێ بەهرەمەند دەکەن، لایەنی ڕووحیی و، سیفەتە بەرزەکان کە خوا پێی داون، خەڵکیان لێ بەهرەمەند دەکەن ...هتد.

٧)- ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ ﴾، کاتێک قسەی پووچ دەبیستن، پشتی تێدەکەن، ڕووی لێ وەردەچەرخێنن.

٨)- ﴿ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ ﴾، هەروەها گوتیان: کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و، کردەوەی خۆشتان بۆ خۆتان، واتە: پێیان دەڵێن: ئێوە ئەو کردەوانە دەکەن، کە شایستەتانن و، ئێمەش کردەوەی شایستەی خۆمان دەکەین.

٩)- ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾، کەسانێک کە قسەی ناشایستیان لەگەڵ دەکەن، یاخود ڕەفتاری ناشایستیان لە بەرانبەردا دەنوێنن، پێیان دەڵێن: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئاشتییتان لەسەر بێ، لە لایەن ئێمەوە تووشی زیان نابن، وەک ئێوە دەتانەوێ ئێمە تووشی زیان بکەن، ئەوە واتایەکی، یاخود ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾، (سَلاَمُ مُتَارَكَةٍ وَمُوَادَعَةٍ)، خوا حافیزتان بێ، ئێمە لەگەڵتان نایەینە نێو تەرازووەوەو، خۆمان بە هاوکوفی ئێوە نازانین.

١٠)- ﴿ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، ئێمە خوازیاری نەفامان نین، کە لەگەڵیان تێکەڵ بین و، شەڕە دەندووکەیان لەگەڵدا بکەین و لەگەڵیان بچینە نێو قسەو باسەوە، واتە: خوازیاری ئەوە نین، لەگەڵ کەسانێکدا مامەڵە بکەین، کە لە ئاستێکی نزمدان، لە جیاتی ئەوەی لە ئاستی بەرزی ئاکاریی و عیلمیی دا مامەڵە بکەن، لە ئاستی نزمی نەفامییدا مامەڵە دەکەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت (٢٠) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (٥٦ - ٧٥)، کـە تـەوەری سـەرەکییان باسـی قیامەتـە، باسـی زینـدوو بوونـەوەو هەڵسـانەوەیە، بـەڵام وێـڕای ئـەوە، چەنـد ڕاسـتییەکی گـەورە و گرنگیـش بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و، شـوێنکەوتووانی خراونـە ڕوو.

هەرەوەهـا ئاماژەیـەک بـە مێـژووی گەلانـی ملهـوڕو لـە خۆبایـی کـراوە، کـە ئـەو نـاز و نیعمەتـەی خـوا پێـی دابـوون، تێیـدا بوغـڕاو لەخۆبایـی بـوون، بـوو بـە هـۆی لـە کەوڵـی خـۆ دەرچوونیـان، کـە کەلاوەکانیـان مـاون و، دواتـر خـوا ﷻ وێـڕای چەنـد دیمەنێکـی ڕۆژی دوایـی، باسـی نیعمەتـی شـەوگارو ڕۆژگاریـش دەکات، کـە لە یەکەمیانـدا مرۆڤـەکان پشـوو دەدەن و دەخـەون و، لـە دووەمیشـیاندا لـە بەخششـی خـوا داوا دەکـەن و، کاسـبیی دەکـەن و جموجـۆڵ دەکـەن.

لـە کۆتاییشـدا خـوا ﷻ باسـی هێنانـی شـایەدێک لەسـەر هـەر کۆمەڵێـک دەکات لـە قیامەتـدا، کـە شـایەدییان لەسـەر دەدات و، لەسـەریان دەبێتـە بەڵگـە.

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ

فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی تۆ ئەو کەسەی خۆشت دەوێ (هەرچەندە سوور بی) ڕاستە ڕێی ناکەی، (نایخەیە سەر ڕاستە شەقامی خوا)، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێ، ڕاستە ڕێی دەکات، ئەویش بە ڕێی ڕاستگرتووان (ئەوانەی شایستەی ڕێی ڕاست گرتنن) زاناترە ﴿٥٦﴾ هەروەها (بێبڕوایەکان) گوتیان: ئەگەر لەگەڵ تۆدا شوێن ڕێنمایی (خوا) بکەوین، لەسەر زەمینی خۆمان دەڕفێنرێین! ئایا حەرەمێکی پڕ هێمنیی و ئاسایشمان بۆ نەڕەخساندوون، میوە و بەرهەمی هەموو شتێکی بۆ دەهێنرێ و، لێی خڕدەکرێتەوە، کە بژیوە لەلایەن ئێمەوە، بەڵام زۆربەیان نازانن؟ ﴿٥٧﴾ گەلێک ئاوەدانییشمان فەوتاندوون، ژیان و گوزەرانیان (کە پڕ بوو لە ناز و نیعمەت)، بوغرا و یاخیی کردن، ئەوانەش خانووەکانیانن، دوای وان کەمێک نەبێ، نەکرانە شوێنی نیشتەجێ بوون و، تەنیا ئێمە بووینە میراتگریان ﴿٥٨﴾ ناشگونجێ پەروەردگارت فەوتێنەری (خەڵکی) ئاوەدانییەکان بێ، (بەهۆی کوفرو خراپەیانەوە)، هەتا لە ئاوەدانییە دایکانە (بنەڕەتییە)کەیاندا پێغەمبەرێک نەنێرێ، کە ئایەتەکانمانیان بەسەردا بخوێنێتەوەو، ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نابین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکاربێ ﴿٥٩﴾ هەر شتێکیشتان پێدرا بێ (ئەی مرۆڤەکان! لە ناز و نیعمەتی دنیا) ئەوە بەهرە وەرگرتنێکی (کەمی) ژیانی دنیا و جوانییەکەیەتی و، ئەوەی لەلای خوایە، چاکترو بەردەوامتریشە، ئایا نافامن؟ ﴿٦٠﴾ ئایا کەسێک کە گفت و بەڵێنێکی باشمان (لە ڕۆژی دوایی دا)، پێداوە و مسۆگەر پێشی دەگات، وەک کەسێکە کە بەهرەمەندی دەکەین، لە ڕابواردنی کەمی ژیانی دنیا، دواییش ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئامادەکراوانە (بۆ نێو دۆزەخ)؟ ﴿٦١﴾ ئەو ڕۆژەش کە (خوا) بانگیان دەکات دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەم کە پێتان وابوو (هاوبەشمن)؟ ﴿٦٢﴾ ئەوانەی قسە و بڕیار(ی سزادران)یان بەسەردا

چەسپیوە، گوتیان: پەروەردگارمان! ئا ئەوانەی کە سەرگەردان و بێمرادمان کردن، وەک چۆن خۆمان سەرگەردان و بێمراد بووین، ئەوانیشمان (بە مەرەدی خۆمان بردو) سەرگەردان و بێ ئاکاممان کردن، ئێستاش حاشایان لێ دەکەین و، لێیان دوور دەکەوینەوە بەرەو لای تۆ، ئەوان (ڕاست ناکەن) ئێمەیان نەدەپەرست ﴿٦٣﴾ پێشیان گوترا: هاوبەشەکانتان بانگ بکەن، یەکسەر بانگیان کردن، بەڵام وەڵامیان نەدانەوە، ئازارو سزا(ی دۆزەخ)یان دی، (خۆزگەیان خواست) کە ڕێی ڕاستیان گرتبایە (و ئێستا سەرفراز ببوونایە) ﴿٦٤﴾ هەروەها ئەو ڕۆژەی (خوا) بانگیان دەکات، دەفەرموێ: چ وەڵامێکی نێردراوانتان دایەوە؟ (ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر مەزنە) ﴿٦٥﴾ کەچی هەواڵەکانیان لێ پەنهان و بزر بوون ( و نەک هەر توانای وەڵامدانەوەیان نیە)، بگرە لە یەکدیش ناپرسن (بۆ دۆزینەوەی وەڵام، چونکە دەزانن نیە) ﴿٦٦﴾ ئنجا کەسێک بگەڕێتەوەو بڕوا بێنێ و کردەوەی باش بکات، ڕەنگە لە سەرفرازان بێ ﴿٦٧﴾ پەروەردگاریشت هەرچی بوێ، دروستی دەکات (و هەر کەسی بوێ بۆ خێرو چاکە)و هەڵیدەبژێرێ، ئەوان (مرۆڤەکان) توانای هەڵبژاردنیان نیە، (لە بەرانبەر خوادا)، پاکیی بۆ خوا و، بەرزیی بۆوی لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٦٨﴾ هەروەها پەروەردگارت ئەوەی (دڵ و) سینەکانیان پەنهانی دەکات و، ئەوەی ئاشکرای دەکەن، دەیزانێ ﴿٦٩﴾ هەروەها ئەو خوایە، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، لە (ژیانی) یەکەم و (ژیانی) دواڕۆژدا، ستایش هەر شایستەی ویە و، حوکم و بڕیار هەر بەدەست ویە و، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٧٠﴾ بڵێ: پێم بڵێن: ئایا ئەگەر خوا شەوگارتان لەسەر بەردەوام بکات، هەتا ڕۆژی قیامەت، چ پەرستراوێک (هەیە) جگە لە خوا ڕووناکیی (ڕۆژگار)تان بۆ بێنێ، ئایا نابیستن؟ ﴿٧١﴾ بڵێ: هەواڵم پێ بدەن، ئایا ئەگەر خوا ڕۆژگارتان لەسەر بەردەوام بکات، هەتا ڕۆژی قیامەت، چ پەرستراوێک (هەیە) جگە لە خوا، شەوگارتان بۆ بێنێ تێیدا بسرەون، ئایا نابینن؟ ﴿٧٢﴾ هەروەها (خوا) بە بەزەیی خۆی، شەو و ڕۆژی بۆ وا لێکردوون کە تێیاندا بسرەون (و بخەون) و

لـە بەخششـی وی بخـوازن (كاروكاسـبیی بكـەن) و، بەڵكـو سوپاسـگوزاریی بكـەن ﴿٧٣﴾ ئـەو ڕۆژەش كـە خـوا بانگیـان دەكات، دەفەرمـوێ: كـوان ئـەو هاوبەشـانەی كـە پێتـان وابـوو (هاوبەشـمن)؟ ﴿٧٤﴾ لـە هـەر كۆمەڵێكیـش شـایەدێكمان دەرهێنـا و گوتمـان: بەڵگەتـان بێنـن (لەسـەر ڕاستیی پەرستراوەكانتان)، بـەڵام زانییـان كـە هـەق تەنیـا هـی خوایـە، ئـەوەی (لـە دنیـادا) بـە درۆ هەڵیـان دەبەسـت (وەک هاوبەشـی خـوا) لێیـان ون بـوو ﴿٧٥﴾].

## شیكرنەوەی هەندێک لە وشەكان

(نُتَخَطَّفْ ): واتـە: دەڕفێنرێیـن، (الخَطْـفُ وَالإِخْتِطَـافُ: الإِخْتِـلاسُ بِسُرْعَـةٍ، خَطِـفَ يَخْطَـفُ وَخَطَـفَ يَخْطِـفُ)، (خَطْـفُ و إِخْتِطَـاف) بریتیـە لـە دزینـی بـە خێرایـی، دەگوتـرێ: (خَطِـفَ يَخْطَـفُ) و، دەشـگوترێ: (خَطَـفَ يَخْطِـفُ)، واتـە: كـردار (فعـل) ەكـەی، ژێر(كسرة)ی هەبـێ، یاخـود سـەر(فتحة)ی هەبـێ، یـەک مانـای هەیـە، واتـە: (نُقْتَـلُ وَنُسْـلَبُ) دەكوژرێـن و ڕووت دەكرێینـەوە.

(يُجْبَىٰ): دەگوتـرێ: (جَبَيْـتُ المَـاءَ فِي الحَوْضِ: جَمَعْتُـهُ، وَالحَوْضُ الجَامِـعُ: الجَابِيَةُ)، ئەگەر نـاو لـە حـەوزدا كـۆ بكرێتـەوە، دەگوتـرێ: (جَبَيْتُـهُ) و، (جَابِيَـة) بـە حەوزێكـی گـەورە دەگوتـرێ، كـە ناوێكـی زۆر كۆدەكاتـەوە، (وَالإِجْتِبَـاءُ: الجَمْـعُ عَـلَى طَرِيـقِ الإِصْطِفَـاءِ)، (إِجْتِبَاء)یـش بریتیـە لـە كۆكردنـەوەی شـتێک بـە شـێوەی هەڵبـژاردن و گوڵبژێركـردن.

(بَطِـرَتْ مَعِيشَـتَهَا ): (أَيْ: بَطِرَتْهـا مَعِيشَـتُهَا) ژیانەكەیـان بوغـرای كـردن و، لـە كەوڵـی خـۆی دەرچووانـدن و، یاخیـی كـردن، ژیانەكەیـان، (البَطَـرُ: دَهَـشٌ يَعْـتَرِي الإِنسَـانَ مِـنْ سُـوءِ النِّعْمَـةِ)، (بَطَـر) بـە حاڵەتێـک دەگوتـرێ، حاڵەتێكـی سەرسامیی و لـە خۆبایـی بـوون، كـە لـە ئەنجامـی ئـەوەدا مـرۆڤ ئـەو نیعمەتـەی، ئـەو چاكـەی بـۆی دێ، چاكـە ناتوانـێ ئیستیعابی بـكات و، تەحەمولـی بـكات، پێـی لـە خۆبایـی

دەبێ، هەروەها (بَطَرْ) بە مانای (طُغْیَان) یاخیی بوون بە هۆی نیعمەتەوە دێ، کە دەفەرموێ: ﴿ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَا ﴾، یانی: (فِي مَعِيشَتِهَا)، واتە: خەڵکی ئەو شارو وڵاتە لە ژیانیدا لە خوا ﷻ یاخیی بوو، لە کەوڵی خۆی دەرچوو، ئەمە وەک ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا ﴿١٥٥﴾ ﴾الأعراف، ( وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ )، واتە: (مِن قَومِهِ)، کەواتە: لێرەش ﴿ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَا ﴾، یانی: (بَطِرَت فِي مَعِيشَتِهَا)، کە مەبەست لە (بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَا ) (أَي: جَهِلَت شُكْرَ نِعْمَتِهَا) واتە: نەفام بوو بەرانبەر بەوەی سوپاسگوزاریی چاکەی خوا بکات.

(تَزۡعُمُونَ): (الزَّعمُ: حِكَايَةُ قَولٍ يَكُونُ مَظِنَّةً لِلكَذِبِ)، (زَعْم) بریتییە لە گێڕانەوەی قسەیەک کە مەزەنەی درۆ بێ.

(أَغۡوَيۡنَآ ): واتە: بێمرادمان کردن، بێئاکامان کردن، (غَوِيَ أَي: جَهِلَ، خَابَ، فَسَدَ عَيْشُهُ)، بەو سێ مانایە دێ: (غَوِيَ) هەم بە مانای (جَهِلَ) دێ، نەفام بوو، یاخود پەشێمان بوو، یاخود ژیانی تێکچوو.

( فَعَمِيَتۡ ): (عَمِيَ عَلَيهِ: اشْتَبَهَ حَتَّى صَارَ بالإِضَافَةِ إِلَيهِ كَالأَعْمَى)، ( فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ )، هەواڵەکان لە بەرانبەریاندا کوێر بوون، واتە: زەفەریان بە هەواڵەکان نەدەبردن، بەڵام لێرەدا وەک هەواڵەکان کوێربن و، ئەوان نەدۆزنەوە، چونکە هەواڵ بۆ مرۆڤ دێ.

(تُكِنُّ): واتە: پەنهانی دەکات، (الكِنُّ: مَا يُحْفَظُ فِيهِ الشَّيء، كَنَنْتُ الشَّيءَ: جَعَلْتُهُ فِي كِنٍّ)، (كِنّ) هەر شوێنێکە، هەر شتێکە شتی تێدا دەپارێزرێ، دەگوترێ: (كَنَنْتُ الشَّيءَ)، واتە: ئەو شتەم خستە شوێنێکەوە، کە شتی تێدا بپارێزرێ، وشەی (کون) لە کوردیی دا ڕەنگە لەوەوە هاتبێت، واتە: شوێنێک کە شتی لێ دەپارێزرێ.

(سَرۡمَدًا ): (السَّرمَدُ: الدَّائِمُ)، (سَرْمَد) بە مانای بەردەوام دێ، (وَالسَّرمَدُ: مَا لَيسَ لَهُ بِدَايَةٌ وَلا نِهَايَة، أَي: أَزَلِيٌّ وَأَبَدِي)، (سَرْمَد) شتێکە نە سەرەتای هەبێ، نە کۆتایی هەبێت، واتە: هەر بوو بێ و بێ کۆتایی بێ، کە دیارە بەس خوا ﷻ بەو شێوەیە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾، دوو گێـڕدراوە دێنیـن لـەو بارەوە:

**١)- [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمِّهِ عِنْدَ الْمَوْتِ: «قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، فَأَبَى، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾] (أخرجه مسلم: ١٤٣).**

واتــە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە کاتی مـردن (سـەرە مـەرگ)دا بـە مامـی (ئەبـوو تاڵیبـی) فەرمـوو: بڵـێ: (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللـهُ) بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، تاکـو لـە ڕۆژی قیامەتـدا شـایەدیت بـۆ بـدەم، (کـە ئەهلـی تەوحیـد بـووی)، بـەڵام ئامـادە نەبـوو بیڵـێ، ئیـدی بـەو بۆنـەوە خـوای بـەرز ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار.

**٢)- [عَنْ سَعِيدِ بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَقَالَ: أَيْ عَمِّ! قُلْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ، فَقَالَ: أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدَانِهِ بِتِلْكَ الْمَقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «وَاللهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ»، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾، وَأَنْزَلَ اللهُ فِي أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ] (أخرجه البخاري: ٧٤٧٢).**

واتـە: سـەعیدی کـوڕی موسـەیيەب لـە بـابی دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: کاتێـک مـردن گەیشـتە سـەر (ئەبـوو تاڵیـب)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـە لای، ئەبـوو جەهـل و عەبدوڵڵای کـوڕی ئومەییـەی کـوڕی موغیـرە، لـە لای بـوون، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئـەی مامـە! بڵـێ: (لا إلـهَ إلاَّ اللـه)، وشـەیەکە، لـە ڕۆژی قیامەتـدا دەیکەمـە بەڵگـە لـە خزمـەت خـوادا، ئەبـوو جەهـل و عەبدوڵڵای کـوڕی ئومەییـە هەردووکیـان پێیـان گـوت: ئایـا واز لـە ڕێبـازی عەبدولموتەلیـب دێنـی؟ ئیـدی بـەردەوام پێغەمبـەر ﷺ پێشـنیارەکەی خـۆی بـۆ مامـی دووبـارە دەکـردەوەو، ئەوانیـش (ئەبـوو جەهـل و عەبدوڵڵای کـوڕی ئومەییـە)، ئـەو قسـەیان دووبـارە دەکـردەوە، تاکـو کۆتـا قسـەی ئەبـوو تاڵیـب کـە ئەوانـی پێدوانـد، پێـش گیـان دەرچـوون، گوتـی: مـن لەسـەر ڕێبـازی عەبدولموتەلیـم و، ئامـادە نەبـوو بڵـێ: (لا إلـهَ إلاَّ اللـه)، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: هـەر داوای لێبوردنـت بـۆ دەکـەم، مـادام قەدەغـە نەکرێـم، خـوا ﷻ بـەو بۆنـەوە ئـەو ئایەتـەی سـووڕەتی (التوبـة)ی نـاردە خـوارەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ و ئەوانـەی بـڕوادارن بۆیـان نیـە، داوای لێبـوردن بـۆ هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان بکـەن، دوای ئـەوەی بۆیـان دەرکەوتـوە، هاوەڵـی گڵپـەی دۆزەخـن، لـە بـارەی ئەبـوو تاڵیبیشـەوە، خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری ﷺ فەرمـوو: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ ئـەوەی حـەز دەکـەی، نایخەیـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، بـەڵام خـوا ﷻ هـەر کەسـێکی بـوێ ڕاسـتە ڕێـی دەکات و، ئـەو زاناتـرە بەوانـەی کـە شایسـتەی ڕێـی ڕاسـت گرتنـن (و دڵییـان وەردەچەرخێنـێ بـۆ گرتنـی ڕێـی ڕاسـت).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ ڕوو لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەکات، هەروەهـا لە پشـت ئەویشـەوە لە هـەر کەسـێک کـە بـە شـوێن پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دا هەنـگاو دەنـێ و، پەیڕەویـی لـێ دەکات و، ڕوویـان تێـدەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ کەسـێک کـە خۆشـت دەوێ، نایخەیـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، واتـە: ناتوانـی بیخەیـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ڕاسـتە ڕێـی بکـەی، ﴿ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾، بـەڵام خـوا ﷻ هـەر کەسـێکی بیـەوێ، ڕاسـتە ڕێـی دەکات، لێـرەدا دەبـێ دڵنیابیـن کـە وشـەی هیدایـەت بـە مانـای ڕێنمایـی کـردن نیـە، چونکـە خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ فەرمـووە: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾الشـوری، بـە دڵنیایـی تـۆ خەڵـک ڕێنمایـی دەکـەی بـۆ ڕاسـتە ڕێ، بـەڵام لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾، بـە دڵنیایی ئـەو کەسـەی تـۆ خۆشـت دەوێ، ناتوانی هیدایەتـی بـدەی، واتـە: ناتوانـی ڕاسـتە ڕێـی بکـەی، نـەک نەتوانـێ ڕێـی پیشـان بـدات، ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾، خـواش زاناتـرە بـە هیدایەتـدراوان، بەوانـەی کـە شایسـتەی وەرگرتنـی هیدایـەت و، شایسـتەی ڕاسـتە ڕێ بوونـن.

﴿ وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا ﴾، (کافـرەکان) گوتیـان: ئەگـەر لەگـەڵ تـۆدا بـەدوای ڕێنمایـی خـوا بکەویـن، لەسـەر زەمینـی خۆمـان دەڕفێنرێیـن، دەبردرێیـن و دەکوژرێیـن، واتـە: دوژمنانمـان گێچەڵـمان پێدەکـەن، شـەڕمان پـێ دەفرۆشـن، لەسـەر ئـەوەی کـە شـوێن ئاییـن و بەرنامەکەی تـۆ کەوتوویـن، خـوا ﷻ لە وەڵامیانـدا، لـە بەرپەرچدانەوەیاندا دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَىٰ إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا ﴾، ئایـا ئێمـە حەڕەمێکـی پـڕ هێمنیـی و ئاسایشـمان بـۆ نەڕەخسـاندوون، کـە لـە بـەرو میـوەی هەمـوو شـتێکی بـۆ دەهێنرێتـەوە، واتـە: هەمـوو جـۆرە میـوە و بەرهەمێکـی ئەمـلا ولای بـۆ دەهێنـرێ، کـە وەک بژێوێکـی

تەرخانکراو و دابینکراو، لەلایەن ئێمەوە بۆ ئەوان وایە، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، واتە: لەبەر ئەوەی زانا نین، خاوەن عیلم نین، بۆیە قەدری ئەو نیعمەتە نازانن، یاخود قەدری نیعمەتی، هیدایەتێک کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ ناردوویەتی، نایزانن، دێن ئەو برو بیانووانە دێننەوە بۆ ئەوەی بڕوای پێ نەهێنن.

، ئنجا خوا ﷻ دەیانگێڕێتەوە بۆ مێژوو، کە ئێوەش وریا بن، وەک گەلە پێشووەکانتان لێ نەیەت و بە مەرەدی ئەوان نەچن: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾، (كَمْ) لێرەدا (كَمْ الخَبَرِيَّة) بۆ زۆرییە، واتە: زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندن، ﴿ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾، کە ژیان و گوزەرانە خۆشەکەیان بەترانی کردبوون، گومڕاو بوغڕای کرد بوون، یاخود لە ژیانەکەی خۆیدا بوغڕا و یاخیی بوو بوون لە خوا ﷻ، ﴿ فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، تا ئەوانە خانووبەرەکانیانن، جێگا و ڕێگاکانیانن، لەدوای وان کەمێک نەبێ، نەکرانە شوێنی نیشتەجێ بوون، مەگەر ڕێبوارێک، کەسێک بەوێدا تێپەڕ بووبێ، لە کاولگەیەکدا نیشتەجێ بووبێ، نەگەرنا کەس تێیاندا نیشتەجێ نەبوون، ﴿ وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴾، هەر ئێمەش میراتگر بووین، واتە: کەس نەچووە جێگا و ڕێگا و شوێنەکانیان و، کەسی لێ نەما بۆوە، وەک چۆن میراتێک دەگێڕرێتەوە بۆ لای خاوەنەکەی، ئەو جێگاو ڕێگایانەش، هاتنەوە لای ئێمە، وەک چۆن میراتێک کە دەچێ بۆ لای میراتگر، تەنیا خواش ﷻ خاوەن و میراتگری هەموو شتێکە.

ئنجا خوای پەروەردگار ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە موحەممەدی ﷺ ناردوە وەک پێغەمبەری کۆتایی بۆ ئەو خەڵکە، ئەوە یاسای خوا وایە، کە دەبێ لەو شوێنانەی چەقن و مەڵبەندی ئەو دەڤەرەن، پێغەمبەریان تێدا ڕەوان بکات، پێش ئەوەی سزایان بدات، ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا ﴾، پەروەردگاریشت فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نیە، تاکو لە دایکانەکەیاندا، لەوەیاندا کە شاری چەق و بنەڕەتە بۆ دەوروبەرەکەی، ڕەوانەکراوێکی تێدا نەنێرێ، ﴿ يَتْلُوا

عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا ﴾، ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، ﴿ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴾، پێشتریش ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نەبووین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکار بووبێ، لادەرو تاوانبار بووبێ، ئەگەرنا ئێمە عادەتمان وانیە، بەبێ ئاگادار کردنەوە بەبێ هۆشداریی پێدان و، بەبێ پەیام بۆ ناردن، سزای ئاوەدانییەکان بدەین و، بیانفەوتێنین.

ئنجا خوا ﷻ جارێکی دیکە ڕوو دەکاتەوە مرۆڤەکان بە گشتیی و، بە تایبەت بێبڕوایەکان و، نەیارەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، پەیامەکەی کە هێناویەتی، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَا ﴾، هەر شتێک کە پێتاندراوە، هەمووی دەچێتە چوارچێوەی ڕابواردن و گوزەرانی ژیانی دنیا و جوانییەکەیەوە، هەمووی ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە و، جوانیی و زریق و بریقێکی کەمی ژیانی دنیایە، ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئەوەی لەلای خوایە، باشتریشە و، درێژخایەن تریشە، زیاتریش دەمێنێتەوە، ئایا نافامن؟ وەک یەکێک لە زانایان گوتوویەتی: ئەگەر بەهەشت خەزەف (واتە: ماددەی دیزە و گۆزە) بووایە و، ژیانی دنیا گەوهەر بووایە، مادام بەهەشت هەمیشەییە و دەمێنێتەوەو، دنیا کاتییە و لە بەین دەچێ، هەر ئەو خەزەفە لەو گەوهەرە باشترە، لە حاڵێکدا کە بەهەشت لەگەڵ ژیانی دنیادا، بەراورد ناکرێ، لە جۆرو چۆنیەتیی دا و، لە ڕووی مانەوەشەوە، دیارە بەهەشت هەمیشەییە و، ژیانی دنیا ماوەیەکی کەمە و، قۆناغێکی ڕاگوزەرەرە، تەنیا بۆ تاقیکرانەوەی مرۆڤەکانە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن؟ عەقڵتان نیە؟ کە هەرگیز نەدەبوو بەهەشت و ڕۆژی دوایی، بگۆڕنەوە بە ژیانی کەمی دنیا.

﴿ أَفَمَن وَعَدۡنَٰهُ وَعۡدًا حَسَنٗا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعۡنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ئایا کەسێک کە بەڵێنێکی باشمان پێداوە و، بە دڵنیاییش پێی دەگات، بەڵێنە باشەکە بەهەشتە، ژیانی نەبڕاوەی ڕۆژی دواییە، ئایا کەسێک کە ئاوایە، وەک کەسێک وایە کە بەهرەمەندی دەکەین لە ڕابواردنی ژیانی دنیا؟ ﴿ ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ

مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴾، دوایی ئەو لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، لە ئامادەکراوان دەبێ، واتە: لە ئامادەکراوان دەبێ بۆ سزا و دۆزەخ، ئایا وەک یەکن و یەکسانن؟ بە تەئکید نەخێر، ئەو هەمزەیەی (أَفَمَن) پێی دەگوترێ: هەمزەی پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانە، بۆ وێنە: کە گوتم: ئایا ئەمە تۆمارکەر (مُسَجِّلَة) نیە؟ یان ئەمە سەعات نیە؟ چاوەڕێی وەڵام ناکەم، چونکە ئەوە پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، یانی: نکووڵی دەکەم لەوەی ئەمە تۆمارکەر نەبێ و، نکووڵی لەوە دەکەم ئەمە سەعات نەبێ، ﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴾، ئەو ڕۆژەش کە (خوا) بانگیان دەکات، دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەم کە پێتان وابوو، خەیاڵتان وابوو، داتانابوو (هاوبەشی منن)؟ ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ ﴾، ئەوانەی کە قسەیان لەسەر پەیوەست بووە، بڕیاری خوایان لەسەر هاتۆتە دی، کە دەبێ بچنە دۆزەخەوە، گوتیان: ﴿ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَا ﴾، پەروەردگارمان! ئا ئەوانەی سەرگەردان و بێمرادو، بێ ئاکامـمان کردوون، وەک چۆن خۆمان سەرگەردان و بێ ئاکام و بێمراد بووین، ﴿ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، ئێمە دووریی لەوان دەکەین بۆ لای تۆ، حاشا لەوان دەکەین، ئەوان دوور دەخەینەوەو بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە، ﴿ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴾، ئەوانە ئێمەیان نەدەپەرست، واتە: لە ڕاستییدا ئەوانە پەرستەری ئێمە نەبوون، بەڵکو هەوا و ئارەزووەکانی خۆیان دەپەرست، بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەپەرست، ئێمەیان، کرد بوو بە بیانوو.

﴿ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ﴾، پێیان گوترا: هاوبەشەکانتان بانگ بکەن، واتە: ئەوانەی کە پێتان وابوو هاوبەشی خوان، هەندێک لە سیفەتەکانی خواتان بۆ بڕیار دابوون، یان لە پەرستراندا بەشدارتان کردبوون، کە دەبێ تەنیا خوا ﷻ بپەرسترێ، یاخود هەندێک لە سیفەتەکانی خواتان بۆ وان بڕیار دابوون، وەک سەرخستن و، ژێر خستن و، شیفا هێنان و، نەخۆش کردن و، هەتا دوایی، ﴿ فَدَعَوۡهُمۡ ﴾، ئەوانیش بانگیان کردن، پەرستارەکان پەرستراوەکانیان بانگکرد، کە

بـە خەیاڵـی خۆیـان هاوبەشـی خـوا بـوون، ﴿ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ ﴾، کـە چـی هیـچ وەڵامیـان نەدانـەوەو بـە دەنگیانـەوە نەهاتـن، ﴿ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ﴾، هەمووشـیان نـازارو سـزای دۆزەخیـان بینـی، ﴿ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴾، خۆزگەیـان خواسـت کـە ڕاسـتیان گرتبایـە، کاتـی خـۆی لـە ژیانـی دنیـادا.

یاخـود: سـزای دۆزەخیـان دەبینـی بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ، ئەگـەر ڕێـی ڕاسـتیان گرتبایـە، ئەگـەر سـەر ڕاسـت و هۆشـیار بوونایـە، دەیانزانـی کـە ئـەو ڕێبـازی شـیرک و کوفـرو گوناهــ و تاوانـە، هـەر بـەو سـزایانەیان دەگەیەنـێ.

﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، ئـەو ڕۆژەش کـە بانگیـان دەکات دەفەرمـوێ: چیتـان وەڵامـی ڕەوانەکـراوان دایـەوە؟ بێگومـان خـوا ﷻ بـۆ خـۆی لـەوان باشـتر دەزانـێ، بـەڵام خـوا ﷻ دەیـەوێ خۆیـان دانـی پێدابێنـن، ﴿ فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ ﴾، لـەو ڕۆژەدا هەواڵـەکان لـە بەرانبەریانـدا کوێـر بـوون، لەبـەر ئـەوەی هـەواڵ بـۆ مـرۆڤ دێ، ئنجـا ئەگـەر هەواڵێـک کوێـر بـێ، نازانـێ بـۆ کـوێ بچـێ، لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە کـە هیچیـان نەزانـی، هـەواڵ و دەنـگ و بـاس و خواسـەکانیان نەزانیـن، بۆیـە نەیانتوانـی وەڵام بدەنـەوە، ﴿ فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾، نـەک هـەر وەڵامـی پرسـیارەکە نازانـن، بەڵکـو لـە یەکدیـش ناپرسـن، چونکـە دڵنیـان کـە لـە یەکـدی پرسـینیان، بـێ سـوودە، یاخـود: لەبەر ئـەوەی دەزانـن: هـەر کامێکیان بەرانبەرەکەشـی لـە خـۆی نەزانـترو بـێ وەڵامـترو، بـێ قسـەترە، ﴿ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ ﴾، بـەڵام کەسـێک گەڕابێتـەوە بـۆ لای خـوا ﷻ و بـڕوای هێنـا بـێ و کـردەوەی بـاش بـکات، نیزیکـە لەسـەر فـرازان و بەختـەوەران و دەربازبـووان بـێ.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر خسـتنە ڕووی چەنـد سـیفەتێکی بـێ وێنـەی خـۆی و، چەنـد کردەوەیەکـی نـاوازەی خـۆی، کـە پێویسـتە لەبـەر ڕۆشـنایی نـاوو سـیفەت و کـردەوە بـێ وێنەکانیـدا، ئێمـە خـوا ﷻ بناسـین و مامەڵـەی شایسـتەو پێویسـتی لەگەڵـدا بکەیـن، سـەرەتا لـە بـارەی کۆمەڵێـک سـیفەتیەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَرَبُّكَ

يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُ ﴾، پەروەردگاریشت هەر شتێکی بیەوێ دروستی دەکات و، هەر شتێکی بیەوێ هەڵیدەبژێرێ، ﴿ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ ﴾، مرۆڤەکان لە بەرانبەر خوادا، توانای هەڵبژاردنیان نیە، بۆ وێنە: خوا ﷻ بڕیاری داوە کە مرۆڤ هەبێ و دروستی بکات، مرۆڤ مافی هەڵبژاردنی نیە، بڵێ: نەدەبوو دروست بکرێم، خوا بڕیاری مردنی بۆ داون، ناتوانن بڵێن: نابێ بمرین، خوا ﷻ بڕیاری بۆ داون کە بەشێکیان نێر بن و بەشێکیان مێ بن، ئەوان مافی سەرپشک بوونیان نیە، کە ڕەگەزی خۆیان بگۆڕن، خوا ﷻ بۆی بڕیارداون کە دابەش بن بەسەر نەتەوەکاندا، بەسەر زمان و ڕەنگەکاندا، هیچ کەس لە توانایدا نیە نەتەوەو ڕەچەڵەکی خۆی بگۆڕێ و ....هتد، ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی دەیکەن بە هاوبەشی خوا، خوا ﷻ زۆر لەوە پاکترو بەرزترە، کە ئەو شتانە بکرێنە هاوبەشی و، بهێنرێنە ئاستی خوا ﷻ، ﴿ وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴾، پەروەردگاریشت دەزانێ سینەکانیان چی پەنهان دەکات و، چی ئاشکرا دەکات، ئەوەی سینەکانیان پەنهانی دەکات و دەیشارێتەوەو، ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن و دەیڵێن بە قسە، یاخود بە کردەوە ئەنجامی دەدەن، پەروەردگارت هەمووی وەک یەک دەزانێ.

﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، هەر ئەو خوایە، جگە لە ئەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، لە یەکەمین و دوایەمیندا، ستایش بەس بۆ ویە، واتە: لە یەکەمدا کە ژیانی دنیایەو، دوایەمیندا، کە ڕۆژی دواییە، ستایش تەنیا بۆ ئەوە، ﴿ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ ﴾، حوکم و بڕیاردان و، حوکمڕانیی و باڵا دەستیی هەر هی ئەوە، ﴿ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، بەس بۆ لای ئەویش دەگێردرێنەوە.

ئنجا خوا ﷻ چەند کردەوەیەکی خۆی، کە بەس هی وین و تایبەتن بەوەوە، دەخاتە ڕوو: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلَّيۡلَ سَرۡمَدًا ﴾، بڵێ: ئایا دەبینن؟ یان: هەواڵم پێ بدەن، یان: ئایا دەزانن ئەگەر خوا ﷻ شەوگاری لەسەرتان

هەمیشـەیی و بـەردەوام کـرد بایـە، (سَرْمَـد: مَـا لاَ نِهَایَـةَ لَـهُ)، ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، تاکـو ڕۆژی هەڵسـانەوەو ڕۆژی دوایـی، تاکـو دنیـا بـە کۆتـا دێ، ﴿مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِضِيَآءٍ﴾، جگـە لـە خـوا چ پەرسـتراوێکی دیکـە هەیـە، کـە ڕۆشـناییتان بـۆ بێنێ؟ ڕۆشـنایی ڕۆژگار، ﴿أَفَلَا تَسۡمَعُونَ﴾، ئایا نابیسـتن؟ یانـی: خڕۆکـەی زەوی لـە جیاتـی ئـەوەی لـە بەرانبـەر خـۆردا، بـە دەوری خـۆی دا بخولێتـەوە، لـە بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعات دا جارێـک، خولێـک بـە دەوری خۆیـدا لـێ بـدا و، تاکـو نیـوەی ببێتـە شـەو، نیـوەی ببێتـە ڕۆژ، ئەگـەر نەخولابایـەوە، وەک هەنـدێ لـە خڕۆکـەکان، کـە هەمیشـە یـەک ڕوویـان لـە خـۆرە، واتـە: دیوێکیـان هەمیشـە ڕۆژەو دیوێکیـان هەمیشـە شـەوە، ئەگـەر خـوا ﷻ زەویشـی وا لێکـرد بایـە، چ پەرسـتراوێک هەبـوو بتوانـێ ڕۆژگارتـان بـۆ بێنـێ، ئەگـەر هـەر شـەو بووایـە، ئایـا نابیسـتن؟ واتـە: ئەگـەر هـەق ببیسـتنن، دەبـێ بزانـن خوایـەک ﷻ کـە بـەس ئـەو شـەوگارو ڕۆژگار بـەدوای یەکـدا دێنـێ، دەبـێ تەنیـا ئەویـش بپەرسـترێ.

﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، بڵـێ: ئایـا دەزانـن، دەبینـن، ئـەو بینینـە چ بینینـی چـاو بـێ، چ زانینـی عەقـڵ، ئەگـەر خوا ﷻ ڕۆژگاری لەسـەرتان بـەردەوام کـرد بایـە، تاکـو ڕۆژی هەڵسـانەوە، ﴿مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٍ تَسۡكُنُونَ فِيهِ﴾، چ پەرسـتراوێک جگـە لـە خـوا ﷻ دەیتوانـی شـەوگارتان بـۆ بێنـێ، کـە تێیـدا پشـوو بـدەن و بحەوێن، ﴿أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾، ئایـا نابینـن؟ هـی پێشـێ فەرمـووی: ﴿أَفَلَا تَسۡمَعُونَ﴾، چونکـە لـە کاتێکـدا کـە شـەوگار بـێ، ئینسـان تەنیـا لەڕێـی بیسـتنەوە دەتوانـێ پەیوەندیـی لەگـەڵ ئەوانـی دیکـەدا بـکات، چونکـە نابینـێ، بـەڵام لـە هـی دووەمـدا دەفەرمـوێ: ﴿أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾، چونکـە لـە ڕۆژدا ئینسـان دەبینـێ، زیاتـر لـە ڕێـی دیتنـەوە لەگـەڵ ئەوانـی دیکـەدا پەیوەندیـی بەرقـەرار دەکات، ﴿وَمِن رَّحۡمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾، هەروەهـا (خـوا) لـە بەزەیـی خۆیـەوە، شـەوگارو ڕۆژگاری بـۆ وا لێکـردوون، کـە تێیانـدا پشـوو بـدەن و،

لـە بەخششـی خـوا ﷻ داوا بکـەن و، بـۆ ئـەوەش کـە سوپاسـگوزاریی ئەنجـام بـدەن (بـۆ خـوا)، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، چونکـە هەندێـک کـەس لـە شـەوێدا کارو کاسـبیی دەکـەن و، لـەڕۆژدا پشـوو دەدەن و نیسـڕاحەت دەکـەن، هەرچەنـدە لـە ئەصڵـدا شـەو بـۆ خەوتـن و پشـوودانە و، ڕۆژگار بـۆ کارو کاسـبییە، بـەڵام جـاری واش هەیـە لـە هەنـدێ شـوێن، یاخـود هەندێـک کـەس، وای بـۆ دەگونجـێ، بـە شـەو کارو کاسـبیی بـکات، وەک هەندێـک کاروانچیـی و، هەندێـک جـۆرە کارو کاسـبیی، کـە بـە شـەو ئەنجـام دەدرێـن، یـان هەندێـک سـەفەرو هاتـن و چـوون.

﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴾، ئـەو ڕۆژەش کـە بانگیـان دەکات، دەفەرمـوێ: لـە کوێـن ئـەو هاوبەشـانەم، کـە پێتـان وابـوو هاوبەشـی منـن، کـوان لـە کوێـن؟ دیارە ئەمـە پێشـتر خـوا ﷻ دووبـارەی کردۆتـەوە لـە ئایەتـی (٦٢)شـدا فەرموویەتـی، لێـرەش لـە ئایەتـی (٧٤)دا دووبـارەی کردۆتەوە، ئنجـا لـەوێ وەڵامەکەیـان بـاس دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَۖ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴾، لـەوێ ئـاوا وەڵام دەدەنـەوە، بـەڵام لێـرەدا وەڵامەکـەی نەگوتۆتـەوە، ئیکتیفـای کـردوە بـە وەڵامـی پێشـوو، یاخـود بۆیـە وەڵامەکـەی دیـار نیـە، چونکـە وەڵامیـان نیـە، کـوا ئـەو هاوبەشـانە لـە کوێـن؟ بوونـە بـەردی بـن گۆمـێ.

لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا ﴾، لـە هـەر کۆمەڵێـک چاودێرێـک و شـایەدێکمان هێنـا، ﴿ فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ ﴾، پێمـان گوتـن: ئـەی کۆمەڵەکە! ئـەی خەڵکەکە! بەڵگـەی خۆتـان بێنـن، بـەڵام زانییـان کـە هـەق تەنیـا هـی خوایـە، ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾، ئـەوەش کـە هەڵیاندەبەسـت، وەک هاوبـەش بـۆ خـوا، لێیـان ون بـوون و نەیانتوانـی بێنـە ڕوو، لەبـەر ئـەوەی بـەس لـە گومـان و خەیاڵـی ئەواندا، هاوبـەش بـوون بـۆ خـوا، ئەگەرنا لـە ڕاسـتییدا دروسـتکراوی خـوا ﷻ بـوون، ئنجـا چ مـاددەی بـێ ژیـان بووبـن، چ

ماددەی ژیاندار بووبن، لە ڕووەک و لە ئاژەڵ، چ وێڕای ژیاندار بوون، خاوەنی هەست و ویستیش بووبن، وەک تێکڕای ئەو جندو مرۆڤ و فریشتانەی بە جۆرێک لە جۆرەکانی پەرستران، پەرستراون.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خستنە سەر ڕێی ڕاست و ڕێنمایی کردن، تەنیا لە توانای خوادایە و، بە ئارەزووی مرۆڤەکان نیە و، خواش زاناترە کێ شایستەی هیدایەتدرانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ناتوانی کەسێک ڕاستە ڕێ بکەی، کە خۆشت دەوێ.

٢)- ﴿ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾، بەڵام خوا ﷻ هەر کەسێکی بوێ، ڕاستە ڕێی دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾، مەبەست پێی نەوەیە کە ویستی خوا ﷻ ڕەهایەو بێ سنوورە، ئەگەرنا بە دڵنیایی خوا ﷻ لە گۆترە کەس ڕاستە ڕێ ناکات و، لە گۆترەش کەس سەر لێ ناشێوێنێ، وەک لە شوێنی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾الشورى، ﴿ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾الرعد، ئەوانە دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ، کە لەناخەوە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، بەڵام ﴿ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم، خوا ستەمکاران سەرگەردان دەکات، یان ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٦﴾ ﴾المنافقون، خوا ﷻ کۆمەڵی لادەران ڕاستەڕێ ناکات.

٣)- ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾، ئەو زاناترە بەوانەی ڕێی ڕاستگرتوون، واتە: شایستەی ئەوەن بخرێنە سەر ڕێی ڕاست.

ئایا کێ شایستەی ئەوەیە، خوا ﷻ دەستی بگرێ و ڕاستە ڕێی بکات؟ بێگومان کەسێک کە ئارەزوو و ڕەغبەتی هەیە و، خوای پەروەردگاری خۆش دەوێ، لە دڵەوە بەرەو خوا وەردەچەرخێ و، لە دڵەوە بەرەو خوا دەجووڵێ و دەخرۆشێ، خوای کاربەجێش هەر کەسە لە قەدەر خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

هەڵبەتە هۆی هاتنە خوارەوەکەی تایبەتە، وەک پێشتر باسمان کردو، دوو ڕیوایەتمان هێنان، بەڵام چەمک و حوکمەکەی گشتگیرە، وەک زۆرجار گوتراوە، زانایان دایانناوە وەک بنچینەیەک: (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لا يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى)، واتە: تایبەت بوونی هۆکار، ڕێگر نیە لە گشتیی بوونی واتا.

## کورتە باسێک: لە پێنج سەرنجدا

١)- تەنانەت پێغەمبەریش موحەممەد ﷺ کە سەروەری پێغەمبەرانە، هەموو شتێکی بەپێی ویست و ئارەزووی نەبووە، شتی پێ خۆش بووە، نەبووە و، شتیشی پێ ناخۆش بووە، بووە، چونکە مرۆڤە مرۆڤە، با پێغەمبەریش بێ، ئەوە تەنیا خوایە ﷻ کە هەرچی بیەوێ دەیکات و، هەرچی نەیەوێ نابێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾.

٢)- چەمکی (هیدایەت) زۆر گرنگە بەپێی سیاق دەرک بکرێ، ئەگەرنا تووشی هەڵەی کوشندە دەبین، بۆ وێنە: لێرە لە ئایەتی (٥٦)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴾، بە دڵنیایی تۆ هیدایەتی ئەو کەسە نادەی کە خۆشتدەوێ، بەڵام لە سوورەتی (الشورى) دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی تۆ بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەکەی، لەوێ دەفەرموێ: تۆ بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەکەی و، لێرەشدا دەفەرموێ: کەسێ کە خۆشت دەوێ و حەزت لێیە هیدایەت بدرێ، هیدایەتیت پێ نادرێ، واتاو چەمکی (هیدایەت) لەم دوو شوێنەدا لێک جیایە، لە سوورەتی (القصص)دا کە دەفەرموێ: تۆ هەر کەسێک خۆشت دەوێ، ناتوانی هیدایەتی بدەی، واتە: ناتوانی بیخەیە سەر ڕاستەڕێ، نەک ناتوانی ڕێی پێشان بدەی، ئایەتی (٥٢) لە سوورەتی (الشورى)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: تۆ بۆ ڕاستە شەقام ڕێنمایی دەکەی (هداية)، بە مانای ڕێنمایی کردن و ڕێ پێشاندانە.

پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێشانی هەموو کەس داوە، بەڵام ئەوە خوایە ﷻ کە دەتوانێ هەندێک لە مرۆڤەکان ڕاستە ڕێ بکات و، بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، تا ئەوەیان تەنیا بەدەست خوایە، بەڵام ئەوە بە دەست پێغەمبەرە ﷺ کە ڕێنماییان بکات، خوای

پەروەردگاریش پێغەمبەری خۆی ناردوە، تاکو ڕێنماییان بکات و، ڕێیان پێشان بدات و، بەرچاویان ڕۆشن بکاتەوە، هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾النحل، واتە: ئەگەر سوور بی لەسەر هیدایەتیان، بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەگەر کەسێک گومڕا بکات، هیدایەتی نادات و، هیچ پشتیوانیشیان نین، لێرەدا ﴿ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ﴿٣٧﴾ ﴾النحل، واتە: نایخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەگەرنا خوا قورئانی ناردوە (هدى للعَالَمِيْن) و، پێغەمبەری ﷺ ناردوە کە خەڵک ڕێنمایی بکات بۆ ڕاستە شەقام، وەک ڕێ پێشاندان، بەڵام وەک دڵ وەرچەرخاندن و خستنە سەر ڕێ، ئەوە خوا ﷻ ئەوەی بۆ هەموو کەس ناوێ، تەنیا بۆ ئەو کەسانەی دەوێ، کە شایستەن و، بۆ ئەو کەسانەی دەوێ کە لە دڵەوە بۆ خوا دەجۆشێن و دەخرۆشێن.

٣)- هیدایەتدانی خوا لە گۆترە نیە، بە بەڵگەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾، خوا زاناترە بە هیدایەت دراوان، واتە: زاناترە بەوەی کێ شایستەی ئەوەیە، خوا هیدایەتیان بدات و، بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لە بڕگەی سێیەمی ئەم مەسەلەیەش دا تیشکی زیاترمان خستە سەر ئەم بابەتە.

٤)- هەرچەندە هۆی هاتنە خوارێمان باس کرد، بەڵام لێرەش ئەم دەقە دێنین، کە تیشکی زیاتر دەخاتە سەر ئەوەی بۆچی ئەبووتاڵیب ئامادە نەبوو، هیدایەت لە برازایەکەی خۆی وەربگرێ:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَمِّهِ: «قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ يَقُولُونَ إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذَلِكَ الْجَزَعُ، لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴿٥٦﴾ ﴾} (أخرجه مسلم: ٢٥).

واتە: ئەبوو هورەیرە ؓ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مردندا بە مامی (واتە ئەبوو تاڵیبی) فەرموو: بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) لە ڕۆژی دواییدا، شایەدیت بۆ

پێ دەدەم، واتە: دەیکەمە بەڵگە بۆت، ئەویش گوتی: ئەگەر زانیبام قورەیشییەکان عەیبم لێ ناگرن و، ڕەخنەم لێ ناگرن، دڵی تۆم پێ خۆش دەکرد، خواش لەو بارەوە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، کە گوتوویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، ئافرەتانی قورەیش ڕەخنەم لێ بگرن، یان قورەیشییەکان بڵێن: لە مردن ترسا، ئەوە ئێستا دڵی تۆم پێ خۆش دەکرد، ئنجا تەماشای ئەو نەفامییە بکەن! مرۆڤ لەبەر ئەوەی خەڵک ڕەخنەی لێ نەگرێ، یان لەبەر ئەوەی نەڵێن: لە مردن دەترسێ، لەسەر کوفرو گومڕایی بمێنێتەوەو، بە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکات و بشزانێ پێغەمبەری خوایە ﷺ لەبەر ئەوەی، مام لە هەموو کەس باشتر برازای خۆی دەناسێ، بەڵام دیارە هیدایەت بەدەست خوایە.

٥)- هەڵوێستی شیعە لە بارەی ئەم ئایەتەوە:

أ)- (مُحَمَّد حُسَین الطبَاطَبَائِي) خاوەن تەفسیری (المیزان في تَفسیرِ القُرآن)[1] دەڵێ:

**(أن الرِّوَايَاتِ المُسْتَفِيضَةِ عن أهل البيت، دلّتْ على إيمانه، والمنقول من أشعاره بالإقرار على صدق النبي ﷺ وحقّية دينه، وهو الذي آوى النبي ﷺ صغيراً وحماه بعد البعثة، وقبل الهجرة فقد كان أَثَرُ مجاهدته وحده، في حفظ نفسه الشريف، في العشر سنين قبل الهجرة، يعدل أثر مجاهدة المهاجرين والأنصار بأجمعهم في العشر سنين بعد الهجرة)**؟!.

نەفامیی ناوا دەبێ، دەمارگیریی ناوا دەبێ، هەموو سنووری بەزاندوون، کاک (طبَاطَبائي)! کە شیعەکان دەڵێن: ڕوونکەرەوەو ساغکەرەوەی زانای شارەزا، تەماشا بکەن، چ نەزانییەک و چ نەفامییەک لە قسەکانی دەتکێ!

دەڵێ: ڕیوایەتەکانی پێشەوایانی (أَهْلُ البَيْت)، (واتە: خزمانی پێغەمبەر ﷺ)، زۆرن لەو بارەوە کە ئیمانی هێنا (واتە: ئەبوو تاڵیب)و، ئەوەی کە لە

---

(١) ج١٦، ص٥٧.

شـیعرەکانیەوە نەقـڵ بـووە، پـڕن لـەوە کـە دانـی پێداهێنـاوە: پێغەمبـەر ﷺ ڕاسـت دەکات و ئایینەکـەی ڕاسـتە و، ئەبـوو تاڵیـب بـوو کـە پێغەمبـەری ﷺ بـە گچکەیـی بەخێـو کـردو، دواییـش بـە گەورەیـی دوای ئـەوەی کـە ڕەوانـە کـرا و، پێـش کۆچکردن بـۆ مەدینـە پاراسـتی، شـوێنەواری هەوڵدانـی و، تێکۆشـانی ئەبـوو تاڵیـب بـە تەنیـا، لـە پاراسـتنی نەفسـی پێغەمبـەردا ﷺ لـە دە (١٠) سـاڵی پێـش کـۆچ کردنـدا، بەرانبـەر هەوڵـدان و تێکۆشـانی هەمـوو کۆچکـەران و پشـتیوانانە بـە تێکـڕا، لـە دە (١٠) سـاڵی دوای کۆچکردنـدا!!!

ئائەوەیـە دەمارگیریـی و، تێپەڕانـدن و نەفامیـی و نەزانیـی، کـە تـۆ بێنـی کاری ئەبـوو تاڵیـب بـە تەنیـا پێـش کۆچکـردن، بیخەیـە تەرازوویـەک، لەگـەڵ کـردەوەی بـاش و ئـەو هەمـوو خەبـات و خوێـن و، کـۆچ و ئاوارەیـی و ناڕەحەتییـەی، تێکـڕای کۆچکـەران و پشـتیوانان، کـە لـە کۆتـا تەمەنـی پێغەمبـەردا ﷺ ژمارەیـان لـە سـەد هـەزار (١٠٠،٠٠٠) کـەس تێپەڕیـوە! بۆیـەش شـیعە بـە زۆریـی بـەو دەمارگیریـی و تێپەڕاندنـە فەوتـاون، کـە ئـەوە هیـچ مەنتیقـی تێـدا نیـە، بـۆ کەسـێک کـە هیـچ بەڵگەیەکـت بەدەسـتەوە نیـە، لەسـەر مسـوڵمانبوونی، عاتیفـەی ئـەوە نەبـێ کـە بابـی عەلـی کـوڕی ئەبـی تاڵیـب بـووە، دیـارە عەلـی ﷺ یەکێکـە لـە چـوار خەلیفـەکان و، ئامـۆزای پێغەمبـەرە ﷺو، یەکێکـە لـە دە (١٠) مـوژدە پێـدراوەکان، چەنـدی بڵێیـی، ئەوەنـدە سـیفەتی بـەرز و باشـی هـەن، بـەڵام ئنجـا بڵێیـن چـی، بابـی کافـر بـووەو بـڕوای نەهێنـاوە، هـەروەک چـۆن نـووح بـۆ خـۆی پێغەمبـەری خـوا بـوو، بـەڵام خێزانەکـەی کافـر بـووە، هەروەهـا کوڕەکـەی کافـر بـووەو بەقسـەی نەکـردوە، دوایـی خـوا سـەر زەنشـتی کـردوە کـە: ئـەی نـووح! لـە نەزانـان نەبـی، داوای دەربازبوونـم بـۆ کوڕەکـەت لـێ نەکـەی! هەروەهـا لـووط خێزانەکـەی کافـر بـووە، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾الأعـراف، لەگـەڵ ئەوانـەدا بـوو کـە فەوتـان و بەجێمـاون، دیسـان ئیبراهیـم بابـی کافـر بـووە و بـڕوای پـێ نەهێنـاوە، بۆیـەش خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: لـە هەمـوو شـتێکدا شـوێنی ئیبراهیـم بکەون،

جگـە لـەوەی کـە داوای لێبوردنـی بـۆ بابـی کـرد، ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ ﴿١١٤﴾ ﴾التوبـة، جگـە لـە داوای لێبوردنـی ئیبراهیـم بـۆ بابـی، لـەوەدا مەیکەنـە سـەر مەشـق، لـەوەدا نەیپێـکاوە، خـوا ﷻ خاتـری کـەس ناگـرێ، بـەڵام شـیعە هـەر لەبـەر ئـەوەی ئەبـوو تاڵیـب بابـی عەلـی ﷺ بـووە، دەڵێـن: تێکۆشـانی وی بـە تەنـێ بـە قـەدەر هـی هەمـوو کۆچکـەران و پشـتیوانانە!!

ب)- تەفسیری (نموونە)ش لە ژێر ناوونیشانی: (ئیمانی ئەبووتاڵیب و هەراو هۆریایەک کە لەو بارەوە بەرپاکراوە)[1]، ئەویش شەش لاپەڕە لە تەفسیرەکەی پڕ دەکاتەوە بە قسەی بێ کەڵک، تەنیا تانە دانە لە ئەبوو هورەیرە ﷺ، لەبەر ئەوەی ئەو فەرمایشتەی گێڕاوەتەوە، هەروەها لە هاوەڵانی دیکە و، پێدا هەڵگوتنی زۆری ئەبوو تاڵیبە، هەندێک شیعران دێنێ کە ئاوای گوتوە و ئاوای گوتوە، ئنجا زۆر کەسی دیکەش هەبووە، زۆری ڕێز لە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتووە، زۆری پێداهەڵگوتوە، بەڵام کە ئیمانی پێ نەهێناوە، بڵێین چی!

**مەسەلەی دووەم:**

**بیانووگرتنی کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ، کە ئەگەر مسوڵمان بن، لە وڵاتی خۆیان دەڕفێنرێن و، بەرپەرچدانەوەیان کە بە هۆی کابەوە، ئەمان و نانیان بۆ دابین کراوە و، سەرنجڕاکێشانیان بۆ مێژووی گەلانی بوغرا بوو بە خۆشگوزارانییان، کە فەوتاون و، خواش هەرگیز پێش پەیام ناردن، هیچ گەلێکی نەفەوتاندوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةِۭ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَاۖ فَتِلۡكَ مَسَٰكِنُهُمۡ لَمۡ تُسۡكَن مِّنۢ بَعۡدِهِمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ وَكُنَّا نَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبۡعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ ﴾، (کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ) گوتیان: ئەگەر ئێمە لەگەڵ تۆدا بەدوای ڕێنمایی بکەوین، بە دوای بەرنامەیەک و، ڕێ پێشاندانێک کە خوا ﷻ ناردوویەتی، لەسەر زەمینی خۆمان دەڕفێنرێین.

(التَّخَطُّفُ: مُبَالَغَةٌ فِي الخَطْفِ وَهُوَ انتِزَاعُ شَيءٍ بِسُرْعَةٍ)، (تَخَطُّف) لەسەر کێشی (تَفَعُّل) زێدەڕۆییە لە (خَطْف)دا، (خَطْف)یش بریتییە لەوەی شتێک بەخێرایی وەربگری و لە شوێنی خۆی هەڵیقەنی و بیڕفێنی.

هەڵبەتە ئێستاش کەسانێک هەن، دەڵێن: ئەگەر بێت و ڕوو لە ئیسلام بکەین و پابەند بین بە ئیسلامەوە، ڕۆژئاوا مامەڵەمان لەگەڵدا ناکات، ڕۆژهەڵات شەڕمان پێ دەفرۆشێ، جوولەکە دانووی لەگەڵماندا ناکوڵێ، وەک بەداخەوە ئێستا زۆر

لـە دەوڵەتانـی کەنـداو هاتوونـە سـەر ئـەو مەشـرەبە، کـە کاتـی خـۆی کافرەکانـی قورەیـش دەیانکـردە بیانـوو، کـە ئەگـەر لەگـەڵ تـۆدا بـەدوای هیدایەتـی خـوا ﷻ بکەویـن، دەرفێترێیـن، ئێسـتاش زۆر لـە دەوڵەتانـی کەنـداو تەسـلیمی کوفـری جیهانیـی بـوون، بـە سـەرکردایەتیی ئەمریـکا و جوولەکـە، بـە بیانووی ئەوە کـە ئەگەر لەگـەڵ ئەوانـدا بەینـمان بـاش نەبـێ، دژایەتییـمان دەکـەن و، ناتوانیـن بـەردەوام بین، ئاخـر بۆیـە ناتوانـی بـەردەوام بـی چونکـە تـۆ، حوکمێکـی بنەماڵەیـی و میراتیـی و، خۆسـەپێنانەت پەیـڕەو کـردوە، لـە دڵـی خەڵکـدا نیـت، ڕەگ و ڕیشـەت نیـە، بۆیـە ناچـاری کـە پـاڵ بـە زلهێزانـەوە بـدەی، ئەگەرنـا ئەگـەر تـۆ بـە پێـی: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشـوری، حوکمڕانیـی بکـەی، ئـەو کاتـە ناچـار نابـی ئەمریـکا بەرگرییـت لـێ بـکات، خێـرو بێرەکـەت بـەرێ و بڵـێ: بێنـە پـارە، چونکـە دەتپارێـزم، ئەگـەر مـن بـەس چـوار ڕۆژان نەتپارێـزم دەڕووخێـی، ئایـا چ ئابڕوویـەک بـۆ ئـەو دەوڵەتـە دەمێنێتـەوە، کـە ئەمریـکا وای پـێ بڵـێ؟.

٢)- ﴿ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا ﴾، ئایا ئێمە حەرەمێکی پڕ هێمن و ئاساییشمان بۆ نەڕەخساندوون؟ بۆمان نەچەسپاندوون؟ (التَّمْكِينُ: الجَعْلُ فِي مَكَانٍ)، (تمكين) چەسپاندنی شتێکە لە شوێنێک دا، حەرەم: مەبەست پێی مەککەو دەوروبەریەتی کە پڕە لە هێمنیی و ئاساییش.

٣)- ﴿ يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، بەروبوومی هەر شتێکی بۆ لا کۆ دەکرێتەوە.

هەڵبەتـە لێـرە (كُلِّ شَىْءٍ) مانایەکـەی عورفییـە، یانـی: هـەر شـتێک کـە بـاوەو هـەر شـتێک کـە دەگونجـێ، لێـی کۆدەکرێتـەوە، هەمـوو بەروبـووم و میـوەکان، هەمـوو بەرهەمـەکان دەهێندرێنـەوە بـۆ ئـەوێ، ئێسـتاش هەروایـە.

٤)- ﴿ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا ﴾، بژیوێکە لەلایەن ئێمەوە، وشەی (رِزقاً): (حَالٌ مِنَ الثَّمَرَات) ئەم بەرومیوانە کە دەهێنرێنەوە بۆ ئەوێ، ئەوە بژیودانێکە لەلایەن ئێمەوە.

٥)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، (إسْتِدْرَاكٌ أي أكْثَرُهُم لا عِلْمَ لَهُم، لِذَلِكَ لَمْ يَتَفَطَّنُوا إلى كُنْهِ هَـذِهِ النِّعْمَة)، (لكن) بە مانای (بەڵام)ە، بەڵام زۆربەیان نازانن و زانیارییان نیە، بۆیە دەرکی چییەتی ئەو نیعمەتە ناکەن، کە ئەو هەموو نیعمەتانەیان بەهۆی مەککەو حەرەمەکەی و کەعبەوە، بەهۆی ئەو ماڵی خوایەوە، چنگیان کەوتوون.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوانە بە زۆریی بە هۆی خۆشگوزەرانیی و ناز و نیعمەتی دنیاوە، پشتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە و، ترساون کە بازاڕەکەیان لێ تێکبچێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ:

٦)- ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ ﴾، زۆرێک لە ئاوەدانییەکانمان فەوتاندوون، ئەم (كَم)ە، (كَمْ الخَبَرِيَّة)یە یانی: (كَثِير)، زۆر، (كَثِيراً أهْلَكْنَا مِنَ القُرَى) زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون.

٧)- ﴿ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾، (البَطَرُ: الطُّغْيَانُ وَالتَّكَبُّرُ)، یانی: لە ژیانەکەی خۆیاندا تووشی حاڵەتی لە خۆبایی بوون و، لە کەوڵی خۆ دەرچوون و، خۆ بەزلگریی بوون، یاخود ﴿ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾، (بَطِرَتْ أيَّامَ عَيْشِهَا)، لە ڕۆژەکانی ژیان و گوزەرانیدا تووشی حاڵەتی لە خۆبایی بوون و بوغراییی، بوون، یاخود (كَفَرَتْ نِعْمَةَ رَبِّهَا فِي مَعِيشَتِهَا) چاکەی پەروەردگاری نادیدە گرتوەو سپڵەیی بەرانبەر نواندوە، لە ژیان و گوزەرانەکەی خۆیدا.

کەواتە: ڕستەی ﴿ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾، وەک زانایان گوتوویانە: دەگونجێ یەکێک لە سێ مەبەستی هەبن:

أ)- ژیانە خۆش و گوزەرانە خۆشەکەی، بوغڕای کرد.

ب)- بوغڕا بوو، لە ژیان و گوزەرانەکەیدا.

ج)- سپڵەیی (کفران)ی کرد لەو ژیان و گوزەرانە خۆشەی دا، کە خوا ﷻ بۆی ڕەخساند بوو، کە پڕ بوو لە نازو نیعمەت.

٨)- ﴿ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەوانە خانووبەرەکانیانن، لە دوای ئەوان کەمێک نەبێ نیشتەجێیان تێدا نەکرا، نەکرانە جێگای نیشتەجێ بوون و تێدا مانەوە، (السُّكْنَى: الحُلُولُ فِي البَيت)، (سُكْنَى) بریتیە لە مانەوە لە ماڵێکدا، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، یانی: (إلاّ أزْمَاناً قَلِيلَةً وإلاّ سُكْنَى قَلِيلاً وَهُوَ سُكُونُ المارِّين)، چەند ماوەیەکی کەم نەبێ و، نیشتەجێ بوونێکی کەم نەبێ، خەڵک تێیاندا نیشتەجێ نەبووە، ئەویش بریتی بووە لە نیشتەجێ بوونی ئەو ڕێبوارانەی بەو شوێنەدا دەڕۆن، (جاری وا بووە لەو کاولگەیەدا، تۆزە پشوویەکیان داوە).

٩)- ﴿ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾، هەر ئێمەش خۆمان میراتگر بووین، واتە: هاتنەوە دەستی ئێمە و، هیچ کەس خاوەنیان نەبوو.

لێرەدا خـوای خاوەنـدار خاوەنداریەتییەکـەی بـە میـرات (وِراثـة) ناونـاوە، یانـی: گەڕانـەوە بـۆ لای ئێمـە و، کـەس نەبـوو خاوەندارێتیـی ئـەو خانووبەرانـە بـکات.

ئنجـا خـوا ﷻ ڕاسـتییەکی دیکـە دەخاتـە ڕوو، کـە بۆچـی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) دەنێـرێ؟ دەفەرمـوێ:

١٠)- ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾، پەروەردگارت فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نیە، تاکو لە دایکانەکەیان و بنەڕەتەکەیاندا پێغەمبەرێک نەنێرێ، ئایەتەکانمانیان بەسەردا بخوێنێتەوە.

بۆیـە نـاو لـە مەککـە نـراوە: (أُمُّ القُـرَى) واتـە: دایکـی شـارەکان، (أُمُّ القُـرَى)ش بریتیـە لـە شـارێکی مـەزن، ئـەو شـارەی کـە مەڵبەنـدو چەقـی شـارەکانی دیکـە بـێ.

﴿ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ﴾، (ئـەو پێغەمبـەرە) ئایەتەکانـی ئێمـە بەسـەر خەڵکەکـەدا (خەڵکـی شـارەکەدا) دەخوێنێتـەوە.

١١)- ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴾، ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەکان نەبووین لە ڕابردووشدا، مەگەر دانیشتووانەکانیان و خەڵکەکەیان

ستەمکار بووبن، واتە: ئێمە لە هیچ حاڵاندا فەوتێنەری خەڵکی ئاوەدانییەکان نەبووین، مەگەر لە حاڵێکدا ئەوان ستەمکارو تاوانبارو خەتاکار بووبن.

## کورتە باسێک لە بارەی بەهرەمەند بوونی خەڵکی مەککە و دەوروبەریەوە، لە حەرەمی مەککە

ئـەم ڕاسـتییە خـوا ﷻ لـە چەنـد شـوێنێکی دیکەشـدا بەیانـی کـردوە، باسـی کەعبـەو لـە پەنـای کەعبـەدا بەهرەمەنـد بـوون لـە هێمنیـی و ئاسـاییش و، نـان و ئەمـان، بـۆ وێنـە:

١- لە سوورەتی (قریش)دا، خوا فەرموویەتی: (بسم الله الرحمن الرحيم): ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ۝٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ۝٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ۝٤﴾.

واتـە: بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە. بەهـۆی خووگرتـن و عادەتگرتنـی قورەیشـەوە ﴿١﴾ عادەتگرتنیـان بـە سـەفەری زسـتانە و هاوینـەوە، (بـۆ بازرگانیـی زسـتانان بـۆ شـام، هاوینـان بـۆ یەمـەن) ﴿٢﴾ بـا پـەروەردگاری ئـەو ماڵـە بپەرسـتن ﴿٣﴾ کـە لـە برسـیەتیی تێـری کـردوون و لـە تـرس و بیمیـش دڵنیایـی کـردوون ﴿٤﴾.

٢- لە سوورەتی (العنكبوت)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنٗا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ ۝٦٧﴾، واتە: ئایا نابینن کە ئێمە حەرەمێکی پڕ هێمنیی و ئاساییشمان بۆ ڕەخساندوون و، خەڵکیش لە دەوروبەریان دەڕفێندرێ، ئایا بڕوا بە باتیڵ دێنن و، سپڵەیی بەرانبەر نیعمەت و چاکەکانی خوا دەکەن؟

٣- لە سووڕەتی (النحل)یش دا، دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾، واتە: خوا ﷻ وێنەیەکی هێناوەتەوە، شارێک کە پڕ هێمنیی و ئاسایش بوو، ئارامگرتوو بوو، بژیوی بە فراوانیی لە هەموو شوێنێکەوە، لە هەموو لایەکەوە بۆ دەهات، بەڵام بەرانبەر بە چاکەکانی خوا ﷻ سپڵە بوو، خواش پۆشاکی برسیەتیی و ترسی پێ پۆشین، (برسیەتیی و ترس وەک چۆن پۆشاکێک دەچێتە بەر ئینسان و، بە جەستەیەوە دەنووسێ، ئاوا پێیانەوە نووسا)، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد (لە بێبڕوایی و سپڵەیی)، بە دڵنیایی پێغەمبەرێک لە خۆیان بۆیان هات، بەڵام بەدرۆیان دانا، بۆیە سزا گرتنی لە حاڵێکدا کە ئەوان ستەمکار بوون.

واتە: سزای دنیا گرتنی، کە بریتی بوو لە برسیەتیی و قات و قڕیی کە بەسەریان هات و، بریتی بوو لە نا ئەمنیی و نا ئاسایشییەک کە بەسەریان هات و، بریتی بوو لەو کوشتارەی کە لە جەنگەکانی بەدرو ئەوانی دیکەدا لێیان کرا، کە زۆربەی زلە زلەکانیان تێداچوون، سزای خوا لە دواڕۆژیشدا بۆ ئەوانەیە کە لە بێبڕواییدا ماونەوەو بێگومان گەورەتریشە.

هەڵبەتە کە خوا ﷻ لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ ئاوا کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری دواندوون و، چاکە و نیعمەتی خۆی کە لە کەعبەدا بەرجەستە بووە و، کەعبە بۆیان بۆتە هۆی هێمنیی و ئاسایش و، بۆیان بۆتە مایەی گەشەی ئابووریی و، ژیان و گوزەران بەڕێوە چوون، کە ئەو کاتە وای پێفەرموون، ئێستاش هەروایە، ئێستاش بەهۆی کەعبەوە، بە هۆی (بَيْتُ اللهِ الحَرَام)ەوە، هەروەها کە دوایی مەدینەشی هاتۆتە سەر، مزگەوتی پێغەمبەریش ﷺ و، مەزارگەی پێغەمبەرو ﷺ مەزارگەی هاوەڵان، ئەو خەڵکانەی کە لە نیوە دوورگەی عەرەبیی (عەرەبستان)دا دەژین، زۆر بەهرەمەندن، لە کەعبەو لە

مزگەوتـی پێغەمبەریـش ﷺ هـەم لـە ڕووی هێمنیـی و ئاسایشـەوە، هـەم لـە ڕووی قـەدرو قیمـەت و ئیعتیبـارەوە، هـەم لـە ڕووی ئابووریـی و ژیـان و گوزەرانـەوە، بـە تایبەتـی کـە لـەو دوا دواییانـەدا نەوتیـش دۆزرایـەوەو، غازیـش دۆزرایەوە لـەوێ، زۆر کەوتوونـە خۆشـگوزەرانیەوە، بـەڵام بەداخـەوە وەک چـۆن کاتـی خـۆی قوڕەیشـییە ملهـوڕەکان بەرانبـەر بـە پێغەمبـەر ﷺو، بەرانبـەر بـە هیدایەتێـک کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هێنابـووی، سـەرکەش و یاخیـی بـوون و، بەرانبـەر بـە نیعمەتـی خـوا کـە لـە کەعبـەدا بەرجەسـتە بـوو بـوو، بـێ بـاک بـوون، نادیدەگیـر بـوون، ئێسـتاش وەک دەڵێـن: (التَّارِيـخُ يُعِيـدُ نَفْسَـهُ) لـەم ڕۆژگارو زەمانـەی کـە ئێمـە تێیدا دەژیـن، کە ئەمڕۆ (٢٥)ی٦ / (٢٠١٩)ی زایینیە و، (٢٢)ی شـەووالی (١٤٤٠)ی کۆچییە، ئا لەم ئان و سـاتەدا، هەمـان وەزع دووبـارە بۆتـەوە جارێکـی دیکـە، ئەوانـەی کـە ئێسـتا لـەوێ حوکمڕانن، زانـاکان لـە زیندانـەکان بەنـد دەکـەن، بوغـڕا بـوون و هەمـوو نـاز و نیعمەتێـک کـە لـەوێ هەیـە، بـە هـی ماڵێکـی دەزانـن و، بـە هـی ئـەو کەسـانەی دەسـتە و وابەسـتەی ئـەو ماڵـەن و، خەڵکـی دیکەیـان لـێ بـێ بـەش کـردوە و، بەداخـەوە کـە لـە جیاتـی ئـەوەی میهرەبانیـی و نـەرم و نیانیـی لەگـەڵ خەڵکـی خۆیانـدا پێشـان بـدەن، نـەرم و نـۆڵ و، نێچیرێکـی تـووک نەرمـن بەرانبـەر بـە جوولەکـە، بەرانبـەر بـە زلهێزانـی دنیـا، بەرانبـەر بـە ئەهلـی کوفـری دنیـا، بەسـەرکردایەتیی ئەمریـکا، کەچـی بەرانبـەر بـە خەڵکەکـەی خۆیـان زۆر زبـرن، یانـی: ڕێـک پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾﴾المائـدة، واتـە: میهرەبانـن لەسـەر بڕواداران (نـەرم و نیانـن) و، لـە بەرانبـەر ئەهلـی کوفـردا زبـرو بەدەمـارن، ئـەوان بـە پێچەوانـەوە: زبـرو بەدەمـارن بەرانبـەر بـە ئەهلـی ئیمـان، بـە تایبەتـی زانایانێـک کـە هەقیـان پـێ دەڵێـن و، تـووک نـەرم و، بـێ زەڕو سـەلامەتن، بەرانبـەر بـە دوژمنـان و ناحەزانـی ئیسـلام و مسـوڵمانان، هەروەهـا وەک خـوا (عَـزَّ وَجَـلَّ) لـە وەسـفی هاوەڵانـدا دەفەرمـوێ: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴿٢٩﴾﴾الفتـح، واتـە: لەسـەر کافـران توندوتیـژن، لەنێـو خۆیانـدا بـە ڕەحـم و بەزەییـن، کەچـی ئـەوان

بە پێچەوانەوە: لەگەڵ کافرەکاندا بە ڕەحم و بەزەیین، بزانن داخۆ جوولەکە بە چ ڕازی دەبێ، چۆن جوولەکە سەلامەت دەبێ (قەوارەی زایۆنی) و، بزانن ئەمریکا چۆن ڕازی دەبێ، تاوا دەکەن. بەڵام سەختیی و توندییەکەیان بەرانبەر بە ئەهلی خۆیانە، ئنجا هەندێک خەڵکی دیکەش کە کارتێکراو بووە بەو تەوژمە لارەو بەو مەشرەبە نالەبارە، کە هەر لە سەرەتاوە بەرانبەر بە ئەهلی ئیمان توند بوون، خوێنی مسوڵمانانیان بە حەڵاڵ داناوە و، بەرانبەر بە ئەهلی کوفر بێ مزەڕەت و سەلامەت بوون، هەندێک لەوانە کە بە پرژو بڵاویی هەن، لە عالەمی ئیسلامیی دا، ئەوانەش دیسان لەسەر هەمان ڕێچکە دەڕۆن، بەرانبەر بە ئەهلی ئیمان زمانیان زۆر تیژو زۆر زبرو بێ ڕحم و دڵڕەقن، بەڵام لە بەرانبەر ئەهلی کوفرو نیفاقدا، زۆر نەرم و نۆڵ و تووک نەرمن، کە ئەوە بەڕاستیی ڕێک هەڵگێڕانەوەی ئەو سیفەتانەیە، کە خوا ﷻ هاوەڵانی بەڕێزیان پێ وەسف دەکات، کە دەبێ لە نێو خۆیاندا، لەگەڵ ئەهلی ئیمان دا، میهرەبان و بەڕەحم و بەسۆز بن و، لە بەرانبەر دوژمنان و ناحەزانیاندا، ئەوانەی شەڕیان پێ دەفرۆشن و گێچەڵیان پێدەکەن، زبرو توندو بە دەمار بن.

ئەگەرنا ئەهلی کوفریش ئەگەر شەڕت لە دژ نەکات، لەگەڵیدا خۆش خوڵق بی، زۆر پێویستە، بەڵام کافرێک کە سەنگەرت لێ دەگرێ و وڵاتت داگیر دەکات، دەیەوێ خێرو بێری تۆ بۆ خۆی بەرێ و، ژێر دەست و ژێر چەپۆکت بکات، لەگەڵی نەرم و نیان بی و بە دەمیەوە پێبکەنی، بەڵام خوشک و برا مسوڵمانەکانت، لەگەڵیاندا زبرو گرژو مۆن و تەنگ و تاڵ بی، بە تەئکید ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری ﷺ و، بەندە پەسندەکانی خۆی پێ وەسف کردوون.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو بەندە چاکانە بگێڕێ، ئەوەی کە خوا لە قورئاندا فەرموویەتی بۆ ئەهلی ئیمان، خۆمان بەو سیفەتانە بڕازێنینەوەو، خۆمان بپارێزین لە پێچەوانەی ئەو سیفەتانە، کە بەداخەوە، ئێستا زۆرێک

لـەو خەڵکانـەی خۆیـان بـە شـوێنکەوتووی پێشـینی چـاک و پابەنـدی قورئـان و سـوننەت و، پارێـزەری ئیسـلام و مسـوڵمانان دەزانـن، ئـەو سـیفەتە خراپانەیـان لـە خۆیانـدا هێناوەتـە دی و، سـیفەتەکانیان لـە خۆیانـدا پێچەوانـەوە کردوونـەوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەراوردێکی لێوان ژیانی دنیای بێبڕوایان و، پاداشتی بەهەشتی بڕواداران و، باسی دەستخەڕۆیی و بێ ئاکامیی جگە لە خوا پەرستان لە ڕۆژی دوایی داو، دەم بوونە تەڵەی تەقیو و هیچ پێ نەگوترانیان، لە کاتی پرسیارلێکران و سەرزەنشتکرانیان دا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَاۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و دوو برگەدا:

**١)- ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا﴾، ئەی مرۆڤەکان! کە نە یارو ناحەزی پەیام و بەرنامەی خوان و، تەنیا بڕواتان بە ژیانی دنیا هەیە: هەر شتێک کە پێتاندراوە، لە دنیادا، هەمووی بەهرەمەند بوونێکی ژیانی دنیاو جوانیی و ڕازاوەییەتی.**

کە دەفەرموێ: ﴿مِّن شَيْءٍ﴾، هەر شتێک، واتە: هەر شتێک کەم بێ یان زۆر بێ، کە پێتاندراوە، هەمووی هەر دەچێتەوە چوارچێوەی: ﴿فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا﴾، هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ﴾، بەپێی سیاق دەزانرێ، یانی: ئەو شتانەی مرۆڤ لێیان بەهرەمەندو سوودمەند دەبێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَا ﴾، ئـەوە بەهرەمەنـد بوونێکـی کەمـی ژیانـی دنیایـە و، جوانیـی و ڕازاوەیـی ژیانـی دنیایـە، مەبەسـت لـەم تەعبیـرە بیرخسـتنەوەیانە، بیرخسـتنەوەی ئـەو ڕاسـتییەیە کـە نـاز و نیعمەتـی ژیانـی ڕۆژی دوایـی، لەگـەڵ هـی دنیـادا، ناخرێتـە تـەرازووەوە، بـۆ ئـەوەی وانەزانـن کـە ژیـانی دنیـا تاکـە ئامانجێکـە دەبـێ مـرۆڤ هەوڵـی بـۆ بـدات، (متاع) بـە مانـای بەهرەمەنـد بوونێکـی کـەم دێ، بەهرەمەنـد بوونێکـی کاتیـی، (مَتَاع: مَا يُنْتَفَعُ بِهِ زَمَنَاً ثُمَّ يَـزُولُ)، (متـاع) شـتێکە مـرۆڤ ماوەیەکـی کـەم لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ، دوایـی دەڕواو نامێنێتـەوە.

(وَزِينَتُهَا) جوانیـی و ڕازاوەیـی ژیانـی دنیایـە، (الزِّينَـةُ: مَا يُحَسِّنُ الأَجْسَـام)، (زينة) هـەر شـتێکە جەسـتەکان، ڕواڵەتـی مـرۆڤ دەڕازێنێتەوەو جوانـی دەکات.

٢)- ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾، ئەوەی لە لای خوایە باشترە و، ماوەتریشە، زیاتریش دەمێنێتەوە.

﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئـەوەی لـە لای خوایـە، ئـەوە هەمـوو شـتێک دەگرێتـەوە، چونکـە ئـەوەی لـە لای خوایـە، مەبەسـت پێـی نـاز و نیعمەتەکانـی ڕۆژی دواییـە، کـە نـاز و نیعمەتەکانـی ڕۆژی دوایـی، وەک هـی دنیـا نیـن، هـەر کەسـە بەپێـی هـەوڵ و کۆششـی خـۆی کـە لـە دنیـادا دەیـدا، شـتێکی دێتـە دەسـت، بـەڵام لـە ڕۆژی دوایـی دا، هەمـوو ئـەو شـتانە لـە لای خـوان ﷻ و، کەسـێک لـە دنیـادا شـتێکی نەکردبـێ و کۆششـێکی نەکردبـێ، لـەوێ هەوڵـی بـۆ نـادرێ و هیچـی دەسـتگیر نابـێ، لـەوێ هەمـوو شـتێک لـە ژێـر ڕکێـف و دەسـتەڵاتی ڕاسـتەوخۆی خـوای بـەرزو مـەزن دایـە.

٣)- ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن؟ خوێندراویشەتەوە: (أَفَلا يَعْقِلُون) بە شێوەی نادیار، ئایا نافامن؟ ئەی ئەوانەی باوەش بە ژیانی دنیادا دەکەن و، بەهۆی زرق و برقی ژیانی دنیاو ڕابواردنی کورت و کەمی ژیانی دنیاوە، بێبڕوا دەبن بە پەیامی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ!!

ئنجا خوا ﷻ بەراوردێک دەکات لە نێوان کەسانێکدا کە بەتەمای دیداری خوان و، لە ڕۆژی دوایی دا خوا ﷻ ڕێز و حورمەتیان لێ دەنێ و، پاداشتیان دەداتەوەو، کەسانێک کە تەنیا بەهرەی ژیانی دنیایان هەیە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت دا، ئامادە دەکرێن بۆ سزا و، ساز دەکرێن بۆ دۆزەخ، دەفەرموێ:

٤)- ﴿ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ ﴾، ئایا کەسێک کە بەڵێنێکی باشمان پێداوە، ئنجا بە دڵنیایی ئەو تووشیشی دێ، دەگات بەو بەڵێنە چاکە کە پێیدراوە، کە مەبەست پێی بڕوادارانە، یانی: ئایا ئەو بڕوادارانەی کە بەڵێنێکی باشمان پێداون کە بەهەشتە، هەر کامێکیان پێشی دەگات، (ف) یان: بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)ە، واتە: بە خێرایی پێی دەگات، دوای ئەوەی ڕووحی لە جەستەی جیا دەبێتەوە، یاخود: بۆ بادانەوە (عطف)یە، وەک هۆکارێک، واتە: سەرەنجام بەو بەڵێنە چاکەی خوا دەگات.

٥)- ﴿كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئایا کەسێک کە ئاوایە، وەک کەسێک وایە کە بەهرەمەندمان کردوە لە ڕابواردنی کەمی ژیانی دنیا؟ (مَن)ی (كَمَن) بۆ کۆیەو مەبەست پێی بێبڕوایەکانە و، لە هەمان کاتدا (مَنْ) بۆ پرسیار کردنیشە، یانی: ئایا کەسێک کە خوا ﷻ بەڵێنێکی باشی پێداوە و، ئەو بەڵێنەشی بۆ دێنێتە دی بە دڵنیایی، وەک کەسێک وایە کە بەهرەمەند کراوە لە ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیادا؟ یانی: بە تەئکید وەک یەک نین، ئەمە پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، بە دڵنیایی ئەو دووانە وەک یەک نین، وەک ئەوە وایە بڵێی: ئایا تاریکیی و ڕووناکیی وەک یەکن؟ چاوەڕێ ناکەی یەکێک بڵێ: بەڵێ، چونکە وەڵامەکەی دیارە.

٦)- ﴿ ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴾، ئەو کەسە، کە لە ژیانی دنیادا بەهرەمەند کراوە لە ڕابواردنێکی کەمی دنیا، بەڵام دوایی لەڕۆژی هەڵسانەوەدا، لە ئامادەکراوانە، (مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ) واتە: لەوانەی کە ئامادە دەکرێن، بە دڵنیایی بۆ سزا و، بۆ دۆزەخ ئامادە دەکرێن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر پێشاندانی هەندێک دیمەن لە ڕۆژی دوای دا، بۆ ئەوانەی کە بێبڕوان، حاڵیان چۆن دەبێ، حاڵ و باڵیان چی لێ دێ، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ ﴾، ئەم (و)ە بۆ یادانەوە (عطف)یە، بۆ سەر ڕستە پێشووەکان: ئەو ڕۆژە کە بانگیان دەکات (یانی: خوا ﷻ بانگیان دەکات)، ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە.

٨)- ﴿ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، خوا دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەم کە ئێوە پێتان وابوو (هاوبەشی منن) و، هاوبەشتان دەکردن لە بەندایەتیی بۆ کردن و پەرستاندا، ﴿ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ﴾، کوان ئەو هاوبەشانەم، کە بە ڕواڵەت پرسیارکردنە لە شوێنەکەیان، شوێنەکەیان لە کوێیە؟ کوان لە کوێن؟ بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست پێی نکووڵییکردنە لە بوونیان، یانی: هەر بوونیان نیە، ئەگەر تۆ بە کەسێک بڵێی: کوا فڵانکەس کە پێت وابوو هەیە، لە کوێیە؟ یانی: هەر نیە، چونکە وشەی (زَعْم) بریتیە لە قسەیەک کە گومانی درۆی لێ بکرێ، یانی: ئەوانەی کە پێتان وابوو هەن، بەڵام بە هەڵەدا چوو بوون.

٩)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ ﴾، ئەوانەی کە قسەیان لەسەر هاتۆتە دی، یانی: سزای خوایان لەسەر هاتۆتە دی، بەڵام بە (ٱلْقَوْلُ) تەعبیری لێکراوە، لەبەر ئەوەی بڕیارەکان بەپێی ئەوە کە ئێمە پێی ئاشناین، بە قسە دەدرێن، بە نووسین و بە بێژە، ئەو بڕیارانەی کە بۆ سزا دەدرێن، دەنووسرێن و دەبێژرێن، دوایی لە سزادا بەرجەستە دەبن.

یاخود: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ ﴾، ئەوانەی ئەو قسەیان لەسەر پێویست بوو، کە دوایی دێ، گوتیان:

١٠)- ﴿ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ ﴾، پەروەردگارمان! ئا ئەوانەی کە ئێمە گومڕامان کردبوون، ئەوانەی ئێمە سەرگەردان و بێمرادو بێ ئاکاممان کردبوون.

١١)- ﴿ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ﴾، ئێمە ئەوانمان بێ ئاکاممان کرد، وەک چۆن خۆشمان بێمرادو بێ ئاکام بووین.

﴿كَمَا غَوَيْنَا﴾، وەک چۆن خۆمـان بێئـاكام و بـێ ئامانـج بوویـن، واتـە: وەک چۆن ئێمـە بـە ویسـتی خۆمـان، کاتـی خۆی بێئـاکام و سـەرگەردان بـوو بووین، ئەوانەشـمان کـە بێمـرادو سـەرگەردان کـرد، ئەوانـەش بەویسـتی خۆیـان شـوێنمان کەوتـن، یانـی: بێئـاکام و بێمـراد بوونەکـەی ئەوانیـش، هـەروەک بـێ ئـاكام و بێمـراد بوونەکـەی ئێمەیـە، کـە کاتـی خـۆی ئێمـە بەویسـتی خۆمـان ئـەو ڕێیەمـان هەڵبژاردبـوو، ئەوانیـش بـە هەمـان شـێوە، بەڵـێ ئێمـە هـۆکار بوویـن، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا بـە ویسـتی خۆیـان شـوێنمانکەوتن، یانـی: (كَمَا أَنَّ غَوَايَتَنَا كَانَت بِإِرَادَتِنا وَفِعلِنَا، وَكَذلِكَ غَوَايَتُهُم كَانَت بِإِرَادَتِهِم)، هـەروەک چـۆن بێمـراد بـوون و سـەرگەردان بوونەکـەی ئێمـە بـە ویسـتی خۆمـان و کـرداری خۆمـان بـوو، ئەوانیـش هـەر بەویسـتی خۆیـان بـوو و بـە کـردەوەی خۆشـیان بـوو.

١٢)- ﴿تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ﴾، ئێمە دووریی لەوان دەکەین بۆ لای تۆ، (التَّبَرُّءُ: التَّفَعُّلُ مِنَ البَرَاءَةِ وَهِيَ الإنْتِفَاءُ)، (تَبَرُّء) لەسەر کێشی (تَفَعُّل) بریتیە لە (بَرَاءَة) کە بریتیە لەوەی مرۆڤ دووریی بکات و، شتێک لا بەرێ، یانی: پەیوەندیی کەسێک بە خۆیەوە نەفیی بکات، یان پەیوەندیی خۆی بەوەوە نەفیی بکات، یانی: ئێمە لەوان دوورین و، ئەوانیش لە ئێمەوە دوورن.

١٣)- ﴿مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ﴾، ئەوانە ئێمەیان نەدەپەرست، یانی: ئەوانە کە هاوبەشیان بۆ تۆ دادەنا، ئەوە نەبوو کە ئێمە بپەرستن و بۆ ئێمە ملکەچ بن، بەڵکو ملکەچی هەوا و ئارەزوو و بۆچوونەکانی خۆیان بوون، ئنجا ئەمە وەک فەرمایشتی خوایە کە لە سوورەتی (یونس)دا، دەفەرمویٚ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَـٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: یاد بکەوە! ئەو ڕۆژەی هەموویان کۆ دەکەینەوە، دوایی بەوانەی کە هاوبەشیان دانابوو، دەڵێین: ئنجا خۆتان و هاوبەشەکانتان لە جێی خۆتان بوەستن، لێکمان جیاکردنەوەو، هاوبەشەکانیان

(ئەوانەی کە بە خەیاڵی خۆیان کردبوویانن بە هاوبەشی خوا)، گوتیان: ئێوە ئێمەتان نەدەپەرست، خوا ﷻ بەسە کە شایەد بێ لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، بێگومان ئێمە لە پەرستنی ئێوە بێ ئاگا بووین.

ئنجا ئەوە ئەگەر دارو بەردو، بت و سەنەمەکان بن، ئەوە دیارە کە بێئاگا بوون و، ئەگەر پێغەمبەران و فریشتەکان و، زانایان و پێشەوایانێک بووبن، کە ڕازیی نەبوون، دیارە بێئاگا بوون لەوە کە دەیانپەرستن، چونکە بە قسەو ئاراستەی وان نەبووە.

١٤)- ﴿ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ﴾، پێیان گوترا: هاوبەشەکانتان بانگ بکەن، ئەوانەی کە بە خەیاڵی خۆتان هاوبەشی خوا بوون.

١٥)- ﴿ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ ﴾، ئەوانیش بانگیان کردن، بەڵام وەڵامیان نەدانەوە.

١٦)- ﴿ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ﴾، سزا و ئازاریان بینی، دۆزەخیان بینی و بۆیان بەرجەستە بوو.

١٧)- ﴿ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴾، واتە: (وَدُّوا لَو أَنَّهُم كَانُوا يَهْتَدُون) خۆزگەیان دەخواست، بریایان دەخواست، ئەگەر ڕێی ڕاستیان گرتبایە، یاخود: ﴿ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴾، سزای سەختیان بینی، ئەگەر لە دنیادا ڕێی ڕاستیان گرتبایە، بە چاوی عەقڵ و دڵ دەیانبینی کە، ئەگەر ڕێی کوفرو شیرک بگرن، دۆزەخ چاوەڕێیان دەکات، واتە: ئەم (وَرَأَوُاْ) لەسەر واتای یەکەم: دیتنی چاوە، بە چاوی سەر لە قیامەت دا دۆزەخیان بینی و، خۆزگەیان خواست کە ڕێی ڕاستیان گرتبایە، بە پێی واتای دووەم: ﴿ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴾، بە چاوی عەقڵ و دڵ سزای دۆزەخیان بینی لە دنیادا، یانی: ئەگەر لە دنیادا ڕێی ڕاستییان گرتبایە، بە چاوی عەقڵ و دڵ، دەیانزانی کە لە ئەنجامی کوفرو شیرکدا، ئەوە دۆزەخ چاوەڕێیانە.

١٨)- ﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ ﴾، ئنجا خوا ﷻ دیمەنێکی دیکە دەخاتە ڕوو، هەر لە دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە کە (خوا) بانگیان دەکات.

١٩)- ﴿ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، دەفەرموێ: چیتان وەڵامی ڕەوانەکراوان دایەوە؟ واتە: ڕەوانەکراوان و پێغەمبەرانی من کە هاتن بۆ لاتان، کوا وەڵامەکەتان چی بوو و چیتان پێ گوتن؟ چۆن مامەڵەتان لەگەڵدا کردن؟

٢٠)- ﴿ فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ ﴾، لەو ڕۆژەدا هەواڵەکان لە ئاستیاندا کوێر بوون، ﴿ فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ ﴾، بە چەند تەعبیرێک توێژەرەوانی قورئان ئەم ڕستەیان مانا کردوە: (**خَفِيَتْ عَلَيْهِمُ الأَقْوَالُ للإِجَابَة، عَمِيَت فَلَا تَهْتَدِي إِلَيْهِم، خَفِيَت إِلَيْهِم مَا يَحْتَجُونَ بِهِ**)،

١- لەو ڕۆژەدا ئەو قسانەی کە پێویستە، وەڵامی ئەو پرسیارەیان پێ بدرێتەوە، لێیان پەنهان بوون، نەیانزانی چی وەڵام بدەنەوەو زاریان بوو بە تەڵەی تەقیو.

٢- یاخود: هەواڵەکان، یان وەڵامەکان وەک کوێریان لێ هات، کە کوێر ناتوانێ بچێتە شوێنی مەبەست، ئەو وەڵامانەش نەیانتوانی بێنە لای ئەوان و، بێنە نێو هۆشدان (ذاكرة) و، بێنە سەر زمانیان.

٣- یاخود: لێیان پەنهان و شێردراوە بوو، ئەوەی کە دەبوو بە بەڵگە بیهێننەوە.

٢١)- ﴿ فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾، بۆیە لەیەکدی پرسیار ناکەن، یانی: لەو ڕۆژەدا داواش لە یەکدی ناکەن، ئەوە هیچ کە وەڵامیان پێ نیە، داواش لە یەکدی ناکەن، کە ئەرێ چی وەڵام بدەینەوەو چۆن وەڵام بدەینەوە؟ چونکە هەر کامێکیان دەزانێ ئەوی دیکە لە خۆی کۆڵەوارترو دەستەپاچەترە و، بێ قسەترو بێ وەڵامترە، لەبەردەم دادگای خوای دادگەردا، وەک دنیا نیە کە خەڵک بتوانێ درۆو دەلەسە بکات، خەڵک بتوانێ حاشا بکات، هەموو شتەکان لەوێ بەرجەستە دەبن، ﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ٩ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ١٠ ﴾الطارق، واتە: ئەو ڕۆژەی نهێنییەکان ئاشکرا دەبن، (هیچکەسێک) نە هێزێکی هەیە، نە یارمەتییدەرێکی هەیە.

٢٢)- ﴿ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ ﴾، ئنجا کەسێک کە گەڕاوەتەوەو، بڕوای هێناوە و، کردەوەی باشی کردوە، ئەوە نیزیکە ئەو

کەسە لەسەر فرازان بێ. کەواتە: ئەگەر دەتانەوێ لەوێ سەرفراز بن، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بڕوا بێنن و کردەوەی باش بکەن، ئەی ئەوانەی تاکو ئێستا لە خوا ﷻ دوور بوون، بێبڕوا بوون و، خاوەنی کردەوە خراپ بوون! چونکە لە ئەنجامی گەڕانەوە بۆ لای خوا و، بڕوا هێنان و کردەوەی باشدا، لەوێ سەرفرازیی و بە مراد گەیشتن نیزیکە کە بۆ مرۆڤ فەراهەم بێ و، دەستەبەر بێ، هی بابایەکی ئاواش لەوانەیەو نیزیکە، چ جای هی کەسێکی بێبڕوای دوور لە خوای کردار خراپ!!

**مەسەلەی چوارەم:**

**خستنە ڕووی چەند سیفەتێکی بەرز و مەزنی خوا ﷻ، وەک: دروستکردن و هەڵبژاردن و تەنیایی لە پەرستراندا، زانایی بە پەنهان و ئاشکراو، باڵا دەستیی ڕەها:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ اللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْحَمْدُ فِى الْأُولَىٰ وَالْآخِرَةِ وَلَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ﴾، پەروەردگارت ئەو زاتەیە کە هەر شتێکی بیەوێ دەیهێنێتە دی، دروستی دەکات، هیچی لەبەر عاسێ نابێ، ﴿ وَيَخْتَارُ ﴾، هەروەها هەر شتێکیشی بیەوێ لە هەر شتێکدا، دەتوانێ هەڵیبژێرێ و، گوڵبژێری بکات، یاخود: ﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾، پەروەردگارت هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، ﴿ وَيَخْتَارُ ﴾، یانی: (يَخْتَارُ مَا هُوَ خَيْرٌ لَكُم) ئەوەی کە بۆ ئێوە باشە بۆتان هەڵدەبژێرێ.

٢)- ﴿ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ ﴾، ئەوان (مرۆڤەکان) مافی هەڵبژاردنیان نیە لە بەرانبەر هەڵبژاردنی خوادا، بۆ وێنە: خوا ﷻ پێغەمبەرانی خۆی لە مرۆڤان ناردوون، بەڵام ئەوان داوایان دەکرد لە فریشتان بن، نەخێر! خوا کارزانە و کاربەجێیە، دەزانێ کە دەبێ ڕەوانەکراوی لای مرۆڤان لە مرۆڤان بن، پاشان کە خوا ﷻ پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، بەو شێوەیە، بەو سیفەتانەوە دروستکردوون، ئەوە هەڵبژاردنی خوایە، کە بەو شێوەیە هەڵیبژاردوون، نەک بەو شێوەیەی کافرەکان چاوەڕوانییان دەکرد، کە فڵانکەسی

زۆر ساماندارو، فڵانکەسی زۆر دەسەڵاتدارو، فڵانکەسی زۆر بە خزم و قەوم، نەخێر خوای پەروەردگار تەماشای مەعدەن و کەسایەتیی و سیفەتە دەروونییەکانی ئەو کەسانەی کردوە، کە بە پێغەمبەر هەڵیبژاردوون، نەک ماڵ و سامان و، خزم و قەوم و ئەوانە! یاخود مەبەست لە: ﴿مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ﴾، یانی: خوا ﷻ یاساکان هەڵدەبژێرێ، حوکمە شەرعییەکان: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، ئەوە چاکەو ئەوە خراپە، ئەوە ڕاستەو ئەوە چەوتە، ئەوان مافی هەڵبژاردنیان نیە، چونکە خوا ﷻ وەک چۆن تاکبووەوە(مُتَفَرِّد)یە، بە دروستکردن (خلق)، بەهەمان شێوە فەرمان (أمر)یش بەس لە لای ئەوە: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾الأعراف، واتە: ئاگاداربن! وەدیهێنان و فەرمان کردن تەنها هی ئەون...، بەس خوا ﷻ شایستەیی ئەوەی هەیەو ڕەوایەتیی ئەوەی هەیە، فەرمان بەسەر مرۆڤەکاندا بکات و، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاری بکات.

٣)- ﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا، لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی لە هەر تایبەتمەندییەکی دا.

٤)- ﴿وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ﴾، هەروەها پەروەردگارت دەزانێ ئەوەی سینەکانیان پەنهانی دەکەن، ئەوەی سینەکانیان پەنهانی دەکەن، وەک: ئەو شتانەی کە بۆ خوایان پێشنیار دەکردن، یاخود: ئەوەی کە پەنهانیان دەکرد لە دڵ و دەروونیان دا وەک: ڕەخنەگرتن لە خوا، ڕەخنەگرتن لە پێغەمبەران، ڕەخنەگرتن لە شەریعەتی خوا، لە حەرام و حەڵاڵی خوا، خوا ﷻ ئەوە دەزانێ کە لە سینەکانیاندا پەنهانی دەکەن، لە شتی خراپ.

٥)- ﴿وَمَا يُعْلِنُونَ﴾، هەروەها ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن، لە گوناهو تاوان و لادان، هەمووی دەزانێ وەک یەک.

٦)- ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ﴾، بەس ئەویش خوایە ﷻ، یاخود: هەروەها ئەو خوایە، هەڵبەتە: خوا بوونی خواش، کۆکەرەوەی تێکڕای ناووسیفەتە بەرزو بێ وێنەکانیەتی.

٧)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە.

٨)- ﴿لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾، ستاییش بەس بۆ ویە لە یەکەم و لە دوایەمیندا، واتە: لە ژیانی دنیادا، کە قۆناغی یەکەمی ژیانی مرۆڤەو، لە ڕۆژی دواییش دا، کە قۆناغی دواییەتی.

٩)- ﴿وَلَهُ ٱلْحُكْمُ﴾، بڕیاری ڕەها تەنیا بە دەست ئەوە.

١٠)- ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، بەس بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە، واتە: بۆ لای خوا ﷻ، یان بۆ لای بڕیارو حوکمی خوا، نەک بۆ لای کەسێکی دیکە، کەواتە: بۆ خۆتان باش وردببنەوە، بە چ چاو و ڕوویەک و، چۆن و بە چ پەرژێز و بەرهەمێکەوە، دێنەوە خزمەت خوا ﷻ؟! چونکە تەنیا بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوەو، هیچ بۆ لاگەڕاوە (مَرْجِع)یەکتان نیە، جگە لەو، هیچ کەسێکی دیکەی بۆ لا گەڕاوەتان نیە، کەس و شوێنی بۆ لا گەڕانەوەتان بەس ئەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**نیعمەتی بە دوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژ، تاکو لە یەکەمیان دا بخەون و بسرەون و، لە دووەمیان دا بجووڵێن و کارو کاسبیی بکەن، ئا ئەوە بەرجەستەکەری بەزەیی و بەخششی خوایە و، شایستەی سوپاسگوزاریی مرۆڤانە، چونکە دەگونجا هەر کام لە شەوگارو ڕۆژگار بەردەوام و نەپساوە بن، کە ئەو کاتە ئەو ژیانە ئاساییەی ئێستا دەیگوزەرێنین، زۆر بە زەحمەت دەکەوت، ئەگەر نەڵێین ژیان مەحاڵ دەبوو، چونکە ئەو کاتە نیوەی خڕۆکەی زەوی هەمیشە شەو دەبو و، نیوەشی هەمیشە ڕۆژ دەبو و، ئەو نیوەیەی کە هەمیشە شەو دەبوو، دەبوو بە بەستەڵەک و، ئەو نیوەیەی کە هەمیشە ڕۆژ دەبوو، دەبوو بە قەرەبرووت و دەسووتا، بەڵام خوا ﷻ وایکردوە لە ماوەی بیست و چوار (٢٤) سەعات دا، جارێک شەو و ڕۆژ بەسەر زەوی دا بێن، لە هەر تاوێکیشدا شوێنێکی زەوی شەوەو، بەرانبەرەکەشی ڕۆژە، شەو و ڕۆژ بە خێرایی بە دوای یەکدا دێن، وەک لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ:** ﴿ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾ ﴾، **خوا ﷻ بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشێ، بە خێرایی شوێنی دەکەوێ، هەڵبەتە ڕۆژگاریش بە خێرایی بەدوای شەوگار دەکەوێ، وەک یەکدی ڕاو بنێن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ﴾، بڵێ: پێم بڵێن، یاخود: ئایا بینیتان، بە چاوی سەر؟ یاخود ئایا دەزانن؟.

٢)- ﴿إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الَّيْلَ سَرْمَدًا﴾، ئەگەر خوا ﷻ شەوگارتان بۆ هەمیشەیی بکات، بەردەوام بکات، (السَّرْمَدُ: الدَّائِمُ الَّذي لا يَنْقَطِعُ مِنَ السَّرْدِ، وَهُوَ المُتَابَعَةُ، وَالأشْهُرُ الحَرَامُ ثَلاثَةٌ سَرْدٌ وَوَاحِدٌ فَرْدٌ)، (سَرْمَد) بە بەردەوامێک دەگوترێ کە نەبڕێ، لە (سَرْد)ەوە هاتوە، (سَرْد)یش بریتیە لە بەدوای یەک کەوتن، دەگوترێ: مانگە حەرامەکان (ثَلاثَةٌ سَرْدٌ، وَوَاحِدٌ فَرْدٌ)، سێیان بەدوای یەکدا دێن، کە: (ذو القَعْدَة وَذي الحِجَّة وَمُحَرَّم)ن و، یەکێکیشیان بە تەنیایە کە مانگی (رَجَب)ە.

٣)- ﴿إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾، هەتا ڕۆژی قیامەت، واتە: شەوگار هەموو کاتەکانی ژیانی دنیا بگرێتەوە، تاکو قۆناغی دیکە دێتە پێش، کە قۆناغی ڕۆژی دواییە.

ئنجا ئەگەر خوا ﷻ وایکردبایە:

٤)- ﴿مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ﴾، چ پەرستراوێک جگە لە خوا، ڕۆشنایی بۆ دەهێنان؟

(ضیاء)، یانی: ڕۆشنایی، لە (ضوء)ەوە هاتوە.

ئـەم پرسـیارە، پرسـیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیـە: ﴿مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ﴾، چ پەرسـتراوێک جگـە لـە خـوا ﷻ ڕۆشـنایی بـۆ دەهێنـان، ئەگـەر خـوا ﷻ هەمیشـە دنیـای لـێ تاریـک داهێنابانایـە؟

٥)- ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾، ئایا نابیستن؟ لەبەر ئەوەی کە لە شەوی تاریکدا، مرۆڤ تەنیا لە هەستەوەری بیستن بەهرەمەند دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾، ئایا ڕاستیی و هەق نابیستن، کە تەنیا خوا ﷻ وایکردوە، شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا بێن، ئنجا ئەگەر هەر شەوگار بووایە، کێ ڕۆژگارو ڕۆشنایی بۆ دەهێنان؟ بێگومان کەس.

٦)- ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ ﴾، بڵێ: پێم بڵێن، یاخود: ئایا دەبینن بە چاوی عەقڵ و دڵ، یان بە چاوی سەر.

٧)- ﴿ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، ئەگەر خوا ﷻ ڕۆژگاری بۆ بەردەوام کردبانایە، تاکو ڕۆژی هەڵسانەوە، تاکو ڕۆژی دوایی.

٨)- ﴿ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٖ تَسۡكُنُونَ فِيهِ ﴾، چ پەرستراوێک جگە لە خوا ﷻ، شەوگاری بۆ دەهێنان، کە تێیدا ئۆقرە بگرن، تێیدا بخەون و پشوو بدەن، دوای ماندووبوونی ڕۆژ، بەهۆی کارو کاسبیی و گەڕان و سووڕانەوە؟

٩)- ﴿ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴾، ئایا نابینن؟ لەبەر ئەوەی لە ڕۆژدا، مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێی هەستەوەری دیتنەوە، مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکات، بۆیە فەرموویەتی: ئایا نابینن؟ ئایا هەق نابینن؟ کە ئەوە خوایە ﷻ بەو شێوەیە مشووری لێ خواردوون، شەو و ڕۆژان بە دوای یەکدا دێنێ، کە بە هاوکۆ (مُعَدَّل)یی دابەش دەبن بۆ دوازدە (١٢) سەعات، بە دوازدە (١٢) سەعات، کورت و درێژیی کەم و زۆرییشیان دەبێ بە پێی جیاوازیی جوگرافیی ناوچەکانی زەوی لە (١٦ - ٨)، تاکو (٢٠ – ٤) و زیاتریش.

١٠)- ﴿ وَمِن رَّحۡمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، خوا ﷻ لە بەزەیی خۆیەوە، شەوگارو ڕۆژگاری وا بۆ هەڵخستوون، کە تێیدا بسرەون و ئۆقرە بگرن و لەبەخششی ویش بخوازن (کارو کاسبیی بکەن).

﴿ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، کە تێیدا ئارام بگرن و، تێیدا لە بەخششی خوا ﷻ داوا بکەن، ﴿ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ ﴾، واتە: لە شەوەکەیدا پشوو بدەن، ئارام بگرن، بخەون، ﴿ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، لە ڕۆژەکەشدا لە بەخششی خوا داوا بکەن.

١١)- ﴿ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾، هەروەها بەڵکو سوپاسگوزارییش بکەن بۆ خوا، بۆیە وای بۆ لێکردوون.

لێرەدا کە خوای پەروەردگار شەوو ڕۆژ هەردووکیان پێکەوە هێناون، لەبەر ئەوەیە کە دەشگونجێ کەسانێک لە شەوگاردا کاسبیی بکەن و، لە ڕۆژگاردا بخەون، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِ ﴾، یانی: هەم لە شەوگارو هەم لە ڕۆژگاردا، لەو کاتەدا کە دابەش دەبێ بۆ شەو و ڕۆژ، دەتوانن تێیاندا بخەون و پشوو بدەن و، دەشتوانن تێیاندا کارو کاسبیی بکەن و، لە بەخششی خوا داوا بکەن.

ئەمەش دەگێردرێتەوە سەر ئەو نیعمەت و چاکەیەی: بەزەیی خوا ﷻ بەرانبەر بە خەڵک.

جاری دیکەش باسمان کردوە: ئەو نیعمەتی شەو و ڕۆژە، کە لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆی لە بەرانبەر خۆردا پەیدادەبێ، یانی: زەوی بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، لە بەرانبەر خۆرداو، ئەو ڕووەی دەکەوێتە لای خۆر، دەبێتە ڕۆژگارو، پشتەوەشی دەبێتە شەوگار، ئنجا ئەگەر زەوی بە دەوری خۆیدا نەخولابایەوە، کە زەوی بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە دەقەیەکدا، بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە لە بەرانبەر خۆردا، شەوو ڕۆژ پەیدانەدەبوون، هەروەها بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەسووڕێتەوە بە دەوری خۆردا، واتە: شەست (٦٠) هێندەی خێرایی خولانەوەی بەدەوری خۆیدا، بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوەو، ئەوەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی کەشەکانی ساڵ.

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:**

**خستنە ڕووی دیمەنێکی سامناکی قیامەت، کە کافرەکان لە بەرانبەر بەڵگە و ئیسپاتی ئیماندا، سەراسیمە و بێ قسە دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ ﴾، ئەو ڕۆژە کە بانگیان دەکات، هەڵبەتە: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ ﴾، لەم چەند ئایەتانەدا سێ جاران دووبارەبۆتەوە، لەبەر ئەوەی دووبارە کردنەوەی مەبەستێک، زیاتر دەیچەسپێنێ لە مێشکدا، ئنجا لێرەدا مەبەست سەرزەنشت کردنی بێبڕوایەکانە، بۆیە پێویستە جار لە دوای جار، سەرزەنشت بکرێن و نوقرچکەیان لێ بدرێ، بەڵکو بەخەبەر بێن و بێدارببنەوە، کە ئەگەر بێت و بڕوا نەهێنن، ئەوە ڕۆژێکی ئاوا کە ئەو هەموو سەرزەنشت و لۆمە و سەرکۆنەیە، ڕوویان تێدەکات، بۆیان دێتە پێش.**

**٢)- ﴿ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾، دەفەرموێ: کوان ئەو هاوبەشانەتان، کە پێتان وابوو، پێتان وابوو هاوبەشن، لە خەیاڵی خۆتاندا، پێشێ وەڵامەکەیان دایەوە: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾، لەوێ وەڵامیان دایەوە: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَـٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾، ئنجا لێرە وەڵامەکەی نەداوەتەوەو ئیکتیفا کراوە بە وەڵامی پێشێ، واتە: هیچ وەڵامێکیان نیە، ئەوە نەبێ کە دان بەوەدا بێنن: ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون، بە ویستی خۆیان گومڕاو سەرگەردان و، بێمراد بوون، وەک چۆن سەرکردەکانیش هەر بەویستی خۆیان، ئەو ڕێیە چەوتەیان گرتۆتە بەر.**

٣)- ﴿ وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ﴾، لە هەر کۆمەڵێک شایەدێکمان داڕنی، شایەدێکمان وەرگرت، (**النَّزْعُ: جَذْبُ الشَّيْءِ مِنْ بَيْنِ مَا هُوَ مُخْتَلَطٌ بِهِ، وَاسْتُعِيرَ هُنَا لِإِخْرَاجِ بَعْضٍ مِنْ جَمَاعَةٍ**)، (نَزْعُ) بریتیە لە داڕنینی شتێک، لە کۆمەڵە شتێک کە لەگەڵیاندا تێکەڵە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ دەرهێنانی هەندێک کەس لە کۆمەڵێک، لە هەر کۆمەڵێک شایەدێکیان لێدێنین.

٤)- ﴿ فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ ﴾، پێمان گوتن: بەڵگەتان بێنن، (هَاتُواْ)، ناوی کردار (اسم فعل)ە، لێرەدا (هێنان) خوازراوەتەوە بۆ دەرخستنی بەڵگە، ﴿ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ ﴾، واتە: بەڵگەکەتان دەربخەن.

٥)- ﴿ فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ ﴾، ئنجا بۆیان دەرکەوت کە هەق هەمووی هی خوایە ﷻ، واتە: بۆیان دەرکەوت کە لە دنیادا بەهەڵەدا چوو بوون و کڵاویان لەسەرنرابوو، یاخود خۆیان بە هەڵەدا برد بوو.

٦)- ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾، ئەوەی کە هەڵیان دەبەست، (لە هاوبەش بۆ خوا دانان، لە کوفر، لەو بیرۆکە پووچ و بێ بنەمایانە)، هەموویان لێ ون بوو.

لێرەدا ئامادە نەبوونی شتێک لە عەقڵ و هۆشیاندا، کە وەڵام بدەنەوە، وشەی (وَضَلَّ)ی بۆ خوازراوەتەوە، واتە: لێیان ون بوو، یانی: ئەصڵەن وەڵامەکە نەبوو، ئنجا وەک هەبووبێ و لێیان ون بووبێ.

﴿ مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾، ئەوەی کە هەڵیان دەبەست لە درۆ و دەلەسە، کە ئەو پەرستراوانەی ئەوان، هاوبەشی خوان و لە ڕۆژی دوایی دا شتێکیان بەدەستەو تکا (شفاعة)یان بۆ دەکەن!

بەو شێوەیە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ئەو دیمەنانەی ڕۆژی دوایی دەخاتە بەرچاوی ئێمە، کە ئەگەر کافرەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، جگە لە خواپەرستان، نەگەڕێنەوە، ئەوە لەو دیمەنانەدا خۆیان دەبیننەوەو، بەو شێوەیە

جگـە لـە عەیبداریـی و، جگـە لـە زار بوونـە تەڵـەی تەقیـوو، بـێ وەڵام بـوون و دان بـە هەڵـەی خـۆ داهێنـان، شـتێکی دیکەیـان بـۆ نامێنێتـەوە، خـوا ﷻ لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە لـە ڕۆژی دوایـی دا سـەر بـەرز و سـەرفراز دەبـن و، بـە زمانێکـی ڕەوان و گۆیـا وەڵامـی پرسـیارەکان دەدەنـەوە، لـە خزمـەت خـوای پـەروەردگاردا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان حـەوت (٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٧٦ - ٨٢)، کـە تێیانـدا بەسـەرهاتی قـاڕوون گێڕراوەتـەوە، کـە لـە هەمـوو قورئانـدا بەسـەرهاتی قـاڕوون، تەنیـا لێـرەدا هاتـوە، بـەڵام لـە چەنـد شـوێنێکدا باسـی قـاڕوون کـراوە، وەک ناوهێنـان لەگـەڵ فیرعـەون و هامانـدا.

شـایانی باسیشـە: قـاڕوون هـەر لـە گەلـی مووسـا (نـەوەی ئیسـرائیل) بـووە، بـەڵام لێیـان هەڵگەڕاوەتـەوەو، پشـتی فیرعەونـی گرتـوە، لـە بەرانبـەر گەلـە هـەژارو سـتەم دیدەکـەی خۆیـدا، بەهـۆی ئـەو پـارە و سـامان و، تەماعـە حـەرام و خراپـەوە، کـە لـە پەنـای فیرعـەون دا کـۆی کردۆتـەوەو وەسـەرێکی نـاوە، وەک چـۆن هەندێـک لـەو دەوڵەمەنـدە مشـەخۆرانەی لـە پەنـای دەسـتەڵاتدارانی ئـەم ڕۆژگارەشـدا، خۆیـان دەوڵەمەنـد دەکـەن، بـە پـارەی حـەرام و، بـە گەندەڵیـی و پۆخەڵیـی و، لەگـەڵ دەسـتەڵاتدارە خۆسـەپێنەکاندا دەبنـە شـەریکە دز.

﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا

يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی قاروون لە گەلی مووسا بوو، کەچی لێیان یاخی بوو( و ستەمی لێکردن)، لە حاڵێکدا کە هێندەشمان ماڵ و سامانی پەزمەندە کراو دابۆیە، کە کۆمەڵێکی بەهێز بە فورسیی (بە زەحمەت) کلیلەکانییان بۆ هەڵدەگیران، (کاتێک لێیان یاخیی بوو) کە گەلەکەی پێیان گوت: زۆر دڵخۆش مەبە (بەو ماڵ سامانەت)، بێگومان خوا زۆر دڵخۆشان (ی بە ماڵ و سامان)ی خۆشناوێن ﴿٧٦﴾ مەنزڵگای دوارۆژیش بخوازە، لەمیانی بەهرەمەند بوون لەوەدا کە خوا پێیداوی و، بەشی خۆشت لە (ژیانی) دنیا لەبیرمەکە و، وەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ کردووی، تۆش چاکە (لەگەڵ خەڵکی دا) بکە و (چاوت لە تێکدان نەبێ و)، خراپەکاریی لە زەویدا مەخوازە، بێگومان خوا (چارەی) تێکدەرانی ناوێ ﴿٧٧﴾ (قارون) گوتی: مسۆگەر ماڵ و سامانەکەمم بە هۆی زانیارییەکەوە کە لەلامە، هاتۆتە دەستم، ئایا (قارون) نازانێ کە خوا ﷻ لە پێش ویدا چەند سەدەیەکی فەوتاندوون؟ کە لەوی هێزیان توندترو، سامانی کۆکراوەشیان پتر بووە و، تاوانبارانیش (لە ڕۆژی دواییدا) لە بارەی گوناهەکانیانەوە، لێیان ناپرسرێ، (چونکە هەموو شتێک تۆمار کراوە) ﴿٧٨﴾ ئنجا (قارون، بە ڕازاوەیی تەواوی و) لە زرق و برق و جوان و بەرچاویدا خۆی بۆ گەلەکەی ڕانواند (وەک شانازی بەسەردا کردن)، ئەوانەی ژیانی دنیایان گەرەکە، گوتیان: ئەی خۆزگە وەک ئەوەی بە قارون دراوە، هەمان بووایە، بەڕاستیی ئەو خاوەن بەشێکی مەزنە!

﴿٧٩﴾ ئەوانـەش کـە زانیارییـان پێـدراوە گوتیـان: هـاوار بـۆ ئێـوە، پاداشـتی خـوا (لـە ڕۆژی دوایـیدا) بـۆ ئـەوەی بـڕوای هێنـاوە و کـردەوەی چـاک دەکات (زۆر لـەوە) باشـترە و، تەنیـا بـە خۆڕاگرانیـش دەدرێ ﴿٨٠﴾ سـەرەنجام خـۆی و خانووەکەیـمان بـە زەویـدا ڕۆبـردن، ئنجـا هیـچ کۆمەڵێکـی نەبـوو لـە بەرانبـەر (سـزای) خـوادا سـەری بخـەن و، خۆیشـی (توانـای نەبـوو) لەسـەرکەوتووان نەبـوو ﴿٨١﴾ ئەوانـەش کـە دوێنـێ خۆزگەیـان بـە شـوێنەکەی دەخواسـت، وایـان لێهـات دەیانگـوت: ئایـا دەزانـی خـوا بژێـو بـۆ هـەر کام لـە بەندەکانـی کـە بیـەوێ زۆرو فـراوان دەکات و (بـۆ هـەر کامیشـیان بیـەوێ) کـەم و بەرتەسـک دەکات! ئەگـەر خـوا چاکـەی لەگـەڵ نەکردبایـن (کـە خۆزگەکەمانـی نەهێنایـە دی) ئێمەشـی (بەزەویـدا) ڕۆدەبـرد، ئایـا دەزانـی بێبڕوایـان سـەرفراز نابـن! ﴿٨٢﴾}.

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡكُنُوزِ): الكنـوز: جمـع كنـز، (الكَنْـز: جَمْـعُ المَـالِ بَعْضُـهُ عَـلَى بَعْـضٍ وَحِفْظُـهُ)، (کَنْـز) بریتیـە لـەوە کـە سـەروەت و سـامان کۆبکرێتـەوە بـۆ سـەر یـەک و، بپارێـزرێ، پەزمەنـدە بکـرێ.

(مَفَاتِحَهُۥ): (مَفَاتِـح وَمَفَاتِيـح: جَمْـعُ مِفْتَـح وَمِفْتَـاح)، (مَفَاتِـح) و (مفَاتِيـح) کـۆی (مِفْتَـح) و (مِفْتَـاح)ن، هەردووکیـان بـە مانـای: (کلیـل)ن.

(لَتَنُوٓأُ): یانـی: (لَتَثْقُـلُ)، (تَنُـوءُ: تَثْقُـلُ، تَثْقُـلُ مَـعَ العُصْبَـةِ)، واتـە: کۆمەڵـە پیاوێکـی بەهێزیـش بۆیـان قـورس دەبـوو، کلیلـی خەزنـە و عەمبارەکانـی قـاڕوون، کـە پـارە و سامانی تێـدا کۆکردبـۆوە، هەڵبگـرن.

(بِٱلۡعُصۡبَةِ): (العُصْبَـةُ: الجَمَاعَـةُ مِـنْ عَـشْرَةٍ إلى خَمْسَـةَ عَـشْرَةَ)، (عُصْبَـة) زانایـان ڕاجیاییـان تێدایـە: هەندێکیـان گوتوویانـە: لـە دەوە تاکـو پـازدە (١٠ - ١٥)یـە، هەندێکـی دیکـە گوتوویانـە: لـە سـێوە تاکـو نـۆ (٣ - ٩)یـە.

(لَا تَفۡرَحۡ): (**الفَرَحُ: أَشَدُّ السُّرُور**)، (**فَرَح**) بریتیە لە زۆر دڵخۆش بوون، (**الفَرَحُ: انْشِرَاحُ الصَّدْرِ بِلَذَّةٍ عَاجِلَة**)، (**فَرَح**) بریتیە لە سینە گوشادبوون بە خۆشیی و ڕابواردنێکی بە پەلەی دنیا. (حَظٍّ): (**الحَظُّ: النَّصِيبُ المُقَدَّر**) بەشێک کە ئەندازەگیریی کراوە، (**وَقَدْ حَظِظْتُ وَحُظِظْتُ فَأَنَا مَحْظُوظ**)، لە زمانی عەرەبییدا وا دەگوترێ: (**حَظِظْتُ وَحُظِظْتُ**) واتە: بەختەوەر بووم و بەختەوەرکرام، (**فَأَنَا مَحْظُوظ**) من خاوەن پشک و بەشم، بەختەوەرم.

(فَخَسَفۡنَا): (**خَسَفَهُ اللهُ وَخَسَفَ هُوَ: ذَهَبَ وَسَاخَ**)، (**خَسَفَ**) هەم بە تێپەڕکەر (**مُتَعَدِّي**) دێ، وەک: (**خَسَفَهُ الله**)، هەم بە لازمییش دێ، وەک: (**خَسَفَ هُوَ**) یانی: بۆ خۆی بە زەویدا ڕۆچوو، (**ذَهَبَ وَسَاخَ**) ڕۆیشت و بە زەویدا چووە خوار.

(وَيۡكَأَنَّ): (**وَي: كَلِمَةٌ تُذْكَرُ لِلتَّحَسُّرِ وَالتَّنَدُّمِ وَالتَّعَجُّبِ: وَي لِعَبْدِ اللهِ، وَيْكَ: وَوَيلَكَ، وَيْكَأَنَّ: الطَّبَرِي، أَلَم تَرَ، أَلَم تَعْلَم**)، وشەی (**وَي**) وشەیەکە بەکاردەهێنرێ بۆ خەفەت خواردن و، پەشێمانیی و، سەرسوڕمان، دەگوترێ: (**وَي لِعَبْدِ اللهِ**) ئای بۆ (عبداللە)!، واتە: پەشێمان بێتەوە، یاخود سەرسوڕمانم بۆ وی هەیە، هەروەها جاری واش هەیە پیتی کاف (ک)ی دەخرێتە سەر (**وَيْكَ، وَيلَكَ**)، (**الطَّبَرِي**) وای لێکداوەتەوە کە (**وَيْكَأَنَّ**) واتە: ئایا نابینی؟ ئایا نازانی؟ هەڵبەتە لە بارەی شیکردنەوەی ئەو وشەیەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، کە دوایی قسەی لێ دەکەین.

(يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ): واتە: ڕۆزیی و بژێو فراوان دەکات، (**بَسْطُ الشَّيءِ: نَشْرُهُ وَتَوْسِيعُهُ**)، شتێک کە بڵاوبکرێتەوەو فراوان بکرێ، وشەی (**بَسْط**)ی بۆ بەکاردێ.

(وَيَقۡدِرُ): (**أَي: يُضَيِّقُ، يُقَلِّلُ**) تەنگ دەکات و، کەم دەکات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئـەم حـەوت (٧) ئایەتـە موبارەکـە، وەک پێشـتریش گوتمـان، بەسـەرهاتی قـارووون دەگرنـە خۆیـان، خـوا ﷻ لێـرەدا کـە بەسـەرهاتی قـارووون دەگێڕێتـەوە، بـەڕای بەنـدە کۆمەڵێـک ئامانجـی لـە پشـتەوە هـەن:

١)- یەک لە ئامانجەکان ئەوەیە کە خوا ﷻ دەوڵەمەندو ساماندارەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، کە بەهۆی سامان و داراییەکەیانەوە بوغڕا بوون و لە خوا ﷻ یاخیی بوون و، خۆیان پێ لە خەڵک زلتر بوو، تەنانەت خۆیان پێ لەوە گەورەتر بوو، گوێ بۆ پەیامی خوا بگرن، هۆشداریی بەوان دەدات، کە خەڵکی لە ئێوە دەوڵەمەندتر هەبووە، وەک قارووون، کەچی ئەوە سەرەنجامی بوو!

٢)- دڵدانەوەشە بۆ هەژاران و نەداران، کە ئێوە پێتان وانەبێ و، سەرسام مەبن بەو سامانداره ملهوڕو بێبڕوایانە، پێتان وابێ لەبەر ئەوەی سامانیان هەیە، ڕەنگە لە ئێوەش عاقڵتر بن، مەکەونە گومان و دوو دڵیی لە خۆتان، ئەوەتا خەڵکی ساماندارتر لەوانیش بووە، بەڵام ئەوە سەرەنجامە تاڵ و شوومەکەیەتی!

٣)- ئەوانەی کە ساماندارن، پێویستە وەک ئەمانەتی خوا، تەماشای ماڵ و سامانەکەیان بکەن، کە خوا پێیداون و لە دەستی وانیدا داناوە، شتێکی کاتییە، ماوەیەک بەدەستی ئەوانەو، دوایی دەچێتە دەست خەڵکێکی دیکە، وەک پێشینانی خۆمان دەڵێن: (ماڵ و سامان چڵکی دەستانە)، منیش دەڵێم: (دنیا یان بەجێی دێڵی، یان بەجێت دێڵێ)، یان ئەو تۆ بەجێدێڵێ و تۆ هەژار دەکەوی، یان تۆ ئەو بەجێدێڵی و دەبێتە میراتت.

٤)- مرۆڤی ئیماندار، هەر شتێک کە خوا ﷻ پێی دەدات، دەبێ ببێتە مایەی ملکەچیی زیاتری بۆ خوا، نەک بوغڕا بوونی و لە خۆبایی بوونی و، لە کەوڵی خۆ دەرچوونی، دەبێ ماڵی دنیا وەک ئامرازێک بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا ﷻ، بە هۆی خزمەتی

خەڵکەوە، هەروەها بەدەست هێنانی بەهەشتی خوا، بە هۆی خەرجکردنی ماڵەکەی لە بەرژەوەندیی گشتییدا بەکاربێنێ.

دەگونجێ گەلێک ئامانجی دیکەش لە پشت ئەو بەسەرهاتەی قاڕوون و گەلەکەیەوە باس بکرێن.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ ﴾، بە دڵنیایی قاڕوون لە گەلی مووسا بوو، واتە: هەر لە بەنوو ئیسرائیل بوو، لە گەلە ستەم دیدەکەی مووسا بوو، ﴿ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡ ﴾، کەچی لێیان یاخیی بوو، ستەمی لێکردن و، لێیان هەڵگەڕایەوە.

ئنجا هۆکارەکەی باس دەکات: ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلۡعُصۡبَةِ أُوْلِي ٱلۡقُوَّةِ ﴾، هێندەمان ماڵی وەسەریەکتراو پێدا بوو، کە کلیلەکانی کۆمەڵە پیاوێکی خاوەن هێز بە قورسیی بۆیان هەڵدەگیران، ﴿ إِذۡ قَالَ لَهُۥ قَوۡمُهُۥ لَا تَفۡرَحۡ ﴾، کاتێک کە خەڵکەکەی پێیان گوت (واتە: خەڵکی بەنوو ئیسرائیل): زۆر دڵخۆش مەبە، (فَرَحْ)، بە مانای دڵخۆش بوون نیە، بەڵکو بە مانای: ئەوپەڕی دڵخۆشییە، چونکە ئینسان بە ماڵ و سامان هەر دڵخۆش دەبێ، یانی: زۆر دڵخۆش مەبە، زۆر دڵخۆش بوونی ئینسان، دەبێ تەنیا بە بەخششی خوا و بە بەزەیی خوا بێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ﴿٥٨﴾ ﴾یونس، بڵێ: با بە بەخششی خوا و، بەزەیی خوا، هەر بەوە زۆر دڵخۆش بن، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان ئەو جیاوازییە وردەیان نەکردووە وایانزانیوە (فَرَح) هەر بە مانای دڵخۆشیی، ئاساییە، بەڵام ئەوەتا لە سووڕەتی (یونس)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: با تەنیا بە بەخششی خوا و، بە بەزەیی خوا، زۆر دڵخۆش بن، ئەگەرنا بە ماڵ و سامانی دنیا، دڵخۆش بی، قەیناکات، بەڵام زۆر دڵخۆش مەبە، ئیمەپەڕێنە، بە گەورەترین ئاوات و هیوای خۆتی دامەنێ، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {وَلا تَجْعَلِ الدُّنيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلا مَبْلَغَ عِلْمِنَا} (أخرجه والترمذي: ٣٥٠٢ وقال: حسن غريب، والحاكم: ١٩٣٤، وقال: صحيح على شرط البخاري).

واتـە: ئـەی خوایـە! دنیا مەکـە بـە گەورەتریـن خەفەتمـان و تەوپـەڕی زانیارییمان! ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زۆر دڵخـۆش بووانـی (بەنـاز و نیعمەتی دنیـای) خـۆش ناوێن.

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، لـەوەش دا کـە خـوا پێـی داوی، مەنزڵـگای دوارۆژ داوا بکـە، واتـە: ئـەم مـاڵ و سـامانە بکـە، بـە نامرازێـک، بـۆ گەیشـتن بـە مەنزڵـگای دوارۆژ، کـە بەهەشـتی بەرینـە، ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا ﴾، بەشـی خۆشـت لـە دنیـا فەرامـۆش مەکـە، ﴿ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾، واتـە: نـاز و نیعمەتێـک کـە خـوا ﷻ پێـت دەدات، لێـی بەهرەمەنـد بـە، بەشـی خـۆت و، چاکـە بکـە، وەک چـۆن خـوا چاکـەی لەگـەڵ تـۆ کـردوە، تـۆش چاکـە لەگـەڵ خەڵکـی خـوادا بکـە، ﴿ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، بـە مـاڵ و سـامانەکەت، تێکـدان و خراپەکاریـی لـە زەویـدا مەخـوازە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾، بێگومـان خـوا تێکدەرانـی خۆشـناوێن، ئەوانـەی مـاڵ و سـامانێک کـە خـوا ﷻ پێـی داون، بـۆ تێکـدان و خراپەکاریـی بـەکاری دێنـن، وەک هەمـوو ئـەو دەوڵەمەنـدو سامانداڕانەی کـە لـە ڕێـی کاسـبیی حـەڕام و، لـە ڕێـی گەندەڵیـی و، پۆخەڵییـە وەو، بـە شـێوازی ناشـەرعیی سـەروەت و سـامان بەسـەریەکەوە دەنێـن، هـەر سـەروەت و سـامانێک بـە ڕێـی ناشـەرعیی بەسـەریەکەوە نرابـێ، لـە ڕێـی ناشەرعییشـەوە خـەرج دەکـرێ.

﴿ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ ﴾، (قـارووون) وەڵامـی خەڵکەکـەی خـۆی دایـەوە کـە ئـەو نامۆژگارییـە باشـانەیان کـرد، گوتـی: بـە دڵنیایـی بەهـۆی زانیاریـی خۆمـەوە، ئـەو مـاڵ و سـامانەم پێـدراوە، خـۆم بەدەسـتم هێنـاوە و، بـە زیرەکیـی خـۆم و شـارەزایی خـۆم!

خـواش ﷻ وەڵامـی دەداتـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗا ﴾، ئایـا نازانـێ کـە خـوا لـە پێـش ویدا چەنـدان سـەدەی فەوتانـدوون، کـە لـەوی بەهێزتـر بـوون و، سـەروەت و سامانیشـیان زیاتـر لـەوی کۆکردبـۆوە، یاخـود خەڵـک و قەڕەباڵغییشـیان، زیاتـر بـەدەورەوە بـوو؟

﴿ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، تاوانبارانیش لە بارەی گوناهەکانیانەوە لێیان ناپرسرێتەوە، چونکە هەموو شتێک تۆمار کراوە و دیارە، واتە: لێیان ناپرسرێ، پرسیار کردنێک کە: ئایا کردووتە، یان نەتکردوە؟ چونکە هەموو شتێک دیارە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الصافات، ئەم پرسیارکردنە بۆ سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنە، نەک بۆ ئەوە داخۆ کردوویانە، یان نەیانکردوە؟

﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ﴾، قارون لە جوانیی و ڕازاوەیی و، زرق و برقی خۆیدا، خۆی ڕانواند لەسەر خەڵکەکەی، چووە دەرێ بۆ ئەوەی کەش و فش و شانازییان بەسەرەوە بکات، ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەوانەی کە ژیانی دنیایان دەوێ، گوتیان: ﴿ يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ ﴾، خۆزگە ئێمەش ئەوەی کە بە قارون دراوە، هەمانبووایە! ﴿ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾، بەڕاستیی ئەو خاوەن پشک و بەشێکی مەزنە، خۆزگەیان پێ خواست، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا ﴾، بەڵام ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، واتە: زانیاریی وەحیی و هیدایەتی خوا ﷻ، گوتیان: سزای سەخت بۆ ئێوە، هاوار بۆ ئێوە، بێ قەزا بن، پاداشتی خوا ﷻ چاکترە، بۆ کەسێک بڕوا بێنێ و کردەوەی باش بکات، پاداشتی خوا لە ڕۆژی دوایی دا، باشترە لەو تۆزە نیعمەتەی کەلە دنیادا هەیە، ﴿ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ﴾، تەنیا خۆڕاگرانیش پێیان دەدرێ (ئەو پاداشتە)، هەر ئەوان شایستەنی، سەرەنجام: ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾، خۆی و خانوو و کۆشکەکەیمان بە زەوییدا بردە خوار، ڕۆمان بردە زەوی، بە ناخیی زەوییدا چووە خوار، ﴿ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئنجا کۆمەڵێکی نەبوون لە بەرانبەر خوادا سەری بخەن، لە بەرانبەر سزای خوادا بەرگریی لێ بکەن و دەربازی بکەن، ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴾، خۆیشی نەیتوانی خۆی سەربخات و، توانای نەبوو.

﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ ﴾، ئەوانەی کە دوێنێ خۆزگەیان بە شوێنەکەی دەخواست، بە پێگەکەی دەخواست، وایان لێهات، ﴿ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ

ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ﴾، دەيانگوت: ئايا تۆ دەزانى، تۆ دەبينى، خوا بژيو بۆ هەر كام لە بەندەكانى كە بيەوێ، فراوان دەكات، ياخود بۆ هەر كامێكيان كە بيەوێ لێى وەتەنگ دێنێ، يان بۆ هەر كامێكيان، هەندێك جاران بۆى فراوان دەكات و هەندێك جاران لێى وەتەنگ دێنێ، ﴿ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا ﴾، ئەگەر خوا ﷻ چاكەى لەگەڵ نەكردباين و، خۆزگەكەى بۆ نەهێنابايە دى، ئەوە چاكە بوو لە لايەن خواوە، كە ئەو خۆزگەيەى نەهێنايە دى، ئنجا ئەگەر ئەو چاكەيەى لەگەڵدا نەكردباين، ﴿ لَخَسَفَ بِنَا ﴾، ئێستا بە زەوييدا دەبردينە خوارو، بە مەرەدى قاروون دەچووين، ﴿ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، ئايا دەزانى! كە بێبڕوايان سەرفرازو بەختەوەر نابن.

هەميشە كوفر مايەى بەدبەختيى و پەشێمانييەوە، هۆكارى ماڵ وێرانييە لە دنيا و دوارۆژدا.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**باسی قارونن کە هەرچەندە لەگەلی مووسا ﷺ بووە، بەلام بە هۆی بوغرابوونی بە سامانەکەی، لێیان هەلگەڕاوەتەوەو، گەلەکەیشی هەندێک ئامۆژگاریی زۆر گرنگی دەکەن کە: سامانەکەی بکاتە ئامرازی ڕازیکردنی خوا و، بەشی خۆیشی لە دنیا لەبیر نەکات و، چاکە بکات و، خراپەکاریی لە زەویدا نەکات و، زۆر دڵخۆش نەبێ بە ماڵ و سامانەکەی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ﴾ بە دڵنیایی قارونن لە گەلی مووسا بوو، لە پەیمانی کۆندا لە (سفر الخروج)دا، دەڵێ: قارونن ناوی قۆرح بووەو ئامۆزای مووسا، (ابنُ عَمِّ مُوسى) بووە، ڕەچەڵەکەکەشی ئاوا دێنێ: (قُورح ابنُ يَصْهَار بنُ قَهَات بن لاوي بن يَعقُوب بنُ إسحاق بن ابراهيم)، مووساش (مُوسى بن عَمرَم (عِمرَان) بن قهات بن لاوي بن يَعقُوب بنُ إسحاق بن ابراهيم)، بەپێی ئەوەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، ئاوایە، کە بە تەئکید جێی متمانە نیە، دیسان هەر لە پەیمانی کۆن دا دەڵێ: فیرعەون (قۆرحی) قارونی کرد بوو بە سەرۆکی بەنوو ئیسرائیل[1]، بەلام لە قورئان دا، ئەوە باس نەکراوە.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس. العهد القديم، سفر العدد، الإصحاح: ١٦، ص: ٢٠٧ - ٢١٠.

٢)- ﴿ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾، دوایی (قارِوون) لێیان یاخیی بوو، یانی: ستەمی لێکردن، بۆچی ستەمی لێکردن؟ چونکە پاڵی دەدایە لای فیرعەونێک کە سۆغرەو بێگاریان پێ دەکات، نێرینەکانیان سەردەبڕێ و، مێینەکانیان دەهێڵێتەوەو، سووکایەتیی دنیای پێ کردوون، کەچی قارِوون بەهۆی ماڵ و سامانە بە گەندەڵیی پەیداکراو و، بە حەرامیی وەسەرێکتراوەکەیەوە، پاڵی دەدایە لای فیرعەون، دژی گەلە ستەم دیدەکەی خۆی!!

٣)- ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ ﴾، هێندەشمان ماڵ و سامانی وەسەرێکتراوو پەزمەندەکراو پێدابوو، کە کلیلەکانی کۆمەڵە پیاوێکی بەهێز، بە قورسیی و زەحمەت بۆیان هەڵدەگیران. (كُنُوز: جَمْعُ كَنْز: مُخْتَزَنُ المَالِ مِن صُنْدُوقٍ وَخِزَانَةٍ)، (كُنُوز) کۆی (كَنْز)ە: ماڵ و سامانێکە وەسەرێکترابێ و کۆکرابێتەوە لە نێو سندووقدا، یاخود لە شوێنێکدا کە تێیدا کۆکراوەتەوە.

(مَفَاتِـح) بـە (مَفَاتِيح)یـش هاتـوە، هەردووکیـان (جَمْـعُ مِفْتَـح وَمِفْتَـاح)، ئنجـا هەندێـک دەڵێـن: (مَفَاتِـح) کـۆی (مِفْتَـح)ە و، (مَفَاتِيـح) کـۆی (مِفْتَـاح)ە، هەردووکیشـیان بـە مانـای کلیـل دێـن، هەندێکیـان گوتوویانـە: بـە مانـای خەزنـە دێ، عەمبـار، بـەڵام ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە کـە بـە مانـای کلیـل دێ، (لَتَنُوٓأُ)، یانـی: (لَتَثْقُـلُ) هێندەمـان خەزنـەو مـاڵ و سـامان و سـەروەتی کۆکـراوە پێـدا بـوو، کـە کۆمەڵـە پیاوێـک بـە زەحمـەت کلیلەکانیـان بـۆ هەڵدەگیـران، ئەگـەر کلیلەکانیـان هەڵگرتبـان، هەسـتیان بـە بـار قورسـیی دەکـردو، بەمـلا ولادا دەچـوون، لەبـەر ئـەو کۆڵـە قورسـەی هەڵیانگرتـوە.

٤)- ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک خەڵکەکەی، (کە گەلی ستەم دیدەی بەنوو ئیسرائیل بوون)، پێیان گوت: زۆر دڵخۆش مەبە، (لَا تَفْرَحْ) (أَي: لاَ تَكُونْ مَسْرُوراً أَشَدَّ السُّرُور)، یانی: زۆر دڵخۆش مەبە بەو ماڵ و سامانەی کە هەتە.

پێشـتریش باسـمکرد: کـە زۆربـەی لـە توێژەرەوانـی قورئـان وشـەی (سُرور) و (فَرَح)یـان، وەک هاوواتـا (مُـتَرَادِف) هێنـاون، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وانیـەو، وشـەی

(فَرَح) لە قورئـان دا هەمیشـە زەمکـراوە، مەگـەر پەیوەندیـی هەبـێ بـە خـوا و پاداشـتی خـواوە، وەک لـە سـوورەتی (یونـس)دا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتـە: بڵـێ: بـە بەخششـی خـوا و، بـە بەزەیـی خـوا، بـەس بـە ئـەوە زۆر دڵخـۆش بـن، (فَرَح) واتـە: زۆر دڵخـۆش بـوون، بـەڵام دڵخـۆش بوونـی ئاسـایی، بـە مـاڵ و سـامانیش، بـە منـداڵ، بـە هـەر شـتێک، ئینسـان دڵخـۆش بـێ، ئاسـاییە، بـەڵام زۆر دڵخـۆش بـوون، دەبـێ تەنیـا بـە بەخششـی خـوا و بـە بەزەیـی خـوا بـێ.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر دڵخۆشانی خۆشناوێن، واتە: زۆر دڵخۆشان بە ماڵ و سامان.

٦)- ﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، مەنزڵگای دوارۆژیش لەوەدا بخوازە کە خوا پێی داوی، واتە: ئەوەی خوا پێیداوی، بیکە بە ئامرازێک بۆ وەدەست هێنانی مەنزڵگای دوارۆژ، کە بەهەشتە، یانی: (أُطْلُبِ الأَخِرَةَ بِالدُّنِيا الَّتِي أُعْطِيتَ) دوارۆژ بەو دنیایەی کە پێتدراوە، بخوازەو دەستەبەری بکە.

٧)- ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ﴾، (أي: لا تَتْرُكْ حَظَّكَ وَقِسطَكَ)، بەش و پشکی خۆشت لە دنیادا فەرامۆش مەکە، واتە: هێندە گرنگیی و بایەخ بە ڕۆژی دوایی بدە، کە هەر ئەوەندە بێ دنیات لەبیر نەچێ، ئاوا دوارۆژ بکە بە ئامانج، دیارە لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە[1]: هەر کات خوا نیعمەتێکی بە بەندەکەیدا، پێی خۆشە شوێنەواری نیعمەتەکەی لەسەر ببینێ، ئەوەش لە کاتێکدا بووە کە پیاوێکی بینی، قرژن و ئاڵۆز و، بەرگێکی نەگونجاوی لەبەردا بوو، فەرمووی: ماڵ و سامانت نیە؟ گوتی: با، حوشترم هەن، ڕەشەوڵاخم هەن، مەڕو بزنم هەن، فەرمووی: خوا حەز دەکات ئەگەر

---

(١) {عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا وَالْبَسُوا فِي غَيْرِ مَخِيلَةٍ وَلَا سَرَفٍ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُرَى نِعْمَتُهُ عَلَى عَبْدِهِ} (أخرجه أحمد: ٦٧٠٨، والحاكم: ٧١٨٨، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤٥٧١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن).

چاکەیەک، نیعمەتێکی بە بەندەی خۆی دا، شوێنەوارەکەی لەسەر ببینێ، واتە: خۆت ڕووت و ڕەجاڵ پێشان مەدە، مادام هەتە.

٨)- ﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾، هەروەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵتدا کردوە، تۆش ئاوا چاکە بکە لەگەڵ خەڵکی خوادا، یانی: (الكَاف: للتَّشْبِيه، وَ«مَا» مَصْدَرِيَّة)، (ک) بۆ وێچواندن و (ما) چاوگییە، یانی: (أَحْسِنِ إِلَى النَّاسِ إِحْسَانَ اللهِ إِلَيكَ)، چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکە، وەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردوە، (وَأَحْسِن) لێرەدا (مُتَعَلِّقُ الإِحْسَانِ مَحْذُوفٌ) ئەوەی کە ئیحسان پێوەی پەیوەست دەبێ، قرتێندراوە، یانی: (وَأَحْسِن إِلَى النَّاس، أَو إِلَى غَيْرِك)، چاکە لەگەڵ خەڵک، یان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکە.

٩)- ﴿وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، تێکدان و خراپەکاریی مەخوازە لە زەویدا، واتە: لەو زەوییەدا کە ئەوان لەسەرنێ، ئەلیف و لام (أل)ی سەر (أَرْض) بۆ ناساندنە، بەڵام مەبەست پێی (عَهْد)ە، واتە: لەسەر زەوییەکە، لە وڵاتەکەدا، کە وڵاتی میسرە، خراپەکاریی مەخوازە.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ تێکدەران و خراپەکارانی خۆش ناوێن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قاڕوون خواناس بووەو، خوای ناسیوە، بۆیە هۆشداریی پێدەدەن کە تۆ مادام خوا دەناسی و، حەز دەکەی خوا خۆشیبوێی، دڵنیابە کە خوا تێکدەران و خراپەکارانی خۆشناوێن.

ئنجا ئـەم ئایەتـە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ....﴾، سـێ ڕاسـتیی مـەزنی لـێ وەردەگیرێـن:

أ- کەسێک لە خەڵک و نەتەوەیەک بێ، لێشیان هەڵگەڕێتەوەو ستەمیان لێ بکات، ئێشی زیاترە، لەوە کە لەو قەوم و نەتەوەیە نەبێ، وەک گوتراوە:

وَظُلْمُ ذَوِي القُرْبَى أَشَدُّ مَضَاضَةً

عَلَى المَرْءِ مِن وَقْعِ الحُسَامِ المُهَنَّدِ

واتە: ستەمی نیزیکان لەسەر مرۆڤ بە تێشترە لە تێشی شمشێری بڕندە.

ب- دەوڵەمەندیی هۆکاری یاخیی بوون و بوغڕابوونە، ئەگەر مرۆڤ لە خۆی وریا نەبێ.

ج- ماڵ و سامان هۆکاری خراپەکارییە، ئەگەر بە دەست خەڵکی خراپەوە بێ، خراپەکاریی پێ دەکات و تێکدانی پێ دەکات، گوناهـ و تاوانی پێ دەکات و پێی بڵاودەکاتەوە، وەک ئێستا زۆربەی دەوڵەمەندەکان لەم هەرێمی کوردستانەدا، لە عێراقدا، لە سەرتاسەری دنیادا، بە زۆری ئەوانەی کە دەوڵەمەندن، بەڵام لە ڕێی ناشەرعییەوە دەوڵەمەند بوون، بەهۆی گەندەڵیی و شەریکە دز بوون لەگەڵ دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەکاندا، سەروەت و سامانەکانیان چۆن بە ناشەرعیی پەیدا کردووە، ئاواش بە ناشەرعیی خەرجیان دەکەن، بەڵام کەسێک ماڵ و سامانی خۆی بە حەڵاڵیی پەیدا کردبێ، لە ڕێی شەرعییەوەو بە پاکیی، بە تەئکید هەر لە ڕێی شەرعیی و پاکیی و چاکییەوە خەرجی دەکات، کە سوپاس بۆ خوا لەو جۆرە دەوڵەمەندو ساماندارانەش هەن، کە کاسبیی حەڵاڵ دەکەن، لە ڕێی حەڵاڵەوە سەروەت و سامان وەسەرێکدەنێن، دواییش لەڕێی حەڵاڵ و باشیشەوە سەروەت و سامانە حەڵاڵەکەیان خەرج دەکەن.

لە ڕاستییدا ئەم چەند ئامۆژگارییانەی قاڕوون لێرەدا، کە لە لایەن قەومەکەیەوە کراون، بەرنامەیەکی گشتگیریان تێدایە، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ماڵ و ساماندا و، چۆنیەتی تەماشا کردنی ژیانی دنیا و، تەماشا کردنی ڕۆژی دوایی، ئامۆژگارییەکانیش ئەم شەشەن:

١- دەبێ ئینسان بە ماڵ و سامان زۆر دڵخۆش نەبێ، با دڵخۆش بێ، بەڵام زۆر دڵخۆش نەبێ، چونکە خوا ﷻ زۆر دڵ خۆشان بە ماڵ و سامانی، خۆش ناوێن.

٢- دەبێ مرۆڤ ماڵ و سامانەکەی بکاتە ئامراز و هۆکار بۆ وەدەستهێنانی مەنزڵگای ڕۆژی دوایی، کە بەهەشتە، ئەویش بەوە کە ئەو ماڵ و سامانە، لە پێناو ڕەزامەندیی خواداو بۆ بەختەوەرکردنی خەڵک و، دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی خەڵک، خەرج بکات.

٣- دەبێ ئینسان ئەوەندە گرنگیی بە ڕۆژی دوایی بدات، کە تەنیا بەشی خۆی لە دنیا فەرامۆش نەکات و، لەبیر نەچێ، نەک باوەش بە دنیادا بکات و، دواڕۆژی لەبیر بچێ و گوریس لە بن دنیا ڕابخات و، دواڕۆژیش فەرامۆش بکات.

٤- دەبێ بابای ساماندار وەک چۆن خوا چاکەی لەگەڵ ویدا کردووەو ماڵ و سامانی پێداوە، ئەویش چاکە لەگەڵ خەڵکی خودادا بکات، سوودیان پێبگەیەنێ، هاوکاریان بێ.

٥- دەبێ ساماندار لە خۆی وریا بێ، ماڵ و سامانەکەی بۆ تێکدان و خراپەکاریی لە زەوییدا بەکارنەهێنێ، وەک ئەوانەی شوێنی گوناهو، شوێنی قومارو، شوێنی مەیخۆریی و، شوێنی نێرگەلە کێشان و، شوێنی تێکەڵکردنی کوڕ و کچان و، شوێنی ورووژاندنی غەریزەکان، دەکەنەوە، بەداخەوە ئەو سامانداره حەڕامخۆرو گەندەڵ و مشەخۆرانەی لەگەڵ دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەکان دا، خاوەن پشک و بەشن و لەگەڵ ئەواندا شەریکە دزن، هەمیشە سامانەکەیان بۆ خراپەکاریی بەکاردێنن.

٦- پێویستە مرۆڤ هەمیشە هەوڵ بدات، خوا ﷻ خۆشیبوێ، خواش ﷻ چاکەکارانی خۆش دەوێن ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ آل عمران -١٣٤-، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا تێکدەران و، خراپەکارانی خۆش ناوێن.

**مەسەلەی دووەم:**

**وەڵامدانـەوەی قـاڕوون کـە بـە زانیاریـی و، شـان و شـەوکەتی خـۆی مـاڵ و سامانەکەی پەیدای کردوە و، بەرپەرچدانـەوەی خـودای کارزان بـۆی، کـە خـوا لـە پێش ویدا، خەڵکی دیکـەی فەوتانـدوون، لەویـش ساماندارتر و بەهێزتـر بـوون و، لەویـش دەور قەرەباڵغـتر بـوون:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٧٨﴾.



## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾، قاڕوون وەڵامی گەلەکەی خۆی دایەوە، کە ئامۆژگارییەکی زۆر دڵسۆزانەیان کرد، گوتی: بە دڵنیایی من ئەوەی پێمدراوە لەو ماڵ و سامانە، بەهۆی زانیاریی خۆمەوە پێمدراوە، خۆم بە دەستم هێناوە، بە پێویست نەزاندراوە بە (و)، یان بە (ف) بابدرێتەوە، چونکە ئەوە وتووێژە لە نێوان قاڕوون و خەڵکەکەیدا، هەمیشە ئەهلی ئیمان، بەخشش و چاکەکانی کە لە ژیانیان دا هەن، بۆ خوایان دەگێڕنەوە، وەک سولەیمان فەرمووی: ﴿هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي ٤٠﴾النمل، ئەوە بەخششی پەروەردگارمە، نەیگوت: بە شان و شەوکەتی خۆم پەیدام کردوە، بەڵام ئەوانەی ئەهلی ئیمان نین، هەمیشە نیعمەتەکان دەگێڕنەوە بۆ شان و شەوکەتی خۆیان.

٢)- ﴿أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗا﴾، ئنجا خوا وەڵامی دەداتەوە، دەفەرموێ: ئایا نازانێ کە خوا لە پێش ویدا لە سەدەکاندا کەسانی وای فەوتاندوون، کە لەوی بەهێزتر بوون و لەویش سامان کۆکەرەوەتر بوون؟! ئەمە پرسیاری نکوولیلێکەرانەو سەرسوڕهێنەرانەیە، (الإستِفهامُ للإنكارِ وَالتَّعجِيب)،

هەروەها جۆرێکە لە دواندنی مسوڵمانانیش بە شێوەی ناڕاستەوخۆ و، ئاوڕدانەوە لێیان: مسوڵمانینە! گوێگرەکان! ئایا قارۆون نەیدەزانی؟

﴿ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ﴾، کە خوا ﷻ لە پێش ویدا، لە کۆمەڵگایەکان، کە لە سەدەکان دا ژیاون، کەسانی وای فەوتاندوون، کە لەوی بەهێزتر بوون، هەروەها لەویش سەروەت و ساماندارتر بوون، ﴿ وَأَكْثَرُ جَمْعًا ﴾، دەگونجێ مەبەست لە (جمع) کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بێ، دەشگونجێ مەبەست کۆکردنەوەی خزم و خەڵک و قەرەباڵغی دەوروبەر بێ، واتە: هەم هێزی عەسکەرییان لەو زیاتر بووەو، هەم سەروەت و سامان، یاخود هێزی سوپایی و بەشەرییشیان لە قارۆون زیاتر بووەو، خواش فەوتاندوونی؟

٣)- ﴿ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، تاوانبارانیش لە بارەی گوناهەکانیانەوە لێیان ناپرسرێ، واتە: لە دنیادا خوا ﷻ لێیان ناپرسێ، هەر کاتێک بیەوێ سزایان بدات، یاخود لە ڕۆژی دوایی دا لێیان ناپرسرێ، لە لایەن خوای زاناو شارەزاوە، چونکە دەزانێ چییان کردوە و، هەموو شتێکیان لەسەر تۆمارکراوە، ئنجا کە لە مەقامێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الصافات، واتە: ڕایانگرن، لێیان دەپرسرێتەوە، ئەوە پرسیارکردنی سەرزەنشتکردن و سەرکۆنەکردنە، نەک پرسیارکردنی: ئایا کردووتە؟ یان نەتکردوە؟

**مەسەلەی سێیەم:**

**خۆڕانواندنی قارووون و، کەشخەیی کردنی بە زرق و برقەوە بەسەر خەڵکەکەی دا و، خۆزگە پێخواستنی کەسانێکی دنیایی، نەزان و ئامۆژگاریی کردنی زانایان بۆیان، کە پاداشتی خوا لەگەڵ ئەوەدا کە بە قارووون دراوە، بەراورد ناکرێ، ئێوە چاو ببڕنە پاداشتی خوا و بەهەشتی خوا و، بە زرق و برقی قارووون هەڵمەخەڵەتێن و خۆزگەی پێ مەخوازن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ﴾، قارووون چووە لای خەڵکەکەی، لێیان هاتە دەرێ لە کۆشک و خانووەکەی خۆی، لە جوانییەکەی خۆیدا، ئەم (ف)یە بۆ (تعقیب)ە، واتە: هەر لەگەڵ ئامۆژگارییەکەی بیست، لە جیاتی ئەوەی ئامۆژگارییەکە وەربگرێ، ئاوا وەڵامی دایەوەو، یەکسەر بە کردەوەش ئەوەی لە خۆیدا بەرجەستە کرد، کە ئەو ئامۆژگارییە هیچ کاری تێنەکردوە و هیچی لێ وەرنەگرتن، کە بە فیز و کەشخە و بەڕازاوەیی، چووە دەرێ، خۆی پێشانی خەڵکەکەی دا و، خۆی لەسەر ڕانواندن.

وشەی (زِينَة) لە ﴿ زِينَتِهِۦ ﴾، (الزِّينَةُ: مَا بِهِ جَمَالُ الشَّيْءِ وَالتَّبَاهِي مِنَ الثِّيَابِ وَالمَرَاكِبِ وَالسِّلاحِ وَالخَدَمِ إِلَى آخِرِهِ)، (زِينَة) هەر شتێکە کە شتی پێ جوان بێ و، خۆی پێوە هەڵبکێشرێ، لە بەرگ و پۆشاک و لە ئامرازی سواریی و چەک و لە خەڵک و خزمەتکارو، دەوروبەرو، هەتا دوایی.

٢)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ ﴾، ئەوانەی کە ژیانی دنیایان دەوێ، گوتیان: ئەی خۆزگە وێنەی ئەوە کە بە قارووت دراوە، بمانبووایە، کە

مەبەست خەڵكەكە بووە بە گشتیی، ئەوانەی ئیمانیان كز بووە، چونكە ئەوان هەموویان لە بەنوو ئیسرائیل بوون، بە بەڵگەی ئەوە كە دوایی لە بەرانبەری ئەواندا، خوا ﷻ باسی ئەهلی عیلم دەكات، باسی زانایان دەكات، كەواتە: دیارە ئەوانەی خەڵكی عەوام و سادە و نەزان بوون و، دنیایی بوون، ئەو خۆزگەو بریایەیان بە قارون خواستوە.

٣)- ﴿ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾، بە ڕاستیی ئەو خاوەن پشك و بەشێكی مەزنە، (الحَظُّ: القِسْمُ الَّذِي يُعْطَاهُ المَقْسُوم لَهُ عِندَ العَطَاء)، (حَظّ) یانی: ئەو بەشەی كاتێك شت دابەش دەكرێ، بابای بەشدراو پێی دەدرێ، پێی دەگوترێ: (حَظّ) و (نصيب).

٤)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، گوتیان: هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوا باشترە بۆ كەسێك بڕوای هێنابێ و كردەوەی باش بكات.

﴿ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ﴾، زانیارییان پێدراوە، یانی: خۆیان بەدەستیان نەهێناوە، بەڵكو زانیاریی وەحییان پێدراوە، لە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) وەریانگرتوە، بێ ئەوەی خۆیانی پێوە ماندوو بكەن و ئارەقەی پێوە بكەن، واتە: ئەو عیلمە عیلمێكی بەخشراو (وهبي)یەو وەدەستهێنراو (كسبي)نیە، بەڵام نەك ڕاستەوخۆ بەوان درابێ، ئەو زانیارییە خواییەی پێیان گەیشتوە، بە هۆی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئەوانە گوتیان.

(ويلكم): هاوار بۆ ئێوە، یان فەوتان بۆ ئێوە، یان حاڵ خراپیی بۆ ئێوە، یاخود: بێ قەزابن، ئەو وشەیە جاری وا هەیە بۆ تێخوڕین (زَجر) بەكاردەهێنرێ.

٥)- ﴿ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴾، ئەو خەسڵەتەش كە بریتیە لە پاداشتی خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی دا، تەنیا خۆڕاگران پێیان دەدرێ، ئنجا ئەم ڕاناوە (وَلَا يُلَقَّىٰهَآ) دیارە بۆ (ثواب) ناچێتەوە، چونكە (ثواب) (مُذَكَّر)ە، بەڵكو (الضَّميرُ (ها) عَائِدٌ إلى مَفْهُومٍ مِنَ الكَلَامِ يَجْرِي عَلَى التَّأنِيثِ أي: الخَصْلَة) واتە: ڕاناوی (ها) دەچێتەوە بۆ فامراوەیەك لە قسەكە، كە مێینەیە، یانی: ئەو خەسڵەتە، كە بریتیە لە گەیشتن بە پاداشتی خوا، تەنیا خۆڕاگران پێیان دەدرێ.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**بە زەویدا ڕۆبردنی قارووون و کۆشک و سامانەکەی و، پەشێمان بوونەوەی خۆزگە پێخوازانی و، سوپاسی خوا کردنیان، کە وەک وی نەبوون و، بە مەرەدی وی نەچوون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾، ئنجا خۆی و خانوو بەرە و کۆشک و تەلارەکەیمان، بە زەوییدا بردە خوار، بە (ف)ی (تعقیب) هێناویەتی، واتە: یەکسەر دوای ئەوە بە زەوییمان بردە خوار، هەر لە گەرمەی خۆڕانواندن و خۆ عەرزکردنەکە و، کەش و فشەکەی بەسەر خەڵکدا، بە زەوییمان بردە خوار، (**الخَسفُ: انْقِلابُ بَعْض ظَاهِرِ الأَرْض إلى بَاطِنِهَا وَعَكْسه**)، (خَسف) بریتیە لەوە ئەوەی لەسەر زەوییە بچێتە بن و، ئەوەی لە بنیەتی، بێتە سەرێ، واتە: بە زەوییدا چوونە خوار.

٢)- ﴿ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ کۆمەڵێکی نەبوون کە سەری بخەن، جگە لە خوا.

لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: دوو سەدو پەنجا (٢٥٠) کەس لە هاوکاران و کاربەدەست و پشتگیرانی هەبوون، ئەوانیش لەگەڵی بە زەوییدا چوونە خوار.

٣)- ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴾، (لە دەرەوەی خۆی کەس نەبوو هاوکاریی بکات)، هەروەها خۆشیی لەوانە نەبوو بتوانێ خۆی سەربخات و خۆی دەرباز بکات.

٤)- ﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ﴾، ئەوانەی کە دوێنێ خۆزگەیان بە پێگەو جێگەو ڕێگەو شوێنەکەی دەخواست، وایان لێهات دەیانگوت: ئایا دەبینی، یان (سەرم سوڕدەمێنێ) کە خوا ﷻ، بۆ هەر کام لە بەندەکانی بیەوێ، بژێو فراوان دەکات و بۆ هەر کەسێکیشی بوێ لێی وەتەنگ دێنێ، یان لە یەک کاتدا، بۆ کەسێک جاری وایە بژێوی بۆ فراوان دەکات، جاری واش هەیە، لێی وەتەنگ دێنێ، بۆ تاقیکردنەوەی.

٥)- ﴿ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ﴾، ئەگەر خوا ﷻ چاکەی لەگەڵ نەکردباین، ئێمەشی بە زەوییدا ڕۆدەبرد، خوێندراویشەتەوە: (لَخُسِفَ بِنَا) واتە: بە زەوییدا ڕۆ دەچوێنراینە خوار.

٦)- ﴿ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، ئایا دەزانی؟ یاخود: سەرم سوڕدەمێنێ کە بێبڕوایان سەرفراز نابن، وشەی: (وَيْكَأَنَّ):

(الطَّبَرِي) دوای ئەوەی زۆر قسەی لێکردوە، گوتوویەتی: ئەم وشەیە وا باشترەو وا ڕاسترە بە: (أَلَمْ تَرَ، أَلَم تَعْلَم) واتە: ئایا دەزانی؟ ئایا دەبینی؟ لێک بدرێتەوە.

هەندێکیش گوتوویانە: (وَي)، یانی: (أَعْجَبُ)، کەواتە: (وَيْكَأَنَّ) یانی: (أَمَا تَعْجَبُ أَنَّ اللهَ)، واتە: ئایا سەرت سوڕ نامێنێ کە خوا ﷻ، بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ بژێوی بۆ فراوان دەکات و، بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ لێی وەتەنگ دێنێ.

لە پەیمانی کۆن[1]، لە ژێر ناوونیشانی: [تَمَرُّدُ قُورح وَدَاثَان وَأَبِيرَام]دا، بە تەفصیل باسی قاڕوونی کردوەو ڕەچەڵەکی قاڕوونی ئاوا هێناوە: (قُورح بنُ يَصْهَار بنُ قَهَات بن لاوي بن يَعقُوب بنُ إسحاق بن ابراهيم)، هەروەها لە ژێر ناوونیشانێکی دیکەدا: [تَآمُرَهُ مَعَ مِئَتَيْنِ وَخَمْسِينَ مِن رُؤَسَاءِ جَمَاعِةِ بَنِي إِسْرَائِيل]، واتە: پیلانگێڕانی قۆڕح (قاڕوون) لەگەڵ دووسەدو پەنجا لە سەرکردەکانی کۆمەڵی بەنوو ئیسرائیل دا، دوایی ئەم تەعبیرەی هێناوە:

---

(١) (التَّفسِيْر التَّطبِيقي لِلكِتَابُ المُقَدَّس، العَهدُ القَدِيم، سفرُ العدد: ١٦، ص: ٣٠٧ - ٣١٠)

(وَحَالَـمَا انْتَهـى مِـن كَلامِـهِ، انْشَـقَّتِ الأَرْضُ تَحْتَهُـم، وَفَتَحَـت فَاهَـا وَابْتَلَعَتْهُـم مَـعَ بُيُوتِهِـم، كَمَا ابتَلَعَـت رِجَـالُ قُورح مَـعَ كُلِّ مَا يَمْلِكُون)، بەپێـی قسـەی پەیمانـی کـۆن، دەڵـێ: قـارِوون مشـت ومڕێکـی بـوو لەگـەڵ مووسـادا ؛ خـۆی بەسـەر مووسـادا هەڵکێشـاوە و، بـڕوای پـێ نەهێنـاوە، مووسـاش گوتوویەتـی: ئەگـەر مـن پێغەمبـەری خـوا بـم و لەسـەر هـەق بـم، دەبـێ خـوا ئێسـتا سـزات بـدات، دەڵـێ: کاتێـک کـە قسـەکەی تـەواو کـرد، یەکسـەر زەوی لـە ژێـر قارِوونـدا و، ئـەوەی کـە لەگەڵیـدا بـوو، قڵیشـاو لـەت بـوو، زەوی زاری خـۆی کـردەوەو، خۆیـان و خانووبەرەکانیانـی قووتـدا، هەروەهـا ئـەو پیاوانـەش کـە لەگـەڵ قـارِوون دا بـوون و هەرچـی کـە هەیانبـوو، تێکڕایانـی قووتـدا و، بـە زەویـدا چوونـە خـوار.

کەواتـە: ئـەوەی کـە لـە پەیمانـی کۆنیشـدا هاتـوە، نێوەڕۆکەکـەی وەک ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ لـە قورئـان دا فەرموویەتـی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـەش (٦) ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (القصـص) پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (٨٣ - ٨٨)، کـە خـوای زانـا و توانـا چەنـد ڕاسـتییەکی گـەورە و گرنـگ ڕادەگەیەنـێ، لـە بـارەی مەنزڵـگای ڕۆژی دوایـی و، لـە بـارەی گێڕانـەوەی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ (پـاش کۆچکردنـی بـۆ شـاری مەککـە، یـان لـە ژیانـی دنیـا وە بـۆ مەنزڵـگای ڕۆژی دوایـی کـە بەهەشـتە).

پاشـان چەنـد ڕێنماییەکـی گـەورە و گرنـگ بـۆ پێغەمبـەر (محمـد) ﷺ دەخاتـە ڕوو، لـە بـارەی چۆنیەتیـی مامەڵەکردنـی لەگـەڵ خەڵـک دا بـە گشـتیی و، بێبڕوایـان بـە تایبەتیـی.

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەو مەنزڵـگای کۆتاییـە بـۆ کەسـانێکی دادەنێیـن، کـە نایانـەوێ بەرزیـی (خۆسـەپاندن) و تێکـدان لـە زەوییـدا بکەن و، سـەرەنجام (ی چاک)یش بـۆ پارێزکارانە (٨٣) (ڕۆژی دوایـی) هـەر کـەس بـە چاکـەوە بـێ (پاداشـتی) لـەو چاکـتری هەیـە و، هـەر کـەس بـە خراپـەوە بـێ، ئەوانـەی خراپەکانیـان کـردوون، تەنیـا بەگوێـرەی ئـەوەی کردوویانـە سـزا دەدرێـن (٨٤) بـە دڵنیایـی ئـەو خوایـە (بـەرز و مـەزن)ەی قورئانـی لەسـەرت پێویسـت کـردوە، بەرەو شـوێنی بـەرەو لا گەڕانـەوەت دەگێڕێتەوە، بڵـێ: پـەروەردگارم زاناتـرە کـێ بـە ڕێنماییـەوە هاتـوە و، کێـش لـە گومڕاییەکـی ڕوون دایـە! (٨٥) (ئـەی موحەممـەد!) تـۆ بـە ئومێـدی ئـەوە نەبـووی کتێـب (ی کۆتایـی خـوا)ت، بـۆلا بنێـردرێ، بەڵکـو تەنیـا بەزەیـی پـەروەردگارت هـۆکار بـوو، بۆیـە هەرگیـز پشـتگیری بێبڕوایـان مەبـە (٨٦) هەروەهـا بـا (بێبڕوایـەکان) لـە ئایەتەکانـی خـوات لانـەدەن، دوای ئـەوەی بـۆ لات دابەزێـنراون و، بانگـەواز (ی خەڵـک) بـۆ لای پـەروەردگارت بکـە و، بـە هیـچ شـێوەیەک لـە هاوبەشـدانەران مەبـە (توخنیـان مەکـەوە) (٨٧) لەگـەڵ خـواش دا لـە هیـچ پەرسـتراوێک مەپاڕێـوە، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، بێجگـە لـە ڕوو (زات)ی وی، هەمـوو شـتێک دەفەوتـێ، حوکـم و بڕیـار تەنهـا هـی ویـەو، بـەس بـۆ لای ویـش دەگێڕدرێنـەوە (٨٨)}.

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَرَضَ): (أَوجَبَ أي: أَوجَبَ عَلَيكَ العَمَلَ بِهِ)، ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ﴾، ئەو کەسەی کە قورئانی لەسەر تۆ پێویست کردوە، یاخود کارکردن بە قورئانی لەسەر تۆ پێویست کردوە.

(مَعَادٍ): (المَعَادُ: العَوْدُ، مَكَانُ العَوْدِ، أو زَمَانُ العَوْدِ)، (مَعَاد) بە مانای گەڕانەوە دێ، چاوگ، بە مانای شوێنی بۆلا گەڕانەوە دێ و، بە مانای کاتی گەڕانەوەش دێ.

(هَالِكٌ): (فَانٍ)، (وَالهَلاَكُ: بُطلاَنُ الشَّيءِ وَعَدَمُهُ رَأْساً)، (هَلاك) بریتیە لە شتێک کە لەبەین بچێ و نەمێنێ.

(وَجْهَهُ): (ذَاتَهُ) واتە: خودی خوا ﷻ، یاخود: ئەوەی کە ڕووی پێکراوەتە خوا، ئەوەی کە مەبەستی پێ ڕەزامەندیی خوا بووە.

(ٱلْحُكْمُ): (الحُكْمُ بالشَّيءِ: أَنْ تَقْضِيَ بِأَنَّهُ كَذَا أو لَيْسَ بِكَذَا)، حوکم لە شتێکدا واتە: تۆ بڕیار بدەی کە ئەو شتە ئاوایە، یان ئاوا نیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، چەند ڕاستییەکی زۆر گەورە و گرنگمان بۆ دەخاتە ڕوو، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ﴾، ئەو مەنزڵگای دوارۆژە، کە زۆر دوورە لە ڕووی پێگە و پلە و پایەوە، بۆیە بە ناوی ئاماژەی دوور (تِلكَ) ئامـاژەی پـێ دەکات، ﴿نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا﴾،

بـۆ کەسـانێکی دادەنێیـن، کـە نایانـەوێ لـە زەوییـدا نـە خۆیـان بەرزبکەنـەوە، خۆیـان بسـەپێنن بەسـەر خەڵکدا و، نـە تێکـدان و خراپەکاریـش بکـەن. ﴿ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾، سـەرەنجامی خێـرو چاکـەش لـە گـرەوی پارێزکاراندایـەو، تەنیـا بـۆ ئـەوان دانـدراوە.

﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ﴾، هـەر کەسـێک چاکـە بێنـێ (لـە ڕۆژی دوایی دا)، لـە چاکەکـەی خـۆی باشـتری بـۆ هەیـە، پاداشـتەکەی، لـە چاکەکـەی خـۆی چاکـترە، ﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، بـەڵام کەسـێک خراپـە بێنـێ، خراپـەش بریتیـە لـە کوفـرو، شـیرک و، نیفـاق و گوناهـو، تـاوان و، لادان، هـەر کەسـێک خراپـە بێنـێ، ئەوانـەی کـە خراپەکانیـان ئەنجامـداوە، تەنیـا سـزای ئـەوە کـە کردوویانـە لـە کاری خـراپ، تەنیـا سـزای ئەوەیـان دەدرێتـەوە، زێدەیـان بـۆ ناخرێتـە سـەر، بـەڵام کەسـێک چاکـە بێنـێ، لـە چاکەکـەی خـۆی باشـتر پاداشـتی دەدرێتـەوە.

پاشـان ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو کەسـەی قورئانـی بـۆ تـۆ دابەزانـدوە، یـان قورئانـی لەسـەر تـۆ پێویسـت کـردوە، یـان کارکـردن بـە قورئانـی لەسـەر تـۆ پێویسـت کـردوە، ئـەی موحەممـەد! ﷺ، تـۆ دەگێڕێتـەوە بـۆ شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە، شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە (معـاد) دەگونجـێ مەبەسـت پێـی شـاری مەککـە بـێ، ئەوەش ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە تـۆ لـەم شـاری مەککـە دەردەکرێـی، دەربـەدەر دەکرێـی، بـەڵام دوایـی بـۆی دەگەڕێیـەوە بەسـەر بەرزیـی و سـەرفرازیی و بـە سـەرکەوتوویی، دەشـگونجێ مەبەسـت لـە: ﴿ مَعَادٍ ﴾، (شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە) مەنزڵـگای دواڕۆژ بـێ، بـە هەشـت بـێ، واتـە: خـوا ﷻ تـۆ دەگێڕێتـەوەو سـەربەرزانە بـۆ بەهەشـتت دەباتـەوە، ﴿ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، بڵـێ: پـەروەردگارم زاناتـرە بـەو کەسـەی ڕێنمایـی هێنـاوە، بـە ڕێنماییـەوە هاتـوە، بـە بەرچـاو ڕوونییـەوە هاتـوە، کـە موحەممـەد ﷺ خۆیەتـی، ﴿ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، هەروەهـا زاناتریشـە

بەو کەسەی لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرای چەندو چوون دایە، کە نەیارو ناحەزەکانی موحەممەدن ﷺ، لە ڕۆژگاری خۆی دا و، دوای ڕۆژگاری خۆشیی، تاکو دنیا بە کۆتا دێ.

﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾، (ئەی موحەممەد!) تۆ بە ئومێد نەبووی کە کتێبت بۆلا بنێردرێ، بەڵکو تەنیا بەهۆی بەزەیی پەروەردگارتەوە بۆت هات، واتە: موحەممەد ﷺ هیچ چاوەڕوانییەکی نەبووە، یان: هەوڵی بۆ بدات، وەک هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، گوتوویانە: کە موحەممەد ﷺ چۆتە ئەشکەوتی حیراء خوا پەرستیی کردوە، ئەوە خۆ ئامادە کردنێک بووە بۆ ئەوەی وەحیی بۆ بێ! ئەوە قسەیەکی پووچە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر سەری سوڕماوە کاتێک جیبریل بەخۆیەوە دەگوشێ و، دەڵێ: بخوێنە، ئەویش دەڵێ: خوێندەوارنیم و، دەچێتەوە بۆ لای دایکمان خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێ) و، دەڵێ: لە خۆم ترسام (واتە: کە دەستم لێ وەشێندرابێ، شەیتانەکان زەفەریان پێ بردم)، ئەویش دڵنیای دەکاتەوە کە شەیتانەکان زەفەری پێ نابەن، لەبەر ئەوەی خاوەنی کۆمەڵێک سیفەتی بەرز و جوانە، یانی: ئەوانەی خاوەنی ئەو سیفەتە بەرز و جوانانە بن، خوا ﷻ ڕێ نادات، شەیتانەکان زەفەریان پێ بەرن، کەواتە: پێغەمبەر موحەممەد ﷺ هیچ بە هیوای ئەوە نەبووە، خوا کتێبی بۆلا بنێرێتە خوار، بەڵام خوا ﷻ بە بەزەیی خۆی و لە بەزەیی خۆیەوە موحەممەدی بەهرەمەند کرد، چونکە پلەی پێغەمبەرایەتیی (وهبي)یە و، (كسبي) نیە، واتە: بەخشراوەو وەدەستهێنراو نیە، ﴿فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ﴾، کەواتە: تۆش هاوکارو پشتگیری بێبڕوایان مەبە، هەڵبەتە ئەمە وەک ئەو پەندەیە کە دەڵێ: (دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێ سووانە، گوێت لێ بێ)، یانی: لێرەدا خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەڵام مەبەستی پێ شوێنکەوتووانیەتی، یاخود: ئەوە سەرزەنشتکردنە بۆ کافرەکان، کە بزانن! پێغەمبەری خاتەم ﷺ خوا ﷻ لێی قەدەغە کردوە، زۆر بە جەختکردنەوەوە کە

پشـتگیرو هاوكارتـان بـێ، لەسـەر ئـەو كوفـرەی كـە لەسـەرینی، ﴿ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ﴾، بـا (كافـرەكان) لات نـەدەن لـە ئایەتەكانـی خـوا، دوای ئـەوەی بـۆ لات دابەزێـتراون، ﴿ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، بانگەوازیـش بكـە بـۆ لای پـەروەردگارت، بـۆ لای رێبـازی پـەروەردگارت خەڵـك بانـگ بكـە، ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، هەرگیـز لـە هاوبەشـدانەران بـۆ خـوا مەبـە، دیـارە خـوا ﷻ دەزانـێ كـە پێغەمبـەر ﷺ نـە هـاوكارە بـۆ كافـران و، نـە لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە، بـەڵام بـۆ ئەوەیـە كـە لەپشـت پێغەمبـەرەوە ﷺ ئامۆژگاریـی بـڕواداران بـكات، پاشـان لەلاڕا سەرزەنشـتی كافـرەكان بـكات، كـە ئـەوەی ئێـوە لەسـەرینی، كـە بریتیـە لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان، خـوا ﷻ لـە پێغەمبـەری خـۆی ﷺ قەدەغەكـردوە، كـە توخنتـان بكـەوێ و، بـە هیـچ شـێوەیەك لێتـان نیزیـك بـێ و، هاوكارتـان بـێ، كەواتـە: ئێـوەش دەسـتبەرداری ئـەو شـیرك و كوفـرە بـن، كـە خـوا ﷻ لـە پێغەمبـەری خاتەمـی خـۆی ﷺ قەدەغـە كـردوە و، هەڕەشەشـی لێكـردوە، وەك لـە سـوورەتی (الزمـر) دا دەفەرمـوێ: ﴿ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ﴿٦٥﴾ ﴾، ئەگـەر تـۆ هاوبـەش بـۆ خـوا دابنێـی، كـردەوەت هەڵدەوەشـێتەوە، ﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، لەگـەڵ خـوادا لـە هیـچ پەرسـتراوێكی دیكـە مەپاڕێـوە هیـچ شـتێكی دیكـە شایسـتەی پەرسـتران نیـە و، هیـچ شـتێكی دیكـە، پەرسـتراو (إلـه) نیـە، بـەڵام ئـەو شـتانە لـە خەیاڵدانـی خەڵـك داو، بـە خەیـاڵ و وەهمـی خەڵـك بـە پەرسـتراو دادەنرێـن، ئەگەرنـا لەڕاسـتییدا پەرسـتراو تەنهـا خوایـە ﷻ، پەرسـتراوێك كـە شایسـتەی پەرسـتنە، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، واتـە: پەرسـتراوی ڕاسـتەقینە (لَا إِلَــهَ بِحَقٍّ إِلَّا هُـو)، ئەگەرنا پەرسـتراوی ناڕاسـت و سـاختە (مُزَیَّف) زۆرن، ﴿ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴾، جگـە لـە ڕووی ئـەو، هەمـوو شـتێك دەفەوتـێ، واتـە: جگـە لـە زاتـی ئـەو، یاخـود جگـە لـە شـتێك كـە مەبەسـت پێـی وەدەسـتهێنانی دیـداری خـواو، پاداشـت و ڕەزامەندیـی خـوا بـێ، ئـەوی دیكـە هیچـی نامێنـێ، ﴿ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، حوكـم و بڕیـار بـەس بـۆ ئـەوەو هـەر بـۆ لای ویـش دەگێڕدرێنـەوە، كەواتـە: بزانـن بـە چ ڕوویەكـەوە دەچنـە خزمـەت خـوا ﷻ!.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**مەنزڵگای کۆتایی لە گرەوی پارێز کارانێکدایە، کە چاویان لە خۆسەپاندن و خراپەکاریی نیە و، لە دوارۆژیش دا، پاداشتی چاکەکاران بە چاکترو، هی خراپەکارانیش سزای پڕ بە پێست و دادگەرانەیە.**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ﴾، ئەو مەنزڵگای کۆتاییە بۆ کەسانێکی دادەنێین، کە نەبەرزییان دەوێ لە زەوییدلو نەتێکدانیشیان دەوێ.

**(الدَّارُ: مَحَلُّ السُّكْنَى)**، (دَار) شوێنی تیا نیشتەجێ بوونە، **(وَالآخِرَة: الدَّائِمَةُ الَّتِي لا دَارَ بَعْدَهَا)**، ﴿ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ ﴾، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونی بەردەوام، چونکە شتێک کە هیچ شتی دیکەی بە دوادا نەیەت، مانای وایە بەردەوامە و کۆتایی نایەت، ئەم مەنزڵگای کۆتاییە، ئەم مەنزڵگای دوارۆژە، ئەم مەنزڵگای بەردەوامە کە کۆتایی نایەت.

بۆ کەسانێکی دادەنێین کە نە بەرزییان دەوێ لە زەوییدا، نە تێکدان و خراپەکارییش، کە دەفەرموێ: بۆ وانی دادەنێین، واتە: بۆ ئەوان و لەبەر ئەوان ئامادە دەکرێ، نەک لەبەر غەیری ئەوان.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُرِيدُونَ ﴾، واتە: نەک هەر نایکەن، نەک هەر خۆسەپاندن و خۆبەرزکردنەوە بەسەر خەڵکداو خراپەکاریی ناکەن، لە زەوییدا، بەڵکو هەر ناشیانەوێ و لە دڵیشیاندا نیەو هەر لە نیەتیاندا نیە، هەڵبەتە کاتێکیش ئینسان شتێکی لە دڵدا دەبێ، هەوڵ دەدات پراکتیزەی بکات بۆ کردەوە، بەڵام ئەوانە ئەو بیرۆکەیە هەر لە دڵیاندا نیەو بیریان لێ نەکردۆتەوە.

٢)- ﴿ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، سەرەنجامی چاکیش بۆ پارێزکارانە، وشەی (**عَاقِبَة: وَصْفٌ عُومِلَ مُعَامَلَةَ الأَسْمَاءِ لِكَثْرَةِ الوَصْفِ بِهِ، وَهِيَ الحَالَةُ الآخِرَةُ بَعْدَ حَالَةٍ سَابِقَة، وَغَلَبَ إِطْلَاقُهَا عَلَى الخَيْرِ**)، وشەی (**عَاقِبَة**) وەسفێکە، مامەڵەی ناوەکانی لەگەڵدا کراوە، چونکە زۆر بەکاردەهێنرێ بۆ شت وەسفکردن، کە بریتیە لە حاڵەتێک کە لە دوای حاڵەتێکی پێشترەوە دێ، بەڵام زیاتر بۆ حاڵەتی چاک بەکارهاتوە، واتە: سەرەنجامی چاک بۆ پارێزکارانە، کە لە بەهەشت دا بەرجەستە دەبێ.

٣)- ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا ﴾، هەر کەسێک چاکە بێنێ، چاکتر لەو چاکەیەی خۆی (پاداشتی) هەیە.

واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، ئەلیف و لامی سەر (بِٱلۡحَسَنَةِ) بۆ ناساندنەو بۆ سەرجەم (**جِنْس**)ە، واتە: هەر کەسێک (**جِنْس**)ی چاکە بێنێ، یاخود بۆ (**عَهْد**)ە، یانی: چاکەکە بێنێ، چونکە (**المُتَبَادِرُ مِنَ الإِطْلَاقِ هُوَ الفَرْدُ الكَامِلُ وَهُوَ التَّوحِيد**)، کاتێک شتێک بە ڕەهایی باسدەکرێ، مەبەست پێی تاکە تێرو تەواوەکەیەتی، کە خوا بە یەکگرتنە، چاکترین چاکە، بریتیە لە خوا ﷻ بەیەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، هەر کەسێک ئەوە بێنێ.

﴿ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا ﴾، چاکتر لە کردەوەکەی خۆی، چاکتر لە چاکەکەی خۆی پاداشتی هەیە، کە بریتیە لە ڕەزامەندیی خوا، دیداری خوا، بەهەشتی خوا.

٤)- ﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ ﴾، هەر کەسێک خراپەش بێنێ، (**سَيِّئَة**) هەموو جۆرەکانی خراپە دەگرێتەوە، ئەویش (أل) ناساندن (تعریف) لەسەرە: أ- سەرجەم (**جِنْس**)ی

خراپە بێنێ، لە شیرک و کوفرو نیفاق و، ئنجا کردەوەکانی دڵ و، کردەوەکانی زمان و، کردەوەکانی ئەندامەکان.

ب- یاخود: مەبەست لە ﴿ بِٱلسَّيِّئَةِ ﴾، (أل) بۆ ناساندن (تعريف)ە، بەڵام مەبەست پێی (عَهْد)ە، واتە: خراپەکە بێنێ، کە خراپترینی خراپە، بریتیە لە شیرک و کوفر.

٥)- ﴿ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەوانەی خراپەکانیان ئەنجام داون،

تەنیا بایی ئەوەندە کە کردوویانە، سزایان دەدرێتەوە، واتە: سزایەکی پڕ بەپێستی ئەوەی کردوویانەو، لە خراپەکەیان زیاد سزا نادرێن.

(القُرْطُبي) لە تەفسیرەکەیدا[1]، ئەم قسەیە دێنێ، کە قسەیەکی خۆش و جوانە:

(وَرَوَى سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ قَالَ: مَرَّ عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ وَهُوَ رَاكِبٌ عَلَى مَسَاكِينَ يَأْكُلُونَ كِسَرًا لَهُمْ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَدَعَوْهُ إِلَى طَعَامِهِمْ، فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، ثُمَّ نَزَلَ وَأَكَلَ مَعَهُمْ. ثُمَّ قَالَ: قَدْ أَجَبْتُكُمْ فَأَجِيبُونِي، فَحَمَلَهُمْ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَأَطْعَمَهُمْ وَكَسَاهُمْ وَصَرَفَهُمْ).

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینەی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی خالید دەگێڕێتەوە دەڵێ: عەلی کوڕی حوسەین (کە بە (زَيْنُ العَابِدِين) ناسراو بووە)، بە سواریی بە لای کۆمەڵێک هەژارو نەداردا تێدەپەڕێ، (نانێکی سادەی خۆیان) لەتکە نان و وردکە نان و شتی سادە دەخۆن، سەلامیان لێ دەکات، ئەوانیش بانگی دەکەن بۆ خواردنەکەیان، ئەویش ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، دوایی دادەبەزێ و،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٥٦.

نانیـان لەگـەڵ دەخـوات، ئنجـا دوایـی پێیـان دەڵێـت: ئـەوە مـن وەڵامـم دانـەوە، ئێـوەش وەڵامـی دەعوەتەكـەم بدەنـەوە، ئەوانیـش دەڵێـن: فەرمـوو، ئیـدی سـواری وڵاخیـان دەكات و، لەگـەڵ خـۆی دەیانبـات بـۆ ماڵـی خـۆی و، لـەوێ خواردنیـان دەداتـێ و، پۆشاكیشـیان بـۆ دەكات و، دوایـی بەڕێیـان دەكات.

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوای زانـا و توانـا پێغەمبەرەکـەی دڵنیـا دەکاتـەوە، کـە ئـەو زاتـەی قورئانـی لەسـەر پێویسـت کـردوە، دەشیگێڕێتەوە بـۆ شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە (مەککـە، یـان بەهەشـت)، فەرمانیشـی پێـدەکات کـە بەکافرەکان بڵـێ: خـوا زاناتـرە: کـێ ڕێنمایـی هێنـاوە و، کێـش لـە گومڕایـی ئاشـکرادایە:**

**خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۢ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍۢ مُّبِينٍۢ ﴿٨٥﴾﴾.**

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

**١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۢ﴾، بە دڵنیایی ئەو کەسەی قورئانی لەسەر تۆ پێویست کردوە، (کە خوایە ﷻ)، دەتگێڕێتەوە بۆ شوێنی گەڕانەوە.**

**﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۢ﴾، (الـرَّدُّ: إِرْجَـاعُ الـشَّيْءِ إِلى حَالِـهِ أَو مَكَانِـهِ)، (رَدّ) بریتیـە لـە گێڕانـەوەی شـتێک بـۆ حاڵەتـی پێشـێی، یاخـود بـۆ شـوێنی پێشـێی، ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۢ﴾، واتـە: تـۆ دەگێڕێتـەوە بـۆ شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوەت، (مَعَـادُ الرَّجُـلِ بَلَـدُهُ، لأَنَّـهُ يَنْـصَرِفُ إِلَيْـهِ ثُـمَّ يَعُـودُ)، واتـە: شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوەی پیـاو، وڵاتەکەیەتـی، شـارەکەیەتی، چونکـە بەجێـی دێڵـێ و دوایـی بـۆ لای دەگەڕێتـەوە، هەندێکیـش گوتوویانـە: (مَعَادٍ) لێـرەدا مەبەسـت پێـی بەهەشـتە، چونکـە لـە ئەصڵـدا دایـک و بابـی مـرۆڤ لـە بەهەشـتدا بـوون، بەهـۆی گوناهـەوە وەدەرنـراون، دوایـی بـۆ لای دەگەڕێنـەوە، (مُقَاتِـلٌ) لێـرەدا کـە یەکێکـە لـە شـارەزایانی قورئـان ئـەم دەقـەی لـێ گێڕراوەتـەوە:**

**(قَـالَ مُقَاتِـلٌ: خَـرَجَ النَّبِـيُّ ﷺ مِـنَ الْغَـارِ لَيْـلًا مُهَاجِـرًا إِلى المدينـة فِي غـير الطَّرِيـق، مَخَافَـةَ الطَّلَـبِ، فَلَـمَّا رَجَـعَ إِلَى الطَّرِيـقِ وَنَـزَلَ الْجُحْفَـةَ، عَـرَفَ الطَّرِيـقَ إِلَى مَكَّـةَ فَاشْـتَاقَ إِلَيْهَـا، فَقَـالَ لَـهُ جِبْرِيـلُ إِنَّ اللـهَ يَقُـولُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ**

مَعَادٍ ﴾، أَيْ إِلَى مَكَّةَ ظَاهِرًا عَلَيْهَا. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَزَلَتْ هَـذِهِ الآيَةُ بِالْجُحْفَةِ لَيْسَتْ مَكِّيَّةً وَلَا مَدَنِيَّةً](1).

واتـە: (مُقَاتِلٌ) گوتوویەتـی: پێغەمبـەر ﷺ بـە شـەو لـە ئەشـکەوتی (ثَـور) چـووە دەرێ، کۆچـی کـرد بـۆ مەدینـە، لـە ڕێیەکـی نەزانـراوەوە، (لـە ڕێـی ئاسـایی خۆیـەوە نەچـوو)، لـە ترسـی ئـەوەی بـە دوای کەوتبـوون، کاتێـک گەڕایـەوە سـەر ڕێیەکـە، لـە جوحفـە دابەزیـن و، ڕێیەکـەی ناسـییەوە بـەرەو مەککـە، ئارەزوومەنـد بـوو، (تامەزرۆ بـوو بـۆ مەککـە)، جیبریـل پێـی گـوت: خـوا ﷻ پێـت دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾، ئـەو کەسـەی قوڕئانـی لەسـەر تۆ پێویسـتکردوە، تـۆ دەگێڕێتـەوە بـۆ شـوێنی بـۆ لای گەڕانـەوە، واتـە: بـۆ لای مەککـەت دەگێڕێتـەوە، بەسـەرکەوتوویی، عەبدوڵـلای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە لـە جوحفـە دابەزیـوە، بۆیـە نـە ئایەتێکـی مەککەییـەو نـە مەدینەییـە.

بـەو واتایـە کـە نـە لـە مەککـە دابەزیـوە، نـە لـە مەدینـە، بـەڵام دیـارە هـەر ئایەتێـک لـە دوای کۆچـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـە، دابەزیبـێ، بـە مەدینەیـی لـە قەڵـەم دەدرێ، کەواتـە: وشـەی (مَعَادٍ):

١- بە مانای مردن دێ.

٢- بە مانای قیامەت دێ.

٣- بە مانای بەهەشت دێ.

٤- بە مانای شاری مەککەش دێ، ئەو شارەی کە پێغەمبەری خوا بۆ لای دەگەڕێتەوە.

٢)- ﴿ قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی ڕێنمایی هێناوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٥٧.

کە بێگومان موحەممەدە ﷺ، چونکە ئەوان پێیان گوتوە: شێتی، جادووگەری، گومڕای، هەڵخەڵەتاوی، خوا دەفەرموێ: تۆ لە وەڵامیاندا بڵێ: پەروەردگارم زاناترە کێ ڕێنمایی هێناوە.

٣)- ﴿وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾، پەروەردگاریشم زاناترە بەوەی کێ لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادایە، تێیدا نغرۆ و نقووم بووە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە هیوا نەبووە وەحیی بووبێ و، تەنیا لە بەزەیی خواوە کتێبی بۆ دابەزێنراوە و، خواش پشتگیریی لە کافران و، لادەران لە ئایەتەکانی لێ قەدەغە کردوە و، فەرمانی پێکردوە کە بانگەواز بۆ لای خوا ﷻ بکات و، توخنی شیرک نەکەوێ و، بزانێ کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە و، هەموو شتێکیش جگە لە خوا دەفەوتێ و، حوکم تەنیا هی ویەو، بەس بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾، تۆ ئەی موحەممەد ﷺ!) ئومێدەوار نەبووی کە کتێبت بۆ لا بنێردرێ، جگە لە بەزەییەک لە پەروەردگارتەوە، ئەمە وەک گوتمان: بە درۆ خستنەوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان و هاووێنەکانیانە، کە دەڵێن: موحەممەد ﷺ خۆی ئامادە کردوە و، پڕاوەو مەشقی ڕووحیی کردوە، تاکو وەحیی بۆ بێت! کە ئەوە قسەیەکی پووچ و بێ بناغەیە، پلەی پێغەمبەرایەتیی بەخشراو (وهبيّ)ە ودو بە دەستهێنراو (كسبي) نیە.

﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾، جگە لە بەزەیی پەروەردگارتەوە، ئەمە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: (إستِثْنَاءٌ مُنقَطِع)، هەڵاواردنی دابڕاو، یانی: (إِلَّا) لێرەدا بە مانای بەڵام (لـكِن)ە، (لـكِن رَحْمَةٌ مِن رَبِّك كَانَتِ السَّبَب)، بەڵام بەزەیی لە پەروەردگارتەوە، هۆکاری ئەوە بوو کە وەحییت بۆ بێ و، کتێبت بۆلا بنێردرێ.

٢)- ﴿ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾، ئنجا تۆش پشتیوان و هاوکاری بێبڕوایان مەبە، یانی: تۆش مادام بێ ئەوەی کە چاوەڕوانیی بکەی و، ئومێدەوار بی، خوا ﷻ لە بەزەیی خۆیەوە، ئەو پلە و پایە بەرز و مەزنەی بە تۆ داوە، کە هیچ پلەیەک نایگاتێ لەنێو مرۆڤایەتیی دا، تۆش لە بەرانبەری ئەوەدا، سوپاسی چاکە و نیعمەتی خوا بکەو، پشتگیرو هاوکاری بێبڕوایەکان مەبە، (الظَّهِيرُ: المُعِينُ، والمُظَاهَرَةُ: المَعُونَةُ وَهِيَ مَرَاتِبُ أَعْلَاهَا النُّصْرَةُ، وأَدْنَاهَا المُصَانَعَةُ وَالمُسَامَحَةُ)، (ظَهِير) بە مانای یارمەتییدەر دێ، (معونة)ش بە مانای هاوکاریی کردن دێ، کە ئەویش پلە پلەیە، بەرزترینی بریتیە لە پشتگیریی کردن و کەمترینی بریتیە لەوە کە تۆزێ موجامەلەیان بکەی و، نەرمکێشییان بۆ بکەی، یانی: هیچ کام لە پلەکانی پشتگیریی کردنی کافران، با لە تۆدا نەبن، ئەی موحەممەد! ﷺ.

٣)- ﴿ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، با ئەو کافرانەش تۆ لا نەدەن لە ئایەتەکانی خوا، تۆ لێیان نەگێڕنەوە، (أَي: لا تَتَقَبَّلْ مِنْهُم مَا يُؤَدِّي إِلى الصَّدِ عَنْ سَبِيلِ الله)، لێیان قبووڵ مەکە، ئەوەی کە ببێتە مایەی لادانی تۆ لە ئایەتەکانی خوا، دەنا ئەوان نەیانگوتوە: ئەوە ئایەتەکانی خوان و، وەرە لێیان لابدە، یانی: تۆ کارێک مەکە، ببێتە هۆی ئەوە کە تۆ لە ئایەتەکانی خوا لا بدەی.

٤)- ﴿ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ﴾، دوای ئەوەی ئەو ئایەتانە بۆ لات دابەزێنراون، یانی: دوای ئەوەی خوا ئایەتەکانی بۆ لای تۆ دابەزاندوون، ئەو شەڕەف و پێگە بەرزەی بە تۆ داوە، بێ ئەوەی کە چاوەڕوانیی بکەی، خوا ﷻ تۆی کردۆتە پێغەمبەری خۆی و، ئەو کتێبە مەزنەی بۆ تۆ دابەزاندوە، هیچ جۆرە هاوکاریی و پشتگیرییەکی کافرەکان مەکە، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، ڕێگەش مەدە ئەوان تۆ لە ئایەتەکانی خوا لابدەن، دوای ئەوەی بۆ لات دابەزێنراون.

٥)- ﴿ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، واتە: بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت، واتە: بەردەوام بە لەسەر بانگەوازکردنی خەڵک بۆ لای پەروەردگارت و، ڕێبازی پەروەردگارت.

٦)- ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، بە هیچ جۆرێک لە هاوبەشدانەران بۆ خوا، مەبە، هەڵبەتە وەک پێشتریش گوتمان: ئەم دواندنە ڕووی لە پێغەمبەرە ﷺ وەک هاندان و

تیژکردنی پێغەمبەر ﷺ لە بەرانبەر هاوبەشدانەرو کافرەکاندا، یاخود مەبەست پێی پەیڕەوانیەتی، واتە: ئەی ئەوانەی شوێن پێغەمبەر دەکەون! ﷺ، بەهیچ جۆرێک توخنی هاوبەش بۆ خوا دانەران مەکەون و، مەکەونە ژێر کاریگەرییان.

٧)- ﴿ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾، لەگەڵ خوادا لە هیچ پەرستراوێکی دیکە مەپاڕێوە، ئەمەش دیسان ڕووی لە پێغەمبەرە ﷺ بە ڕواڵەت، بەڵام مەبەست پێی هەڵوەشاندنەوەی شیرک و، پاڕانەوەیە لە غەیری خوا و، دەرخستنی گومڕایی خەڵکەکەیەتی، چونکە ئەوان ئیددیعای ئەوەیان دەکرد، خوا ﷻ دەناسن، کەچی لە جگە لە خواش دەپاڕانەوە.

٨)- ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لە خوا، هیچ پەرستراوێک نیە.

٩)- ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ﴾، هەموو شتێک فەوتاوە، جگە لە ڕووی خوا، واتە: جگە لە زاتی خوا، هەموو شتێک دەفەوتێ و هیچ شتێک نامێنێ، هیچ شتێک بوونی لەخۆیەوە نیەو هەمووی بوونی خوازراوەو خوا ﷻ پێی داوە، ئنجا هەر کاتێک خوا ﷻ بوونی لێ ستاندەوە، سفر دەبێتەوەو دەچێتەوە حاڵەتی نەبوون.

١٠)- ﴿ لَهُ ٱلْحُكْمُ ﴾، باڵا دەستیی، دەست ڕۆیشتوویەتی تەنیا هی خوایە.

١١)- ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

کەواتـە: لەبـەر چـوار هـۆکاران هاوبـەش بـۆ خـوا دامەنـێ و، لـە جگـە لـە خـوا ﷻ مەپاڕێـوە:

١- جگە لە ئەو هیچ پەرستراوێک نیە.

٢- جگە لە ڕووی ئەو، جگە لە زاتی ئەو، هەموو شتێک دەفەوتێ.

٣- لەبەر ئەوەی بەس ئەو باڵا دەست و بڕیار بەدەستە، لە دنیا و دواڕۆژدا.

٤- لەبەر ئەوەی گێڕانەوە تەنیا بۆ لای ئەوەو، هەموویان دەچنەوە بەر قاپی ئەو، هەموویان دەچنەوە خزمەت ئەو، ئەو شوێنەی کە ئەو دیاریی کردوە.

لێرەشـدا دێینـە کۆتایـی تەفسـیری سـوورەتی (القصـص)، لـە خـوای بـە بەزەیـی داواکاریـن لـە نـوورو هیدایـەتی قوڕئـان زیاتـر بەهرەمەندمـان بـکات و یارمەتییـمان بـدات، ئـەوەی دەیزانیـن بیتوانیـن، حاڵیـی بوونەکەمـان بکاتـە حـاڵ و، یارمەتییـمان بـدات زیاتـر لێـی تێبگەیـن، ئـەو هیدایـەت و نـوورەی کـە تێیدایـە، زیاتـر لـە خۆماندا بەرجەسـتەی بکەیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەسپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ (٢٤)ی شەووالی ساڵی (١٤٤٠)ی کۆچییە، بەرانبەر ٢٧/ ٦/ ٢٠١٩ی زایینی، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـک و مەبەسـتەکانی ئایەتـە موبارەکەکانـی سـوورەتی (العنکبـوت)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (العنکبوت)و بابەتەکانی

### ا)- ناوی ئەم سوورەتە:

نەزانراوە ئـەم سـوورەتە موبارەکـە جگـە لـە: (**سُورَةُ العَنْكَبُوت**)، ناوێکـی دیکـەی هەبـێ، لـەو بـارەوەش ئـەم دوو شـوێنەوارە هاتـوون:

**أ. (عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: كَانَ الْمُشْرِكُونَ إِذَا سَمِعُوا تَسْمِيَةَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَسورَةِ الْعَنْكَبُوتِ، يَسْتَهْزِئُونَ بِهِمَا، فَنَزَلَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾الحجر)**[1].

واتــە: عیکریمــە دەڵــێ: هاوبــەش بــۆ خوادانــەرەکان کاتێــک نــاوی ســوورەتی بەقـەرەو سـوورەتی عەنکەبووتیـان دەبیسـت، گاڵتەیـان پـێ دەکـردن، قسـەی خـوای بـەرز لـەو بـارەوە دابـەزی: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾الحجـر، واتـە: ئێمـە گاڵتـە پێکەرەکانمـان لـە کـۆڵ کردوویـەوە.

---

(١) التَّحْرِير والتَّنوير: ج٢٠، ص١٩٩.

ب- (عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ الْعَنْكَبُوتِ بِمَكَّةَ)[1].

واتە: سووڕەتی (العنكبوت) لە مەککە هاتۆتە خوارێ.

دیارە تەفسیرەکانی دیکەش، هەموویان باس دەکەن، کە ئەم سووڕەتە غەیری ناوی (العنكبوت) ناوێکی دیکەی بۆ بەکارنەهێنراوە.

## ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئەم سووڕەتە لە کوێ هاتۆتە خوار؟ واتە: مەککەییە، یان مەدینەییە؟ لەو بارەوە سێ ڕا هەن:

١- ئەم سووڕەتە سووڕەتێکی مەککەییە، کە ئەو ڕایە لە هەموویان بەهێزترە.

٢- ئەم سووڕەتە سووڕەتێکی مەدینەییە، لەبەر ئەوەی باسی جیهادو کۆچ کردن و، هەندێک شتی تێدا کراوە کە دەشوبهێتە نێوەڕۆکی سووڕەتە مەدینەییەکان.

٣- ئەم سووڕەتە مەککەییە، جگە لە هەندێکی، یان دوو ئایەتی سەرەتا کە لە مەدینە دابەزیون.

ڕای بەندە ئەوەیە: کە ئەم سووڕەتە مەککەییەو، لە کۆتایی قۆناغی مەککەدا هاتۆتە خوار، بەر لە کۆچکردن، واتە: کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، واپێدەچێ لە سەرەتاو گەرمەی کۆچکردنی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازیبێ)دا بۆ یەثریب هاتبێتە خوار، چونکە بە لای کەمەوە ساڵێک، دوو ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە، یەثریبییەکان مسوڵمان بوون و پێغەمبەریش ﷺ هەندێک لە هاوەڵانیشی مۆڵەت داون، ئنجا چ وەک بانگەوازکار، چ وەک خۆ دەربازکردن لە دەست ئازارو ئەشکەنجەی کافرەکان، کە کۆچ بکەن بۆ یەثریب.

---

(١) ذكره السيوطي في (الدر المنثور) (٤٤٩/٦) ونسبه لابن الضُّريس والنّحاس وابن مردويه في (الدلائل). الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣، ص٤١ .

بۆیـەش هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: (هَـــذِهِ السُّـورَةُ آخِـرُ مَـا نَـزَلَ بِمَكَّـةَ) ئـەم سـوورەتە کۆتـا شـتێکە لـە شـاری مەککـە، لـە قۆناغـی مەککـەدا دابەزیـوە.

## ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە لـە دابەزیـن (ترتیـب النُّـزُول)دا (٨٥)ە، واتـە: (٨٤) سـوورەت لـە پێـش ئـەم سـوورەتەوە دابەزیـون و ئەمـە هەشـتاو پێنجەمیینیانـەو، پێـش (المطففـین) و دوای (الـروم) دابەزیـوە.

لـە ڕیزبەندیـی موصحەفیـش دا کـە هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازیبێ) لـە دوو توێـی موصحەفـدا، سـوورەتەکانیان کۆکردوونـەوە، ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە (٢٩)یـە [1].

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە، بـە یەکدەنگیـی هەمـوو ژمێـرەران (ئەوانـەی کـە ئایەتەکانـی قورئانیـان ژمـاردوون) شەسـت و نـۆ (٦٩)یـە.

## ٥)- نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتەش هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانـە، لـە باسـی: خواپەرسـتیی و، خـوا بەیەکگرتـن لـە پەرسـتنیداو، بەڵگەکانـی خواناسـیی لـە دیـاردەو دیمەنـە دڵبزوێنەکانـی گـەردوون، بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ

---

(١) ئێمـە لـە کتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قورئـان دا بیـن)، بـە درێژیـی و، بـە وردیـی باسـی چۆنیەتـی ڕیزبەندیـی سـوورەتەکانمان کـردوە، لـە نێـو دوو توێـی موصحەفـدا، چ لـە سـەردەمی ئەبـوو بەکـردا بـە پێشـنیاری عومـەر، چ دواتـر لـە سـەردەمی عوسـماندا (خـوا لـە هەموویـان ڕازی بـێ).
بـەڵام لێکۆڵینـەوەی تێـرو تەسـەلترمان لەوبـارەوە لـە کتێبـی: (قورئـانی مـەزن لـە نـۆزدە تـەوەردا) کـردوە، کـە ئێسـتا لەژێـر چاپـە.

والسَّلاَم)، کە لەم سوورەتەدا ئاماژەیەک بە بەسەرهاتی نووح کراوەو، گۆشەیەک لە بەسەرهاتی ئیبراهیم باسکراوە، هەروەها بەسەرهاتی لووط، دوایی ئاماژەیەک کراوە بە بەسەرهاتی شوعەیب لەگەڵ گەلی مەدیەن، دوایی ناوی هەر کام لە گەلی عادو سەموود هێنراوە، هەروەها ناوی هەریەکە لە قاروون و فیرعەون و هامان هێنراوە، کە مووسا بە بەڵگە ڕوونەکانەوە بۆ لایان ڕەوانە کراوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم).

هەروەها باسی خۆڕاگریی لەسەر ئازارو مەینەتیی و ناڕەحەتییەکان کراوەو، باسی ئاماژەکردن بە کۆچکردنی هاوەڵان کراوە، کە دیارە پێش ئەوەی هاوەڵان کۆچ بکەن بۆ یەثریب، پێشتر دوو جار کۆچیان کردوە بۆ حەبەشە، هەروەها لەم سوورەتەدا ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی کراوەو، باسی زیندووبوونەوەو سزاو پاداشتی خوا لە ڕۆژی دوایی دا کراوە.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

هەر کام لە سوورەتەکانی قورئان، کۆمەڵێک تایبەتمەندییان هەن، واتە: کۆمەڵێک جیاکەرەوەیان هەن، کە تەنیا لەو سوورەتەدا هەن، لەم سوورەتەش دا ئاماژە بە پێنجیان دەکەین:

١- باسی جیهادو تاقیکردنەوە (إبتلاء)ی خوا بۆ بەندەکانی لە سەرەتاو کۆتایی سوورەتەکەدا هاتوە، بەڵام وشەی (جهاد) بەچەمک و واتای گشتیی وفراوانی بەکارهێنراوە، نەک چەمک و واتای تایبەت کە جەنگ و فیداکاریی و بەرەنگاربوونەوەیە.

٢- وشەی (العنكبوت) جاڵجاڵۆکە، کە لە هەندێک شوێن پێی دەڵێن: پیرەمۆتەو، لە هەندێک شوێن پێی دەڵێن: جۆلاییکەر، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوەو، وێنەی پێ هێنراوەتەوە، وێنە بەماڵی جاڵجاڵۆکە هێنراوەتەوە، بۆ ئەوانەی پەنا دەبەنە بەر جگە لە خواو، جگە لە خوا دەکەنە سەرپەرشتیارو دۆست و پەرستراوی خۆیان.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا وشەی (سُبُلَنَا) پاڵدراوەتە لای خوا ﷻ، وەک دەفەرمویّ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا ﴾، واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، چونکە تێکۆشان بۆ لای خوا، بۆ بەرقەرار کردنی بەرنامەو ئایینی خوا، پێویستیی بە ڕێبازو شێوازی جۆراوجۆر دەکات، بە پێی گۆڕانی ژینگەو هەل ومەرجەکان، وشەی (سُبُلَنَا)ش تەنیا لێرەدا بەکارهێنراوە، بەڵێ، لە سوورەتی (النحل)دا خوا دەفەرمویّ: ﴿ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ ٦٩ ﴾النحل، بەڵام (سُبُلَنَا) تەنیا لێرەدا هاتوە، لەوێش کە دەفەرمویّ: ﴿ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ ٦٩ ﴾النحل، واتە: بە ملکەچیی بە دوای ڕێبازەکانی پەروەردگارت بکەوە، ئەو حاڵەتە غەریزییەی خوا ﷻ بۆ هەنگی داناوە، کە چۆن هەنگوین دروست بکات و، شیلەی گوڵان بمژێ، لەوێدا مەبەست لەوەیە.

٤- تەنیا لەم سوورەتە باسی ماوەی مانەوەی نووح ﷺ کراوە، کە بریتی بووە: لە نۆ سەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ پێش تۆفان، وەک دەفەرمویّ: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا ١٤ ﴾، واتە: پێش تۆفان، نووح نۆ سەدو پەنجا ساڵ وەک پێغەمبەر لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوە.

٥- لەم سوورەتەدا باسی چوار جۆرە سزادانی خوا بۆ گەلە یاخییەکان کراوە، ئەوەی بێتە یادم، تەنیا لەم سوورەتەدا ئەم چوار جۆرە سزایە، ئاوا بە دوای یەکدا هاتوون:

أ)- ﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا ﴾.

ب)- ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾.

ج)- ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ ﴾.

د)- ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَا ﴾.

ئەم چوار جۆرە سزایە (حَاصِب، صَيْحَة، خَسْف، غَرْق) تەنیا لەم ئایەتی ژمارە (٤٠)ی سوورەتی (العنكبوت)دا، بەو شێوەیە هاتوون، کە خوا ﷻ گەلە

یاخییەكانی، یان زۆربەی هەرە زۆری گەلە یاخییەكانی بە یەكێك، یان زیاتر لەو چوار جۆرە سزایە فەوتاندوە.

## ۷)- دابەشكردنی بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە ئەو شەست و نۆ (٦٩) ئایەتە، بۆ پێنج دەرس دابەش دەكەین:

دەرسی یەكەم: ئایەتەكانی: (١ - ١٣) دەگرێتە خۆی، ئەم سێزدە ئایەتە وەك پێشەكیی وان بۆ كۆی بابەتەكانی دیكە، كە لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوون.

دەرسی دووەم: ئایەتەكانی: (١٤ - ٢٧)، واتە: چواردە ئایەت، كە بەسەرهاتی نووح ﷺ زۆر بە كورتیی و ئاماژە ئاساو، بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ تارادەیەك بەدرێژیی لەو چواردە ئایەتەدا خراونە ڕوو.

دەرسی سێیەم: ئایەتەكانی: (٢٨ - ٤٠)، واتە: (١٣) ئایەت، كە وێڕای بەسەرهاتی لووط ﷺ لەگەڵ گەلە ڕەوشت نزمەكەی دا، ئاماژەكیش كراوە بە بەسەرهاتی شوعەیب ﷺو گەلی مەدیەن و، ناوی هەر كام لە گەلەكانی: عادو سەموود هێنراوە، هەروەها ناوی قارون و فیرعەون و هامانیش هێنراوە، كە مووسایان بە بەڵگە ڕۆشنەكانەوە بۆلا ڕەوانكراوە و بەڵگە ڕۆشنەكانی خوای بۆ بردوون.

دەرسی چوارەم: ئایەتەكانی: (٤١ - ٥٥)، واتە: (١٥) ئایەت، كە لەو پازدە ئایەتەدا خوا ﷻ وێنەی بە ماڵی جاڵجاڵۆكە هێناوەتەوە، بۆ ئەوانەی كە جگە لە خوا دەكەنە سەرپەرشتیارو دۆست و پشتیوان و پەرستراوی خۆیان، ئنجا باسی ئەوە كراوە كە خوا ﷻ ئەم گەردوونەی بە هەق نەبێ نەهێناوەتە دی، دوایی فەرمانی كردوە بە پێغەمبەر ﷺ كە قورئان بخوێنێ و نوێژ بەرپا بكات، دوایی باسی قورئان كراوەو، ئەو شوبهەو تۆمەتانەی ناحەزانی ئیسلام ئاڕاستەی قورئانیان كردوەو دەیانكەن، خوای زاناو شارەزا وەڵامی داونەوە، پاشان وەڵامی ئەوانەی داوایان دەكرد كە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری كۆتاییش، وەك پێغەمبەرانی

پێش خۆی موعجیزە بەرهەستەکان و، یاسادڕەکانی لە ڕووی بەرهەستییەوە بۆ بێن، خوای پەروەردگار وەڵامی دلونەوە کە قورئان کافییەو یاسادڕە، بەڵام عەقڵ و هۆشی مرۆڤەکان دەدوێنێ، نەک هەستەوەرەکانیان بدوێنێ، بۆ کەسێک کە بیەوێ بڕوا بێنێ قورئان بەسەو، قورئان بەڵگەی پێغەمبەری کۆتاییە ﷺ دوایی باسی ڕۆژی دوایی و باسی چارەنووسی شوومی بێبڕوایان کراوە، کە چۆن پەلە دەکەن لە هاتنی سزای خوا، لە حاڵێکدا کە سزای خوا زۆر لێیان نیزیکەو، دۆزەخ ئابڵووقەی داون.

دەرسی پێنجەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (٥٦ - ٦٩)، واتە: چواردە ئایەت، باسی کۆچکردن و هاندانی خوا بۆ کۆچکردنی بڕواداران و، نەمانەوەیان لە ژێر زەخت و فشاری کافرەکاندا، کە ڕێی دینداریی و خواپەرستییان لێ دەگرن، هەروەها ئەو شتانەش کە دەبنە پەرچ و کۆسپ لە بەردەمیاندا، خوا ﷻ لایداون، دوایی ژمارەیەک لە دیمەنەکانی گەردوون و نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا خراونەڕوو، بۆ زیاتر هاندانی بڕواداران کە بەرەو خوا، بەرەو ئەو شوێنەی کە ڕەزامەندیی خوای لێیەو دەتوانن دینداریی لێ بکەن، کۆچ بکەن، پاشان باسی ژیانی دنیاو، ژیانی ڕۆژی دوایی کراوە، دیسان چەند نیعمەتێکی دیکە، هێنراونەوە بیری ئەوانەی لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دابوون، بەهەموو لایەکەوە.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺو، شوێنکەوتووانی، موژدەیان پێدەدات کە ئەگەر لە پێناوی ئەودا تێبکۆشن، ڕێبازەکانی خۆییان پێشان دەدات و سەر ڕاستیان دەکات و، پێیان ڕادەگەیەنێ کە بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکارانداییە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سێزدە (١٣) ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (العنكبـوت) پێکـدێ: (١ - ١٣)، کـە وەک پێشـەکیی وان بـۆ کـۆی ئایەتەکانـی دیکـە، لـەم سێزدە ئایەتـەدا خـوا باسـی مسـۆگەربوونی تاقیکرانـەوەی بـڕواداران و، لـە یـەک هەڵاوێردرانـی ڕاسـتان و درۆزنانـی کـردوە.

پاشـان باسـی ئاتاجیـی مـرۆڤ بـە هەوڵدانـی خـۆی و بێنیازیـی خـوا، بـاسی خەسـڵەتە بنەڕەتییەکانـی مسـوڵمانان و، چۆنیەتیـی مامەڵەیـان لەگـەڵ بـاب و دایکیـان دا، کـراوە.

لـە کۆتاییـی دا باسـی کەسانێکی لاف لێدەری خۆڕانەگر لـە تاقیکرانـەوەدا کراوەو، قسـەی کافرەکان بەرانبـەر بـە بـڕواداران کە ئەگەر بـە قسـەیان بکـەن و هەڵگەڕێنەوە، ئـەوە گوناهەکانیـان وەئەستۆ دەگـرن، کـە بێگومـان قسـەکەیان ڕاسـت نەبووە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ٣ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ٤ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَءَاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ٥ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ٦ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى

كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، ئەلیـف، لام، میـم ﴿١﴾ ئایـا خەڵـک پێیـان وایـە تەنیا بەوەنـدە کـە بڵێـن: بڕوامـان هێنـا، وازیـان لـێ دەهێـنرێ و تاقیـی ناکرێنـەوە؟ ﴿٢﴾ لـە حاڵێکـدا کـە بـە دڵنیایـی ئەوانـەی پێـش ئەوانمـان تاقیکردنـەوە، کـە سـەرەنجام خـوا ئەوانـەی ڕاسـتیان کـردوە بزانـێ و، ئەوانـەش بزانـێ کـە درۆکارن (لەسـەر ئـەرزی واقیـع ڕاسـتیی و درۆیـان دەربکـەوێ) ﴿٣﴾ یـان ئایـا ئەوانـەی خراپـان دەکـەن پێیـان وایـە پێشـمان دەکەونـەوە (لـە دەسـتمان قوتـار دەبـن!) ئـەوە خراپتریـن بۆچـوون و بڕیـارە کـە پێیگەیـون ﴿٤﴾ هـەر کـەس بـە هیـوای دیـداری خوایـە (بـا مشـووری خـۆی بخـوات چونکـە) بێگومـان کاتـی دیاریکـراوی خـوا (بـۆ هاتنـی دیـداری خـوا) هـەردێ و، ئەویـش بیسـەری زانایـە ﴿٥﴾ هـەر کەسـێکیش (لـە ڕێـی خـوادا تێبکۆشـێ) ئـەوە بـۆ سـوودی خـۆی تێدەکۆشـێ، چونکـە بـە دڵنیایـی خـوا لـە جیهانییـان بێنیـازە ﴿٦﴾ ئەوانـەش کـە بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە چاکـەکان

دەکەن، مسۆگەر خراپەکانیان لێ دەسڕینەوەو، بە پێی باشترینی کردەوەکانیان پاداشتیان دەدەینەوە ﴿٧﴾ مرۆڤیشمان لە بارەی باب و دایکیەوە بە چاکەکاری ڕاسپارد (کە چاکەیان لەگەڵدا بکات و پێشمانڕاگەیاند:) ئەگەر زۆریشیان هەوڵ لەگەڵدای، شتێک بکەیە هاوبەشم کە زانیارییت لە بارەیەوە نیە (چونکە بوونی نیە) بە قسەیان مەکە، گەڕانەوەتان بۆ لای منەو، لە بارەی ئەوەوە کە دەتانکرد هەواڵتان پێدەدەم (ئنجا بە گوێرەی کردەوەکان سزا، یان پاداشت هەیە) ﴿٨﴾ بە دڵنیاییش ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، دەیانخەینە نێو (ڕیزی) چاکانەوە ﴿٩﴾ لە خەڵکیش کەسی وا هەیە دەڵێ: بڕوامان بە خوا هێناوە، کەچی کە لەسەر خوا ئازاردرا، بەڵای ئازاردانی خەڵک وەک سزاو ئازاردانی خوا دادەنێ و، ئەگەر یارمەتیی و سەرخستنێکیش بێ لە پەروەردگارتەوە، دەڵێن: بێگومان ئێمەش لەگەڵتان بووین و هاوبەشین، ئایا خوا زاناتر نیە بەوەی کە لە سینەکانی جیهانییاندا هەیە؟ ﴿١٠﴾ بە دڵنیاییش خوا ئەوانە دەزانێ (و دەناسێ) کە بڕوایان هێناوەو، مسۆگەر دەغەڵ و مونافیقەکانیش دەزانێ و پێیان ئاشنایە ﴿١١﴾ ئەوانەش کە بێبڕوا بوون، بەوانەیان گوت کە بڕوایان هێناوە: ئێوە شوێن ڕێبازەکەمان بکەون، با گوناهەکانتان لە جیاتیتان هەڵگرین، هەڵبەتە هیچ شتێک لە گوناهەکانیان لە جیاتییان هەڵناگرن (و لە کۆڵیان ناکەنەوە)و، بێگومان ئەوان درۆکارن ﴿١٢﴾ بە دڵنیاییش ئەوان (کافرە سەرمەشقەکان) قورساییەکانی خۆیان هەڵدەگرن و، کۆمەڵێک قورسایی وێڕای قورساییەکانیان (هەڵدەگرن)و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە بارەی ئەوەوە کە هەڵیدەبەستن، لێیان دەپرسرێتەوە ﴿١٣﴾].

## شیكرنەوەی هەندێك لە وشەكان

( أَحَسِبَ ): (أَ) لێرەدا هەمزە (أ)ی پرسیاركردن (إسْتِفْهَام)ە، (حَسِبَ أي: ظَنَّ)، واتە: ئایا پێی وایە؟ وا دەزانێ، وا گومان دەبات.

(لَا يُفْتَنُونَ): (لاَ يُمْتَحَنُون، لاَ يُبْتَلُون، لاَ يُؤْذَون)، واتە: ئایا پێیان وایە ناجەرِبێنرێن؟ تاقیناكرێنەوە؟ ئازار نادرێن و نارەحەتییان بەسەر نایەت؟

(جَاهَدَ): واتە: زۆر تێكۆشاوە، (الجِهَادُ: مُبَالَغَةٌ فِي الجُهْدِ الَّذِي هُوَ مَصْدَرُ جَهَدَ كَمَنَعَ)، (جِهَاد): زێدەڕۆییكردنە لە (جُهْد)دا، (جُهْد) یانی: هەوڵ و تێكۆشان، چاوگی (جَهَدَ)یە، (جَهَدَ يَجْهَدُ جُهْدَاً)، یان (جَهَدَ يَجْهَدُ جَهْدَاً) وەك (مَنَعَ يَمْنَعُ مَنْعَاً)، ئنجا (جَهْد)، ناوەكەیەو (جُهْد) چاوگەكەیە.

( وَوَصَّيْنَا ): واتە: ئاموژگارییمان كردوە، (وَصَّى كَأَوْصَى، وَالوَصِيَّةُ: أَمْرٌ بِفِعْلِ شَيْئٍ فِي مَغِيبِ الآمِرِ بِهِ، فَفِي الإِيصَاءِ مَعْنَى التَّحْرِيضِ)، (وَصَّى): وەك (أَوْصَى) یەك واتایان هەیە، (وَصَّاهُ وَأَوْصَاهُ)، (وَصَّى بِهِ، وَأَوْصَى بِهِ)، (وَصِيَّة): فەرمانە بە شتێك لە كاتێكدا كە فەرمانپێكەر لەوێ نیە، بۆیە لە وشەی وەسیەت كردندا مانای هاندان و پاڵپێوەنان هەیە.

(وَأَثْقَالًا): (أَثْقَال جَمْعُ ثِقْل، مِثْل أَوْزَار جَمْعُ وِزْر، يُعَبَّرُ بِهَا عَنِ الآثَامِ)، (أَثْقَال): كۆی (ثِقْل)ە، (ثِقْل) قورسایی، (أَثْقَال) قورساییەكان، وەك: (وِزْر) كە بە (أَوْزَار) كۆدەكرێتەوە، كە بە هەمان شێوە هەر بە مانای قورسایی، یان كۆڵیگران دێ و، تەعبیر بە (أَثْقَال)و (أَوزَار) دەكرێ لە گوناهەكان، چونكە گوناهیش باری شانی ئینسان قورس دەكات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سێ ئایەتە: ﴿ الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣ ﴾. لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە:

{عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: إِنَّهَا نَزَلَتْ، يَعْنِي: ﴿ الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣ ﴾ فِي أُنَاسٍ كَانُوا بِمَكَّةَ أَقَرُّوا بِالْإِسْلَامِ، فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ: إِنَّهُ لَا يُقْبَلُ مِنْكُمْ إِقْرَارًا بِالْإِسْلَامِ حَتَّى تُهَاجِرُوا، فَخَرَجُوا عَامِدِينَ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَاتَّبَعَهُمُ الْمُشْرِكُونَ فَرَدُّوهُمْ، فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الْآيَةُ، فَكَتَبُوا إِلَيْهِمْ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَتْ فِيكُمْ آيَةُ كَذَا وَكَذَا، فَقَالُوا: نَخْرُجُ، فَإِنِ اتَّبَعَنَا أَحَدٌ قَاتَلْنَاهُ؛ قَالَ: فَخَرَجُوا فَاتَّبَعَهُمُ الْمُشْرِكُونَ فَقَاتَلُوهُمْ ثُمَّ فَمِنْهُمْ مَنْ قُتِلَ، وَمِنْهُمْ مَنْ نَجَا، فَأَنْزَلَهُ اللَّهُ فِيهِمْ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١٠ ﴾النحل}[1].

واتە: شەعبیی دەڵێ: ﴿ ﴿ الٓمٓ ١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣ ﴾، لە بارەی کەسانێکەوە هاتنە خوار کە لە مەککە بوون، دانیان بە ئیسلامدا هێنابوو، هاوەڵانی موحەممەد ﷺ لە مەدینەوە (دیارە ئەوانەی کە زووتر کۆچیان کردوە) بۆیان نووسین کە دان هێنان بە ئیسلامتاندا لێ قبووڵ ناکرێ تاکو کۆچ نەکەن، ئەوانیش ڕۆیشتن چوونە دەرو ڕوویان کردە مەدینە، بەڵام

---

(١) أخرجه الطبري في تفسيره: ٢٧٦٥٥، وابنُ أبي حاتم في تفسيره: ١٧١٣١، قال مؤلفا الإستيعاب في بيان الأسباب: قُلنا: وسَنَدهُ ضَعيف. ج٣، ص٤٢.

هاوبەش بۆ خوادانەرەکان شوێنیان کەوتن، گێڕایاننەوە، لە بارەی وانەوە ئەم ئایەتانە هاتنە خوار، ئنجا ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، بۆیان نووسین کە لە بارەتانەوە فلان ئایەت و فلان ئایەت هاتۆتە خوار، ئنجا ئەوانەی کە لە مەککە مابوونەوە گوتیان: لەمەودوا دەردەچین، ئەگەر کەسێک شوێنمان کەوت لەگەڵی دەجەنگین، دەرچوون، هاوبەش بۆ خوادانەرەکانیش شوێنیان کەوتن و ئەوانیش لەگەڵیان جەنگان، دەستەوکەریان کرد، هەیانبوو کوژراو هەشیان بوو دەربازبوو، خوا لە بارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾ ﴾النحل، واتە: ئنجا بە دڵنیایی پەروەردگارت بۆ کەسانێک کە کۆچیان کردوە، دوای ئەوەی ئازار دراون و سزا دراون و، ئەشکەنجە دراون، دوایی تێکۆشاون و خۆڕاگر بوون، بە دڵنیایی پەروەردگارت لێبووردەی میهرەبانە بەرانبەریان.

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە خوا تێیدا دەفەرمویٚ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾، چەند ڕیوایەتێک هاتوون، ئێمە یەکێکیانمان هێناوە:

{عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَتْ أُمِّي: أَلَيْسَ تَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ بِصِلَةِ الرَّحِمِ وَبِرِّ الْوَالِدَيْنِ؟ فَوَاللَّهِ، لاَ آكُلُ طَعَامًا، وَلاَ أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى تَكْفُرَ، وَلَمْ تَأْكُلْ طَعَامًا وَلَمْ تَشْرَبْ شَرَابًا، وَكَانُوا إِذَا أَرَادُوا أَنْ يُطْعِمُوهَا شَجَرُوا فَمَهَا بِعَصًا فَيُصِيبُونَ فِيهِ الطَّعَامَ وَالشَّرَابَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ... ﴿٨﴾ ﴾} (أخرجه أحمد: ١٥٦٧ وغيره، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والبزار: ١١٤٩، واللَّفْظُ لَهُ).

واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دایکم پێی گوتم: ئایا تۆ پێت وانیە کە خوا فەرمانی پێ کردووی پەیوەندیی خزمایەتیی بکەیەنی و، لەگەڵ باب و دایکتدا چاک بی؟ سوێند بە خوا نە هیچ خواردنێک

دەخۆم، نە هیچ شلەمەنییەک دەخۆمەوە، تاکو هەڵنەگەڕێیەوەو بێبڕوا نەبی (تاکو بێبڕوا نەبی بە موحەممەد ﷺ و بە ئیسلام)، سوێندەکەی خۆی بردە سەر، هیچ خواردنی نەخواردو، هیچ خواردنەوەی نەخواردەوەو، ئەگەر ویستبایان خواردنێکی بدەنێ، بە گۆچانێک، (بە دارێک شتێک) زاریان لێکدەکردەوەو، خواردن یان خواردنەوەیان لە زاری دەکرد، لەو بارەوە ئەم ئایەتە هاتەخوار: کە لەگەڵ باب و دایکتان چاک بن، بەڵام ئەگەر هەوڵیان لەگەڵدان تاکو بێبڕوا بن، هاوبەشم بۆ دابنێن، بە قسەیان مەکەن، (ئەگەرنا لەبواری دیکەدا چۆن چاکە لەگەڵیان دا، وابن).

هەڵبەتە ئەمە لە سوورەتی (لقمان) و (الإسراء) و (الأحقاف)یشدا هاتوە، بە تەعبیری نیزیک لەو تەعبیرەی کە لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک گوتمان: ئەم سێزدە ئایەتە وەک پێشەکیی وان، بۆ کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، ئنجا خوا پشتیوان بێ، لەبەر ئەوەی باسێکی سەربەخۆ دەکەین لە بارەی تاقیکردنەوەی خواوە بۆ بەندەکانی، لێرەدا بە کورتیی مانای گشتیی ئایەتەکان دەکەین و زۆر ناچینە نێو وردەکارییەکانەوە:

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرمووێ: (بسم الله الرحمن الرحيم):

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە.

واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، لەکاتی گوتنی ئەم ڕستە موبارەکەشدا بەلای کەمەوە، دەبێ ئەم چوار واتایە لە عەقڵ و دڵ دا بچەسپێنرێن:

١) ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢)- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣)- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤)- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿الٓمٓ﴾، ئەمانە، سێ پیتن: ئەلیف، لام، میم، زۆر جاری دیکەش قسەمان لەو بارەوە کردوە، کە ئەو پیتە پچڕ پچڕانە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئان دا هاتوون، کە زۆربەیان سوورەتە مەککەییەکانن و، دووانیشیان سوورەتە مەدینەییەکانن، زانایان لە بارەی هاتنی ئەم پیتە پچڕ پچڕانە (الحُروفُ المُقَطَّعَة)وە، زۆر شتیان گوتوە، باشترین بۆچوون هەر ئەوەیە کە بگوترێ: خوا ﷻ دەیەوێ بە مرۆڤەکان بفەرمووێ: ئەو قورئانەی لەبەر دەستتاندایەو، لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، کە ئەک قورئانێکی وەک ئەو، بگرە

ده سـووڕەتی وەک هـی ویـش ناهێنـن و تەنانـەت سـووڕەتێکیش!، ئـەو قوڕئانـە هەر لـەو پیـت و دەنگانـە پێکهاتـوە کـە لـە نووسـیندا بەکاریـان دێنـن، لـە قسـەکردندا بەکاریـان دێنـن، پیتەکانـی: ئەلیـف و لام و صـادو قـاف تاکـو کۆتایـی، کەواتـە کـە نەتانتوانـی وەک قورئـان، یـان وەک ده سـووڕەتی قورئـان، یـان سـووڕەتێکی قورئـان بێنـن، لـە کاتێکـدا کەرەسـتەکەش لەبـەر دەسـتتاندا هەیـە، ئـەوە دڵنیـا بـن کـە خوایـەک ﷻ ئـەو فەرمایشـتەی فەرمـووە، بەدیهێنـەری ئێـوەش و هـی هەمـوو شتێکیشـەو پـەروەردگاری هەمـوو شتێکیشـە، بۆیـەش فەرمایشتەکەشـی لـە قـەدەر خۆیەتـی، هیـچ کـەس ناتوانـێ وێنـەی فەرمایشـتی خـوا بێنـێ، چ زۆری چ کەمـی.

﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا ﴾ ئایـا خەڵـک پێیـان وایـە، وا دەزانـن، وازیـان لـێ بهێنـرێ هـەر بەوەنـدەی کـە دەڵێـن: بڕوامـان هێنـا، ﴿ وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴾، بەبـێ ئـەوەی تاقیبکرێنـەوە: ئایـا کـە دەڵێـن: بڕوامـان هێنـا، ڕاسـت دەکـەن یـان ڕاسـت ناکـەن، ئایا تاکـو چ ڕاددەیـەک ئـەوە حەقیقەتێکـەو تەعبیریـان لـێ کـردوە، پێـش ئـەوەی بـە زمـان تەعبیـری لێبکـەن، لـە عەقـڵ و دڵیانـدا جێگیربـووە؟ ئەگـەر پێیـان وابـێ ئـەوە خەیـاڵ پڵاویـان کـردوە، بـە هەڵـەدا چـوون، بۆچـی؟

﴿ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە ئەوانـی پێـش وانمـان کـە بڕوایـان هێنـاوە، تاقیکردنـەوەو، جەڕباندمانـن، تاڵیـی و شـیرینیی، هـەورازو نشـێوو، سـەرماو گەرمایـان هاتـە ڕێ، نـازارو ناڕەحەتییـان هاتـە ڕێ.

ئنجـا لـە ئەنجامـی تاقیکردنەوەکـەدا ﴿ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾، خـوا ئەوانـە دەزانـێ کـە ڕاسـتیان کـردووەو، ئەوانـەش دەزانـێ کـە درۆکارن، واتـە: لـە ئەنجامـی تاقیکردنەوەکـەدا لەسـەر ئـەرزی واقیـع دەردەکـەون و دەزانرێـن، ئەگەرنـا خـوا ﷻ بـە زانیاریـی بێسـنووری خـۆی، پێـش تاقیکردنـەوەش هـەر ناسـیونی و، زانیونـی، بـەڵام لەسـەر ئـەرزی واقیـع دوای ئـەوەی تاقیدەکرێنـەوە، جەوهـەر و چییەتیـان دەردەکـەوێ.

﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ﴾، یان ئایا ئەوانەی کردەوە خراپەکان دەکەن، پێیان وایە پێشمان دەکەونەوە؟ لە دەستمان قوتار دەبن و دەرباز دەبن؟ ﴿ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾، ئەوە خراپترین حوکمە کە دەیدەن، خراپترین بۆچوونە، خراپترین بڕیارە دەیدەن و ڕاست نیە، ﴿ مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ ﴾، هەر کەسێک بە ئومێدی دیداری خوایە، واتە: لە بەهەشت و لە ڕۆژی دوایی دا بچێتە بەهەشت و بە دیداری خوا شاد بێ، ﴿ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٍ ﴾، بە دڵنیایی کاتی خوا، ئەو کاتەی خوا دیاریکردوە بۆ ئەوەی بەندەکانی بە دیداری شاد بن و، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت بۆ بەندەکانی بێنێتە گۆڕێ، بە تەئکید هەردێ، بە دڵنیایی، ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، ئەویش بیسەری زانایە، دەزانێ چییانگوتوەو دەزانێ چییانکردوە، دەبیستێ چیان گوتوەو، دەشزانێ چییانکردوە.

﴿ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ﴾، هەر کەسێکیش زۆر تێبکۆشێ و هەوڵ بدات و تەقەلـلا بکات، بە دڵنیایی تێکۆشانەکەی بە سوودی خۆیەتی، خۆی لێی بەهرەمەندە، بۆچی؟ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا بێنیازەو دەوڵەمەندە لە جیهانیان و پێویستیی پێیان نیە، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، ئەوانەش کە لە پێناوی خوادا تێدەکۆشن، با پێیان وانەبێ ڕەنج و زەحمەت و تەقەللایەکەیان، هەر تەنیا ئەوەندەیە پێی دەچنە بەهەشت، بەڵکو وێڕای ئەوەش، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، بە دڵنیایی خراپەکانیان لێ دەسڕینەوەو، پاکیان دەکەینەوە، ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، هەروەها بە دڵنیایی پاداشتیان دەدەینەوە بە باشترینی ئەو کردەوانەی دەیکەن، واتە: باشترین کردەوەیان دەکەینە پێوەر بۆ پاداشت دانەوەیان، یاخود پاداشتی باشترینی کردەوەکانیان دەدەینەوە، کە باشترینی کردەوەکان ئەوانەن بۆ خوا ئەنجام درابن، بە پێی بەرنامەی خوا بن و، ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاریان تێدا ڕەچاو کرابێ.

ئنجا لـە بـواری مامەڵـەی مـرۆڤ لەگـەڵ بـاب و دایکیـدا، لەبـەر ئـەوەی کـە نیزیکـترن بازنەیـە لـە مرۆڤـەوە، لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ ﴾، هەروەهـا مرۆڤـمان ڕاسـپاردوە، تامۆژگاریـیـمان کـردوە، لـە بـارەی بـاب و دایکیـەوە بـە چاکـە، ڕامانسـپاردوە کـە چاکەیـان لەگـەڵ بـکات، یانـی: (وَوَصَّيْنَـا الإِنْسَـانَ بِوَالِدَيْـهِ أَنْ يُحْسِـنَ إِلَيْهِـمَا حُسْـنًا). ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ ﴾، بـەڵام ئەگـەر زۆر هەوڵیـان لەگەڵـدای، شـتێک بکەیـە هاوبەشـم کـە زانیارییـت پێـی نیـە، واتـە: بوونـی نیـە چونکـە شـتێک کـە نەبـێ، زانیاریـی خـوا پێـوەی پەیوەسـت نابـێ، واتـە: هەوڵیـان لەگەڵـدای شـتێک بکـەی بـە هاوبەشـم کـە هاوبـەش نیـەو، لەسـەر ئـەرزی واقیـع بوونـی نیـە، تەنیـا لـە خەیاڵـدان و وەهمـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـدا هەیـە، ﴿ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ ﴾، لـەوەدا گوێڕایەڵییـان مەکـەو بـە قسـەیان مەکـە، لەگەڵیـان باشـبە، بـەڵام لـە کافـر بـوون و لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان، بەڵکـو لـە گوناهـو تاوانـدا بـە قسـەیان مەکـە، ﴿ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ ﴾، گەڕانەوەتـان بـەس بـۆ لای منـەو، دێنـەوە لای مـن، ﴿ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، ئنجـا ئـەو کاتـە هەواڵتـان پـێ دەدەم بـەوەی کـە دەتانکـرد، واتـە: ئەگـەر خـراپ بـێ، سـزاتان دەدەم و، ئەگـەر بـاش بـێ پاداشـتتان دەدەمـەوە، کەواتـە بزانـن چـۆن دێنـەوە بـۆ دیـدارو خزمەتـی مـن.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، دووبـارەی دەکاتـەوە: هەروەهـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ و، کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، چ پەیوەندییـان بـە دڵ و دەروونـەوە هەبـێ، چ بـە تەعبیرەکانـی زمـان (ئێسـتا بـە نووسـین)، چ بـە کـردەوەی ئەندامـەکان، ئەوانـەی کـە بڕوایـان هێنـاوە بـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێنـدرێ و، کـردەوە باشـەکان ئەنجامـدەدەن بـە هەمـوو جۆرەکانیانـەوە، ﴿ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی دەیانخەینـە نێـو چاکانـەوە، دەیانخەینـە ڕیـزی بەنـدە چاکەکانـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا.

ئنجا خوا ﷻ باسی جۆرە خەڵكێكی دیكە دەكات، كە لە تاقیكردنەوەكانی خوادا خۆڕاگرو دامەزراو نین ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾، هەروەها لە خەڵكی هەیە، هی وا دەڵێ: بڕوامان بە خوا هێناوە، ﴿ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ ﴾، بەڵام كاتێك لە پێناوی خوادا ئازاردرا: قسەی پێگوترا، دەركرا، نان بڕاو كرا، ناڕەحەتكرا، شەڕی پێفرۆشرا، گێچەڵی پێكرا، تۆمەتی پێكرا، لەپێناوی خوادا ئازاردرا، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، زیان بە جەستەی گەیەنرا، زیان بە ماڵ و سامانی گەیەنرا، زیان بە دەوروبەری گەیەندرا، هەر كامێك لەوانە ﴿ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴾، ئازاردانی خەڵك و تاقیكردنەوەی خەڵك بۆی، وەك ئازارو سزای خوا تەماشا دەكات، پێی وایە شتێكی زۆر گەورەی بەسەر هاتوە، بۆیە بە چۆك دادێ، ئەوە لە كاتی نەهاتیدا، ئنجا با بزانین لە كاتی هاتیدا چی دەكات؟ ﴿ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ ﴾، كاتێك لە پەروەردگاریشتەوە سەركەوتنێك، پشتگرتنێك هات، ﴿ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ ﴾، زۆر بە دڵنیایی دەڵێن: ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا بووین، دەبێ لە خێردا شەریك بین، (لە شەڕێدا تەریكن، بەڵام دەیانەوێ لە خێرێدا شەریك بن!)، لە كاتی ناڕەحەتییاندا بە چۆك دادێن و تەسلیم دەبن، سزادانی خەڵكیان پێ وەك ئازاری خوا وایە، بۆیە لە بەرانبەریدا تەسلیم دەبن، بە چۆك دادێن، بەڵام لە كاتی هات و لەكاتی خۆشییدا، خۆیان بە هاوبەش دەزانن، لە حاڵێكدا: ئەو كەسە لە هاتدا هاوبەشە، كە لە نەهاتدا خۆڕاگر بێ، ئەو كەسە لە كاتی خۆشیی دا پشك و بەشی هەیە، كە لە كاتی ناخۆشییدا خۆڕاگربێ، بە چۆك دانەیەت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئەو(أ)یە هەمزەی پرسیار لێكردنی نكووڵیلێكەرانەیە، ئایا خوا زاناتر نیە بەوەی لە سینەكانی جیهانییان دا هەیە؟ خوا دەزانێ چی لە سینەكانیاندا هەیە، ئەگەر سینەكانیان ئیمان و تەقوای تێدا بێ، بە تەئكید جەستەشیان خۆڕاگر دەبێ، وەك من پەندێكی عەرەبییم هەیە دەڵێم: (لاَ يَضْعُفُ جِسْمٌ عَمَّا قَوِيَتْ عَلَيْهِ الرُّوح) واتە: هەرگیز جەستە بێهێز نابێ، لە بەرانبەر شتێكدا كە ڕووح لە بەرانبەریدا

بەهێز بێ، ئەوە ڕووحە هێز دەداتە جەستە، هەروەها هەر ڕووحە کە هێزو پێز لە جەستە دەبڕێ، ئەگەر ڕووحەکە تێشکاو مرۆڤ لە دەروونەوە تێشکا، بە ڕواڵەتیش تێدەشکێ، ئەگەر لە دەروونەوە خۆڕاگربێ، بە ڕواڵەتیش خۆڕاگرە.

﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾، بە دڵنیاییش خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەیانزانێ، دەیانناسێ و، مونافیقەکانیش دەناسێ و دەیانزانێ.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، بەوانەیانگوت کە بڕوایان هێناوە، بە تەئکید ئەوانەی بێبڕوان یانی: سەران و سەرمەشقانی کافران، ئەوانەی بڕیار بە دەست و خاوەن بڕیارن، ﴿ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ ﴾، ئێوە شوێن ڕێبازەکەی ئێمە بکەون و، با ئێمەش گوناهەکانتان هەڵگرین، ئەم (ل)ە، دەگونجێ (لام الأمر)بێ واتە: ئێمەش فەرمان بە خۆمان دەکەین کە گوناهەکانتان هەڵبگرین، دەشگونجێ (لام العاقبة) بێ، واتە: دوای ڕێبازەکەی ئێمە بکەون و، سەرەنجام ئێمەش گوناهەکانتان هەڵدەگرین و لە کۆڵتان دەکەینەوە، ناهێڵین ئێوە لە سەریان سزا بدرێن، دەیانخەینە سەر گوناهەکانی خۆمان، ﴿ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ ﴾، خوا دەفەرموێ: بەڵام ئەوان هەڵگری هیچ کام لە گوناهو تاوانەکانیشیان نین، ﴿ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە درۆ دەکەن کە دەڵێن: گوناهەکانتان هەڵدەگرین، هەڵبەتە کافرەکان مەبەستیان بە تەوس و توانجەوە قسەکردن بووە لەگەڵ بڕواداران داو، بڕوایان بەوە نەبووە کە ڕۆژێک دێ لەسەر کوفرو خراپەکانیان سزا بدرێن، تاکو هی بڕوادارانیش بخەنە سەر ملی خۆیان، لە حاڵێکدا کە شوێنیان دەکەون و، واز لە تایین و بەرنامەکەیان دێنن، ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی قورساییەکانی خۆیان هەڵدەگرن و، چەند قورساییەکیش لەگەڵ قورساییەکانی خۆیاندا، واتە: وێڕای قورساییەکانی خۆیان، قورسایی دیکەش هەڵدەگرن، گوناهەکانی خۆیان کە قورساییین هەڵیاندەگرن، گوناهەکانی ئەوانەش کە گومڕایان دەکەن و لەڕێیان لادەدەن، گوناهەکانی

ئەوانیش، دیارە گوناهی گومڕا کردنەکەیان، نەک گوناهەکانی ئەوان بخەنە سەر کۆڵی خۆیان، وەک خۆیان بەڵێنیان داوە، نا، لەوەدا درۆ دەکەن، بەڵام گوناهی ئەوەیان هەڵدەگرن، کە گومڕایانکردوون، ئەگەرنا گومڕایەکانیش گوناهیان هەر لە ئەستۆی خۆیانە، بەڵام گومڕاکەرەکان گوناهی خۆیانهەڵدەگرن و، گوناهی گومڕاکردنی ئەوانیش هەڵدەگرن، ﴿وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا، لە بارەی ئەوەوە کە هەڵیاندەبەست لە بارەی خواوە کە گوایە دەتوانن لە قیامەتدا گوناهەکانیان بۆ لە کۆڵ بنێن و هەڵیانبگرن، لە کۆڵ ئەوانیان بکەنەوە، لەسەر ئەوە لێیان دەپرسرێتەوە واتە: لەسەری سزا دەدرێن، چونکە پێیان دەگوترێ: بۆچی واتانگوت؟ ئایا زانیارییتان هەبوو لە خواوەو، بەڵێنێکتان پێدرا بوو لە خواوە؟ بۆچی ئەو درۆیەتان بە ناوی خواوە کرد؟ بۆچی ئەوەتان هەڵبەست؟ لەسەر ئەوە کە لێیان دەپرسرێتەوە یانی: سزا دەدرێن و سەرزەنشت دەکرێن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**حەتمیی بوونی تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندە بڕوادارەکانی و، لێک جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاستیان و، دەربازنەبوونی خراپەکاران لە سزای خواو، بێنیازیی خوا لە مرۆڤەکان و، پاککرانەوەی بڕواداران لە خراپەکانیان و، بە باشترین شێوە پاداشت درانەوەیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَـٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَـٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿الٓمٓ ﴿١﴾﴾، لە بارەی پیتە پچڕپچڕەکانەوە کە لە سەرەتای (٢٩) سوورەت لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، زانایان زۆر شتیان گوتوە، ئێمەش باسێکی خەست و خۆڵمان لەو بارەوە کردوە، لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، بۆیە هەمیشە خوێنەرانی بەڕێز دەگێڕینەوە بۆ ئەوێ، لێرەدا هەر ئەوەندە زیاد دەکەین، کە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (الٓمٓ) یاخود (صٓ) یان (قٓ) ئەوانە بۆ ئاگادار کردنەوەن، واتە: مەرج نیە مانایەکی تایبەتیان هەبێ، تەنیا بۆ ئاگادار کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بووە کە ئەوە سوورەتێکی بۆ دێ.

ئنجا **(الشعراوي)** لە **(خواطر)**ەکەی خۆیدا قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: ئەگەر کەسێک کەرەستەی ئاوریشمی بخەیە بەر دەست و، یەکێکی دیکەش موو (مووی بزن)، یان خوریی مەڕ، یان تووکی حوشتر، ئنجا بڵێی: شتێکم بۆ بچنن، ئەوانەیان کە موو یان خوریی، یان تووکی حوشتریان لە بەردەست دایە، ئەگەر نەیانتوانی شتێکی جوانی وەک ئەو کەسە بچنن کە ئاوریشمی لە بەردەست دایە، بۆیان هەیە بڵێن: ئاخر ئێمە کەرەستەکەمان لە ئاست کەرەستەی ئەودا نەبوو!! دەڵێ: ئەو کەرەستەیەی خوا قورئانی لێ پێک هێناوە، ئەو فەرمایشتەی خۆی، کە پیتەکانن، دەنگەکانن، هەر ئەو بیست و نۆ پیتەن کە ئێمە قسەیان پێ دەکەین، کە لە زمانی عەرەبییدا هەن، لە زمانی کوردییش دا چەند پیتێکیان بۆ زیاد کراون کە: (پ و چ و ژ و ڤ و ڕ) ن، چەند پیتێکیش کە لە عەرەبییدا هەن لە کوردیدا نین کە: (ص، ض، ذ، ث، ظ.ط)ن، ئنجا ئەو پیتانە لە بەردەستی مرۆڤەکانیشدا هەن، ئەو دەنگانە لە بەردەستی مرۆڤەکانیشدا هەن و، هەمان کەرەستەن، ئنجا مادام خوا ﷻ توانی فەرمایشتێک لەو پیتانە بێنێتە دی، کە ئێوە لە بەرانبەریدا دەستەوسانن و ئێوە ناتوانن شتێکی ئاوای لێ بێننە دی، کەواتە: بزانن ئەو فەرمایشتە کە خوا ﷻ لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێکی هێناوە، کە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، بزانن سەرچاوەکەی و بێژەرەکەی خوایە ﷻ، ئەگەرنا ئەگەر مرۆڤێکی وەک خۆتان بووایە، موحەممەد ﷺ یان غەیری موحەممەد، ئێوەش دەتانتوانی شتێکی وەک ئەوە، یاخود نیزیک لەوە بێننەدی.

٢)- ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴾، ئایا خەڵک پێیان وایە وازیان لێ بهێنرێ، بەوە کە گوتیان بڕوامان هێناوەو ئەوان تاقیناکرێنەوە؟! (أَحَسِبَ) ئەم هەمزە (أ)یە هەمزەی پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: من نکووڵیی دەکەم کە ئەوە وابێ، مرۆڤ یان خەڵک وازیان لێ بهێنرێ، هەر بەوەندەی کە دەڵێن: بڕوامان هێناوەو تاقیی نەکرێنەوە.

ڕستەی: ﴿ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا ﴾، تەنیا بەوەندەی کە دەڵێن: بڕوامان هێنا، (**فِي مَوْضِعِ النَّصْبِ عَلَى نَصْبِ الخَافِضِ الَّذِي هُوَ لَامِ التَّعْلِيلِ، أَيْ لِأَجْلِ أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا**)، کەواتە: ئاوای لێدێتەوە: (**أَنْ يُتْرَكُوا لِأَجْلِ أَن يَقولوا آمَنَّا**)، (أَن يُتْرَكُوٓاْ) ئەو شتەی ژێردار (**مَجرور**)ی کردوە، لێیداڕندراوە، کە (ل)ەو چۆتە شوێنی سەردار (**مفتوح- منصوب**)، یانی: (**أَحَسِبَ النَّاسُ تَرْكَهُم**)، ئایا وایانزانی وازیان لێ بیهێنرێ؟ بە هۆی ئەوەوە کە دەڵێن: بڕوامان هێنا! نەخێر، ناگونجێ لەبەر ئەوەندە وازیان لێ بهێنرێ.

﴿ وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴾، ئەوان تاقیی ناکرێنەوە، (لَا يُفْتَنُونَ) واتە: لە لایەن خوای بەرزەوە تاقیی نەکرێنەوە، یاخود (لَا يُفْتَنُونَ) واتە: ئازار نەدرێن لە لایەنی کافرەکانەوە، واتە: ئازارو ئەشکەنجە نەدرێن، ناگونجێ بڵێن: بڕوامان هێناو، خوا تاقییان نەکاتەوە، یاخود لە لایەن ناحەزو دوژمنەکانیانەوە کە ئەهلی کوفرن، ئازار نەدرێن و ناڕەحەت نەکرێن.

٣)- ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، **بە دڵنیایی ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیکردەوە، ئازارو ناڕەحەتیی و، سەرئێشەو هەورازو نشێومان بۆ هێنانە پێش، ئەمە یاسای خوا بووە لە ژیانی خەڵکدا، کە تاقییان بکاتەوە.**

٤)- ﴿ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، **(خوا تاقییان دەکاتەوە) سەرەنجام بەمسۆگەریی ئەوانەی ڕاستیانکردوە دەیانناسێ و دەیانزانێ و، ئەوانەش کە درۆکار بوون، ئەوانەش دەزانێ.**

بۆ بڕواداران بە: ڕاستیانکردوە (صَدَقُواْ) هێناویەتی، یانی: تێپەڕیوەو ڕاستیان کردوە لەگەڵ خواداو، بڕوایان هێناوە، بەڵام بۆ ناڕاستەکان فەرموویەتی: درۆکاران (ٱلْكَٰذِبِينَ) چونکە بەو سیفەتی درۆکردنە ناسراون، (**كاذِبين**) کۆی (**كاذِب**) و ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ەو، چەسپاویی دەگەیەنێ، ئەو سیفەتی درۆکردنە تێیاندا چەسپاوە.

لەو بارەوە ئەم دەقە بێنین باشە، کە زیاتر تیشک دەخاتە سەر ئەو کەش و بارودۆخە، کە ئەم سووڕەتی (العنکبوت) بە گشتیی و، ئەم ئایەتانەی سەرەتای تێدا دابەزیون:

{ عَنْ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَنْ أَظْهَرَ إِسْلاَمَهُ سَبْعَةٌ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعَمَّارٌ، وَأُمُّهُ سُمَيَّةُ، وَصُهَيْبٌ، وَبِلاَلٌ، وَالمِقْدَادُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، فَأَمَّا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَمَنَعَهُ اللهُ بِعَمِّهِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَمَّا أَبُو بَكْرٍ فَمَنَعَهُ اللهُ بِقَوْمِهِ، وَأَمَّا سَائِرُهُمْ فَأَخَذَهُمُ المُشْرِكُونَ فَأَلْبَسُوهُمْ أَدْرَاعَ الْحَدِيدِ، وَأَوْقَفُوهُمْ فِي الشَّمْسِ، فَمَا مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ وَاتَاهُمْ عَلَى مَا أَرَادُوا غَيْرَ بِلاَلٍ، فَإِنَّهُ هَانَتْ عَلَيْهِ نَفْسُهُ فِي اللَّهِ وَهَانَ عَلَى قَوْمِهِ، فَأَعْطَوْهُ الوِلْدَانَ فَجَعَلُوا يَطُوفُونَ بِهِ فِي شِعَابِ مَكَّةَ، وَجَعَلَ يَقُولُ: أَحَدٌ أَحَدٌ} (أخرجه أحمد ٣٨٣٢، وابن ماجه: ١٥٠، والحاكم: ٥٢٣٨، والبزار: ١٨٤٥، والبيهقي في الكبرى: ١٧٣٥١، وحَسَّنَهُ كُلّ من الألباني وشعيب الأرنؤوط).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یەکەمین کەسانێک کە مسوڵمانەتیی خۆیان ئاشکرا کرد، حەوت کەس بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبوو بەکرو، عەممارى کوڕی یاسیرو سومەییەی دایکی و، صوهەیب و، بیلال و، میقداد، خوا لێیان ڕازی بێ، هەرچی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، خوا بە هۆی ئەبوو تاڵیبی مامیەوە پاراستی، هەروەها ئەبوو بەکریش خوا بە هۆی خزمەکانیەوەو خەڵکەکەیەوە پاراستی، بەڵام ئەوانی دیکە، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان گرتیانن، زرێی ئاسنیان لەبەر کردن و، لەبەر خۆر ڕایاندەگرتن، هیچ کامیان نەبوو، مەگەر ئەوەی کە هاوبەش دانەرەکان لێیان دەویست، نەرمییەکی بۆ نواندن، جگە لە بیلال، ئەو لە پێناوی خوادا نەفسی خۆی پێ هیچ نەبوو و، خەڵکەکەش کە کۆیلەیان بوو، پێیان هیچ نەبوو، چونکە بێکەس بوو، بۆیە گرتیان و، تەسلیمی منداڵە وردکانیان کرد، منداڵە وردکە لە دۆڵ و شیوەکانی مەککەدا دەیانگێڕا، ئەویش هەر دەیگوت: (أَحَدٌ أَحَد) خوا تاکە تاک، هاوبەشی نیە، (تێوە بە هەڵەدا چوون هەمووتان).

هەڵبەتە کە دەڵێن: هیچ کامیان نەبوو، مەگەر شتێکی پێدان لەوەی کەویستیان، یانی: بیلال لە هەموویان سەرسەختترو، توندتر بووە، ئەگەرنا وەنەبێ ئەوانیش پەشیمان بووبنەوە، بەڵام ڕەنگە ئەو سەختیی و پتەویی و ڕووبەڕوو بوونەوە بەهێزەی بیلالیان (بە ڕای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود) نەبووبێ، لێرەدا دەبێ ئەو تێبینییە بخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی کە ستایشی بیلال دەکەین، سەرزەنشتی هاوەڵانی دیکە نەکەین (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەموویان کێو بوون، خۆڕاگر بوون، شێر بوون، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود وای هاتۆتە بەرچاو، لەسۆنگەی ئەوەوە کە بیلالیان زۆر ئەزیەت داوەو ئاڕەحەتیان کردوە، پێی وابووە ئەو بە هیچ جۆرێک، هێندەی تاڵە مووێک تەنازولی بۆ نەکردوون، بەڵام ئەوانی دیکە ڕەنگە شتێکیان گوتبێ و شتێکیان کردبێ، بێبڕوایەکان پێیان خۆش بووبێ، ئەوەش بۆچوونی ئەوە (خوا لە هەموویان ڕازی بێ).

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەوانەی کە خراپە دەکەن و، سزای ئەو مسوڵمانە چەوسێنراوانەیان داوە:

٥)- ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ﴾، یان ئایا ئەوانەی خراپەکان دەکەن، پێیان وایە پێشمان بکەونەوە، لەدەستمان دەربازبن؟ کە لە خراپەکانیان: کوفرە، شیرکە، قەتڵە، زینایە، مەیخۆرییە، ... هتد، بەڵکو بەشێک لەو گوناهانەشیان ئازارو ئەشکەنجەدانی مسوڵمانانە لەسەر ئیمان.

(أَمْ حَسِبَ) (أَم: لِلإِضْرَابِ الإنتِقَالِي وَيُقَدَّرُ بَعدَهَا الإِسْتِفهَامُ الإِنكَارِيُّ)، (أَمْ) بۆ گواستنەوەیە، واتە: ئەوە نیە، بەڵکو لەوە خراپتر، یان ئەوە نیە بەڵکو لەوە چاکتر، ئنجا لە دوای ئەوە پرسیارکردنی نکووڵیلێکردن (إِسْتِفهَام الإِنكَارِي) تەقدیر دەکرێ، واتە: یان ئایا ئەوانەی کە خراپەکاریی دەکەن، پێیان وایە لە دەستمان دەرباز دەبن؟ بە نکووڵیلێکردنەوە وا دەفەرمووێ، نەخێر دەرباز نابن.

﴿أَن يَسْبِقُونَا﴾، ئایا ئەوانەی ئەو خراپانە دەکەن، پێیان وایە پێشمان بکەونەوە؟ کەسێک کە پێش کەسێک دەکەوێتەوەو لێی تێدەپەڕێ، مانای وایە بۆی ناگیرێ، یانی: لێمان دەرباز بن و لە دەستمان قوتار بن و نەتوانین سزایان بدەین؟

٦)- ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾، ئەوە خراپترین دادوەرییە دەیکەن، یانی: (بِئْسَ الحُكْمُ حُكْمُهُم) ئەوە خراپترین حوکمە، خراپترین بۆچوونە کە ئەوان هەیانە، بە تەئکید لە دەستی ئێمە دەرباز نابن.

٧)- ﴿مَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَءَاتٍ﴾، [ئەمە دڵدانەوەی بڕوادارانە]، هەر کەسێک بە ئومێدی دیداری خوایە، بە دڵنیایی کاتی دیداری خوا دێ، ئەو کاتەی خوا دیارییکردوە بۆ دیداری خۆی، (أَجَلَ ٱللَّهِ): (أَجَلُ اللهِ لِلِقَائِهِ، وهو الوَقْتُ الَّذِي عَيَّنَهُ اللهُ لِلبَعْثِ وَالحِسَاب) واتە: مەبەست پێی ئەو کاتەیە کە خوا دیارییکردوە بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، یان: ئەو کاتەی خوا دیارییکردوە بۆ سەرخستنی بڕواداران و دەربازکردنیان لەو واقیعە تەنگ و تاڵەی تێیکەوتوون، لە شاری مەککە، یان لە هەر شوێنێکی دیکە کە مسوڵمانان تێیدەکەون، دێ، چونکە ئەم ئایەتانە بەڵێ یەکەمجار لە مەککە دابەزیون و ئەو خەڵکەی کە لەو ڕۆژگارەدا ژیاون، یەکەمجار پێیان دوێنراون، بەڵام لە ڕاستییدا دوایی بۆ تێکڕای بەشەرن بە چاک و خراپیانەوە.

٨)- ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾، هەر خوا بیسەری زانایە، واتە: قسەی هەمووان دەبیستێ، زاناشە بە کردەوەی هەمووان و، بە نهێنیی نێو دڵی هەموویان.

٩)- ﴿وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ﴾، هەر کەسێکیش تێبکۆشێ و زۆر خۆی ماندوو بکات، بە دڵنیایی زۆر خۆ ماندوو کردن و، تێکۆشان و تەقەللا دانەکەی بە سوودی خۆیەتی، یانی: (نَفْعُ جِهَادِهِ رَاجِعٌ إليهِ فِي الدُّنيَاوالآخِرَة) لە دنیاو دواڕۆژدا سوودی تێکۆشان و هەوڵدانەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بۆیەش (إِنَّمَا)ی خراوەتە سەر، چونکە (إنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات) (إِنَّمَا) ئامرازی چەسپاندن و کورتهەڵێنانە، یانی: بە دڵنیایی تەنیا خۆی لە

تێکۆشانەکەی بەهرەمەندە، خوا ﷻ پێویستیی بە تێکۆشانی کەس نیەو، پەکی لەسەر نەکەوتوەو، خوا لەوە بەرزترە کە مرۆڤەکان بە هەوڵدان و تێکۆشانی خۆیان، بتوانن سوودی پێ بگەیەنن، یان بە پێچەوانەوە: بە کوفرو تاوانیان بتوانن زیانی لێ بدەن، ئەمە وەک ئەو ئایەتە موبارەکە وایە کە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ ﴾فاطر، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن بۆ لای خواو، خوا بێنیازی شایستەی ستایشە، ستایشکراوە.

١٠)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بێگومان خوا بێنیازە لە جیهانییان، پێویستیی بە تێکۆشانی کەس نیە، پێویستیی بە خۆ ماندوو کردنی کەس نیە، ئەو مرۆڤەکانن کە پێویستییان بەوە هەیە لە پێناوی خوادا تێبکۆشن و، تەقەللا بکەن و هەوڵبدەن.

١١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێبهێنرێ و، کردەوە باشەکان ئەنجامدەدەن، بێگومان ئێمە خراپەکانیان لێدەسڕینەوە، واتە: بە هۆی ناڕەحەتیی و گرفتارییەکان و، سەرئێشەو ئازارو مەینەتییەکانەوە کە کافرەکان بۆیان دێننە پێش، گوناهەکانیان لێ دەسڕینەوەو پاکیان دەکەینەوە، چاکیان دەکەین.

١٢)- ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، پاداشتی باشترینی ئەوەش کە دەیکەن، باشترینی کردەوەکانیان، دەدەینەوە، (**أَحْسَنَ: وَصْفٌ لِمَصْدَرٍ مَحْذُوفٍ وَهُوَ مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ مِن فِعْلِ** (وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ) **وَتَقْدِيرُهُ: وَلَنَجْزِيَنَّهُم جَزَاءَ أَحْسَنِ أَعْمَالِهِم، أَي: جَزَاءً هُوَ مُقَدَّرٌ بِأَحْسَنِ أَعْمَالِهِم**)، وشەی (أَحْسَنَ) وەسفە بۆ چاوگێکی قرتێندراو کە بریتیە لە بەرکاری ڕەها (**مَفْعولٌ مُطْلَقٌ**) لە کرداری: (وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ): (**لَنَجْزِيَنَّهُم جَزَاءَ أَحْسَنِ أَعْمَالِهِم**) پاداشتیان دەدەینەوە، پاداشتی باشترینی کردەوەکانیان، واتە: پاداشتێک کە ئەندازەگیریی دەکرێ، بە باشترینی کردەوەکانیان و، باشترین کردەوەکانیان دەکرێنە پێوەر بۆ پاداشت دانەوەیان.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا ئامۆژگاریی مرۆڤی کردوە کە لەگەڵ باب و دایکیدا چاکەکاربێ، بەڵام بۆ کوفرو شیرک گوێڕایەڵیان نەبێ و، بڕوادارانیش دڵنیابن کە دەخرێنە نێو چاکەکارانەوە، لە ڕۆژی دوایی دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴾، مرۆڤمان ڕاسپاردوە کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکات، (حُسْنًا): (اسمُ مَصْدَرٍ، أي بِإِحْسَانٍ، أي: وَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْه بِحُسْنٍ، بِنَزْعِ الخَافِضِ)، (حُسناً) ناوی چاوگە، یانی بەچاکەکاریی، واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردوە بە چاکە کردن بە داڕنینی ژێردارکەر.

زانایان و شارەزایانی زمانی عەرەبیی، بە چەند جۆرێک واتای ئەم ڕستە قورئانییەیان لێکداوەتەوە:

أ- وشەی (حُسْنًا) ناوی چاوگە ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴾، واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردوە بە چاکەکردن لەگەڵ باب و دایکی، (وَصَّينَا الإنسَانَ بِوَالِدَيْهِ بِحُسْنٍ) ئەو (ب)ی دەبێتە هۆی ژێردار (مجرور) کردنی، لێی لابردراوە، کە پێی دەگوترێ: (نَزعِ الخافِضِ) سەرەنجام (منصوب) بووەو بۆتە (حُسْنًا).

ب- هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: (وَوَصَّيْنَا الإنسَانَ بِوَالِدَيْه وَوَصَّيْنَاهُ حُسْناً) واتە: مرۆڤمان بەرانبەر دایک و بابی ڕاسپاردووەو، ئامۆژگارییمان کردوە بە چاکە لەگەڵیاندا.

٢)- ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، ئنجا یەكسەر خوا ﷻ لە شێوەی نادیارەوە دەیگوازێتەوە بۆ شێوەی دواندن (خطاب): ئەی ئینسان! هەركاتێک باب و دایكت زۆر هەوڵیان لەگەڵدای، لەگەڵت تێكۆشان كە هاوبەشێكم بۆ پەیدابكەی، كە زانیارییت لە بارەیەوە نیە، شتێک بكەیە هاوبەشم كە تۆ زانیارییت پێ نیە، یانی: بوونی نیە، بۆیە زانیاریی پێوەی پەیوەست نابێ، (أي: أشْيَاءٌ لَا تَسْتَنِدُ إِلى دَلِيلٍ مِنْ عَقْلٍ أو شَرْعٍ عَلَى اسْتِحْقَاقِهَا للعِبَادَةِ)، واتە: شتانێک بكەیە هاوبەشم كە پشت ئەستوور نین بە بەڵگەی عەقڵ یان شەرع، كە شایستەی پەرستانن.

(الزمخشري) لە تەفسیری (الكشاف)دا دەڵێ: (إِنَّ نَفْيَ الْعِلْمِ كِنَايَةٌ عَنْ نَفْيِ الْمَعْلُومِ)[1]، كە دەفەرموێ: ﴿ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾، ئەمە كینایەیە بۆ ئەوەی بوونیان نیە، واتە: ئەگەر باب و دایكت هەوڵیان لەگەڵدای، شتێک بكەیە هاوبەشم كە بوونی نیە.

٣)- ﴿ فَلَا تُطِعْهُمَآ ﴾، بە قسەیان مەكە، فەرمانبەرییان مەكە.

٤)- ﴿ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ ﴾، گەڕانەوەتان بۆ لای منە، نەیفەرمووە: (مَرْجِعُكُمْ إِلَيَّ)، بەڵكو فەرموویەتی: ﴿ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ ﴾، ئەم ژێردارکەر و ژێردارکراو (الجارُّ والمجرور)ە كە پێشدەخرێ، دەلالەت لەسەر كورتهەڵێنان دەكات، یانی: گەڕانەوەتان تەنیا بۆ لای منە، ئەمە ترساندنە لەوەی كە بە قسەی باب و دایک بكرێ لە كوفرو لە تاوان و خراپەدا.

٥)- ﴿ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، هەواڵتان پێدەدەم بەوەی كە دەتانكرد، دیارە پەیوەست (لازم)ی هەواڵ پێدان، ئەوەی كە لە هەواڵ پێدانەوە دێتە دی، بریتیە لە سزا، یاخود پاداشت دانەوە، كە لێرەدا مەبەست پێی سزایە.

٦)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە و، كردەوە باشەكانیان ئەنجامداون، بە مسۆگەریی دەیانخەینە نێو بەندە چاكەكانەوە.

---

(١) التحرير والتنوير ج٢٠، ص٢١٤، لمحمد الطاهر بن عاشور.

ئەمەش جۆرێک لە دڵدانەوەیە بۆ ئەوانەی باب و دایکیان لێیان توورە دەبن لەسەر خوا، لەسەر ئیسلام، لەبەر ئەوەی کە بە قسەیان ناکەن لە گوناهو لە تاوان دا، باب و دایکیان پەیوەندییان لەگەڵ دەپچڕێنن، زۆر جاران ئەوە بۆ گەنجەکان دێتە پێش، کچە یان کوڕە، باب و دایکی دەیبوغزێنن، لەبەر ئەوەی هاموشۆی مزگەوت دەکات، یان لەبەر ئەوەی گوێ دەگرێ لە وتاری مامۆستایەک، یان لەبەر ئەوەی کتێبی خەڵکێکی دیندارو ئیسلامیی و بۆ خوا سوڵحاو دەخوێنێتەوە، یان گوێ لە وتارەکانیان دەگرێ، هاموشۆیان دەکات، یان لەگەڵیان تێکەڵ دەبێ، باب و دایکی دەیبوغزێنن، لێرە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، با پەکیان بەوە نەکەوێ کە باب و دایکیان، یان خزم و کەسیان دەیانبوغزێنن و دوورییان لێدەکەن بە ناهەق، ئێمە دەیانخەینە نێو چاکانەوە، لە دنیادا دەکەونە نێو کاروانی بۆ خوا صوڵحاوان، کە پێغەمبەران سەرقافڵەینی، لە دواڕۆژیشدا دەیانخەینە نێو چاکانەوەو، ئەو کاتە بێنیازو بێ منەت دەبن، لەو باب و دایکەیان کە ڕێی دینداریيان لێدەگرن، یان لەو خزم و کەسانە، یان لەو دۆست و ڕەفیقانە کە لە ئەنجامی ئەوەدا کە واز لە ڕێبازی چەوتی ئەوان دێنن، دەیانبوغزێنن و دوورییان لێ دەکەن و حاشایان لێ دەکەن، هەم لە دنیادا هەم لە دواڕۆژدا، دەیانخەینە ڕیزی ئەو کاروانە نوورینەوە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) سەر قافڵەینی.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی جۆرە کەسانێکی بێهێزو لەرزۆک کە وەک سزای خوا تەماشای ئازاری مرۆڤان دەکەن و، لە کاتی هاتیشدا لافی زل زل لێدەدەن! بێخەبەر لەوەی خوا بە نهێنیی سینەکان ئاگادارەو، بڕوادارو دەغەڵان دەناسێ و، لە یەکیان هەڵدەوێرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایاتە، لە هەشت بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ ﴾، هەروەها لە خەڵکی هەیە، کەسانێک کە دەڵێن: بڕوامان بە خوا هێناوە.**

**لە هەندێک لە تەفسیرەکاندا هاتوە: (هَذَا فَرِيقٌ أَسْلَمُوا بِمَكَّةَ كَانَ حَالُهُم فِي عِلاقَاتِهِم مَعَ المُشْرِكِين حَالَ مَنْ لا يَصْبِرُ عَلَى الأَذَى، فَإِذَا لَحِقَهُم أَذَىً رَجَعُوا إِلى الشِّرك)، ئەمە باسی دەستەیەکە کە لە مەککە مسوڵمان بوون، بەڵام حاڵیان لە پەیوەندیی لەگەڵ هاوبەش بۆ خوادانەرەکاندا، وەک حاڵی کەسانێک بوو کە لەسەر ئازارو مەینەتیی خۆڕاناگرن، کاتێکیش ئازارێکیان تووش دەبوو دەگەڕانەوە بۆ شیرک.**

**لەوانەیە ئەمانە تاکو تەرایەکی کەم بووبن، بۆیە لە کتێبەکانی سیرەدا بە شێوەیەکی وا ناویان نەهاتوە زەق بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ باس دەکات و دیارە کەسانێکیش بەو جۆرە هەر بوون.**

**٢)- ﴿ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ ﴾، کاتێک لە پێناوی خواداو، لەبەر خوا ئازار درا.**

٣)- ﴿ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴾، ئازارردانی خەڵک وەک سزاو ئازاری خوا تەماشا دەکات، (أي: جَعَلُوا أَذَى الكُفّارِ مُسَاوِياً لِعَذَابِ الله) واتە: ئازاردان و ئەشکەنجەدانی کافرەکان، ناڕەحەتییەکانی کە ئەوان بۆیان دێننە پێش، وەک سزاو ئازاری خوا تەماشا دەکەن، پێیان وایە شتێکی زۆر گەورەیان بەسەرهاتوە.

ئەمەش وایە: ئینسان تاکو ئیمانەکەی مەحکەمتر بێ، ئەو ناڕەحەتییانەی دێنە ڕێی، بە بچووکتریان تەماشا دەکات، بەڵام ئەگەر ئیمانەکەی وەک پێویست نەبێ، شتێکی گچکەی بەسەر بێ، پێی وایە بەڵایەکی بەسەر هاتوە، بەسەر کەس نەهاتوە، هی وا هەیە من دەیبینم، یان دێتە لام لە مەلاو لە غەیری مەلا، شتێکی گچکەی بەسەرهاتوە، چەند ڕۆژێ دەگیرێ، ماوەیەک دەگیرێ، یاخود زیانێکی ماددیی پێدەگات، یاخود شتێکی لەسەر دەنووسرێ، یان پڕوپاگەندەیەکی بۆ دەکرێ، بە شێوەیەک لە شێوەکان ئازار دەدرێ، دێ، دنیای لێ هاتۆتەوە یەک، پێی وایە لە بن درەختێکە یەک گەڵای پێوە نیە، دڵی بۆتە توورەکەی بزماران، پێمگوتوە: ها چییە چیت لێ قەوماوە؟ شتیان لەسەر نووسیوم، یان فڵان قسەیان پێگوتووم، یان: فەسڵیان کردووم و نانیان بڕیوم، یان: دەریان کردووم لە شوێنەکەم، یان: گێچەڵم پێدەکەن و ڕەنگە بمگرن!!

بۆیە ئەمە هەمووی هۆشداریی پێدانە، کە خوا دەفەرموێ: هی واهەیە ئەگەر لە پێناوی خوادا ئازاردرا، ئازاردان و ئەشکەنجەدانی خەڵک، وەک سزای خوا، تەماشا دەکات، نەفامی واش هەیە هەندێک پەندی پێشینان دەڵێ، کە خەڵکی نەفام و بوودەڵە گوتوویانە: (لۆمەی عەبدان لە عەزابی قەبر ناخۆشترە)، کە ئەو قسەیە هیچ نیە، چونکە خوا بە دەقی ئایەت دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴿٥٤﴾ ﴾المائدة، ئەوانەی خوا خۆشی دەوێن و خوایان خۆش دەوێ، لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، بێ باک و بێ منەتن، ئەگەر پەیوەندییت لەگەڵ خوادا باش بێ، نە بە مەدحی خەڵک زۆر دڵخۆش دەبی، نە بە زەمیان زۆر دڵناخۆش دەبی، بەڵێ! مرۆڤ قسەی خۆشی پێ خۆشە‌و، هی ناخۆشی پێ

ناخۆشـە، بـەڵام کەسـێک کـە هاوسـەنگیی تێکدەچـێ و زۆر دەشـڵەژێ، لەبـەر ئـەوەی دوو قسـەی پێگوتـراون، بەڵایەکـی بەسـەرهاتووەو نارەحـەت بـووە، بابـای وا لەڕاستەڕێ لایـداوە، لـە جیاتـی ئـەوەی دڵـی پـێ خـۆش بـێ بڵـێ: کـێ لەسـەر خـوا تووشـی نارەحەتیـی بـووە؟ پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) و بـۆ خوا سـوڵحاوان، منیـش تووشـی نارەحەتیـی بـووم لەسـەر خـواو ئایینـی خـوا، کەواتـە: دەبـێ دڵـم بـە خـۆم خـۆش بـێ کـە لەسـەر ڕێـی پێغەمبـەرم ﷺ! کەچـی ئـەو لـە جیاتـی ئـەوەی دڵـی بـە نارەحەتییـەک خۆشـبێ، کـە لەسـەر خـوا تووشـی هاتـوە، سـەری دنیـای لـێ دێتـەوە یـەک!!

٤)- ﴿ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەگەر یارمەتیی و سەرخستنێک لە پەروەردگارتەوە هات.

٥)- ﴿ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ ﴾، دەڵێن: ئێمەش لەگەڵ ئێوە بووین.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە لەمـەودوا مسـوڵمانان دەرووی خێریـان لێدەکرێتـەوەو، یارمەتییـان بـۆ دێ و خـوا سـەریان دەخـات، واتـە: لـەم حـاڵ و بارودۆخـە کـە لـە مەککـە تێیـدا بـوون، نامێننـەوە، لـەو مەینەتییانـەدا نامێننـەوە، خـوا دەرووی خێریـان لـێ دەکاتـەوەو، ئنجـا ئـەوە بـۆ مسـوڵمانی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ وابـووەو، بـۆ ئێمـەش هەروایـە، ئێمـەش لـەو نارەحەتیـی و مەینەتییانـە کـە ئێسـتا لـەم دۆخـەدا تێیـان دایـن، لـە هەرێـم و عێـراق، لـە سـووریا، (شـام) لـە فەلەسـتین، لـە لوبنـان، لـە ئـوردن، لـە میسـر و لیبیـا و تونـس و سـوودان و یەمـەن و، لـە دەوڵەتانـی دیکـەی عەرەبیـی و، لـە دەوڵەتانـی کەنـداو لـە ناوچەکـەدا، بـە گشـتیی، کـە بەداخـەوە زۆربـەی دەوڵەتـەکان تەسـلیمی کوفـری جیهانیـی بـوون و گـوێ لـە مستی ئەوانـن، خێـرو بێریـان بـە تـاڵان دەبـەن و، لـە بەرانبـەردا چەکیـان پێـدەدەن، کـە شـەڕی پـێ لـە نێـو خۆیانـداو، لەگـەڵ مسـوڵماناندا بکـەن، هەروەهـا لـە باقـی دیکـەی وڵاتانـی مسوڵماننشـیندا لـە عەرەبیـی و غەیـری عەرەبیـی، مسـوڵمانان لـەو

حاڵـەدا نامێننـەوە، شـەوگار هەرچەنـدە خەسـت و خـۆڵ بـێ، بـەڵام بەرەبەیـان هـەر هەیـە، بەرەبەیانـی بـەدوا دادێ.

٦)- ﴿ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئایا خوا زاناتر نیە بەوەی کە لە سینەکانی جیهانییاندایە؟ ئەم پرسیارە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، دەشگونجێ پرسیار لێکردنی پێ چەسپاندن (تقريري) بێ و، ڕووی پێ لە پێغەمبەر ﷺ بێ: ئایا ئەی موحەممەد ﷺ دانی پێدادێنی کە خوا زاناترە بەوەی لە سینەی خەڵکەکاندا هەیە، کە پاڵنەرو هاندەریان چییە، کاتێک خۆیان ڕادەگرن، کاتێک کە خۆیان ڕاناگرن، لە کاتی نەهاتدا کە بە چۆک دادێن و، لە کاتی هاتدا سینگ دەردەپەڕێنن، چی لە دڵیاندا هەیە؟ خوا پێی زانایەو لێی ئاگادارە.

٧)- ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بە دڵنیایی خواش ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەیانزانێ، دەیانناسێ.

٨)- ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾، هەروەها خوا مونافیق و دەغەڵ و دووڕووەکانیش دەناسێ.

ئەمـە جۆرێکـە لـە گرنگیـی پێدانـی تایبـەت بـەو دوو کۆمەڵـە، بـە ئیمانـداران و دەغـەڵان، بۆچـی ئیماندارانـی بـە کـرداری ڕابـردوو هێنـاوە (ءَامَنُوا۟)؟ واتـە: پێشـتر ئیمانیـان هێنـاوەو تێیـدا چەسـپاون، لـە ڕابـردوودا ئیمانیـان هێنـاوەو، ناسـنامەی ئیمانیـان پێیـە، ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾ واتـە: سـیفەتی نیفـاق هێنـدە تێیانـدا ڕیشـەدارو ڕۆچوویـە کـە پێـی نـاسراون و، بوونـە چاوگـی دەغەڵیـی و موخەننەتیـی.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**هەوڵدانی کافرانی باڵادەست و حوکمڕان کە ئیمانداران فریو بدەن، گوایە گوناهەکانیان لێ هەڵدەگرن! بە درۆخستنەوەی خواش بۆیان و، جەختکردنەوە لەسەر هەڵگرتنی قورسایی سەرباری قورساییەکانیان و، سزادرانیان لەسەر درۆ هەڵبەستنیان بە ناوی خواوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، بەوانەیان گوت کە بڕوایان هێناوە: شوێن ڕێبازەکەمان بکەون و با گوناهەکانتان هەڵگرین.**

**ئایا ئەوانەی وایانگوتوە کافری ڕەش و ڕووت و بێ دەست و پێ و سادە بوون؟ بە تەئکید نەخێر، چونکە کەسێ بتوانێ لافی وا گەورە لێبدا، دەبێ بەرپرس و دەستڕۆیشتوو بێ: وەرن بە دوای ڕێبازی ئێمە بکەون و ئێمەش گوناهەکانتان بۆ هەڵدەگرین! کافرە ڕەش و ڕووتەکان ڕێبازیان نەبووە، شوێنکەوتوو و لاساییکەرەوە بوون، ئێستاش هەروان، ئێستاش زۆرینەی ئەوانەی بە دوای ئەهلی نیفاق و کوفرو فیسق و خراپە دەکەون، هیچ نین، جاری وایە هەر نازانێ بەرنامەو ڕێبازەکە چییە؟! بەڵام ئەوەی کە دەمڕاستەو بڕیار بە دەستە، دەزانێ ڕێبازەکەی چییە! ڕێبازەکەی ئەوەیە خەڵک خزمەتی خۆی و بنەماڵەکەی خۆی و خزم و حیزبەکەی بکات و، کۆیلەو ژێردەست بێ، زەبوون بێ و کرێ گرتەبێ، ئەو ڕێبازەکەی خۆی زۆر چاک دەزانێ و، دەزانێ ڕێبازەکەی ڕێ نادا ئایین و**

بەرنامـەی خـوا بچەسـپێ، لەبـەر ئـەوەی ئایـن و بەرنامـەی خـوا ڕێ نـادات زوڵـم بکـرێ، ڕێ نـادات چینایەتیـی و قڕیـی و پڕیـی هەبـێ، دەڵـێ: نیعمەتەکانـی خـوا بـۆ هەمـوو بەندەکانـی خـوان، مرۆڤـەکان هەموویـان وەک یەکـن، کـەس لـە کـەس گەورەتـر نیـە، کـەس نابـێ باڵادەسـت و کەسـیش نابـێ بندەسـت بـێ، جگـە لەوانـەی کۆمەڵـگا خـۆی ئەرکـی بەرپرسـیارێتییان پـێ دەسـپێرێ، ئەویـش لـەو سـنوورەدا کـە بۆیـان دیاریـی دەکـەن، بـۆ ئـەوەی دادگەرییـان لـە بەینـدا بچەسـپێنن و، چاکەیـان بۆ بچەسـپێنێ و خراپەیـان لـە نێـودا ڕیشـەکێش بکـەن، نـەک خۆیان بەسـەردا بسـەپێنن، بەڵکـو بـۆ ئـەوەی دادگەریـی بچەسـپێنن.

کەواتـە لێـرەدا: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، بـە سـیاق و سـەلیقە دیـارە یانـی: ئـەو کافـرە بڕیـار بـە دەسـت و خۆبەزلگـرو خۆسـەپێنەکان، بەوانەیـان گـوت کـە بڕوایـان هێنـاوە، چییـان پێگوتـن؟

﴿ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ ﴾، شـوێن ڕێبازەکەمـان بکـەون، بـا ئێمـەش گوناهەکانتـان هەڵگریـن، ڕێبازەکـەی ئەوانیـش بریتـی بـووە لـە کوفـرو شـیرک و خراپەکاریـی، هەڵبەتـە لێـرەدا خـوا ﷻ بـە کورتیـی و پوختیـی قسـەی کافـرە بڕیـار بـە دەسـتەکان دێنـێ، ئەگەرنـا بـە ڕواڵـەت وادیـارە گوتوویانـە: نـە ئێمـەو نـە ئێـوە زینـدوو ناکرێینـەوەو لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت نیـە، ئنجـا ئەگـەر گریمان هەشـبێ، ئـەو کاتـە ئێمـە گوناهەکانتـان بـۆ هەڵدەگریـن، وەرن واز لـەو ئایینـە تازەیـە بێنـن: کـە دەڵـێ: تەنیـا دەبـێ خـوا بپەرسـترێ، ئەوانـی دیکـە هەموویـان بەنـدەی خـوان و هەموویـان لەیـەک ئاسـت دان، واز لـەوە بێنـن و وەرنـەوە سـەر ڕێبازەکـەی ئێمـە، ڕێبازەکـەی ئەوانیـش ئـەوە بـوو: کەمینەیـەک بەسـەر زۆرینـەدا خۆیـان سـەپاندبوو، خێـرو بێریـان لـێ قـۆرخ کردبـوون، بـە چـاوی خزمەتـکارو خـەدەم و حەشـەم تەماشـایان دەکـردن! کـە بێگومـان هەروایـەو ئـەوە بـۆ زلـە زلـەکان و خۆ سـەپێنەکان عەیبـی نیـە، بـەڵام ڕەش و ڕووتـەکان ماڵوێرانـن!!

﴿ وَلْنَحْمِلْ خَطَـٰيَـٰكُمْ ﴾، ئـەو (ل)ی (ولْنَحْمِـلْ) بـۆ فەرمانـە، واتـە: فەرمـان بـە خۆمـان دەكەیـن كـە گوناهەكانتـان هەڵبگریـن، ئەمـەش جەختكردنەوەیـە كـە بـە تەئكیـد گوناهەكانیـان هـەر بـۆ هەڵدەگـرن و زۆر لـە خۆیـان دەكـەن!

دەشـگونجێ (ل) لامـی سـەرەنجام (لام العاقبـة) بـێ، یانـی: سـەرەنجام گوناهەكانتان بـۆ هەڵدەگرین.

خوا ﷻ بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ:

٢)- ﴿ وَمَا هُم بِحَـٰمِلِينَ مِنْ خَطَـٰيَـٰهُم مِّن شَىْءٍ ﴾، ئەوان هەڵگرانی هیچ لە گوناهەكانیان نابن، ئەوان هەڵگری هیچ كام لە گوناهەكانیان نین، نە كەم، نە زۆر.

٣)- ﴿ إِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان درۆكارن، درۆزنن و ناتوانن گوناهەكانی ئەوان هەڵبگرن.

٤)- ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾، بە دڵنیایی قورساییەكانی خۆیان هەڵدەگرن، وێڕای قورساییەكانی خۆیان، قورسایی دیكەش هەڵدەگرن.

ئەمـە كەسـێ بـە ڕواڵـەت تەماشـای بـكات، دەڵـێ: ئـەوەی خـوا لـە پێشـدا لایـبردوە، دوایـی نیسـپاتی كـردوە، پێشـێ دەفەرمـوێ: هیـچ لـە گوناهەكانیـان هەڵناگـرن، دوایـی دەفەرمـوێ: گوناهـی خۆیـان هەڵدەگـرن و، وێڕای قورسـاییەكانی خۆیان، گوناهو قورسـایی دیكـەش هەڵدەگـرن، یـانی: هـی ئەوانـەی گومڕایـان كـردوون! بـەڵام وەڵامەكـەی ئاوایـە:

(الحَمْـلُ المَنْفِـيُّ هُـوَ مَـا كَانَ المَقْصُـودُ مِنْـهُ: دَفْـعُ التَّبِعَـةِ عَـنِ الغَـيْرِ وتَبْرِئَتُـهُ مِـن جِنَايَاتِـهِ)، واتـە: هەڵگرتنێـك كـە لابـردراوە، ئەوەیـە كـە گونـاح لـە كـۆڵ وان بكەنـەوەو، تەبریەیـان بكـەن، گوناهەكانیـان لـێ دوور بخەنـەوە، ئـەوەی لابـراوە ئەوەیـە، بـەڵام ئـەوەی چەسـپێنراوە، بریتیـە لـە بارقورسـكرانی خۆیـان و، زێدەیـی لـە سـزادان دا، نـەك گوناهێـك لـە كـۆڵ شـوێنكەوتووەكانیان بكەنـەوەو لێیـان دووربخەنـەوە، شـوێنكەوتووەكانیش گوناهـی خۆیـان هـەر لـە ئەسـتۆی خۆیانـە،

بەڵام سەرکردەکان، ئەوانەی کە خەڵکیان گومڕا کردوە، گوناهە قورسەکانی خۆیان لە کۆڵ دەنێنن و گوناهی گومڕاکردنی ئەو هەڵخەڵەتاوانەش لە کۆڵ دەنێن، گوناهی هەڵخەڵەتانەکەیان، نەک گوناهەکانیان کە ئەنجامیان دەدەن، هەر کەسە گوناهی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ ﴾فاطر، واتە: هیچ بارگرانێک، باری گرانی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، هەرکەسە گوناهی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی، بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە گومڕایان کردوون، سزاو گوناهی ئەو گومڕاکردنەش هەڵدەگرن، کەواتە: ئەوەی نەفی کراوە، بریتیە لەوەی گوناهەکان لە کۆڵ هەڵخەڵەتاوەکان بکەنەوە، بەڵام گوناهیان لە کۆڵ ناکرێتەوە، ئەوەش کە چەسپێنراوە، بریتیە لەوەی لەسەر گومڕاکردنی ئەوان سزا دەدرێن و، گوناهی گومڕا کردنەکەیان هەڵدەگرن.

لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ هەیە:

**{مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا، وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ} (أخرجه الطيالسي: ٦٧٠، وأحمد: ١٩١٧٩، ومسلم: ١٠١٧، والترمذي: ٢٦٧٥، والنسائي: ٢٥٥٤، وابن ماجه: ٢٠٣، وابن حبان: ٣٣٠٨).**

واتە: هەر کەسێک لە ئیسلامدا ڕێیەکی باش دابنێ، (سوننەت بە مانای بنچینەو ڕێشکاندن و کارێکی باش دێ)، لە دوای خۆی کاری پێ بکرێ، ئەوە پاداشتی ئەو کار پێکردنەی هەموو ئەوانەی هەیە، (پاداشتی هەموو ئەوانەی کاریان پێکردوە، تاکو ڕۆژی قیامەت)، بێ ئەوەی پاداشتی ئەوانەی کاریان کردوە بەو بنەڕەتەی ئەو دایناوە، کەم بکرێتەوە، هەروەها هەر کەسێک لە ئیسلامدا شتێکی خراپ دابنێ، (دابێکی خراپ، بنچینەیەکی خراپ، عادەتێکی خراپ، شوێنەوارێکی خراپ جێ بهێڵێ)، ئەوە گوناهی خۆیشی لەسەرەو هی هەموو

ئەوانـەش کـە کاریـان بـەو ڕێشـکاندنە خراپـە، بـەو بنەڕەتـە خراپـە کـردوە، بـێ ئـەوەی لـە گوناهـی ئـەوان کـەم بکرێتـەوە، هێنـدەی هەمـووان گوناهـی دەگاتـێ، چونکـە ئـەو هـۆکار بـووە، کـە ئـەو خەڵکـە تووشـی ئـەو خراپـە بـووە، بەهـۆی ئـەو ڕێشـکاندنەو ئـەو ڕێ پێشـاندانەی ئـەوەوە.

ئەمـە وەک ئایەتەکـەی سـوورەتی (النحـل)ە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتـە: بـا گوناهەکانـی خۆیـان هەڵبگـرن لـە ڕۆژی قیامەتـدا بـە تەواویـی و، لـە گوناهـی ئەوانـەش کـە گومڕایـان دەکـەن بەبـێ زانیاریـی، ئاگاداربـن! ئـەوە خراپتریـن شـتە کـە لـە کۆڵیـان نـاوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، واتـە: لـە گوناهـی گومـڕا کردنەکەیـان، ئەگەرنـا گومـڕا بووەکانیـش، گوناهـی خۆیـان لـە ئەسـتۆی خۆیانـە.

٥)- ﴿ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا، لە ڕۆژی دواییدا لەبارەی ئەوەوە کە هەڵیان دەبەست، لێیان دەپرسرێتەوە، واتە: لەسەری سزا دەدرێن، چونکە کە لێیان پرسرایەوە، وەڵام و بەڵگەیان نیەو، تووشی سزاو جەزرەبە دەبن.

﴿ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾، لـە بـارەی ئـەوەوە کـە هەڵیاندەبەسـت لـە دنیـادا بـە نـاوی خـواوە، بۆچـی دەفەرمـوێ: (يَفْتَرُونَ)؟ چونکـە قسـە کـردن لـە کاروبـاری ڕۆژی دوایـی و قیامـەت، لـە ڕاسـتییدا درۆ هەڵبەسـتنە بـە نـاوی خـواوە، قسـە کـردن بەبـێ ڕۆشـنایی وەحیـی، هەرچـی بگوتـرێ، درۆیـەو، قسـە هەڵبەسـتنە بـە نـاوی خـواوە، چونکـە کاروبـاری قیامـەت هەمـووی عایـدی خوایـە ﷻ و پەنهـان و نادیـارەو بەبـێ وەحیـی قسـە لەبـارەوە کـردنی، تفەنـگ بەتاریکاییەوەنانـە.

## کورتە باسێک
## لە بارەی تاقیکردنەوەی خواوە بۆ بەندەکانی

ئەم کورتە باسە لە سێ تەوەردا دەخەینەڕوو:

تەوەری یەکەم: پێناسەی تاقیکردنەوە، بوارەکانی، حەتمیی بوونی، حیکمەتی، هۆکاری تێدا کەوتنی، هۆکاری تێدا دەرچوونی.

تەوەری دووەم: حەوت ڕاستیی گرنگ لە بارەی تاقیکردنەوەوە.

تەوەری سێیەم: سێ ئاگاداریی پێویست لە بارەی تاقیکردنەوەوە.

### تەوەری یەکەم: پێناسەی تاقیکردنەوە، بوارەکانی، حەتمیی بوونی، حیکمەتی، هۆکاری تێدا کەوتنی، هۆکاری تێدا دەرچوونی

**برگەی یەکەم: پێناسە:**

سێ وشە هەن لە زمانی عەرەبییداو لە بەکارهێنانی قورئاندا، کە بریتین لە: (الإبتِلاَء، الإفتِتَان، الإمْتِحَان)، خوا ﷻ ئەو سێ وشەیەی بە کارهێناون بۆ تاقیکردنەوە، بۆ هەرکام لە وشەکان چەند نموونەیەک دێنین:

أ)- وشەی (الإبتِلاء):

١- خوا لە سوورەتی (الملك)دا، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ ﴿٢﴾﴾، واتە: خوا ئەو کەسەیە مردن و ژیانی هێناونەدی، تاکو تاقیتان بکاتەوە.

٢- لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ ﴿١٢٤﴾﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێک پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند وشەیەک، واتە: بە چەند ئەرکێک تاقیکردەوە.

٣- له سووڕەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ﴿١٥٥﴾ ﴾، واته: به دڵنیایی تاقیتان دەكەینەوە، به بەشێک له ترس و برسیەتیی و له دەست چوونی ماڵ و سامان و خۆشەویستان و، بەرهەم و میوەجات.

٤- له سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ﴿١٨٦﴾ ﴾، واته: به دڵنیایی له سامانتانداو، له نەفسی خۆشتاندا تاقیدەكرێنەوە.

ڕاغیبی ئەصفەهانیی دەڵێ: (إبتلاء) به مانای (إختِبَار)ە، تاقیكردنەوە (إبتلاء)و (إختِبَار)ی خوا بۆ بەندەكانی، دوو واتای هەن:

واتای یەكەمیان: بۆ خوای پەروەردگار ناشێ، ئەویش ئەوەیە كەسێك كەسێک تاقیبكاتەوە، بۆ ئەوەی پێی ئاشنا بێ و بیناسێ، كە بە تەئكید خوای پەروەردگار هەموو شتێک دەزانێ و، هەموو كەس دەناسێ.

واتای دووەمیان: ئەوەیە كە خوا ﷻ مرۆڤ تاقیدەكاتەوە تاكو هەرچی لە سینەیداو لە هەناویدا هەیە بیخاتە گۆڕێ، لەسەر ئەرزی واقیع بناسرێ، ئەوەیان شتێكی ئاسایيە، خوا مرۆڤەكان تاقیدەكاتەوە، تاكو هی بن بەڕێیان بێتە سەر بەڕێ، هی نێو هەناویان بێتە دەرێ.

ب)- وشەی (الإفتِتان) كە بە وشەی (فِتْنَة) لە قوڕئاندا زۆر هاتوە، وشەی (فِتْنَة)ش لە ئەصڵی زمانی عەرەبیيدا بەوە دەگوترێ:

بابای زێڕینگر زێڕەكەی خۆی یاخود زیوەكەی، یاخود كانزایەكەی خۆی قاڵ بكاتەوە لەسەر ئاگر، تاكو ئەگەر كانزایەكی نامۆی ڕەگەڵ تێكەڵ بووبێ، دەركەوێ، بۆیە كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (زێڕی سوور، یان زێڕی پاک لە ئاگر ناترسێ)، زێڕ هەرچەند سووری بكەیەوەو قاڵی بكەیەوە، لەبەر ئەوەی زێڕی پاكە، كانزای دیكەی لەگەڵ تێكەڵ نەكراوە، وەک قافۆن و تەنەكە، كەم ناكات.

دوو نموونەش بۆ وشەی (فتنة) لە قورئان دا دێنینەوە:

١- لە سوورەتی (العنكبوت)دا کە ئێستا خەریک تەفسیر کردنێی، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: ئایا خەڵک پێیان وایە وازیان لێ بهێندرێ کە بڵێن: بڕوامان هێناو (إفتِتان) نەکرێن؟ واتە: تاقی نەکرێنەوە؟

٢- هەر لە سوورەتی (العنكبوت) دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾ ، واتە: بەدڵنیایی ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیکردنەوە.

وشەی (فِتْنَة)ش لە قورئانـدا زۆر هاتـوە، ئێمـە تەنیـا مەبەسـتمان ئـەوە بـوو، وەک چـۆن وشـەی (إبتِلاء) لـە قورئانـدا هاتـوە، وشـەی (إفتِتان)یـش هاتـوە.

ج- وشەی سێیەم (الإمتِحَان)، کە بە تێگەیشتن و سەرنجدانی من، تەنیا دووجاران لە قورئاندا هاتوە، جارێک بۆ پیاوان، جارێک بۆ ئافرەتان:

١- لە سوورەتی (الحجرات)دا بۆ پیاوان هاتوە، لە بارەی ئەوانەوە کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەنگی خۆیان نزم دەکەنەوەو کپ دەکەن، لە کاتێک دا قسەی لەگەڵ دەکەن، وەک ئەدەب و ڕێز، ئەوانە خوا دڵی تاقیکردوونەوەو لە بێژینگی داون، تاکو تەقوا بچێتە نێویان.

٢- جاری دووەمی هاتنی وشەی (إمتِحَان) بە مانای تاقیکردنەوە، ئەوەیە کە خوای بەرزو بێوێنە لە سوورەتی (المُمْتَحِنَة)دا، بۆ ئافرەتان بەکاری هێناوە، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێک ئافرەتانی بڕواداری کۆچکەر هاتن بۆ لاتان، تاقییان بکەنەوە، خواش بە ئیمانەکەیان ئاگادارترە.

کەواتـە: وشـەکانی: (إمتِحَـان)، (إبتِـلاء)، (إفتِتان)بـە مانـای تاقیکردنـەوەو جەڕبانـدن و، دەرخسـتنی ماهیـەت و جەوهـەری ئەو کەسـەن، کە تاقـی دەکرێتـەوەو دەجەڕبێنرێ.

**بڕگەی دووەم: بوارەکانی تێدا تاقیکردنەوە:**

بـە کورتیـی دەڵێیـن: بوارەکانـی تێـدا تاقیکرانـەوەی بـڕواداران بریتیـن لـە هەمـوو بـوارەکانی ژیـان و گـوزەران، بـا سـەرنج بدەیـن:

١- وەک لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾، واتە: بە تەئکید تاقیتان دەکەینەوە، بە شتێک لە ترس و برسیەتیی و کەمیی ماڵ و سامان و، نەفسەکان (مردنی عەزیزو خۆشەویستان) و، بەرهەمەکان، موژدەش بدە بە ئارامگران، ئەوانەی کە بەڵایان تووش بوو دەڵێن: ئێمە هی خواین و بۆ لای خواش دەگەڕێینەوە.

کەواتە: بە هەموو جۆرەکانی تاقیکردنەوە، خوا بڕواداران تاقی دەکاتەوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ﴿١٨٦﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و سامانەکانتان و، لە نەفسی خۆشتاندا، واتە: هەم ماڵ و سامانتان دەکەوێتە مەترسیی، هەم خۆشتان دەکەونە بەر مەترسیی.

٣- لە سوورەتی (البقرة) خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ابْتَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ ﴿١٢٤﴾ ﴾، واتە: یاد بکەوە! کاتێک پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند وشەیەک، (بە چەند ئەرکێک، نەک بە یەک و دووان، بە زۆر ئەرکان) تاقیکردەوە، لە هەمووشیان دەرچوو، ئنجا بە کەڵکی پێشەوایەتیی هات: ﴿ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ﴿١٢٤﴾ ﴾البقرة، (خوا) فەرمووی: دەتکەمە پێشەوا بۆ خەڵک، دەبێ لە تاقیکردنەوەکان دەربچی، لە کڵ دەربچی، دەبێ ساغ بیەوەو خڵەت پێوە نەمێنێ، ئنجا بە کەڵکی پێشەوایەتیی دێی، بە کەڵکی ئەوە دێی خوا ﷻ بتکاتە سەرمەشق بۆ خەڵك بەگشتیی و ئەهلی ئیمان، بەتایبەت.

**برگەی سێیەم: تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، بڕیارێکی حەتمیی خوایە:**

بەمسـۆگەریی دوای ئـەوەی مرۆڤـەکان ئیعلانـی ئیـمان دەکـەن، خـوا تاقییـان دەکاتـەوە، وەک ئایەتەکـەی سـوورەتی (العنكبـوت) دەفەرمـوێ: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٣ ﴾.

**کەواتە تاقیکردنەوەکە حەتمییە.**

یـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ۝٢١٤ ﴾البقـرة، واتـە: ئایـا پێتـان وابـوو بچنـە بەهەشـت، بـەر لـەوەی ئەوەتـان بەسـەربێ کـە بەسـەر ئەوانـی پێـش ئێـوە هـات، کـە ناڕەحەتیـی و نەخۆشـیی و ئازاریـان تـووش بـوو، هەتـا ڕاددەیـەک کـە پێغەمبـەر ﷺو ئەوانـەی لـە خزمەتـی دابـوون، گوتیـان: کەنگـێ یارمەتـی خـوا دێ؟ ئاگاداربـن! یارمەرتی خـوا نزیکە.

**برگەی چوارەم: حیکمەت و ئامانجی تاقیکردنەوە:**

حیکمـەت و ئامانجـی تاقیکردنـەوە، ئەوەیـە کـە خـوا ڕایگەیانـدوە: ﴿ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٣ ﴾العنكبـوت، واتـە: بـە دڵنیایـی خـوا لـە ئەنجامـی تاقیکردنـەوەی دا بـۆ بەندەکانـی، ئەوانـەی ڕاسـت دەکـەن دەیانزانـێ و، درۆزنەکانیـش دەزانـێ.

هەروەرهـا لـە سـوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمـوێ: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ۝١٧٩ ﴾، واتـە: خـوا عادەتـی وا نیـە لـە بـڕواداران بگـەڕێ، وەک ئـەو حاڵـەی ئێـوە ئێسـتا لە سـەرینی، (کـە وەک ماش و برنـج تێکەڵن، لەگـەڵ دڵنەخـۆش و دەغەڵەکان

دا)، بەڵكو تاقیتان دەكاتەوە تاكو پیس لە پاك جیادەكاتەوە، كەواتە: حیكمەتی تاقیكردنەوەو ئامانجەكەی بریتیە لەوەی پاك و پیس لێك هەڵباوێردرێن، كاو دانی مسوڵمانان لێك جیابكرێنەوە.

**بڕگەی پێنجەم: هۆكارەكانی كەوتن لە تاقیكردنەوەدا:**

مرۆڤ بۆچی و، بە چی لە تاقیكردنەوەی خوادا دەكەوێ؟ لە ڕاستییدا بە هۆی سەرپێچیی لە فەرمانی خواو، بە هۆی زاڵبوونی خۆشەویستیی دنیا بەسەریدا، وەك لەو ئایەتەی سووڕەتی (آل عمران)دا زۆر دیارە كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ﴿١٥٢﴾ ﴾، واتە: خوا بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوەدا ڕاست بردە سەر (كە فەرمووی: سەرتان دەخەم، بەڵێنی خۆی لەگەڵ ئێوەدا ڕاست بردە سەر)، هەتا كاتێك كە ئێوە بێهێز بوون و، لە نێو خۆتاندا ناكۆك بوون و، سەرپێچییتان كرد (لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ) دوای ئەوەی شتێكی پێشاندان كە حەزتان لێ دەكرد، (دەستكەوتی جەنگ)، هەتانبوو دنیای دەویست و هەتانبوو دوارۆژی دەویست، دوایی خوا ئێوەی لەوان لادا، تاكو تاقیتان بكاتەوە...

یانی: زاڵبوونی خۆشەویستیی دنیا بەسەر خۆشەویستیی دوارۆژدا لە هەندێكتاندا، هۆی ئەوە بوو كە فەرمانی پێغەمبەرتان ﷺ شكاند، لە ئەنجامی ئەوەشدا لە نێو خۆتاندا ناكۆك بوون، لە ئەنجامی ئەوەشدا بێهێزیی و فەشەل ڕووی تێكردن، كەواتە: هۆكاری كەوتن لە تاقیكردنەوەی خوادا، بێهێزیی ئیمان و، زاڵبوونی خۆشەویستیی دنیایە.

**بڕگەی شەشەم و كۆتایی: هۆكاری دەرچوون لە تاقیكردنەوەدا:**

هۆكاری دەرچوونیش لە تاقیكردنەوەی خوا، ئەوەیە كە ئینسان ئیمانەكەی باش بێ، پەیوەندیی لەگەڵ خوادا توندو تۆڵ و گەرم و گوڕ بێ، ئەوكاتە پیلانی

دوژمنـان، نارەحەتییەکانـی کـە دێنـە ڕێـی، زەفـەری پـێ نابـەن، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴿١٠٥﴾ ﴾المائـدة، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! وریـای خۆتـان بـن، ئەوانـەی کـە گومـڕا بـوون زیانتـان لێنـادەن، ئەگـەر ئێـوە ڕێـی ڕاسـت بگـرن، ئەگـەر ئێـوە ڕێـی ڕاسـت گرتووبـن و پابەندبـن بـە شـەریعەتیی خـواوە.

یـانی: ئیمانێکـی باشـتان هەبـێ، عیبادەتێکـی باشـتان هەبێ، ڕەوشـتێکی پەسـندتان هەبـێ، سـیفەتە بەرزەکانتـان هەبـن و، سـەبرو تەقـواو ڕاوەسـتاویی و دامەزراویـی، ئەوکاتـە دوژمنـان و ناحەزانتـان زەفەرتـان پـێ نابـەن.

هـەروەک لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتـە: ئەگـەر ئێـوە خۆڕابگـرن و پارێـز بکـەن، پیلانـی ئـەوان هیـچ زیانێکتـان لێنـادات، کەواتـە: هـۆی دەرچـوون لـە تاقیکردنـەوەی خـوا، بریتیـە لـە: ئیمانـی بـاش، تەقـوای بـاش، خۆڕاگریـی، هـەروەک لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾، واتـە: خۆڕاگـران لـە کاتـی سـەختییدا، لـە کاتـی ناخۆشـیی و نەخۆشـیی و هەژاریـی و نەداریـی داو، لـە کاتـی دەردو مەینەتـی داو، لە کاتـی ڕووبـەڕوو بوونـەوەو جەنگـدا، (ئەوانـەی خۆڕادەگـرن لـەو سـێ حاڵەتانـەدا)، ئـا ئەوانـە ڕاسـت دەکـەن و ئـا ئەوانـەن پارێـزکاران.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بکێـڕێ، کـە لـە تاقیکردنەوەی خـوا ﷻ لـە ژیانـی دنیـادا سـەربەرزانە دەردەچن، بـە هـۆی ئیمانـی پتـەوو، خۆڕاگریی و پارێزکاریـی و ڕازانـەوە بـەو سـیفەتە بەرزانـەوە، کـە دەسـتەبەرکەری دەرچوونـی مرۆڤـن لـە تاقیکردنـەوەی خوا.

## تەوەری دووەم : حەوت ڕاستیی گرنگ
## لە بارەی تاقیکردنەوەی خواوە بۆ بەندەکانی

ئەمیش لە حەوت بڕگەدا شی دەکەینەوە:

١- خوا ﷻ ئینسانی بۆ بەندایەتییکردن خوڵقاندوەو، بەندایەتیی ئینسانیش بۆ خوا لەمیانی تاقیکردنەوەیدا دەبێ، ئەم ڕاستییە، ڕاستییەکی یەکجار گەورەو گرنگە، ئەگەر نەڵێین گەورەترین ڕاستییە لە ژیانی مرۆڤدا، کە خوا مرۆڤی بۆ بەندایەتییکردن بۆ خۆی هێناوەتە دی، بەندایەتییەکەشی لە میانی تاقیکردنەوەیدا بەرجەستە دەبێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون و، بەندایەتییم بۆ بکەن، بمپەرستن.

هەڵبەتـە بەندایەتیـی جنـدو مـرۆڤ بـۆ خـوا ﷻ، وەنەبـێ ئامانجێـک بـۆ خـوا بێنێتـە دی، بـەڵام ئامانجـی خۆیـان دێنێتـەدی، خـوا ﷻ بۆیـە بەندایەتییکـردن بـۆ خـۆی لەسـەر مـرۆڤ و جنـد، پێویسـت کـردوە، چونکە بـەوە بەختەوەر دەبـن و ئەوە مایـەی سـەرفرازییانەو، مایـەی ئازادیـی و ئازاییانـە لـە دنیـاداو، مایـەی سـەرفرازیی و ڕووسـوورییانە لـە دواڕۆژدا، ئەگەرنا خـوا ﷻ یەکێـک لـە سـیفەتەکانی بریتیـە لـەوە کـە بێنیـازە لـە دروسـتکراوەکانی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾العنكبـوت.

ناگونجـێ خـوا ﷻ پێویسـتیی بـە جگـە لـە خـۆی بـێ، بـەڵام ئـەوە مرۆڤەکانـن پێویسـتییان بـەوە هەیـە کـە بەندایەتیـی بـۆ خوا بکـەن، بۆ ئـەوەی تووشـی کۆیلایەتیی و ژێردەسـتەیی و زەبوونیـی بـۆ مرۆڤێکـی وەک خۆیـان، یـان شـتێکی دیکـەی لـە خـوار مرۆڤیشـەوە نەبـن، وەک پـارەو سـامان، هـەواو ئـارەزوو، حیـزب و ڕژێـم، دارو بـەرد،

خۆرو مانـگ و ئەسـتێرەو...هتد، ئنجا ئـەوە کـە خـوا ﷻ مرۆڤـی بۆیـە هێناوەتـە دی، تاکـو تاقیبکاتـەوە لـە زۆرێـک لـە سـوورەتەکانی قورئانـدا ڕاگەیەنـدراوە، بـە ڕاشـکاویی، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (الإنسـان)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئێمـە مرۆڤـمان لـە تۆرەمەیەکـی تێکـەڵ، (نوتفەیەکـی تێکـەڵ) دروسـتکردوە، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی تاقیدەکەینـەوە، بۆیـە گێڕاومانـە بـە بینـەرو بیسـەر، (هەسـتەوەرەکانمان پێـداون) و، ئێمـە ڕێـی ڕاسـتمان پێشـانداوە، ئنجا سوپاسـگوزار دەبـێ یاخـود سـپڵە.

٢- سروشتی ئیسلامیش تاقیکردنەوەی مرۆڤ دەکاتە شتێکی حەتمیی، ئیسلامێک کە خوا ﷻ بە تاکە بەرنامەی پەسندکراوی خۆی داناوە، بۆ ژیان و گوزەرانی ئینسان و، جگە لە ئیسلامی لە قورئان و سوننەتدا، خوا لە مرۆڤەکان قبووڵ ناکات، بیکەنە بەرنامەی ژیانیان، وەک دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴿٣﴾﴾المائدة، واتە: ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواوکردن و، چاکەی خۆمم بە تەواویی لەگەڵدا کردوون، ئیسلامیشم بە بەرنامەی ژیان بۆ پەسەند کردوون، کە دیارە ئەم ئایەتە موبارەکە لە حەجی ماڵئاوایی (حَجَّةُ الوداع)دا بۆ سەر دڵی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دابەزی، وەك لە (صحیح البخاري)دا[1] هاتووە.

هەروەهـا لە سـوورەتی (آل عمـران)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾، واتـە: هـەر کەسـێک جگـە لـە ئیسـلام بەرنامەیەکـی دیکـە بخـوازێ، لێـی وەرناگیـرێ و، ئـەو لـە دواڕۆژیـش دا لـە زیانبارانـە.

لێـی قبـووڵ ناکـرێ بەوواتایـە نیـە کـە ڕێـگای نـادرێ جگـە لـە ئیسـلام بکاتـە بەرنامـە، وەک ڕێپێـدران ڕێـی پـێ دەدرێ، چونکـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾الکافـرون، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ﴿٢٥٦﴾﴾البقـرة،

---

(١) كِتَابُ: الاعْتِصَامِ بِالْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، برقم: ٧٢٦٨

بـەڵام بـەو واتایـە دێ کـە لـە دوارۆژدا لێـی قبـووڵ ناکـرێ، ئەگـەر بـە دوای جگـە لـە ئیسـلام کەوتبـێ لـە ژیانـی دنیـای دا، ئنجـا ئیسـلامیش کـە خـوا کردوویەتـی بـە ئاییـن و بەرنامەیەکـی تێـرو تـەواو، جگـە لـە ئیسـلامیش خـوا لـە مرۆڤـەکان قبـووڵ نـاکات، ئـەو ئیسـلامە بـە کەمتر لـە حوکمڕانیـی و باڵادەسـتیی ڕازی نابـێ، وەک خـوا لـە سـوورەتی (التوبـة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە پێغەمبـەری خۆی بـە ڕێنمایـی و بـە بەرنامـەی هەقـەوە نـاردوە، تاکـو بەسـەر تێکـڕای بەرنامەکانـدا باڵادەسـتی بـکات، واتـە: ئیسـلام هاتـوە حوکمـڕان بـێ، ئیسـلام هاتـوە سـایەو سێبەر بـێ، ئنجـا ئیسـلامێکی ئـاوا، کەسـانێک شـوێنی بکـەون بـە تەئکیـد ئـەو کەسـانە لەگـەڵ ئـەو سیسـتمە تاغووتیـی و خۆسـەپێنانەدا کـە هەڵقـوڵاوی نـارەزوو و بۆچوونەکانـی مرۆڤـن، تێکدەگیـرێ، بەرژەوەندیـی ناشـەرعیی ڕژێمـە خۆسـەپێنەکان، لەگـەڵ ئازادیـی ئـەو مرۆڤانـەدا کـە دەیانـەوێ بـەو شـێوەیە بژیـن، خـوا بـۆی دیاریی کـردوون، تێکدەگیـرێ، سـەرەنجام مـرۆڤ تووشـی سـەختیی و نارەحەتیـی و، هەورازو نشـێوو، تاڵیـی و سـوێریی دەبـێ.

٣- سروشتی ئەهلی کوفریش هۆکارێکی گرنگی تاقیکردنەوەی مسوڵمانانە، ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، هەمیشە سەرانی ئەهلی کوفر، کە لە خۆ بەزلگران و خۆ سەپێنان و، خۆشگوزەرانان و چەواشەکاراندا بەرجەستە بوون، سەرانی ئەهلی کوفر هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) تێکگیراون، لەبەرچی؟

أ- لەبەرئەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) هاتوون ژیانێکی ڕەببانییانە بەرقەرار بکەن لەسەر زەوی، بەڵام ئەوان چاویان لە ژیانی شەیتانییانەی تاغووتانە بووە.

ب- پێغەمبەران هاتوون مرۆڤەکان هەموویان یەکسان بکەن، هەموویان پێکەوە تەبابن، بەندەی خوا بن، بەڵام تاغووت و ڕژێمە خۆسەپێنەکان ویستوویانەو، دەیانەوێ: خەڵک هەمووی کۆیلەو، خزمەتکارو بندەستی ئەوان بێ.

جـ- پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ) هاتوون دادگەریی بچەسپێ، بەڵام ئەوان چاویان لە ستەم و چەوسانەوە بووە.

د- پێغەمبەران هاتوون نازو نیعمەتەکانی خوا بە یەکسانیی بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر بکرێن، بەڵام ئەوان چاویان لە گەندەڵیی و قۆرخکاریی و دەست بەسەرداگرتنی موڵک وماڵی خەڵکی بووە، لە ئەنجامی ئەوەدا بە ئەنکید تێکگیران دروست دەبێ.

با تەماشای چەند ئایەتێک بکەین، بۆ وێنە:

یەک: خوا لە سوورەتی (الزخرف)دا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: هەر بەو شێوەیە لە پێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکمان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی ئەو ئاوەدانییە گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێک بینیوەو، ئێمە بە شوێنەواری ئەواندا دەڕۆین.

دوو: هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ﴿٢١٧﴾﴾، واتە: ئەهلی کوفر بەردەوام لە دژتان دەجەنگن، تاکو ئەگەر بتوانن لە ئایینەکەتان هەڵتانگێڕنەوە.

سێ: هەروەها هەر لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴿١٢٠﴾﴾، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان لێت ڕازی نابن، تاکو شوێن ڕێبازی ئەوان نەکەوی.

کەواتە: نابێ هیچکەس لە مسوڵمانان خەیاڵی وابێ کە دەتوانێ مسوڵمانێکی سەلامەت و، بێ بەڵاو گرفتبێ، لە حاڵێکدا کە چەندان تاغووتی ملهوڕ لەسەر زەوی، خۆیان لە خەڵک کردۆتە پەروەردگارو پەرستراوو، تەراتێن لە زەوی دا دەکەن و، گەمەو یاریی بە چارەنووس و خێرو بێری سەدان بەڵکو ملیاران خەڵک دەکەن، ئنجا بە ئەنکید کەسانێک بیانەوێ بە مسوڵمانەتیی بژین،

لەگەڵ ئەو تاغووت و دیکتاتۆرە ملهوڕانەدا، تێکدەگیرێن کە وەک گوتم: چاویان لە ستەم و بێ دادیی و خۆسەپاندنە.

٤- ڕاستیی چوارەم ئەوەیە کە سروشتی مرۆڤیش، تاقیکردنەوەی مرۆڤ پێویست دەکات، یانی: ئینسان لەم گەردوونەدا خاوەنی کەسایەتیی و سروشتێکی تایبەتی ناوازەیە، کە خوای کاربەجێ ﷻ بە مەبەستی گونجانی بۆ تاقیکردنەوە، سروشتی ئینسانی وا هەڵخستوە، مرۆڤ لە نێو هەموو دروستکراوەکانی خوادا، دەتوانێ زۆر بەرزبێتەوە، بە بەندایەتیی بۆ خواو، خۆ وەنیزیکخستن لە خواو، خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزەکان و بەها پەسندەکان، هەروەک دەشتوانێ زۆر نزم بێتەوە، بە دوورکەوتنەوە لە خواو، نیزیک کەوتنەوە لە شەیتان و، خۆ پیس و پۆخڵ کردن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ ﴾المطففين.

واتە: لیستی کردەوەی تاوانباران لە (سِجِّينٍ)ە، دەزانی (سِجِّينٍ) چییە؟ کتێبێکی نووسراوە، سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بە درۆدانەران، ئەوانەی ڕۆژی سزا و پاداشت بە درۆ دادەنێن.

دوایی خوا ﷻ لە درێژەی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: ئەوانە کەسانێکن دەچنە دۆزەخەوە، بەڵام دوایی لە سیاقی هەمان ئەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾المطففين، واتە: نەخێر وانیە، وەک ئێوە دەڵێن، لیستی چاکەکاران لە (عِلِّيِّينَ)ە، ئنجا ئەگەر (سِجِّينٍ) زۆر نزمە، (عِلِّيِّينَ)یش زۆر بەرزە.

کەواتە: مرۆڤ دەتوانێ زۆر بەرزبێ و، دەشتوانێ زۆر نزم بێ، هەر بە ویست و خوا ستی ئازادانەی خۆی، وەک لە سوورەتی (الشمس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: سوێند بە نەفس و بەوەی کە نەفسی ڕێکخستوە . گوناهکاریی و پارێزکاریی فێر کردوە . بە دڵنیاییی سەرفرازە ئەو کەسەی خۆی پاک و چاک

کـردوە، هەروەهـا بێگومـان پەشـێمانەو بەدبەختـە ئـەو کەسـەی نەفسـی خـۆی لـە بـن چڵکـی گوناهانـدا، ون کـردوە.

سروشـتی مـرۆڤ وەک گوتمـان: لەبـەر ئـەوەی هـەم پاڵنـەری چاکەکاریـی، هـەم پاڵنـەری خراپەکاریـی تێدایـەو، خـوا وای هەڵخسـتوە: بتوانـێ بـەرز بـێ و نـزم بـێ، بـە پێچەوانـەی دروسـتکراوەکانی دیکـەوە، کـە فریشـتە هـەر فریشـتەن، ئـاژەڵ هـەر ئاژەڵـن، درنـدە هـەر درنـدەن، ماددەی بـێ ژیـان هـەر ماددەی بـێ ژیانـە، ڕووەک هـەر ڕووەکـە، بـەڵام لـەو نێوانـەدا مـرۆڤ -هەڵبەتـە جنديـش- دەتوانـن چـاک بـن و خـراپ بـن، بەرزبنـەوەو نـزم بنـەوە.

٥- ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان و کۆمەڵگای مسوڵمان، بەبێ تاقیکردنەوەو، بەبێ بڕینی سەختیی و دژوارییەکان، پوخت و کامڵ نابن، هەمیشە ئینسان لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا، لە ئەنجامی بڕینی سەختیی و دژوارییەکان و هەورازو نشێوەکاندا، زیاتر خۆی دەناسێ، پوخت و کامڵ دەبێ.

أ- وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ﴿١٥٤﴾﴾ آل عمران، واتە: بۆ ئەوەش خوا ﷻ بەو شێوەیە هێنایە پێش (کە لە جەنگی ئوحوددا لە ئەنجامی سەرپێچییکردن لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، تێشکان)، تاکو خوا ئەوەی لە سینەکانتاندا هەیە، تاقی بکاتەوەو، ئەوەی کە لە دڵەکانتاندا هەیە پاڵفتەی بکات.

کەواتـە: لـە ئەنجامـی ناڕەحەتییەکانـدا، ئینسـان پاڵفتـە دەبـێ و، خڵتـەو خاڵـی پێـوە نامێنـێ.

ب- هەروەها هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا خوا دەفەرموێ:

﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾

﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤١﴾، واتـە: ئەگـەر برینێکتـان تێبـوە، خەڵکەکـەی دوژمنانیشـتان، بەرانبەرەکانیشـتان بـە هەمـان شـێوە برینیـان تێبـووە، ئـەو ڕۆژانـەش دەسـتاو دەسـتیان پـێ دەکەیـن لـە نێـوان خەڵکـداو، (بـۆ ئـەوەش خوا ﷻ ئـەو نارەحەتییانەتـان بـۆ دێنێتـە پێـش) تاکـو ئیمانـداران بزانـێ و، شـەهیدان لـە نێوتانـدا هەڵبژێـرێ، خـواش سـتەمکارانی خۆشـناوێن و، بـۆ ئـەوەش کـە ئیمانـداران بپاڵێـوێ و پاڵفتـە بـکات، هەروەهـا کافـرەکان خەفـەو بێدەسـتەڵات بـکات (کـە نەتوانـن ئەهلـی ئیـمان بچەوسـێننەوە).

٦- یاسای خوا وایە کە هەتا مسوڵمانان قۆناغی تاقیکردنەوە نەبڕن و ساغ نەبنەوە، نایانباتە قۆناغی باڵادەستیی و حوکمڕانییەوە، سوننەتی خوا وایە، کە دەبێ مسوڵمانان بە نارەحەتییەکاندا بڕۆن، هەورازو نشێوەکان ببڕن، پوختە بن و پێبگەن، ئنجا بە کەڵکی ئەوە دێن، خوا باڵادەستیان بکات لە زەوی داو، جڵەوی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیان بخاتە دەست.

وەک لـە سـوورەتی (الأنفـال)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٢٦﴾، واتـە: یـادی ئـەو کاتـە بکەنـەوە! کاتێـک ئێـوە چەوسـێنراوە بـوون و کـەم بـوون لـە زەوییـدا، دەترسـان کـە خەڵـک بتانڕفێنـێ، بـەڵام خـوا ئێـوەی پەنـاداو، بـە یارمەتیـی خـۆی ئێـوەی بەهێـز کـردو، لـە بژیـوە پـاک و چاکـەکان بـە ئێـوەی بەخشـیی، بەڵکـو سوپاسـگوزاریی بکـەن.

ب- هەروەها خوا ﷻ لە بارەی ئیبراهیمەوە ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ١٢٤﴾البقرة، واتە: یاد بکەوە! کاتێک پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند وشەیەک، (بە چەند ئەرکێک)، تاقیکردەوە، تەواوی کردن، (هەمووی جێبەجێ کردن)، ئنجا خوا فەرمووی: من گێڕەری تۆم بە پێشەوا بۆ خەڵک، گوتی: ئەدی لە وەچەکەم؟ (خوا) فەرمووی: ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە.

واتــە: لــە وەچەكــەت ئەوانــەی لەســەر ڕێــی تــۆ بــڕۆن، خــوا پەرســت و ڕێــك و ڕاســت بــن، ئەوانــەش ئــەو بەڵێنــەی بــە تــۆ دراوە، ئەوانیــش دەگرێتــەوە، بــەڵام كەســانێ ســتەمكارو لارو لادەرو تاوانباربــن، بــا وەچــەی تــۆش بــن، ئــەو بەڵێــن و موژدەیــە نایانگرێتــەوە، كەواتــە: ئیبراهیــم ﷺ دوای ئــەوەی ئەركەكانــی جێبەجــێ كــردن و، لــە تاقیكردنەوەكانــدا دەرچــوو، ئنجــا بــە كەڵكــی ئــەوە هــات خــوا بیكاتــە پێشــەوا بــۆ خەڵكــی.

٧- تاقیكردنەوەی مسوڵمانان لەسایەی شوومی جیهانگیریی (عَوْلَمَة): (Globalization) دا، یەكجار قورس و سەختەو، پێویستە خۆیانی بۆ ساز بكەن، ڕاستییەكەی لەم ڕۆژگاری ئێستاماندا، كە بە داخەوە ئەهلی كوفر حوكمڕانی زەویین بە قیادەی ئەمریكاو، لەو لاشەوە ڕووسیاو چین، پاشان دەوڵەتانی ئەورووپایی، هەركەسە لە قەدەر خۆی، كە هەموویان ئەهلی كوفرن، لە ئەنجامی ئەوەدا، بارودۆخێكی سەخت بۆ ئەهلی ئیسلام هاتۆتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە كە دەبێ بۆ ئەوەی بتوانن دینداریی شەخسیی، دینداریی خێزانیی، دینداریی كۆمەڵایەتییان بكەن، نەك حوكمڕانییش، دەبێ زۆر بە تەحەممول و زۆر خۆڕاگربن، دەبێ دژی ئەو تەوژمە ماددییگەرایی و بە ئاژەڵ تەماشاكەرەی كە زلهێزان بەسەر دنیایاندا فەرز كردوە، دژی ئەو تەوژمە بوەستنەوە، كە ئەوەش كارێكی ئاسان نیە، بەڵام بێگومان ئەوەی كە پارێزەری مسوڵمانانەو، هاوكاریانە بۆ ئەوەی بتوانن دینداریی بكەن و، لەسەر ڕاستە شەقامی خواو پێغەمبەری خوابن ﷺ بریتیە لەوەی دۆستی خوا بن و نیزیكی خوا بن، ئەهلی ئیمان و تەقوا بن:

أ- وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ﴿١٢٠﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەگەر ئێوە خۆڕاگر بن و پارێزكار بن، پیلان و فێڵی ئەوان هیچ زیانتان لێ نادات.

واتــە: ئــەو زیانەتــان لــێ نــادات، كە پەكتــان بخــات، ئەگەرنا بــە تەئكید مســوڵمانان تووشــی ئــازارو نارەحەتیــی و گرفتاریــی دەبن بە دەســتی ئەهلــی كوفرەوە.

ب- هەروەها ئەوانەی دۆستی خوا بن، خواترس و خەم و پەژارەی لێ لابردوون: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾یونس، واتە: ئاگادار بن! دۆستانی خوا، نیزیکانی خوا، نە ترسیان لەسەرە، نە خەم و پەژارە دادەگرن، واتە: ئەو ترسەی کە خەڵک هەیەتی، ئەو خەم و پەژارەی کە خەڵک هەیەتی، ئەوان نیانە، ئەگەرنا ئەهلی ئیمانیش، بێگومان بێترس و بێخەم و خەفەت و ناڕەحەتیی نابن، ئایا دۆستانی خوا کێن؟ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾یونس، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە! (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێبهێنرێ)، عادەتیشیان وابوو پارێزیان دەکرد، هەمیشە پارێزکارانە دەژیان.

ئەمانـە ئـەو حـەوت ڕاسـتییەن، کـە پێویسـتە لەبـەر چاومـان بـن، کاتێـک کـە دەزانیـن ئێمـە لـەم سـەر زەوییـە بـۆ تاقیکردنـەوەی دانراویـن.

## تەوەری سێیەم: سێ ئاگاداریی پێویست. بۆ ئەوەی لە تێگەیشتنی تاقیکردنەوەدا. بە هەڵەدا نەچین

**١- هـەر كەسـێک لەسـەر ڕێبـازو بەرنامـەی جگـە لـە خـوا بـێ، لەسـەر بـەڵاو گرفتارییەكانـی، پاداشـتی نابـێ:**

كاتێـک مرۆڤـی مسـوڵمان لەسـەر بـەڵاو گرفتارییەكانـی، لەسـەر ناڕەحەتییەكانـی، پاداشـتی دەبـێ و، دەبنـە هـۆی پاكبوونـەوەو لـە خـوا نیزیـک بوونـەوەی، ئەگـەر لەسـەر ڕاسـتە شـەقامی خـوا بـێ، بـەڵام ئەگـەر لـە ڕێـی خـوا لایـداو، شـوێن بیردۆزەیـەک و ڕێچكەیەكـی شـەیتانیی كـەوت، بێگومـان ئـەو كاتـە نابـێ چاوەڕێـی پاداشـتی خـوا بـێ، بـا لـەو ڕێبـازەدا كـە گرتوویەتـە بـەر، تووشـی ناڕەحەتیـی و گرفتارییـش ببـێ، لێـرەدا بـۆ ڕوونكردنـەوەی مەبەسـت، بـە پێویسـتی دەزانـم، ئـەم كورتـە بیرەوەرییـەی خـۆم بگێڕمـەوە:

لە سـاڵانی سـەرەتای ڕاپەڕینی جەماوەری، سـاڵی (١٩٩١ ز)دا بوو، لە مەجلیسـێكدا لەگـەڵ یەكێـک لـەو كەسـانەی خۆیـان بـە مسـوڵمان دەزانـن و، بەرپـرسی حیزبێكـی عەلمانییشـن، ئـەم وتووێژەمـان بـوو: دوای چەند قسـەیەک:

پێم گوت: فڵانكەس، ئایا تۆ خۆت بە مسوڵمان دەزانی، یان نا؟

گوتی: بەڵێ، بێگومان خۆم بە مسوڵمان دەزانم و نوێژو ڕۆژووشم هەیە.

گوتـم: باشـە، بـەڵام ئـەو حیزبـەی تـۆ بەرپرسـیاریەتیی دەكـەی، بەرنامەكـەی جگـە لـە ئیسـلامە!

گوتـی: ئنجـا چ گرفتێـک هەیـە لـەوەدا؟ ئـەوە بـۆ كارو چالاكیـی سیاسـیی و، هێنانـەدی ئامانجـە نەتەوەییەكانمانـە.

گوتم: ئاخر ناگونجێ ئینسان خۆی بە مسولمان بزانێ، بەڵام لە بوارو لایەنێکی گرنگی ژیان و گوزەراندا، شوێن جگە لە ئیسلام بکەوێ و جگە لە ئیسلام، بەسەر ئیسلامدا هەڵبژێرێ!

گوتی: ئەوە نازانم، ئەوەندە هەیە لە ڕێی میللەتەکەمدا ڕەنجی زۆرم کێشاوەو، خەباتی زۆرم کردووەو، خۆشم هەر بە مسولمان دادەنێم.

گوتم: ڕاستە خۆت ماندوو کردووەو ڕەنجت داوە، بەڵام ئایا چاوەڕوانیی پاداشتی لای خوا دەکەی، لە بەرانبەر ئەو خەبات و قوربانییەتدا، کە هەر لە سەرەتاوە ناوی خوات لێ نەهێناوەو، لەسەر بناغەی شەریعەت بنیاتت نەناوە؟

گوتی: بەڵێ، مەگەر لە ئایەتدا نیە، کە خوا پاداشتی هیچ کەس بزر ناکات؟

گوتم: با ئەوە لە ئایەت دایە، بەڵام ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾﴾ الكهف، واتە: ئێمە پاداشتی کەسێک کە کردەوەی باشی کردوە، زایە ناکەین، کەوتە کاتێک خوا پاداشتت دەداتەوە کە کردەوەکەت باشبێ.

گوتی: ئنجا ئایا بەرگریی لێکردنی وڵات و میللەت کردوەیەکی باش نیە؟

گوتم: با، بەڵام ئەگەر بتەوێ پاداشتی لای خوات هەبێ و، بۆ دنیاش کارەکەت بەرهەمدار بێ، دەبێ ئەو کردەوە باشەت دوو مەرجی سەرەکیی تێدابن.

گوتی: چی و چی؟

گوتم: یەکەم بە پێی بەرنامەی خوا بێ و لە چوارچێوەی شەریعەتدا ئەنجامت دابێ.

دووەم تەنیا مەبەستت پێی ڕازیکردنی خوا بێ.

پاشان ئەم وێنەیەم بۆ هێنایەوە:

گوتم: ئایا ئەگەر کابرایەک چەند کرێکارێک بە کرێ بگرێ و، بناغەی بینایەکیان بۆ ڕەنگ بڕێژێ و، بڵێ: ئێرەم بۆ هەڵبکەنن و، بیکەنە خەندەک بۆ بناغە، کەچی ئەوان لەجیاتی ئەو شوێنەی کە بۆیان دیاریکراوە، بچن خەندەک و چاڵێکی قووڵ و زل لە شوێنێکی دیکە لێبدەن، ئایا هەقیانە ئێوارە داوای کرێیەکە بکەن و، ئایا کابرای خاوەن نیش پێیان نالێ: کاکە ئێوە هیچ هەقتان ناکەوێ، چونکە ئەو کارەی من پێم گوتوون، ئەنجامتان نەداوە، بێهوودە خۆتان ماندوو کردوە، ڕەنجتان بەفیڕۆ چووە! ئایا ئەگەر وایان پێ بڵێ، قسەیەکی هەقی نەکردوە؟

گوتی: بـا.

گوتم: دە باشە تۆش هیچ کەس نالێ: بەرگریی لە خەڵک و لە خاک کردنەکەت، شتێکی خراپە، بگرە فەرزو پێویستیشە، چونکە خوای کاربەجێ و دادگەر فەرمووەتی: ﴿لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾البقرة، نە ستەم بکەن، نە با ستەمیشتان لێ بکرێ، واتە: نە ستەم لە خەڵکی بکەن و نە قبووڵیش بکەن هیچ کەس ستەمتان لێ بکات، بەڵام ئایا ئەگەر خوای پەنهانبین لە ڕۆژی قیامەت دا پێی فەرمووی: ئەرێ فلانکەس! ئەوە بۆچی شوێن بیردۆزەو ڕێچکەی (...) کەوتبووی؟ مەگەر من قورئانم بۆ تۆ نەناردبوو کە بیکەیە بەرنامەو ڕێبازی ژیان و گوزەرانت؟ ئایا قورئانم بۆ ناردبووی یان فلان ڕێچکە؟

گوتی: منیش دەڵێم: خوایە! من هەر ئەوەندەم لێدەزانی و، خەتای مەلایەکان بوو، پێشمان نەکەوتن و ڕێی خەباتیان پێشان نەدایین!

گوتم: ئاخر خوای دادگەریش دەفەرموێ: ئنجا مادام بە ڕێی ڕاستت نەدەزانی، بۆچی بە نەزانیی پێش میللەت کەوتبووی؟ مەگەر لە قورئاندا پێم نەفەرموو بووی: کە ئەگەر نازانن، لە زانایان پرسیار بکەن؟ ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾﴾الأنبياء!

ئیدی لێرەدا گفتوگۆیەکەمان تەواو بوو.

کەواتە: بەڵێ، نابێ هەموو بابایەکی بەڵادارو گرفتار، کە ڕەنج و مەینەتیی دیت، پێی وابێ هەر لەبەر ئەوەی کە ناوی مسوڵمانی لەسەرە، لەسەر نارەحەتیی و ڕەنج و دەردەسەریەکانی پاداشتی لە لای خوا هەیە، بەڵکو بەبێ ڕێبازو ئایینی خوا گرتن، مرۆڤ ئەگەر بە شمشێر هەور دابێنێ، لە لای خوای دادگەرەوە بۆ قیامەت، کارەکەی فلسێک ناهێنێ و سەپانی پووشە، دەبێ ئێمە کاتێک چاوەڕێی پاداشت بین لە خوا، کە ناوی خوامان لە کارەکەمان هێنابێ و، هەم بە پێی شەرعی خوا بێ، هەم مەبەستمان پێی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بێ، ئەگەر نا وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە[1]: کەسێک کە بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵک کارێک بکات، ئەگەر دەوڵەمەندێکە پارە دەبەخشێ، ئەگەر زانایەکەو قسەی باش بۆ خەڵک دەکات، ئەگەر جەنگاوەرێکەو بە ڕواڵەت لە پێناوی خوادا لەسەر ڕێبازی ئیسلام دەکوژرێ، بەڵام مادام مەبەستی پێ خوا نەبێ، خوا لە ڕۆژی قیامەت دا پێیان دەفەرموێ: مەدحت کراو ستایشت کراو، پاداشتی خۆت وەرگرتەوە، هەر بۆ ئەوەشت بوو، بۆ ئەوەت نەبوو من پاداشتت بدەمەوە، هەروەها ئەو جۆرە کەسانەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾الفرقان، واتە: ڕوومان کردە ئەو کردەوەیەی کە کردبوویان (کردەوە باشەکان)، کردمانە تۆزو گەرد، چونکە ناوی خوایان لێ نەهێنا بوو و، هەوێنی ئیمان و خوا پێ مەبەست بوونی تێدا نەبوو.

**٢- کەسێک لەسەر گوناهو تاوان، گیرۆدەی دەردو گرفتارییەک ببێ، ئەوە هیچ کە پاداشتی نیە، بگرە لێپرسینەوەشی لەسەرە:**

ئەمەش ئاگادارییەکی پێویستە بۆ ئەوەی بە هەڵە لە چەمک و واتای تاقیکردنەوە (ابتلاء) تێنەگەین، بۆ وێنە: ئایا بابایەکی دزو جەردەو ڕێگر، یان داوێن پیس، یان خوێنڕێژو پیاو کوژ، لە ئەنجامی کارە دزێوو ناشەرعییەکەیدا، گیرۆدەی سزاو تۆڵەو باجدان ببێ، دەگونجێ بە هیوا بێ لەسەر ئازارو نارەحەتیی

---

(١) أخرجه أحمد: ٨٢٦٠، ومسلم: ١٩٠٥، والنسائي: ٣١٢٧.

و ئـەو سـزاو تۆڵـەو جەزرەبەیـە، خـوا پاداشـتی بداتـەوەو بـۆی بـە چاکـەو خێـر لـە قەڵـەم بـدرێ و، دڵـی خـۆی بـەوە خـۆش بـكات كـە ئـەوە تاقیكردنـەوەی خوایـەو، بـەڵاو گرفتارییەكـە بەسـەری هێنـاوەو، خـوای كاربەجـێ ئەوانـەی خۆشـیدەوێن تاقییـان دەكاتـەوەو تووشـی سـەختیی و ئازاریـان دەكات؟! بـە تەئكیـد نەخێـر، چونكـە:

أ)- هەموو ئەو فەرمایشتانەی باسی پاداشتی بەڵاو گرفتاریی و ناڕەحەتیی دەكەن، لە كاتی باسكردن و ناوهێنانی مسوڵمانانی دیندارو چاك دا، باسی ئەو پاداشت و پلەو پایە دەكەن.

ب)- لە هیچ كام لە فەرمایشتەكاندا ئاماژە بەوە نەكراوە، كە بابایەک بە هۆی گوناه و هەڵەو لادانیشەوە، تووشی بەڵاو گرفت و ناڕەحەتیی بووبێ، هەمان پاداشت و پلەی هەیە، با تەماشا بكەین:

یەک: خوا دەفەرموێ: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾البقرة، واتە: موژدە بە خۆڕاگران بدە، ئەوانەی كاتێک بەڵایەكیان تووش دەبێ دەڵێن: ئێمە هی خواین و، بۆ لای خواش دەگەڕێینەوە، ئا ئەوانە خوا مەدحیان دەكات و بەزەیی پێیاندا دێ و، ئا ئەوانە ڕێی ڕاست گرتووانن.

دوو: هەروەها پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: [مَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ، حَتَّى يَلْقَى اللهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ] (أخرجه أحمد: ٩٨١٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والترمذي: ٢٣٩٩، وقال: حسن صحيح، والبيهقي في شعب الإيمان: ٩٨٣٦، وابن حبان: ٢٩١٣، والحاكم: ٧٨٧٩، وقال: صحيح على شرط مسلم عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه).

واتـە: بـەڵاو ناڕەحەتیـی بـەردەوام تووشـی پیـاوی بـڕوادارو ئافرەتـی بـڕوادار دێ، لـە نەفسـی خۆیـداو لـە منداڵەكانیـداو لـە سـامانیدا، تاكـو كاتێـک دەگاتـە خـوای بـەرز، هیـچ گوناهـی پێـوە نەمـاوە.

**سێ: هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ عِظَمَ الجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ البَلَاءِ، وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى إِذَا أَحَبَّ قَوْماً ابْتَلَاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا ، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ} (أخرجه الترمذي: ٢٣٩٦، وقال: حسن غريب» وابن ماجه: ٤٠٣١، البيهقي في شعب الإيمان: ٩٧٨٢، والقضاعي: ١١٢١، عن أنس رضي الله عنه، وقال الألباني: حديثٌ حسن).**

واتە: پاداشتی مەزن لەگەڵ تاقیکردنەوەی مەزن دایە، (واتە: تاکو بەڵا مەزنتر بێ، پاداشتەکەشی مەزنترە)و، خوای بەرز ئەگەر کەسانێکی خۆشویست، تاقییان دەکاتەوە، ئنجا ئەوەی ڕازیی بوو، خوا لێی ڕازییە، (ڕەزامەندیی خوای بۆ هەیە)و، ئەوەش کە تووڕە بوو، خوا لێی تووڕە دەبێ.

**چوار: هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُصِبْ مِنْهُ } (أخرجه أحمد: ٧٢٣٤، والبخاري: ٥٣٢١، وابن حبان: ٢٩٠٧، عن أبي هريرة رضي الله عنه).**

واتە: هەر کەسێک خوا چاکەی بۆی بوێ، تووشی گرفتاریی دەکات، تووشی بەڵاو ناڕەحەتیی دەکات.

هەر کەس لە قەدەر ئیمانی خۆی، تاکو ئیمانەکە چاکتر بێ، تاقیکردنەوەکەی قورستر دەبێ، کەواتە: خوای بەخشندەو بەبەزەیی بە هۆی تاقیکردنەوەی بەندەکانیەوە، بەو بەڵاو ئازارو مەینەتیانەی کە دێنە ڕێیان، گوناهەکانیان لێ هەڵدەوەرێنێ و پلەو پایەیان بەرز دەکاتەوە، بەڵام بە مەرجێک بە ئەنقەست، هەروەها بە هۆی گوناهو سەرپێچییەکانەوە، خۆیان گیرۆدەی ئەو بەڵاو ئازارو ناڕەحەتیانە نەکردبێ، چونکە لە حاڵێکی وادا، ئازارو ناڕەحەتیی و گرفتارییەکانی ئەو جۆرە کەسانە، ئەوپەڕەکەی بایی ئەوە دەکات کە ببێتە مایەی پاکبوونەوەی خاوەنەکانیان لە خودی ئەو گوناهو تاوانانەی کە بە هۆیانەوە دووچاری بەڵاو سزاو تۆڵەو ناڕەحەتیی بوون، ئەمما خودی بەڵاو ناڕەحەتییەکان کە بە هۆی گوناهو تاوانەوە بوون، لە ڕاستییدا زۆر نیزیکە خوا سزاشیان بدات، بۆچی ئەو بەڵایەت بەسەر خۆت هێنا؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە تۆ بە ڕێیەکی چەوت دا ڕۆیشتی، خۆت تووشی گوناح کرد، تووشی ئەو باج دانە بووی!

**٣- هەر کەسێک بە شێوەیەکی هەڵەو ناشەرعییانە، خۆی بخاتە بەر بەڵاو تاقیکردنەوەیەک، نابێ بە تەمای پاداشت بێ:**

ئاگاداریی یەکەممان لە بارەی کەسانێکەوە بوو، کە لە حاڵێکدا شوێن بەرنامەو ڕێبازی جگە لە خوا کەوتوون، بە هیوان، کە بەڵاو ئازارو ناڕەحەتییەکانی، ببنە مایەی پاداشت درانەوەیان لە دواڕۆژدا، کە ئەوانە خەیاڵپڵاویان کردوە.

ئاگاداری دووەمیش دەربارەی کەسانێک بوو، کە لە خودی خۆیاندا مسوڵمانن و بە پێی ئیسلام بەڕێوە دەچن، بەڵام لە حاڵێک دا کە لە سۆنگەی لە شەرع لادان و خراپەو تاوانەوە، دووچاری سزاو ئازارو، تۆڵە، یان نەخۆشیی و مەینەتباریی بوون، بە ئومێدی ئەوەن خوا پاداشتیان بداتەوەو، پلەو پایەیان بۆ بەرز بکاتەوە، ئەوانەش هەر خەیاڵپڵاویان کردوە.

ئاگاداری سێیەمیش لە بارەی کەسانێکەوەیە کە بە حیسابی خۆیان بە کاری چاکەو خێر هەڵدەستن، بۆ وێنە: فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، یان جەنگ و جیهاد، یان هەق بێژیی، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە کارەکەیان لە خودی خۆیدا شەرعیی و ڕاستە، بەڵام چۆنیەتیی ئەنجامدانەکەی، هەلومەرجەکەی، کات و شوێنەکەی، بەو جۆرە نیە کە شەرع دیارییکردوە، ئەوانەش نەک هەر هیچ پاداشتیان نیە، بگرە بە ئەندازەی ناتەواویی کارەکەیان و، زەرەرو زیان لێکەوتنەوەی بۆ ئیسلام و مسوڵمانان، گرفتاری لێپرسینەوەو سزاو جەزرەبەش دەبن، هەندێک کەس وا دەزانێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى**} (**أخرجه البخاري: ١، ومسلم: ٤٥، عَنْ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ**).

واتە: بێگومان کردەوەکان بە گوێرەی نیازو مەبەستەکانن و، بە تەنکید هەر کەسە بە پێی نیازو مەبەستی، پاداشتی هەیە.

وا دەزانن مادام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کردەوەکان بە گوێرەی نیازو مەبەستەکانن و پاداشتیان هەیە، هەرکەسێک هەر چۆنێکی عەقڵی بڕی بە کارێکی خێرو چاکە هەڵسا، ئنجا ئەو کارە ئەنجام و ئاکامی هەر چۆنێک بێ، هەر شوێنەوارێکی چاک یان خراپی لێ بکەوێتەوە، خاوەنی کردەوەکە بە گوێرەی نیازو مەبەستی نێو دڵی، پاداشتی لە لای خوا هەر مسۆگەرە، چونکە مادام لە ڕێی خواو ئیسلام دا، تووشی گرفتاریی و بەڵاو مەینەتیی و، ڕەنج و ئازارو سەرئێشان بووە، ئەوە بە ئەندازەی ئێش و ئازارو ناڕەحەتییەکەی، مادام نیازی نێو دڵی تەواو بێ، پاداشتی هەر دەدرێتەوە، کە بێگومان ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەو، ئەو جۆرە تێگەیشتنە لە مەسەلەی تاقیکردنەوەو بەڵاو ناڕەحەتیی بەسەر هاتن دا، زۆر هەڵەو سەرکێڵانەیەو، خاوەنەکەی تووشی غەڵەتی سەیر سەیر دەکات و، ڕەنگە هەڵوێستی وای پێ بنوێنێ، کە ئەم پەندە کوردییەی بەسەردا بچەسپێ، کە دەڵێ: (بۆ دەستەسڕێک قەیسەرییەک دەسووتێنێ»، دەتوانین زۆر بەڵگان لەو بوارەوە بێنین بۆ ڕاستیی ئەو قسەیەی گوتمان:

أ- یەکێک لەوانە، خوا لەسەر زاری کوڕە باشەکەی ئادەم، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾المائدة، واتە: بە تەئکید خوا تەنیا لە پارێزکاران قبووڵ دەکات، ئنجا پارێزکاریی، دوو مەرجی پێویستن:

**یەکەم:** دەبێ ئەو کارەی ئەنجامی داوە، بەپێی شەرعی خوا بێ.

**دووەم:** دەبێ تەنیا خوای پێ مەبەست بێ.

ئنجا بە پێی شەرعی خوا بوونی کردەوەی باش، هەم مەبەست پێی ئەصڵی کردەوەکەیە، هەم چۆنیەتیی و کات و شوێنی ئەنجامدانیشی، ئەوانیش دەگرێتەوە، بۆ وێنە:

کەسێک نوێژ دەکات، دەبێ دیار بێ: چ جۆرە نوێژێک دەکات، نوێژێک بێ کە شەرع دایناب‌ێ، بۆ وێنە: نوێژی چێشتەنگاو، نەک بۆ خۆی لە خۆوە

جۆرە نوێژێک دابێنێ، پاشان دەبێ نوێژەکەشی بەو چۆنیەتییە بکات کە شەرع دایناوە، نەک بێتێ لە نوێژێکدا سێ چوار سەجدەی زیاد، یان سێ چوار ڕکووعی زیاد، یان بیکاتە چەند تەحیاتێک، دەبێ بەو شێوەیە بێ کە شەرع دیاریکردوە.

ب- هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾ ﴾التغابن، واتە: ئەوەندەی کە دەتوانن پارێز لە خوا بکەن.

ج- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ} (أخرجه البخاري: ٦٨٥٨، ومسلم: ١٣٣٧، والنسائي ٢٦١٩، وابن ماجه: ٢ عن أبي هريرة).

واتە: کاتێک فەرمانم بە کارێک پێکردن، ئەوەندەی کە لە تواناتاندا هەیە، لێی ئەنجام بدەن.

ئنجا زاناو پێشەوایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون و، یەکدەنگن کە سەرجەم جموجۆڵ و چالاکییە شەرعییەکان لە حاڵێکدا کە تواناو بڕست و هەلومەرجی ئەنجامدرانیان وەک پێویست ئەڕەخسابێ و، لە کاتی دەست بۆ بردنیان دا، ئەگەری زەرەرو زیان و بە ئاکام نەگەیشتنیان زیاتر بێ، دروست نیە، دەستیان بۆ ببردرێ، بۆ وێنە لە بارەی جەنگ و جیهادەوە گوتوویانە: جەنگ و جیهاد بە گوێرەی هەلومەرجە جیاوازەکان حوکمی دەگۆڕێ و، لە حاڵەتی جیا جیادا هەر پێنج حوکمە شەرعییەکان (الأحكام الشَّرعيَّةُ الخَمسة)، بەسەردا دەچەسپێن، جاری وا هەیە فەرزە (فەرزی کیفایە، یان فەرزی عەین)، جاری وا هەیە سوننەتەو، جاری واش هەیە قەدەغەیە، جاری واش هەیە نا پەسندەو، جاری واش هەیە ڕەوایە، ئەوەش هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە، کە ئایا ئەو کارە هەرچەندە لە ئەصڵدا شەرعییە، بەڵام کە ئەنجام دەدرێ بە پێی هەلومەرجەکە، بە پێی کات و قۆناغەکە، بە پێی تواناو بڕستەکە، بە پێی چۆنیەتییەکە، ئایا مسوڵمانان لێی بەهرەمەندن، یان زەرەرمەندن؟!

د- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، بابای مسوڵمان خۆی بخاتە حاڵەتێکەوە کە تێیدا زەبوون بێ، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتوە: **{عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَيْسَ لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قَالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ الْبَلاءِ لِمَا لاَ يُطِيقُ} (أخرجه أحمد: ٢٣٤٩١، والترمذي: ٢٢٥٤، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٤٠١٦، قال الألباني: صحيح)**[1].

واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ بڕوادارێک بۆی نیە خۆی زەبوون بکات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن خۆی زەبوون دەکات؟ فەرمووی: خۆی دەداتە بەر بەڵاو تاقیکردنەوەی وا، کە لە توانایدا نیە.

ئەمانە، ئەو سێ ڕاستییە بوون، کە گرنگە ئێمە لەبەرچاویان بگرین، لە کاتێکدا باس باسی تاقیکردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی.

شایانی باسە: ئەم کورتە باسە لە نامیلکەی (تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی) کە دانراوی بەندەیەو، ئاڵقەی حەڤدەیەمە لە زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان بە گوشراویی و خوڵاسەیی وەرمانگرت.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) حديث ابن عمر: أخرجه الطبراني في الكبير: ١٣٥٠٧، وأخرجه أيضًا: في الأوسط: ٥٢٥٧، قال الهيثمي (٢٧٤/٧): رواه البزار الطبراني في الأوسط والكبير وإسناد الطبراني في الكبير جيد ورجاله رجال الصحيح، غير زكريا بن يحيى بن أيوب الضرير، ذكره الخطيب، روى عن جماعة، وروى عنه جماعة، ولم يتكلم فيه أحد.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان چـواردە (١٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (١٤ - ٢٧)، کـە ئاماژەیەکـی کورتیـان تێدایـە بـە بەسـەرهاتی نـووح ﷺو، تیشـکێکی تـا ڕاددەیـەک باشـی تێـدا خراوەتـە سـەر بەسـەرهاتی ئیبراهیـم ﷺو گەلەکـەی و، دەربازبوونـی لـە پیلانـی سـووتێنرانی لـە لایـەن کافـرەکان و، بـڕوا پێهێنانـی لـووط و، پاداشـت درانـەوەی لـە دنیـاو دوارۆژداو، پێبەخشرانـی هـەرکام لـە ئیسـحاق و یەعقـووب، کـە ئیسـحاق کوڕیـەتی و یەعقووبیـش نەوەیـەتی و کـوڕی ئیسـحاقە.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُوا۟ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يَئِسُوا۟ مِن رَّحْمَتِى وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٣﴾ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ

ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٞۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَجۡرَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی نووحیشمان بۆ لای گەلەکەی نارد، ئنجا هەزار ساڵیان جگە لە پەنجا ساڵ لە نێودا مایەوە (هەر سەرگەرمی بانگەواز بوو)، بەڵام بڕوایان پێنەهێنا، بۆیە سەرەنجام تۆفان گرتنی لە حاڵێکدا کە ستەمکار بوون ﴿١٤﴾ یەکسەر خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان ڕزگار کردو، گێڕامان بە نیشانەیەک (ی مەزن) بۆ جیهانییان ﴿١٥﴾ هەروەها ئیبراهیمیش (یاد بکەوە) کاتێک بە گەلەکەی گوت: خوا بپەرستن و پارێزی لێبکەن، ئەگەر بزانن ئا ئەوەتان بۆ ئێوە باشترە (کە تەنیا خوا پەرست بن) ﴿١٦﴾ بێگومان ئێوە تەنیا بتان لە جیاتی خوا دەپەرستن و درۆ هەڵدەبەستن، بەڕاستیی ئەوانەی جگە لە خوا دەیانپەرستن، هیچ بژیوێکیان بۆتان بەدەست نیە، دە جا بژیو تەنیا لە لای خوا بخوازن و، بیپەرستن و سوپاسی بکەن، بەس بۆ لای وی دەگێڕدرێنەوە ﴿١٧﴾ ئەگەر (پەیامی خواش) بە درۆ دابنێن، بە دڵنیایی چەند کۆمەڵگایەک پێش ئێوەش (بەرانبەر پەیامی خوا بێبڕوا بوون و) بە درۆیان داناو، پێغەمبەریش بەس گەیاندنی ڕۆشن و ڕوونکەرەوە (ی پەیامی خوا)ی لەسەرە ﴿١٨﴾ ئایا (بێبڕوایان) نەیاندیوە چۆن خوا دروستکراو دەست پێ دەکات و، دوایی (پاش نەمانی) دەیگێڕێتەوە (بۆ بوون)،

ئەوە (كارێكە) بۆ خوا ئاسانە ﴿١٩﴾ بڵێ: بە زەوییدا بڕۆن، سەرنج بدەن! (خوا) چۆن سەرەتا دروستكراوی هێناوەتە دی؟! دوایی خوا پێكەیاندن و دروستكردنی كۆتایی دەرەخسێنێ، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێک بە توانایە ﴿٢٠﴾ (خوا) هەر كەسی بوێ (بە پێی خراپەكانی) ئازارو سزای دەدات و، هەر كەسیشی بوێ (بەپێی چاكەكانی) بەزەیی پێدادێ و، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٢١﴾ (ئەی مرۆڤەكان!) ئێوە نە لە زەمین و، نە لە ئاسمان دا دەستەوسانكەر (ی خوا) نین و، جگە لە خواش هیچ دۆست و پشتیوانێكتان نیە ﴿٢٢﴾ ئەو كەسانەش كە بە نیشانەكانی خواو دیداری بێبڕوان، ئا ئەوانە لە بەزەیی من نا ئومێد بوون و، ئەوانە (لە ڕۆژی دوایی دا) ئازارێكی بە ئێشیان هەیە ﴿٢٣﴾ وەڵامی گەلەكەشی (گەلی ئیبراهیم) تەنیا ئەوە بوو كە گوتیان: بیكوژن یان بیسووتێنن، خواش لە ئاگر قوتاری كرد، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێک بڕوا بێنن ﴿٢٤﴾ هەروەها (ئیبراهیم) گوتی: ئێوە تەنیا بە مەبەستی خۆشەویستیی نێوانتان لە ژیانی دنیادا، بتەكانتان لە جیاتی خوا (بە پەرستراو) گرتوون، دوایی لە ڕۆژی قیامەت دا بەرانبەر بە یەكدی بێبڕوا دەبن و، نەفرین لە یەكدی دەكەن و، پەناگەتان ئاگر(ی دۆزەخ)ەو، هیچ یارمەتیدەرێكتان نابێ ﴿٢٥﴾ ئنجا لووط بڕوای (بە خواو پەیامەكەی) بۆ هێناو، (ئیبراهیم) گوتی: من بەرەو لای پەروەردگارم كۆچكەرم، بە دڵنیایی تەنیا ئەو زاڵی كارزانە ﴿٢٦﴾ ئیسحاق و یەعقووبیشمان پێبەخشین و، پێغەمبەرایەتیی و (دابەزینی) كتێبیشمان خستە وەچەكەیەوە، لە دنیادا پاداشتەكەیمان دایەوەو، بە دڵنیایی لە دواڕۆژیشدا لە چاكانە (لە ڕیزی صاڵحان دایە) ﴿٢٧﴾].

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَلَبِثَ): واتە: لە نێویاندا مایەوە، نووح لە نێو گەلەکەی دامایەوە (لَبِثَ بِالمَكَان: أَقَامَ بِهِ لازِمَاً) لە شوێنێک مایەوەو، ئەو شوێنەی چۆڵ نەکرد.

(ٱلطُّوفَانُ): (الطُّوفَانُ: كُلُّ حَادِثَةٍ تُحِيطُ بالإِنْسَانِ، وَصَارَ مُتَعَارَفَاً فِي المَاءِ المُتَنَهِي فِي الكَثْرَة)، (طوفان): هەر ڕووداوێکە کە دەوری مرۆڤ دەدات، کارەساتێکی بێڕەزا، ڕووداوێکی گەورەو مەزن، بەڵام لە عورفدا زیاتر بۆ ئەو ئاوە کە زۆر زۆرە، لافاوو لێزماو، بەکاردەهێنرێ بە کوردیی، تۆفانیش هەر بەکاردەهێنرێ.

(أَوْثَـٰنًا): (أَوْثَان: وَاحِدُهُ: وَثَن، وَهُوَ حِجَارَةٌ كَانَت تُعْبَدُ، وَالصَّنَمُ: جُثَّةٌ مُتَّخَذَةٌ مِنْ فِضَّةٍ أَو نُحَاسٍ أَو خَشَبٍ، وَجَمْعُهُ أَصْنَام)، دوو وشە هەن: (أَوثَان)و (أَصْنَام)، (أَوثَان) کۆی (وَثَن)ە، (أَصْنَام) کۆی (صَنَم)ە، (وَثَن): بریتییە لە بەردێک کە بپەرسترێ بەبێ ئەوەی شێوەو دیمەنێکی دیارییکراوی پێدرابێ، بە پیرۆزیان زانیوە، بەڵام (صَنَم): بریتییە لە پەیکەرێک لە شێوەی شتێکدا، (باڵندە، مرۆڤ، فریشتە)، کە لە زیو، یاخود مس، یاخود تەختە، یاخود لە هەر ماددەیەکی دیکە دروستیانکردووەو، لە شێوەی مرۆڤ یان هەر شتێکداو پەرستوویانە.

(وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًا): واتە: درۆ هەڵدەبەستن، وشەی (خَلق): بە مانای ئەندازەگیریی دێ، بە مانای داهێنانیش دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای هەڵبەستن دێ، درۆ هەڵبەستنیش ئەوەیە: کە کەسێک قسەیەک بکات ئەصڵی نەبێ، ئەوەش هەر جۆرێکە لە پەیداکردن، بەڵام پەیداکردنی قسەیەکی درۆ کە بنەمایەکی نیە.

(إِفۡكًا): (الإِفْكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ)، (إفك): بریتییە لە هەر شتێک لەو ڕووەی لادرابێ کە پێویست بووە لەسەری بێ، (إِفك) بە مانای هەڵگێڕانەوەو لادان، دێ (أَنَّى يُؤْفَكُون) یانی: (أَنَّى يُصْرَفُون) بۆ کوێ لادەدرێن؟

(ٱلنَّشۡأَةَ): (النَّشأُ وَالنَّشأَةُ: إِحْدَاثُ الشَّيءِ وتَرْبِيَتُهُ)، وشەی (نَشأ) و (نَشأَة): بریتیە لە پەیداکردنی شتێک و، پەروەردەکردن و گەورە کردن و، گەشە پێدانی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئەم چواردە (١٤) ئایەتە، باسی بەسەرهاتی نووح ﷺ، زۆر بە کورتیی و خوڵاصەیی دەگێڕنەوەو، گۆشەیەکیش لە ژیان و بەسەرهاتی ئیبراهیم لەگەڵ گەلەکەی دا دەگێڕنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی درێژتر، (الطبري) جوانی گوتوە لێرەدا، دەڵێ: خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی تاقیکردنەوەی خۆی، بۆ مسوڵمانان دەکات، کە شتێکی حەتمییە، پاشان باسی کەسانێکی کرد کە لە تاقیکردنەوەی خوادا خۆڕاگر نابن و، لەسەر تەلن و لەسەر قەراغن، وەک لە سوورەتی (الحج) دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: کەسانێک هەن خوا دەپەرستن بەڵام لەسەر قەراغ وەستاون، ئەگەر چاکەی تووش بوو، پێی ئارام دەگرێ، بەڵام ئەگەر خراپەی بەسەرهات، لەسەر ڕووی هەڵدەگەڕێتەوە، دنیاو دوارۆژی دۆڕاندوون، ئەوەشە زیانباریی ڕۆشن.

لێرەش دوای ئەوەی خوا فەرمووی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ ﴾، لە خەڵک هەیە کەسانێک کە دەڵێن: بڕوامان بە خوا هێنا، بەڵام ئەگەر لە پێناوی خوادا ئازاردرا، ئازاردانی خەڵکی بۆی، وەک سزای خوا تەماشا دەکات، (زۆر لە لای شتێکی گەورەو مەزنە، بۆیە لە بەرانبەریدا بە چۆک دادێ)، بەڵام ئەگەر لە پەروەردگارتەوە یارمەتیی و پشتیوانییەک بوو، دەڵێن: ئێمەش لەگەڵتان بووین، واتە: لە کاتی نەهاتدا خۆڕانەگرن و، لە کاتی هاتدا، لافێک لێدەدەن و

ئیددیعایەک دەکەن کە هەقیان نیە، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ بەسەرهاتی نووح ﷺ ئاماژەیەک پێ دەکات کە چەند خۆڕاگر بووە، نۆ سەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ بەردەوام بووە لەگەڵ گەلە کافرو ملهوڕو کەللەڕەقەکەی دا، بەڵام وازی لە کارەکەی خۆی نەهێناوەو دەستبەردار نەبووە، ماندوو نەبووەو شل نەبووەو کول نەبووە.

دوایی باسی ئیبراهیم ﷺ دەکات، کە تەنانەت لە ئاگری سوور نەترساوە لە پێناوی خوادا، خستوویانەتە نێو مەنجەنیق و بە مەنجەنیق هەڵیانداوەتە نێو بڵێسەی ئاگر، بەڵام دەستبەرداری پەیام و بەرنامەی خوای پەروەردگار نەبووە، واتە: ئێوەش نووح بکەنە سەرمەشق بۆ خۆڕاگریی و پشوو درێژیی و، ئیبراهیم بکەنە سەرمەشق (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، لەوەدا کە لە پێناوی خوادا ئامادەبن فڕێ بدرێنە نێو ئاگری سوورەوەو، ئامادەبن لە پێناوی خوادا کۆچ بکەن و، هەموو شتێک بەجێبهێڵن.

دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾، بە دڵنیایی نووحمان بۆ لای گەلەکەی نارد، هەزار (١٠٠٠) ساڵ جگە لە پەنجا (٥٠) لە نێویاندا مایەوە، واتە: (٩٥٠) ساڵ لە نێویاندا مایەوە، ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾، تۆفان گرتنی، لافاوێکی گەورە گرتنی، لە حاڵێک دا کە ئەوان ستەمکاربوون، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرمووێ: (فَلَبِثَ فِيهِم تِسْعُ مِائَة وخَمسينَ عَامَاً، أو سَنَةً) بەڵام بەو تەعبیرە فەرموویەتی: هەزار جگە لە پەنجا، بۆ ئەوەی کە بزانرێ بە وردیی، (٩٥٠) ساڵ بووە، ئەگەر فەرموویای: (٩٥٠) لەوانەیە یەکێک گوتبایە: دەبێ بە جۆرێک لە زێدەڕۆیی، یان بۆ زۆر پیشاندانی ئەو ماوەیە بێ، بەڵام کە خوا دیاریکردوە: هەزار جگە لە پەنجا، مانای وایە ڕێک (٩٥٠) ساڵ، نووح ﷺ پێش تۆفان لە نێو گەلەکەیدا ماوەتەوەو، لەگەڵیاندا سەرگەرمی بانگەوازو تێگەیاندن و هۆشیارکردنەوەیان بووە، کە دەفەرمووێ: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾، تۆفان گرتنی لە حاڵێکدا ستەمکار بوون، واتە: بە هۆی ستەمەکەیانەوە تۆفان گرتنی، ئەگەرنا خوا ﷻ ستەم لە بەندەکانی ناکات.

﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئێمە خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردن و، گێڕامان بە نیشانەیەک بۆ جیهانییان.

ئایا ئەم ڕاناوی (ها) لە (وَجَعَلْنَٰهَآ)دا، بۆ (سَفِينة) دەچێتەوە، یان بۆ بەسەرهاتەکە دەچێتەوە، یان بۆ ئەو سزایە دەچێتەوە کە کافرەکانی پێ سزا دراون؟ هەموویان گونجاون، بەڵام وەک دواییش باسی دەکەین وا نیزیکترە ڕاناوەکە بۆ کەشتییەکە بچێتەوە، چونکە بە پێی ڕێزمانی عەرەبیی ڕاناو (ضمیر) دەچێتەوە بۆ نیزیکترین باسکراو (أَقْرَبُ مَذْكُورٍ) کە ئەویش (السَّفِينة) یە، ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ﴾، (أي وَجَعَلْنَا السَّفِينَةَ آيَةً لِلعَالَمِين)، کە دوایی باسی دەکەین: کەشتییەکە چۆنەو، چۆن نیشانەیەو موعجیزەیە بۆ جیهانییان، هەڵبەتە ئێمە پێشتریش باسمان کردوە، کە لە سوورەتی (هود)دا لێکۆڵینەوەیەکی تاکو ڕاددەیەک تێروتەسەلمان کردوە، لە بارەی بەسەرهاتی نووح ﷺ و گەلەکەیەوە.

ئنجا یەکسەر دێتە سەر باسی ئیبراهیم و دەفەرمووێ: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ﴾، هەروەها ئیبراهیمیشمان ڕەوانکرد، ئەم (و)ە ئەمە دەگێڕێتەوەو بایەداتەوە بۆ سەر (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا ) واتە: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِبْرَاهِيم)، ئیبراهیمیشمان ڕەوانکرد، ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، کاتێکک بە گەلەکەی خۆی فەرموو: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، خوا بپەرستن، ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾، هەروەها پارێزی لێبکەن، ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئا ئەوە کە تەنیا خوا بپەرستن و تەنیا پارێز لە خوا بکەن، بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بزانن، ئەگەر زانیارییتان هەبێ، بێجگە لە خواپەرستیی، هیچ شتێکی دیکە شایستەی مرۆڤ نیە.

﴿ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لە جیاتی خوا، لە خوار خواوە، جگە لە خوا، تەنیا بتان دەپەرستن، (أَوثَان) کۆی (وَثَن)ە، کە بریتیە لە بەردێک بپەرسترێ، هەرچەندە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (وَثَن) دەگونجێ

هەر بەردێک بێ، دەشکونجێ پەیکەرێک بێ بە شێوەی مرۆڤ، یان لە هەر شێوەیەکی دیکەدا، بەڵام زۆربەیان دەڵێن (وَثَن) مەرج نیە شێوەی هەبێ، بەڵام (صَنَم) شێوەی هەیە. ﴿ وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾، هەروەها درۆ هەڵدەبەستن، (وَتَخْلُقُونَ ) یانی: پەیدای دەکەن، درۆ پەیدا دەکەن، هەڵدەبەستن، شتێک دەڵێن کە هیچ بنەمایەکی نیە، چونکە هاوبەشانی خوا، بوونیان نیە. ﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە جیاتی خواو، جگە لە خوا دەیانپەرستن، بژێویان بۆ ئێوە بە دەست نیە. ﴿ فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ ﴾، ئنجا بژێو لە لای خوا داوا بکەن. ﴿ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ ﴾، بیپەرستن، سوپاسگوزاریی بۆ ئەنجامدەن. ﴿ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، هەر بۆ لای وی دەگێردرێنەوە، بۆیە بزانن بە چ چاوو ڕوویەکەوە دەچنەوە خزمەتی خوا، بزانن بە چ دەست و توێشوویەکەوەو بە چ پەرێزو بەرهەمێکەوە، دەچنەوە خزمەتی.

﴿ وَإِن تُكَذِّبُوا ﴾، ئەگەر ئەوەش کە دەیڵێم، بە درۆی دابنێن، ئەو پەیامە، ئەو بەرنامەیەی خوا بە درۆ دابنێن. ﴿ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش ئێوەش دا گەلانێک، کۆمەڵگایانێک، پێغەمبەران و پەیامەکانی خوایان بە درۆ دانان. ﴿ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾، ڕەوانەکراو (ی خوا)یش، تەنیا گەیاندنی ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەری لەسەرە، دوای ئەوەی پەیامی خوای بە ڕوونیی و بە ئاشکرایی پێگەیاندن، ئەرکی خۆی ئەنجامداوە، ئەگەر ئێوە وەڵامی نەدەنەوە، ئەوە خۆتان زیانتان کردوە، ئەگەرنا ئەو زیانی پێناگات، چونکە ئەو ئەرکی خۆی جێبەجێ کردوە، ئەرکەکەشی هەر ئەوەیە پەیامی خوا بگەیەنێ، بە قسەو بە کردەوەو بە هەڵوێست بیگەیەنێ.

ئنجا ئەم ئایەتانە: (١٩ - ٢٣)، ئەم پێنج ئایەتە موبارەکە، فەرمایشتی خوایە نێواخنی کردوە لەگەڵ قسەکانی ئیبراهیم دا ﵇ پێش ئەوەی وەڵامی کافرەکان بخاتەڕوو، هەندێکیش دەڵێن: ئەوە هەر فەرمایشتی ئیبراهیمە، بەڵام شێوەی دواندنەکەی لە دواندنی ڕاستەوخۆ (خِطاب)ەوە گۆڕیوە بۆ دواندنی نادیار(غِیاب)،

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ﴾، ئایا نابینن؟ بە چاوی عەقڵ و دڵ، ئەگەرنا بە چاوی سەر نابینرێ، ئایا نابینن خوا چۆن سەرەتا دروستکراو دەست پێ دەکات، (أَبْدَأَ) کە (مضارع)ەکەی (يُبْدِئ)یە، لەگەڵ (بَدَأَ) کە (مضارع)ەکەی (يَبْدَأُ)یە، یەک واتایان هەیە، یەکیان چواریی (رباعي)یەو یەکیان سیانیی (ثلاثي)یە لە ڕووی پیتەکانەوە، (أَبْدَأَ يُبْدِئ) لەگەڵ (بَدَأَ يَبْدَأُ) هەر یەک واتایان هەیە، واتە: دەستی پێکرد، ئایا نابینن بە چاوی عەقڵ و دڵ چۆن خوا دروستکراوەکان دەست پێ دەکات؟ ﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُ ﴾، دوایی ئەو دروستکراوە دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی لە بەین دەچێ، جارێکی دیکە دەیگێڕێتەوە بۆ بوون، ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە لەسەر خوا ئاسانە، کە ئێوەش دوای ئەوەی دەفەوتێن و دەمرن، بتانگێڕێتەوەو زیندووتان بکاتەوە، کەواتە: ئێوەش پێتان وانەبێ، ئەگەر لە بەین چوون و مراندنی، زیندوو ناکرێنەوە، بزانن کە ڕۆژێک دێ، زیندووتان دەکاتەوە، تەماشا ناکەن! ڕۆژانە خوا شتان دروست دەکات و لە بەینیان دەبات و، دوایی دەیانگێڕێتەوە؟ کاتی خۆی زانست ئەوەی نەزانیوەو، بۆی دەرنەکەوتوە، کە لە جەستەی مرۆڤدا بە مەزەننە و بە نیزیککراوەیی لە هەر چرکەیەکدا سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە جەستەی مرۆڤ دەمرێ، سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانەی دیکەش شوێنیان دەگرنەوە، جەستەی مرۆڤیش هەمووی لە نیزیکەی سەد تریلیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانە پێکهاتوە، سەد هەزار ملیار خانە.

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾، بڵێ: بە زەوییدا بڕۆن و سەرنج بدەن، خوا دروستکراوەکانی چۆن دەست پێکردوە! واتە: لێبکۆڵنەوە، سەرنج بدەن، ﴿ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ﴾، دوایی خوا دروستکردنەوەی دیکە دێنێتە گۆڕێ و پێدەگەیەنێ، دروستکردنەوەی دیکە، ئەو دروستکردنەوەیە کە لە ڕۆژی دوایی دا دەبێ، واتە: ئێوە تەماشا بکەن بۆ وێنە: لە زیندەوەران، لە ئاژەڵان، خوا چۆن دەیانمرێنێ، یان گژو گیا چۆن وشک دەبێ، دوای ئەوە

لەوەرزی بەهاردا، دووبارە چەكەرە دەكاتەوەو دێتەوە ناراوە، ئێوەش بە هەمان شێوە ﴿ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡـَٔاخِرَةَ ﴾، دوایی خوا پێكەیاندنی كۆتایی دێنێ، كە لە ڕۆژی دوایی دا دەبێ و لە دوای ئەو پێكەیاندن و دروستكردنە، مردن نابێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەمو شتێك بە توانایە.

﴿ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُ ﴾، خوا هەر كەسێكی بیەوێ نازاری دەدات، سزای دەدات و، هەر كەسێكی بیەوێ بەزەیی پێدا دێ، ﴿ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴾، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە، دیارە لێرە بە ڕەهایی فەرموویەتی: هەر كەسێكی بیەوێ سزای دەدات و، هەر كەسێكی بیەوێ بەزەیی لەگەڵ دەنوێنێ، بەڵام بە تەنكید ئەوە بە گۆترە نیە، چونكە سیفەتەكانی خوا ﷻ پێكەوە كار دەكەن، واتە: وەك چۆن خوا ویستێكی ڕەهای هەیە، حیكمەتێكی ڕەهاشی هەیە، بەزەیی و میهرەبانییەكی ڕەهاشی هەیەو، زانیارییەكی بێ سنووری هەیە، وەك چۆن دەسەڵاتێكی بێ سنووری هەیە، كەواتە: سیفەتەكانی خوا هەموویان پێكەوە كار دەكەن، بۆ وێنە: خوا ویستی ڕەهای هەیە، هەر كەسێكی بیەوێ گومڕای دەكات و، هەر كەسیشی بیەوێ هیدایەتی دەدات، بەڵام كاربەجێیەكی ڕەهاشی هەیە، خوا دەزانێ كێ گومڕا دەكات و، دەشزانێ كێ هیدایەت دەدات، هەروەها خوا هەر كەسێكی بوێ، سزای دەدات، بەڵام دەزانێ بە هەق خەڵك سزا دەدات و، بە هەق خەڵك دەبەخشێ و، بەزەیی بە خەڵك دادێ، ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئێوەش دەستەوسانكەر نین بۆ خوا ﷻ نە لە زەوی و نە لە ئاسمان دا، هەڵبەتە مرۆڤ ناچێ بۆ ئاسمان، بەڵام یانی: ئەگەر گریمان بچن بۆ ئاسمانیش، لەوێش ناتوانن خوا دەستەوسان بكەن، ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴾، ئێوەش جگە لە خوا، هیچ سەرپەرشتیارو هاوكارو یارمەتیدەرێكتان نیە، واتە: لە بەرانبەر خوادا، ئەگەر بیەوێ سزاتان بدات، كەس سەرپەرشتیتان ناكات و كەس هاوكارتان نابێ و یارمەتیتان نادات.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان بە نیشانەکانی خوا نیەو بە دیداری خوا نیە، بێبڕوان بە نیشانەکانی خوا، کە ئایەتە خوێنراوەکانن، یان ئایەتە بینراوەکانن، یان موعجیزەکانی پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ والسَّلَامُ)، هەروەها بڕواشیان بە دیداری خوا نیە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحْمَتِي ﴾، ئا ئەوانە لە بەزەیی من نائومێدبوون، ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، هەروەها ئەوانە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، کەواتە بە هۆی ئیمان بە ئایەتەکانی خواوەو بە دیداری خوا، مرۆڤ شایستەی بەزەیی خوا دەبێ، بەڵام بە هۆی کوفر بە ئایەتەکانی خواوەو، بە دیداری خوا، مرۆڤ شایستەی سزای بە ئێشی خوا دەبێ، کەواتە: نە بەزەیی نواندنەکەی خوا، نە ئازاردان و سزادانەکەی، هیچیان بە گۆترە نین، بەڵکو هەمووی پڕ بە پێستەو لە جێی خۆیەتی.

ئنجا دێتە سەر وەڵامی گەلە کافرەکەی ئیبراهیم ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ ﴾، وەڵامی گەلەکەی هیچ شتێک نەبوو، جگە لەوەی گوتیان: بیکوژن، یان بیسووتێنن، واتە: یان بیکوژن بە کوشتنی ئاسایی، یاخود بیسووتێنن، کە ئەویش هەر کوشتنە، بەڵام کوشتنێکی نائاساییە.

ئنجا ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە، کە سەرەنجام بڕیاریاندا ئاگرێکی بۆ بکەنەوەو، ئاگریان بۆ کردەوەو، خستیانە نێو مەنجەنیق، بە مەنجەنیق فڕێیاندا نێو مەشخەڵی ئاگرەکەوە، ئەوە هەمووی پێچراوەتەوەو یەکسەر دێتەسەر سەرەنجامەکەی: ﴿ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾، واتە: دوای ئەوەی پێشێ جۆرێک لە دڵ لە دڵدانیان هەبوو، گوتیان: ئایا بیکوژین، یاخود بیسووتێنین؟ دوایی دڵی خۆیان لەسەر ئەوە ساغ کردەوە، کە بیسووتێنن و فڕێشیاندایە نێو ئاگر، بەڵام خوا لە ئاگر دەربازی کرد.

کەواتە: ئەی ئەهلی ئیمان! ئێوەش لە پێناوی خوادا دەربەست مەبن، کە ئەگەر فڕێبدرێنە نێو ئاگری سووردەوەش، خوا ئەگەر بیەوێ لە نێو ئاگری

سـووریش دا سـەلامەتتان دەكات و، ئەگـەر سـەلامەتیش نەبـوون، ئـەوە لـە پێنـاوی خـوادا سـووتێتران و كـوژران و دەربـەدەر كـران و، هـەر شـت پێكـران، لـە پێنـاوی خـوادا هەمـووی ئاسـانە، یانـی: دەبـێ لـە لات سـێنا بـێ، خـوا هێنـدە بـەرزو مـەزن و گەورەیـە، پاداشـتی خـوا هێنـدە گەورەیـە، كـە هەمـوو شـتێك لـە پێنـاوی خـوادا ئاسـانەو دەبـێ پێـت ئاسـان بـێ، ئەگـەر بەڕاسـتیی خوانـاس بـی، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ﴾، بەڕاسـتیی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ كۆمەڵێـك بـڕوا بێنـن، یـانی: لـە بەسـەرهاتی ئیبراهیـم دا ﷺ، لـەوەدا كـە لـە پێنـاوی خـوادا خرایـە نێـو ئاگـری سـوور و خـواش دەربـازی كـرد، نیشـانە زۆرن بـۆ كەسـانێ بڕوابێنـن، بـەڵام كەسـێك بڕوانەهێنـێ، لـە نیشـانەكانی خـوا بەهرەمەنـد نابـێ.

﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، هەروەهـا ئیبراهیـم فەرمـووی: بـە دڵنیایـی ئێـوە ئـەو بتانـە لـە جیاتـی خـوا گرتووتانن، دەیانپەرسـتن بـۆ خۆشەویسـتییتان لـە ژیانـی دنیـادا، واتـە: خۆشەویسـتیی نێوانتـان، یەكـدی خۆشویسـتنتان و، پەیوەسـتیی عاتیفیـی و سـۆزتان لەگـەڵ یەكدیـی دا، وەك لاسـایی كردنـەوەی كوێرانـەی پێشـینانتان، یاخـود لەبـەر خۆشەویسـتییتان بـۆ بتـەكان دەیانپەرسـتن لـە ژیانـی دنیـادا، واتـە: ﴿ مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ ﴾، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ كـە ئـەو بتانـە دەپەرسـتن، لەبـەر ئـەو خۆشەویسـتییەیە كـە لـە نێوانتـان دا هەیـە، واتـە: لـە نێـوان ئێـوەو پەرسـتراوەكانتان دا، یاخـود: لـە نێـوان خۆتانـدا، وەك خەڵكەكـە، تاكـو ئـەو خۆشەویسـتیی و پەیوەندییـە كۆمەڵایەتییانـەو بەرژەوەندییانـەی پێكـەوە هەتانـن، بـەردەوام بـن لە ژیانی دنیـادا، بۆیە ئەوانـە دەپەرسـتن، ئەگەرناوەنەبێ بنەمایەكیان هەبێ و بەڵگەیەكیان لە پشـت بێ، ﴿ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا ﴾، دوایـی لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا هەندێكتـان بێبـڕوا دەبـن بـە هەندێكتـان، هەندێكیشـتان نەفریـن لـە هەندێكتـان دەكـەن، دیـارە سـەركردەو دەمڕاسـتەكان بێبـڕوا دەبـن بـە شـوێنكەوتووەكانیان، دەڵێـن: ئێمـە بەرانبەر بـە ئێـوە بێبڕوایـن، ئێـوە هەڵەتـان كـردوە كـە ئێمەتـان پەرسـتوە، شـوێنكەوتووەكانیش

نەفرین دەکەن لە سەرکردەکانیان کە بەو مەرەدەیان بردوون و، تووشی ئەو حاڵەیان کردوون، یاخود هەموویان هەم بەرانبەر بە یەکدی بێبڕوان و حاشا لە یەکدی دەکەن، هەم نە فرینیش لە یەکدی دەکەن و قسە بەیەکدی دەڵێن، ﴿ وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾، جێگای حەوانەوەتان ئاگرەو، هیچ یارمەتییدەرو هاوکاریشتان نین لە ڕۆژی دوایی دا.

﴿ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ﴾، لووط بڕوای بۆ هێنا، واتە: لەبەر خۆشەویستیی ئیبراهیم و لەبەر متمانەی بە ئیبراهیم، بڕوای هێنا بە پەیامەکەی خوا ﷻ، بەوەی کە بە ئیبراهیم دا ناردوویەتی، هەڵبەتە زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن: لووط برازای ئیبراهیم بووە، مام و برازا بوون.

ئەمەش دووبارە قسەی ئیبراهیمە: ﴿ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ﴾، هەروەها ئیبراهیم فەرمووی: من بەرەو پەروەردگارم کۆچکەرم، کۆچ دەکەم بەرەو پەروەردگارم، واتە: بەرەو ئەو شوێنەی کە پەروەردگارم فەرمانم پێ دەکات، کە دەتوانم لەوێ چاک پەروەردگارم بپەرستم، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو زاڵی کارزانە، باڵادەستە و دەمپارێزێ و، ڕێی کۆچ کردنم بۆ ئاسان دەکات، کارزان و کاربەجێشە، لێرە بارودۆخم لێ وەتەنگ هاتووە، دەمباتە شوێنێک کە بتوانم لەوێ بە دەستکراوەیی دینداریی بکەم، ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴾، ئێمەش هەرکام لە ئیسحاق و یەعقووبمان پێدان، کە دیارە یەعقووب کوڕی ئیسحاقەو ئیسحاقیش کوڕی ئیبراهیمە ﷺ، بە تەئکید پەیدابوونی ئیسحاق دوای پەیدابوونی ئیسماعیلەو، ئیسحاق لە سارە خاتوون بووە، هەروەک ئیسماعیل لە هاجەرە خاتوون بووە، یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر لە ڕۆژگاری ئیبراهیم دا بووە کە خوای پەروەردگار یەعقووبی بە ئیسحاق بەخشیوە.

﴿ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ﴾، هەروەها لە وەچەی ئیبراهیمدا پێغەمبەرایەتیی و کتێبمان دانا، واتە: لە دوای ئیبراهیم ﷺ هەر پێغەمبەرێک هاتبێ لەوەچەی ئەو بووە، هەر کتێبێک دابەزێندرابێ، لەوەچەی ئەودا دابەزێندراوە، لە هەردوو لقی ئیسحاق و ئیسماعیلەوە، بەڵکو هەندێک گوتوویانە: کوڕێکی دیکەشی هەبووە بە ناوی میدیان و، شوعەیب بۆ گەلی میدیان ڕەوانکراوەو شوعەیب دەچێتەوە سەر میدیان کە ئەویش هەر کوڕی ئیبراهیمە، وەک لە پەیمانی کۆن دا هاتووە، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا ﴾، لە دنیادا پاداشتەکەیمان دایەوە، واتە: بەشێک لە پاداشتەکەیمان لە دنیادا دایەوە، کە بریتیە لەوەی هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان، یەکدەنگن لەسەر ئیبراهیم ﷺو ستایشی دەکەن، هەروەها ئەوە بوو کە خوا وەچەیەکی باشی بە ئیبراهیم دا، تەوەتا پێغەمبەرایەتیی لە دوای ئیبراهیم تەنیا لەوەچەی ئەودا بووەو، کتێبەکانی خوا، تەنیا بۆ وەچەی ئەو دابەزیون، هەروەها ئیبراهیم خوا توانایەکی ماددیی باشی پێداوەو، سومعەو ئیعتیبارێکی باشی پێداوە، ئیبراهیم پێغەمبەرێکی نێودەوڵەتیی بووە، لە عێراق، لە شام، لە میسر، لە حیجاز، کە ئەوکاتە ئەو چوار شوێنە زیاتر کۆمەڵگای بەشەریان تێدا کۆبۆتەوە، نێوان دیجلەو فورات و نیل، ﴿ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا، ئیبراهیم ﷺ لە چاکانە، واتە: لە ڕیزی صاڵحان و چاکان دایە.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**ناردنـی نـووح بـۆ لای گەلەكـەی و، بـەردەوام بوونـی لـە بانگـەواز كردنیـان بـۆ مـاوەی نـۆ سـەدو پەنجـا (٩٥٠) سـاڵ و، فەوتێنرانیـان بـە لافاوێكـی مـەزن و، دەربازكردنـی خـۆی و سـواربووانی كەشـتییەكەو، كردنـی كەشـتییەكە بـە نیشـانەیەك بـۆ جیهانییـان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَـٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَصْحَـٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَـٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نووحمان بۆ لای خەڵكەكەی، بۆ لای گەلەكەی ڕەوانكرد، واش پێدەچێ ئەو كاتە هەر ئەوەندە مرۆڤە بووبن لەسەر زەوی كە نووحیان بۆ لا ڕەوانكراوە، وەك دواییش زیاتر باسی دەكەین.

ئنجـا وەك پێشـتریش گوتمـان: ئـەوە بـۆ چەسـپاندنی پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ كـە ئـەو ڕێیـەی تـۆ لەسـەری و، ئـەو پەیامـەی بـۆ تـۆ هاتـوە، ئـەوە لـە پێـش تۆشـدا نـووح بـووە، ئیبراهیـم بـووە، پێغەمبەرانـی دیكـە بـوون (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ والسَّـلاَمُ**)، بۆیـە دەبـێ تـۆش خۆڕاگـر بـی، وەك چـۆن نـووح نۆسـەدو پەنجـا (٩٥٠) سـاڵ خـۆی ڕاگـرت، هەڵبەتـە تەمەنەكـەی درێـژ بـووەو، تەمەنـی خەڵكەكـەش هـەر درێـژ بـووە ئـەو كاتە.

٢)- ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾، هەزار ساڵ جگە لە پەنجا لە نێو خەڵکەکەیدا مایەوە، واتە: خەریکی بانگەوازو تێگەیاندن و هۆشیار کردنەوەو، ترساندنیان بوو، وەک لە سوورەتی (نوح) دا خوا ﷻ لەسەر زمانی نووح وردەکارییەکانی چۆنیەتیی بانگەوازو بانگکردن و هۆشیارکردنەوەی بۆ گەلەکەی باس دەکات، لە تەفسیری سوورەتی (هود)یش دا بە وردیی باسی بەسەرهاتی نووحمان ؑ کردوەو وردەکارییەکانمان خستوونەڕوو.

٣)- ﴿ فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾، لە کاتێکدا کە ستەمکار بوون، تۆفان گرتنی، لافاوێکی گەورە گرتنی.

٤)- ﴿ فَأَنجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ ﴾، ئێمەش خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردن، لە تۆفانەکە دەربازمان کردن و، ئەوانی دیکە هەموویان خنکان.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ ﴾، ئەم سێ (ف)یە، هەموویان بۆ بادانەوە (عطف)ن.

٥)- ﴿ وَجَعَلْنَاهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴾، کەشتییەکەشمان کردە نیشانەیەک بۆ جیهانییان.

کە ئێستاش لەسەر چیای جوودیی ماوە.

## کورتە باسێک
## لە حەوت کورتە سەرنج دا

١- ئێمە بەسەرهاتی نووحمان لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا بە درێژیی باسکردوە، لەبەر ئەوەی لە سوورەتی (هود)دا، جیا لە هەموو سوورەتەکانی دیکە، ئەو وردەکارییانەی لەوێدا هاتوون دەربارەی نووح ﷺو گەلەکەی، لە هیچ شوێنێکی دیکەدا نەهاتوون، کە ئایەتەکانی: (٢٥ - ٤٩)ن، یانی: بیست و پێنج ئایەت تەرخانکراون بۆ بەسەرهاتی نووح ﷺو، وردەکارییەکانی بەسەرهاتی نووح لەو بیست و پێنج ئایەتەدا زۆر بە جوانیی خراونە ڕوو.

٢- بە پێی ئایەتەکانی: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾الصافات، کە مانایەکەیان ئاوایە: بە دڵنیایی نووح بانگی ئێمەی کردو، ئێمەش باشترین وەڵامدەرەوە بووین بۆی . خۆی و نیزیکەکانیمان لە بەڵای مەزن دەربازکرد . تەنیا وەچەکەیمان کرد بەماوەوان، (ئەوانەی مانەوە لەسەر زەوی لە مرۆڤان).

بە پێی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە، نووح بۆ تێکڕای بەشەر نێردراوەو، تۆفانەکەی گشتگیر بووەو، تەنیاوەچەکەی ئەویش ماون، تەنیا وەچەی نووح، وەک وەچەی ئادەم لەسەر زەوی ماون، هەروەها بە بەڵگەی ئایەتی (٥٨) لە سوورەتی مەریەم دا کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ﴿٥٨﴾ ﴾مريم، واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا چاکەی لەگەڵ دا کردوون لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ والسَّلَامُ)، لەوەچەی ئادەم و لەوانەی لەگەڵ نووحدا هەڵمانگرتن، دیارە هەموو پێغەمبەران لە وەچەی ئادەمن، مانای وایە، هەموو ئەو پێغەمبەرانەش کە لە دوای نووح هاتوون، لە وەچەی نووح بوون.

کەواتــە: مرۆڤــەکان هەموویــان تەنیــا ئەوانــە بــوون کــە لەگــەڵ نووحــدا هەڵگیــراون، جگــە لەوانــەی کــە لــە کەشــتییەکەدا هەڵگیــراون و پارێــزراون، کەســی دیکــە لــە مرۆڤــان لەســەر زەوی نەمــاوە.

٣- (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[١] دەڵێ: (إِنَّ اللهَ أَرْسَلَ نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ وَهُوَ ابْنُ خَمْسِينَ وَثَلَاثِ مِائَةِ سَنَةٍ، فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا، ثُمَّ عَاشَ بَعْدَ ذَلِكَ خَمْسِينَ وَثَلَاثَ مِائَةِ سَنَةٍ).

واتــە: خــوا نووحــی بــۆ لای گەلەکــەی نــارد کــە تەمەنــی سێســەدو پەنجــا (٣٥٠) ســاڵ بــوو، نۆســەدو پەنجــا (٩٥٠) ســاڵیش لــە نێویانــدا مایــەوە، کــە دەکاتــە هــەزارو سێســەد (١٣٠٠) ســاڵ، دوای تۆفانیــش سێســەدو پەنجــا (٣٥٠) ســاڵی دیکــە ژیــا، کــە دەکاتــە هــەزارو شەشســەدو پەنجــا (١٦٥٠) ســاڵ، بــە پێــی ئــەو ڕیوایەتــەی (الطــبري) تەمەنــی نــووح لــە لــە دایــک بوونیــەوە، تاکــو کۆچــی دوایــی دەکاتــە: (١٦٥٠) ســاڵ.

هــەر (الطــبري) دەڵــێ: وشــەی (ٱلطُّوفَانُ): (كُلُّ مَـاءٍ كَثِـيرٍ فَـاشٍ طَـامٍّ فَهُـوَ عِنْـدَ العَـرَبِ طُوفَـانٌ سَـيْلاً كَانَ أَوْ غَـيْرَهُ) واتــە: هــەر ئاوێکــی زۆری بــڵاوی بێــڕەزا، لــە لای عــەڕەب بــە تۆفــان نــاو دەبــرێ، چ لافــاو بــێ، چ جگــە لــە لافــاو.

٤- (الطبري) لە قەتادەوە هێناویەتی کە خوا دەفەرمووێ: ﴿فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَصْحَـٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَـٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾، واتە: خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردن و، کردمانە نیشانە بۆ جیهانییان، قەتادە گوتوویەتی: (أَبْقَاها اللهُ آيَةً لِلنَّاسِ بِأَعْلَى الجُودِيِّ)[٢]، واتە: خوا کەشتییەکەی هێشتەوە وەک نیشانەیەک بۆ خەڵک، لەسەر لووتکەی چیای جوودیی.

هەروەهــا (محمــد الطاهــر ابــن عاشــور)یش دەڵــێ: (قَــالَ قَتَــادَةُ: بَقِيَــتْ بَقَايَـا السَّـفِينَةِ عَـلَى الْجُـودِيِّ حَتَّـى نَظَرَتْهَـا أَوَائِـلُ هَـذِهِ الْأُمَّـةِ، وَيُقَـالُ: إِنَّهَـا دَامَـتْ إِلَى أَوَائِـلِ الدَّوْلَـةِ الْعَبَّاسِـيَّةِ، ثُـمَّ غَمَرَتْهَـا الثُّلُـوجُ)[٣].

---

(١) جامعُ البيان: ٢٧٦٧٤.

(٢) جامع البيان: ٢٧٦٧٧

(٣) التحرير والتنوير: ج٢٠، ص٢٢٣.

واتـە: قەتـادە دەڵـێ: پاشـماوەكانی كەشـتیی نـووح، لەسـەر چیـای جوودیـی مابوونـەوە تاكـو سـەرەتاكانی ئوممەتـی ئیسـلام سـەرنجیان داوەو بینیویانـەو، گوتـراوە: پاشـماوەكانی كەشـتیی نـووح ماونـەوە تاكـو سـەرەتای دەوڵەتـی عەبباسـیی، دوایـی بـە بەفـر داپۆشراوە (كەوتۆتـە بـن خـۆڵ و دارو بـەرد، لـە ئەنجامی داشـۆرانی چیـاكان و هاتنـی لافـاودا).

٥- كە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾، زانایان زۆربەیان گوتوویانە: وا پێدەچێ ڕاناوی (ها) مەبەست پێی كەشتییەكە بێ و كەشتییەكە ئێستا هەیە، هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێی هەواڵی یان بەسەرهاتی نووحە، یانی: (وَجَعَلْنَا قِصَّةَ نُوحٍ آيَةً لِلعَالَمِين)، هەندێكیش گوتوویانە: یانی: ئەو سزایەی كە خوا ناردوویەتی كە بریتیە لە تۆفان بۆ گەلی نووح، ئەوەمان كرد بە نیشانە بۆ هەموو جیهانییان، لەبەر ئەوەی هەواڵی بەسەرهاتی نووح ﷺو، ئەو سزایەی كە خوا ناردوویەتی بۆ گەلی نووح، لە هەموو دنیای كۆن و تازەدا بڵاوبۆتەوە، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾.

٦- لە پەیمانی كۆندا هاتوە: (وَاسْتَقَرَّ الْفُلْكُ عَلَى جِبَالِ أَرَارَاطَ)[1] قسەی پەیمانی كۆن هەر ئەوەندەیە: كەشتییەكە لەسەر چیای ئاراڕات لەنكەری گرت، چیای ئاراڕاتیش ناوە بۆ چیای جوودیی.

(محمـد الطاهـر ابن عاشـور) دەربـارەی (جِبَـالِ أَرَارَاطَ) دەڵـێ: (وَقَدِ اخْتَلَـفَ الْبَاحِثُونَ فِي تَعْيِـينِ جِبَـالِ أَرَارَاطَ، فَمِنْهُـمْ مَـنْ قَـالَ: إِنَّـهُ اسْـمُ الْجُـودِيِّ، وَعَيَّنُـوا أَنَّـهُ مِـنْ جِبَـالِ بِـلَادِ الْأَكْـرَادِ فِي الْحَـدِّ الْجَنُـوبِيِّ لِأَرْمِينِيَـا فِي سُـهُولِ مَـا بَـيْنَ النَّهْرَيْـنِ)[2]، واتـە: لێكۆڵـەرەوان ڕاجیاییـان هەیـە لـە دیاریـی كـردنی چیـای ئـاراڕات دا، هەندێكیـان دەڵێـن: نـاوی چیـای جوودییـەو دیارییـان كـردوە كـە لـە چیـاكانی كوردانـە، لـە سنووری باشـووری ئەرمینیـا، لـەو دەشـتەی كـە پێـی دەگوتـرێ: نێـوان دوو ڕووبـارەكان، [كـە ئێسـتا لـە باكـووری كوردسـتانی توركیایـە، لـە سـەرووی زاخـۆوە].

---

(١) العهد القديم: سفر التكوين، الإصحاح: ٨.

(٢) التحرير والتنوير: ج٢٠، ص٢٢٣.

٧- وێڕای ئەوەی کە دەگونجێ ڕاناوەکە بۆ کەشتییەکە بچێتەوە: ﴿ وَجَعَلۡنَٰهَآ ﴾، (أي: وَجَعَلْنَا السَّفِينَةَ آيَةً لِلعَالَمِين)، دەشکونجێ بگەڕێتەوە بۆ هەواڵەکە، بەوە کە (خبر)ەکە بە مانای (قصة) یان (حَادِثَة) بێ، یانی: (وَجَعَلْنَا القصة، أو الحادثة المذكورة آية للعالمين)، چونکە دەبێ مێینە (مؤنث) بێ، یاخود بە مانای (العُقُوبَة) ئەو سزایەی خوا ناردی بۆ گەلی نووح ﷺ کە ئەو تۆفانە بوو پێی فەوتێنران، کردمانە نیشانە بۆ جیهانییان.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئاماژەیەک بە وتووێژی ئیبراهیم لەگەڵ گەلەکەیدا، کە فەرمانی پێکردوون بە خواپەرستیی و پارێزکاریی و، ڕەخنەی لە بتەکانیان گرتوە کە هیچ کارەن و، سەرنجی بۆ مێژووش ڕاکێشاون کە پەندی لێ وەربگرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُوا۟ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ﴾، هەروەها یادبکەوە کاتێک ئیبراهیم بە خەڵکەکەی خۆی گوت: خوا بپەرستن و پارێزی لێ بکەن.

(و)ی سەر (وَإِبْرَٰهِيمَ) ئەوەی ئێرە دەگێڕێتەوە سەر ڕستەی پێشوو: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾، کەواتە ئاوای لێ دێ: (**وَلَقَـد أَرْسَـلْنَا إِبْرَاهِيـمَ إِلى قَوْمِـهِ**) یاخود: (**وَاذْكُـر إِبْرَاهِيـمَ إِذْ قَـالَ لِقَوْمِـهِ**) یاخود: (**وَاتْـلُ عَلَيْهِـم نَبَـأَ إِبْرَاهِيـم**) یادی ئیبراهیم بکە کاتێک بە گەلەکەی خۆی فەرموو.

شایانی باسە: ئێمە بەسەرهاتی ئیبراهیممان بە وردیی لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (إبراهیم)دا باسکردوە، ئنجا ئایا گەلی ئیبراهیم کە ئەو وتووێژەی لەگەڵدا کردوون، کێ بوون؟ ئیبراهیم بە پێی سەرچاوە مێژوویییەکان دەبێ لە باشووری عێراق بووبێ، هەندێک لە سەرچاوە مێژوویییەکان دەڵێن: (**نور الكلدانيين**)، واتە: گەلی ئیبراهیم لە عێراقی ئێستا بوون، بەڵام زیاتر لە دەڤەری خوارووی عێراق بوون.

ڕستەی ﴿ اَعْبُدُواْ اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ﴾، خـوا بپەرسـتن و پارێـزی لێبکـەن، بێگومـان پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ والسَّـلاَم) کـە بـە گەلەکانـی خۆیانیـان گوتـوە: خـوا بپەرسـتن، خواپەرسـتیی بـە چەمـک و واتـا ڕاستەقینەکەی، بەرنامەیەکـی گشـتگیری ژیانـە، واتـە: بـۆ خـوا ملکـەچ بـن لـە هەمـوو ژیانتانـدا، نـەک بـەو چەمـک و واتـا تەسـک وبـاوەی کـە ئێسـتا لـە زەینـی زۆربـەی مسـوڵمانانـدا هەیـە، کـە پێیـان وایـە خواپەرسـتیی تەنیـا بریتیـە لـە ئەنجامدانـی دروشـمەکان، کـە پێیـان دەگوتـرێ: دروشـمەکانی پەرسـتن (شَعَائِرُ التَّعَبُّـد) وەک نوێـژو ڕۆژوو و زەکات و حـەج و، ئـەو پەرستشـانەی دیکـە کـە لـە نێـوان مـرۆڤ خـۆی و خـوای پـەروەردگاردا ئەنجـام دەدرێـن، بەڵکـو خواپەرسـتیی و بەندایەتیـی بـۆ خـوا یـانی: ملکەچیـی بـۆ خـوا لـە هەمـوو وردو درشـتی ژیـان دا، لـە مزگـەت و بـازاڕ، لەسـەر دوانگـەو لـە فەرمانگـە، لـە کێڵگـەو لـە کارگـەو، لـە هەمـوو کایەکانـی ژیـان دا، بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن و پارێـزی لـێ بکـەن.

٢)- ﴿ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەوە بۆ ئێوە باشترە ئەگەر بزانن.

یـانی: ئەگـەر زانیارییتـان هەبـێ، دەزانـن ئـەوە بـۆ ئێـوە باشـترین شـتە، (خَيْرٌ) یانـی: باشـترین، چونکـە جێگـرەوەو ئەڵتەرناتیڤـی بەندایەتیـی کردنـی مـرۆڤ بـۆ خـوا، بریتیـە لـە کۆیلایەتیـی کردنـی بـۆ شـتەکانی دی، یـان مرۆڤێکـی وەک خـۆی، یاخـود دروسـتکراوەکانی دیکـەی خـوار خـۆی.

٣)- ﴿ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لە جیاتی خوا، یان لە خوار خواوە، تەنیا بتان دەپەرستن.

٤)- ﴿ وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾، هەروەها درۆی هەڵگێڕاوە هەڵدەبەستن، (أي وَتَفْتَرُونَ كَذِباً) درۆ هەڵدەبەستن بۆ خوا، گوایە هاوبەشی هەن و، ئێوەش ئەو هاوبەشانە دەپەرستن تاکو لە خواتان نیزیک بخەنەوە، وەک لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرمویٚ: ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾الزمر، نایانپەرستین مەگەر بۆ ئەوەی لە خوامان نیزیک بخەنەوە.

(الطبري) لـە مانـای: ﴿ وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ﴾دا، دەڵـێ: (وَتَصْنَعُـونَ كَذِبـاً وبَاطِـلاً) واتـە: ئێـوە درۆو پـووچ هەڵدەبەسـتن و دروسـت دەكـەن، ئـەو هاوبەشـانە، ئـەو بتانـەی دەیانپەرسـتن گوایـە هاوبەشـی خـوان، ئـەوە شـتێكە هەڵیدەبەسـتن بـۆ خـواو، درۆیەكـە پەیـدای دەكـەن، وشـەی (خَلْـق) یـانی: هێنانـەدی شـتێک لـە نەبـوون، بـەڵام لێـرەدا بـە مانـای درۆ هەڵبەسـتن یـانی: قسـەیەک بكـرێ هیـچ ئەصـڵ و بنەمایەكـی نەبێ، ئەگەرنـا (خَلْـق) هێنانـەدی شـتانە لـە نەبـوون، كـە تەنیا بـە خـوای پـەروەردگار دەكـرێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴿٦٢﴾ ﴾الزمـر، خـوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێكە، یاخـود كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾الفرقـان، واتـە: خـوا هەمـوو شـتێكی پەیداكـردوە، ئنجـا بـە ئەندازەگیریيەكـی بـاش ئەندازەگیریـی كـردوە.

ئنجـا درۆ هەڵبەسـتن ئەوەیـە شـتێک بگوتـرێ، بنەمایـەک و ئەصڵێكـی نەبـێ، ئەویـش لـەو ڕووەوە دەشـوبهێنە پەیداكـردن و هێنانـەدی لـە نەبـوون.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، لە خوار خواوە دەیانپەرستن، جگە لە خوا بەندایەتییان بۆ دەكەن، هیچ بژێوێكیان بۆ ئێوە بەدەست نیە.

چونكـە (رِزْقًـا) بـە نەزانـراو (نَكِـرة) هاتـوە، واتـە: كـەم و زۆر بژێویـان بـۆ ئێـوە بەدەسـت نیـە، بۆیـە شایسـتە نیـن بپەرسـترێن، پەرسـتراو دەبـێ بتوانـێ زیـان لـە پەرسـتەرەكەی دووربخاتـەوەو سـوودی بـۆ بێنـێ، بژێـوی بـۆ دابیـن بـكات، هێنابێتیـەدی، سەرپەرشـتیی بـكات، كـە ئـەو بتانـە هیچـكام لـەو سیفەتانەیان نیـن.

٦)- ﴿ فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ ﴾، ئێوە بژێو لە لای خوا بە خوا بخوازن.

٧)- ﴿ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ ﴾، هەروەها بیپەرستن و سوپاسگوزاریی بۆ ئەنجام بدەن، (شَكَرَ، يَشْكُرُ، شُكْراً) بۆ خۆی بۆ بەركار تێپەڕ دەكات و پێویستیی بە پیتێكی دیكە نیە، بەڵام لێرەدا (وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ) واتە: لەبەر خاتری وی سوپاسگوزاریی بكەن، ئەمە ماناكەی بەهێزترو تۆختر دەكاتەوە.

٨)- ﴿ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، بە دڵنیایی هەر بۆ لای وی دەگێردرێنەوە.

کەواتە: لێرەدا ئیبراهیم ﷺ چوار شتان دەکاتە وەسف و پێناسە بۆ خوا:

**یەک:** بژێو تەنیا بەدەست ئەوە.

**دوو:** دەبێ بەندایەتیی تەنیا بۆوی بێ.

**سێ:** پارێزکردن دەبێ تەنیا لەوی بێ.

**چوار:** گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای ویە.

٩)- ﴿ وَإِن تُكَذِّبُواْ ﴾، دوایی ئیبراهیم ﷺ پێیان دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە پەیامی خوا بە درۆ دابنێن، پێغەمبەری خوا بە درۆ دابنێن، بڕوای پێنەکەن.

١٠)- ﴿ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ﴾، خوا پەکی بە ئێوە ناکەوێ، لە پێش ئێوەدا، کۆمەڵگایانێکی دیکە پەیام و پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ دانا، بەڵام سەرەنجام تەماشا بکەن چۆن سەریان بە فەتارەت چوو!

١١)- ﴿ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، پێغەمبەریش تەنیا گەیاندن و ڕوونکردنەوەیکی ئاشکرای، (یاخود ئاشکراکەری) لەسەرە، (ٱلۡبَلَٰغُ) (بَلَغَ يَبْلُغُ بَلاغاً) گەیشت دەگات، گەیشتن، گەیاندن، (ٱلۡمُبِينُ)یش لێرەدا دەگونجێ بە مانای ڕۆشن بێ، دەشگونجێ بە مانای ڕۆشنکەرەوە بێ، یان لە (أَبَانَ)ی (لازِم)ە، بە مانای ڕۆشن، یان (أَبَانَ)ی تێپەڕکەر (مُتَعَدِّي)ە، بە مانای ڕۆشنکەرەوە.

ئیبراهیم ﷺ دەیەوێ پێیان بفەرموێ: ئەگەر وەڵامم نەدەنەوەو، من بە درۆ دابنێن و پەیامی خوا کە بە مندا ناردوویەتی، بە درۆی دابنێن، ئەوە تەماشای مێژوو بکەن، کۆمەڵگایانێکی دیکەو، خەڵکانێکی دیکەش هەبوون کە پێغەمبەرانیان بە درۆ داناون، بەڵام سەرەنجام سزادراون، منیش وەک پێغەمبەری خوا، وەک هەموو پێغەمبەران، تەنیا گەیاندنی پەیامی خوام لەسەرە، بە شێوەیەکی ڕوون و ڕوونکەرەوە، ئنجا کاتێک کە پەیامی خوام پێڕاگەیاندن،

ئەرکی من لێرە تەواو دەبێ، وا مەزانن کە تووشی چۆرەمێک دەبم، تووشی گرفت و کێشەیەک دێم، بە نسبەت نێوان خۆم و خواوە، ئەگەر ئێوەوەڵامتان نەدامەوە، ئێوە بەس خۆتان زیانبار دەبن و خۆتان تووشی سزا دەبن، ئەگەرنا من ئەرکەکەم هەر ئەوەیە، پەیامی خواتان پێ ڕابگەیەنم.

دیارە گەیاندنی پەیامی خوا ﷻ مەرج نیە تەنیا بە زمانی وتار بێ، بەڵکو بە زمانی کردار، بە زمانی هەڵوێست، بە زمانی جێبەجێ کردن، هەموو ئەوە پێی دەگوترێ: گەیاندن، واتە: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) ئەرکدار (مكلّف) بوون، پەیامی خوا وەک چۆن بە تەعبیری زمان دەگەیەنن، بە هەڵسوکەوتەکانیشیان، بە هەڵوێستەکانیشیان، پەیامی خوا لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی وسیاسیی خۆیاندا، بەرجەستە بکەن بۆ خەڵک، بۆ ئەوەی خەڵک وێڕای ئەوەی هەقیان لێ دەبیستێ، هەقیشیان تێدا ببینێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سەرنجڕاكێشانی خوا بۆ مرۆڤان كە دروستكراوەكان دێنێتەدی و، دەیانگێڕێتەوەو، فەرمانكردن بە بە زەوییدا ڕۆیشتن و، سەرنجدانی پێگەیشتنی دروستكراوەكان و، كردنە بەڵگەی ئەو حاڵەتە لەسەر ژیانی ڕۆژی دوایی و، ئاماژە كردن بە هەندێك لە سیفەتەكانی خوا و دەستەپاچەیی مرۆڤان و، سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان بە دیداری خوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ۚ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَاءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَلِقَائِهِ أُولَٰئِكَ يَئِسُوا مِن رَّحْمَتِي وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٣﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ﴾، ئایا نەیانبینیوە، (بە چاوی عەقڵ و دڵ)، خوا چۆن دروستكراوی دەستپێكردوە، دوایی دەیگێڕێتەوە! لێرەدا دیتن دیتنی دڵ و عەقڵە، دەشگونجێ مەبەست لە دیتن لێرەدا، دیتنی چاو بێ، بۆ هەندێك لەو شتانەی بە چاو دەبینرێن، كە خوا ﷻ چۆن دەست بە دروستكردنیان دەكات، پنجە گیایەك، دەنكە تۆوێك چۆن دەڕوێ؟! دواییش دوای ئەوەی لە بەیندەچێ، دووبارە خوا ﷻ دەیژێنێتەوەو دەیڕوێنێتەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست لە دیتن، دیتنی عەقڵیی بێ، وەك زانایان دەڵێن: (الرُّؤية عَقْلِيَّة ولَيسَت بَصَرِيَّةٌ) دیتنی عەقڵ مەبەستە، نەك دیتنی چاو، (أَوَلَمْ يَرَوْا) خوێنراویشەتەوە: (أَوَلَمْ تَرَوا)، ئنجا ئەگەر (أَوَلَمْ يَرَوْا) بێ، دواندنەكە دواندنێكی نادیار (خِطَابٌ غِيَابِي)ە، ئەگەر (أَوَلَمْ تَرَوا) بێ، دواندنەكە دواندنێكی ڕووبەڕوویە.

ئنجا -وەک پێشتریش باسمانکرد- ئەو پێنج ئایەتە دەگونجێ هەمووی قسەی ئیبراهیم ﷺ بێ، کە بە خەڵکەکەی خۆی فەرموون، دەشگونجێ ئەمە فەرمایشتی خوا ﷻ بێ، تێواخنی کردوە لەگەڵ قسەکانی ئیبراهیم ﷺ و وتووێژی لەگەڵ خەڵکەکەیدا، کە دوای ئەم پێنج ئایەتە، ئەوان وەڵام دەدەنەوە، خوای پەروەردگار ئەم فەرمایشتەی خۆی کردۆتە تێواخن و نێوپەڕە بۆ ئەو دیالۆگ وتووێژەی نێوان ئیبراهیم و گەلەکەی.

وشەی (يُبْدِئُ) لە زمانی عەرەبییدا (أَبْدَأَ يُبْدِئُ) و (بَدَأَ يَبْدَأُ) وەک (الطبري) گوتوویەتی: (لُغَتَانِ بِمَعْنًى وَاحِدٍ) دوو وشەن بە یەک واتا، (أَبْدَأَ) لەگەڵ (بَدَأَ)، (بَدَأَ) سێ پیتی (ثُلاثِي)یە، بەڵام (أَبْدَأَ) چوار پیتیی (رباعي)یە (، (أَبْدَأَ) واتە: دەستی پێکردوە، (بَدَأَ)ش هەر یانی: دەستی پێکردوە، ئەم (همزَةُ الإستفهام)ە لە (أَوَلَمْ يَرَوْا)دا، زانایان گوتوویانە: بۆ پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنەو چاوەڕێی وەڵام ناکرێ، ئایا نابینن بە چاوی عەقڵ و دڵ چۆن خوا دروستکراو دەست پێ دەکات، دوایی دەیگێڕێتەوە، دوای ئەوەی لە بەینی دەبات، دەیگێڕێتەوەو جارێکی دیکە دروستیدەکاتەوە.

﴿ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ﴾، دوایی دەیگێڕێتەوە، واتە: دوای ئەوەی لە بەین چووە، دووبارەی دەکاتەوە بۆ بوون، (أَي: يُعِيدُهُ بَعْدَ فَنَائِهِ وَبِلاهُ، كَمَا بَدَأَهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ خَلْقاً جَدِيداً) وەک چۆن لە سەرەتاوە دروستیکردوە، دوای ئەوەی کە لە نێو دەچێ، جارێکی دیکە دەیگێڕێتەوەو دەیهێنێتەوە بۆ بوون.

٢)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴾، واتە: ئەوە لەسەر خوا ئاسانە، ئەو دەستپێکردن و لەبەین بردن و دووبارە هێنانەوە کایە، بۆ خوا ئاسانە، کەواتە وا مەزانن دوای ئەوەی ئێوەش دەمرن و لە بەین دەچن، زیندووکرانەوەتان لە لای خوا قورسە، ئەوەتا ڕۆژانە خوا دروستکراوەکان دروستدەکات و لە بەینیان دەبات و، دوایی دووبارەیان دەکاتەوە.

پێشتریش باسمان کرد: ئێستا زانستیی توێکاریی (علم الفسلجة) دەریخستوە کە لە هەر چرکەیەکدا نیزیکەی سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانە لە جەستەی مرۆڤ دەمرێ، لەو سەد تریلیۆن (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانەیەی کە جەستەی مرۆڤیان لێ پێکهاتوە، واتە: سەد هەزار ملیار خانە بە نیزیککراوەیی جەستەی مرۆڤیان لێ پێکهاتوە، لە هەر چرکەیەکدا سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانەیان لێ دەمرن و، سەدو بیست و پێنج ملیۆن (١٢٥,٠٠٠,٠٠٠) خانەی دیکە شوێنیان دەگرنەوە، ئنجا ئەوە هەر لە جەستەی مرۆڤدا، لە ئاژەڵان، لە پەلەوەران، لە ژیانداران، لە درندان، لە هەوا، لە دەریا، لە زەوی، لە بن زەوی دا، ئەم پرۆسەیە بەردەوامە.

٣)- ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾، دوایی خوا ﷻ پێگەیاندنی کۆتاییش جارێکی دیکە پێ دەگەیەنێتەوە، دروستکردنی کۆتایی دروست دەکاتەوە، دروستکردنی کۆتایی ئەو دروستکردنەیە کە دوایی مردنی بە دوادا نایەت، کە مەبەست پێی زیندووکردنەوەی ڕۆژی قیامەتە، کە ئەوە دروستبوونی کۆتاییە، چونکە نەبوون و مردنی بە دوادا نایێ.

(النَّشأةُ: المَرَّةُ مِنَ النَّشأ وهُوَ الإيجَاد)، (نَشأ) واتە: پەیداکردن و پەروەردەکردن، (نَشأة) جارێکە لە (نَشَأَ يَنشَأُ نَشأً) کەواتە: (يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَ) یانی: بۆ پێگەیاندن و دروستکردنی کۆتایی خوا ﷻ دوایی دروست دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەت دا.

٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێک بە توانایە، لێرەدا خوا ﷻ شتێک کە لەبەر چاویاندا ڕوودەدات، دەیکاتە بەڵگە بۆ شتێک کە لێیان دوورە، ئەوەی لەبەرچاویان ڕوودەدات، ئەوەیە کە ڕۆژانە هەر خۆیان نەمام دەنێژن، تۆو دانەوێڵە دەوەشێنن، کشتوکاڵ دەکەن، ئەوەتا لەبەر چاویان دەڕوێ، دروست دەبێ، گەشە دەکات، دوایی لەبەین دەچێ، یاخود درەوی دەکەن دەبێتە پووش، بەڵام ساڵێکی دیکە دووبارە دەینێژنەوە، یان دووبارە تۆوەکە دەوەشێنن، یاخود گیایەکان و درەختەکان

دەڕوێنەوە، ئەوە لەبەرچاویان ڕوودەدات، ئنجا بابیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی لێیان دوورە، کە بریتیە لە زیندوو بوونەوەو دروست بوونەوەی ڕۆژی دوایی، دوایی خوا ﷻ باسی چەند سیفەتێکی دیکەی خۆی دەکات، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُ ﴾، هەر کەسێک کە بیەوێ ئازاری دەدات، سزای دەدات و، هەر کەسێکیش بیەوێ، بەزەیی پێیدادێ.

کە دەفەرموێ: هەر کەسێک بیەوێ سزای دەدات و، هەر کەسێکیش بیەوێ بەزەیی لەگەڵ دەنوێنێ، مەبەست ئەوەیە کە ویستی خوا ﷻ ڕەهایە، هیچ کۆت و بەندێکی لەسەر نیە، بەڵام مەبەست ئەوە نیە، خوا لە گۆترەو، هەر لە خۆوە هەندێک خەڵک سزا بدات و، هەندێک خەڵکیش ڕەحم پێ بکات و، بیانخاتە نێو نازو نیعمەتی بەهەشتەوە! بەڵکو سیفەتەکانی خوا هەموویان پێکەوە کار دەکەن، وەک جاری دیکەش گوتوومانە: دەستەڵاتی خوا بێ سنوورە، ویستی خوا بێ سنوورە، زانیاریی خوا بێ سنوورە، بەڵام حیکمەتی خواش بێ سنوورەو، خوا شتی بێجێ ناکات، خوا ﷻ کەسێک سزا دەدات کە شایستەی سزا بێ، ڕەحم بە کەسێک دەکات شایستەی پەرۆش و بەزەیی لەگەڵ نواندن بێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٥٦ ﴾الأعراف، واتە: بەزەیی خوا لە چاکەکاران نیزیکە، بەڵام سزایەکەی لە خراپەکاران نیزیکە بە تەئکید: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ۝١٦٠ ﴾الأنعام، لەبەر ئەوەی چاکە دێنێ، خوا پاداشتی دەداتەوە، ئەوی دیکەش لەبەر ئەوەی خراپە دێنێ، خوا سزای دەدات، چاکەو خراپەکانیش خۆیان ئەنجامیان دەدەن.

٦)- ﴿ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴾، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە، (القَلْبُ: الرُّجُوعُ)، (قَلْب) گەڕانەوە، (قَلَبَهُ) یانی: هەڵیگێڕایەوە، وەک شتێک کە دەڕوا، دوایی تەقڵەیەک لێبدات و بە شوێنی خۆیدا بێتەوە.

٧)- ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، هەروەها ئێوە دەستەوسانکەرنین، نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا، واتە: دەستەوسانکەری خوا نین، (المُعْجِزُ: هُوَ أَنْ يَجْعَلَ الآخَرَ عَاجِزاً)، (مُعْجِز) ئەوەیە کە بەرانبەرەکەی بێ دەستەڵات بکات، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، ئێوە ناتوانن لە دەستی خوا، لە دەستەڵاتی خوا قوتار بن، ناتوانن لە ژێر ڕکێفی خوا بچنە دەر، نە لە زەویدا کە ئێوە ژیانی لەسەر دەگوزەرێنن و، نە لە ئاسمانیشدا، ئەگەر گریمان بتوانن بچنە ئاسمانیش، لەوێش ناتوانن لە ژێر ڕکێفی خوا قوتارو دەرباز بن، ئەگەرنا، ئێمەی مرۆڤ و جند هەر لەسەر زەویین، واتە: لە هەر جێیەک بن، هەر لە ژێر ڕکێف و دەستەڵاتی خوای پەروەردگاردان.

٨)- ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴾، ئێوە لە جگە لە خوا، یان لە بەرانبەر سزای خوادا، نە هیچ سەرپەرشتیارێکتان هەیە، نە هیچ هاوکارو پشتیوانێکتان هەیە، (وَلِيّ) کەسێکە سەرپەرشتیی کەسێک بکات ومشووری لێ بخوات و، بەسەری ڕابگات بە تەواویی، بەڵام (نَصِيرٖ ) بریتیە لەوەی لە کاتی تەنگانەدا هاوکاریی بکات، واتە: ئێوە نە کەسێک هەیە کە سەرپەرشتییتیان بکات بە تەواویی لە هەموو حاڵێکدا، نە کەسێکیش هەیە کە لە تەنگانەدا دەفریاتان بێ، لە بەرانبەر سزای خوادا چەپاڵەتان بدات و بتانپارێزێ.

٩)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي ﴾، ئەوانەش بێبڕوا بوون بە نیشانەکانی خواو، بە دیداری خوا، ئەوانە کەسانێکن لە بەزەیی من نائومێدبوون، وەک زۆرجار گوتوومانە: (آيات) کۆی (آية)ە، کە دەگونجێ بە مانای ڕستەکانی قورئان بێ، یان ڕستەکانی فەرمایشتی خوا، لە قورئان، یان تەورات، یان ئینجیل، یان زەبوور، یان لە صوحوف دا، دەشگونجێ ئایەت بە مانای موعجیزەی پێغەمبەران بێ (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم)، دەشگونجێ ئایەتەکان بە مانای دیاردە سروشتییەکان بن کە نیعمەتەکانی خوان و دەسەڵاتی خوایان تێدا دەدرەوشێتەوە، دەشگونجێ ئایەتەکان بە مانای ئەو بەڵایانە بن کە خوا بەسەر گەلانی هێناون، کەواتە وشەی (آية) کە بە (آيات) کۆدەکرێتەوە چوار واتای هەن و، بە پێی ئەو سیاقە کە تێیدا دێ، دەزانین کام واتای مەبەستە:

**١- یان بە مانای فەرمایشتی خوایە.**

**٢- یان بە مانای موعجیزەی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ).**

**٣- یان بە مانای دیاردە سروشتییەکانە.**

**٤- یان بە مانای ئەو بەڵایانەن، کە خوا بەسەر گەلە پێشووەکانی هێناون بۆ فەوتاندنیان.**

**لێرەدا ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ ﴾، (آيات) واپێدەچێ مەبەست پێی فەرمایشتی خوا بێ، ڕستەکانی قورئان، بەڵام لەم ڕەوتەدا موعجیزەکانی خواش دەگرێتەوەو، دیاردە سروشتییەکانیش دەگرێتەوە، کە لە بوونەوەرو دەوروبەردا خوای پەروەردگار بڵاوی کردوونەوە.**

**ئنجا ئەوانەی بێبڕوان بە نیشانەکان و بە دیداری خوا، ئەوانە:**

**﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحْمَتِي ﴾، ئا ئەوانە لە بەزەیی من نائومێد بوون، بە هۆی کوفرەکەیانەوە، نائومێد بوون لە بەزەیی خواو لە کەرەم و لێبوردنی.**

**١٠)- ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، هەروەها ئەوانە سزاو ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، ئنجا ئازار هەر بە ئێشە، بەڵام یانی: سزاو ئازارێکی وا کە بە مانای وشە ئێش پێکەیەنەو بە ژان و ناسۆرە.**

**مەسەلەی چوارەم:**

**وەڵامدانەوەی بە هەڕەشەی گەلەکەی و دەربازکرانی و، تانەدانی ئیبراهیم لە پەرستنیان بۆ بتان و، خستەڕووی سەرەنجامی شوومیان لە ڕۆژی دوایی داو، بڕوا پێهێنانی لووط و کۆچکردنی ئیبراهیم و، خێرو بەرەکەت بەسەردا بارانێردرانی لە دنیاو دواڕۆژدا، لە لایەن خواوەو، پێبەخشرانی هەر کام لە ئیسحاق و یەعقووب:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ﴾، وەڵامی گەلەکەی هیچ شتێک نەبوو، نەوە نەبێ کە گوتیان: بیکوژن یاخود بیسووتێنن، شێوازی کورتهەڵێنان لێرەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یەکدەنگییان هەبووە لەسەر ئەو سزادانەی ئیبراهیم بە کوشتن، یان بە سووتاندن، هیچ دوودڵییان نەبووەو، یەکدەنگ بوون لەسەر لە نێو بردنی، بەڵام لە ڕووی شێوازو میکانیزم و چۆنیەتیی لە نێوبردنەکەیەوە، دوو ڕا بوون، بیکوژن ڕاستەوخۆ بە شمشێر، یان بە شتێک کە ڕاستەوخۆ بمرێ، یاخود بیسووتێنن، کە سووتاندن خراپترین جۆری کوشتنە، ئنجا لەوەدا کە کامیان هەڵبژێرن؟ دوو ڕایان

هەبوون، کە دیارە سەرەنجام ڕای سووتاندن زاڵ دەکەن، کەواتە: وەڵامی گەلەکەی بۆ قسەکانی ئیبراهیم ﷺ هەر ئەوە بوو کە گوتیان: بیکوژن، یاخود بیسووتێنن.

٢)- ﴿ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾، بەڵام خوا لە ئاگر دەربازی کرد.

ئێمە هەم لە بەسەرهاتی ئیبراهیم دا ﷺ کە لە سوورەتی (إبراهیم)دا بە وردیی باسمان کردووە، هەم لە تەفسیرکردنمان بۆ سوورەتی (الأنبياء) کە لەوێ بە وردیی باسی چۆنیەتی ئەم ئاگر بۆ کردنەوەی ئیبراهیم و خستنە نێو مەنجەنیق و، هەڵدانی بۆ نێو ئاگر، بە تەفصیل باسمان کردوە، بەڵام لێرە خوا ﷻ بە کورتیی هێناویەتی و، ئێمەش بە کورتیی لەسەری دەڕۆین، ئەوان بڕیاریاندا بیکوژن یان بیسووتێنن، بەڵام سەرەنجام سووتاندنیان هەڵبژارد، ئاگریان بۆ کردەوەو فڕێیاندایە نێو ئاگر، بەڵام خوا لە ئاگر دەربازی کرد، ئەمە هەمووی پێچراوەتەوەو کورتکراوەتەوە.

٣)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا، (کە ئیبراهیم ﷺ خوا لە نێو ئاگری سووردا پاراستی و دەربازیکرد)، چەندان نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک بڕوابێنن، (لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) واتە: ئیمان هێنان، پێکهێنەر (مقوّم)ی کۆمەڵەکەیانەو کۆمەڵێکن بە ئیمانەوە ناسراون، ئیمان هێنان بناغەی بوونیانە، ئنجا بۆ ئەوانە، ئەو دەربازکرانی ئیبراهیم لە نێو ئەو ئاگرە سوورە، لەو ئاگرەی کە گەلەکەی ئیبراهیمیان هەڵدایە نێوی، نیشانە هەن، لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ بەندەکانی خۆی وێڵ ناکات، لە تەنگانەدا دە فریایان دێ، ئەگەر بیەوێ لە ئاگری سووردا دەیانپارێزێ و، ناهێڵێ زیانیان پێ بگات، هەتا لە تەفسیرەکاندا هەندێکیان گوتوویانە: ئەوەی لە ئیبراهیم سووتا، تەنیا ئەو کۆت و پێوەندە بوو کە دەست و پێیان پێی بەستبوو، بەس ئەوەی سووتا، دەنا هیچ زیانی پێ نەگەیشت، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبياء) دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾، گوتمان: ئەی ئاگر! سارد بەو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم.

٤)- ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا ﴾، گوتیشی: ئێوە لەجیاتی خوا تەنیا بتان دەپەرستن.

ئایا ئیبراهیم دوای ئەوەی خوا دەربازی کردوە لە سووتێنران، ئەوەی گوتوە، یان ئەوە قسەی پێشییەتی، بەڵام دواخراوە؟ گرنگ ئەوەیە بە گەلەکەی فەرموو: بە دڵنیایی ئێوە لە جیاتی خوا، هەندێک بتان دەپەرستن، (أَوْثَانًا) کۆی (وَثَن)ە، (وَثَن) بە مانای بەردێک دێ، یاخود هەر شتێک بپەرسترێ، بەبێ ئەوەی شێوەی پێدرابێ، یاخود مەبەست پێی کۆی ئەو شتانەیە کە دەپەرسترێن و، لە ماددەی بێ ژیان دروست دەکرێن، چ پەیکەردار بن و شێوەیەکیان هەبێ وەک شێوەی مرۆڤ یان باڵندە، یان هەر شێوەیەکی خەیاڵیی، یاخود شێوەیان نەبێ، گرنگ ئەوەیە ئەوانە هەموویان پەیکەرن و شتی بۆشن.

٥)- ﴿ مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، وەک خۆشەویستیی نێوانتان لەژیانی دنیادا، (مَوَدَّةَ) بە مانای خۆشویستن (مَحَبَّة)ە، واتە: ئێوە بتەکانتان خۆشدەوێ و تاکو ئولفەت و تەبایی نێوانتان لە دنیادا بەردەوام بێ بە هۆی ئەو بتپەرستییەوە، یاخود بۆیە ئەو بتانە دەپەرستن، لەبەر خۆشویستییتان بۆ یەکدی و لاسایی کردنەوەی یەکدی و، ڕێزو خۆشەویستیتان بۆ باب و باپیران و پێشینانتان، نەک لەبەر ئەوەی بەڵگەیەکتان بە دەستەوەیە، ﴿ مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە، خۆشەویستی نێوانتان:

أ- واتە: ئێوە بتەکانتان خۆشدەوێ و پێتانوایە لە خواتان نیزیک دەخەنەوە، یان پێتانوایە زیان و قازانجیان بە دەستە.

ب- یاخود ئەو بتانە دەپەرستن لە جیاتی خوا، وەک پاساوی بەردەوام بوونی خۆشەویستیی و تەبایی و ئولفەتی نێوانتان لە ژیانی دنیادا، چونکە بە هۆی ئەو پەرستنەی جگە لە خواوەیە، کۆبوونەوە، لەو بتانە کۆبوونەوەو پێکەوە تەبان و، کۆمەڵگاکەتان ژیانی ئاسایی دنیایی خۆی دەگوزەرێنێ، مەبەستی ئیبراهیم ﷺ ئەوەیە کە هیچ بەڵگەیەکتان بە دەستەوە نیە، نە لە عەقڵ نە لە نەقڵ، نە لە زانست و نە لە زگماک، لەسەر ڕاستیی بتپەرستیی، بەڵام ئەوە خۆشەویستییتانە بۆ یەکدی، یاخود سۆزو عاتیفەتانە بۆ بتەکان، ئەگەرنا لە ڕاستییدا هیچ بەڵگەیەکی عەقڵ و، زگماک و، نەقڵ و، زانست لەسەر بتپەرستیی نیە.

٦)- ﴿ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا﴾، دوایی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، هەندێکتان بێبڕوا دەبن بە هەندێکتان و، هەندێکتان نەفرین لە هەندێکتان دەکەن.

ئایا ئەوە چۆنە؟

أ- (يَكْفُرُ العَابِدُونَ بِمَعْبُودِيهِم، وَيَلْعَنُ العَابِدونَ بَعْضُهُم بَعْضَاً)، ئەوانەی کە پەرستار بوون، کوفر بە پەرستراوەکانیان دەکەن و، حاشایان لێدەکەن، دووریيان لێدەکەن، هەروەها پەرستەرەکانیش لە نێو خۆیاندا، هەندێکیان نەفرین لە هەندێکیان دەکەن، ئەم دەڵێ: خەتای تۆ بوو، ئەو دەڵێ: خەتای تۆ بوو.

ب- (يَكفُرُ القَادَةُ بِالأَتْبَاعِ وَيَتَبَرَّئُونَ مِنهُم، وَيَلْعَنُ الأَتْبَاعُ القَادَةَ وَيَسُبُّونَهُم)، واتە: سەرکردەکان بێبڕوا دەبن بەرانبەر بە شوێنکەوتووەکانیان و دووریيان لێدەکەن و حاشایان لێدەکەن، پەخەیان لەبەر دادەدڕن، شوێنکەوتووەکانیش نەفرین دەکەن لە سەرکردەکان و سەرمەشقەکان و، قسەیان پێدەڵێن و جنێویان پێدەڵێن!

بەس ئەوەیان بەدەست ماوە لەوێ.

کەواتە: هەردوو واتاکان گونجاون:

أ- ﴿يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ﴾، واتە: پەرستەرەکان کوفر دەکەن بە پەرستراوەکان، ﴿وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا﴾، سەرکردەکانیش نەفرین لە پەرستەرەکان دەکەن.

ب- یاخود: سەرمەشق و سەرکردەکان بێبڕوا دەبن و حاشا دەکەن لەوانەی شوێنیان کەوتوون و، شوێنکەوتووەکانیش نەفرین دەکەن لە سەرکردەکان کە لە دنیادا گومڕایان کردوون و، قسەیان پێدەڵێن.

٧)- ﴿وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾، جێگاو ڕێگەشتان ئاگرە، (مَأْوَى: مَكَانُ اللُّجُوءِ)، (مَأوى) واتە: شوێنی پەنا پێبردن، شوێنی لێ حەوانەوە، شوێنی لێ پارێزران، ئنجا ئەگەر کەسێک شوێنی لێ پارێزرانی نێو ئاگر بێ، دەبێ شوێنەکانی دیکەی چۆن بن؟!

٨)- ﴿ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴾، هیچ یارمەتییدەرێکتان نیە، ئەمە لابردن (نَفي) یە بۆ تێکڕا (جنس)ی سەرخەر (ناصر) یانی: هیچ جۆرە یارمەتییدەرێک و هاوکارێکتان نیە لەو ڕۆژەدا.

٩)- ﴿ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ﴾، ئنجا لووط ئیمانی بۆ هێنا، ئەم (ف)یە بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)ە، (الفَاءُ: تُفِيدُ مُبَادَرَةَ لوط للإيمانِ بِهِ)، یانی: لووط ﷺ یەکسەر ئیمانی بۆ ئیبراهیم ﷺ هێنا، ئیمانی بە خوا هێنا بۆ ئیبراهیم، یاخود ئیمانی بەو پەیامە هێنا کە بە ئیبراهیم دا ﷺ نێردراوە، لەبەر خاتری ئیبراهیم، جا (آمَنَ بِهِ) و، (آمَنَ لَهُ) لە قورئانداو، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ، هەردووکیان هاتوون، بۆ وێنە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ﴿٦١﴾ ﴾التوبة.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هاتوە: (وَقَالَ ابْنُ زَيْدٍ فِي حَدِيثِ الذِّئْبِ الَّذِي كَلَّمَ الرَّجُلَ، فَأخْبِرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «فَآمَنْتُ لَهُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ» وَلَيْسَ أَبُو بَكْرٍ وَلَا عُمَرُ مَعَهُ) (أخرجه الطبري في تفسيره: ٢٧٦٩٣، البخاري: ٢٣٢٤، مسلم: ٢٣٨٨)

لەو فەرموودەیەدا کە ئیبنو زەید لە بارەی گورگێکەوە کە قسەی لەگەڵ پیاوێک دا کردوە، هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ درا لەوبارەیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من و ئەبووبەکرو عومەر بڕوامان بۆ هێنا، کە لەو کاتەدا ئەبووبەکرو عومەر لەوێ نەبوون.

واتە: هەر شتێک من ئیمانی پێ بێنم، ئەبووبەکرو عومەریش ئیمانی پێ دێنن (خوا لێیان ڕازی بێ)، (فَآمَنْتُ لَهُ أَيْ صَدَّقْتُهُ) واتە: بە ڕاستم زانی.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ﴾، لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: کە ئیبراهیم ﷺ کۆچ دەکات لە عێراقەوە بۆ شام، هەم سارە خاتوونی خێزانی لەگەڵیدا دەبێ، هەم لووط و هاوسەری لووطیش کە ناوی مەلیکە بووە، ئنجا ئایا ئەو

خێزانەی لـووط هـەر ئەوەیـە کـە لەگەڵـی فەوتـاوە، یـان ئافرەتێکـی دیکـە بـووە؟ چونکـە ئەگـەر ئـەوە بووبـێ کـە لەگەڵـی فەوتـاوە، دەبـێ ئیمانـی پـێ نەهێنابـێ، نـە بـە ئیبراهیـم و نـە بـە لووطیـش، بۆیـە خـوا سـزای داوە لەگـەڵ گەلـە خراپەکارەکەیدا.

١٠)- ﴿ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ ﴾، ئیبراهیم فەرمووی: من کۆچکەرم بەرەو پەروەردگارم.

ئـەوەش کاتێـک بـوو کـە خـوا فەرمانـی پێکـرد: مـادام ئـەو خەڵکـە وا لێـت عاسـێ بـوون و کەللەرەقـن، وازیـان لـێ بێنـەو پشـتیان تێبکـە، ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ ﴾، یـانی: بـۆ ئـەو سـەرزەمینە کـۆچ دەکـەم کـە خـوا فەرمانـی پێکـردووم و، لـەوێ دەتوانـم چـاک بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەم، لـەوێ دەتوانـم پەیامـی خـوا بگەیەنـم و، خەڵکەکـە لێـم وەربگـرن.

١١)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو زاڵی کارزانە، کە وەسفی خوای پەروەردگاریش دەکات بە: ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، واتە: ئەو خوایەی من بەندایەتیی بۆ دەکەم و پشتی پێ دەبەستم، هەم باڵادەستە، هەم کارزانیشە.

لـە سـەرچاوە مێژووییـەکان دا دەڵـێ: ئیبراهیـم پێشـێ لـە عێراقـەوە لـە ئـووری کلدانییـان، یاخـود لـە بابلـەوە کـۆچ دەکات بۆ حـەڕران، کـە ناوچەیەکە لە باکووری شـام، کـە ئێسـتا کوردسـتانەو خەڵکـی کـوردی لێیـەو دەکەوێتـە نێـو جوگرافیـای کوردسـتانەوە، دوایـی لـە حەڕرانیشـەوە دەچـێ بـۆ شـام، دوایـی دەچێتـە خوارتـر، باشـووری شـام[1].

---

(١) بڕوانـە: مفصـل العـرب واليهـود في التأريـخ، الدكتـور المهنـدس أحمـد سوسـة، ص ٥٠٦-٥١٠ الطبعـة الخامسـة/١٩٨١م.

کـە نووسـیویەتی: (إن أحـدث التحقيقـات الآثاريـة التـي توصـل إليهـا العلـماء تشـير إلـى أن إبراهيـم الخليـل ظهـر في القـرن التاسـع عـشر قبـل الميـلاد، أي قبـل حـوالي أربعـة آلاف عـام...) لەبـارەی شـوێنی لەدایك بـوون و نیشـتەجێ بوونیشـیەوە، گوتوویەتـی: (... ويتفـق المؤرخـون علـى أن مولـد إبراهيـم الخليـل كان في العـراق، إلا أن الروايـات اختلفـت في تعيـين مـكان ولادتـه في العراق بالضبـط، فبعضهـم ذكـر أن مولـده كان في (أور الكلدانيـين) وبعـض الآخـر عينـه في بلـدة (أوروك- الوركـاء) وفي روايـة أخـرى أن مدينـة (كوثـا) كانـت نسـقط رأسـه فيهـا طـرح في النـار.....).

١٢)- ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴾، هەرکام لە ئیسحاق و یەعقووبمان پێ بەخشین، ئیسحاق لە سارە خاتوون دەبێ و، یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە، پێشتریش گوتمان: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر لە ڕۆژگاری ئیبراهیم دا، ئیسحاق و هاوسەرەکەشی یەعقووبیان بووبێ و ئیبراهیم بینیبێتی، چونکە خوا دەفەرموێ: بە ئیبراهیممان بەخشین، ئەوە زیاتر دێتە زەینەوە، ئەگەرنا دەشگونجێ یەعقووب دوای ئیبراهیم پەیدا بووبێ، ئەوکاتەش هەر مانای وایە کە خوا بە ئیبراهیمی بەخشیوە، چونکە نەوەیەتی.

١٣)- ﴿ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ ﴾، پێغەمبەرایەتیی و کتێبمان لەوەچەی ئیبراهیم دا دانا، وشەی (كِتَاب) مەبەست پێی تێکڕا (جنس)ی کتێبە، واتە: تەوڕات، ئینجیل، زەبوور، قورئان، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، چونکە لە دوای هاتنی ئیبراهیم ﵇، کتێبەکانی خوا تەنیا لە وەچەی ئەودا دابەزیون، پێغەمبەرایەتییش تەنیا لە وەچەی ئەودا بووە، چ لە لقی ئیسحاق، کە دوایی یەعقووبی دەبێ، یەعقووبیش نازناوەکەی ئیسرائیلە، کە بە مانای بەندەی خوایە، ئیسرا یانی (عبد) ئیل یانی: (ألله)، چ لە لقی ئیسماعیل کە لە هاجەرە خاتوون بووە، ئنجا ئایا ئیسماعیل بەس پێغەمبەری کۆتایی خۆمان موحەممەد ﷺی لێ بووە، یان پێغەمبەرانی دیکەش بوون؟ پاشان لە پەیمانی کۆن دا دەڵێ: ئیبراهیم کوڕێکی دیکەشی بووە بە ناوی (میدیان)، بەڵکو چەند کوڕێکی دیکەشی باس دەکات، کە دەبێ خەڵکی مەدیەنیش لە وەچەی میدیان بن، گرنگ ئەوەیە خوا کە دەفەرموێ: ئێمە لە وەچەی ئیبراهیم دا پێغەمبەرایەتیی و کتێبمان کورت هەڵێنا، واتە: لە دوای ئیبراهیم ﵇ تەنیا لەوەچەی ئەودا هەر پێغەمبەرێک هاتبێ، ڕەچەڵەکەکەی گەڕاوەتەوە سەر ئیبراهیم، هەر کتێبێک دابەزێنرابێ، بۆ ئەوانە دابەزێنراوە کە لە تۆرەمەو ڕەچەڵەکی ئیبراهیمن ﵇.

١٤)-- ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ﴾، لە دنیاش دا پاداشتەکەیمان دایەوە.

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە: ئایا مەبەست لە پاداشتەکەی لە دنیادا چییە؟

١- هەندێکیان گوتوویانە: سەرکەوتنیەتی بەسەر دوژمنانیدا.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی ناوو ناوبانگی چاکە، کە لە سووڕەتی (الشعراء) دا ئیبراهیم عليه السلام لە خوا پاڕاوەتەوە: ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤﴾ الشعراء، هەروەها ناوی چاکم بە نێو ئەوانی دیکەدا بڵاوکەوە، خواش دووعایەکەی قبووڵ کردوە.

٣- هەندێک گوتوویانە: زۆریی موڵک و سامانە.

٤- هەندێک گوتوویانە: وەچەی، چاکە کە لە ڕێی ئیسحاق و ئیسماعیلەوەو، ئەگەر میدیانیشی بووبێ و، ئەوانی دیکەشی بووبن، وەک لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە، وەچەی چاک و کوڕو کچانی چاکی لێ پەیدا بوون، ئەوە هەمووی بریتیە لە پاداشتی دنیا، ئەوانەش هیچیان پێکەوە ناکۆک نین، واتە: خوا هەم بەسەر دوژمنانی سەریخستوە، هەم ناوو ناوبانگی چاکی بووە، هەم ماڵ و سامانی باشی بووەو، هەم وەچەی باشیشی بووە، ئەوە هەمووی پاداشتی خوا بووە بۆ ئیبراهیم لە دنیادا.

١٥)- ﴿وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾. بە دڵنیایی ئەو لە دواڕۆژیشدا لە ڕیزی چاکاندایە، واتە: لە بەهەشتیشدا خوا دەیخاتە ڕیزی چاکانەوە، مەبەست ئەوەیە کە ئیبراهیم عليه السلام هێندە چاکەکارە، دەچێتە نێو قووڵایی چاکەکارانەوە، نەک چەمکەکەی بەو شێوەیە بێ، کە ئەویش دەچێتە نێو چاکان، نا! یانی: لە نێو قووڵایی چاکەکاراندایە، یانی: سەرمەشقیانەو پێشەنگیانە، چونکە زانایانی ئیسلام زۆربەیان ڕایان وایە کە دوای پێغەمبەری ئێمە موحەممەد ﷺ، گەورەترینی پێغەمبەران، ئیبراهیمە ئنجا دوایی ئەوانی دیکە، شایانی باسە: ئیبراهیم عليه السلام وەک چۆن نووح پێیگوتراوە: (أبو البشر الثاني) بابی دووەمی مرۆڤایەتیی، ئیبراهیمیش پێگوتراوە: (أبو الأنبياء) بابی پێغەمبەران، لەبەر ئەوەی لە دوای ئیبراهیم عليه السلام وەک ئەو ئایەتە دەیگەیەنێ، هەر پێغەمبەرێک هاتبێ لە وەچەی ئیبراهیم بووەو، خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ لە وەچەی ئیبراهیم ناردوویەتی و، هیچ کتێبێکی دانەبەزاندوە، مەگەر بۆ ئەوانەی لە وەچەی ئیبراهیمن عليه السلام.

ئـەوەی لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـە دەیڵێیـن ئەوەیـە کـە: خـوا ﷻ بەسـەرهاتی هـەرکام لـە نـووح و ئیبراهیـم، هەڵبەتـە دوایی لـووط و ئەوانـەش بـاس دەکات، بەڵام ئـەو دوو بەسـەرهاتە، ئـەو دوو پێغەمبـەرە پایـە بـەرزە، نـووح کـە بابـی دووەمـی مرۆڤایەتییـەو، ئیبراهیـم کـە بابـی پێغەمبەرانـە، بـۆ موحەممـەد پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە تـۆش هەروەهـا شوێنکەوتووانیشـی، چ لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، چ دوایـی، هەتـا دنیـا کۆتایـی دێ، ئێـوەش نـووح بکەنـە سەرمەشـق، کـە نـۆ سـەدو پەنجـا (٩٥٠) سـاڵ بـەس پێـش تۆفـان، بانگـەوازی کـردوەو مانـدوو نەبـووەو شـل و کـول نەبـووە، هەروەهـا ئیبراهیـم بکەنـە سـەر مەشـق، کـە بـۆ خـوا ئامـادە بـوو بسـووتێنرێ، بـە مەنجەنیـق خرایـە نێـو ئاگـری سـوور، کـە زۆربـەی خەڵکـی وادەزانـن مەنجەنیقەکـە ئاگرەکـەی تێدایـە، نـا! مەنجەنیـق ئامێرێـک بووە شـتیان پـێ هەڵداوە، ئنجـا ئیبراهیمیـان خسـتۆتە نێـو مەنجەنیقـەوە، بـەو مەنجەنیقـە هەڵیانداوەتـە نێـو ئـەو مەشـخەڵەی ئاگـرە.

کەواتـە: ئێـوەش ئـەی مسـوڵمانان! ئـەی بڕوادارانـی شـوێنکەوتووی پێغەمبـەری خاتـەم! ﷺ نـووح بکەنــە سەرمەشـقی خۆتـان، چاوسـاغی خۆتـان، چـاو لـەو بکەن:چەنـد خۆڕاگـر بـووەو چەنـد پشـوو درێـژ بـووە! هەروەهـا ئیبراهیـم بکەنـە سەرمەشـقی خۆتـان، چەنـد خۆڕاگـر بـووەو، چەنـد فیـداکار بـووە لـە پێنـاوی خـوای پـەروەردگاردا!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سـێزدە (١٣) ئایـەت پێکـدێ، ئایەتـەکانی: (٢٨ - ٤٠)، کـە بەسـەرهاتی لـووط و گەلەکـەی و، ئاماژەیـەک بـە بەسـەرهاتی شـوعەیب و گەلەکـەی مەدیـەن دەگرێتـە خـۆی، وێـڕای ناوبردنـی گەلـی عـادو سـەموودو، هـەر کام لـە: قارِوون و فیرعـەون و هامـان، کـە مووسـا بـە بەڵگە ڕۆشـنەکانەوە بـۆ لایان نێـردراوە، بـەڵام خۆیـان بەزلگرتـوە، لـە کۆتاییشـدا خـوا باسـی چـوار جـۆرە سـزای سـەرەکیی کـردوە، کـە زۆربـەی گەلـە یاخییەکانـی پـێ لـە بەیـن بـردوون:

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ

جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{هەروەها لووطیش(مان نارد) كاتێك بە گەلەكەی گوت: بەڕاستیی ئێوە خراپەیەكی قێزەون دەكەن، كە هیچ كەس لە جیهانییان لە كردنیدا پێشتان نەكەوتوە ﴿٢٨﴾ ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان (بۆ تێركردنی ئارەزووی جینسیی) و ڕێگریی دەكەن و، لە كۆڕەكەتاندا كاری خراپ و ناقۆڵا دەكەن؟! وەڵامی گەلەكەشی تەنیا ئەوە بوو كە گوتیان: سزاو ئازاری خوامان بۆ بێنە، ئەگەر لە ڕاستانی (كە پێغەمبەری خوای)؟ ﴿٢٩﴾ گوتی: پەروەردگارم! بەسەر كۆمەڵی تێكدەران و خراپەكاراندا سەرم بخە ﴿٣٠﴾ كاتێكیش فریشتە ڕەوانەكراوەكانمان بە مۆژدەوە هاتنە لای ئیبراهیم گوتیان: (بۆ ئاگاداریت!) ئێمە فەوتێنەری خەڵكی ئەو ئاوەدانییەین (چونكە) بێگومان خەڵكەكەی ستەمكارن ﴿٣١﴾ (ئیبراهیم) گوتی: ئاخر لووطیشی تێدایە! (فریشتەكان) گوتیان: ئێمە زاناترین بەو كەسانەی تێیدان، بە دڵنیایی (لووط) خۆی و خێزانەكەی دەرباز دەكەین، جگە لە ئافرەتەكەی (بە پێی بڕیاری خوا) ئەو لە فەوتاوانە ﴿٣٢﴾ كاتێكیش (فریشتە) ڕەوانەكراوەكانمان چوونە لای لووط، بە هۆی چوونیانەوە حاڵی خراپ بوو (پێی ناخۆش بوو)، لە بەرانبەر (پاراستن)یاندا دەستەپاچەو سەغڵەت بوو،

ئەوانیش گوتیان: مەترسەو خەمبار مەبە، بێگومان ئێمە خۆت و خێزانەکەت دەرباز دەکەین، جگە لە ئافرەتەکەت، کە لە فەوتاوانە ﴿٣٣﴾ ئێمە لە سەرێوە دابەزێنەری ئازارێکین بەسەر خەڵکی ئەم شارەدا، بە هۆی ئەوەوە کە لادان (لە عەقڵ و زگماک و شەرع) دەکەن ﴿٣٤﴾ بە دڵنیاییشەوە نیشانەیەکی ئاشکرامان لەو شارەدا بەجێهێشت، بۆ کۆمەڵێک بفامن ﴿٣٥﴾ هەروەها بۆ لای (شاری) مەدیەنیش شوعەیبی برایامان ناردو گوتی، ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن و، بە هیوای (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بن و، تێکدان و خراپەکاریی لە زەوییدا مەکەن ﴿٣٦﴾ (بەڵام گەلەکەی) بە درۆیان دانا و، ڕاتەکاندن و لەرزینەوەیەک (ی بێڕەزا) گرتنی و، یەکسەر لە خانووەکانیاندا لەسەر چۆکان لەپەوڕوو کەوتن ﴿٣٧﴾ هەروەها (هەردوو گەلی) عادو سەموودیش (فەوتێنران) کە لە خانووەکانیان دا بۆتان دەرکەوتوە (لە حیجرو ئەحقاف چۆن فەوتێنراون)، شەیتانیش کارەکانیانی بۆ ڕازاندنەوەو لە ڕێ (ی ڕاست) لایدان، لە حاڵێکدا کە شارەزاو بەرچاو ڕوون بوون ﴿٣٨﴾ هەروەها قارون و فیرعەون و هامانیش (سزادران) و بە دڵنیایی مووسا بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، کەچی لە زەوییدا خۆیان بە زلگرت و (کاتێکیش سزایان بۆ هات) لە قوتار بووان نەبوون ﴿٣٩﴾ هەر کامێکیانمان بە هۆی گوناهو تاوانەکەیەوە گرت (سزادا): هەیانبوو بای بەهێزی چەو هەڵگرمان بۆ ناردو، هەیانبوو هاڕژن و دەنگی گەورە گرتی و، هەیانبوو بە زەوییماندا ڕۆبردە خوارو، هەیانبوو (لە ئاودا) خنکاندمان، (هەرگیزیش) نەدەگونجا خوا ستەمیان لێ بکات (بە ناهەق بیانفەوتێنێ) بەڵکو خۆیان بوون ستەمیان لە خۆیان کرد ﴿٤٠﴾].

## شیكرنەوەی هەندێک لە وشەكان

(نَادِيكُمُ): (النَّادِي: المَكَانُ الَّذِي يَنْتَدِي فِيهِ النَّاسُ، أَي يَجْتَمِعُونَ نَهَاراً لِلْمُحَاوَرَةِ والمُشَاوَرَةِ، مُشْتَقَّةٌ مِنَ النَّدوِ بِوَزنِ العَفْوِ، وَهُوَ الإِجْتِمَاعُ نَهَاراً، وَمَكَانُ الإِجتِمَاعِ لَيلاً: سَامِر)، (نَادِي): ئەو شوێنەیە کە خەڵک بە ڕۆژ لێی کۆدەبنەوە، بۆ وتووێژو ڕاوێژ کردن، لە (نَدْو)ەوە هاتوە، لەسەر کێشی (عَفْو)، بریتیە لەو شوێنەی خەڵک بە ڕۆژ لێی کۆبێتەوە، بەڵام شوێنی کۆبوونەوەی خەڵک بە شەوان، پێ دەگوترێ: (سَامر)، بەڵام هی ڕۆژ پێی دەگوترێ: (نادي).

(ٱلْغَٰبِرِينَ): (الغَابِر: الهَالِك، البَاقِي مَعَ الهَالِكِين)، وشەی (غَابِر): دوو مانای پێچەوانەی یەکدی هەن: هەم بە مانای تێپەڕیو، دێ، هەم بە مانای ماوە، دێ، تێپەڕی واتە: سزادراو ڕۆیشتوەو بۆتە بەشێک لە مێژوو، یاخود بە مانای شتێک دێ کە دەمێنێتەوە، واتە: لەگەڵ سزادراواندا مایەوە.

(وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا): (الذَّرْعُ والذِّرَاعُ، ضَاقَ ذَرْعُهُ: لَمْ يُطِقْهُ)، (ذَرْع) و (ذراع) بە مانای باڵ دێن، جا شتێک نینسان باڵی لێی نەگاتەوە، واتە: تاقەتی پێ ناشکێ، ئەوە خوازراوەتەوە بۆ تاقەت پێ نەشکان، (وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا) واتە: باڵی وەتەنگ هات لەوە کە لێی بگاتەوە، یانی: لە بەرانبەریاندا، لە بەرانبەر پاراستنیاندا، دەستەپاچە بوو، هەستی بە دەستەپاچەیی کرد.

(رِجْزًا): (عَذَاباً)، (رِجْس وَرِجْز)، هەردووکیان بە مانای پیسیی (خبث) و، بە مانای سزای بە ئێش دێن.

(ٱلرَّجْفَةُ): (الرَّجْفَةُ: الزِّلْزَالُ الشَّدِيد الَّذِي تَرْتَجِفُ مِنْهُ الأَرْضُ)، (رَجْفَة): بریتیە لە لەرزینەوەیەکی بەهێز کە بە هۆیەوە زەوی دەهەژێ.

(جَٰثِمِينَ ): (الجُثُـومُ: الـبُرُوكُ عَـلَى الرُّكْبَتَـيْنِ)، (جُثُـوم) ئەوەیـە كـە ئینسـان لەسـەر ئەژنۆیـان بكـەوێ، (جَاثِمِـين) كـۆی (جَاثِـم)ە، (جَاثِم)یـش واتـە: لەسـەر ئەژنـۆ كەوتـوو، لەپـەوڕوو كەوتـوو، ئـەوەش ئەوپـەڕی بێدەسـتەڵاتیی و زەبوونییـە.

(مُسْتَبْصِرِينَ ): (الإِسْـتِبْصَارُ: البَصَـارَةُ فِي الأُمُـورِ، أَي: كَانُـوا ذَوِي عُقُـولٍ)، (مُسْـتَبْصِرِينَ ) واتـە: بەرچـاوڕوون بـوون، تێگەیشـتوو بـوون، حاڵییكـراو بـوون، چونكـە (إِسْـتِبْصَار) بـە مانـای بەرچـاو ڕوونیـی لـە كارانـدا، دێ، یـانی: كـە خـوا فەوتاندنـی، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا نەبـووە نەزانـن، بەڵكـو شـوێن هیدایەتـی خـوا نەكەوتـن، ئەگەرنـا بەرچاویـان ڕوون كرابـۆوەو، بەڵگەیـان لەسـەر تـەواو كرابـوو.

(حَاصِبًا): (الحَاصِـبُ: الرِّيـحُ الشَّـدِيدَة، سُـمِّيَت بِذَلِـكَ لأَنَّهَـا تَقْلَـعُ الحَصْبَـاءَ مِـنَ الأَرْض)، (حاصـب): بـە بـای بەهێـز دەگوتـرێ، چونكـە (حَصْبَـاء) هەڵدەكەنـێ، یانـی: چـەوو بـەرد لەگـەڵ خـۆی ڕادەدات.

(ٱلصَّيْحَةُ ): واتە: چریكە، نەعرەتە، دەنگی بەهێز، هاڕژن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەسەرهاتی لووط ﷺ و گەلەکەیمان، لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی هوود، ئایەتەکانی: (٧٧ - ٨٣)دا، بە درێژیی باسکردوە، هەروەها باسی شوعەیب و گەلەکەیشی (مەدیەن) دیسان لە سوورەتی هوود، ئایەتەکانی: (٨٤ - ٩٥)دا، بە تەفصیلْ باسمان کردوە، هەروەها باسی هوودو گەلەکەیشی (عاد)مان هەر لە هەمان سوورەت لە ئایەتەکانی: (٥٠ - ٦٠)دا باسکردوە، هەروەها بەسەرهاتی صالْح و گەلەکەی (ثمود)مان لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (الحجر) ئایەتەکانی: (٨٠ - ٨٤)دا، باسکردوەو، بەسەرهاتی قارِوون و فیرعەون و هامانیشمان لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)دا، هەروەها لە سوورەتی (القصص) ئایەتەکانی: (١ - ٣٥)دا، باسکردووە.

خوا ﷻ لەم سوورەتەدا دوای ئەوەی بەسەرهاتی هەر کام لە نووح و ئیبراهیمی (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ) باسکرد، ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتی لووط، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلُوطًا ﴾، هەروەها لووطیشمان نارد، (و) بۆ بادانەوەیەو گێڕەرەوە (عاطفة)یە، ئنجا یان دەچێتەوە سەر، ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾، ( وَلُوطًا ) (أَي وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا لوطاً)، یاخود: (وَاذْكُرْ لوطاً) واتە: یادی لووط بکەوە، ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾، کاتێک کە بە گەلەکەی خۆی گوت، لووط بە تەنکید لە عێراقەوە چووە، چونکە برازای ئیبراهیمە، لە کلدانییەکان، یاخود بابلییەکانی عێراقەو، ئەو گەلەی کە لووط بۆ لایان چووە، کەنعانیی بوون لە فەلەستین، بەلام بۆچی دەفەرمویٚ: ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ ﴾؟ لەبەر ئەوەی ماوەیەک لە نێویاندا ژیاوەو وەک یەکێک لە خۆیانی لێهاتوە، پێیگوتن: ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە گوناهێکی زۆر دزێوو ناقۆڵا، کردارێکی قێزەون ئەنجام دەدەن، کە هیچ کەس لە جیهانییان

لە پێش ئێوەدا نەیکردوە، دوایی باسی دەکەین کە ئایا مەبەست لەوە چییە؟ ئایا مەبەست ئەوەیە کە هیچ کەس نێربازیی نەکردوە لە پێش گەلی لووط دا؟ یان مەبەستی ئەوەیە کە هیچ کەس بەو شێوەیە تەبەنیی نەکردوە بە ڕەسمیی و بە هەرەوەزیی، هەردوو واتایەکە دەگونجێن.

(ٱلْفَـٰحِشَةَ) هەر کردارێک کە لە دزێویی و ناشیرینییدا هەموو سنوورێکی تێپەڕاندبێ، ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ﴾، ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانەیە (إستفهام توبيخي)یە، بۆ سەرزەنشت و سەرکۆنە کردنە، ئایا ئێوە دەچن بۆ لای پیاوان؟ یانی: لەگەڵ پیاواندا جووت دەبن، نێربازیی دەکەن؟ ﴿وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ﴾، هەروەها ڕێگریی دەکەن، خەڵک ڕووت دەکەنەوەو، پارەو سامانیان لێ دەستێنن، یاخود دەیانکوژن، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە هەندێک لە توێژەرەوان گوتوویانە: ﴿وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ﴾، ڕێگریی دەکەن واتە: ڕێی زاووزێ و بەردەوام بوونی وەچەی بەشەر دەگرن؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەگەر پیاوان لەگەڵ پیاوان جووت بن و، ئافرەتان لەگەڵ ئافرەتان، مانای وایە: تۆوی بەشەر دەبڕێتەوە، ئەوەش واتایەکیەتی، هەر چەندە واتایەکەی دیکەی دیارترە، ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾، هەروەها لە یانەکەی خۆتاندا، لە کۆڕو مەجلیسی خۆتاندا خراپە دەکەن، ئایا ئەو خراپەیە چییە؟ توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان باسکردوە:

أ- گوتوویانە: پەلاپیتکەیان لە خەڵکی گرتوە.

ب- گوتوویانە: لەبەرچاوی یەکدی نێربازییان کردوە.

جـ- هەندێکی دیکە گوتوویانە: چەپڵەیان لێداوە.

د- هەندێک گوتوویانە: فیکەیان کێشاوە.

بەڵام لە ڕاستییدا کە دەفەرموێ: ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾، لە مەجلیسی خۆتاندا خراپە دەکەن، هەموو خراپەیەک دەگرێتەوە، هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕووی شەرعەوە، لە ڕووی عەقڵەوە، لە ڕووی عورفەوە بە خراپ دادەنرێن، هەموو ئەو هەڵسوکەوتانە دەگرێتەوە.

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوە بوو کە گوتیان: ئازارو سزای خوامان بۆ بێنە، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، واتە: ئەگەر لە ڕاستانی کە پێغەمبەری خوای، سزای خوامان بۆ بێنە، بەڵام هێنانی ئازارو تۆڵەو سزای خوا، بە دەست لووط نیە، هەروەها بە دەست هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، ئەوان بەندەی خوا بوون، بۆیە لووطیش پەنای بردە بەر خوا: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، فەرمووی: پەروەردگارم! بەسەر کۆمەڵی تێکدەران و خراپەکاراندا سەرمبخە، واتە: دەربازم بکە لێیان و سزایان بدە، ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ ﴾، لە چەند شوێنان لە قورئاندا خوا بەسەرهاتی ئیبراهیم و لووط (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ) هەر پێکەوە دێنێ:

١- لێرە.

٢- لە سوورەتی (الذاريات).

٣- لە سوورەتی (هود) و، لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوا ﷻ هەر پێکەوەیان دێنێ، لێرەش دەفەرموێ: کاتێک نوێنەرەکانمان هاتنە لای ئیبراهیم بە موژدەوە، نوێنەرەکانمان، ڕەوانەکراوەکانمان واتە: فریشتەکانمان کە ڕەوانمان کردبوون، موژدەی چییان بۆ ئیبراهیم هێنا؟ موژدەی ئەوە کە خێزانەکەی سارە خاتوون کە نەزۆک بوو، خۆشی کەوتبووە تەمەنەوە، کوڕی دەبێ کە ئیسحاقەو، لە دوای ئیسحاقیش یەعقووبی دەبێ، وەک لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَـٰهَا بِإِسْحَـٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَـٰقَ يَعْقُوبَ ۝٧١ ﴾، ئەوە موژدەکە بوو بۆ ئیبراهیم، کە لەڕاستییدا جووت موژدە بوو.

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهْلِكُوٓاْ أَهْلِ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ﴾، گوتیان: بۆ ئاگاداریت ئێمە فەوتێنەری خەڵکی ئەم شارەین، ئایا ئەو شارە، شاری سەدووم بووە، یان عەمموورە بووە، یاخود کۆمەڵە شارێک بوون، لە پەیمانی کۆندا باسی پێنج شاران دەکات و ئێمە کاتی خۆی بە تەفصیل باسەکەیمان هێناوە، وەک بەرچاو ڕوونییش لە (پەیمانی کۆن)دا هەندێک شتمان هێناوە.

﴿ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴾، بەڕاستیی دانیشتووان و خەڵكی ئەم شارە ستەمكارو لادەرن: ستەم لە خۆیان دەكەن، ستەم لە بەشەر دەكەن، ستەم لە پێغەمبەران دەكەن، ستەم لە فیترەت و زگماك دەكەن، ﴿ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ﴾، ئیبراهیم فەرمووی: بە دڵنیایی لووطی تێدایە لەو شارەدا، ئاگاتان لێبێ، بە تەئكید فریشتەكان لەویان چاكتر زانیوە، بۆیە دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ﴾، گوتیان: ئێمە زاناترین بەو كەسانەی كە لەو شارەدان، ﴿ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لووط خۆی و نزیكەكانیشی دەرباز دەكەین، ﴿ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ ﴾، جگە لە ئافرەتەكەی، ﴿ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، ئەو لە فەوتاوانە، یاخود: ئەو لەوانەیە كە لە ماوانە، دەمێنێتەوە لەگەڵ گەلە فەوتاوەكەی دا، واتایەكەیان هەر یەكە:

أ- لەگەڵ واندا دەڕواو تێدەپەڕێ و، دەبێتە هەواڵێك لە مێژوو.

ب- یاخود لەگەڵ واندا دەمێنێتەوە، تاكو ئەو سزایە بچێژێ كە گەلە خراپەكەی پێی سزا دەدرێن، لەبەر ئەوەی پشتیوان و هاوكاری لووط ﷺ نەبوو، بەڵكو بە پێچەوانەوە هاوكاری گەلە ڕەوشت نزمەكەی بووە.

﴿ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا ﴾، كاتێك كە ڕەوانەكراوەكانمان، چوونە لای لووط، ﴿ سِىٓءَ بِهِمْ ﴾، حاڵی تێكچوو بە هۆی وانەوە، واتە: پێی ناخۆش بوو، چوونیانی پێ ناخۆش بوو، حاڵی خراپ بوو، ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾، هەروەها پێی وابوو كە دەستەپاچەیە لە بەرانبەر پاراستنیان دا، دەیزانی كە گەلەكەی، ئەو گەلە ڕەوشت نزمەی، تەماع لە هەر میوانێك و ڕێبوارێك، لە هەر كەسێكی غەریب دەكەن، دەستدرێژیی بكەنەسەر، ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾، (وَضَاقَ) یانی: تەنگ بوو، تەسك بوو، (ذَرْعًا) یانی: قۆڵ، باڵ، ئنجا ئینسان كاتێك باڵی لە شتێك نەگاتەوە، باوەشی لە شتێك نەگاتەوە، پێی ناگیرێ، ئەمە تەعبیرێكە بەكاردێ بۆ كەمتوانایی، واتە: هەستی بە كەم توانایی كرد لە بەرانبەریاندا، لەوەی بیانپارێزێ لە گەلە ڕەوشت نزمەكەی، زۆر سەغڵەت بوو.

ئەو بەسەرهاتە لە سوورەتەكانی: (الحجر) و (هود) و (الذاريات)یشدا هاتوە، بەڵام بە تایبەت لە سوورەتی (هود)دا، ئێمە بە تەفصیل لەوێ باسمان كردوە، كە چۆن گەلە ڕەوشت نزمەكەی تەماع لە میوانەكانی لووط دەكەن، ئەویش وا دەزانێ میوانەكانی مرۆڤن، وەك گوتراوە: لەسەر شێوەی گەنجی جوانیش بوون، ئیدی زۆر ترساوەو زۆر خەفەتی خواردوە، هەتا گوتوویەتی: ئەوە كچەكانمن! یانی: ئەگەر كچەكانی خۆم تەسلیم كردبن، ئەوانەتان تەسلیم ناكەم، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: كە گوتوویەتی: ئەوە كچەكانمن واتە: ئەوانە نافرەتی ئۆممەتەكەمن، خوا نافرەتی وا دروست كردوە، كە پیاو لەگەڵی جووت بێ، بەڵام ئەوان هەر سوور دەبن لەسەر داوای خۆیان، دوایی لووط ﷺ زۆر نارەحەت دەبێ، وەك لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ ﴾هود، گوتی: بریا خۆم هێزێكم هەبووایە، بتوانم بەرپەرچتان بدەمەوە، یاخود پەنایەكم هەبووایە پەنام بۆ بردبایە! ئنجا فریشتەكان خۆیان ئاشكرا دەكەن: ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ ﴿٨١﴾ ﴾هود، گوتیان: ئەی لووط! ئێمە نێردراوانی پەروەردگارتین، ئەوانە دەستیان ناگاتە تۆ و دەستیان ناگاتە میوانەكان.

بۆیە لێرەش پێیان گوت: ﴿ وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ ﴾، گوتیان: مەترسەو خەمبار مەبە، لێرە بە كورتیی هێناویەتی و لەوێ بە درێژیی باسیكردوە، ﴿ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴾، ئێمە دەربازكەری خۆت و نیزیكانیشتین، خێزانەكەشتین، جگە لە ئافرەتەكەت، ئەو لە فەوتاوانە، یاخود لە بەجێماوانە، لە هەموو قورئاندا خوای پەروەردگار كە باسی ژنی نووح دەكات، لە سوورەتی (التحريم)داوە لێرەو، لە چەند شوێنی دیكەش كە باسی ژنی لووط دەكات، بە (زَوجة) یان (زوج) باسیان ناكات! چونكە لە ڕاستییدا ئەوان هاوكووف و جووتی مێردەكانیان نەبوون، بۆیە بە (إمرَأَتَكَ) یان (إمْرَأَتَهُ)، یان (إِمْرَأَةَ نُوح، وَامْرَأَةَ لوط) ئاوا باسیان دەكات، هەر ئەوەندەیە مێینە بوون و لەگەڵیان بوون، ئەگەرنا هاوسەرێك نەبوون، كە هاوكووف و هاوتایان بن، لەبەر ئەوەی بڕوایان پێ نەهێناون.

﴿ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئێمە دابەزێنەری سزاو ئازارێکین لە سەرێوە بەسەر خەڵکی ئەم شارەدا ﴿ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە لادانیان دەکرد، لادان دەکەن، لادان لە زگماک، لە عەقڵ، لە شەرع، ﴿ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نیشانەیەکی ڕۆشنمان لێ بەجێهێشت، بۆ کۆمەڵێک بفامن، لە کوێی بەجێهێشت؟ لەو شارە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین، لێکۆڵەرەوانی قورئان لەو بارەوە مشتومڕیان زۆرە، ئایا ئەو نیشانە ڕۆشنە چییە؟ بەڵام وادیارە نیشانە ڕۆشنەکە هەر ئەو دەریاچە مردووەیە، کە ئێستا شوێنی ئەو شارە، بۆتە دەریاچەیەک کە هیچ زیندەوەرێک، هیچ ژیاندارێکی تێدانییە.

ئنجا خوا باسی بەسەرهاتی مەدیەن و، ئەو پێغەمبەرەی کە بۆیان نێردراوە (شوعەیب ﷺ) دەکات: ﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا ﴾، یانی: (وَأَرْسَلْنَا إلى مَدْيَنَ أخاهُمْ شُعَيْباً) هەروەها بۆ لای گەلی مەدیەن شوعەیبی برایانمان ڕەوانکرد، ﴿ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾، سێ شتی پێ فەرموون گوتی: ئەی گەلەکەم ! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و ئومێدەواربن بە ڕۆژی دوایی پاداشتی ڕۆژی دوایی و، تێکدەرانە خراپەکاریی مەکەن لە زەوییدا، لێرەدا بەس ئەوەندە دەفەرمووێ، بەڵام وەک لە شوێنی خۆی دا، کە بەسەرهاتی شوعەیبمان هێناوە، لە سوورەتی (هود)دا، باسمانکردوە: خراپەکارییەکەیان لە زەوییدا ئەوە بووە:

١- ڕێگرییان کردوە.

٢- شتی خەڵکیان بە کەمگرتوە.

٣- تەرازووبازییان کردوە.

٤- لە ڕووی ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، ئەمنییەوە لادان و، تاوانی زۆریان کردوە.

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ ﴾، بـە درۆیـان دانـاو ڕاتەكانـدن و ڕاچڵەكاندنێكـی مـەزن گرتنـی، ﴿ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ ﴾، ئنجـا لـە خانووەكـەی خۆیانـدا، واتـە: لـە شـارەكەیان دا كـە هەمـوو وەک یـەک خانـوو بـێ وایـە، لـە هەندێـک شـوێن دەفەرمـوێ: ﴿ دِيَـٰرِهِمْ ﴾، كـە كـۆی (دار)ە: خانـوو، بـەڵام (دیـار) خانـووەكان، ئنجا كـە دەفەرمـوێ: (فِى دَارِهِمْ) یـانی: شـارەكە هەمـووی وەک یـەک مـاڵ بـێ، وابـوو، پێكـەوە مـردن، چییـان لـێ هـات؟ ﴿ جَـٰثِمِينَ ﴾، (جاثـم) بـە (جَـٰثِمِينَ )، كۆدەكرێتـەوە، واتـە: لەسـەر ئەژنـۆ كەوتـوو، لەپـەوڕوو كەوتـوو، باڵنـدە كـە هەڵدەنیشـێ و بـە زەوییـەوە دەنوسـێ، دەگوتـرێ: (جَثَمَ الطَّيْرُ) واتـە: نیشـت و بـە زەوییـەوە نووسـا.

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی هـەر كام لـە گەلـی عـادو سـەموودیش دەكات: ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ ﴾، یانـی: (وَاذْكُـرْ عَـاداًو ثَمُـوداً) هەروەهـا یـادی گەلـی عـادو سـەموودیش بكـە، كـە خـوا هـوودی بـۆ گەلـی عـاد نـارد، ساڵیحیشـی بـۆ گەلـی ثەمـوود نـارد، ﴿ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَـٰكِنِهِمْ ﴾، بەدڵنیایـی بۆتـان ڕوون بۆتـەوە لـە خانووبەرەكانیـان دا، یـانی: بۆتـان ڕوون بۆتـەوە كـە خـوا چۆنـی سـزاداون، خانووبەرەكانیـان لـە كوێـن؟ گەلـی عـاد ئـەوە دیـارە شـوێنەكەی ئەحقافـە، ﴿ وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ ﴿٢١﴾ ﴾الأحقـاف، (أحقـاف) كـۆی (حِقـف)ە، كـە بـە گردۆلكـەی گچكـەی لم دەگوتـرێ، كـە بـا جووڵـەی پـێ دەكات، شـوێنەواری گەلـی (ثمود)یـش (حِجْـر)ە، كـە ئەحقـاف دەكەوێتـە نیـوە دورگـەی عەرەبییـەوەو، حیجریـش دەكەوێتـە نێـوان شـام و نیـوە دوورگـەی عەرەبیـی، كاتـی خـۆی باسـمان كـردوە بـە تەفصیل، ﴿ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَـٰكِنِهِمْ ﴾، لـە خانووبەرەكانیانـدا بۆتـان دەركەوتـوە (خـوا چی پێكـردن!) ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴾، شـەیتانیش كردەوەكانـی خۆیـانی بـۆ ڕازاندنـەوە، كردەوەكانیانـی بـۆ جوان كـردن، ﴿ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ئنجـا لـە ڕێ لایـدان، لـە ڕاسـتەڕێ لایـدان، لـە ڕاسـتەڕێی خـوا، ﴿ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴾، لەحاڵێـک دا بەرچـاو ڕوونیـش بـوون، بـە ڕێیـان دەزانـی، وەنەبـێ كـە

شـەیتان لـە ڕێ لایـدان، لەبـەر ئـەوە بووبێ کـە بەڕێیـان نەزانیبێ، بـە ڕێیـان دەزانـی و بەرچـاو ڕوون و شـارەزا بـوون، بۆیـە شایسـتەی ئـەوە بـوون کـە خـوا سـزایان بـدات، ئەگەرنـا کەسـانێک کـە شـارەزا نەبـن و بەرچـاو ڕوون نەبـن، خـوا سـزایان نـادات، ﴿ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ﴾، هەروەهـا یـادی قـاڕوون و فیرعـەون و هامانیـش بکـە، کـە بێگومـان قـاڕوون هـەر لـە گەلـی بەنـوو ئیسـڕائیل بـووە، وەک لـە سـووڕەتی (القصص)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ﴿٧٦﴾ ﴾، بـەڵام فیرعـەون و هامـان، هـەر قیبتیـی بـوون و لـە گەلـی میسـڕ بـوون، ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، مووسـا بەڵگـە ڕۆشـنەکانی بـۆ هێنـان، ﴿ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بـەڵام لـە زەوییـدا خۆیـان بـە زلگـرت، واتـە: لەسـەر زەمینـی میسـڕدا، ئـەم وشـەی (ٱلْأَرْضِ) (أل)ەکـەی بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام بـۆ ناسـاندنی (عهد)واتـە: لەسـەر زەمینەکـەدا، لەسـەر زەمینـی میسـڕدا خۆیـان بـە زلگـرت، ﴿ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴾، نەوانـەش لـە پێشـکەوتووان نەبـوون، ئـەوە نەبـوون پێـش ئێمـە بکەونـەوە، چونکـە کەسـێک پێـش کەسـێک بکەوێتـەوە، بـۆی ناگیـرێ، واتـە: ئـەوان ئـەوە نەبـوون لـە دەسـتمان دەربـازو قوتاربـن.

﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ﴾، هـەر کامێـک لـەو گەلانەمـان بـە گوناهەکـەی گـرت، سـزامان دا، ﴿ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا ﴾، ئنجـا هەیانبـوو کـە بایەکـی بەهێـز، کـە چـەوو بـەرد لەگـەڵ خـۆی ڕامـاڵێ، ناردمانـە سـەریان، وەک گەلـی عـاد کـە بـە بـای بەهێـز فەوتـان، ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ ﴾، هەشـیانبوو بـە دەنـگ و چریکەیەکـی بەهێـز بەهاڕژنێـک فەوتـا، وەک گەلـی سـەموود، ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾، هەشـیانبووە بـە زەوییمانـدا بـردە خـوار، وەک گەلـی لووطو قـاڕوون، ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ﴾، هەشـیانبوو لـە ئـاودا فەوتاندمـان، خنکاندمـان، وەک هـەر کام لـە گەلـی نـووح و گەلـی فیرعـەون، ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴾، خـواش نەدەگونجـا سـتەمیان لێـکات، خـوا لێـی ناوەشـێتەوە سـتەمیان لـێ بـکات، ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، بەڵکـو ئـەوان خۆیـان سـتەمیان لـە

خۆیـان کـرد، بۆیـە شایسـتەی ئـەوە بـوون کـە خـوای دادگـەر بـەو جـۆرە سـزایان بـدات، ئـەم چـوار جـۆرە سـزایە: (حَاصِب، صَيحَة، خَسْف، غَرْق) واتـە: بـای بەهێـزو، هـاڕژن و، بـە زەوییـدا بردنـە خـوارو، خنکێـنران لـە ئـاودا، زۆربـەی گەلـە یاخییـەکان بـە یەکێـک لـەو چـوار سـزایانە، فەوتـاون، یاخـود ڕەنگـە هەبـێ زیاتـر لـە جـۆرە سزایەکیشـی بـۆ تەرخـان کرابـێ، بـەوە فەوتێـنراون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ناردنی لووط ﷺ بۆ لای گەلەکەی و، هۆشداریدانی پێیان، لە بارەی نێربازییەوەو سەرزەنشتکردنی بۆیان و، بێباکیی دەربڕینیان و، پاڕانەوەی لووط لە خوا کە سەری بخات و دەربازی بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾، واتە: یادی لووط بکەوە، یان لووطیشمان نارد کاتێک بە گەلەکەی گوت، وەک پێشتر باسمان کرد بۆیە فەرموویەتی: خەڵکەکەی، گەلەکەی، چونکە ماوەیەکی زۆر لە نێویاندا بووەو، لەبەرئەوەی زۆر بۆیان دڵسۆز بووە، وەک یەکێک لە خۆیان بووبێ لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ والسَّلَامُ) وەک برای بابی خۆیان، بۆ خەڵک دڵسۆز بوون، ئەگەرنا لووط لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە لەو گەلە نەبووە، کە بۆیان نێردراوە، چونکە ئەو گەلە لە فەڵەستین بووەو، کەنعانییەکان بوون، بەڵام لووط لە عیبرانییەکان بووەو، خەڵکی عێراق بووەو، ئەو کاتە حوکمڕانانی عێراق: کلدانیی، یان بابلیی بوون[1].

---

(١) بڕوانە: مفصل العرب واليهود في التأريخ، ص٥٢١، کە نووسیویەتی: (...كانت تسود العراق

چـــی پێكوتـــن؟

٢)- ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ ﴾، بەدڵنیایی ئێوە فاحیشە ئەنجامدەدەن، (الفَاحِشَةُ: الفِعْلَةُ القَبِيْحَةُ البَالِغَةُ فِي القُبْحِ)، (فاحشة): بریتیە لە كردارێكی ناشیرین كە تێپەڕاندبێ لە ناشیرینییدا، ئەوپەڕی ناشیرینیی و قێزەونیی، كە مەبەست پێی نێربازییە.

٣)- ﴿ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، هیچ كەسێك لە جیهانییان پێشتان نەكەوتۆتەوە لە ئەنجامدانی ئەو كارە قێزەونەدا، كە نێربازییە؟

پێشـتریش گوتمـان: لـەو بـارەوە ڕوونكەرەوانـی قوڕئـان، توێژەرەوانـی قوڕئـان مشـتومڕیانە كـە: ئایا مەبەسـت ئەوەیـە پێـش گەلـی لـووط هیـچ كـەس كـردەوەی نێربازیـی ئەنجـام نـەداوەو، ئـەوان یەكـەم كـەس بـوون كـە دایانهێنـاوە؟ یاخـود مەبەسـت ئەوەیـە كـە ئێـوە یەكـەم كەسـن كـە بـە ڕەسـمیی تەبەنییتـان كـردوە، بـە هەرەوەزیـی و پێـوەی نـاسراون و، لـە حاڵەتـەوە گواسـتووتانەوەو كردووتانـە بـە دیـاردە؟

وا پێدەچێ ئـەوەی دووەمیـان زیاتـر مەبەسـت بێ، كـە ئـەوان وەك دیاردەیەكیان لێكـردوە، ئەگەرنا ئـەو گوناهـو تـاوان و لادانانـە لـە ژیانـی بەشـەردا كـەم و زۆر هـەر بـوون، بـەڵام گەلـی لـووط یەكەمیـن گەلێـك بـوون كـە لـە حاڵەتـەوە، لـە شـتێكی دەگمـەن و ڕیزپـەڕەوە كردیـان بـە یاسـایەكی گشـتیی، كردوویانـە بـە عـادەت و نەریتێـك كـە پێـوە نـاسراون و بـە گشـتیی تەبەنییـان كـردوە، بۆیـەش خـوا ﷻ بـە گشـتیی سـزای داون.

٤)-﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ ﴾،ئایائێوەدەچنەلای پیاوان؟(أَئِنَّكُمْ )خوێندراویشەتەوە: (إِنَّكُم)، (أ) لە (أَئِنَّكُمْ )دا هەمزەكە بۆ پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانەیە، ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان (بۆ تێركردنی ئارەزووی جینسییتان)؟

---

أثناء هجرة إبراهيم الخليل منه، نجد أن زمن هجرة الذي حدد بحوالي القرن التاسع عشر قبل الميلاد، يقع في فترة حرجة كانت تجتازها البلاد وهي في حالة اضطراب وتوتر...).

٥)- ﴿ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ ﴾، هەروەها ڕێ دەگرن، ڕێ دەبڕن، **(قَطْعُ الطَّرِيقِ: التَّصَدِّي لِلمَارِّينَ بِأَخْذِ أَمْوَالِهِم، أَو قَتْلِ أَنْفُسِهِم، أَوِ الفَاحِشَةِ بِهِم)**، مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: ڕێ دەبڕن، ڕێ دەگرن، ئەوەیە کە بچنە سەر ڕێی ئەو کەسانەی ڕێبوارن و بە ڕێ دادێن: یان ماڵ و سامانەکەیان لێ بستێنن، یان بیانکوژن، (یان هەردوو لایان)، یاخود بۆ ئەوەی نێربازییان لەگەڵ بکەن، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ ﴾، واتە: لە ئەنجامی ئەو کارە قێزەونەی ئێوەدا، ئێوە ڕێ دەگرن لە بەردەوام بوونی بەشەر لەسەر زەوی، بە هۆی ئەوەوە کە ڕێدەگرن، پیاوان و ئافرەتان پێکەوە هاوسەرگیریی بکەن، بەو شێوەیە ئەگەر خەڵک هەموو وەک ئێوە بکات، بەشەر دەبڕێتەوە، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر لەگەڵ ڕەوت و لەگەڵ ئایەتەکەش دا دەگونجێ.

٦)- ﴿ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ﴾، هەروەها لە کۆڕو مەجلیسی خۆتاندا، خراپە دەکەن، پێشتر گوتمان: (نادي) ئەو شوێنەیە کە خەڵک بە ڕۆژ تێیدا کۆدەبێتەوەو، (سامِرُ) ئەو شوێنەیە کە خەڵک بە شەوێ تێیدا کۆدەبێتەوە، کە دەفەرموێ: لە مەجلیسی خۆتاندا، لە شوێنی کۆبوونەوەتاندا، خراپە ئەنجام دەدەن، ڕوونی نەکردۆتەوە خراپەکە چییە؟ بەڵام ماناکەی گشتییە:

١- توێژەرەوانی قورئان زۆربەیان دەڵێن: مەبەستیان پێی پەلەپیتکەیە **(حذف)**، پەلەپیتکەیان لە خەڵکی گرتوە.

٢- هەندێک گوتوویانە: گاڵتەیان بە خەڵکی کردوە.

٣- هەندێک گوتوویانە: بە خەڵکی پێکەنیون.

٤- هەندێک گوتوویانە: لە کۆڕو مەجلیسی خۆیاندا، ئەو فاحیشەی نێربازییان ئەنجام داوە.

٥- هەندێک گوتوویانە: فڵان کاری خراپیان ئەنجام داوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەمانە هەموویان گونجاون، هیچکام لەوانەش تێکناگیرێن، مادام خوا دەفەرموێ: (ٱلْمُنكَرَ)، (أل)ی سەر (ٱلْمُنكَرَ) بۆ ناساندنەو، مانای تێکڕا (جنس) دەگەیەنێ، واتە: هەرچی جۆری خراپەیەو بە خراپ دادەنرێ، لەو کۆڕو مەجلیسەی خۆیاندا ئەنجامیان داوە، لە

گاڵتەکردن بە خەڵک، لە زەم و غەیبەت، لە پەلاپیتکە هاویشتن، لە شەڕاب خۆریی، لە تێکدان و خراپە، هەمووی دەگرێتەوە.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە هەم لێرە، هەم لە سوورەتەکانی: (هود، الحجر، الذاريات، الشعراء)داو، لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خوا بەسەرهاتی لووط ﷺ و گەلەکەی باسدەکات، باسی ئەوە ناکات کە لووط خەڵکەکەی بانگ کردبێ بۆ تەنیا خوا پەرستیی، جگە لە سوورەتی (الشعراء)، لەوێدا ئەویش وەک سەرجەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ)، ئەو قسەیەی خۆی دووبارە کردۆتەوەو فەرموویەتی: تەقوای خوا بکەن، هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم، تەنیا لەوێدا، ئەوە هاتوە، ئەویش لە ڕیزی پێغەمبەرانی دیکەدا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ)، وەک دەفەرمووێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾﴾ الشعراء.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەوەی کە دەفەرمووێ: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَـٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾﴾ الشعراء.

ئنجا پرسیار ئەوەیە: بۆچی پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ) خەڵکەکەیان بۆ تەوحیدو خواپەرستیی بانگ کردوەو، لەوێوە دەستیان پێکردوە، بەڵام لووط ﷺ لە هەموو شوێنەکان دا، کە خوا بەسەرهاتەکەی دەگێڕێتەوە، جگە لە سوورەتی (الشعراء) کە ئەویش وەک پێغەمبەرانی دیکە بەوە دەستی پێکردوە، لە شوێنەکانی دیکەدا، لووط ﷺ جەختی کردۆتەوە لەسەر دەست هەڵگرتنی گەلەکەی، لەو ڕەوشتە نزمە، لەو کارە قێزەونە، وەڵامەکەی ئەوەیە کە لووط ﷺ یەکێک بووە لە شوێنکەوتووانی ئیبراهیم، یەکێک بووە لە بڕواپێهێنەرانی ئیبراهیم، ئیبراهیمیش ﷺ ئەو بانگەوازەی تەنیا خواپەرستیی

**(توحید اللە)** هەم لە عێراق، هەم لە شام، هەم لە میسر، هەم لە حیجازدا، لە هەمووی بڵاوی کردۆتەوە، واتە: زۆربەی خەڵکی دنیای ئەو کاتە، کەوا پێدەچێ مرۆڤایەتیی زیاتر لەو شوێنانە نیشتەجێ بووبن، چونکە ئیبراهیم ﷺ بە مەزەنندە زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش بووە، یانی: زیاتر لە دوو هەزار (٢٠٠٠) ساڵ پێش لە دایک بوونی عیسا ﷺ، ئەگەر زیاتریش نەبووبێ، وا پێدەچێ مرۆڤەکان ئەو کاتە زیاتر لەو شوێنانە نیشتەجێ بووبن، لە لای ڕووباری نیل و لە نێوان دیجلەو فوڕات، میزۆپۆتامیا، کە عێراق و شام و حیجازو میسر دەگرێتەوە، ئیبراهیم ﷺ بانگەوازو پەیامی خۆی لەوانە هەموویان دا بڵاوکردۆتەوە، بۆیە پەیامەکەی ئیبراهیم بە هەمووان گەیشتووەو لووط ﷺ بە پێویستی نەزانیوە بانگیان بکات بۆ ئەوە، بەڵکو یەکسەر ئەوەی کە زۆر مەبەستی بووە، ئەوە بووە کە ئەو گەلە ڕەوشت نزمەی، واز لەو کارە قێزەونە بێنن، لە نێربازیی.

٧)- ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوە بوو کە گوتیان: ئەگەر لەڕاستانی ئازار (سزا)ی خوامان بۆ بێنە

﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، واتە: ئەگەر تۆ لە ڕاستانی کە پێغەمبەری خوای، ڕەوانەکراوی خوای، با سزای خوامان بۆ بێ.

٨)- ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾، گوتی: پەروەردگارم! بەسەر کۆمەڵی تێکدەران و خراپەکاران دا سەرمبخە.

کە بە مانای وشە تێکدەرو خراپەکاربوون، خوایە بەسەر تێکدەران دا سەرمبخە، یانی: دەربازم بکەو ئەوان سزا بدە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چوونی فریشتە نێردراوەکان بۆ لای ئیبراهیم ﷺ بە موژدەوەو، هەواڵپێدانی کە خەڵکی شارە بەد ڕەفتارەکە دەفەوتێنین و، باسکردنی ئیبراهیم ﷺ کە لووطیش لەو شارەدایەو، دڵنیا کردنەوەی فریشتەکان بۆی کە لێی ئاگادارن و، لووطو خێزانەکەی جگە لە ژنەکەی قوتار دەکەن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَنْ فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ ﴾، کاتێک نێردراوەکانمان موژدەیان بۆ ئیبراهیم برد، (لَمَّا أَدَاةٌ تَدُلُّ عَلَى التَّوقِيتِ، وَهِيَ تَسْتَلزِمُ وُجُود جُمْلَتَين وَهِيَ الإِخْبَارُ بِمَا فِيهِ)، (لَمَّا) ئامرازێکە دیاریکردنی کات دەگەیەنێ، هەمیشە دوو ڕستە دەخوازێ، کاتێک ئەوە بوو، ئەوە بوو ﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَىٰ قَالُوا ﴾، واتە: کاتێک نێردراوەکانمان موژدەیان بۆ ئیبراهیم برد، بە موژدەوە چوون بۆ لای ئیبراهیم، گوتیان.

﴿ بِالْبُشْرَىٰ ﴾، (بُشْرَى: اسْمٌ لِلبَشَارَةِ، وَهِيَ الإِخْبَارُ بِمَا فِيهِ مَسَرَّةٌ لِلمُخْبَرِ)، (بُشْرَى): ناوە بۆ (بَشارة) کە بریتیە لە هەواڵدان بە شتێک کە مایەی دڵخۆشییە بۆ هەواڵپێدراو، کە مەبەست ئەو موژدەیە، لە سوورەتی (هود)دا بە تەفصیل باس کراوە: ﴿ وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ ﴾هود، واتە: هاوسەرەکەی (ئیبراهیم) ڕاوەستابوو (واتە: سارە خاتوون)، پێکەنی ئێمەش موژدەی ئیسحاقمان پێداو، دوای ئیسحاقیش یەعقووب.

هەروەها لە سوورەتی (الحجر)دا، کاتێک فریشتەکان و ڕەوانەکراوەکان دەچن بۆ لای ئیبراهیم ﷺ و موژدەی پێدەدەن، واتە: موژدەکە هەم بە سارەی

هاوسەری دراوە، هەم بە خودی ئیبراهیم ﷺیش، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴿٥٥﴾﴾، یادبکەوە! کە لێی وەژوورکەوتن گوتیان: سەلامت لێ بێ، گوتی: ئێمە بەهۆتانەوە داچڵەکیوین، گوتیان: مەترسێ، ڕامەچڵەکە ئێمە موژدەت پێ دەدەین بە کوڕێکی زانا، (ئیبراهیم) گوتی: ئایا موژدەم پێدەدەن دوای ئەوەی کەوتوومە تەمەنەوە، موژدەی چیم پێ دەدەن؟ (فریشتەکان) گوتیان: موژدەت پێ دەدەین بە ڕاستیی، ئنجا تۆ لە نائومێدان مەبە.

لە سووڕەتی (الحجر) و (هود)دا وردەکاریی ئەو موژدەیە کە بە ئیبراهیم دراوە، باسکراوە.

٢)- ﴿قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ﴾، پێیان گوت: ئێمە فەوتێنەری خەڵکی ئەم شارەین، واتە: خەڵکی ئەم شارە، کە شاری سەدووم بووە، هەندێک گوتوویانە: عەمووڕە بووە.

٣)- ﴿إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾، بەدڵنیایی دانیشتووان و خەڵکی ئەم شارە لە ستەمکارانن.

ئەمە پاساو هێنانەوەیە بۆ فەوتاندنیان و، مەبەستیشیان ئەوە بووە کە زەمینە خۆشبکەن بۆ ئیبراهیم ﷺ کە ئەو هەواڵە دڵتەنگکەرو، دڵناڕەحەتکەرە دەبیستێ، چونکە ئیبراهیم ﷺ پیاوێکی زۆر بە ڕەحم و بە سۆزو پەرۆش بووە، وەک خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (هود)دا لێی دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾﴾هود.

٤)- ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا﴾، ئیبراهیم فەرمووی: بەڵام لووطیش لەو شارەدایە.

ئەمە بەرگریی کردنە لە لووط و، داوا کردنە بۆ دەربازکردنی.

٥)- ﴿قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا﴾، گوتیان: ئێمە زاناترین بەوەی کە تێیدایە، لەو شارەدایە، دیارە ئیبراهیم ﷺ وەک زانیاریی دەماودەم و، زانیاریی وەدەستهێنراو، زانیویەتی کە لووطی برازای لەوێیە، بەڵام ئەوان بە زانیاریی پێبەخشراو، زانیاریی وەحیی، ئەوەیان زانیوە، بۆیە زانیاریی ئەوان تەواوتر بووە.

٦)- ﴿لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ﴾، بە دڵنیایی خۆی و نیزیکەکانی، خێزانەکەی دەرباز دەکەین، جگە لە ئافرەتەکەی، ئەو لە فەوتاوانە، ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ ڕستەی پێشوو.

﴿كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ﴾، (كَانَتْ) لەئەسڵ دا (تَكونُ)یە، بەڵام بۆیە بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی، یانی: تازە تێپەڕیوە، ئەگەرنا (تَكونُ مِنَ الغابِرین) لە فەوتاوان دەبێ، یاخود لە ماوان دەبێ لە سزای خوادا، لەوانە دەبێ کە دەمێننەوەو، سزای خوایان پێدەگات، ئەمە لە سوورەتی (هود)دا زیاتر وردەکاریی باس دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَـٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَـٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾﴾هود، واتە: ئیبراهیم ﷺ دوای ئەوەی ترس و ڕاچڵەکینی لێ لاچوو و، موژدەکەی بۆ هات، لە بارەی گەلی لووطە وە مشتومڕی لەگەڵماندا دەکرد، بە دڵنیایی ئیبراهیم زۆر هێدیی و مەند، زۆر بە پەرۆش، زۆر گەڕاوە بوو بۆ لای خوا، (خوا فەرمووی) ئەی ئیبراهیم! واز لەوە بێنە، فەرمانی پەروەردگارت هاتووەو، ئەوانە سزایەکیان بۆ دێ کە تازە ڕەتناکرێتەوە.

پێشتریش باسمانکردوە کە (غابر) دوو مانای دژیەکی هەن: (غابر: ماضٍ) تێپەڕیو، (غابر: باقٍ) ماوە، یانی: تێپەڕیو لە سزادان دا، یان: ماوە لەنێو سزادراوان دا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاتنی فریشتەکان بۆ لای لووط و، هەواڵپێدانی و، نارەحەت و سەغڵەت بوونی و، مـوژدەی دەربازکردنی خۆی و نیزیکەکانی جگە لە ژنەکەی و، بەجێهێشتنی نیشانەیەکی ئاشکرا لە شوێنەکەیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا ﴾، کاتێک نێردراوەکانمان، ڕەوانەکراوەکانمان چوونە لای لووط.

(أَنْ) پیتێکە زیاد کراوە، بۆ زیاتر جەختکردنەوە، بە زۆریی لە دوای (لَـمَّا) ئەم (أَنْ) زیاد دەکرێ، بۆ بەهێز کردنی واتایەکەی.

٢)- ﴿ سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾، بە هۆی وانەوە حاڵی خراپ بوو، پێی ناخۆش بوو و، باڵی تەسک بوو، باوەشی تەسک بوو، بەو واتایە کە خۆی دەستەپاچەو بێدەستەڵات بینی، لە بەرانبەر پارێزرانی ئەو میوانانەی دا، لە گەڵە ڕەوشت نزمەکەی.

٣)- ﴿ وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ﴾، ئەوانیش گوتیان: مەترسێ و دڵتەنگ مەبە.

ترس و دڵتەنگیی پەکی ئینسان دەخەن، دوو نەخۆشیی زۆر کوشندەی مەعنەوییـن، بۆیە فریشتەکان پێیان گوت: نە ترست لەسەر بێ، مەترسەو، دڵتەنگ و پەژارەداریش مەبە.

٤)- ﴿ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەربازكەری تۆو نیزیكانتین، خێزانەكەتین، كەواتە: پێویست بە ترس و پەژارە ناكات، وشەی (مُنَجُّوكَ ) خوێنراویشەتەوە: (مُنْجُوكَ).

٥)- ﴿ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴾، جگە لە ئافرەتەكەت، ئەو لە فەوتاوانبوو.

زۆرجـار گوتوومانـە: (غَـبَرَ) هـەم بـە مانـای (مَـضَى) دێ، هـەم بـە مانـای (بَقِـيَ) دێ، (غَابِـر): (مَـاضٍ)، (غَابِـر): (بَـاقٍ)، ئافرەتەكـەت لـە تێپەڕیوانـە، لـە ڕابردووانـە، یاخـود: لەوانەیـە كـە دەمێننـەوە، لـە ماوانـە، لـەو سـزایەدا كـە بۆیـان دێ، ئەویـش دەگرێتـەوە.

٦)- ﴿ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئێمە دابەزێنەرین بۆ سەر خەڵكی ئەم شارە، ئازارێكی بەئێش لەسەرێوە.

٧)- ﴿ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە كە لادەدەن و دەردەچن، لە چی؟ لە زگماك و لە عەقڵ و لە شەرع.

٨)- ﴿ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە شوێنی ئەو شارە، لەو شارە نیشانەیەكی ڕۆشنمان بەجێهێشت، بۆ كۆمەڵێك بفامن.

پێشـتریش باسـمكرد: توێژەرەوانـی قورئـان لـە بـارەی ئـەوەوە كـە ئایـا ئـەو نیشـانەیە چییـە؟ ڕا جیاییـان هەیـە:

١- هەندێک گوتوویانە: ئەو سزایەیە، كە بۆی ناردوون.

٢- هەندێک گوتوویانە: ئەو بەسەرهاتەیە، كە خوا خستوویەتە كتێبەكانی خۆیەوە.

٣- بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست لەو نیشانە ڕۆشنە: دەریاچەی مردوو (بحر الميت)ە، هەروەک (مجاهد) دەڵێ: (هُوَ المَاء الأَسْوَدُ عَلَى وَجْهِ الأَرْض) واتە: ئاوە ڕەشەكەیە لەسەر ڕووی زەوی.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾، واتە: بەس عەقڵیان هەبێ، ئەوە بەسە دەرس و پەندی لێ وەربگرن.

بەڵام بۆ کەشتییەکەی نووح ﷺ فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَـٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾، چونکە کەشتییەکەی نووح، هەموو مرۆڤایەتیی بەسەرهاتەکەی زانیوەو دەتوانن تەماشای کەشتییەکە بکەن، بەڵام بە نسبەت ئەو سزایەی کە گەلی لووطی پێ سزادراوەو، ئەو شوێنەی کە لێی سزادراون، مەرج نیە هەموو جیهان پێی بزانن، بەڵام هەر کەسێک عەقڵی هەبێ و، تێگەیشتنی هەبێ، پەند وەردەگرێ لەو نیشانەیەی خوا لە گەلی لووط بەجێیهێشتوە، ئێمە کاتی خۆی بە تەفصیل باسمانکردوە، کە زانیاریی شوێنەوارناسیی ئێستا دۆزیویەتەوە، کە لە ژێر دەریاچەی مردوودا، شارێک هەیە، بەڵام بە هەڵگەڕاوەیی، شوێنەواری سزادان و ئەشکەنجەدان هەیەو، لاشەی مردووەکانیش هەن، کە بەو سزایەی خوا باسی کردوە، پێی فەوتێنراون.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ناردنـی شـوعەیب ﷺ بـۆ لای گەلـی مەدیـەن، کـە خـوا بپەرسـتن و بـە هیـوای پاداشـتی دوارِۆژبـن و، خراپەکاریـی نەکـەن، بـەڵام بـە درۆدانرانـی و، بـە لەرزینەوەیەکـی بێـرەزا سـزادانی گەلـی مەدیـەن و، لـە بەیـن برانـی:**

خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ﴾، هەروەها بۆ لای گەلی مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان نارد. (و)ی سەر (وَإِلَىٰ) (و)ی بادەرەوە (عاطفة)یە، واتە: **(وَأَرْسَلْنَا إِلى مَدْيَنَ أَخَاهُم شُعَيْباً)**، هەروەها بۆ لای گەلی مەدیەن شوعەیبی برایانمان ڕەوانەکرد، پێشتریش گوتمان: شوعەیب ﷺ هەر لە گەلی مەدیەن بووە، لە (پەیمانی کۆن)دا، دەڵێ: میدیان یەکێک بووە لە کوڕەکانی ئیبراهیم ﷺ، گەلی مەدیەنیش لە تۆرەمەو وەچەی میدیانن، ئنجا شوعەیبیش هەر یەکێک بووە لە گەلی میدیان، بەو پێیە بێ دەبێ شوعەیبیش هەر بچێتەوە سەر ئیبراهیم ﷺ.

٢)- ﴿ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، ئنجا گوتی: ئەی خەڵکەکەم! خوا بپەرستن.

پێشـتریش گوتمـان: ئێمـە بەسـەرهاتی شـوعەیب ﷺو گەلەکەیـمان: میدیـان، یـان مەدیـەن، هەروەهـا (أَصْحَابُ الأَيْكَةِ)ش، لـە کاتـی تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (هـود) دا، لێکۆڵینەوەیەکـی تێـرو تەسـەلمان لەسـەر کـردوە، بـەڵام لێـرە خـوا ﷻ زۆر بـە پوختیـی و گوشراویـی بەسـەرهاتەکە دێنـێ، شـوعەیب بـە گەلەکـەی فەرمـوو: ئـەی گەلەکـەم! خـوا بپەرسـتن.

٣)- ﴿ وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ ﴾، هەروەها بە هیوای (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بن، (**الرَّجَاءُ: التَّرَقُّبُ وَاعْتِقَادُ الوُقُوعِ فِي المُسْتَقْبَلِ**)، (رَجَاء): بریتیە لە چاوەڕێ کردن و، باوەڕ هەبوون بەوەی کە لە داهاتوودا ڕوودەدات، بەڵام (رَجَاء) لە زمانی عەرەبییدا زیاتر بۆ حاڵەتێک بەکاردێ، کە مرۆڤ هۆکارەکانی هێنانەدی ئەو ئاواتە دەستەبەر بکات، واتە: ئێوە هۆکارەکانی وەدەستهێنانی مەنزڵگای ڕۆژی دوایی دەستەبەر بکەن، بەڵام (أَمَل): بریتیە لەوە کە ئینسان شتێک بە ئاوات بخوازێ، بەبێ ئەوەی هۆکارەکانی دەستەبەر بکات، ئەوە جیاوازیی نێوان (رَجَاء) و (أَمَل)ە، بە ئومێدی ڕۆژی دوایی بن واتە: بە هیوای پاداشتی مەنزڵگای ڕۆژی دوایی بن، کە بەهەشتە.

٤)- ﴿ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾، خراپەکاریی خەست و خۆڵ لە زەوییدا مەکەن، واتە: لە زەوی مەدیەندا، خراپەکارانە، تێکدەرانە هەڵسوکەوت مەکەن، (مُفۡسِدِينَ) یانی: تێکدەرانە، (تَعۡثَوۡاْ) لە (**عُثُوّ**)وە هاتوە (**عَثَى يَعْثُوا عُثُوًّا**): (**الفَسَادُ المَسْتور**): بریتیە لە تێکدانێکی پەنهان.

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴾، یانی: (**وَلا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِين**) واتە: هەر بۆ تەئکید کردنەوەیە، وەک دەڵێن: (**قَعَدْتُ جُلوسَاً**) ئەمە زیاتر بۆ جەختکردنەوەیە، وشەکان لێک جیان، بەڵام مانایان زۆر لێک نیزیکە، یاخود یانی: خراپەکاریی نە پەنهان و نە ئاشکرا مەکەن.

(ٱلۡأَرۡضِ) کە (أل)ی ناساندن (**تعريف**)ی لەسەرە، بۆ (**عهد**)ە، واتە: لە زەوییەکەدا، لە وڵاتەکەدا کە وڵاتی مەدیەنە، خراپەکاریی مەکەن، کەواتە: شوعەیب سێ ئامۆژگاریی کردوون:

أ)- گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، کە خواپەرستیی هەموو چاکەکان دەگرێتە نێو خۆی، هەروەک کوفر هەموو خراپەکان دەگرێتە نێو خۆی.

ب)- بە هیوای ڕۆژی دوایی بن، ئومێدەواربن، واتە: ئەو هۆکارانەی کە پاداشتی ڕۆژی دواییتان بۆ دەستەبەر دەکەن، فەراهەمیان بێنن، دەستەبەریان بکەن، ئەو هۆکارانە بێننە دی، نەک هەر خەیاڵ پڵاو بکەن.

ج)- خراپەكارییش لە زەوییدا مەكەن، نە هی پەنهان و نە هی ئاشكرا.

ئـەم سـێیانە هـەر كامێكیـان ئەویدیكـە دەگرێتـە تێـو خـۆی: بەندایەتیـی بـۆ خـوا بكـەن، كەسـێك بەندایەتیـی بـۆ خـوا بـكات، ئومێـدەوار دەبـێ بـە ڕۆژی دوایـی و، ئـەو هۆكارانـە دەڕەخسـێنێ كـە مەنزڵـگای ڕۆژی دوایـی بـۆ دەسـتەبەر دەكـەن، كەسـێكیش خواپەرسـت بـێ و، بـە هیـوای ڕۆژی دوایـی بـێ، بـە تەنكیـد خراپەكاریـی و تێكـدان لـە زەوییـدا نـاكات، چونكـە دەزانـێ دەچێتـەوە خزمـەت خـواو، لێپرسـینەوەو سـزاو پاداشـت چاوەڕێـی دەكات.

بەڵام ئەوان چییان كرد؟

٥)- ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ ﴾، بە درۆیان دانا، ئنجا لەرزینەوەو هەژان، گرتنی، واتە: گوتیان: تۆ ڕاست ناكەی، وەک لە شوێنی دیكە لە سوورەتی (الأعراف)و (هود)و لە چەند شوێنی دیكەدا هاتوە، گوتیان: ئەگەر تۆ ڕاست دەكەی و لە ڕەوانەكراوانی، ئەگەر لە ڕاستانی، سزای خوامان بۆ بێنە.

﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ ﴾، ئنجـا لەرزینـەوە گرتنـی، لێـرەدا (ٱلرَّجْفَةُ) (أل)ی ناسـاندن (تعریـف)ی لەسـەرە، یانـی: جینسـی ئـەو لەرزینەوەیـە كـە دیارەو زانـدراوە، (الرَّجْفَـةُ: الزِّلْـزَالُ الشَّـدِيدُ الَّـذِي تَرْتَجِـفُ مِنْـهُ الأَرْضُ) (رَجْفَـة) بریتیـە لـەو لەرزینـەوە بەهێـزەی كـە زەوی بـە هۆیـەوە دەلەرزێتـەوە، لـە سـووڕەتی (هـود)و (الحجـر)دا سـزایەک كـە گەلـی شـوعەیبی پـێ سـزادراوە، نـاوی بـە (صَيْحَة) هاتـوە: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾الحجـر، وادیـارە لـە ئەصڵـدا چریكـەو هاڕژنێكـی گـەورە بـووەو، بۆتـە هـۆی لەرزینـەوەی زەوی، پاشـان بۆتـە هـۆی ئـەوە كـە خانووبـەرەو شـارەكەیان هەمـووی تێكبڕمـێ و، بەسـەر یەكـدا برووخـێ.

٦)- ﴿ فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾، ئنجا لە خانووەكەیاندا لەسەر ئەژنۆیان كەوتن، (جَٰثِمِينَ) واتە: (هَامِدِينَ بِلا حِرَاكٍ) بە مردوویی كەوتن بێ ئەوەی جووڵەیان مابێ، دەگوترێ: (جَثَمَ الطَّائِرُ جُثُوماً: لَصِقَ بِالأَرْضِ)، كاتێک باڵندە دەنیشێ و بە زەوییەوە

دەنووسێ، پێی دەگوترێ: (طَائِرٌ جَاثِمٍ) ئەگەر نیشتبێ و بە زەوییەوە نووسابێ، (جُثُوم) بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە لەسەر ئەژنۆ، لەسەر چۆک بکەوێ، لەپەڕوو.

لێرە دەفەرموێ: ﴿ فِي دَارِهِمْ ﴾، بەڵام لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ فِي دِيَـٰرِهِمْ ﴿٩٤﴾ ﴾، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فِي دَارِهِمْ ﴿٩١﴾ ﴾الأعراف، وەک شارەکە هەمووی یەک ماڵ بووبێ و، لەوێدا لەپەڕوو کەوتبن، کە دەشفەرموێ: ﴿ فِي دِيَـٰرِهِمْ ﴿٩٤﴾ ﴾هود، لە خانووەکان دا، لە ماڵەکانی خۆیاندا، (دیار) کۆی (دار)ە، خانوو، ماڵ، هەرکامیان لەماڵی خۆیدا کەوتبوو.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**فەوتێنرانی گەلی عادو گەلی سەموودیش، وێڕای بەرچاو ڕوونییان، هەروەها قاروون و فیرعەون و هامان، هەرچەندە مووساش بەڵگە ڕوونەکانی بۆ لابردن، سەرەنجام سزادرانی گەلە یاخییەکان، بە باو چریکەو ڕۆچوون و خنکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ﴾ هەروەها گەلەکانی: عادو سەموودو لە خانووبەرەکانیشیان بۆتان دەرکەوتوە، چۆن فەوتاون؟ ( وَعَادًا وَثَمُودَاْ ) واتە: (**وَأَهْلَكْنَا عَاداً وَثَمُودَاً**) یاخود: (**وَاقْصص عَلَيْهِم عاداً وثَمُودًا**) واتە: بەسەرهاتی عادو سەموودیان بۆ بخوێنەوە، یان عادو سەموودیشمان فەوتاندن، عاد پێغەمبەرەکەیان هوودە ﷺو، سەموودیش پێغەمبەرەکەیان ساڵیحە ﷺ، پێشتریش گوتوومانە: بەسەرهاتی گەلی (هود)مان، واتە: هوودو گەلەکەی عادمان بە درێژیی توێژیوەتەوە، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانە: (٥٠ - ٦١) لە سوورەتی (هود)و، بەسەرهاتی گەلی سەموودمان لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان ساڵیح ﷺ لە سوورەتی (الحجر)دا توێژیوەتەوە، کە پێنج ئایەتی موبارەکن، بەو بۆنەوە کە لە هەموو قورئاندا تەنیا لەو شوێنەدا گەلی (ثمود) بە (**أصحابُ الحِجر**) واتە: خاوەنانی حیجر، ئەو ناوچەی کە حیجری پێ دەڵێن: ناویان هاتوە، خوا دەفەرموێ: گەلی عادو سەموودیشمان لە بەین بردن.

﴿وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَـٰكِنِهِمْ﴾، بە دڵنیاییی لە خانووبەرەکانیان بۆتان دەرکەوتوە، واتە: لە سەرنجدانی خانووبەرەکانیان، شوێنەوارەکانیان بۆتان دەرکەوتوە کە چۆن فەوتێنراون، چۆن قڕەبڕ کراون.

لەئەنجامی چییدا فەوتاون؟

٢)- ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾، شەیتان کردەوەکانیانی بۆ جوان کردن، واتە: کردەوە خراپەکانیان، بێبڕوایی و هاوبەش بۆ خوادانان و، گوناهو تاوان و لادانەکان، شەیتان بۆی جوان کردن.

٣)- ﴿فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، ئنجا لە ڕاستە شەقام لایدان، (فَصَدَّهُمْ): (مَنَعَهُم) أو (صَرَفَهُم)، ڕێگریی لێکردن لە ڕاستە شەقام، یاخود: لە ڕاستە شەقام لایدان و، بە لاڕێیدا بردن.

(الصَّدُّ: المَنْعُ عَنْ عَمَلٍ)، (صَدّ): بریتیە لە پێشگیریی کردن و ڕێ لێگرتن لە کردەوەیەک، (السَّبِيلُ: مَا يُوصِلُ إِلى المَطْلُوبِ الحَقّ)، (سَبيل): بریتیە لەو ڕاستە شەقامەی مرۆڤ دەگەیەنێتە ئامانج، لێرەدا (ٱلسَّبِيلِ) بە تەئکید مەبەست پێی ڕاستە شەقامی خوایە ﷻ، واتە: لە ئایین و بەرنامەی خوا لایدان.

٤)- ﴿وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ﴾، لە حاڵێکیشدا کە ئەوان بەرچاوڕوون بوون، (أَي: كَانُوا أَهْلَ بَصَائِر) خاوەن بەصیرەت بوون، خاوەن عەقڵ بوون، بەرچاو ڕوون بوون، یاخود لە حاڵێکدا کە ئەوان بەرچاویان ڕۆشن کرابۆوە، هەق و ناهەقیان بۆ خرابوونەڕوو، واتە: وەنەبێ نەزان بووبن، یاخود بە ڕێ نەزانن، بۆیە لایاندابێ، بەڵکو ڕاستە شەقامیان لەبەر چاو بوو، بەڵام بۆیە بە ڕێی چەوت و لاردا ڕۆیشتن، وەک هەموو حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ لە خەڵککەرە پەرستراوو پەروەردگارەکانی هەموو چاخ و ڕۆژگارەکان، بۆیە بە ڕاستە شەقامی خوادا ناڕۆن، چونکە ئەگەر بە ڕاستە شەقامی خوادا بڕۆن، ڕێی دزیی و جەردەیی و ڕاووڕووت و، ڕێگریی و خۆسەپاندن و، قۆرخکاریی و گەندەڵیان نابێ، ئەوە ڕێچکە شەیتانییەکان و کوێرەڕێیەکانن، کە ئەو ئامانجە ناشەرعییانە بۆ حوکمڕانە

خۆسەپێنەکان دەستەبەر دەکەن، هەر بۆیەش کوردەواریی دەڵێن: (تەیری گول عاشقی داری ژەقنەبووتە).

لە کتێبی: (گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا) باسم کردوە، کە ئەو حوکمڕانەی بیەوێ ئامانجە شەرعییەکان جێبەجێ بکات، خەفتانی ئامرازو شێوازە چاکەکان دەخوات، بەڵام (ڕاوچی خراپ لە ناوی لێڵدا ڕاو دەکات)و، (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ)، ئەوەی بەتەمای حوکمێکی خۆسەپێنانە، فیرعەونانەو تاغووتییانە بێ، کەسێک چاوی لە قۆرخکاریی و لە چەوساندنەوەی خەڵک بێ، دەبێ خەفتانی ئەو ئامرازو شێوازانەش بکات، کە ئەو ئامانجە ناشەرعییەی بۆ دابین دەکەن، هەمیشە ئامانجەکانن کە ئامرازەکان پەلکێش دەکەن، ئەگەر ئامرازەکان شەرعیی و ڕاست و چاک بن، ئەو ئامانجانە خاوەنەکەیان ناچار دەکەن بە دوای شێوازو ئامرازو، ڕێبازی شەرعیی و چاک و پەسندیشدا بگەڕێ، بەڵام ئەگەر ئامانجەکە ناشەرعیی بوو، وەک خۆسەپاندن و، قۆرخ کردن و، خەڵک بە کۆیلەو خزمەتکار تەماشا کردن، ئەو کاتە دیارە چاو دەگێڕێ بۆ شێوازو ئامرازو ڕێبازێک، بەپێی سروشتی ئەو ئامانجە ناشەرعییەی کە هەیەتی.

٥)- ﴿ وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ﴾، هەروەها قاڕوون و فیرعەون و هامانیشمان فەوتاندن، کە قاڕوون لە گەلی بەنوو ئیسرائیل بوو کە عیبرانیی بوون، بەڵام فیرعەون و هامان لە قیبتییەکان بوون، قیبتییەکانی میسر، واتە: هەر لە گەلەکەی فیرعەون بوون.

٦)- ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ﴾، مووسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، بۆ لای کێ چوو؟ بۆ لای قاڕوون و فیرعەون و هامان، تەنیا ئەو سێیە نەبوون، بەڵام خوا ﷻ بۆیە باسی ئەو سێیە دەکات، چونکە ئەوانە سەرپەرشتیی خەڵکی میسریان دەکردو، خەڵکی میسریان خستبووە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

٧)- ﴿ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دوای ئەوەی مووسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، ئەوان لەسەر زەوییدا خۆیان بە زلگرت.

وشـەی (ٱلۡأَرۡضِ ) لێـرەدا (أل)ەکـەی بـۆ ناسـاندن (تعریف)ە، بـەڵام بۆ (عهـد)ە، واتە: لـە زەوییەکـەدا، ئەلیـف و لامـی (عهـد) لـە زمانـی کوردییـدا دەچێتـەوە بەرانبـەر: (کـە)، بـۆ وێنـە: ئەگـەر گوتـم: کتێبـم بـۆ بێنـە، نازانـی کام کتێـب؟ بـەڵام ئەگـەر گوتـم: کتێبەکـەم بـۆ بێنـە، دەزانـی کامەیـە، (جِئْنِي كِتَابَاً) نازانـی کام کتێبەیـە، بـەڵام ئەگـەر گوتـم: (جِئْنِي بِالكِتَاب) یانـی: کتێبەکـەم بـۆ بێنـە.

لەسـەر زەمینـی میسـڕدا خۆیـان بـە زلگـرت، کوفرەکەیـان لـە ڕووی خۆبەزلگرتـن و، خۆسـەپاندن و، خـۆ پـێ زۆر بوونـەوە بـوو، نـەک لـە ڕووی نەزانیـی و بێئاگاییـەوە.

٨)- ﴿ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴾، کاتێکیش ویستمان سزایان بدەین، لە پێشکەووتوان نەبوون.

دوو کـەس کـە پێکـەوە پێشـبڕکێ دەکـەن، ئەگـەر یەکێکیـان پێشـکەوتەوە، ئـەوە دووەمیـان ئـەوی بـۆ نەگیـراوەو تێپەڕیـوە، بەڵام خـوای زاناو توانـا لێـرەدا دەربازبوونی ئـەوان، ئـەو تەعبیـرەی (سَٰبِقِينَ)ی بـۆ بەکارهێنـاوە، واتـە: پێشـکەوتووەوە نەبوون، (أي: مَـا كَانُـوا مُفْلِتِين) دەربازبـوو، قوتـار بـوو، نەبـوون لـە سـزای ئێمـە.

٩)- ﴿ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ ﴾، هەر کامێک لەوانە، هەر کامێک لەو گەلانەی باسکران و، لەو کەسایەتییانەی باسکران، بە گوناهی خۆی گرتمان، (الأَخْذُ: الإِتْلَافُ وَالإِهْلَاكُ): (أخذ) لێرەدا بریتیە لە لەبەین بردن و فەوتاندن.

١٠)- ﴿ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا ﴾، ئنجا هەیانبوو بای بەهێزی چەوڕادەر (حاصِب)مان ناردە سەری، (الحَاصِبُ: إِعْصَارٌ شَدِيدٌ يَقْذِفُ بِالحَصى، وَالرِّيحُ العَاصِفَةُ أَشَدُّ)[1]، (حاصِب): بریتیە لە بایەکی بەهێز کە بەردو چەو لەگەڵ خۆی ڕامالێ، بەڵام (عَاصِفَة) بەهێزتریشە، خوای تۆڵەستێن جاری واش هەیە وشەی: (رِيح عَاصِف) بایەکی زۆر بەهێز، بەکاردێنێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ

---

(١) القاموس القديم: ج١، ص١٥٥.

أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ يونس، كەواتە: لەو كۆمەڵگایانە هی وابووە بە بایەكی ڕاماڵكەری بەردو چەو، فەوتێنراوە، وەک گەلی عاد: ﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ ﴾الحاقة.

١١)- ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ ﴾، هەشیانبوو هاڕژن گرتی، وەک گەلی مەدیەن، کە شوعەیب ﷺ، پێغەمبەریان بووە.

١٢)- ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾، هەشیانبوو کە بە زەوییماندا بردە خوار، وەک گەلی لووط، هەروەها قاروون و ئەوانەی لەگەڵی بوون.

١٣)- ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ﴾، هەشیانبوو کە لە ئاودا خنکاندمان، وەک گەلی نووح، هەروەها گەلی فیرعەون.

١٤)- ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴾، هەرگیزیش وانەبوو خوا ستەمیان لێ بکات، ئەم ڕستەیە وەک شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: مانایەکەی زۆر بەهێزترە لەوەی بفەرموێ: (وَمَا ظَلَمَهُمُ الله)، ئەوەش هاتوە، بەڵام لێرەدا: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴾ هاتوە، خوا ﷻ بە پێی سیاق تەعبیرەکان دێنێ، یانی: هەرگیز نەدەگونجاو شایستەی خوا نەبوو، کە ستەمیان لێ بکات (أَي لا يَنْبَغي وَلا يَليقُ بِهِ الظُّلْمُ).

١٥)- ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾، بەڵام خۆیان بوون کە ستەمیان لە خۆیان کردو، خواش ﷻ لەسەر ستەمەکەیان سزای دان، ئەو بەڵایەی کە بەسەریان هات لە لایەن خواوە، ستەم نەبوو، بەڵکو ئەوە بەرهەمی ستەمی خۆیان بوو، خوا ﷻ سزایدان لەسەر ئەو ستەم و لادان و تاوانەی کردیان.

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا، تێبینیی و سەرنجێکی (فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆی (مَفاتيحِ الغَيب)[1]دا دێنین، تێبینییەکی جوانە، دەڵێ: (فَحَصَلَ العَذابُ بالعَنَاصِرِ الأربَعَةِ والإنْسانُ مُرَكَّبٌ مِنْها، وبِهَا قِوَامُهُ، وبِسَبَبِهَا بَقَاؤُهُ وَدَوَامُهُ،

---

(١) التَّفسيرُ الكَبير: ج٢٦، ص٥٨.

**فَإِذَا أَرَادَ اللهُ هَلاَكَ الإِنْسَانِ، جَعَلَ مَا مِنْهُ وُجُودُهُ، سَبَباً لِعَدَمِهِ، وَمَا بِهِ بَقَاؤُهُ، سَبَباً لِفَنَائِهِ).**

**واتە: سزادانی خوا بە چوار توخمەكان هاتە دی، بە چوار پێكهاتەكان، كە مرۆڤ لەو چوارانە پێكهاتوە، (كە بریتین لە: هەواو ئاگرو گڵ و ئاو)، هەروەها بەو چوارانەش ڕاوەستاوەو بەو چوارانەش دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێ لە ژیان دا، ئنجا كاتێك خوا بیەوێ مرۆڤ بفەوتێنێ، ئەوەی كە هۆكاری بوونیەتی، دەیكاتە هۆكاری نەبوونی و، ئەوەی كە هۆكاری مانەوەیەتی، دەیكاتە هۆكاری لە بەین چوونی.**

**١- بایەكە ئەوە دیارە، چونكە (حاصِب) كە لێرەدا هاتوە، یانی: ئەو بایەی چەوو بەرد لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێ.**

**٢- ئاگرەكەش لێرەدا ئەو هاڕژن (صَیحة)و لەرزینەوەیە، كە دوایی بۆتە هۆی ژێرەو ژوور بوونی خەڵكەكە، وەك بوومەلەرزەیەك و لەوانەیە سەرەنجام بووبێتە ئاگرڕژێن (بركان)یش.**

**٣- بەزەوییدا ڕۆچوواندنیش، كە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾، وەك گەلی لووط ﵇ و قارون، هەر ئەو زەوییەی لەسەری بوون لە بنیاندا ڕۆچوو، بە زەوییدا چوونە خوار.**

**٤- ئاویش ئەوە دیارە هەم تۆفانی نووح و، هەم گەلی فیرعەون كە لە دەریای سووردا فەوتێندران.**

**كەواتە:**

**ئەی مرۆڤەكان بەهیچ شتێك بوغڕاو لەخۆبایی مەبن، چونكە خوای دادگەرو باڵادەست هەركات ویستی بتانفەوتێنێ، هەموو شتێكی لەبەردەستە بۆ پێ سزادانتان و لەبەینبردنتان!**

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پـازدە (١٥) ئایـەت پێكـدێ، ئایەتـەكانی: (٤١ - ٥٥)، كـە چـوار ئایەتـی سـەرەتا: (٤١ - ٤٤) باسـی خـوا بـە یەكگرتـن و خواناسـیی دەكـەن و، هەشـت ئایەتـی نێوەڕاسـت (٤٥ - ٥٢)ش هەموویـان بـە پلـەی یەكـەم باسـی قورئـان و، ئـەو تۆمەتانـەی كـە كافـرەكان لـەو بـارەوە دەیانلێـن دەكـەن و، سـێ ئایەتـی كۆتاییـش (٥٣ - ٥٥) باسـی ڕۆژی دوایـی دەكـەن.

كەواتــە: لــەم پــازدە (١٥) ئایەتــەدا، هەرســێك پایــە ســەرەكییەكەی قورئانــی مەككەیـی: (خواناسـیی و خـوا بەیەكگرتـن و، وەحیـی و پێغەمبەرایەتیـی و، ڕۆژی دوایــی) خراونــەڕوو.

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًاۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتْلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَٰحِدٌ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾

وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{وێنەی ئەو کەسانەی کە جگە لە خوایان بە دۆست (و پشتیوان و، سەرپەرشتیار)یان گرتوە، وەک جاڵجاڵۆکەیە کە ماڵێکی دروستکردوەو، بێگومان ماڵی جاڵجاڵۆکەش بێهێزترین ماڵە، ئەگەر بزانن ﴿٤١﴾ بە دڵنیایی خوا دەزانێ کە جگە لەو لە هیچ شتێک (کە بوونی ڕاستەقینەی هەبێ) ناپارێنەوەو، هەر ئەو زاڵی کارزانە ﴿٤٢﴾ ئەو وێنانەش بۆ (تێگەیاندنی) خەڵکی دەیهێنینەوەو، جگە لە زانایانیش تێیان ناگەن ﴿٤٣﴾ خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونەدی، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەک (ی مەزن) هەیە بۆ بڕواداران ﴿٤٤﴾ ئەوەی لە کتێب بۆت سروش کراوە، بیخوێنەوەو، نوێژ بەرپا بکە، بێگومان نوێژ (خاوەنەکەی) لە هەرچی قسەو کرداری خراپ و دزێوە دەگێڕێتەوەو، یادی خواش (لە هەموو شتێک) گەورەترەو، خواش دەزانێ کارامانە، چی دەکەن! ﴿٤٥﴾ بە باشترین

شێوازیش نەبێ لەگەڵ خاوەن کتێبان دا شەڕە قسە مەکەن، جگە لەوانەیان کە ستەم دەکەن (بە گوێرەی ستەمەکەیان وەڵامیان بدەنەوە)و بڵێن: بڕوامان بەوە هێناوە کە بۆ لامان دابەزێنراوەو، بەوەی بۆ لای ئێوەش دابەزێنراوەو، پەرستراوی ئێمەو پەرستراوی ئێوە یەکەو، ئێمە بۆی ملکەچین ﴿٤٦﴾ بەو شێوەیە (کە شێوەیەکی بەرزو ناوازەیە) کتێبمان بۆ لات دابەزاندوە، ئنجا ئەوانەی (پێشتر) کتێبمان پێداون (مادام عەقڵ وویژدان بەکار بێنن) بڕوای پێ دێنن و، لەوانەش (کافرانی ڕۆژگاری کۆمەڵگای موحەممەد ﷺ) هەیانە بڕوای پێدێنن و، تەنیا کافرەکانیش نکوولیی لە ئایەتەکانمان دەکەن ﴿٤٧﴾ تۆش لە پێش وی (قورئان) دا هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو، بە دەستی ڕاستیشت نەتنووسیوە، ئەگەرنا (ئەگەر خوێندن و نووسینت هەبووایە) ئەوانەی لەسەر ناهەقن، دەکەوتنە دوودڵییەوە ﴿٤٨﴾ (ئەم قورئانە لە جگە لە خواوەوە نەهاتوە) بەڵکو ئایەتانێکی ڕۆشنن لە سینەی ئەوانەدا کە زانیارییان پێدراوەو، جگە لە ستەمکارانیش هیچ کەسێک نکوولیی لە ئایەتەکانمان ناکات ﴿٤٩﴾ هەروەها (بێبڕوا بیانووگرەکان) گوتیان: دەبووایە چەند نیشانەیەک (ی یاسادڕ)ی لە پەروەردگاریەوە بۆ سەر دابەزێنرابان، بڵێ: نیشانە (و موعجیزە)کان تەنیا لە لایەن خواوەن و، من بەس ورياکەرەوەو (ترسێنەر)ێکی ئاشکرام ﴿٥٠﴾ ئایا بۆ ئەوان بەس نیە کە ئێمە کتێبمان دابەزاندۆتە سەرت، بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە! لەوەدا بەزەیی و بیرخستنەوە (یەکی مەزن) هەیە بۆ کۆمەڵێک بڕوا بێنن ﴿٥١﴾ بڵێ: خوا بەسە لە نێوان من و ئێوەدا شایەد بێ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە، دەیزانێ و، ئەوانەی بڕوایان بە ناهەق هێناوەو بێبڕوان بە خوا، هەر ئەوانەن زیانباران ﴿٥٢﴾ هەروەها (بێبڕوایان) پەلەت لێ دەکەن بە هاتنی سزاو ئازار(ێک کە هەڕەشەت پێی لێیان کردوە)، ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە، کاتێکی ناوبراو هەیە (بۆ سزادرانیان) سزایان بۆ دەهات، مسۆگەریش (سزاو ئازار) کت و پڕ بێ ئەوەی هەست بکەن، بۆیان دێ ﴿٥٣﴾ پەلەی هاتنی سزاو ئازارمان لێ دەکەن و،

بێگومان دۆزەخیش تابڵووقەدەری بێبڕوایانە ﴿٥٤﴾ ئەو ڕۆژە کە لە سەروویانەوەو لە ژێر لاقانیانەوە ئازار (ئاگری دۆزەخ) دایاندەپۆشێ و (خوا) پێیان دەفەرموێ: (سزای)ئەوە بچێژن کە دەتانکرد (لەبێبڕوایی وخراپە) ﴿٥٥﴾].

## شیکرنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَوْهَنَ): یانی: بێهێزتر (الوَهْنُ: ضَعْفٌ مِنْ حَيْثُ الخَلْقِ أو الخُلُقِ)، (وَهْن): بریتیە لە بێهێزیی، لە ڕووی جەستەیی و لە ڕووی دەروونییەوە، لە ڕووی ڕواڵەتیی و لە ڕووی ئاکارییەوە.

(ٱلْفَحْشَآءِ): (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَال)، هەر سێ وشەی (فُحش، فحْشَاء، فَاحِشَة) هەر کردەوەو قسەیەکە کە ناشیرینیی و دزێوییەکەی، قێزەونییەکەی، زۆر مەزن بێ.

(وَٱلْمُنكَرِ): (المُنكَر: كُلُّ فِعلٍ تَحْكُمُ العُقولُ الصَّحِيحَةُ بِقُبْحِهِ، أو الشَّرِيعَةُ)، (مُنكَر): بریتیە لە هەر کردوەیەک کە عەقڵە ڕاستەکان حوکم بکەن بە ناشیرینی، یاخود شەریعەت حوکم بکات، هەڵبەتە ئەو گوتوویەتی: (كُلُّ فِعْلٍ)، بەڵام لە ڕاستییدا (مُنكَر) دیسان بە هەرکام لە قسەو کردەوەی نامۆو، لەگەڵ سروشت و عەقڵدا نەگونجاو، دەگوترێ.

(وَلَا تُجَٰدِلُوٓا۟): واتە: مشتومرو شەڕەقسە مەکەن، (الجِدَالُ: الصِّرَاعُ وَإِسْقَاطُ الإِنسَانِ صَاحِبَهُ عَلَى الجَدَالَةِ، وَهِيَ الأَرْضُ الصُّلْبَةُ)، (جِدال): بریتیە لەوە کە مرۆڤ زۆران بگرێ و هەوڵ بدات خاوەنەکەی بخاتە سەر جەدالە، کە بریتیە لە زەوییەکی سەخت و پتەو.

(يَجْحَدُ): (الجَحْدُ: نَفْيُ مَا فِي القَلْبِ إِثْبَاتُهُ، وَإِثْبَاتُ مَا فِي القَلْبِ نَفْيُهُ)، (جَحْد): بریتیە لەوە کە شتێک لە دڵدا چەسپاوە، لابرێ و، شتێک کە لە دڵدا نیە،

بچەسپێنرێ، واتە: نكوولّییكردن لە بوونی شتێك، یان لە نەبوونی، لەگەڵ ئەوەشدا كە لە دڵ و دەروونـدا پێچەوانەی ئەو نكوولّییكردنە هەیە.

(ٱلْمُبْطِلُونَ): (البَاطِلُ: نَقِيضُ الحَقِّ، وَهُوَ مَا لاَ ثَبَاتَ لَهُ عِنْدَ الفَحْصِ عَنْهُ)، (باطِل): پێچەوانەی هەقە، ئەویش بریتیە لەوەی كاتێك دەپشكنی و تێیدەفكری، هیچ بوونێكی نیە، هیچ چەسپاویی نیە، ئنجا (مُبْطِل) كەسێكە هەڵگری (باطِل) بێ، واتە: ئەوانەی لەسەر ناهەقن.

(أَجَلٌ مُّسَمًّى): (أَجَلٌ) كاتی دیارییكراو، (مُسَمًّى) شتی ناوبراوو دیارییكراو.

(بَغْتَةً): كت و پڕ، لە ناكاو (البَغْتُ: مُفَاجَأَةُ الشَّيْءِ مِنْ حَيْثُ لا يُحْتَسَب)، (بَغْت): بریتیە لە كت و پڕ هاتن، لە ناكاو هاتنی شتێك، بەبێ ئەوەی حیسابی بۆ كرابێ و چاوەڕێی كرابێ.

(يَغْشَىٰهُمُ): (يَسْتُرُهُم وَيُغَطِّيهِم) دایاندەپۆشێ، دەیانخاتە ژێر خۆیەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

ئەم پازدە (١٥) ئایەتە، سێ تەوەری سەرەكیی دەگرنە خۆیان: خواناسیی و خوا بەیەككرتن، قورئان و وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و، ڕۆژی دوایی، هەڵبەتە لەگەڵ ئەو سێ بابەت و سێ پایە سەرەكییەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییشدا، هەندێك شتی دیكەش لەگەڵیاندا تێواخن و تێوپڕە كراوە:

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ﴾، وێنەی ئەوانەی كە جگە لە خوایان كردوە بە دۆست و سەرپەرشتیارو مشوورخۆری خۆیان، (أَوْلِيَآءَ ) كۆی (وَلِيّ)یە، (وَلِي) لە ئەصڵدا لە (وَلِي)یەوە هاتوە، واتە: (قُرْب)، بەڵام بە پێی سیاق مانایەكەی دەگۆڕێ، جاری وا هەیە (وَلِيّ) بەمانای: نیزیك، یارمەتییدەر، سەرپەرشتیار، پەروەردگار، سەروەر، دێ، لێرەدا دەفەرموێ: وێنەی ئەوانەی جگە لە خوایان كردوە بە دۆست و سەرپەرشتیارو پەرستراو مشوورخۆری خۆیان، وەك جاڵجاڵۆكەیە كە ماڵێكی دروستكردوە، ﴿ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ﴾، بێهێزترین ماڵ و خانووش، ماڵ و خانووی جاڵجاڵۆكەیە، ﴿ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾، ئەگەر بزانن، ئەگەر زانیارییان هەبێ، دوایی باسی دەكەین ئەمە ئیعجازێكی عیلمیی تێدایە، كە خوا ﷻ زانینی بێهێزیی و بێپێزیی و، بێ سەروبەرەیی ماڵی جاڵجاڵۆكەی بەستۆتەوە بە هەبوونی زانیارییەوە، ئەگەر زانیارییت هەبێ دەزانی كە ماڵی جاڵجاڵۆكە چەند بێهێزو پێزو، چەند پەنایەكی بێسوودە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ دەزانێ كە لە هیچ شتێك لە جگە لە خوا، ناپاڕێنەوە، واتە: ئەوەی لێی دەپاڕێنەوە هیچ نیە، بوونی نیە، یاخود (مَا) لێرەدا دەگونجێ (مَوْصُولَة) بێ، واتە: بە دڵنیایی خوا ئەوەی كە لێی دەپاڕێنەوە، هەر شتێك بێ، دەزانێ لە چی

دەپارێنەوە، دەشگونجێ (مَا)ی پرسیارکردن (الإستفهامية)بێ کە ماناکانیان لێک نیزیکن، ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، هەر ئەو (خوا ﷻ)یش باڵادەست و زاڵ و کاربەجێیە، ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایان تێیاندەگەن و، فامیان دەکەن و، بە وردیی لێیان حاڵیی دەبن، یانی: وەک پێویست، تەنیا زانایان لێیان تێدەگەن.

﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق واتە: بە حیکمەت و بۆ ئامانجێک کە پەیوەندیی بە مرۆڤەکانەوە هەیە، نەک خۆی، هێناونە دی، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾، بەدڵنیایی -لەوەدا کە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی- نیشانەیەکی مەزن هەیە بۆ بڕواداران، بەڵام ئەوەی بێبڕوابێ، چونکە لەبەر تیشکی ئیمان دا لە هیچ شتێک ورد نابێتەوە: پەند لە هیچ شتێک وەرناگرێ و، هیچ شتێک بۆی نابێتە نیشانەو بەڵگە، لەسەر کاربەجێیی و زانایی و دەستەڵاتی خواو، لەسەر ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ و، ڕەزامەندیی خوا بکرێتە بەرزترین لووتکەی ئاوات و هیوا لە ژیاندا، تەنیا بڕواداران لەوە بەهرەمەند دەبن و، ئەوە دەکەن بە نیشانەو بەڵگە، یانی: کەسێک بڕوای بە خوا نەبێ، کاتێک تەماشای بوونەوەرو گەردوون و دەوروبەری خۆی دەکات، بەو چاوە تەماشای ناکات کە ئەوە دروستکراوی خوایەو، نیشانەو بەڵگەی خوایە، نیعمەتی خوایەو، دەستی خوای لە پشتەوە نابینێ، وەک چۆن کەسێک کە بە چاوی ڕووت تەماشای دڵۆپە ئاوێک بکات، هیچی تێدا نابینێ، ئنجا ئەوە لە کوێ کە بە میکرۆسکۆپ (وردیلەبین) تەماشا دەکات، دەبینی هەزاران دروستکراوی تێدایە، بۆیە بە چاوی ئیمانەوە تەماشای شتان کردن، زۆر جیایە لە سەرنجدان چاوی بێ ئیمانییەوە، ئەگەرنا شتەکان هەر وەک خۆیانن، بەڵام بینینەکە فەرق دەکات.

ئێستا ئەوە لە کوێ: ئایا زانایەک تەماشای گەردوون بکات چی تێدا دەبینێ، بابایەکی عەوامی نەخوێندەواری نەشارەزاش چی تێدا دەبینێ؟ بەڵێ عەوامەکەش

بەشی خۆی تێیدا دەبینێ: ئەوە دروستکراوی خوایەو، خوای پەروەردگار ئەو وردەکارییەی لە گەردووندا داناوەو، لە جەستەی مرۆڤ و دەوروبەردا داناوە، هەر کەسەو بەشی خۆی لێی حاڵی دەبێ، بەڵام ئەو کەسەی زانایە زیاتری لێ تێدەگات، ئیمانیش وادەکات کە ئینسان عەقڵ و دڵی ڕۆشنتر بێ، شتەکان باشترو چاکتر ببینێ.

دوای ئەوە خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئەوەی لە کتێب بۆت سروشکراوە، بۆت نێردراوە، بیخوێنەوە، واتە: بەسەر خەڵکیدا بیخوێنەوە، ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژیش بەرپا بکە، قورئان بخوێنەوە بەسەر خەڵکداو، بۆ خۆشت بیخوێنەوەو، نوێژیش بەرپا بکە، نوێژ بەو شێوەیە بێنە دی و ئەنجام بدە کە خوا فەرمانی پێکردووی، ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ ﴾، بە دڵنیاییەوە نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە هەر کردارو قسەیەکی ناشیرین و، لە هەر کردارو قسەیەکی خراپ، (ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ) هەردووکیان سیفەتن بۆ گوناهان، چ گوناهێک بێ بە قسە بکرێ، چ بە کردەوە، لەبەر ئەوەی ئەو گوناهەی کە بە دڵ دەکرێ، ناشیرینییەکەی و قێزەونییەکەی و خراپیەکەی دەرناکەوێ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا گوناهەکان دەبنە سێ بەش:

أ- بەشێکیان پەنهانن بە دڵ و دەروون دەکرێن.

ب- بەشێکیان بە زمان.

ج- بەشێکیش بە ئەندامەکان، ئنجا گوناهەکان لەو ڕووەوە کە ناشیرین و قێزەونن، خوا وشەی (ٱلۡفَحۡشَآءِ)ی بۆ بەکارهێناون، یانی: زۆر ناشیرین و قێزەون، لەو ڕووەوەش کە خراپ و زیانبەخشن، وشەی (وَٱلۡمُنكَرِ)ی بۆ بەکارهێناون، واتە: ناپەسندو خراپ، ئەو گوناهانەش چ دەربڕینەکانی زمان بن، یان جۆرەکانی نووسینی ئێستا، چ کردەوەی ئەندامەکان بن، دەفەرموێ: نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە گوناهو تاوانەکان، لە قسەو کردارە خراپەکان، کە لە ڕووی ناشیرینییەوە، تاکو بڵێی ناشیرین و قێزەونن و، لە

ڕووی خراپیشەوە تاکو بڵێی خراپن، ﴿ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾، بە تەئکید یادی خواش گەورەترە، واتە: یادی خوا کە نوێژی بۆ فەڕز کراوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ١٤ ﴾طه، واتە: نوێژ بەرپا بکە بۆ یادی من، ئەو یادی خوا کردنە لە نوێژەکەدا، گەورەترە لە خودی نوێژەکە، چونکە ئامانج و ڕووحی نوێژەکەیە.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە یادکردنی خوا بۆ ئێوە، گەورەترە لە یادکردنی ئێوە بۆ خوا، ئەوە زۆر گەورەیە کە خوا یادتان بکات، ئنجا لە ئەنجامی چیدا خوا مرۆڤەکان یاد دەکات؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤەکان بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن و، یادی خوا دەکەن، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾، خواش دەزانێ ئێوە چی دەکەن.

(فعل) هەیە، (عمل) هەیە، (صُنع) هەیە، (كَسْب) هەیە، کە هەرکامێک لەوانە واتای خۆی هەیە:

١- (فِعْل) زۆربەی زانایان دەڵێن: هەر کردەوەیەکە بکرێ، نیەتی لەگەڵ بێ یان نا.

٢- (عَمَل) کردەوەیەکە نیەتی لەگەڵدا بێ.

٣- (صُنْع) کردەوەیەکە وردەکاریی و کارامەیی تێدا بەکاربهێنرێ.

٤- (كَسْب) وەدەستهێنان، وەدەستهێنانی کردەوەیەک، ئنجا چ (فعل) بێ، چ (عمل) بێ، چ (صُنع) بێ، هەمووی (کسب)ی بۆ بەکاردەهێنرێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ٢٨٦ ﴾البقرة، واتە: هەر کەسێک چاکە بەدەست بێنێ، سوودەکەی بۆ خۆیەتی و، خراپەش بەدەست بێنێ، زیانەکەی بۆ خۆیەتی.

﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾، لەبەر ئەوەی کە لە مەسەلەی قورئاندا مشتومڕ دێتە پێش، خوا دەفەرموێ: لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا شەڕە قسە مەکەن، مەگەر بە شێوازێک کە باشترینە، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ ﴾، جگە لەوانەیان کە ستەم دەکەن، واتە: ئەوانەیان کە ستەم

دەكـەن، تێدەپەڕێنـن و سنوورشـكێنیی دەكـەن، بۆتـان هەیـە وەک خۆیـان وەڵامیـان بدەنـەوەو دەمكوتیـان بكـەن، ئەگەرنـا نابـێ پەنـا ببرێتـە بـەر دەمكوتكـردن و بـێ قسـەكردنی خەڵـک، مەگـەر بەرانبەرەكـەت سـتەم بـكات و تێپەڕێنـێ، ئـەو كاتـە بـۆت هەیـە بـە ئەنـدازەی ئـەوە كـە لـە سـنووری خـۆی دایـە، ڕایبگـری و تـۆش شـێوازێكی شـێوەی ئـەو بەكاربێنـی، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴿٤٠﴾ ﴾الشورى، واتـە: سـزای خراپەیـەک، خراپەیەكـی وەک خۆیەتـی، ﴿ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ ﴾، ئەمـە بەرجەستەكردنی ئـەو ڕستەیەیە كە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾، واتـە: بـە باشـترین شـێواز، بـە باشـترین شـێواز چۆنـە؟ ئەوەیـە كـە بڵێـن: بڕوامـان بـەوە هێنـاوە كـە بـۆ لامـان دابەزێنـدراوە (كـە قوڕئانـە) و، بڕواشـمان بـەوە هێنـاوە كـە بـۆ لای ئێـوە دابەزێـنراوە (لـە كتێبەكانـی پێشـوو، وەک ئەصڵەكەیـان: صوحوفـی ئیبراهیـم، تەوراتـی مووسـا، زەبـووری داود، ئینجیلـی عیسـا (عَلَيهِـمُ الصَّـلاَةُ والسَّـلاَم) )، ﴿ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ ﴾، پەرسـتراوی ئێمـەو پەرسـتراوی ئێـوە یەكێكـە (كـە خوایـە،) ﴿ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾، ئێمـەش بـۆی ملكەچیـن، ئێمـە بـۆ خـوا ملكەچیـن، بـڕوا بـە هەمـوو كتێبەكانـی دێنیـن و بـڕواش بـە هەمـوو پێغەمبەرەكانـی دێنیـن، ئێـوەش وابـن، ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، واتـە: بـەو شـێوە (سەرسـوڕهێنەرە، بـەو شـێوە ناوازەیـە كـە قوڕئانمان پـێ دابەزانـدوە، كـە هـەر دەبـێ بەخـۆی بچوێـنرێ ونەچوێـنراو (مُشَـبَّه)ێک نیـە پێـی بچوێـنرێ) كتێبـمان بـۆ لای تـۆ دابەزانـد، ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئنجـا ئەوانـەی كتێبـمان پێـداون، (مـادام عەقـڵ و ویـژدان بـەكار بێنـن،) بـڕوای پێدێنـن، ﴿ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦ ﴾، لەوانـەش، (لـە كافرانـی ڕۆژگاری تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ) هەیانـە بـڕوای پێدێنـێ، ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، تەنیـا بێبڕوایەكانیـش، (كافرەكان كـە هـەق دەپۆشـن،) ئەوانـە نكووڵیـی دەكـەن لـە نیشـانەكانی ئێمـەو دانیـان پێداناهێنـن.

ئنجا دێتە سەر بەرپەرچدانەوەی هەندێک لەو تۆمەتانەی کە بۆ پێغەمبەر ﷺ کرابوون و، ئێستاش دەکرێن: گوایە موحەممەد ﷺ بۆ خۆی قورئانی داناوە، یان کەسێکی دیکە فێری کردوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ ﴾، تۆ لە پێش ئەمەدا، پێش قورئان، هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە، ﴿ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ﴾، بە دەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، ﴿ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾، ئەگەر خوێندنەوەو نووسینت هەبووایە، ئەوانەی لەسەر ناهەقن، بۆیان هەبوو بکەونە دوودڵییەوە، بەڵام کە تۆ لە پێش قورئاندا دێرێکت نەخوێندوەو، هیچ وشەیەکت نەنووسیوە، خوێندن و نوسینت نەبووە (أُمّيّ) بووی بە هەردوو واتایەکەی، واتە: نەشارەزا لە کتێبی پێشووەکان و، نەزانینی خوێندن و نووسین، هیچ بواری کەوتنە نێو دوودڵییان نیە، ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ﴾، (ئەو قورئانەوەک ئەوان دەڵێن، هەڵبەستراو نیە،) بەڵکو ئەو (قورئان)ە ئایەتە ڕۆشنەکانن، لە سینەی ئەوانەدا کە زانیارییان پێدراوە، ئەوانەی زانیارییان پێدراوە لە خاوەن کتێبە پێشووەکانیش، ئەوانیش دەزانن کە قورئان فەرمایشتی خوایەو، چاوەڕوانییشیان کردوە پێغەمبەری کۆتایی، موحەممەد ﷺ بێ، هەروەها دوا کتێبی خوا، دوا نوسخەی هیدایەتی شیفا بەخشی خوا، بۆ سەر موحەممەد ﷺ دابەزێ، ئەوانیش چاوەڕوانییان کردوە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، لەوبارەوە باسێکی سەربەخۆمان کردوە، لەو شوێنەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ﴿١٥٧﴾ ﴾.

﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، تەنیا ستەمکارانیش نکوولیی دەکەن لە نیشانەکانی ئێمە، لە ئایەتەکانی ئێمە، پێش ئەوە بە بێبڕوایان (ٱلْكَٰفِرُونَ) ناوزەدی کردن، دواتر بە ناهەقان (ٱلْمُبْطِلُونَ) ئنجا بە ستەمکاران (ٱلظَّٰلِمُونَ).

﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، هەروەها کافرەکان گوتیان: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەکانی دابەزنە سەر، واتە: موعجیزەو نیشانەی

وەک هـی پێغەمبەرانـی پێشـوو، موعجیـزە بەرهەسـتەکان، وەک: گۆچانەکـەی و دەسـتی مووسـا ﷺو، مـردوو زیندووکردنـەوەی عیسـا ﷺو...هتـد، ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْآيَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، بڵـێ: نیشـانەکان، موعجیـزەکان تەنیـا لـە خـواوەن، بـە دەسـت مـن نیـن، ﴿ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، مـن تەنیـا وریاکـەرەوەو ترسـێنەرێکی ڕوون و ئاشـکرام.

ئنجـا بەرپەرچـی ئـەو پێشـنیارەیان دەداتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾، ئایـا بـۆ ئـەوان بـەس نیـە، ئەگـەر لـە هـەق بگەڕێـن، کـە ئێمـە کتێبێکـمان دابەزاندۆتـە سـەرت، بەسـەریاندا دەخوێندرێتـەوە، لـەوە گەورەتـر موعجیـزە چـی؟ فەرمایشـتی خـوا لـە لایـەن پێغەمبەرێکـەوە ﷺ کـە هەرگیـز درۆو خیلافـی لـێ نەبیسـتراوە، هەرگیـز قسـەی نارێکیـی لـێ نەبینراوە، ئـەو فەرمایشـتەی خـوا بخوێنێتـەوەو، لـە خۆیـدا بەرجەسـتەی بـکات، نـەک بـەس بیخوێنێتـەوە، بەڵکـو قورئـان چـی دەفەرمـوێ، بـەو شـێوەیە ڕەفتـار بـکات، ئـەو مرۆڤـە هـەرە پـاک و چاکـە، ئـەو فەرمایشـتە هـەرە بـەرزو ڕاسـت و چاکـە بخوێنێتـەوە، ئایـا بـەس نیـە بـۆ ئـەوان؟ ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڕاسـتیی لـەوەدا، لـەو قورئانـەداو لـە خوێندنـەوەی قورئـان لـە لایـەن موحەممـەدەوە ﷺ بەسـەر ئێـوەدا، بەزەییەکـی تایبـەت و بیرخسـتنەوەیەکی زێـدە مـەزن هەیـە، بـۆ کۆمەڵێـک بڕوابێنـن، بـۆ ئـەوەی بـڕوا بێنـن، قورئـان بەسـە بـۆ بەڵگـەو شـایەدیی موحەممـەد ﷺ کـە هـەم بەڵگـەو موعجیزەشـیەتی و، هـەم بەرنامەشـیەتی.

﴿ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ﴾، بڵـێ: خـوا بەسـە لـە نێـوان مـن و ئێـوەدا شـایەدو بەڵگـە بـێ، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَـٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾، ئەوانـەش کـە بڕوایـان بـە پـووچ و ناهـەق هێنـاوەو بـە خـوا بێبـڕوا بـوون، هـەر ئەوانـە زیانبـاری ڕاسـتەقینەن.

لـە کۆتایـی دا دێتـە سـەر تـەوەری سـێیەم، باسـی ڕۆژی دوایـی: ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ

﴿بِٱلۡعَذَابِ﴾، پەلەشت لێ دەكەن بە هاتنی سزاو ئازاری خوا، ﴿وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾، ئەگەر كاتێكی دیاریكراوو ناوبراو نەبووایە، سزایان بۆ دەهات، بەڵام خوا سیستمێكی بۆ گەردوون و ژیانی مرۆڤ داناوەو هەروا هەوەنتە نیە، هەر شتێك لە كاتی خۆیدا دێ، ﴿وَلَيَأۡتِيَنَّهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾، ئەو سزایەی خواش كتوپڕ بۆیان دێ، بێ ئەوەی كە هەست پێ بكەن، ئنجا چ مەرگی خۆیان بێ، چ سزایەكی دیكەو بەڵای ناگاهان بێ، لە دنیادا بەسەریان بێ، چ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، ﴿يَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ﴾، پەلەشت لێدەكەن بە هاتنی سزاو ئازار، ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، بە دڵنیایی دۆزەخیش ئابڵووقەدەری بێبڕوایانە، یانی: دۆزەخ دێ و ئابڵووقەشیان دەدات و لێشی قوتار نابن، ﴿يَوۡمَ يَغۡشَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۡ﴾، ئەو ڕۆژە كە سزاو ئازار لە سەروویانەوەو لە بن لاقیانەوە دایاندەپۆشێ، واتە: سەرو ژێریان دەگرێتەوەو، ئاگر دەیانخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، لە نێو خۆیەوە دەیانپێچێ، ﴿وَيَقُولُ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، (خوا)ش دەفەرموێ: بیچێژن ئەوەی كە دەتانكرد، كە بریتی بوو لە كوفرو لادان و تاوان و لە خراپە، سزایەكەی بچێژن.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**وێنـە هێنانـەوە بـەماڵـی جاڵجاڵۆكـە، بـۆ پەرسـتراوانێك كـە بێبڕوایـان پەنایـان پێدەبـەن، كـە لـە ڕاسـتیدا پەرسـتراوانی جگـە لـە خـوا هیـچ نیـن و، تەنیـا زانایانیـش لـە وێنـە هێنانەوەكانـی خـوا بـاش تێدەگـەن و، گەردوونیش بـە هەق دروسـتكراوەو، ئـەو ڕاسـتییەش جگـە لـە بـڕواداران تێیناگـەن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًاۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ﴾، وێنەی ئەوانەی جگە لە خوا سەرپەرشتیاران و، دۆستان و پشتیوانانێكیان گرتوون، وەك جاڵجاڵۆكەن، ماڵێكی گرتوە، (أَوْلِيَآءَ ) (**أي: يُوالُونَهُم وَيَتَّكِلُونَ عَلَيهِم فِي حَاجَاتِهِم مِنْ دُونِ اللهِ، جَمَاداً كَانَ، أو حَيَوَاناً، أَو أَحْيَاءً، أَو أَمْوَاتاً**) یانی: ئەوانەی كە دۆستایەتییان دەكەن و نیزیكییان لێدەكەن، بۆ جێبەجێ كردنی پێداویستییەكانیان، پشتیان پێ دەبەستن، ئنجا ئەوانە ماددەی بێ ژیان بن، یان ژیاندار، زیندوو بن، یان مردوو، هەر شتێك بن، هەر شتێك جگە لە خوا وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، ئەوە لە ڕاستییدا شیركەو، جگە لە خوا پەرستنە، چ بە شێوەیەكی گشتیی بێ لە هەموو

ڕوویەکەوە، یان بە شێوەیەکی جوزئیی بێ لە شتێک لە شتەکاندا، کە تایبەتمەندیی خوایە ﷻ.

﴿كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ﴾، وەک جاڵجاڵۆکەیە، وشەی: (ٱلْعَنكَبُوتِ) تاکەو، بۆ کۆش بەکاردەهێنرێ، بۆ نێرینەو بۆ مێینەش بەکاردەهێنرێ، بە (عَنَاكِب) و (عَنْكَبوتات) کۆدەکرێتەوە.

﴿ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾، وێنەیان وەک وێنەی جاڵجاڵۆکەیە، کە ماڵێک، خانوویێک دروست دەکات، دیارە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە سەرما، نە گەرما، نە مەترسیی، هیچ شتێک ناگێڕێتەوە.

٢)- ﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ﴾، بە دڵنیایی بێهێزترین و، بێپێزترین ماڵیش، خانووو ماڵی جاڵجاڵۆکەیە.

٣)- ﴿لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾، ئەگەر بزانن، ئەگەر زانیارییان ببووایە، ئەو ڕاستییەیان دەزانی کە پەرسترانی جگە لە خوا، وەک پەنا بردنە بە ماڵی جاڵجاڵۆکە، ئەوانەی کە پەنا دەبەنە بەر جگە لە خوا، وەک ئەو زیندەوەرانەوان کە پەنا دەبەنە بەر ماڵی جاڵجاڵۆکە، کە سەرەنجام لەوێدا سەریان بە فەتارەت دەچێ[1].

٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ﴾، بە دڵنیایی خوا دەزانێ کە جگە لەو، لە هیچ شتێکی دیکە ناپاڕێنەوە.

أ- دەگونجێ (مَا يَدْعُونَ) یانی: لە هیچ شتێک لە جگە لە خوا ناپاڕێنەوە، لە هیچ شتێک کە بوونێکی ڕاستەقینەی هەبێ و، شایستەی لێ پاڕانەوەو پەرستش بێ، هیچ شتێکی وایان نیە، واتە: (مَا) بۆ لابردن (نَفي)یە.

ب- دەشگونجێ (ما) ، (المَوصولة)بێ واتە: (إِنَّ اللهَ يَعلمُ الَّذِي يَدعُونَ مِنْ دونِهِ مِنْ شَيء) واتە: خوا هەرچی کە جگە لە خوا، هەر شتێک لێی بپاڕێنەوە، دەیزانێ.

---

(١) دوایی چەند زانیارییەک لە بارەی جاڵجاڵۆکەو ماڵەکەیەوە دەخەینەڕوو.

جـ- دەشگونجێ (ما) (الإستفهامية) بێ واتە: خوا دەزانێ کە لە چی دەپاڕێنەوە، لە جگە لەوی، هەر شتێک لێی بپاڕێنەوە، دەزانێ چییە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ (ما)یەکە بۆ لابردن (نّفي) بێ، واتە: خوا بە دڵنیایی دەزانێ کە هەرچی لێی دەپاڕێنەوە، بوونی نیە، واتە: ئەو بوونەی نیە کە لە خەیاڵی ئەوان دا هەیە، کە بە دەنگیانەوە بێ و، شایستەی هاوار تێبەستن و، پشت پێبەستن و، داوالێکردن بێ، ئەگەرنا بوونی ڕواڵەتیی و ڕووکەشییان هەیە وەک ئەستێرەیە، مانگە، خۆرە، ئێسک و پرووسکیی مردووێکە، یان زیندووێکە، یان پەلەوەرێکە، یان دارو بەردێکە، پەیکەرێکە، ئەوانە وەک پەیکەر بوونیان هەیە، بەڵام وەک ئەوەی کە ئەوان خەیاڵیان کردوەو، لە وەهمی ئەواندا هەیە، کە ئەوان پەرستراون و داواکارییەکانیان جێبەجێ دەکەن، وەک ئەوە بوونیان نیە.

٥)- ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بە دڵنیایی خواش زاڵی کارزانە.

٦)- ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴾، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایان لێیان تێدەگەن، لێرەدا خوا وێنەی بە جاڵجاڵۆکە هێناوەتەوە، لە سوورەتی (البقرة)دا بە مێشوولەو، لە سوورەتی (الحج)دا بە مێش، یانی: ئەو وێنانە دێنینەوە، بە زیندەوەران و بە شتی دیکە، بەڵام تەنیا زانایان لەو وێنە هێنانانەوانە تێدەگەن، واتە: بەس ئەوانەی زاناو شارەزان، لە وێنە هێنانەوەکانی قورئان، وەک پێویست حاڵیی دەبن و، لە مەبەستەکەیان تێدەگەن، دەنا هەموو کەس لە ڕواڵەتەکەیان حاڵیی دەبێ، بەڵام حیکمەت و ئامانج و مەبەست لەو وێنە هێنانەوەیە، دیوی نێوەوەی و ئەو ئامانجەی لە پشتیەوە شێردراوەیە، چییە؟ ئەوە زانایان تێیدەگەن.

٧)- ﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونەدی، واتە: بە هەوەنتەو بێ حیکمەت نەهێتراونەدی، ئنجا ئایا ئەو هەقە بریتیە لە چی؟ لە سوورەتی (الجاثية)دا ڕوونیکردۆتەوە: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق، (بە ڕاستیی و بە حیکمەت هێناونەدی، ئنجا ئایا هەقەکە بریتیە لە

چی؟) تاكو هەر كەسێک بەوەی كردوویەتی سزا یان پاداشت بدرێتەوە، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بكرێ.

شایانی باسە: ئێمە لە سوورەتی (یونس) لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٥)دا باسێكی سەربەخۆمان لەو بارەوە كردوەو، هەموو ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا ئەو ڕاستییە دەخەنەڕوو، كە لە دەوری پازدە شوێن لە قورئاندا ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو، زۆریش ڕاستییەكی گەورەو گرنگە، كە ئەم گەردوونە بە هەق دروستكراوە، ئەم گەردوونە حیكمەت لە هێنانەدیدا هەیەو، مرۆڤ بە هەوەنتە لێرە دانەنراوە، ئەم ڕاستییە لە دەوری پازدە شوێنی قورئاندا جەختی لەسەر كراوەتەوە.

٨)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانەیەكی مەزن هەیە بۆ بڕواداران.

# چەند زانیارییەک لە بارەی
# جاڵجاڵۆکەوماڵەکەیەوە

١- جاڵجاڵۆکە زیندەوەرێکە کە بە گشتیی هەشت پێی هەن و، بیست هەزار (٢٠,٠٠٠) جۆر زیاترە[1].

٢- جاڵجاڵۆکە وێڕای ئەوەی کە ڕستن و چنینی هەیە، وێڕای ئەوەی کە ڕستەر (غَزَّال)ە و چنەر (نَسَّاج)ە، هەم دەڕێسێ و هەم دەچنێ، وەستا (بَنَّاء)یشە، یەکێک لە زانایان لەو بارەوە گوتوویەتی: (لَوِ اجْتَمَعَ كُلُّ غَزَّالٍ ونَسَّاجٍ فِي الدُّنْيَا، وقُوبِلَ صِناعاتُهُم بِصِنَاعَةِ العَنْكَبُوتِ، لَفَاقَ الثَّانِي الأَوَّلِينَ وَالآخرِين)[2].

واتـە: ئەگـەر هەرچـی ڕستەرو چنـەر هەیـە، (ئەوانـەی کـە دەڕێسـن و دەچنـن)، هـی دنیـا هەمـوو کۆببنـەوەو، پیشەسـازییەکانیان، بەرهەمەکانیـان بـەراورد بکرێـن لەگـەڵ ئـەوەدا کـە جاڵجاڵۆکـە دەیچنـێ و دەیڕێسـێ، ئـەوەی جاڵجاڵۆکـە پێـش هەموویـان دەکەوێتـەوە.

یـانی: هەرچـی چنـەرو ڕێسـەر هەیـە لـە دنیـادا، هەمـوو بەرهەمەکانیـان لەگـەڵ هـی جاڵجاڵۆکـەدا کۆبکرێتـەوەو بـەراورد بکـرێ، هـی جاڵجاڵۆکـە لـە هەموویـان وردەکاریـی زیاتـری تێدایـە!

---

(١) هەڵبەتـە ئـەو سـەرچاوەیەی مـن لێـم وەرگرتـوە وایگوتـوە، کـە هەتـا زیندەوەرزانـی بـەرەو پێشـەوە بچـێ و زانایـان زانیارییـان فراوانـتر بـێ، لـە بـارەی زیندەوەرانـەوە ڕەنگـە جۆرەکان زیاتـر بکـەن، یەکیان دەڵێ: بیسـت هـەزار (٢٠,٠٠٠) یەکـی دی دەڵێ: نەخێـر سـەد هـەزار (١٠٠,٠٠٠) جـۆر جاڵجاڵۆکـە هەیـە، مەبەسـتم ئەوەیـە ئـەو ژمارانـە، زیاتـر بـە شـێوەی نزیکخراوەیـی و بـە شـێوەی مەزەنـەن.

(٢ ) الجواهر في تفسير القرآن الكريم: ج١٤، ص١٦٤-١٦٥.

٣- جاڵجاڵۆكە بە ڕێكترین شێوەی ئەندازەیی (هندسي)ی ماڵەكەی خۆی دروست دەكات، كە زیاتر حاڵەتی شەش پاڵوویی هەیە، وەک هی هەنگ و بە قەدەر نووكی دەرزیی هەڵەو كەم و كوڕیی لە دروستكراوی جاڵجاڵۆكەدا نیە، ڕیسەكەشی لیكی نێو زاریەتی و، لە هەزاران كونەوە ماددەیەكی لینج دێتە دەرێ، دوای ئەوەی هەوای پێكەوت، ڕەق دەبێ و دەبێتە دەزوو، ئنجا بە شێوەیەكی هەندەسیی وا دروستی دەكات، نارێكیی تێدانیە.

٤- دەزووی جاڵجاڵۆكە چوار (٤) تاڵە، هەر تاڵێكیان لە هەزار (١٠٠٠) تاڵی باریكتر پێكدێ، واتە: چوار جارانی هەزار (٤ ×١٠٠٠) = چوار هەزار (٤٠٠٠)، ئنجا ئەگەر چوار ملیار داوی جاڵجاڵۆكە پێكەوە بن، هێندەی تاڵە موویەكی ڕیش ئەستوور نین، یانی: چوار هەزار جارانی چوار ملیار (٤٠٠٠×٤،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)= (١٦،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) شازدە تریلیۆن داوی جاڵجاڵۆكە كۆبكرێتەوە لە داوە وردەكانی كە دوایی دەزووەكەی پێک دێنن، چونكە هەر دەزووەكی جاڵجاڵۆكە لە چوار هەزار (٤٠٠٠) تاڵی باریكتر پێكدێ، ئنجا هەموویان بە قەدەر تاڵە موویەكی ڕێش ئەستوور نابن، هەر كامێک لەوانەش لەو دەزووانە لە كونێكەوە لە جەستەی جاڵجاڵۆكە دێتەدەر، كە لە ئەصڵدا ماددەیەكی لینجە، دوایی كە بای بەر دەكەوێ، وشک دەبێ و دەبێتە ئەو دەزووە پتەوە!!

٥- دەزووی جاڵجاڵۆكە لە پۆڵا بەهێزترە، بگرە بەهێزترین ماددەیە تاكو ئێستا دۆزرابێتەوەو، پۆشاكی دژی گولله لەسەر تەقلیدی داوی جاڵجاڵۆكە دروست كراوە، یانی: ئەگەر پۆڵا بە قەبارەی دەزووی جاڵجاڵۆكە باریک بكرێتەوە، دەزووی جاڵجاڵۆكە زۆر بەهێزترە لە پۆڵا.

٦- جاڵجاڵۆكە چەندان جۆرە زیندەوەری زیانبەخش دەخوات، كە ژمارەیان لە ملیۆنێک (١،٠٠٠،٠٠٠) جۆر زیاترە، واتە: جاڵجاڵۆكە وەنەبێ بەس تەون بڕێسێ و تەواو، بەڵكو زیاتر لە ملیۆنێک جۆر زیندەوەری زیانبەخش دەخوات، كە ئەو ماڵەی دروستی دەكات و ئەو تەونەی ڕایدەهێڵێ، دەیچنێ و دەیڕێسێ، ئەوە تەڵەو داوەو زیندەوەرەكان پێوەی دەبن، ئەویش دوایی وردە وردە دەچێ تەڕاییەكەیان دەمژێ و، لەو تەڕاییەی دەیمژێ، دووبارە دەزووی دیكە دروست دەكات.

**٧- بۆچی خوا دەفەرموێ: ماڵی جاڵجاڵۆكە بێهێزترین ماڵە؟ خانووەكەی بێهێزترین خانووە؟**

أ- لەبەر ئەوەی ماڵی جاڵجاڵۆكە هیچ شتێك ناگێڕێتەوە، نە سەرما، نە گەرما، نە مەترسیی.

ب- لە نێو ماڵی جاڵجاڵۆكەدا ئاژاوەیەكی زۆر بێڕەزا هەیە، ئاژاوەو ئاشووبێكی گەورەی تێدایە، مێیەكە نێرەكە دەخوات، بەچكەكانیش یەكدی دەخۆن، یانی: لە نێو ماڵی جاڵجاڵۆكەدا ئەصڵەن خۆشیان سەلامەت نین، دیارە هەر زیندەوەرێكیش پەنا بەرێ بۆ ماڵی جاڵجاڵۆكە، بە تەڵەو داوی جاڵجاڵۆكەوە دەبێ، جاڵجاڵۆكە دوایی وردە وردە دەچێ دەیمژێ، هەتا دەیكات بە كەلەشێكی وشكهەڵاتوو، ئەگەر تەماشا بكەن، ماڵی جاڵجاڵۆكە كوللەو مێشوولەو پەپوولەو مەگەزەكانی پێوەن، بەڵام هەركامێكیان كە ڕایدەوەشێنی، تەنیا كەلەشێكی بۆشە، چونكە هەرچی تەڕایی تێیدایە، مژیویەتی و هەمووی دەكاتە ئەو لیكەو، تەون و داوی دیكەی پێ دروست دەكات.

٨- شایانی باسە: مێینەی جاڵجاڵۆكەیە كە تەونەكە دەچنێ، هەروەك خوا دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾، وەك چۆن مێیەی شێر ڕاو دەكات، نێرەكەی تەنیا پاسەوانیی شوێنەكە دەكات و، نایەڵێ دوژمن و ئاژەڵی دیكە بێنە ئەو شوێنە، بە هەمان شێوەش مێیەی جاڵجاڵۆكەیە كە خانووەكە دروست دەكات، نەك نێرەكەی، هەر بۆیەش مێیەكە دوای ئەوەی لەگەڵ نێرەكەدا جووت دەبێ، یەكسەر نێرەكە دەخوات و، بەچكەكانیش كامیان بۆی بكرێ، ئەوی دیكە دەخوات[1].

---

(١) ئەو زانیاریانەم لە: (تفسیر الجواهر: ج١٤، ص١٦٥-١٧٩) كە ئەو زۆر بە تەفصیل شتی باس كردوە، هەروەها (تفسیر النابلسي: ج٧، ص٥١)، و هەندێك سەرچاوەی دیكەش وەرگرتوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمان کردن بە پێغەمبەری خوا، کە کتێبی خوا بخوێنێتەوەو، نوێژ بەرپا بکات، نوێژی ڕاستەقینەش خاوەنەکەی لە هەرچی قسەو کرداری دزێوو خراپە دەگێڕێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ  ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، ئەوەی لە کتێب بۆت سروشکراوە، بیخوێنەوە، واتە: بۆ خۆت بیخوێنەوە، یان بەسەر خەڵکدا بیخوێنەوە، یاخود: خۆشت بیخوێنەوەو بەسەر خەڵکیش دا بیخوێنەوە.

٢)- ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژیش بەرپابکە.

نوێژ بەرپا کردن (إقامةُ الصَّلاة) یانی: بەو شێوەیە کە خوا فەرزی کردوە، ئەنجام دەدرێ، چونکە شتێک کە ڕادەوەستێنرێ، باشترین حاڵەت و دیمەنی سروشتیی خۆی وەردەگرێ، واتە: نوێژ بەو شێوەیەی خوا فەرزی کردوە، جێبەجێی بکە.

٣)- ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾، بە دڵنیایی نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات و دەگێڕێتەوە لە هەرچی گوناهو خراپەیە، لە هەرچی قسەو کردەوەی ناقۆڵاو ناشیرین و دزێوەو، لە هەرچی قسەو کردەوەی خراپ و زیانبەخشە، (إِنَّ)، لێرەدا لە شوێنی (فاء التعلیل)ە، یانی: (فَالصَّلاةُ تَنْهى عَنِ الفَحْشَاء والمُنْكَر) بۆیە نوێژ بکە، چونکە نوێژ خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە هەرچی کردارو قسەی ناشیرین و خراپ و زیانبەخشە.

٤)- ﴿ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾، بە دڵنیاییی یادی خواش گەورەترە.

أ- واتە: یادی خوا، کە جەوهەرو نێوەڕۆک و کاکڵی نوێژە، گەورەترە لە هەموو شتێک.

ب- یاخود: یادی خوا، کە لە نێو کتێبەکەیدا هەیە، لە نێو قورئاندا هەیە، لە هەموو شتێک گەورەترە.

جـ- یاخود یادی خوا ﷻ کردن لە هەموو شتێک گەورەترە، وەک خوا نوێژیشی بۆ ئەوە فەڕز کردوە، کە ئینسان یادی خوا بکات ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾طه.

د- یاخود یادی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی گەورەترە لە یادکردنی ئەوان بۆ خوا، هەروەک چۆن خوا ﷻ لە فەرموودەیەکی قودسییدا دەفەرمووێ: {وَإِذَا ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ خَيْرٍ مِنْهُ}، (أخرجه البخاري: ٦٩٧٠، ومسلم: ٢٦٧٥).

واتـە: ئەگـەر مـرۆڤ لـە نێـو کۆمەڵێـک مرۆڤـدا یـادم بـکات، مـن لـە نێـو کۆمەڵێکـدا یـادی دەکـەم، کـە چاکـترن لـەو کۆمەڵـەی خـۆی، (کـە فریشـتە زۆر لـە خـوا نیزیکەکانــن).

٥)- ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾، بە دڵنیاییی خواش دەزانێ چی دەکەن، چی دەکەن بە لێزانیی، بە کارامەیی و وردەکاریی، چونکە وشەی (صَنُع) وەک پێشتر باسمان کرد یانی: کرداری لێزانانەی پڕ وردەکاریی و کارامانە.

## کورتە باسێک لە بارەی نوێژەوە[1]

بەڕێـــــزان!

لێرەدا کورتە باسێک لە بارەی نوێژەوە دەخەینەڕوو، لە حەوت تەوەردا:

### یەکەم: نوێژ چییە؟

#### أ- لەڕووی زمانەوە:

لە زمانی کوردییدا نوێژ لە بەرانبەر (صلاة)ی عەرەبییدا دانراوە، واشپێدەچێ: وشەی نوێژ وشەیەکی لەمێژینەو کۆن بێ لە زمانی کوردییدا، چونکە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نوێژ یەکێکە لەو خواپەرستییانەی، کە لە بەرنامەکانی سەرجەم پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوادا هەبووە، ئنجا وادیارە گەلی کوردیش وەک تێکڕای گەلانی دنیا، بەر لە هاتنی ئیسلامییش بۆ کوردستان، جۆرێک یان زیاتریش ئایین و بەرنامەی خوای لە نێودا بووبێ و، گەلێکی خواپەرست و دیندار بووەو، خوا پەرستییەکانی وەک نوێژو ڕۆژووی هەر ئەنجام داون.

وشەی (صلاة) کە وشەیەکی عەرەبییە، زانایان ئاوایان پێناسە کردوە:

١- (راغب الأصفهاني) لە (مُفردات ألفاظ القُرآن)دا دەڵێ: (الصَّلاةُ قَالَ كَثِيرٌ مِن أَهْلِ اللُّغَةِ: هِيَ الدُّعَاء والتَّبْرِيكُ وَالتَّمْجِيدُ، يُقَالُ: صَلَّيْتُ عَلَيْهِ أَي: دَعَوتُ لَهُ)، واتە: زۆر لە شارەزایانی زمان گوتوویانە: نوێژ بریتیە لە پاڕانەوەو بە پیرۆز گرتن و بە پایەبەرز دانان، دەگوترێ: (صَلَّيْتُ عَلَيْهِ) واتە: بۆی پاڕامەوە.

---

[1] ئەم کورتە باسەمان بە کوشین و دەستکارییەوە لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت دا) بەناوونیشانی: (نوێژ بەرپاکردن: یەکەمین دروشمی خواپەرستیی) وەرگرتوە.

٢- (النووي) بۆ پێناسەی (صلاة)، له (المَجموع شَرحُ المُهَذَّب)[1]دا.

٣- هەروەها هەمان شت (الشوكاني)یش دەیهێنێ له (نیل الأوطار)دا [2]، گوتوویانه: (الصَّلاةُ فِي اللُّغَةِ: الدُّعَاء، وَسُمِّيَتِ الصَّلاةُ الشَّرعِيَّةُ صَلاةً لِاشْتِمَالِها عَلَيْهِ، هذا هُوَ الصَّحِيحُ، وَبِهِ قَالَ الجُمْهورُ مِنْ أَهْلِ اللُّغَة وغَيْرُهُم مِن أَهْلِ التَّحْقيق).

واتـه: (صـلاة) لـه زمانـدا پاڕانەوەیـه بۆیـه نوێـژی شـەرعیی بـەو نـاوه ناونـراوه، چونکـه نوێژیـش پاڕانـەوەی لـه نێـو خۆیـەوه گرتـوه، ئەمه قسـەی ڕاسـت و دروسـتەو جەمـاوەری زانایانـی زمانـزان و باقـی لێکۆڵەرەوانـی دیکـەش هـەر وایـان گوتـوه.

٤- هەروەها (ابن منظور)یش له (لسانُ العرب)دا، ئەوەی ئەوان گوتوویانه، به تەعبیرێکی دیکه دووبارەی دەکاتەوه.

ب- لەڕووی زاراوەییەوه:

زانایانی شەرعزان ئاوا پێناسەی نوێژ دەکەن:

(الصَّـلاةُ: عِبَـادَةٌ تَتَضَمَّـنُ أَقْوالاً وأَفْعَـالاً مَخْصُوصَـةً، مُفْتَتَحَـةً بِتَكْبِـيرِ اللـهِ تَعـالى مُخْتَتَمَةً بِالتَّسْـليم)[3]، واتـه: نوێـژ خـوا پەرسـتییەکه چەنـد قسـەو کردەوەیەکـی تایبەتیـی تێـدان، کـه بـه (أَللَّـهُ أَكْبَر) دەسـت پـێ دەکات و، بـه سـەلامدانەوه کۆتایـی دێ.

## دووەم: پلەو پایەی نوێژ:

دەتوانیـن لـه بـارەی پلـەو پایـەی نوێـژەوه زۆر شـت بڵێیـن، بـەڵام لـه هـەژده خـاڵان دا بـه کورتیـی، ئـەوەی بەپێویسـتیی بزانیـن بـاسی دەکەیـن:

---

(١) ج٣، ص٣.

(٢) ج١، ص٣٦٠.

(٣) له زۆربەی کتێبه فیقهییەکاندا، ئەم پێناسەیه هاتوه.

١- نوێژ گەورەترین دروشم و بنچینەی ئیسلامەو، بەرزترین و مەزنترین جۆری خواپەرستییە، لە خواپەرستییە تایبەتییەکان، وشەی (صلاة) بە هەموو سیغەکانیەوە نەوەدو نۆ (٩٩) جار لە قورئاندا هاتوە، واتە: بە ژمارەی ناوەکانی خوا ﷻ: [إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا] (أخرجه البخاري: ٦٠٤٧، ومسلم: ٢٦٧٧).

٢- نوێژ تاکە خوا پەرستییەکە کە لە هیچ حاڵەتێکدا چوواندن و نەکردنی دروست نیە، بە ساغیی و بە نەخۆشیی، بە دەوڵەمەندیی و بە نەداریی، لە کاتی جەنگ و لە کاتی ئاشتیی دا، لە سەفەر بێ، یان لە ماڵ، سەرما بێ یان گەرما، سوار بێ، یان پیادە بێ، دەبێ مرۆڤ نوێژەکەی هەر بکات.

٣- خوای پەروەردگارو پەنهانبین، نوێژی لەگەڵ هەرکام لە: زیکرو زەکات و صەبرو قوربانیی سەربڕیندا، باسکردوە:

١- دەفەرموێ: ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾الأعلى.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾البقرة.

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴿٤٥﴾ ﴾البقرة.

٤- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾الكوثر، کەواتە: باسی نوێژ لەگەڵ زیکرو زەکات و، ئارامگریی و، قوربانیی سەربڕیندا هاتوە.

٤- خوای زاناو وردبین ﷻ حوکمی خۆڕانەگریی و هەڵپەیی بەسەر تێکڕایی ئینسانەکاندا داوە، بێجگە لە نوێژکەران، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ﴾المعارج، واتە: مرۆڤ خۆڕانەگرو بە هەڵپە خوڵقێنراوە، کاتێک خراپەیەکی تووش دێ، زۆر نارەحەت دەبێ، کاتێکیش خۆشییەکی تووش دێ، لە خۆیدا حەپسی دەکات، جگە لە نوێژکەران.

٥- خوا لە پێناسەکردنی بڕواداران دا، لە سەرەتاو کۆتایی خەسڵەتەکانیان دا، نوێژی باسکردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ

(٢) ﴾المؤمنون، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾المؤمنون، خوا پێناسەی بڕواداران دەكات، یەكەمین سیفەتیان ئەوەیە لە نوێژەكانیاندا بۆ خوا ملكەچن، هەروەها كۆتا سیفەتیشیان ئەوەیە كە پارێزگاریی لە نوێژەكەنیاندا دەكەن.

٦- خوای دادگەر هەڕەشەی زۆر توندی لەو نوێژكەرانە كردوە، كە لە نوێژەكانیاندا كەمتەرخەمن، بێئاگان لە نوێژەكانیاندا: ﴿ فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾الماعون، واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژكەرانەی، لە نوێژەكانیان بێئاگان.

بێگومـان لـە نوێژەكانیـان بێئـاگان، جیایـە لـە لـە نوێژەكانیانـدا بێئـاگان، واتـە: ئەوانــەی نوێــژ دەكــەن، بــەڵام نازانــن نوێژەكەیــان چــی پێكوتــن! بەرهەمەكانــی نوێژەكانیـان ناچننـەوە، بـەڵام ئەگـەر فەرمووبـای: (الَّذِيـنَ هُـم فِي صَلاتِهِـم سَـاهُون) واتـە: ئەوانـەی لـە نوێژەكانیانـدا بێئـاگان، ئـەوە كـەم كـەس سـەلامەت دەبـوو، بـەڵام خـوا واینەفەرمـووە، واتـە: مەبەسـت پێـی ئەوانـە نیـە كە لـە نوێـژدا دڵغـەو خەیاڵیان دەڕوا، كـە بـە دڵنیایـی مسـوڵمانان كـە نوێـژ دەكات دەبێ دڵـی ئامـادە بێ و، دڵغەو خەیاڵـی بەمـلاو لادا نەچـێ، بـەڵام خـوا نەیفەرمـووە: (فِي صَلاتِهِـم سَـاهُون) بەڵكـو فەرموویەتـی: ﴿ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾الماعـون، لـە نوێژەكانیـان بێئـاگان، واتـە: هەقـی پێنـادەن و ئـەو بەرهـەم و دەرهاویشـتە باشـانە ناچننـەوە، كـە پێویسـتە نوێـژ لەوانیـان دا بێنێتـەدی.

٧- نوێژ نەكردن و بە زایەدانی، بە یەكەمین خەسڵەتی خراپی ئەو پاشینە بەدە دانراوە كە لە دوای پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) واز لە ڕێبازەكەیان دێنن و، دەكەونە دوای هەواو ئارەزووەكانیان، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ ﴾مریم، پێشتر باسی پێغەمبەران دەكات دوایی دەفەرموێ: پاشینێكی خراپیان لێوەپاش كەوتن، (لە دوای وان هاتن،) نوێژیان زایە كردو، شوێن ئارەزووەكان كەوتن، لەمەودوا تووشی بێمرادیی دێن.

٨- پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە کۆڵەکەی مسوڵمانەتیی داناوە، وەک لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: {**وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ**} (**أخرجه أحمد: ٢٢٠٦٩، والترمذي: ٢٦١٦، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٣٩٧٣، والحاكم: ٣٥٤٨، وقال: صحيح على شرط الشيخين، وَصَحَّحَهُ الألباني**).

واتە: کۆڵەکەی دینداریی و مسوڵمانەتیی نوێژە.

٩- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژ یەکەمین شتە، کە بەندەکانی خوای لەسەر دادگایی دەکرێن لە ڕۆژی دوایی دا، ئنجا ئەگەر لە نوێژەکەیدا چاک بێ، ئەوە سەرجەم کردەوەکانی دیکەشی باش دەبن و ڕزگاری دەبێ، ئەگەر خراپیش بێ، ئەوە کردەوەکانی دیکەشی خراپ دەبن و خەسارەتمەندو ڕەنج بە خەسار دەبێ، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ، فَإِنْ صَلَحَتْ، فَقَدْ أَفْلَحَ وأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ، فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ**} (**أخرجه الترمذي: ٤١٣، وقال: حسن غريب، والنسائي: ٤٦٥، وابن ماجه: ١٤٢٥، وَصَحَّحَهُ الألباني**).

١٠- نوێژ دواپین دیاردەی ئیسلامەتییە کە لەنێو دەچێ و نامێنێ، واتە: کاتێک نوێژ کردن نامێنێ، کە ئایین هیچی لێ نەمابێ و بنبڕ کرابێ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّ أَوَّلَ مَا تَفْقِدُونَ مِنْ دِينِكُمَ الأَمَانَةَ، وَآخِرُ مَا تَفْقِدُونَ الصَّلاَةَ**} (**أخرجه الخرائطي في مكارم الأخلاق، ص ٧٢، رقم: ١٧١، عن أنس وَصَحَّحَهُ الألباني في السلسلة الصحيحة: ١٧٣٩**).

واتە: یەکەمین شتێک کە لە دینی خۆتاندا لە دەستی دەدەن، بریتیە لە دەستپاکیی و ئەمینیی و، دوایین شت کە لە دینەکەتان نامێنێ، بریتیە لە نوێژ.

١١- نوێژ یەکەمین خواپەرستییە کە لەسەر مسوڵمانان پێویست کراوەو، تەنیا خواپەرستییەکیشە کە لە ئاسمانێ و لەکاتی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (**الإسراء والمعراج**)ی پێغەمبەری ﷺ کۆتایی دا، فەرز کراوە، وەک گوتراوە: {**فُرِضَتِ الصَّلاةُ عَلى النَّبِيِّ ﷺ لَيلَةَ أُسْرِيَ بِهِ**} (**أخرجه عبد بن حميد في مسنده: ٩٥٧، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ**).

واتە: نوێژ لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەو شەوەدا کە شەوڕۆیی پێکرا، فەرز کرا.

١٢- دۆزەخییەکان لە وەڵامی بەهەشتییەکان دا کە لێیان دەپرسن: چ شتێک بوو بووە مایەی هاتنە نێو دۆزەختان؟ یەکەمین شت دەڵێن: لە نوێژکەران نەبووین: ﴿ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ ﴾المدثر، واتە: ئیمانداران کە بە دەستی ڕاست نامەی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە، لە دۆزەخییەکان دەپرسن: چ شتێک ئێوەی خستە نێو ئاگری دۆزەخ (سقر)؟ دەڵێن: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین، واتە: تاوانباران نوێژ نەکردن بە یەکەمین هۆی چوونە دۆزەخیان دادەنێن، کەواتە: بە پێچەوانەوەش: نوێژ یەکەمین و سەرەکییترین هۆی چوونە بەهەشتی بڕوادارانە.

١٣- لە چەندان دەقی قورئان و سوننەتدا، لە دوای ئیمان و خوا بەیەکگرتن، ڕاستەوخۆ باسی بەرپاکردنی نوێژ کراوە، وەک لە سوورەتی (المؤمنون)دا هاتوە: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: بەڕاستیی ئەو بڕوادارانەی کە لە نوێژەکانیاندا بۆ خوا ملکەچن، سەرفرازن، لە سووڕەتی (التوبة)ش دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾ ، هەرکات (چوار) مانگە جەنگ تێدا قەدەغەکراوەکان تەواوبوون، دژی هاوبەشدانەرەکان بجەنگن و بیانگرن و ئابڵوقەیان بدەن و، لە هەر بۆسەیەکدا بۆیان دابنیشن، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە بۆ لای خوا و، نوێژیان بەرپا کردو زەکاتیان دا، وازیان لێبێنن.

پێغەمبەریش ﷺ کاتێک کە نوێنەرەکانی خۆی بەملاولادا دەنارد بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی بۆ ئیسلام، پێی دەفەرموون: لە دوای ئیمان و شایەتمان، بانگیان بکەن بۆ ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکان، بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ: «إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ } (أخرجه البخاري: ١٤٢٥).

واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـباس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبــەر ﷺ کاتێـک موعـازی کـوڕی جەبــەلی نـارد بـۆ یەمــەن، پێـی فەرمـوو: تـۆ دەچـی بـۆ لای کەسـانێک کـە خاوەنـی کتێـبن، بـا یەکەمیـن شـتێک کـە تـۆ ئەوانـی بـۆ بانـگ دەکـەی، شـایەتمان هێنـان بـێ، بـەوە کـە جگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، موحەممەدیـش ﷺ ڕەوانەکـراوی خوایـە، ئنجـا ئەگـەر گوێڕایەڵییـان کـردی لـەوەدا، پێشـیان ڕابگەیەنـە کـە خـوا پێنـج نوێـژی لـە شـەوو ڕۆژیانـدا لەسـەر فـەرز کـردوون.

١٤- نوێژ تاکە خواپەرستییەکە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان بە ئینسانی مسوڵمان کردوە، کە هاوسەرو منداڵەکانی خۆی وادار بکات بە ئەنجامدانی و ئامۆژگارییان بکات: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ١٣٢ ﴾طه، واتە: فەرمان بە ماڵ و خێزانت بکە بە نوێژو، خۆشت ڕابگرە لەسەر ئەنجامدانی نوێژ.

هەروەهـا پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: [مُـرُوا أَوْلادَكُـمْ بِالصَّـلاةِ وَهُـمْ أَبْنَـاءُ سَـبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُـمْ عَلَيْهَـا، وَهُـمْ أَبْنَـاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُـوا بَيْنَهُـمْ فِي المَضَاجِـعِ] (أخرجـه أحمـد: ٦٦٨٩، وابـن أبي شـيبة: ٣٤٨٢، وأبـو داود: ٤٩٥))، واتـە: منداڵەکانتـان فەرمـان پێبکـەن بـە نوێـژ، کاتێـک گەیشـتن بـە تەمەنـی حـەوت سـاڵان، (ڕایانبهێنـن،) کـە گەیشـتنە دە سـاڵ و نەیانکـرد، لێیـان بـدەن، (یـانی: زبرییـان لەگـەڵ بنوێنـن، مەبەسـت ئـەوە نیـە فەلاقەیـان بکـەن، بـەڵام گوێـی ڕاکێشـە، بـا دڵنیـا بـێ کـە تـۆ زۆرت مەبەسـتە)و، جێـگای خەوتنیشـیان لێـک جیـا بکەنـەوە.

١٥- نوێژ بە دروشم و نیشانەی مسوڵمانەتیی و، سنووری نێوان ئینسانی مسوڵمان و ئینسانی کافر دادەنرێ، وەک پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: [إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ، تَرْكَ الصَّلَاةِ] (أخرجه مسلم: ٨٢ عن جابرٍ رضي الله عنه)، واتە: لە نێوان پیاوو هاوبەشدانان و کوفردا، واز هێنان لە نوێژە، (کەسێک وازی لە نوێژ هێنا، دەچێتە نێو بازنەی کوفرەوە).

١٦- هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ)، هیچ کردەوەیەکیان بە کوفر نەدەزانی، جگە لە وازهێنان لە نوێژ، وەک شەقیقی کوڕی عەبدوڵڵا کە یەکێکە لە

زانایانی تابیعین دەڵێن: [ كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ لاَ يَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلاَةِ] (أخرجه التِّرمِذِيُّ: ٢٦٢٢، وصححه الألباني)، واتە: هاوەڵانی موحەممەد ﷺ وازهێنانی هیچ کام لە کردەوەکانیان بە کوفر دانەدەنا، جگە لە وازهێنان لە نوێژ.

١٧- لە نوێژدا گەورەترین و ئەوپەڕی شێوەی بەندایەتیی و گەردنکەچیی ئەنجام دەدرێ بۆ خوا ﷻ، کە بریتیە لە چوونە ڕکووع و کڕنووش بردن، خوا ﷻ لە بارەی یەکەمیانەوە لە میانی باسکردنی هۆی کەوتنە نێو دۆزەخی تاوانبارانەوە، فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ارْكَعُوا لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾المرسلات، واتە: کاتێک پێیان بگوترێ: بچنە ڕکووع، ڕکووع نابەن، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت بۆ ئەوانەی ئایینی خوا بە درۆ دادەنێن.

هەروەها لە بارەی سەجدە نەبردنەوە، کە دیسان بە هۆکاری چوونە نێو دۆزەخ و زەبوون بوونی کافرەکانی داناوە، فەرموویەتی: ﴿ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا يُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ وَهُمْ سَالِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾القلم، واتە: لەو ڕۆژەدا بێبڕوایان بانگ دەکرێن بۆ کڕنووش بردن، بەڵام نایتوانن، چاوەکانیان پڕ ترس و لەرزن و، زەبوونیی دایاندەپۆشێ، پێشتریش بانگدەکران بۆ سەجدە بردن، کە ئەو کاتە سەلامەت بوون (واتە: لە دنیادا، بەڵام سەجدەیان نەدەبرد).

١٨- لە نوێژدا گەورەترین سوورەتی قورئان کە فاتیحەیە دەخوێنرێ، چونکە (أَبِي سَعِيدِ رَافِعِ بنِ المُعَلَّى) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئایا بەر لەوەی لە مزگەوت بچیە دەرێ مەزنترین سوورەتی قورئانت فێربکەم؟ پاشان دەستی گرتم، ئنجا کاتێک ویستمان بچینە دەرێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ فەرمووت: کە مەزنترین سوورەتی قورئانت فێر دەکەم، فەرمووی: [الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، هِيَ السَّبْعُ المَثَانِي وَالقُرْآنُ العَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ] (أخرجه البخاري: ٤٢٠٤)، فەرمووی: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾الفاتحة، (واتە: ئەو سوورەتەی کە بە (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) دەست پێ دەکات،) ئەوە بریتیە لە حەوت ئایەتە دووبارە کراوەکان و، ئەو قورئانە مەزنەی کە پێمدراوە.

## سێیەم: مەبەستی بەرپاکردنی نوێژ چییە؟

له چوار خاڵان دا وەڵامی ئەم پرسیارە دەخەینە ڕوو:

١- بە دڵنیایی خواپەرستیی ئاکە ئامانجی دروستکرانی مرۆڤە، ئاکە حیکمەتێک و ئامانجێکە پەیوەست بێ بە مرۆڤەوە، خوا مرۆڤی بۆ دروست کردبێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾الذاريات.

٢- بەبێ بەندایەتیی و خواپەرستیی، ئینسان لە ئینسان دەشۆرێ، ئینسان کاتێک بەندەی خوایە، ئەو مرۆڤە ڕێز لێگیراوەیە کە خوا ویستوویەتی و، کاتێک بەندەی خوا نامێنێ، دەبێتە کۆیلەی مرۆڤێکی وەک خۆی، یاخود کۆیلەی شتێک کە لە خوار خۆشیەوەیەتی و لە مرۆڤ بوون دەشۆرێ: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ ﴾التين، واتە: دوایی گێڕامانەوە بۆ پلەی ژێری ژێرەوە.

٣- تێکڕای پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَمُ) بۆ ئەوە نێردراون، خەڵکی فێری بەندایەتیی و خوا پەرستیی بکەن، کە نوێژ گەورەترین جۆری خواپەرستییە، بۆیە خوا فەرموویەتی: نوێژ بەرپا بکەن، بۆ ئەوەی چاکترین و گەورەترین جۆری خواپەرستیی لە خۆماندا بەرجەستە بکەین.

٤- بە بێ بەندایەتیی بۆ خواو پەرستنیی، شەیتان زەفەرمان پێ دەبات و پێی ناوێرین، ئنجا مادام نوێژ یەکێک بێ لە جۆرەکانی خواپەرستیی، بەڵکو گەورەترین و بەرزترین جۆریشی بێ، دیارە ئامانج و مەبەستی ئەنجامدرانی ویش، هەر هەمان ئامانجی خواپەرستییە بە گشتیی.

خـوای پەروەردگاریـش بـە پێغەمبەرێکـی پایـە بـەرزی وەک مووسـا ﷺ ی فەرمـووە: ﴿ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ ﴾طـه، واتـە: بێگومـان بـەس مـن خـوام، جگـە لـە من پەرسـتراوی دیکـە نیـە، ئنجا بمپەرستەو نوێـژ بـۆ یادکردنـی مـن بەرپـا بکـە.

یانی: بابای نوێژکەر ئامانج و مەبەستی لە نوێژ کردنەکەیدا، پێشاندانی ملکەچیی و بەندایەتیی خۆیەتی بۆ خواو، سەلماندنی وەفاداریی و پابەندایەتییە، بە بەڵێن و پەیمانی بەندایەتییەوە، کە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بەستوویەتی.

هەروەها خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری سەروەرو بەڕێزمانی ﷺ فەرمووە: ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾الأنعام، واتە: بلێ: بێگومان من پەروەردگارم بەرەو ڕاستەڕێ ڕێڕوونیی کردووم، [یان: خستوومیە سەر ڕاستە ڕێ]، بەرنامەیەکی ڕاست و تەواوە، ڕێبازی بێخەوشی ئیبراهیمە، من لە هاوبەش بۆ خوادانەران نیم، بلێ: بێگومان نوێژم و، قوربانیی سەربڕینم و، ژیانم و مردنم، بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە، هاوبەشی نین و، هەر بەوەش فەرمانم پێکراوەو، من یەکەمینی مسوڵمانانم.

هەڵبەتە مەبەستم لێرەدا ئەوە بوو، کە هیچ کەس بە هەڵەدا نەچێ لەوەدا، کە ئامانج و مەبەستی نوێژ بەرپا کردن، لەگەڵ بەرهەم و سوودەکانیدا تێکەڵ بکات، دوایی ئێمە لە تەوەری حەوتەم و کۆتاییدا باسی بەرهەم و سوودەکانی نوێژ دەکەین، ئامانج و مەبەستی نوێژ بریتییە لە ئەنجامدانی بەندایەتیی بۆ خواو لە خۆدا بەرجەستەکردنی بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ، بەڵام بەرهەم و سوودەکانی نوێژ، ئەوانەن کە بێ ئەوەی مەبەستی بن، بۆ بابای نوێژکەر دەستەبەر دەبن و دێنە دی.

## چوارەم: حوكمی كردن و نەكردنی نوێژ:

ئـەم مەسـەلەیە توێژینەوەیەكی خەسـت و خۆڵـی دەوێ و، ئێمـە لـە سـەرچاوەی ئامـاژە پێكـراودا[1]، بـە تەفصیـڵ باسـمان كـردوە، بـەڵام لێـرەدا زۆر بـە كورتیـی چـوار خـاڵان دێنیـن و دەڵێیـن:

١- سەرجەم زاناو پێشەوایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە نوێژ كردن (واتە: پێنج نوێژە فەرزەكە) لەسەر هەر مسوڵمانێكی عاقڵ و باڵغ، نێر بێ یان مێ بێ، فەرزی تایبەتیی (**فرض العین**)ە، واتە: هیچ بیانوویەک و عوزرێک بۆ چوواندنی نوێژ قبووڵ ناكرێ و، پێویستە لە هەموو حاڵ و لە هەموو هەلومەرجێكدا بە گوێرەی توانا، نوێژ ئەنجام بدرێ (واتە: پێنج نوێژە فەرزەكە)و، دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

أ/ خوا دەفەرموێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾البقرة، واتە: پارێزگاریی لە ئەنجامدانی نوێژەكان بكەن و لە نوێژی نێوەڕاست بە تایبەت (كە هەندێک دەڵێن: نوێژی بەیانییەو هەندێک دەڵێن: نوێژی عەسرەو هەندێكیش دەڵێن: نیوەڕۆیە)و، بە گەردنكەچییەوە بۆ خوا بوەستن.

ب/ هەروەها خوا لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ ﴾النساء، واتە: نوێژ بەرپا بكەن، چونكە بێگومان نوێژ لەسەر بڕواداران لە چەند كاتێكی دیارییكراودا پێویستكراوە.

ج/ پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **{أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى الله تَعَالَى} (أخرجه البخاري: ٢٥، ومسلم: ٢٢، عن ابن عمر).**

واتـە: فەرمانـم پێكـراوە كـە لەگـەڵ خەڵكـی دا بجەنگـم، هەتـا شـایەدیی دەدەن (واتـە: ئەوانـەی كـە جەنـگ كـردن لەگەڵیانـدا ڕەوایـە) كـە جگە لـە خوا پەرسـتراوێكی

---

(١) بەرگـی دووەمـی خواپەرسـتیی ئیسـلامی: نوێـژ بەرپـا كـردن، لاپـەڕەكانی: (١١٦ - ١٥٣) بـۆ ئـەو بابەتەمـان تەرخانكـردوون.

دیکـە نیـەو، موحەممەدیـش ﷺ پێغەمبـەری خوایـەو نوێـژ بەرپـا دەکـەن و، زەکات دەدەن، ئنجـا ئەگـەر ئەوانەیـان کـرد، ئـەوە خوێـن و سـامانی خۆیانیـان لـە مـن پاراسـتوە مەگـەر بەهەقـی ئیسـلام -بەپێـی شـەریعەتی ئیسـلام مافێکـی کەوتبێتـە سـەر- و لێپرسینەوەشـیان لەسـەر خـوای بـەرزە، واتـە: هـەر کاتێـک ئەوانـەی لەدژیـان دەجەنگـم مسـوڵمان بـوون، کـە مسـوڵمان بوونەکەیـان لـە شـایەتمان هێنـان و، نوێـژ کـردن و، زەکات دانـدا خـۆی دەنوێنـێ، یـان لـە شـەڕو تەبابـوون، تەبابیەکەشیان لەچەنـد شـتێکدا بەرجەسـتە دەبـێ، وەك: دژی یەکـدی نەجەنـگان، هاوکاریـی دەوڵەتـی ئیسـلامیی کردن بەشـێوەیەك لـە شـێوەکان، سـەرانەدان...، (وەک لـە کتێبەکانـی سـیرەدا هاتـوە)، ئـەوە جەنـگ و کوشـتاریان دروسـت نیـەو، خوێنیـان نارێـژرێ و ماڵیـان ناکرێتـە دەسـتکەوت (غنیمـة).

٢- سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە هەر کاتێک ئینسان بەهۆی لەبیر چوون، یان خەوتن، یان بێهۆشیی، نوێژێک یان زیاتری بچێ، گوناهبار نابێ، بەڵام دەبێ دوایی بیگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا، فَإِذَا كَانَ الغَدُ فَلْيُصَلِّهَا عِنْدَ وَقْتِهَا﴾ (أخرجه مسلم: ١٥٩٤ واللفظ لهُ، الترمذي: ١٧٧، وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى: ١٥٨٢، وابن ماجه: ٦٩٨)).

واتـە: کەمتەرخەمیـی لـە خەوتنـدا نیـە، بەڵکـو کەمتەرخەمیـی (لـە بێدارییدایـە) لەوەدایـە کەسـێک کاتی نوێـژ کـردن هاتـوە، ئەنجامـی نـادات تاکـو کاتی نوێژێکـی دی دێ، ئنجـا ئەگـەر یەکێکتـان ئـەوەی کـرد، (نوێـژی لەبیـر چـوو، یـان لەبـەر خەوتـن لێـی فەوتـا) بـا هـەر کات هاتـەوە یـادی بیـکات، سـبەینێش بـا لـەکاتی خۆیـدا بیـکات.

هەروەهـا پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: ﴿مَـنْ نَـسِيَ صَـلَاةً، فَلْيُصَلِّهَـا إِذَا ذَكَرَهَـا، لَا كَفَّـارَةَ لَهَـا إِلاَّ ذَلِـكَ﴾ (أخرجـه البخـاري: ٥٧٢، ومسـلم ٦٨٤، وأبـو داود: ٤٤٢، والترمـذي: ١٧٨، وقـال: حسـن صحيـح، وابـن ماجـه: ٦٩٥) واتـە: هـەر کەسـێک نوێژێکـی لەبیـر چـوو، بـا کاتێـک هاتـەوە یـادی بیـکات، تەنیـا ئـەوە کەفـارەت و سـڕانەوەکەیەتی.

۳- تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە هەر کەسێک لە ڕووی:

أ- خۆبەزلگریی (کبر).

ب- یان بە سووک تەماشا کردن (إستخفاف).

جـ- یان بێڕێزیی پێکردن (إهانة).

د- یاخود بڕوا پێنەبوون (جحود).

هـ- یاخود پشتگوێ خستن و گرنگیی پێنەدان (الإعراض والإهمال)ەوە، نوێژێکی نەکرد، یان دەیکردو وازی لێهێنا، ئەوە لە هەر کام لەو حاڵەتانەدا، بە کافر لە قەڵەم دەدرێ و لە ئایین دەردەچێ، چونکە هەر کام لەو ڕەفتارانە، تەنیاو لە خودی خۆشیاندا ئینسانیان پێ کافر دەبێ، چ جای نوێژ نەکردنیشیان ئاوێتە ببێ و بێتە سەرباریان، لەو بارەشەوە دەکرێ زۆر بەڵگە بهێنرێنەوە، یەکێک لەوانە:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾البقـرة، یـاد بکـەوە! کاتێـک بـە فریشـتەکانمان فەرمـوو: کڕنـووش بـۆ ئـادەم بـەرن، هەموویـان کڕنووشـیان بـرد جگـە لـە ئیبلیـس، ئامـادە نەبـوو، خـۆی بـە زلگـرت و لـە کافـران بـوو.

هەروەهـا لـە بـارەی بـە کـەم تەماشـا کـردن و گاڵتـە پێکردنـی دیـن بـە گشـتیی و بـە تایبەتـی نوێـژەوە، خـوای کاربەجـێ لـە سـووڕەتی (المائـدة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەوانـەی ئایینەکەتـان بـە گاڵتـە دەگـرن و یاریـی وگەمـەی پێدەکـەن و، لەوانـەی کـە لـە پێـش ئێـوە کتێبیـان پێـدراوەو، لـە کافرەکان بـە دۆسـت مەگـرن و، پارێـز لـە خوا بکـەن ئەگەر بـڕوادارن، کاتێـک بانـگ دەکـەن بـۆ نوێـژ، گاڵتـەی پێدەکـەن و بـە گەمـەی دەگـرن، لـە بـەر ئـەوەی نافامـن.

هەروەها کەسێک کە هەق بزانێ و دانی پێدانەهێنێ، دیسان ئەوەش هەر کوفرە، وەک خوا ﷻ لە بارەی ئالی فیرعەونەوە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١٣ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤ ﴾النمل، واتە: کاتێک ئایەتەکانی ئێمەیان زۆر بە ڕۆشنیی بۆ هاتن، (وابوون کە بەرچاویان ڕۆشن بکەنەوە،) گوتیان: ئەوەش جادوویەکی ئاشکرایەو، نکووڵییان کرد لە نیشانەکانی ئێمەو، لە دڵی خۆشیان دا دڵنیابوون کە ڕاستن، تەماشا بکە بە هۆی ستەم و خۆ بەزلگرییەوە، سەرەنجامی تێکدەران چۆن بوو؟

٤- تێکڕای زانایان و پێشەوایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە پێویستە بابای نوێژنەکەر، یان نوێژ چوێنەر، سزا بدرێ، بەڵام لەسەر چۆنیەتیی سزادانەکەی، ڕایان جیایە، دوای ئەوەی لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە بابای نوێژنەکەر ئەگەر نوێژ نەکردنەکەی بە جۆرێک بێ، پێی لە ئایین دەربچێ، پێویستە سزای کافر بوون و لە دین هەڵگەڕانەوەی بەسەردا بچەسپێنرێ.

هەر کام لە مالیک و شافیعیی و ئەحمەد دەڵێن: ئەگەر بە هۆی تەنبەڵیی و تەوەزەلییەوە بوو، دەبێ پاش داوای پەشێمان بوونەوە لێکردن (استتابة) بکوژرێ، ئنجا مالیک و شافیعیی دەڵێن: دەبێ نوێژی لەسەر بکرێ و لە گۆڕستانی مسوڵمانان دا بنێژرێ.

بەڵام ئەحمەد دەڵێت: چونکە بە موتڵەقیی نوێژ نەکردن مرۆڤی پێ کافر دەبێ، نابێ نوێژی لەسەر بکرێ و لە گۆڕستانی مسوڵمانان دا بنێژرێ، ئەبوو حەنیفەش دەڵێ: نابێ بکوژرێ، بەڵکو حەپس دەکرێ و ئەشکەنجە دەدرێ، هەتا دێتە ژێرباری شەرع و نوێژەکانی دەکات.

من ئەو ڕایەی ئەبوو حەنیفەم پێ بەهێزترە لە ڕووی بەڵگەوە، چونکە نەزانراوە پێغەمبەر ﷺ کەسی لەسەر نوێژ نەکردن کوشتبێ، بەڵکو فەرموویەتی: بە دڵم دادێ ئەوانەی کە نایەن بۆ نوێژ، کەسێک لە شوێنی خۆم دابنێم نوێژ بکات بۆ مسوڵمانان و، بچم ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنم[1]، بەڵام ئەوەی نەکردوە.

---

(١) صحيح البخاري: كِتَابُ الأَحْكَامِ بَابُ إِخْرَاجِ الخُصُومِ وَأَهْلِ الرِّيَبِ مِنَ البُيُوتِ، رقم: ٧٢٢٤.

هەڵبەتە زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە كەسێك لە ئەنجامی بێبڕواییدا نوێژ نەكات، پێی كافر دەبێ، بەڵام كەسێك بڵێ: بڕوام پێی هەیە، بەڵام لەبەر تەنبەڵیی نایكەم، لەسەر ئەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە، كە خستنەڕووی ئەوەش پێویستی بە باسێكی سەربەخۆ دەكات، كە من لە سەرچاوەی ناوبراودا، پانتاییەكی باشم بۆ تەرخانكردوە، بۆیە لێرە نامەوێ هەڵیپرووزێنم، گرنگ ئەوەیە نوێژ نەكردن، زۆر زۆر شتێكی مەترسییدارە، بەڵام بە تەئكید لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێك، لە كەسێكەوە بۆ كەسێك، لە حاڵێكەوە بۆ حاڵێك، دەگۆڕێ، بۆیەش زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە.

## پێنجەم: بەرپاكردنی نوێژ (إقامة الصلاة) چییەو چۆنە؟

خوای زاناو شارەزا ﷻ هەر جارێك باسی نوێژ كردنی كردبێ لە قورئاندا، تەنیا یەك جۆرە تەعبیری بەكارهێناوە، كە بریتییە لە بەرپا كردن (إقامة)، (**أَقَامُوا الصَّلَاةَ، يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ، أَقِمِ الصَّلَاةَ، أَقِيمُوا الصَّلَاةَ**)، كە وشەی ناوبراو، بە هەموو بەكارهێنانەكانیەوە، پەنجا (٥٠) جار لە قورئاندا هاتوە، كەواتە دەبێ سەرنج بدەین وبزانین نوێژ بەرپا كردن (**إقامة الصلاة**) چییەو؟ بۆچی ئەو جۆرە تەعبیرە بەكارهێنراوە؟

(**راغب الأصفاني**) لە كتێبە ناودارەكەی خۆی (**مُفردات ألفاظ القرآن**)دا لە بارەی وشەی (**إقامة الصلاة**)ەوە گوتوویەتی: (**وَإِقَامَةُ الشَّيْءِ تَوْفِيَةُ حَقِّهِ، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٦٨﴾ ﴾المائدة، أي: تُوفُونَ حُقُوقَهُمَا بِالعِلْمِ وَالعَمَلِ، وَلَمْ يَأْمُر تعالى بِالصَّلاةِ حَيْثُ مَا أَمَرَ، وَلاَ مَدَحَ بِهِ حَيْثُ مَا مَدَحَ، إلاَّ بِلَفْظِ الإِقَامَةِ، تَنْبِيهاً عَلَى أَنَّ المَقْصُودَ مِنْها تَوْفِيَةُ شَرَائِطِهَا لَالإتْيانِ بِهَيْئاتِها**)[1].

واتە: ئیقامەی هەر شتێك بریتییە لەوەی كە مافی خۆی پێبدرێ، كە خوا بە خاوەن كتێبەكانی فەرمووە: بڵێ ئەی خاوەن كتێبەكان! لەسەر هیچ نین هەتاكو

---

(١) مُفردات ألفاظ القرآن: ص٤٠٨.

تەورات و ئینجیل بەرپا دەکەن، واتە: مافی خۆیانیان پێ دەدەن لە ڕووی زانیاریی و کردەوەوە، خوای زانا هەر کاتێک فەرمانی بە نوێژ کردبێ و، هەر کاتێک مەدحی کردبێ، تەنیا بە بێژەی (إقامة) باسیکردوە، وەک ئاگادار کردنەوە، کە گرنگ ئەوەیە مەرجەکانی تێدا جێبەجێ بکرێن، نەک تەنیا کردەوە ڕواڵەتییەکانی.

کەواتە: (إقامة الصلاة) بەرپاکردنی نوێژ یانی: بەجێهێنانی بە شێوەیەکی وا کە خوا فەرمانی پێکردوەو پێ ڕازییەو، ئەو ئامانج و مەبەستانەی تێیدا ڕەچاو کراون، بێنە دی، دیارە ئەویش بە بێ هێنانە دی ماف و مەرجە ڕواڵەتیی و دەروونییەکانی، مسۆگەر نابێ.

## ئایا حیکمەتی بەکارهێنانی ئەو جۆرە تەعبیرە چییە؟

بێگومان تێرو تەواترین حاڵەتی هەر شتێک، حاڵەتی ڕاوەستاویەتی و لە حاڵەتی وەستان دا، لە هەمووی زیاتر و چاکتر حەقیقەت و سیمای ئەو شتە دەردەکەوێ و دەبینرێ، بۆ وێنە:

جەستەی ئینسان لە کاتی ڕاوەستان (قیام)دا، هەر کام لە ئەندامەکانی لە شوێنی سروشتیی خۆیاندا جێگیر دەبن و، هەر کامێکیان چاکتر دەتوانێ ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە، ئەنجامی بدات و، خۆیان چۆنن ئاوا دەربکەون و ببینرێن، وەختێک مرۆڤ ڕادەوەستێ، سەری لە سەرووی جەستەوە دەبێ، جەستە لەسەر بڕبڕەکانی پشت دەوەستێ، هەمووشیان لەسەر هەردوو لاقەکان ڕادەوەستن، دەمارەکانی هەستکردن و جووڵاندن بە ئاسانیی فەرمان وەردەگرن و هەواڵ دەنێرن، چاوو گوێ و دەست و لاق بۆ هەر جێیەکی بیانەوێ، بە ئاسانیی ڕووی تێدەکەن، ئینسان لە کاتی ڕاوەستاندا لە تەواوترین دیمەندا خۆی دەبینێ، چونکە عەقڵ و هۆشی کە مەزنترین و بەرزترین شتە لە مرۆڤدا، لە کاتی ڕاوەستاندا لە سەرووی لەشەوە دەبێ، عەقڵ کە زۆر پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەیە بە مێشکەوە، ئنجا دوای عەقڵ، دڵ دێ، کە کانگای سۆزو عاتیفەیە، وێڕای ئەوەی کە ترومپای

دابەشکردنی خوێنە بەسەر هەموو جەستەدا، ئەویش لە خوار عەقڵەوە قەرار دەگرێ، کەواتە: دەبێ دڵ لە ژێر فەرمانی عەقڵدا بێ و، بە پێی فەرمانی عەقڵ، فڵان شتت بوێ و فڵان شتت نەوێ، ئەو شتە بخۆی و ئەو شتە نەخۆی، بەرەو ئەملایە بچی و بەرەو ئەولایە نەچی، ئنجا دڵ لە سەرووی گەدەوە قەرار دەگری، کە گەدە عەمباری خۆراک و بژیوە، پاشان ورگ و گەدەش لە سەرووی داوێنەوە، کە کانگای ئارەزووی جینسییە، کەواتە: پێویستە ئینسان لە کاتی ڕاوەستاندا، ئەندام و هێزە دەروونییەکانی چۆن ڕیز دەبن، لە هەڵسوکەوتی ژیانیشیدا هەروا بن، عەقڵ و هۆش دەمڕاستی بێ، بە دڵ و دەروون پاڵپشتی بڕیارو نەخشەکانی عەقڵ بکات و، گەدە لە خزمەت مێشک و دڵ و دەروونیدا بێ، نەک بە پێچەوانەوە، هێزی جینسییش کارێک نەکات، پێچەوانەی عەقڵ و بەرژەوەندیی گەدەو جەستەی بێ، ئنجا هەروەک چۆن تێرو تەواویی جەستە لە کاتی ڕاوەستانی دا دەردەکەوێ، واتە: لە حاڵێکدا کە لە باری سروشتیی خوا کردییدا قەرار دەگرێ، نوێژی تێرو تەواوو کامڵیش، ئەو نوێژەیە کە ڕاست ڕابگیرێ و، بەو شێوەو چۆنیەتییە شەرعییە بەڕێوەببرێ، کە خوای کاربەجێ و دادگەر ﷻ فەرمانی پێکردوە.

کەواتە: بەرپاکردنی نوێژ: جێبەجێ کردنی نوێژە، بەو شێوەیە کە خوا فەرموویەتی و، بەو شێوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی کردوە لەبەر چاوی هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە لای کەمەوە دوو جاران لەسەر مینبەر نوێژی کردوەو، فەرموویەتی: (**صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي**)، (أخرجه: البخاري: ٧٨٥، ومسلم: ٦٧٤، عن مالك بن الحُوَيْرِث رضي الله عنه) واتە: نوێژ بکەن وەک چۆن منتان بینی نوێژم کرد، ئنجا با لەو بارەوە چەند دەقێک لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بێنین:

١- ئەم دەقەیان لە هەموویان گشتگیرترە، کە لە کتێبەکانی سوننەتدا بە: (**حَدِيثُ المُسِيءِ صَلاتَهُ**)، فەرموودەی ئەو کەسەی نوێژەکەی باش نەکرد، هاتوە:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ؛ فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَرَدَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِ السَّلاَمَ؛ فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ثَلاَثًا فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ، فَعَلِّمْنِي قَالَ: إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا} (أخرجه البخاري: ٧٥٧ ، ومسلم: ٣٩٧) واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک هاتە مزگەوت، لە مزگەوت بەژوور کەوت، پیاوێکیش هات نوێژی کرد، دوایی هات سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش پێی فەرموو: بگەڕێوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد، گەڕایەوە نوێژی کرد وەک پێشتر، دووبارە هاتەوەو سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش دووبارە فەرمووی: بچۆوە نوێژەکەت بکە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد، سێ جاران (وای پێ فەرموو)، کابرا گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە، لەوە چاکتر کە کردم نایزانم، فێرم بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بۆ نوێژ هەڵسای (ألله أكبر) بكە (واتە: نیەت بێنە)، دوایی ئەوەندەی کە لە قورئان بۆت ئاسانە بیخوێنەوە (مەبەست پێی سوورەتی فاتیحەیە بەڕای زۆربەی زانایان، چونکە هەموو کەس دەتوانێ سوورەتی فاتیحە لەبەر بکات)، دوایی بچۆ ڕکووع هەتاکو ئارام دەگری لە ڕکووع دا، دوایی هەڵسەوە تاکو تەواو هەڵدەستیەوەو ئارام دەگریەوە، دوایی سەجدە بەرە تاکو لە سەجدە بردنەکەتدا ئارام دەگری، دوایی هەڵسەوە تاکو لە دانیشتنەکەی نێوان هەردوو سەجدەکان دا ئارام دەگری، دوایی دووبارە سەجدە ببەوە تاکو ئارام دەگری لە سەجدەکەتدا، دوایی بەو شێوەیە بکە لە هەموو (ڕکاتەکانی) نوێژەکەت دا، لە ڕیوایەتێکی موسلیم دا هاتوە: ئەگەر هەڵسای بۆ نوێژ، دەستنوێژێکی چاک بگرە، دوایی ڕوو بکە قیبلەو (ألله أكبر) بکەو، نوێژ دابەستە.

**٢- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [لَيَنْتَهِيَنَّ قَوْمٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى ٱلسَّمَاءِ فِي ٱلصَّلَاةِ، أَوْ لَا تَرْجِعَ إِلَيْهِمْ] (أخرجه مسلم: ٤٢٨، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه)، واتە: کەسانێک کە چاو بەرز دەکەنەوە بەرەو سەرێ (لە نێو نوێژدا)، یان واز دێنن، یاخود چاویان بۆ لایان ناگەڕێتەوە واتە: خوا سزایان دەدات و کوێریان دەکات، یاخود گوناهی ئەوە کە لە نوێژدا سەر بەرز دەکەنەوە، بە ئەندازەی چاو کوێر بوونە.**

**٣- پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی کەسێکدا کە دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا پرسیاری لێکردووە فەرموویەتی: [هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الْعَبْدِ] (أخرجه البخاري: ٧١٨، عن عائشة رَضِيَ اللهُ عنها)، فەرموویەتی: ئەوە دزییەکە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێ (کاتێک کە ئاوڕ دەداتەوە).**

**هەڵبەتە پێشتریش ئەو ئایەتە موبارەکەمان هێناوە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢﴾ المؤمنون، هەروەها ئەو ئایەتەشمان هێنا کە دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥﴾ الماعون.**

**٤- هەر لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: [لاَ صَلاَةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ، وَلاَ وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ] (أخرجه مسلم: ٥٦٠، وأبو داود: ٨٩، عن عائشة رَضِيَ اللهُ عنها) واتە: نوێژ کردن نیە لە کاتێک دا کە خواردن ئامادەیە، هەروەها کاتێک کە دوو شتە پیسەکان مرۆڤ تەنگاو دەکەن (واتە: میزو پیسایی).**

## شەشەم: چۆن نوێژ بەرپادەكەی؟

بەڕێـــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ ئێمـە لـە بیسـت وچـوار بڕگـەدا بـاسی چۆنیەتیـی ئەنجامـدانی نوێـژ دەكەیـن، كـە بـەڕای زۆربـەی زانایـان یـازدە (١١)یـان پایـەن و، ئـەوانی دیكـەش یـان فـەرزن یـان سـوننەتن.

هەڵبەتـە كـە دەڵێیـن: چـۆن نوێـژ بەرپـا دەكـەی؟ یـانی: كاتـی نوێـژ هاتـووەو، دەسـتنوێژت گرتـووەو بـە پۆشـاكێكی پاكـەوە، لـە شـوێنێكی پـاك، بـەرەو ڕووگـە (قیبلـە) وەسـتاوی (چونكـە ئەوانـە هەموویـان مەرجەكانـی نوێـژن)، ئنجـا دەچیـە نێـو یەكەمیـن كاری نوێـژو پایـەی یەكەمـی نوێـژەوە، كـە بریتیـە لـە:

**١- نیـــەت هێنان:**

نیـازو مەبەسـت (نیـة) بریتیـە لـە بنچینـەی هـەر كارێـك، وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {**إِنَّمَـا الأَعْمَالُ بالنِّيَّـاتِ، وَإِنَّمَـا لِـكُلِّ امـرِىءٍ مَـا نَـوَى**} (**أخرجـه البخـاري: ١، ومسـلم: ١٩٠٧عـن عمـر بـن الخطـاب رضي اللـه عنـه**) واتـە: كـردەوەكان بـە پێـی نیـەت و نیـازو مەبەسـتی مرۆڤـن و، بـۆ هـەر مرۆڤێـك لـە كردەوەكـەی بـەس ئـەوە هەیـە كـە نیەتـی لێهێنـاوە، واتـە: بـە پێـی نیەتەكـەی كردەوەكـەی بـۆ حسـابە.

زانایـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەكدەنگـن، كـە شـوێنی نیـەت بریتیـە لـە دڵ، بۆیـە هـەر بـە كورتیـی دەڵێـم: ئەوانـەی پێیـان وایـە گۆكـردن (تلفـظ) و دەربڕینـی بێـژەی نیـەت، پێویسـتە، لـە ڕاسـتییدا نـەك فـەرز نیـە، بەڵكـو سـوننەتیش نیـەو، زۆربـەی زانایـان بـە داهێنـدراو (بدعـة)ی دەزانـن، چونكـە نیـەت كاری دڵـەو لـە دڵـەوە پەیدادەبـێ و هیـچ پەیوەندیـی بـە زارو زمانـەوە نیـە، تەوەنـدە هەیـە بـۆ نیـەت هێنانـی حـەج، زانایـان لەسـەر ئـەوە یەكدەنگـن كـە دەبـێ مـرۆڤ دەنگـی پـێ بەرزبكاتـەوە، وەك دروشـمێك كـە دەڵـێ: (**لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ حَجَّـةً**) یـان (**لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ**

عُمْـرَة) یـان (لَبَیْـكَ اللَّهُـمَّ حجَّـةً وعُمْـرَة) ئـەوە هەڵاوێـردراوە کـە حـەج و عومـرە، نیەتیـان پـێ دەهێـنرێ لـە کاتـی ئیحـرام بەسـتندا، دەنگیـان پـێ بـەرز دەکرێتـەوە، واتـە: بـە بێـژەش دەگوتـرێ، وێـڕای ئـەوەی کـە لـە دڵـدا هەیـە، بـەڵام بـە تەئکیـد بـۆ هـەر کارێـک لـە دڵـدا نیـەت و نیـازو مەبەسـتەکە ئامـادە نەبـێ، یانی: ئـەو مرۆڤـە نیەتـی نەهێنـاوە، ئنجـا بـۆ ڕۆژووگرتـن، بـۆ دەسـتنوێژ، بـۆ غوسـڵ، بـۆ نوێـژ و بـۆ هەمـوو شـتێک، بـەڵام گۆکـردن و دەربڕینـی بێـژەی نیـەت هێنـان، نـەک هـەر فـەرز نیـە، بەڵکـو سـوننەتیش نیـەو پێغەمبـەر ﷺ هەرگیـز لێـی نەگێڕراوەتـەوە بـۆ نوێـژ فەرمووبێتـی: نیەتـم هەیـە نوێـژی نیـوەڕۆ دەکـەم چـوار ڕکات، یـان نوێـژی شـێوان سـێ ڕکات، یـان نیەتـم هەیـە بـەڕۆژوو دەبـم، یـان نیەتـم هەیـە دەسنوێژ دەگـرم، یـان نیەتـم هەیـە غوسـڵ دەکـەم، لـە ڕاسـتییدا ئـەوە هەمـووی شـەرعزانان و زانایـان ڕەنگـە بـۆ ئیحتیـات کـردن وایانگوتـوە، ئـەوەک خەڵـک نەتوانـێ ئـەو شـتە بـە دڵـی خۆیـدا بێنـێ، بـەڵام ئـەوە شـتێکە زیادەیـەو داهێـنراوە.

ناشـڵێین: هـەر کەسـێک بێـژەی نیەتـی گـۆ (تلفـظ) کـرد، نیەتەکـەی دروسـت نیـە، مـادام لـە دڵیـدا هەبـێ، ئـەوەی لـە دڵیدایـە، ئـەوە نیەتەکەیەتـی و، ئـەوەی بـە زمـان دەیڵـێ، زیادەیـە، بـەڵام ناڵێیـن ئـەو زیادەیـە نیەتەکـەی لـێ تێکـدەدات، بـەڵام هـەر ئەوەندەیـە شـتێکی زیـادەی کـردوە.

**٢- گوتنی (أللـــه أكـــبـر):**

دوای ئـەوەی بـەو جـۆرەی گوتـرا، نیـازو مەبەسـتی بەرپاکردنـی نوێژەکـەت لـە دڵ و مێشـکتدا ئامـادە دەکـەی، ئنجـا نوێـژ بـە گوتنـی (اللـه أكبر) دەسـت پێـدەکات، وەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {مِفْتَـاحُ الصَّـلاَةِ الطُّهُـورُ، وَتَحْرِيمُهَـا التَّكْبِـيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْـلِيمُ} (أخرجـه أحمـد: ١٠٠٦، وأبـو داود: ٦١٨، والترمـذي: ٣، وابـن ماجـه: ٢٧٥ عَـنْ عَـلِيٍّ رضي اللـه عنـه).

واتـە: کلیلـی نوێـژ پـاک و خاوێنییـە، (پـاک و خاوێنیـی لـە ڕووی جەسـتەوە، لـە ڕووی پۆشـاکەوە، لـە ڕووی شـوێنەوە) و حەڕامکردنـی نوێـژ (بـەو واتایـە کـە دوای

ئەوەی ئەو وشەیە دەڵێی، هەموو شتێکت لێ قەدەغە دەبێ)، بریتیە لە (أللە أكبر)، [ (أللە أكبر) پێی دەگوترێ: (تَحَرُّم) واتە: تۆ هەموو شتێك لە خۆت قەدەغە دەكەی] و، بە سەلامدانەوە ئەوانەی لە نوێژدا لە تۆ قەدەغە بوون (وەك قسە كردن، خواردن، خواردنەوەو، شتەكانی دیكە هەموویان) بۆ تۆ حەڵاڵ دەبن.

٣- بەرزكردنەوەی هەردوو دەست، تاكو ئاستی گوێیەكانت:

دەستەكانت بەرزدەكەیەوەو سوننەتە پەنجە گەورەكەت لە لای نەرمەی گوێت بێ، ئەمەش دەگونجێ لە كاتی گوتنی (أللە أكبر)كاندا بێ، دەشگونجێ پێش، یان دوایی بێ، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، واش باشترە لە كاتی دەست بەرزكردنەوەكەدا، پەنجەكان نە پێكەوە نووساو بن، نە زۆر بڵاویش بن، بەڵكو ئاسایی بن.

ئنجا وەك گوتمان: ئەوە كە دەبێ دەستەكان بەرز بكرێنەوە لە كاتی نیەت هێناندا، لە پێش، یان لەكاتی نیەت هێنانەكەدا، یان لە دوای، گرنگ ئەوەیە پێكەوە بوونێكی عورفیی بێت.

٤- ڕۆنانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ:

ئەویش دیسان یەكێكە لە كردەوەكانی نوێژ، كە زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، كە ئایا دەستەكان لەسەر سینگ بن، یاخود لە خوار سینگ، یان لەسەر نێوك، یان لە خوار نێوك؟ بەڵكو ڕایەكی ئیمام مالیك هەیە، شیعەی دوازدە ئیمامییش هەر ڕایان وایە كە هەر دەست نەگرتن سوننەتە، ئنجا مادام مالیك كە ئیمامی ئەهلی مەدینە بووە، ڕایەكی وای هەبێ، دیارە ئەو ڕایەش ئەصڵێكی بووەو، ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ هەموو حاڵەتەكانی كردبن، بۆ ئەوەی بۆ ئۆممەتەكەی ئاسان بێ.

**٥- چاوبڕینە شوێنی کڕنووش و ڕاوەستان بە ملکەچییەوە:**

وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾البقرة، بە ملکەچیی لە خزمەت خوادا بوەستن، وا باشە لەو کاتەدا کە ئینسان نوێژەکەی دادەبەستێ، تەماشای شوێنی کڕنووش بردنەکەی بکات، یاخود تەماشای پێش خۆی بکات بە گشتیی و بە ملکەچییەوە بوەستێ.

**٦- خوێندنی دوعای (الإستفتاح) :**

ئەو دوعایانەی کە هی دەستپێکردنی نوێژیان پێدەڵێن، کە چەند دوعایەک هەن و وا باشە مرۆڤ لەسەر یەکێکیان خۆی کورت هەڵنەهێنێ و، هەر جارە یەکێکیان بخوێنێ، چونکە مادام هەموویان لە پێغەمبەرەوەن ﷺ دیارە هەموویان سوننەتن، بەڵام کۆکردنەوەی هەموویان پێکەوە سوننەت نیە، بەڵکو دەبێ هەر جارە یەکێکیان بخوێنێ، بۆ وێنە:

**أ- {وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لا شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ، وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ} (أخرجه مسلم: ٧٧١ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه).**

**ب- {سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ} (أخرجه أبو داود: ٧٧٦، والترمذي: ٢٤٣، وابن ماجه: ٨٠٦، وابن خزيمة: ٤٧٠، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا).**

**جـ- {أَللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيراً، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً} (أخرجه مسلم: ١٣٨٦، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، رضي الله عنه).**

**د- {أَللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، أَللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، أَللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٩٢٠ ، وأحمد: ٧١٦٤، والبخاري: ٧١١، ومسلم: ٥٩٨، وأبو داود: ٧٨١، والنسائي: ٦٠، وابن ماجه: ٨٠٥، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه).**

**٧- گوتنی: (أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم) كه به كورتيی (إستعاذة)ی پێدەڵێن:**

واتە: دوای ئەوەی یەکێک لە دوعایەکانی کردنەوەی، یان دەست پێکردنی نوێـژت خوێنـد، ئنجا (إستعاذة) بکە، چونکە لە لای زۆربەی زانایان، لە ڕکاتی یەکەم لە پێش خوێندنی فاتیحەدا، سوننەتە، دیارە (إستعاذة)ش بە چەند ڕێژگەیەک لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتـوە:

أ/ **(أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم)** واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو.

ب/ **{أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ} (أخرجه أبو داود: ٧٧٥، وصححه الألباني).**

ج/ **{أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْثِهِ وَنَفْخِهِ} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٣٩٦، وأبو داود: ٧٦٤، وابن ماجه: ٨٠٧).**

واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو، لە خوتخوتەی و، فووی خۆبەزلگریی بەبەردا کردنی و، شیعری خراپ فێرکردنی.

دیارە لەو نوێژانەدا کە پەنهانیی (**سرّي**)ن، یانی: فاتیحەیان بە دەنگی نزم تێدا دەخوێندرێ، ئەوە (**إستعاذة**)ش بە هەمان شێوە، بەڵام لەو نوێژانەدا کە ئاشکرا (**جهري**)ین، بە دەنگی بەرز تێیان دا دەخوێندرێ، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە (**إستعاذة**) بە دەنگی نزم بخوێندرێ، بەس شافیعیی ڕای وایە کە هەردووک لا یەکسانن، بەڵام بێگومان ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترە.

**٨- خوێندنی سوورەتی فاتیحە:**

لەو بارەوە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەن، کە بە بێ خوێندنی فاتیحە، نوێژەکە بەرناکەوێ، بۆ وێنە:

أ/ **{لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ} (أخرجه البخاري: ٧٢٣، ومسلم: ٣٩٤، عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ).**

واتە: هەر کەسێک فاتیحە نەخوێنێ، نوێژەکەی بەرناکەوێ.

**ب/ (مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَهِيَ خِدَاجٌ) (أخرجه أحمد: ٧٨٢٣، ومسلم: ٣٩٥، وأبو داود: ٨٢١، والترمذي: ٢٩٥٣).**

واتــە: هــەر کەســێک نوێژێــک بــکات، فاتیحــەی کتێبــی خــوای تێــدا نەخوێنــێ، ئــەوە ناتــەواوە.

زۆربــەی زانایــان ڕایــان وایــە، کــە ســوورەتی **(الفاتحة)** لەهــەر ڕکاتێــک دا فــەڕزە، یــان پایەیــە.

بــەڵام ئەبــوو حەنیفــە (خــوا لێــی خــۆش بــێ) ڕای وایــە کــە خوێندنــی فاتیحــە بــە مــەرج نەگیــراوەو، هــەر شــوێنێکی دیکــەی قورئــان بخوێنــێ، هــەر دروســتە، بــەڵام ڕای زۆربــەی زانایــان ڕاســتەو بەڵگــەدارە.

هەندێکیشــیان خوێندنــی فاتیحەیــان تەنیــا لــە دوو، یــان زۆربــەی ڕکاتەکانــدا بــە مــەرج گرتــوە.

بــەڵام کەســێک نەیتوانــی ســوورەتی فاتیحــە فێرببــێ، دەبــێ بــە ئەنــدازەی وی لــە ســوورەتێکی دیکــە بخوێنــێ، ئەگــەر ئەوەشــی هــەر بــۆ نەکــرا، بــا بــە ئەنــدازەی ســوورەتی فاتیحــە، ئــەم زیکرانــە بخوێنــێ: **(سُبْحَانَ اللَّـهِ وَالْحَمْـدُ لِلَّـهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَاللَّـهُ أَكْـبَرُ، وَلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إِلاَّ بِاللَّـهِ).**

دیــارە خوێندنــی فاتیحــەش، هەروەهــا خوێندنــی قورئانیــش بــە گشــتیی پێویســتە بــە شــێنەیی بــێ و، لــە کۆتایــی ئایەتــەکان دا بوەســتێ، مەگــەر کۆتایــی ئایەتێــک کــە دروســت نەبــێ بوەســتێ، وەک: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾﴾ الماعــون، نابــێ لــەوێ بوەســتێ و، دەبــێ یەکســەر بچیــە ســەر ئایەتــی دواتــر: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾﴾ الماعــون، بــۆ ئــەوەی مانایەکەی هەڵــە دەرنەچێ.

**٩- گوتنی ئامین لە کۆتایی سوورەتی فاتیحەدا:**

کە بوخاریی و ئەبووداوود وایان لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناوە، ئەو کەسە کە نوێژ دەکات ئیمام بێ، یان مەئمووم بێ، پێویستە بڵێ: ئامین، دیارە لە نوێژە (جهر)یەکاندا بە دەنگی بەرزو، لە نوێژە پەنهانەکانیشدا بە دەنگی پەنهان.

**١٠- هەڵوەستە کردنی ئیمام دوای گوتنی ئامین:**

واتە: دوای ئەوەی ئیمام دەڵێ: ئامین، دەبێ هەڵوەستەیەک بکات و بوەستێ، تاکو هەم بۆ خۆی پشوویەک بدات، هەم مەئموومەکانیش بتوانن سوورەتی فاتیحە بخوێنن، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: يَا بَنِيَّ اقْرَءُوا فِي سَكْتَةِ الإِمَامِ، فَإِنَّهُ لاَ تَتِمُّ صَلاَةٌ إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ} (أخرجه النسائي في الكبرى: ٣٠٧٤).

واتە: هیشامی کوڕی عوروە لە باوکی دەگێڕێتەوە (کە ئامۆژگاریی کوڕەکانی دەکرد)، گوتوویەتی: ڕۆڵەکانم! کاتێک ئیمام دەوەستێ (لە دوای سوورەتی فاتیحە)، ئێوە (سوورەتی فاتیحە) بخوێنن، چونکە هەر کەسێک سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ، نوێژەکەی بەرناکەوێ.

ئنجا ئایا مەرجە مەئموم سوورەتی فاتیحە بخوێنێ، یان نا؟ ئایا خوێندنی ئیمام وەبری خوێندنی مەئموومەکان دەکەوێ، یان نا؟ لەو بارەوە ڕاجیاییەک هەیە:

ئەبوو حەنیفە پێی وایە خوێندنی ئیمام، وەبری وانیش دەکەوێ.

بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو مەرجە هەرکەسێک سوورەتی فاتیحە لە هەموو ڕکاتەکاندا بخوێنێ و، لە ڕاستییدا قسەی زۆربەی زانایانیش ڕاستە، دوای ئەوەی ئەو هەموو فەرمایشتەی پێغەمبەرمان ﷺ هێنان، کە هەر کەسێک سوورەتی فاتیحە نەخوێنێ (واتە: لە هەموو ڕکاتەکاندا) نوێژەکەی بەرناکەوێ، بەڵام ڕای ژمارەیەکی زۆریش لە زانایان وەک هی (أبو حنيفة)یە[1].

---

(١) بڕوانە: مجموع الفتاوی لابن تیمیة، ج٢٣، ص٢٧٠، هەروەها بڕوانە: (فقه السنة الميسّر).

**١١- قورئان خوێندنی پاش فاتیحە:**

لـە دوای سـوورەتی فاتیحـەش سـوننەتە قورئـان بخوێـنرێ، ئنجـا لـە نوێـژی بەیانیـی دا بـە زۆریـی وابـووە کـە پێغەمبـەر ﷺ قورئانـی زیاتـری خوێنـدوە، بـۆ وێنـە: جـاری وا هەبـووە سـوورەتی (**الواقعـة**)ی خوێنـدوەو، جـاری وا هەبـووە سـوورەتی (ق)ی خوێنـدوە، جاریـش هەبـووە بـە ئەنـدازەی شەسـت ئایەتـی لـە ڕکاتێـک یـان لـە هـەردوو ڕکاتەکانـدا خوێنـدوە، جاریـش هەبـووە کـە سـوورەتێکی کورتـی خوێنـدوە، وەک سـوورەتی (**الزلـزال**)، هەروەهـا لـە بەیانیانـی ڕۆژی جومعـە لـە ڕکاتـی یەکەمـدا، سـوورەتی (**السـجدة**)ی خوێنـدوەو، لـە ڕکاتـی دووەمـدا: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ ﴿١﴾ ﴾ی سـوورەتی (**الإنسـان**)ی خوێنـدوە.

هەروەهـا لـە نوێـژی نیـوەڕۆدا پێغەمبـەر ﷺ لـە دوو ڕکاتـی یەکەمدا لە پاش فاتیحە، دوو سـوورەتی دەخوێنـدن، لـە ڕکاتـی یەکەمدا زیاتـری دەخوێند لە هـی دووەم.

هەروەهـا پێغەمبـەر ﷺ دیسـان لـە دوو ڕکاتـی یەکەمـی ئێـوارە (عـصر)دا پـاش فاتیحـە، دوو سـوورەتی خوێنـدوون، یەکەمیشـی درێژتـر کردۆتـەوە لـە هـی دووەم[1].

هەروەهـا سـوورەتە کورتەکانـی لـە نوێـژی شـێواندا دەخوێنـدن، بـەڵام جـاری وا هەبـووە سـوورەتی (**محمـد**)ی لـە نوێـژی شـێواندا خوێنـدوە، هەندێکجاریـش سـوورەتی (**الأعـراف**)ی لـە دوو ڕکاتـی یەکەمـی نوێـژی شـێواندا دەخوێنـد[2]، جـاری واش هەبـووە سـوورەتی (**الأنفـال**)ی لـە هـەردوو ڕکاتەکانـی شـێوان دا خوێنـدوە، وەک (**الطـبراني**) هێناویەتـی.

بـە نسـبەت نوێـژی خەوتنانـەوە، پێغەمبـەر ﷺ لـە دوو ڕکاتـی یەکەمیـدا سـوورەتە ئێوەنجییـە کورتەکانـی دەخوێنـدن، جـاری واش هەبـووە: ﴿ وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا

---

ج١ ، ص١٤٣ ، د.عبدالله بن محمد المطلق.

(١) بوخاریی و موسلیم هێناویانە.

(٢) بوخاریی و موسلیم هێناویانە.

﴿ ١ ﴾الشمس، جاری واش هەبووە سوورەتی (الإنشقاق)ی خوێندوە: ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ ﴾و سەجدەشی بردوە.

**١٢- ڕکووع بردن:**

پاش خوێندنی ئایەتەکان دوای سوورەتی فاتیحە، ئنجا هەڵوەستەیەک دەکرێ، دوایی (أللە أكبر) دەکرێ و ڕکووع دەبردرێ، ڕکووعیش ئەوەیە کە ئینسان ئانیشکەکانی ڕاست بکات و پەنجەکانی بەرەو قیبلەو، پشتی ڕاست بکات بە شێوەیەک کە پشتەملی لەگەڵ پشتی دا یەک ئاست بێ و تەخت بێ، ئنجا لە کاتی ڕکووع بردنیشدا، مرۆڤ دەبێ لە ڕکووعدا ئارام بگرێ و، لە ڕکووعیشدا چەند دوعایەک هەن وەک:

أ- [سُبْحانَ رَبِّيَ العَظِيم]، ب- یان [سُبْحانَ رَبِّيَ العَظِيم وَبِحَمْدِهِ]، ج- یان [سُبُّحٌ قُدُّوس رَبُّ المَلائِكَة والرُّوح]، د- هەروەها: [أللهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْت، أَنْتَ رَبِّي، خَشَعَ سَمْعي وَبَصَري وَدَمي وَلَحْمي وَعَظْمي وَمُخِّي وَعَصَبي للهِ رَبِّ العالَمين]، هەروەها کۆمەڵێک دوعای دیکەش هەن.

**١٣- هەڵسانەوە لە ڕکووع کە ڕێکبوونەوە (إعتِدال)ی پێدەڵێن:**

لە کاتی هەڵسانەوەدا دەگوترێ: [سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَه]، ئنجا دوای پشت ڕاستکردنەوە، دەگوترێ: [رَبَّنا ولَكَ الحَمْد]، یان [ رَبَّنا لَكَ الحَمْد]، جاری وا هەبووە ئەوەشی خراوەتە سەر: [مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ ما بَيْنَهُما وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ] (أخرجه مسلم: ١٠٩٦)، دیارە لە هەڵسانەوە لە ڕکووعیش دا، مرۆڤ پێویستە ئارام بگرێ.

**١٤- کڕنووش بردن (السجود):**

ئنجا (أللە أكبر) دەکرێ و مرۆڤ دەچێتە سەجدە، چۆنیەتیی کڕنووش بردنیش ئەوەیە: کە لە دوای گوتنی: (أللە أكبر) هەردوو دەستەکانت لە ئەنیشتەکانت

دوور بخـەوە، ئنجـا سـەجدە ببـە، دەگونجـێ سـەرەتا هـەردوو ئەژنـۆت و هـەردوو لەپـە دەسـتت بخەیـە سـەر زەوی، کـە ئـەوە ڕای زۆربـەو جەمـاوەری زانایانـە، یاخـود هـەردوو دەسـتت، پاشـان دوو ئەژنۆیەکانـت لەسـەر زەوی دابنێـی، ئـەوەش ڕای هەندێکیانـە، پێویسـتە لـە کاتـی سـەجدە بردنـدا، حـەوت ئەندامـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی بـن: نێوچەوانـی، هـەردوو لەپـە دەسـتی، هـەردوو ئەژنـۆی، هـەردوو سـینگی پێـی، لـەکاتی سـەجدە بردنیشـدا کۆمەڵێـک زیکـر دەخوێنرێـن، بـۆ وێنـە: أ- {سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى}، ب- یاخود:{سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى وَبِحَمْدِهِ}، جـ- {سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِر لِي}، هەروەهـا کۆمەڵێـک زیکـری دیکـە هـەن، کـەوا باشـە مـرۆڤ هەرجـارە یەکێکیـان بخوێنـێ، نـەک تەنیـا لەسـەر یەکێکیـان بـەردەوام بـێ.

**١٥- هەڵسانەوە لە کڕنووشی یەکەم و دانیشتنی نێوان کڕنووشی یەکەم و دووەم:**

ئەمیـش کـە پێـی دەگوتـرێ: (جَلْسَةُ الإِسْتِرَاحَة) واتـە: دانیشـتنی پشـوودان، پێویسـتە مـرۆڤ ئارامـی تێـدا بگـرێ، لـەو کاتەشـدا چەنـد زیکرێـک دیاریکـراون، یەکێـک لەوانـە: {رَبِّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَارْفَعْنِي وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي} (أخرجـه أحمـد: ٢٨٩٧، وأبـو داود: ١٥١٦، وابـن ماجـه: ٣٨١٤، وغيرهـما، واللفـظ لأحمـد).

**١٦- کڕنووش بردنی دووەم:**

دوایی (ألله أکبر) دەکرێ و، سەجدەی دووەم دەبردرێ، وەک سەجدەی یەکەم.

**١٧- هەڵسانەوە دوای کڕنووشی دووەم:**

لـە دوای هەڵسـانەوە لـە کڕنووشـی دووەم، بەشـێک لـە زانایـان پێیـان وایـە دانیشـتنێک هەیـە پێـی دەگوتـرێ: پشـوودان (جَلْسَةُ الإِسْتِرَاحَة)، بـەڵام هەندێـک لـە زانایانـی دیکـە کـە مـن ڕای ئـەوەی دووەمـم پـێ پەسـندە، ئەوەیـە کـە ئـەوە بـۆ کەسێکە، نەتوانـێ یەکسـەر هەڵسێتەوە، بـەڵام کەسێکیش دابنیشـێت، ئاساییەو بـواری تێـدا هەیـە.

**١٨- ڕکاتی دووەم:**

ڕکاتی دووەمیش هەروەک ڕکاتی یەکەم دەخوێنرێ، ئەوەندە هەیە دوعای (الإستفتاح) ناخوێنرێ، بەڵکو بە ڕای زۆربەی زانایان، وا باشە: (أَعوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم)یش نەخوێنرێ لە پێش فاتیحەوە.

**١٩- تەحییاتی یەکەم:**

زۆربەی زانایان تەحییاتی یەکەم بە سوننەت دادەنێن، ئەگەر نوێژەکە دوو تەحییاتی بێ، واتە: سێ یان چوار ڕکاتیی بێ، بەڵام ئەگەر هەر یەک تەحییات بێ وەک نوێژی بەیانیی، ئەوە تەحییات فەرزە، هەڵبەتە لەسەر تەحییات و وتەکانی کە تێیدا دەگوترێن، ماناو مەبەستەکانیان، قسە زۆرن.

**٢٠- هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و چوارەم:**

دوای ئەوەی کە بەو شێوەیەی باسکرا، ڕکاتی یەکەم و دووەم دەکرێن، ئنجا بۆ ڕکاتی سێیەم و، دوای سێیەمیش بۆ چوارەم، ئەگەر چوار ڕکاتیی بێ، هەڵدەستینەوە.

**٢١- تەحییاتی کۆتایی:**

ئەمیش هەروەک تەحییاتی یەکەمە، لەگەڵ چەند جیاوازییەک وەک:

أ- لە تەحییاتی یەکەمدا سوننەتە مرۆڤ بە (افتِراش) دابنیشێ واتە: لەسەر پێی چەپی دابنیشێ و، سینگی پێی ڕاستی لە زەوی بچەقێنێ، بەڵام لە تەحییاتی دووەمدا، جگە لە ئەبوو حەنیفە، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بە شێوەی (تَوَرُّك) دابنیشێ، ئەویش ئەوەیە کە پێی چەپی لە لای ڕاستیەوە تێپەڕێنێ و، ئەوی دیکەیان بچەقێنێ و لەسەر سمتی چەپی دابنیشێ.

ب- هەروەها جەماوەری زانایان ڕایان وایە، کە صەڵەواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحییاتی یەکەمدا سوننەت نیە، بەڵام شافیعییەکان پێیان وایە تەنیا گوتنی: (أَللّٰهُمَّ صَلِّ

عَلَى مُحَمَّد) سوننەتە، هەندێکیشیان دەڵێن: صەڵاوەتەکە بە تەواویی سوننەتە، بەڵام ڕای ئەوانی دیکە بەهێزترە.

جـ- جیاوازییەکی دیکەیان ئەوەیە، کە تێکڕای زانایان ڕایان وایە، سوننەتە چەند دوعایەک بخوێنرێن لە تەحییاتی کۆتایی دا، پاشان سەلام بدرێتەوە، بەڵام لە تەحییاتی یەکەمدا، دوعا کردن سوننەت نیە.

**٢٢- خوێندنی دوعای قونووت لە نوێژی بەیانیی دا:**

لەو بارەوە زانایان چەند ڕایەکیان هەن:

أ- هەندێکیان دەڵێن: دروست نیە دوعای (قنوت) بخوێندرێ، هەرچەندە کاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ خوێندوویەتی، بەڵام دوایی وازی لێهێناوە، کەواتە: نەسخ کراوەتەوە، ئەمە ڕای ئەبوو حەنیفەو ژمارەیەکی دیکەیە لە زانایانی عێراق.

ب- ڕای دووەم ئەوەیە دەڵێن: سوننەتە لە نوێژی بەیانییان دا بخوێنرێ، لە کاتی ئاساییداو لە کاتی نائاسایی دا وەک جەنگ، یان هەر بەڵاو گرفتارییەکی دیکە، دروستە کە لە هەر پێنج نوێژە فەڕزەکاندا بخوێندرێ.

ج- ڕای سێیەم دەڵێن: تەنیا لە کاتی ڕوودانی بەڵاو گرفتاریی گشتییدا، سوننەتە (قنوت) بخوێنرێ، ئەویش لە کۆتایی هەر پێنج نوێژە فەڕزەکاندا

هەڵبەتـە واپێدەچـێ ئـەو ڕایـە کـە دەڵـێ: (قنـوت) تەنیـا لـە نوێـژی بەیانیـدا هەیـە، ئەوەیـان لـە ڕایەکانـی دیکـە بەهێزتـر بـێ، هەرچەنـدە (ابـن القیّـم) دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ کـە لێـی گێڕدراوەتـەوە: [مَا زَالَ يَقْنُتُ فِي الفَجْرِ] بـەس ئـەوە بـووە کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە نوێـژی بەیانییـدا زۆر لـە خزمـەت خـوادا ماوەتـەوەو قورئانـی زۆری خوێنـدوە، مەبەسـتەکە ئەوەیـە، نـەک مەبەسـت پێـی خوێندنـی دوعـای (قنـوت) بێ.

ڕایەکەی (ابن القیّم)یش لێرەدا زۆر بەدڵەوە دەنووسێ.

**٢٣- سەلامدانەوە:**

دوایی کە هەموو کردەوەکانی نوێژ تەواو دەبن، ئنجا ئینسان سەلام لە لای ڕاستی و ئنجا لە لای چەپی دەداتەوەو، ئەو دەقەش لەوبارە هاتوە:

**{عَنْ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ}(أخرجه: ٣٦٩٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم).**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوایی سڵاوی لە لای ڕاستی دەدایەو، سڵاوی لەلای چەپی دەدایەوە، هەتاکو سپیایی ڕوومەتی (کە سڵاوی ڕاستی دەدایەوە، لە لای چەپیەوە ڕوومەتی ڕاستی دیار دەبوو و، کە سڵاوی لای چەپی دەدایەوە، ڕوومەتی چەپی لە لای ڕاستە دیار دەبوو، واتە: تەواو ملی دەسووڕاند).

**٢٤- زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان:**

چەند زیکرێک هاتوون، وپەسندە دوای ئەوەی مرۆڤ لە نوێژە فەرزەکان تەواو دەبێ، چەند زیکرێک بخوێنێ، بەڵام زیکرەکان زیاتر بە دەنگی کپ و لەبەرخۆیەوە، نەک بە کۆڕس و بە دەنگی بەرز، هەرچەندە هەندێک لە زانایانیش بۆ فێرکردنی مسوڵمانان بە دروستیان داناوە، بەڵام دوای ئەوەی فێر بوون، ئەصڵ ئەوەیە زیکرەکان و ویردەکان لەبەرخۆیەوە بیانخوێنێ و، بە دەنگی کپ هەر کەسە بۆ خۆی بە تەنیا، بۆ وێنە:

أ/ سێ جار (أستغفر الله) کردن، پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابووە دوای ئەوەی سەلامی داوەتەوە، سێ جاران دەیفەرموو: (أستغفر الله)[1].

ب/ **{أَللَّهمَّ أنتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبارَكْتَ يا ذَاالجَلالِ وَالإِكْرام}** رواه مسلم: ٥٩١..

---

(١) رواه مسلم: ٥٩١.

ج/ {أَللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِك} رواه أحمد وأبو داود والنسائي وابن خزيمة وابن حبان والحاكم.

د/ {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الحَسَنُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الكَافِرُونَ} (أخرجه مسلم: ٥٩٤).

هـ/ {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، أَللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ} (أخرجه: البخاري: ٨٤٤ ، ومسلم: ٥٩٣).

و/ گوتنی: سی و سێ (سبحان الله)و سی و سێ (الحمد الله) و سی و سێ (ألله أكبر)، جاری سەدەمین: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (أخرجه أحمد: ٨٨٢٠، ومسلم: ٥٩٧، وابن حبان: ٢٠١٦)[1]، دەگونجێ زیکری دیکەش بخوێنرێن، بەڵام بە نسبەت دوعاوە لە دوای نوێژە فەرزەکانەوە، ئایا سوننەتە، یان نا؟ لە ڕاستییدا دوعا کردن بەو واتایە کە دەست بەرزبکرێتەوەو بە کۆڕس دوعا بکرێ، یان بە تەنیا دوعا بکرێ، ناڵێین: دروست نیە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیکردوە بە عادەت کە لەو حاڵەتەدا بەو شێوەیە دوعا بکات و بیکاتە عادەتێک، بەڵام ئەگەر جار جار مرۆڤیش لە دوای نوێژی فەرز دوعا بکات ئاساییە.

کەواتە: پایەو فەرزەکانی نوێژ، دەتوانین بڵێین: ئەم یازدەیەن بە دوای یەکدا:

یەک: نیەت هێنان.

دوو: گوتنی (ألله أكبر).

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ: «مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَكَبَّرَ اللهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ}.

**سێ:** نوێژ دابەستن.

**چوار:** بە پێوە ڕاوەستان لە نوێژی فەرزدا بۆ خوێندنی فاتیحە.

**پێنج:** خوێندنی سوورەتی فاتیحە لە هەر ڕكاتێكدا.

**شەش:** ڕكووع بردن و ئارام تێداگرتنی.

**حەوت:** هەڵسانەوەی دوای ڕكووع و ڕاستبوونەوەو ئارام گرتن.

**هەشت:** دووجار كڕنووش بردن و ئارام تێدا گرتنی.

**نۆ:** دانیشتن لە نێوان دوو كڕنووشەكانداو ئارام تێدا گرتنیان.

**دە:** دانیشتن بۆ خوێندنی تەحییاتی كۆتایی.

**یازدە:** سەلام دانەوەی یەكەم.

ڕیزكردنی پایەو فەرزەكان بەو جۆرەن كە باسكران، ئەوەش كە دەمێنێتەوە، سوننەتەكانی نوێژن.

## حەوتەم: بەرهەمەكانی نوێژ بەرپا كردن

دەگونجێ زۆر شت لە بارەی بەرهەمەكانی نوێژ بەرپاكردنەوە بڵێین، كە من لە سێزدە خاڵدا كورتم كردوونەوە:

**١- یەكەم بەرهەمی نوێژ، بریتیە لە پەیمان نوێكردنەوە:**

كاتێك بابای نوێژكەر لە هەموو ڕكاتێكی نوێژەكەیدا، ڕوو لە خوای پەروەردگارو بەخشندەی دەكات و پێی دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة، بەس تۆ دەپەرستین و یارمەتی تەنیا لە تۆ دەخوازین، هەروەها كاتێك ڕوو بە پەروەردگاری دەفەرموێ: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦﴾ الفاتحة، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، مانای وایە پەیمان لەگەڵ خوادا تازە دەكاتەوە، كەواتە یەكەمین بەرهەمی نوێژ، بریتیە لە پەیمان تازە كردنەوە لەگەڵ خوادا.

**٢- دڵ و دەروون ڕوون بوونەوەو گەشبوونەوە:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾الرعد، واتە: ئاگادار بن! بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن، ئۆخژنیان بۆ دێ، لە ڕاستییدا ئامانجی سەرەكیی نوێژیش، بریتیە لە یادی خوا، وەك لە سوورەتی (طە)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي ﴿١٤﴾﴾طە، واتە: نوێژ بەرپا بكە بۆ یادی من، بۆیە نوێژێك كە ئینسان نەزانێ چی تێدا دەڵێ، لە خزمەت كێدا وەستاوەو، یادی خوای تێدا نەكات، كەلەشێكی بێ ڕووحە.

**٣- ئیرادەو عەزم هەڵبڕانەوەو تیژبوونەوە:**

بێگومان كەسێك خۆی بە بەندەو فەرمانبەری خوا بزانێ و، تەنیا خوا بە پەرستراوو گەورەو سەروەری ڕەهاو، پشتیوانی خۆی دابنێ، هەمیشەو دایم، بە برشت و چوست و چالاك دەبێ، ئەگەر جار جار لە ژێر كاریگەریی تین وتەوژمی تێش و ئازارو دەردەسەریدا، تیغی ئیرادەی كول و، عەزمی شل ببێ، بە هۆی نوێژ كردنەوە، وەك تیغی تازە دەمەزەدكراو، تیژ دەبێتەوەو هەڵدەبڕێتەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ كاتێك تووشی سەغڵەتیی و ناڕەحەتییەك بووبووایە، بە هۆی گرفتاریی و تێش و ژان و موعاناتەكانی ڕێی دینداریەوە، پەنای دەبردە بەر نوێژو تاعەت: [**عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى**] (**أخرجه أبو داود: ١٣٢١**)، واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێك كە كارێك سەغڵەت و ناڕەحەتی دەكرد، نوێژی دەكرد.

**٤- بیرو زەین كۆبوونەوە:**

زانایان و شارەزایانی دەروونناسیی نوێ دەڵێن: هەبوونی توانا لەسەر بیر چەسپاندن (**تركيز الذهن**) بنەڕەتیترین هۆی سەركەوتن و، بەرەو پێشچوونی ئینسانە لە ژیانیدا، دەڵێن: گەورەترین هۆی هەڵكەوتنی بلیمەتەكان، توانا هەبوونیانە لەسەر بیركردنەوەو چەسپاندنی زەین، لەسەر ئەو مەبەستەی

دەیانـەوێ، دیـارە تاقـە هۆیەكیـش كـە دەبێتـە هـۆی زەیـن كۆبوونـەوەی ئینسـان، ئەوەیـە كـە مەیـل و ئارەزووو خۆشەویسـتیی و، بایـەخ پێدانی لە دڵدا هەبـێ بەرانبەر بـە ئامانـج و مەبەسـتێكی دیارییكـراو، ئـەوە باشـترین هـۆكارە بـۆ كۆكردنـەوەی زەین، بێگومـان بابـای نوێژكەریـش بـە هـۆی نوێـژو خـوا پەرسـتییەكەیەوە، هەمـوو ئـەو پێداویسـتییانەی بـۆ دابینكـراون، بـە تایبـەت كەسـانێک كـە نوێژەكانیـان بـەو جـۆرو چۆنیەتییـە كـە شـەرع دیارییكـردوە، ئەنجـام دەدەن.

٥- لە ئاوان پاكبوونەوە:

لـە ئەنجامـی نوێژكردنـدا مـرۆڤ لـە چڵـک و چەپـەڵی گونـاه، پاكدەبێتـەوە، وەک لـەو فەرموودەیـەدا هاتـوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه، أَنَّهُ سَـمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا، مَا تَقُولُ ذٰلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ؟ قَالُوا: لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا، قَالَ: فَذٰلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا} أخرجه أحمد: ٨٩١١، والبخاري: ٥٠٥، ومسلم: ٦٦٧. واتـە: كـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ئایـا ئەگـەر رووبارێـک بەبـەر دەرگای یەكێكتانـدا بـێ، شـەوو ڕۆژی پێنـج جـاران، خـۆی لـێ بشـوات، چڵكـی پێـوە دەمێنـێ؟ گوتیـان: نەخێـر چڵكـی پێـوە نامێنـێ، فەرمـووی: ئـەوەش وەک پێنـج نوێـژە فەڕزەكانـە، كـە خـوای پـەروەردگار گوناهەكانیـان پـێ لـە مـرۆڤ دەسـڕێتەوە.

٦- لە كۆڵ بەدكاریی بوونەوە:

بـە هـۆی نوێـژەوە مـرۆڤ لـە خراپـەو گونـاە دوور دەبـێ، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴿٤٥﴾ ﴾العنكبـوت، وەک پێشـتریش ماناكـان كـرد، نوێـژ خاوەنەكەی قەدەغـە دەكات لـە هـەر قسـەو ڕەفتارێكـی ناقـۆڵاو، ناپەسـندو خـراپ، یانـی: نوێـژ مـرۆڤ لـە خراپەكاریـی پـاک دەكاتـەوەو، خراپەكاریـی لـە كـۆڵ مـرۆڤ دەكاتـەوە.

**٧- گرەو لە شەیتان بردنەوە:**

ئیبلیس یەکێک لەو دروستکراوانەی خوا بوو کە خوا زۆر ڕێزی لێنابوو، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بێ فەرمانیی کردو، فەرمانی خوای جێبەجێ نەکرد، خوا نەفرینی لێکرد، بۆیە لە فەرموودەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي، يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ أُمِرَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَعَصَيْتُ فَلِي النَّارُ} أخرجه أحمد: ٩٧١١، ومسلم: ٨١، وابن ماجه: ١٠٥٢. واتە: کە هەر کاتێک مرۆڤ سەجدە بۆ خوا دەبات، شەیتان دوور دەکەوێتەوەو دەگری، دەڵێ: لەسەر ئەو ملکەچیی و سەجدەیە من ئەوەم بە خۆم کرد، کە من ئامادە نەبووم سەجدە بۆ خوا بەرم و مل بۆ خوا کەچ بکەم، کەواتە مرۆڤ ئەگەر نوێژکەری چاک بێ، لە ڕاستییدا گرەوی لە شەیتان بردۆتەوە.

**٨- وەرزش و ساغبوونەوە:**

زاناو شارەزاو پسپۆڕانی بوارە جیاجیاکانی پزیشکیی و جەستە ناسیی دەڵێن: وەرزش و جووڵان، شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ جەستەی ئینسان، هەر جەستەیەک بۆ ماوەیەکی زۆر نەجووڵێ و، کارو چالاکیی نەبێ، هێدی هێدی ماسوولکەکانی دەپووکێنەوەو، دەمارەکانی خاو دەبنەوەو، سەرجەم ئەندامەکانی بەرەو لاوازیی و بێ تینیی دەچن، باشترین جۆری وەرزشیش ئەوەیە کە سەرجەم جومگەکانی مرۆڤ و، هەموو ماسوولکەکانی و، دەمارەکانی جەستەی تێدا بجووڵێن، ئاشکراشە نوێژ، تێکڕا هیچ ماسوولکەیەک، هیچ جومگەیەک، هیچ ئەندامێک لە جەستەدا نامێنێ - بە تایبەت ئەگەر مرۆڤ نوێژەکەی بە پێی سوننەت بکات، بە پێی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ- کە نەجووڵێ.

**٩- ڕازانەوەو پاکبوونەوە:**

خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، بە دڵنیایی خوا زۆر گەڕاوان و زۆر خۆ پاککەرەوانی خۆش دەوێن،

بـە تەئکیـد بـە هـۆی نوێـژەوە مـرۆڤ دەگەڕێتـەوە بـۆ لای خـواو پاکدەبێتـەوە، چاکدەبـێ و دەڕازێتـەوە بـە بەندایەتیـی بـۆ خـواو، بـە هەمـوو ئـەو ڕەوشـت و بەهـا بەرزانـەی کـە لـە بەندایەتیـی بـۆ خـواوە نەبـێ، پەیـدا نابـن.

**١٠- پێکەوە جۆشدران و ساغبوونەوە:**

زۆربــەی زانایــان دەڵێــن: ئەنجامدانــی بــە کۆمەڵــی پێنــج نوێــژە فــەڕزەکان، فـەڕزی کیفایەیـە، بەڵکـو هەیانبـووە گوتوویەتـی: فـەڕزی عەینـە، ئەوانـی دیکـەش گوتوویانــە: ســوننەتێکی زۆر گرنگــەو، نوێــژی بــە کۆمــەڵ وەك لــە فەرمایشــتی پێغەمبــەر دا هاتــووە بیســت و پێنــج، یــان بــە بیســت و حــەوت پلــەی هــەن، کــە بـە تەئکیـد پێکـەوە ئەنجامدانـی نوێـژە فـەڕزەکان، ڕۆژی پێنـج جـاران لەسـەر ئاسـتی گــەڕەک و لادێ، دەبێتــە هــۆی ئــەوە کــە مســوڵمانان ئاگایــان لــە یەکــدی بــێ و، پێکـەوە جۆشـدراوو سـاغ و تۆکمـە بـن.

**١١- برایەتیی ویەکسانیی درەوشانەوە:**

ئەگـەر خەڵـک بـە دروشـم و شـیعار باسـی برایەتیـی و، باسـی یەکسـانیی دەکات، لـە نوێـژو خـوا پەرسـتیی دا، بـە تایبـەت لـە نوێـژدا، هەڵبەتـە حەجیـش هـەر وایـەو لـە ڕۆژووگرتنیشـدا، ئـەو یەکسـانیی و برایەتیـی و وەک یـەک بوونـە، زۆر بـە جوانیـی بەرجەسـتە دەبـێ، هەمـوو مسـوڵمانان پێکـەوە دەوەسـتن، یەکێـک لـە پێشـیانەوەیە تاکـو ئـەو جووڵـە نـەکات، ئـەوان جووڵـە ناکـەن، کـەس پێـش کـەس ناکەوێتـەوە، شـان بـە شـانی یەکدیـەوە، پـێ بـە پێـی یەکدیـەوە، وەک دیوارێکـی قورقوشـمیی وان.

**١٢- ڕاهاتن بە ڕێک و پێکییەوە:**

وەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: **{لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ}** **(أخرجـه البخـاري: ٦٨٥ ومسـلم: ١٠٠٦ عـن النُّعْـمَانِ بْـنِ بَشِـيرٍ)**، واتـە: ڕیزەکانتان ڕاسـت دەکـەن، یاخـود خـوا ڕووشـتان لێـک وەردەگێڕێ.

پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگیی بەوە داوە کە مسوڵمانان بە ڕێکیی بوەستن و، پاڵ وێکبدەن و لێک نیزیک بن، بەڵام بە بێ یەکدی سەغڵەت کردن.

**١٣- خووگرتن بە فەرمانبەرییەوە:**

پێشەوا، ئیمام بۆ ئەوەیە کە نوێژی مسوڵمانان، ئەو خوا پەرستییەیان بۆ ڕێک بخات، دەبێ ئەو جووڵە بکات، ئنجا ئەوان بە دوای ئەودا جووڵە بکەن، پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەیەکی گەورەی کردوە لەو کەسەی لە پێش ئیمامدا جووڵە دەکات، وەک فەرموویەتی: **{أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ، أَوْ لاَ يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ، أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ ؟!}** **(أخرجه البخاري: ٦٩١، ومسلم: ٤٢٧)**، واتە: ئایا یەکێکتان ناترسێ کە لە پێش ئیمامدا سەر بەرز دەکاتەوە، خوا سەری بکات بە سەری کەر؟ واتە: ئەو کەسە ئینسانێکی نەفامە، ئیمام بۆ ئەوەیە کە بە دوای ئەودا جووڵە بکرێ و چاو لەو بکرێ، بەڵام کەسێک پێش ئیمامەکەی بکەوێتەوە، مانای وایە نازانێ و نافامێ بۆچی نوێژ دەکات و بۆچی ئەو ئیمامە داندراوە!

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمان کردن بە پێغەمبەر ﷺ کە بە باشترین شێواز نەبێ، مشتومڕ لەگەڵ خاوەن کتێبانـدا نـەکات و، باسی ئـەوە کە قورئـان لە خـواوە دابەزێراوەو، کەسانی بەویژدانی خاوەن کتێبان بـڕوای پێدێنن و، نەخوێندەوار بوونی موحەممەدیش ﷺ باشترین بەڵگەی ڕاستییەتیی، وەحیی خوا بۆ هاتنیەتی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾، شەڕە قسەش لەگەڵ خاوەن کتێباندا مەکەن، مەگەر بەو شێوازە کە باشترینە، (و) بۆ بادانەوە (عطف)یەو ئەم ڕستەیە بادەداتەوە بۆ سەر ڕستەی یەکەم: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، واتە: کتێبی خوا بخوێنەوە بەسەر خەڵکداو، نوێژ بەرپا بکەو، لە کاتی تێکگیرانیشدا لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا، بە باشترین شێواز نەبێ، مشتومڕو شەڕەقسە مەکە، خۆت و هاوەڵان و شوێنکەوتووانت.

**وشـەی (مُجادَلَـة: مُفَاعَلَـةٌ مِـنَ الجَـدَلِ، وَهُـوَ إِقامَـةُ الدَّلِيـلِ عَـلى رَأْيٍ اخْتَلَـفَ صَاحِبُـهُ مَعَ غَيْرِهِ)، (مُجادَلَـة) لەسـەر کێشـی (مُفَاعَلَةٌ)یـە لـە (جَـدَل)ەوە هاتـووە، ئەویش بریتیە لـە بەڵگـە هێنانـەوە لەسـەر ڕایـەک، کـە خاوەنەکـەی لەگـەڵ بەرانبەرەکەیـدا ڕاجیایـە.**

هەندێکیش گوتوویانە: (جِدال) ئەوەیە کە هەر کامێک لە دوو تەرەفەکان، یان زیاتر لە دوو تەرەفیش بن، دەیەوێ هاوەڵەکەی بخاتە سەر زەوی کە (جَدالة)ی پێ دەگوترێ واتە: زەوییەکی رەق، هەر کامێکیان دەیەوێ ئەویدیکە بخات.

﴿إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾، مەگەر بە شێوازێک کە باشترین شێوازە، ئەم (إلَّا)یە، ((إستِثْناء) مِنْ مَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ الْمُسْتَثْنَى)) هەڵاواردنە لە قرتێنراوێک کە هەڵاوێرراوەکە دەیگەیەنێ، یانی: (لاَ تُجادِلُوهُم بِالجِدالِ إلاَّ بِالَّتي هِيَ أحْسَن) واتە: شەرە قسەیان لەگەڵ مەکەن بە شەرە قسەکردن، مەگەر بە شەرە قسەیەک کە باشترینە، ئنجا (بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ) دوو واتای هەن:

یەکەم: (بِالَّتي هِيَ أحْسَنُ مِن مُجادَلَةِ المُشْرِكين) واتە: بە شێوازێک کە باشترینە لە شێوازی شەرە قسە لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران دا.

دووەم: (بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ) ئەوە نیە کە بەرانبەرێکی لەبەر چاو گیرابێ و بەرزیی و نزمییان پێکرابێ، بەڵکو: بەرزیی و نزمیی لێدارنراو (مَسْلُوبُ المُفاضَلَة)ە، مەبەست ئەوە نیە باشتر بێ لە بەرانبەرەکەی، بەڵکو لە خودی خۆیدا باشترین بێ.

٢)- ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾، جگە لەوانەی کە ستەم دەکەن لەوان، ئەوانەی ناسەلمێنن، یان ئەوانەی دژایەتیی مسوڵمانان دەکەن و سنوورەکان دەبەزێنن، ئەوانە بۆتان هەیە، بە شێوازێک کە بەرپەرچ دەدرێنەوەو دەمکوت دەکرێن، بیاندوێنن، نەک بە باشترین شێواز، وەک گوتراوە: (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال) بۆ هەر شوێنە قسەی خۆی هەیە، کەسێک دەیەوێ بتشکێنێ، دەیەوێ تۆ وا پێشان بدات کە نازانی، یان پەیامەکەت هەڵەیە، جاری واو لەگەڵ کەسی وادا، لەسەر بەردەوام بوون بە باشترین شێواز، راست نیەو پڕ بە پێستی حاڵەتەکە نابێ، بۆیە دەبێ هەر کەسە بە پێی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دا بکرێ، بەڵام هەر لە ئاستی بەرزی رەوشت و ئاکاری مسوڵمانانەدا.

٣)- ﴿ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ ﴾، هەروەها بڵێن: بڕوامان هێنا بەوەی کە بۆ لای ئێمە دابەزێنراوە، هەروەها (بەوەی) بۆ لای ئێوەش دابەزێنراوە.

٤)- ﴿ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ ﴾، پەرستراوی ئێمەو پەرستراوی ئێوەش یەکێکە (کە خوایەو ﷻ، بەس ئەو شایستەی پەرستنە).

٥)- ﴿ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾، ئێمە بۆ ویش ملکەچین، واتە: ئێوەش وەرن ملکەچ بن بۆ خوا، ئەمە هەم زەمینە خۆشکردنە، هەم فێرکردنی موناقەشەو شەڕەقسەیە بە باشترین شێواز، کە بریتیە لە دیارییکردنی خاڵە هاوبەشەکان، پێش خاڵە جیاوازەکان.

لێرەدا چەند خاڵێکی هاوبەش باسکراون:

أ- (ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ).

ب- (وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ).

ج- (وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ)، یانی: ئێوەش خۆتان هەروا دەزانن کە ملکەچن بۆ خوا، کەواتە: ئەوەش خاڵی هاوبەشە لە نێوانماندا.

پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرمایشتێکی هەیە، دەفەرموێ: **{لَا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ، وَقُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ، وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ} (أخرجه البخاري: ٧٥٤٢)**، واتە: خاوەن کتێبەکان بە ڕاست دامەنێن و بە درۆشیان دامەنێن و، بڵێن: بڕوامان بەوە هێناوە کە بۆ لای ئێمە دابەزێندراوەو، بەوەی بۆ لای ئێوەش دابەزێندراوەو، پەرستراوی ئێمەو پەرستراوی ئێوە یەکێکە، ئێمە بۆ خوا ﷻ ملکەچین.

٦)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، هەروەها بەو شێوەیە کتێبمان بۆ لات دابەزاندوە، (وَكَذَٰلِكَ) بەو شێوەیە، بەو شێوە سەرسوڕهێنەرو، سەرنجڕاکێش و جوانە، کتێبمان بۆ لای تۆ دابەزاندوەو، هەم شێوازی دابەزاندنەکەی هەر ئایەتە لە شوێنی خۆی، هەر سوورەتەو لە کات و شوێنی خۆیدا، هەم کتێبەکە بۆ خۆی کە دابەزێندراوەکەیە،

لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، لە ڕووی پاراوییەوە، لە ڕووی نێوەڕۆکیەوە، لە ڕووی شێوازی بەرزییەوە، شایستەی ئەوەیە کە هەر بە خۆی بچوێنرێ، چونکە شتێکی دیکەی وەک ئەو، یاخود هاوتای وی نیە، پێی بچوێنرێ.

٧)- ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾، ئنجا ئەوانەی کتێبمان پێداون، بڕوای پێ دێنن، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێداون و، ئەمینداریش بوون بەسەریەوە، ئەیفەرمووە: (فَأَهْلُ الكِتَابِ) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، ئەوانەی کتێبمان پێداون، یانی: کتێبمان پێداون و، ئەمینداریش بوون بەسەر ئەو کتێبەوەو شایستەی ئەوە بوون کتێبیان پێبدرێ، لێرەدا مەبەست پێی ئەوانەیانن کە بە ئینساف و ویژدانن.

﴿ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ ﴾، بڕوای پێ دێنن، واتە: لە داهاتوودا بڕوای پێ دێنن، یاخود (يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ) بۆ هێنانە بەرچاوی دیمەن و وێنەکەیە، بۆیە بە کرداری ئێستاو بەردەوام (فعل المضارع) هێناویەتی.

٨)- ﴿ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦ ﴾، هەروەها لەوانەش (لە کافرەکانی ڕۆژگاری خۆشت، لە کۆمەڵگاکەی خۆشتدا) هەیانە بڕوای پێ دێنێ.

٩)- ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، جگە لە بێبڕوایانیش هیچکەس نکووڵیی لە ئایەتەکانی ئێمە ناکات.

(الجُحُود: عَدَمُ الإعْتِرَافِ بِالحَقِّ، مَعَ مَعْرِفَةِ الحَق) (جُحُود) ئەوەیە مرۆڤ هەق بزانێ و بناسێ، بەڵام دانی پێدا نەهێنێ، واتە: بە دڵ بزانێ ئەوە هەقە، بەڵام بە زمان پێی لێنەنێ و دانی پێدا نەهێنێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: تەنیا بێبڕوایان نکووڵیی دەکەن لە نیشانەو ئایەتەکانی ئێمە، (کَافِرون) بێبڕوایان ئەوانەن کە هەقیان پێکەیشتوەو دایانپۆشیوە، هەقیان پێکەیشتوەو ڕەتیان کردۆتەوە، بەو کەسە دەگوترێ: (کَافِر)، بەڵام کەسێک هەقی پێنەگەیشتبێ و ڕەتی نەکردبێتەوە، یاخود بە شێوەیەکی شێوێندراو هەقی پێکەیشتبێ و ڕەتی کردبێتەوە، ئەوە بە کافر لە قەڵەم نادرێ، (کافِر) لەسەر کێشی (فاعِل)ە، بە مانای (ساتِر)ە، پۆشەر،

یانی: کەسێک هەقی پێگەیشتبێ و، هەقەکەی پۆشیبێ و ژێر لێوی خستبێ و دانی پێدا نەهێنابێ.

١٠)- ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ ﴾، تۆ پێش وی هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە، خوا ﷻ بەڵگەیەکی زۆر بەهێز دێنێتەوە لەسەر هەققانییەتی موحەممەد ﷺو، ڕاستییەتی ئەو وەحیی و پەیامەی بۆی هاتوە، کە لە خواوەیە، نەک لە خۆیەوە، یان غەیری خۆیەوە، دەفەرموێ: تۆ پێش ئەمە (لە پێش قورئاندا)، هیچ جۆرە کتێبێکت نەخوێندۆتەوە.

١١)- ﴿ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ﴾، هەروەها هیچ جۆرە کتێبێکیشت پێش ئەم قورئانە بە دەستی ڕاستت نەنووسیوە، واتە: تۆ نە خوێندنەوەت هەبووە، نە نووسین، کە یەکێک لە دوو واتایەکانی (أُمّي) ئەوەیە، (عديم القراءة والكتابة) واتایەکی دیکەشی ئەوەیە: نەشارەزا لە کتێبە پێشووەکان، بە هەردوو واتایەکەش موحەممەد ﷺ (أُمّي) بووە، نە خوێندن و نووسینی زانیوەو، نەشارەزای کتێبە پێشووەکانیش بووە.

وەک مەولەوی شاعیر دەڵێ:

هەتیو وە ئەدەو، ئوممی عەللامە .... لەمە موعجیزتر موعجیزە کامە

پێغەمبەر ﷺ بێ باب بووە، کەچی لە لووتکەی ئەدەب و ڕەوشتی بەرز وجواندا بووە، ئنجا خوێندن و نووسین نەزانێ و شارەزای کتێبە پێشووەکان نەبێ، عەللامەش بێ، (لەمە موعجیزتر موعجیزە کامە) چ شتێک موعجیزەیە، ئەگەر ئەمە موعجیزە نەبێ؟!

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ﴾، تۆ هیچ کتێبێکت بە دەستی ڕاستت نەنووسیوە، ئەمە بۆ هێنانە بەرچاوی حاڵەتی نەخوێندەواریی و نەنووسینی پێغەمبەرە ﷺ، وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ ﴿٣٨﴾ ﴾الأنعام، هیچ باڵندەیەک نیە بە دوو باڵەکانی بفرێ، دیارە باڵندە

هەر بە دوو باڵ دەفڕێ، بەڵام خوا ﷻ وەک هێنانە بەرچاوی دیمەنی فڕینی باڵندەکە، هێناویەتی.

ئنجا ئایا حیکمەتی چییەو بۆچی موحەممەد ﷺ لە پێش قورئاندا هیچ کتێبی نەخوێندوون و، هیچ شتێکیشی نەنووسیوە؟

١٢)- ﴿ إِذًا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾، چونکە ئەگەر لە پێش قورئاندا کتێبت خوێندبایەو، پێش ئەوەی قورئانت بۆ بێ، بە دەستی ڕاستت شتت نووسیبایە، ئەوانەی لەسەر ناهەقن، دەکەوتنە دوو دڵییەوە، (مُبْطِل) یانی: ئەوەی لەسەر (باطِل)ە، بەڵام ئێستا هیچ بیانوویان نیە بکەونە دوودڵیی و گومانەوە، بەرانبەر بە تۆ، چونکە تۆ خوێندنت نەزانیوە، تاکو لە کتێباندا بخوێنی و، نووسینت نەزانیوە تاکو کەسێک بۆت بنووسێ و بینووسیەوە، ئەدی ئەو عیلم و مەعریفەتە کە قورئان گرتوویەتە خۆی، چۆن بۆت پەیدابوو؟ کە ئەگەر هەموو بەشەرییەت کۆبکرێتەوە، بگرە تێکڕای مرۆڤ وجند، ناتوانن وەک ئەو قورئانە بێنن، وەک لە سوورەتی (الإسراء)دا هاتوە: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەگەر ئینس و جینن (مرۆڤەکان و جینندەکان) هەموویان تێکڕاو وێکڕا، کۆببنەوەو پشتگیریی یەکدی بکەن، ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن.

بەڵکو ناتوانن وێنەی دە سوورەت، بەڵکو ناتوانن وێنەی سوورەتێکیشی بێنن و، نەشیانتوانیوە.

کەواتە: هیچ بواری کەوتنە دوودڵیی و گومان نیە، بەرانبەر بە قورئان و بەرانبەر بە موحەممەد ﷺ، چونکە نە خوێندنەوەی زانیوەو، نە نووسینیشی زانیوە، پاشان موحەممەد ﷺ درۆو ناڕاستیی لە بوونیی دا نەبووە، لەگەڵ مرۆڤەکاندا، لەگەڵ بەندەکاندا ناڕاستیی نەگوتوە، تاکو ئێستا بەرانبەر بە خوای بەندەکان و، بە ناوی ئەوەوە شتێکدا، هەڵبەستێ بڵێ: ئەوە خوا بۆی ناردووم!! ئنجا لە قورئاندا خوا لە چەند شوێنێک ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێ و دەفەرموێ: نەدەبوو وات کردبایە، بۆچی واتکرد؟ نەدەبوو ئەو کارە بەو شێوەیە بێ!

١٣)- ﴿ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ ﴾، بەڵكو ئەو (قورئان)ە ئایەتە ڕۆشنەکانە لەسینەکانی ئەوانەدا کە زانیارییان پێدراوە.

(بـل) بـۆ گواسـتنەوەیە (إضْرَابٌ عَـن تَطَـرُّقِ الشَّـكُّ إِلَيْـهِ) یـانی: نـەک هـەر بـواری کەوتنـە دوودڵیـی، ئەوانـەی کـە ملـی ناهەقیـان گرتـوە، نیـە، بەڵکـو ﴿ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ ﴾، ئـەم قورئانـە بریتیـە لـە ئایەتـە ڕۆشـنەکان.

﴿ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ ﴾، لـە سـینەی ئەوانـەدا کـە زانیارییـان پێـدراوە، واتـە: زانیاریـی وەحییـان پێـدراوە، کـە دەگونجـێ لێـرەدا مەبەسـت پێـی پێغەمبـەر ﷺو هاوەڵانـی بـێ (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هەروەهـا زانایانـی میراتگـری پێغەمبـەر ﷺ، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ کـە بـاس و خـوا سـی ئـەم قورئانـە، بـاس و خواسـی موحەممـەد ﷺ کـە ئـەم قورئانـەی بـۆ دادەبەزێـنرێ، لـە لای زانایانـی خـاوەن کتێبـەکان هەیـە، وەک لـە سـوورەتی (الأعراف)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ﴿١٥٧﴾ ﴾، واتـە: پێغەمبـەری ﷺ ڕەوانەکـراوی نەخوێنـدەوار کـە لـە لای خۆیـان بـە نووسراویـی دەیبینـن، لـە تـەورات و ئینجیلـدا، لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا باسـێکی سـەربەخۆمان کـردوە، لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـە موبارەکـەدا، لەبـارەی هەبـوونی بـاس وهەواڵـی پێغەمبـەری کۆتایـی (محمـد) لەکتێبـی خـاوەن کتێبـەکان دا.

١٤)- ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، جگە لە ستەمکارانیش کەس نکووڵیی لە نیشانەکانی ئێمە، لە ئایەتەکانی ئێمە ناکات، واتە: لەبەر ئەوەی ستەمکارن، بە هۆی ستەمەکەیانەوە، نکووڵیی دەکەن لە ئایەتەکانی ئێمە.

خوا ﷻ ئەوانەی بێبڕوان بە قورئان، بە سێ سیفەت، وەسفی کردوون:

١- (ٱلۡكَٰفِرُونَ) لە: ﴿ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾دا.

٢- (ٱلۡمُبۡطِلُونَ) لە: ﴿ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾دا.

٣- (ٱلظَّـٰلِمُونَ) لە: ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾دا.

ئەوانـە (كَافِـر)ن، چونكـە هەقێـك كـە پێیـان گەیشـتوە، دایدەپۆشـن، هەروەهـا (مُبْطِـل)ن، چونكـە ئەهلـی (باطِـل)ن، شـوێن بەتـاڵ و ناهـەق كەوتـوون، دیسـان (ظالِـم)ن، لەبـەر ئـەوەی سـتەم لـە خۆشـیان و لـە خەڵكیـش و لـە پەیامـی خـواش دەكـەن، لەسـۆنگەی ئـەوەوە كـە دەشـزانن هەقـەو دانـی پێـدا ناهێنـن، لەبەرچـی دانـی پێـدا ناهێنـن؟ چونكـە ڕێـی ڕاوو ڕووتیـان لـێ دەگـرێ، ڕێـی خۆسـەپاندنیان لـێ دەگـرێ، ڕێـی ناشـەرعییان لـێ دەگـرێ، ڕێـی وەسـەرێكنانی سـەروەت و سـامانی ناشـەرعیی و، ڕێـی قۆرخكاریـی سـامان ودەسـتەڵات (ثـروة وسـلطة)یان لێدەگـرێ، بۆیـە دانـی پێـدا ناهێنـن و دانوویـان لەگەڵیـدا ناكوڵـێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**داواکردنی بێبڕوایان بە دابەزێنرانی موعجیزان و، وەڵامدرانەوەیان بەوە کە ئەوە کاری خوایەو، ئەویش قورئانی وەک بەڵگەو موعجیزە بۆ ناردوون، خواش بەسە شایەد بێ لە بەینداو، بڕواداران بە ناهەق (باطل) و بێبڕوایان بە خواش، زیانبارانی ڕاستەقینەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، هەروەها گوتیان: دەبووایە لەپەروەردگاریەوە نیشانەکانی دابەزنە سەری! پیتی (و) لە (وَقَالُوا۟)دا، ئەم ڕستەیە بادەداتەوەو دەیگێڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی پێشوو، واتە: کافرەکان وێڕای ئەوەی کە هەقیان ڕەفز کرد، ئەو پێشنیارەشیان کرد، ئەو داواکارییەشیان کردو گوتیان: ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، (لَوْلَآ) لێرەدا بە مانای (هَلاَّ)یەو بۆ هاندان (تحريض)ە، واتە: دەبووایە لە پەروەردگاریەوە چەند نیشانەیەکی بۆ دابەزن، مەبەستیان لە نیشانەکان (ءَايَٰتٌ) ئەو موعجیزانەن کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ والسَّلاَم) هاتوون، واتە: دەبووایە بەڵگەو موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ موحەممەد ﷺ دابەزێ، دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا، خوا وەسفی کردن کە بێبڕوا (كافِر)ن، ناهەق (مُبطِل)ن، ستەمکار (ظالِم)ن، ئنجا دێتە سەر باسی بیانوو گرتنیان و داواکاریی پێشکەشکردنیان!

٢)- ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، خوا له وەڵامی ئەوەدا دەفەرموێ: بڵێ: موعجیزەو نیشانەکان تەنیا له لایەن خواوەن، (إنَّمَا: أداةُ الحَصْرِ والإثْبات) (إنَّمَا) ئامرازی کورتهەڵێنان و چەسپاندنە، واته: نیشانەو موعجیزەکان تەنیا له لای خوان، تەنیا ئەو دەیاننێرێ، ئەویش به پێی پێویستیی و، خوا شارەزا و کار بەجێیه، بۆ هەر پێغەمبەرێک و بۆ هەر کۆمەڵگایەک، له هەر هەلومەرجێکدا ئەو موعجیزەو بەڵگەیەی ناردوە، که پێویست بوو بۆ ئەوێ و، پڕ به پێستی ئەو شوێنەو ئەو کاته بووە.

٣)- ﴿ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، دیسان به ئامرازی کورتهەڵێنان و چەسپاندن، واته: من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەرم، یانی: ئەوە که موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ من بێ، نیشی من نیه، نیشی خوای پەروەردگارە، خوای پەروەردگاریش که خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەت و زانیارییه، ئەو قورئانەی به بەس (كافي) زانیوە، که موعجیزەو بەڵگەی من بێ.

٤)- ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾، ئایا بۆ ئەوان بەس نیه، که ئێمە کتێبمان دابەزاندۆته سەر تۆ، بەسەریان دا دەخوێندرێتەوە؟

٥)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾، لەوەدا به دڵنیایی بەزەیی هەیەو، یادخستنەوە هەیە، بۆ کۆمەڵێک بڕوا بێنن.

لێرەدا خوا ﷻ ئەو موعجیزەیەی که بۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ ناردوە، به پێنج سیفەتان وەسف دەکات:

١- سیفەتی یەکەم: کتێبه، وەک دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، کتێبێکە، نووسراوەتەوەو، قورئانێکە دەخوێندرێتەوە.

٢- دووەم سیفەتی ئەوەیه: ﴿ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴾، بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، دەتوانن گوێی لێ بگرن، دەتوانن تەماشای بکەن و لێی ورد ببنەوە، موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو یەک شت بووە، ئەوانەی بینیویانە، بەس ئەوان بینیویانە، ئەگەر حوشترەکەی

صاڵح بووە، ئەگەر گۆچانەکەی مووسا بووە، ئەگەر دەستی بووە، ئەگەر مردوو زیندووکردنەوەی عیسا بووە، ئەوکاتە تەنیا ئەوانەی بینیویانە لەو کات دا بینیویانەو تەواو، بەڵام خەڵکەکەی دیکە، وەک بەسەرهات بۆیان گێردراوەتەوە، بەڵام ئەم قورئانە بەردەوام دەخوێنرێتەوە بەسەریانداو، لەبەر دەستیانە، هەموویان دەتوانن گوێی لێ بگرن و، هەمووشیان دەتوانن بیخوێننەوە.

٣- سیفەتی سێیەم: بەزەیی خوایە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً﴾، بە دڵنیایی لەوەدا بەزەیی هەیە، واتە: قورئان هۆکاری وەدەستهێنانی بەزەیی خوایە.

٤- سیفەتی چوارەم: ﴿وَذِكْرَىٰ﴾، هەروەها بیرخەرەوەشە.

٥- سیفەتی پێنجەم: ﴿لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾، بۆ کۆمەڵێک بڕوا بێنن، ئەگەر لە بڕوا بگەڕێن.

کەواتە: قورئان هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی هەن:

١- کتێبە.

٢- لەبەر دەستیانەو دەتوانن بیبخوێننەوەو بەسەریاندا بخوێنرێتەوەو گوێی بۆ بگرن.

٣- مایەی بەزەیی خوایەو بەرجەستەکەری بەزەیی خوایە بۆیان.

٤- بیرخەرەوەیە.

٥- بە مەرجێک لە ئیمان بگەڕێن و مەبەستیان ئیمان بێ.

٦)- ﴿قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا﴾، بڵێ: خوا بەسە شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەدا، (شَهید) بە مانای شایەدو، چاودێرو، بەڵگە، دێ، بەڵام لێرەدا: (ضُمِّنَ «شَهِيداً» مَعْنى حَكَما وحاكِماً، فَعُدِّيَ بِظَرْفِ بَيْنِي وَ بَيْنَكُم)، بۆیە (شَهِيداً) بە ( بَيْني وَ بَيْنَكُم) تەعەددای پێکراوە تاکو مانای (حاكِم)و (حَكَم)ی بخرێتە نێو، یانی: (كَفَى بِاللهِ حاكِمًا وحَكَماً بَيْني وَ بَيْنَكُم)، ئەگەرنا (كَفَى بِاللهِ شَهِيداً) واتە: خوا بەسە شایەد بێ، پێویستیی بەوە نەدەکرد بە جگە لەخۆی بەرکار بخوازێ، بەڵام بۆ ئەوەی وێڕای:

شایەدیی و چاودێریی، مانای حوکمڕانیی و دادوەرییشی بخرێتە نێو، بە (بَيْنِي وَ بَيْنَكُم) تەعەددای کردوە.

٧)- ﴿يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە دەیزانێ، واتە: خوا کە شایەدە لە نێوان من و ئێوەدا، لەسەر ڕاستیی قورئان و، دادوەرە لە نێوان من و ئێوەدا لەسەر ئەوە کە قورئان ڕاستە، ئەو خوایە ﷻ نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، واتە: قورئانێکی دابەزاندوە کە نهێنیی ئاسمانەکان و زەوی هەموویان گرتوونە خۆی.

٨)- ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان بە ناهەق وپووچ (باطل) هێناوەو بە خوا بێبڕوابوون ئەوانەن زیانبارن.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾، تـا ئەوانـەن زیانبـار، زیانبارانـی ڕاسـتەقینە تەنیـا ئەوانـەن، چونکـە سـەرمایەکەیان کـە بریتیـە لـە تەمەنیـان لـە دەسـتچووە، لـە شـوێنکەوتنی پـووچ (باطـل)و بڕواهێنـان پێیـداو، هەقیـش لـەوێ بـووەو بڕوایـان پێنەهێنـاوە.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾، یـانی: ئـەوان ئەگـەر لـە موعجیـزەو بەڵگـە دەگەڕێـن لەسـەر ڕاسـتیی موحەممـەد ﷺ ئایا بـۆ ئـەوان بـەس نیـە کـە ئێمـە کتێبـمان ناردۆتـە سـەر تـۆ، بەسـەریاندا دەخوێنرێتەوە، مایـەی بەزەیـی و بیرخسـتەنەوەیە بـۆ کەسـانێک بـڕوا بێنـن؟ ئنجـا: ﴿قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا﴾، خـواش بەسـە شـایەدو بەڵگـە بـێ لـە نێـوان مـن و ئێوەداو، بەسـە حوکمـڕان و دادوەر بـێ، کـە زانیاریـی خـواش ﷻ، هیـچ شـتێکی لـێ ون نابـێ:

﴿يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدا هەیـە، دەیزانـێ، ئنجـا ئـەو کتێبـەش کـە خـوا دەفەرمـوێ: بەسـە موعجیـزەو بەڵگـە بـێ، نهێنیـی ئاسـمانەکان و زەوی خسـتۆتە نێـوی، بـا تەماشـای بکـەن و لێـی ورد

بینەوە، ئنجا بۆیان دەردەکەوێ کە هەموو ئەو نهێنییانەی کە لە گەردووندا هەن، لە دروستکراوەکاندا هەن بە سەرو خواریەوە، بە ئاسمانەکان و زەوییەوە، خوا خستوونیە نێو کتێبەکەی خۆی، بەو ئەندازەیەی بەشەر بتوانێ دەرکیان بکات و، بەشەر پێویستیی پێیان بێ و، بەشەر قەناعەت پێ بێنن، کە ئەم قورئانە ناگونجێ لە سەرچاوەیەک جگە لە زانیاریی بێسنووری خواوەو، لە سەرچاوەیەک جگە لە حیکمەت و دەسەڵاتی رەهاو بێسنووری خواوە، هاتبێ.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**بێبڕوایـان پەلـە دەکـەن لـە هاتنـی سـزای خـواو، بـە پێـی سیسـتمی خـواش پەلـەی لێناکـرێ و، کاتێکیـش کـت و پـڕ دێ، بێبڕوایـان هەسـتی پـێ ناکـەن و، دۆزەخیـش دەوری داون، کاتێـک دێ کـە سـزای ئاگـر سـەرو خواریـان دادەگـرێ:**

خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ﴾، پەلەشت لێ دەکەن بە هاتنی سزا، هاتنی ئەو ئازارەی هەڕەشەیان پێی لێکراوە، (ألْ)ی سەر (بِالْعَذَابِ) بۆ (عهد)ە، پەلەت لێدەکەن لە هاتنی سزاو ئازارەکە و ئاگری بڵێسەداری دۆزەخە.

٢)- ﴿ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ ﴾، ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە کاتێکی دیاریکراو هەیە، ئەو سزاو ئازارەیان بۆ دەهات، (مُسَمًّى أَي: مُحَدَّد ومُعَيَّن)، دیاریکراوو دانراو، چونکە (مُسَمًّى) یانی: ناوبراو، ئنجا شتێک کە ناودەبردرێ، مانای وایە دیاریکراوە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە بە پێی سیستمی خوا، هاتنی ئەو سزایە، کاتێکی دیکەی بۆ دیاریکراوە، نەک لەم ژیانە دنیاییەدا بێ، بەڵکو لە دوای قۆناغی بەرزەخەوە دێ، ئەوە بۆیان دەهات.

٣)- ﴿ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، بە دڵنیایی کت وپڕیش بۆیان دێ، بێ ئەوەی هەستی پێبکەن، کت و پڕو لە ناکاو.

ئنجا ئایا ئەوەی بۆیان دێ:

أ- ئەو سزایەی خوایە کە بریتیە لە دۆزەخ.

ب- یاخود مەبەست پێی سزایەکی دیکەیە لە دنیادا یەخەیان دەگرێ؟

جـ یان مەبەست پێی مەرگ و مردنیانە؟ کە ئەویش بۆ خۆی ئازارەو سزای کافران لەوێڕا دەست پێدەکات لە سەرەمەرگەوە، هەموویان دەگرێتەوە.

٤)- ﴿ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ ﴾، پەلەت لێدەکەن بە هاتنی ئەو سزاو ئازارە بەڵێندراوەی، هەڕەشە پێ لەوان کراوە.

٥)- ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، [(و)ی سەر (وَإِنَّ) بۆ حاڵە]، واتە: لە حاڵێکدا کە دۆزەخیش ئابڵووقەدەرە بۆ کافران، ئابڵووقەی کافرانی داوە، واتە: لێی دەرباز نابن، چونکە کەسێک ئابڵووقەدرابێ، دەورەی درابێ، ڕێگای هەڵاتن و دەربازبوونی نیە.

٦)- ﴿ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ ﴾، ئەو ڕۆژە کە سزاو ئازار لە سەرروویانەوە، دایاندەپۆشێ و لە ژێر لاقەکانیشیانەوە.

ئەمە وێناکردنی چۆنیەتیی دەوردانی دۆزەخە بۆ ئەوان و، ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە دەفەرموێ: دۆزەخ ئابڵووقەی داون، یانی: لەو ڕۆژەدا کە تووشی دۆزەخ دێن، هەم لە سەرروویانەوە ئاگر هەیە، هەم لە ژێر لاقیانەوە ئاگر هەیە، (التَّغْشِيَةُ: التَّغْطِيَة والحَجْبُ) (تَغْشِيَة) بریتیە لە داپۆشین و پەردەپۆش کردن، ئاگر سەرو خواریان دەگرێ، کە دەگوترێ: سەرو خوار مانای وانیە پاش و پێش و ڕاست و چەپیشیان ناگرێ، یانی: لە هەر چوار لاوە، ئاگری دۆزەخ دەوریان دەدات.

خوا پەنامان بدات بە لوتف و کەرەمی خۆی و، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە بە هۆی ئیمان و تەقواوە، لە هەڕەشەی خواو سزای خوا، لە ئاگری دۆزەخی خوا، چەپاڵە دەدرێن و دەپارێزرێن.

٧)- ﴿ وَيَقُولُ ذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، [خوا] دەفەرموێ: بیچێژن ئەوەی دەتانکرد، واتە: سزای ئەوەی دەتانکرد بیچێژن.

(وَيَقُولُ ) خوێنراویشەتەوە: (وَنَقُولُ) واتە: دەڵێین: بیچێژن سزای ئەوەی دەتانکرد.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە کۆتـا دەرسـە لـە سـوورەتی (العنکبـوت)، لـە چـوارده ئایەتـی کۆتایـی پێکهاتـوە: (٥٦ - ٦٩)، پێنـج ئایەتـی سـەرەتا: (٥٦ - ٦٠) باسـی کۆچکردنـن لـە پێنـاوی خـوادا، سـێ ئایەتـی دواییـان: (٦١ - ٦٣) باسـی چەنـد نیشـانەیەکی پەروەردگارێتیـی خـواو، نیعمـەت و چاکەکانـی لـە ژیانـی مـرۆڤ دان، ئایەتـی دوای وان: (٦٤) باسـی ژیانـی دنیـاو دواڕۆژە، چـوار ئایەتەکانـی دوای وی: (٦٥ - ٦٨) باسـی ڕاسـتیێتی تەنیـا خـوا پەرسـتیی و پووچەڵیـی شـیرکن.

ئایەتـی کۆتاییـش: (٦٩) باسـی تێکۆشـەرانی ڕێـی خوایـە، کـە خـوا لەگەڵیاندایـەو، بـە ڕێنمایـی و هاوکاریـی تایبەتـی خـۆی لەگەڵیاندایـە، بەرچاویـان ڕوون دەکات و، پشـتیان دەگـرێ و هاوکاریانـە.

﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٣﴾ وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي

ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئـەو بەندانـەم کـە بڕواتـان هێنـاوە! بێگومـان سـەرزەمینی مـن فراوانـە! (بۆیـە لەبـەر بەجـێ نەهێشـتنی نیشـتیمان، مـل بـۆ کوفـرو سـتەم کـەچ مەکـەن و، کـۆچ بکـەن،) تاکـو تەنیـا مـن بپەرسـتن ﴿٥٦﴾ (لـە مردنیـش مەترسـن) هەمـوو کـەس چێـژەری مردنـە، دواییـش بـۆ لای ئێمـە دەگێردرێنـەوە ﴿٥٧﴾ ئەوانـەش کـە بڕوایـان هێنـاوەو، کـردەوە چاکەکانیـان ئەنجـام داون، لـە بەهەشـتدا لـە کۆشـکە بـەرزەکان دا نیشـتەجێیان دەکەیـن، ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن و تێیانـدا هەمیشـەیین (ئەمـە پاداشـتی چاکەکارانـە) باشـترین پاداشـتیش هـی ئەنجامـدەران (ی کـردەوە باشـەکان) ن ﴿٥٨﴾ ئەوانـەی خۆڕاگـر بـوون و تەنیـا پشـتیان بـە پەروەردگاریـان دەبەسـت ﴿٥٩﴾ گەلێـک ژیانداریـش هـەن بژیوەکەیـان هەڵناگـرن، خـوا بژیـوی ئێـوەو ئەوانیـش دەدات (بۆیـە بـا بیرکردنـەوە لـە بژیـو، ڕێگـری کۆچکردنتـان نەبـێ)و ئـەو (خـوا) بیسـەری زانایە ﴿٦٠﴾ ئەگەر لێشیان بپرسـی: کێ ئاسـمانەکان و زەوی دروسـتکردوون و، خـۆرو مانگـی ڕام و ملکـەچ کـردوون؟ بـە جەختکردنـەوە دەڵێـن: خـوا، ئـەدی چـۆن (لـە ئیمان و خـوا پەرسـتیی) لادەدرێـن؟! ﴿٦١﴾ خـوا بـۆ هـەر کەسـێ لـە بەندەکانـی بیـەوێ، بژیـوی بـۆ فـراوان (و زۆر دەکات) و (جـاری واشـە) لێـی وە تەنـگ دێنـێ (و کەمـی دەکات)، بـە دڵنیایـی خـوا بـە هەمـوو شـتێک زانایـە ﴿٦٢﴾ ئەگـەر لێشـیان

بپرسی: کێ لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوەو، لە پاش مردنی (وشک هەڵگەڕانی) زەوی پێ ژیاندۆتەوە؟ بە جەختکردنەوە دەڵێن: خوا، بڵێ: ستایش بۆ خوا (کە بەڵگەی بەهێزی لەسەر ئاتەو هۆکاری بێبڕواییتان بێ بەڵگەیی نیە) بەڵکو زۆربەیان نافامن ﴿٦٣﴾ ئەم ژیانە دنیاییەش (لە ڕووە مادییەکەیەوە) تەنیا خافڵان و یارییەو، بەس مەنزڵگای کۆتایی (لە ڕۆژی دوایی دا)ش ژیان (ی ڕاستەقینەو تەواو)ە، ئەگەر بزانن ﴿٦٤﴾ کاتێکیش (هاوبەشدانەرەکان) سواری کەشتیی دەبن (و دەکەونە سەغڵەتیی و تەنگانەوە، بە ملکەچیی و خۆ بۆ ساغکردنەوەوە) لە خوا دەپاڕێنەوە (کە دەربازیان بکات)، کاتێکیش بەرەو لای وشکانیی قوتاریان دەکات، یەکسەر هاوبەش بۆ (خوا) دادەنێن ﴿٦٥﴾ ئنجا با سپڵەیی بکەن بەرانبەر بەو (نیعمەتان)ەی پێمان داون و، با (کەمێک) ڕابوێرن و بەهرەمەند بن (لە خۆشییەکانی ژیانی دنیا) لەمەودوا (سەرەنجامی شوومیان) دەزانن ﴿٦٦﴾ ئایا ئەو (سپڵەو ناسپاس)انە نەیاندیوە کە ئێمە (بە هۆی کابەوە) حەرەمێکی پڕ هێمنیی و ئاساییشمان بۆ ڕەخساندوون، لە حاڵێکدا کە خەڵکی دیکە لە دەوروبەریان دەڕفێنرێ! ئایا بڕوا بە ناهەق دێنن و سپڵەیی بەرانبەر بە چاکەی خوا دەکەن؟ ﴿٦٧﴾ (ئەوانەی بە درۆ هاوبەش بۆ خوادادەنێن) ئنجا ئایا لەو کەسە ستەمکارترە، کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یان کاتێک هەقی (لە خواوە) بۆ دێ، بە درۆی دادەنێ! ئایا لە دۆزەخ دا شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ بێبڕوایان نیە؟ ﴿٦٨﴾ بە دڵنیایی کەسانێکیش کە لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، بەرەو ڕێبازەکانی خۆمان ڕێنماییان دەکەین و، مسۆگەر خواش لەگەڵ چاکەکاران دایە ﴿٦٩﴾].

## شیكرنەوەی هەندێک لەوشەکان

(لَنُبَوِّئَنَّهُم ): واتـە: نیشـتەجێیان دەکەیـن، یاخـود جێگـەو ڕێگەیـان بـۆ ئامـادە دەکەیـن، دەگوتـرێ: (بَوَّأْتُ لَـهُ مَكَاناً أَيْ: سَـوَّيْتُهُ) واتـە: جێگاکەیـم بـۆ چـاک کـرد، مەبەسـت پێـی نیشـتەجێ کـردن و سـەقامگیرکردنی ئیماندارانـە لـە بەهەشـتدا.

(غُرَفًا ): (الغُـرَفُ: جَمْـعُ غُرْفَـة، وَالغُرْفَـةُ: عُلِّيَّـةٌ مِـنَ البِنَـاء)، واتـە: قاتـی بـەرز کـە لـە خانـووو کۆشـکدا هەیـەو، بـە مانـای کۆشـکی بـەرز (القَصْرُ العَالِي)یـش، دێ، هەروەها بـە واتـای باڵەخانـە، یاخـود ئـەو ژوورەی کـە لـە سـەرەوە لـە خانـوودا دەکـرێ، دێ.

(يُؤْفَكُونَ ): (يُصْرَفُـونَ مِـنَ الحَـقِّ إِلَى البَاطِـل) واتـە: لـە هەقـەوە لادەدرێـن بـەرەو بەتـاڵ و بـەرەو ناهـەق.

(وَيَقْدِرُ): (أَيْ: وَيُضَيِّـقُ) تەنـگ دەكات، پێچەوانـەی (يَبْسُطُ )وە، کـە (يَبْسُطُ ) یانـی: پـان ڕادەخـات، فـراوان دەکات، کـە مەبەسـت پێـی زۆر کردنـە، (وَيَقْدِرُ ) واتـە: وەتەنـگ دێنـێ، کـە مەبەسـت پێـی کەمکردنەوەیـە، (قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الـشَّيْءَ: ضَيَّقْتُـهُ، كَأَنَّمَـا جَعَلْتُـهُ بِقَـدَرٍ، بِخِـلاَفِ مَـا وُصِـفَ بِغَـيْرِ حِسَـابٍ)، دەگوتـرێ: (قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الـشَّيْءَ) واتـە: لێـم تەنـگ کـردەوە، ئەندازەگیرییـم کـرد، ئەندازەیەکـم بـۆ دیارییکـردوە، بـە پێچەوانـەی ئـەوەوە کـە دەگوتـرێ: بەبـێ ژمـاردن.

(لَهْوٌ ): (اللَّهْـو: مَـا يَشْـغَلُ الإِنْسَـانَ عَـمَّا يَعْنِيـهِ وَيُهِمُّـهُ، لَهَـوْتُ بِكَـذَا، ولَهَيْـتُ عَـنْ كَـذَا)، (لهو): بریتیە لـە هـەر شتێک کـە مـرۆڤ لـەوەی کـە بەلایـەوە جێـی گرنـگ و مەبەسـتە، بـێ ئـاگای بـکات، دەگوتـرێ: (لَهَوْتُ بِكَذَا) واتـە: پێـی خافـڵام، (وَلَهَيْـتُ عَنْ كَـذَا) واتـە: لێـی خافـڵام، ئـاگام لێـی نەمـا.

(وَلَعِبٌ): (لَعِـبَ فُـلاَنٌ: إِذَا كَانَ فِعْلُـهُ غَـيْرَ قَاصِـدٍ بِـهِ مَقْصِـداً صَحِيحَـاً) واتـە: هـەر کەسـێک کارێـک بـکات کـە مەبەسـتێکی ڕاسـتی لـە پشـتەوە نەبـێ، پێـی دەگوتـرێ:

(لَعِبَ)، وشـەی: (لَعِبٌ) بـە گەمـەو یاریـی منداڵانیـش دەگوتـرێ، لەبەرئـەوەی ئامانجێکـی لـە پشـتەوە نیـەو هـەر خـۆ خافڵاندنـە.

(ٱلْحَيَوَانُ): (الحَيَاةُ الحَقِيقِيَّةُ السَّرْمَدِيَّةُ الَّتِي لاَ تَفْنَى) واتـە: ئـەو ژیانـە ڕاستەقینە بەردەوامـەی کـە هەرگیـز کۆتایـی نایـەت.

(وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ)،(الخَطْف: الأخـذ بِسُرعةٍ) (خَطْف) بەکوردیـی: ڕفاندنـە، گرتنـی شـتێک و ڕفاندنیـەتی بەخێرایـی.

(مَثْوًى): واتـە: جێـگای تێـدا نیشـتەجێ بـوون، (الثَّوَاءُ: الإِقَامَـةُ مَـعَ الإِسْتِقْرار)، (ثَواء): بریتیـە لـە نیشـتەجێ بـوون (مانەوە لـە شـوێنێکدا) لەگەڵ سـەقامگیر بـوون دا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک لـە پێناسـەی ئـەم دەرسەشـدا گوتمـان: ئـەم چەنـد ئایەتـە زەمینـە خۆشـکردن و هاندانـی مسـوڵمانانن بـۆ کۆچکـردن، چونکـە وەک پێشـتر گوتمـان: ئـەم سـووڕەتی (العنكبوت)ە، لـە نێـوان قۆناغـی مەککـەو مەدینـەدا هاتۆتـە خـوار، واتـە: لـە کۆتایـی قۆناغـی مەککـەدا، پێـش ئـەوەی مسـوڵمانان کـۆچ بکـەن بـۆ مەدینـە، بۆیـە لـەم ئایەتانـەدا خـوا هانـی مسـوڵمانان دەدات بـۆ کۆچکـردن، هـەم پاڵنەریـان بـۆ دەخاتـە ڕوو، هـەم ئـەو لەمپەرانـەی خەیـاڵ دەکـرێ لـە بەردەمیانـدا هەبـن، لـە بەردەمیانـدا لایاندەبـات، هـەم کۆسـپەکان لادەبـات، هـەم هاندەریشـیان بـۆ دەخاتـە ڕوو.

سـەرەتا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ ﴾، ئـەی ئـەو بەندانـەم کـە بڕواتـان هێنـاوە! واتـە: بڕواتـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێنـرێ، بـە دڵنیایـی سـەرزەمینی مـن فراوانـە، ﴿ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴾، ئنجـا تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ مـن بکـەن، واتـە: ئەگـەر لـە شـوێنێک ڕێتـان لێگیـرا بەندایەتیـی بـۆ مـن بکـەن، ئـەوێ بەجـێ بهێڵـن و بچـن بـۆ شـوێنێک کـە

دەتوانن بەندایەتیی بۆ من بکەن، با سەرزەمین و نیشتیمان و ماڵ و حاڵ، بە خۆیانتانەوە گرێ نەدەن، دەست و پێتان نەبەستن.

ئنجا گەورەترین لەمپەرو کۆسپێک کە بە زەینیدا دێ، ڕێ لە مرۆڤ بگرێ، کە ماڵ و حاڵ و نیشتیمان و زێدی بەجێ بهێڵێ، بریتییە لەوەی تووشی مردن ببێ، تووشی لە بەین چوون ببێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾، واتە: هەموو کەسێک چێژەری مردنە، یانی لێرە بن یان لەوێ بن، کۆچ بکەن یان کۆچ نەکەن، لە ماڵی خۆتان بن یان لە دەرەوە بن، مردن هەر دەچێژن، ﴿ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾، دواییش بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە، یانی: لەسەر ئەوەی لە پێناوی خوادا بەسەرتان هاتوە، لێی ناچنە زەرەر، چونکە دێنەوە بۆ لای من و پاداشتتان دەدەمەوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ و، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام داون بە گشتیی، چ پەیوەندییان بە نیەت و مەبەستی نێو دڵەوە هەبێ، چ بە دەربڕینەکانی زمان، چ بە کردەوەی ئەندامەکانەوە، ئا ئەوانە ﴿ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا ﴾، لە بەهەشتدا جێگاو ڕێگای بەرزیان واتە: باڵەخانەکانیان بۆ ئامادە دەکەین، کۆشکی بەرزیان بۆ ئامادە دەکەین، ﴿ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە دامێن کۆشکەکاندا، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە لەو کۆشکانەدا، واتە: لە ڕووی چۆنیەتییەوە ئەوانە کۆشک و باڵەخانەی بەرزن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، لە ڕووی کات و تێدا مانەوەشەوە، هەمیشەیین تێیاندا، ﴿ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴾، واتە: باشترین پاداشت، پاداشتی کەسانێکە کە کاریان کردوە، کاریان بۆ خوا ﷻ کردوە، یانی: (نِعْمَ الأَجْرُ أَجْرُ العَامِلِينَ لِلَّه) واتە: باشترین پاداشت، پاداشتی ئەوانەیە کە کاریان بۆ خوا کردوە، هەر کەسێک کار بۆ خوا بکات، دەبێ خوا چۆنی پاداشت بداتەوە؟

﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾، ئەوانـە کار بـۆ خـوا دەکـەن، لـە پێنـاوی خـوادا تێدەکۆشـن و خەبـات دەکـەن: کـە خۆیان ڕاگرتـوە لە بەردەم بـەڵاو موسـیبەت و ناڕەحەتییەکانداو، لـە بـەردەم گرفـت و کێشـەکان دا، کـە لەبـەر ئاوارەیـی و کـۆچ و کۆچبـار دێنـە ڕێیـان، ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، تەنیـا پشـتیش بـە خـوا دەبەسـتن.

کەواتـە: ئەگـەر بتانـەوێ بـۆ خـوا کار بکـەن، ئـەو کۆشـک و باڵەخانـە بەرزانـەی خواتـان پـێ ببڕێـن، لـەو بەهەشـتانەی خـوادا کـە بـە هەمیشـەیی تیایانـدا دەمێننـەوەو، ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن، دەبـێ خاوەنـی خۆڕاگریـی بـن و خاوەنـی پشـت بـە خـوا بەسـتن بـن: (**الصَّبر والتَّوَكُّل**).

ئنجـا کۆسـپ و پەرچێکـی دیکـە، کـە ڕێ لـە خەڵـک دەگـرێ دەسـت لـە نیشـتیمانی خـۆی، لـە زێـدی خـۆی، لـە وڵاتـی خـۆی هەڵبگـرێ، لـە کاتێکـدا کـە تەنگـی پـێ هەڵدەچـنڕێ و، ڕێـی دینداریـی لـێ دەگیـرێ، بریتیـە لـە مەسـەلەی بژێـو، بریتیـە لـە ڕزق و ڕۆزیـی کـە ئایـا چـۆن ژیـان بگوزەرێنـێ؟ خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ﴾، ( وَكَأَيِّن ) یـانی: زۆر، زۆر ژیانـدار هـەن بژێـوی خۆیـان هەڵناگـرن، بـەڵام خـوا بژێویـان دەدات و بژێـوی ئێـوەش دەدات، ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بـە دڵنیاییـش خـوا بیسـەری زانایـە، قسـەو داواتـان دەبیسـتێ، ئـاگادارو زاناشـە بـە پێویسـتییەکانتان، کەواتـە: با مەترسیی بژێـو و ڕۆزییـش نەبێتـە کۆسـپ و لەمپـەر لـە بەردەمتانـدا کـە کـۆچ بکـەن، لـە کاتێکـدا کـە ڕێـی دینداریتـان لـێ دەگیـرێ، مـاف و ئازادیـی و کەرامەتتـان پێشـێل دەکـرێ، ئـەو شـوێنە بەجـێ بهێڵـن و بچـن بـۆ شـوێنێک کـە تێیـدا ئـازاد بـن.

ئنجـا دوایـی خـوا ﷻ جارێکـی دیکـە دێتـەوە سـەر باسـی پێشـاندانی نیشـانەکانی خـواو، خسـتەڕووی نیعمەتەکانـی و، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ﴾، ئەگـەر تـۆ پرسـیاریان لێبکـەی: کـێ ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی و، کـێ خـۆرو مانگـی ڕام و دەسـتەمۆ کـردوون، ملکەچیکـردوون،

کە لە فەرمانی وی دەرنەچن؟ ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، زۆر بە جەختکردنەوە دەڵێن: خوا، خوا ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، خوا خۆرو مانگی ڕام و دەستەمۆ کردوون، کە تێمە لێیان بەهرەمەند بین، ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، کەواتە بەرەو کوێ لادەدرێن؟ واتە: مادام خوا هەمەکارەی کەون و کائیناتە، خوا خاوەنی هەموو چاکەو نیعمەتەکانە، کەواتە بەرەو کوێ لادەدرێن؟ بۆچی جگە لە خوا دەپەرستن؟

﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ﴾، خوا بۆ هەر کام لە بەندەکانی بیەوێ بژیو فراوان دەکات، جاری واش هەیە لێی وەتەنگ دێنێ، واتە: بژیوی بۆ زۆر دەکات، یاخود لێی کەم دەکاتەوە، بۆ هەر کام لە بەندەکانی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێک زانایە، دەزانێ کەی بژیو بۆ کەسێک فراوان و زۆر دەکات و، کەنگێ لێی وەتەنگ دێنێ و لێی کەم دەکاتەوە، تاکو لە کاتی بژیو زۆرکردندا، بزانێ ئایا ئەهلی سوپاسگوزاریی دەبێ؟ ئەهلی ئەمەگ و وەفا دەبێ؟ هەروەها لە کاتی بژیو لێ وەتەنگ هێناندا، ئایا خۆڕاگر دەبێ و خۆی تووشی گوناهو تاوان ناکات، بە هۆی ناشوکریی و بە هۆی نارەزایی دەربڕینەوە؟ ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا ﴾، ئەگەر پرسیاریشیان لێبکەی: کێ لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوەو، زەوی پێ ژیاندۆتەوە دوای مردنی، دوای ئەوەی هیچی لەسەر نەماوە کە نیشانەی ژیان بێ؟ بۆتە قاقڕو دێمەکارو، ئەوەی کە لێیڕواوە کاتی خۆی، بۆتە پووش و پەڵاش و با ڕایداوەو، ئێستا هیچ نیشانەی ژیان و زیندوویەتیی لەسەر نەماون، بەڵام دوای ئەوەی خوا ئاوی دادەبەزێنێتە سەر، ئەو سەر زەوییە زیندوو دەبێتەوە.

وەک زۆر جاری دیکە گوتوومانە: لە قورئاندا بە زۆریی وشەی: (مَآءً)، ئاو، بەکارهاتوە، تاکو بەفرو باران و تەرزەو ناونگ و شێ، هەموویان بگرێتەوە، ئنجا ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی: کێ ئاوی لە ئاسمان دابەزاندوەو، دوای مردنی سەر زەوی پێ ژیاندۆتەوە؟ ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، بەجەختکردنەوەوە دەڵێن: خوا، ﴿ قُلِ

﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خوا، واتە: هەموو مەدح و سەناو ستایشێک، شایستەی خوایە، ﴿ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴾، بەڵکو زۆربەیان نافامن، بۆیە دەفەرمویّ: زۆربەیان، چونکە هەندێکیان دوایی ئیمانیان هێناوەو، لە عەقڵەکەی خۆیان بەهرەمەند بوون و خوایان پێناسیوە، خاوەنی خۆیان پێناسیوە، ڕێی خوایان پێ دۆزیوەتەوە، بەڵام زۆربەیان ئەوانەی لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا بوون ﷺ، ئێستاش زۆربەیان لە عەقڵەکەیان بەهرەمەند نەبوون، نەیانفامیوە، تاکو لە حاڵێکدا کە دان بەوەدا دێنن: خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری کەون و کائیناتە، هەر ئەویش پەرستراویان بێ.

پاشان دێتە سەر باسی ناساندنی ژیانی دنیا، لە بەرانبەر ژیانی ڕۆژی دوایی دا و دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞ ﴾، ئەم ژیانی دنیایەش تەنیا خافڵان و یاریی و گەمەیە، ﴿ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُ ﴾، مەنزڵگای کۆتاییش، کە لە کۆتاییدا دێ و، لە دوای ئەو هیچ مەنزڵگایەکی دیکە نیەو، بەردەوام دەبێ بەبێ بڕانەوە، ﴿ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُ ﴾، هەر ئەوە ژیانی ڕاستەقینە، واتە: ژیانی ڕاستەقینە هەر لەوێدا هەیە، ﴿ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئەگەر بزانن، ئەگەر زانیارییان هەبێ، دەبێ بزانن خوا ئەم سیستمی گەردوونەی داناوە، کۆتاییەکی هەیە، قۆناغی کۆتایی جارێکی دیکە نەبوونی بەسەردا نایەت و، قۆناغی کۆتایی لەگەڵ ژیانی دنیادا بەراورد ناکرێ، مەگەر وەک چۆن کە شتێک لەگەڵ گەمەو یاریی منداڵ و خافڵانی منداڵاندا بەراورد دەکرێ، ئاوا تەماشای بکرێ.

جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ، ڕووی نیازو مەبەستەکانی تێبکرێ، دەفەرمویّ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ ﴾، لە کاتێکدا سواری کەشتیی دەبن، کاتێک چوونە نێو کەشتییەوە، یان: چوونە نێو کەشتییەکانەوە، چونکە وشەی: (ٱلۡفُلۡكِ) هەم بە تاک دێ، بە مانای یەک کەشتیی، هەم بە مانای کۆش دێ واتە: کەشتییەکان،

لـەو کاتـەدا: ﴿ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، کـە سـواری کەشـتیی دەبـن، مەبەسـت ئەوەیـە کـە دوایـی شـەپۆلیان بـۆ دێ، یاخـود بـا دێ و کەشـتییەکەیان دەکەوێتـە حاڵەتـی مەترسیی: لـە خـوا دەپاڕێنـەوەو، ملکەچیـی خۆیـان بۆ خـوا ساغ دەکەنەوە، بەشـی جگـە لـە خـوای پێـوە ناهێڵـن، خڵتـەی شـیرک بـە بانگکردنـی خـواو، لـە خـوا پاڕانەوەکـەی خۆیانـەوە، ناهێڵـن و سـاغی دەکەنـەوە، چونکـە (مُخۡلِصِينَ)، نـاوی بکەر (اسم فاعل)ە، یانـی: لـە حاڵێکـدا کـە ملکەچیـی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغکردۆتەوە، ئـاوا لێـی دەپاڕێنـەوە، ﴿ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ﴾، کاتێـک دەربـازی کـردن بـەرەو وشـکانیی، کـت و پـڕ هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن، دیسـان دەگەڕێنـەوە سـەر بەزمـی پێشـوویان، ﴿ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ ﴾، بابەرانبـەر بـەو چاکـەو نیعمەتانـەی پێمانـداون، سـپڵەیی بکـەن، بێوەفایـی بکـەن، ﴿ وَلِيَتَمَتَّعُواْ ﴾، هەروەهـا بـا ماوەیـەک ڕابوێـرن، بەهرەمەنـد بـن لـە نیعمەتەکانـی دنیـا، ﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾، بـە دڵنایـی لەمـەودوا دەزانـن، دەزانـن کـە چ هەڵەیەکـی گەورەیـان کـردوە، کـە بەرانبـەر بـە چاکەکانـی خـوا سـپڵەن و، سـەرگەرم بوونیـان بـە ژیانـی دنیـاوە، مەنزڵـگای کۆتایـی لـە بیـر بردوونـەوە!

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنًا ﴾، خـوای پـەروەردگار چاکەیەکـی دیکـەی خۆییـان، بـە تایبـەت هـی کافرەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، خەڵکـی مەککـە، دەخاتـە بەرچـاو، پێیـان دەفەرمـوێ: ئایـا نابینـن کـە ئێمـە حەرەمێکـی پـڕ هێمـن و ئاسایشـمان بـۆ ڕەخسـاندوون، بـە هـۆی کەعبـەوە؟ ﴿ وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡ ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە خەڵـک لـە دەوروبەریـان دەڕفێنـدرێ، دەبـردرێ، لـە تـرس و بیمـدان، کەچـی ئـەوان لـە هێمنیـی و ئاسایشـدان، لـە بەرەکەتـی ئـەو کەعبـەوە کـە ناوچەیەکـی حەرەمـی بـۆ دەسـتەبەر کـردوون، حـەرەم واتـە: ئـەو شـوێنەی کـە هەمـوو گوناهـو تـاوان و لادانێکـی تێـدا قەدەغەیـە، قەدەغەتـر لـە شـوێنەکانی دیکـە، ﴿ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئایـا بـڕوا بـە پـووچ دێنـن، بـڕوا بـە ناهـەق دێنـن؟ کـە بریتیـە لـەو بـت و صەنەمانـەی دەیانپەرسـتن، پەرسـتراوە سـاختەکان، ﴿ وَبِنِعۡمَةِ

ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ ﴾، بەرانبەر بە چاکەی خواش سپڵەیی دەکەن؟ یاخود: بێبڕوا دەبن؟ بەڕاستیی شتێکی سەیرە، ئەمە پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، هەروەها ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، یاخود: دوای ئەوەی هەقی بۆ دێ، پێی بێبڕوا دەبێ و درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ گوایە: خوا هاوبەشی هەیە، ڕۆڵەی هەیە، وەک هاوبەشدانەرەکانی کۆن و ئێستا هەروا دەڵێن و وایانگوتوە، ﴿ أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ﴾، یان ئەو هەقەی بۆیان هاتوە، پێی بێبڕوان و بە درۆی دادەنێن، کە لە پێغەمبەری خوادا ﷺ و، لە قورئاندا بەرجەستەیە؟ ﴿ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوًى لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾، ئایا لە دۆزەخدا، جێگەو ڕێگایەک نیە بۆ بێبڕوایان؟ واتە: ئایا دۆزەخ جێگەو ڕێگایەکی پڕ بە پێست نیە بۆ تێدا نیشتەجێ بوون و سەقامگیربوونی بێبڕوایان، ئەم شێوە پرسیار کردنە، دەگونجێ بڵێین: پرسیارکردنی دانپێپێداهێنان (إستفهام تقريري)ە، دەشگونجێ بڵێین: پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنە.

لە کۆتاییی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ ﴾، بە دڵنیاییی ئەوانەی کە لە پێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، خۆ ماندوو دەکەن و ڕەنج دەدەن، بە دڵنیاییی ئێمە ڕێبازەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین، یاخود دەیانخەینە سەر ڕێبازەکانی خۆمان، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بە دڵنیاییی خواش لەگەڵ چاکەکاراندایە.

وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین: تێرە تاکە شوێنێکە کە وشەی (سُبُل) پاڵدرابێتە لای خوا ﷻ بەم ڕێژگەیە: (سُبُلَنَا)، چونکە لە قورئاندا وشەی (سَبِيل) هاتوە، (سَبِيلِ رَبِّك، سَبِيلنا)، لەبەر ئەوەی ڕاستە شەقامی خوا، یەک ڕاستە شەقامە، بەڵام لێرەدا وشەی (سُبُل) مەبەست پێی ئیسلام نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەو ڕێبازو شێوازانەیە، بۆ تێکۆشان لە پێناوی خوادا دەگیرێنە

بەر، دیارە لە سوورەتی (النحل)دا ﴿ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسۡلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلٗاۚ يَخۡرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٞ لِّلنَّاسِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ النحل: ٦٩ ، هاتوە واتە: ڕێبازەكانی پەروەردگارت، بەڵام مەبەست پێی ئەو فێركردنە غەریزییانەیە كە خوا فێری هەنگی كردوون، تاكو بچێت شیلەی گوڵان بمژێ و هەنگوین دروست بكات، ئەوە جیایە، بەڵام لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا وشەی (سُبُل) پاڵدراوەتە لای خوا، بەشێوەی كۆ (سُبُلَنَا).

لێرەدا خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ: كە ئەوانەی لە پێناوی ئێمە تێدەكۆشن، واتە: دوو شتیان هەن، یەكەم: تێكۆشان و ڕەنجدان و زەحمەتكێشان، دووەم: ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوون، ئا ئەوانە ﴿ لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ ﴾، زۆر بە جەختكردنەوەوە خوا بەڵێنی داوە كە ڕێبازەكانی خۆییان پێشان بدات، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاكەكاراندایە، هیچ كەسیش لەو كەسە چاكەكارتر نیە، كە خۆی ماندوو دەكات، تێدەكۆشێ و خەبات دەكات و مەبەستی پێ ڕازیی كردنی خوایە ﷻ.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**هاندانی خوای میهرەبان بۆ كۆچكردنی مسوڵمانان، لە كاتێكدا تەنگیان پێ هەڵدەچنرێ و، بە وره كردنیان لە بەرانبەر مردن داو، موژدەی بەهەشت پێدانیان و، جەختكردنەوە لەسەر هەردووک سیفەتی بەرزی خۆڕاگریی و پشت بە خوا بەستن (صبر وتوكل) و، دڵنیاكردنەوەیان لە بواری بژێوو ڕۆزیی دا:**

**خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ (٥٦) كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ (٥٧) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ (٥٨) ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ (٥٩) وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (٦٠) ﴾.**

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ ﴾، ئەی ئەو بەندانەم كە بڕواتان هێناوە! بە دڵنیایی زەوییەكەم فراوان و فەڕاحە، ئەمە بێگومان بانگ كردنێكە بۆ پێشاندانی پلەو پایەی ئەو بەندانە، چونكە خوا ﷻ ئەو بەندانەی پاڵداونە لای خۆی و، لە قورئاندا هەر جارێک وشەی بەندەكانم (عِبادِي) بەكارهاتبێ، بە زۆریی بۆ ئیماندارانە، دیارە هەموو مرۆڤەكان بەندەی خوان، بەڵام بەندەی ناچاریی، بەڵام ئیمانداران بەندەی ئیختیاریی خوای پەروەردگارن، واتە: بە ویستی خۆیان بەندایەتیی و، ملكەچیی بۆ خوا ئەنجام دەدەن.

﴿إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ﴾، بـە دڵنیایـی سـەرزەمینی مـن فراوانـە، خـوا نەیفەرمـووە: کـۆچ بکـەن (هاجِـرُوا)، بـەڵام یەکێـک بـە یەکێـک دەڵـێ: مـن ئێـرەم پـێ ناخۆشـە، ئەویدیکـەش دەڵـێ: وڵات فراوانـە، یـان ئـەرزی خـوا فراوانـە، واتـە: لێرەدا لاچـۆو بچۆ بـۆ هـەر شـوێنێک کـە مەیلـت لێیـەو مەبەسـتتە! یانـی: ئایا نابینـن کـە سـەرزەمینی مـن فراوانـە؟ ئایـا ناتوانـن شـوێنێکی دیکـە پەیـدا بکـەن و، لەوێـدا بەندایەتییەکـی ڕێـک و دروسـت بـۆ مـن بکـەن؟ ئایـا ناچـارن هـەر لەوسـەر زەمینـە بمێننـەوە کـە کافـرەکان ناچارتـان دەکـەن، دەسـت لـە بەشـێک لـە دینداریتـان هەڵبگـرن، یاخـود ناڕەحەتتـان دەکـەن و گێچەڵتـان پـێ دەکـەن، ئێـوە لـەوێ نەبەسـتراونەوە؟ ئێـرە بەجێبهێڵـن، مـادام کەرامـەت و مـاف و ئازادیەکانتـان پێشـێل دەکرێـن، بچـن بـۆ شـوێنێک تێیـدا ئـازاد بـن.

٢)- ﴿فَإِيَّٰىَ فَٱعۡبُدُونِ﴾، بەس بەندایەتیی بۆ من بکەن، ئەمە هۆکاری کۆچکردن و، فەرمانکردنە بە کۆچکردن و بەجێهێشتنی خاک و نیشتیمان، (ي)کەی کۆتایی لە (فَٱعۡبُدُونِ)دا، قرتێندراوە بۆ ئەوەی سووک بێ و، نوونەکە پێی دەگوترێ: (نون الوقاية)، ئەصڵی خۆی ئاوایە: (فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِي) تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، واتە: بۆ ئەوەی تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، سەرزەمینی من فراوانە، کۆچی تێدا بکەن و ئەو شوێنەی کە ڕێتان لێ دەگیرێ دینداریی لێ بکەن، بەجێی بهێڵن.

٣)- ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِ﴾، هەموو کەسێک چێژەری مردنە، لەبەر ئەوەی گەورەترین کۆسپ و لەمپەر کە دێتە ڕێی ئینسان، کۆسپ و لەمپەرێکی وەهمیی، کە ڕێی کۆچکردن و بەجێهێشتنی نیشتیمانی لێ بگرێ، ئەوەیە: کە دەڵێ: ڕەنگە ئەگەر ئێرە بەجێبێڵم بکوژرێم، ئەمێنم، خواش دەفەرموێ: هەموو نەفسێک چێژەری مردنە، هەموو کەس دەبێ هەر بمرێ، لە ماڵ بێ، یان کۆچ بکەی، لە ئاشتیی دابی، یان لە شەڕ بێ، مردن هەر یەخەت دەگرێ، کەواتە مردنێکی سەربەرزانە بمرە، نەک لێرە زەلیلانەو ژێر دەستانە، لەبەر ئەوەی دەستت بۆ لە نیشتیمانەکەت هەڵناگیرێ، لە شوێنی خۆت مردار بیەوە! لە پێناوی خوادا کۆچ بکە یا لە ڕێدا بکوژرێی، ئەوە مردنی سەر بەرزانەیە.

کەواتە: ئایەتەکەی پێشتر: ﴿ إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ ﴾، پاڵنەرو هاندەر بوو، سەرزەمینی من فراوانە، واتە: ڕێتان هەیە بڕۆن، ئەمە پاڵنەرە، ئەویدیش لابەری ئەو کۆسپ و لەمپەرەیە، کە لە بەردەمدا هەیە کە مەرگ و مردنە، جاری وایە ترسان لە مردن، دەستی ئینسان دەگرێ لە کۆچکردن و لە جیهادو بەرخۆدان، خواش دەفەرموێ: هەموو کەسێک دەبێ مردن هەر بچێژێ بە هەر حاڵێک بێ.

٤)- ﴿ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾، ئەمەش دیسان هاندانێکی دیکەیە، واتە: دواییش بۆ لای ئێمە دەگێردرێنەوە، ئەم وشەیە خوێندراویشەتەوە: (ثُمَّ إِلَيْنَا يُرْجَعُون) ئەمە پێی دەگوترێ: ئاوڕ دانەوە لە حاڵەتی دواندن و ڕووبەڕووەوە، بۆ حاڵەتی دواندنی نادیار (إلتفات من الخطاب إلى الغياب)، ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە، کاتێک بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، چی چاوەڕێیان دەکات؟

٥)- ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، لە بەهەشت دا، لە باڵەخانەو کۆشکان دا نیشتەجێیان دەکەین، جێگەو ڕێگەیان بۆ دابین دەکەین، وشەی (لَنُبَوِّئَنَّهُم)، خوێندراویشەتەوە: (لَنُثْوِيَنَّهُم) (أَثْوَاهُ بِالمَكَانِ إِذَا جَعَلَهُ ثَاوِيَاً: مُقِيمَاً)، (لَنُثْوِيَنَّهُم) و (لَنُبَوِّئَنَّهُم)، هەر یەک واتایان هەیە، چونکە (بَوَّأَهُ بِالمَكَانِ) واتە: شوێنەکەی بۆ خۆشکردو بۆ ئامادە کرد، یاخود نیشتەجێی کرد لەوێدا، (أَثْوَاهُ بِالمَكَانِ)، (لَنُثْوِيَنَّهُم) لە (أَثْوَاهُ)ەوە هاتوە، (أَثْوَاهُ يُثْوِيهِ) یانی: لەو شوێنەدا نیشتەجێی کردو سەقامگیری کرد.

﴿ غُرَفًا ﴾، لە بەهەشتدا لە کوێ نیشتەجێیان دەکەین؟ (غُرَف) کۆی (غرفة) یە واتە: ئەو خانووەی، ئەو ژوورەی کە لەسەرەوەترە، لە کۆشکە بەرزەکاندا، لە باڵەخانەکاندا.

٦)- ﴿ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ﴾، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

٧)- ﴿ خَالِدِينَ فِيهَا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوەو بەردەوامن.

٨)- ﴿ نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴾، باشترین پاداشت هی کارکەرانە (بۆخوا).

ئەمـە تەعبیرەکـەی ئاوایـە: (نِعْـمَ الأَجْـرُ أَجْـرُ العامِلِين) واتـە: باشـترین پاداشـت، پاداشـتی کارکەرانـە، کەسـانێک کـە کاریـان کـردوە بـۆ خـوا ﷻ، کەواتـە ئـەو پاداشـتەی چاوەڕێیـان دەکات، لـە ڕووی چۆنیەتییـەوە باشـترینە، لـە ڕووی دەوامـەوە، بەردەوامترینـەو، هـی ئەوەیـە کـە زۆر ستایشـی بکـرێ، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴾، باشـترین پاداشـت، پاداشـتی ئەوانەیـە کـە کار بـۆ خـوا دەکـەن.

لـەو بـارەوە ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن، کـە دەفەرمـوێ: {إِنَّ فِي الْجَنَّـةِ لَغُرَفًـا يُـرَى بُطُونُهَـا مِـنْ ظُهُورِهَـا وَظُهُورُهَـا مِـنْ بُطُونِهَـا، فَقَـالَ أَعْـرَابِيٌّ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ لِمَـنْ هِـيَ؟ قَـالَ: لِمَـنْ أَطَـابَ الْـكَلَامَ، وَأَطْعَـمَ الطَّعَـامَ، وَصَـلَّى لِلَّـهِ بِاللَّيْـلِ وَالنَّـاسُ نِيَـامٌ} (أخرجـه أحمـد: ١٣٣٧، والترمـذي: ١٩٨٤، عَـنْ عَـلِيٍّ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ، وحسَّـنَهُ كلّ مـن الألبـاني وشـعيب الأرنـؤوط).

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: لـە بەهەشـتدا چەنـد باڵەخانـەو کۆشـکێک هـەن، دیـوی دەرەوەیـان لـە نێـوەوە دەبیـنرێ و، دیـوی نێوەوەیـان لـە دەرەوە دەبیـنرێ (زۆر ڕوون و سـپیی و درەوشـاوەن)، کابرایەکـی عەرەبیـی خێڵەکیـی هەڵسـا گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! ﷺ، ئـەو کۆشـکانە بـۆ کێـن؟ فەرمـووی: بـۆ کەسـێکە قسـەی بـاش بـکات و، خـواردن بـدات بـە خەڵکـی، لـە کاتێکـدا خەڵـک خەوتـوون، شـەونوێژ بـکات.

٩)- ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، ئەوانەی خۆیـــان ڕاگرتوەو، پشتیان بە پەروەردگاریان بەستوە.

خـوا ﷻ دوو سـیفەتی سـەرەکیی ئـەو بڕوادارانـەی، ئـەو بەهەشـت و خەڵاتـە چاوەڕێیانـە، بـاس دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، بڕواداراننێـک خـوا ئـەو کۆشـک و تـەلارو باڵەخانانـەی بـۆ ئامـادە کـردوون، کـە خۆیانڕاگرتـوەو، پشـتیش بـە پەروەردگاریـان دەبەسـتن، (صَبَرُواْ )، واتـە: خۆیانڕاگرتـوە، ئەمـەی بـە ڕابـردوو هێنـاوە، خۆیانڕاگرتـوە لەسـەر ئیـمان، لەسـەر ئیسـلام، لەسـەر تاعـەت، لەسـەر کۆچکـردن و کۆچیـان کـردوە.

﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، پشتیش تەنیا بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەمەی بە (فعل المضارع) هێناوە، بۆ ئێستاو داهاتوو، بەردەوام پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، لە هەر شتێكدا كە بێتە پێشیان.

لەڕووی ڕێزمانییەوە: ( ٱلَّذِينَ): (خَبَرٌ مُبْتَدَأ مَحْذُوفٍ) گوزارەی نیهادێكی فڕتێنراوە، یانی (هُمْ الَّذِينَ صَبَرُوا)، ئنجا (هُمْ) دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ) و ( ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ) دەبێتە گوزارە (خبر)، كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، لێرەدا ژێرداركەر و ژێرداركراو (الجارُّ المجرور) كە پێشخراوە، بۆ زیاتر گرنگیی پێدانە، واتە: تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

١٠)- ﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ﴾، زۆر ژیانداریش هەن، بژیوی خۆیان هەڵنەگرتوە، خوا ﷻ وەهمێكی دیكەی ئەوانەی كۆچ دەكەن لە پێناوی خوادا، كە دەبێتە كۆسپ و لەمپەر لە بەردەمیان دا، دەڕەوێنێتەوە، دەفەرموێ: زۆر ژیانداریش هەن، (دَآبَّةٍ ): (كُلُّ ما يَدُبُّ عَلَى الأَرْضِ) هەر شتێك كە بە زەوییدا دەڕوات، واتە: هەموو ژیاندارێك، زۆر ژیاندار هەن، كە بژیوەكەی خۆیان هەڵناگرن، لە كۆڵیان نەناوە، كە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ﴾، دەگونجێ مەبەست لە هەڵگرتن، هەڵگرتنی ڕواڵەتیی بێ واتە: بژیوەكەی بە كۆڵەوە نیە، نە باڵندە، نە دڕندە، نە ژیاندار، هیچی بژیوی لە كۆڵ نیە، یاخود مەبەست ئەوەیە: خۆی ماندوو ناكات (أَي: لا تَتَكَلَّفُ تَحْصِيلَ رِزْقِهَا) واتە: خۆی ماندوو ناكات، لەئێستاوە بە تەنگ ئەوەوە بێ داخۆ ئێوارێ چی بخوات! بەڵكو بۆ خۆی دەڕوات و هەوڵێك دەدات، خوای پەروەردگاریشیان تاكو ئەو كاتەی مۆڵەتی لەسەر بێ، بژی، بژیویان چنگ دەخات.

١١)- ﴿ ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ﴾، خوا بژیوی ئەوانیش دەدات و هی ئێوەش دەدات، ئەیفەرموە: (يَرْزُقُها اللهُ وَإِيَّاكُم) یانی: پاڵوەلادراو (المُسْنَدُ إِلَيْهِ) خوای پەروەردگارە، وشەی (ٱللَّهُ ) كە نیهاد (مبتدأ)ە، پێشخراوە لەسەر گوزارە (خبر)كە، یانی: تەنیا خوا بژیویان دەدات، هەروەها بژیوی ئێوەش دەدات.

١٢)- ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾، تەنیا خواش بیسەری زانایە، قسەكانتان دەبیستێ، پاڕانەوەكانتان دەبیستێ و پێداویستییەكانیشتان دەزانێ.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە كە خوا بژێوی ژیانداران دەدات، دەفەرمووێ: {**لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تَغْدُو خِمَاصًا، وَتَرُوحُ بِطَانًا**}[1]، واتە: ئەگەر بەڕاستیی پشت بە خوا ببەستن، بژێوتان دەدات، وەك چۆن بژێوی باڵندە دەدات، بەیانییان بە سكی برسییەوە دەڕواو، ئێواران بە سكی تێرەوە دێتەوە.

بەڵام بە تەئكید ئەگەر ئەو باڵندانە لە هێلانەكانی خۆیان دا هەڵنیشن و جموجۆڵێك نەكەن، لە برسان دەمرن، كەواتە پشت بە خوا ببەستن، بەڵام وەك چۆن باڵندە هەوڵ دەدات، ئێوەش هەوڵێك بدەن، بە تەئكید وەك چۆن خوا بژێوی باڵندەكان دەدات، بژێوی ئێوەش دەدات، وەك چۆن بژێوی هەموو ئەو ژیاندار ودڕندەو، هی نێو دەریاو هی نێو هەواو، هی سەر زەوی، هی بن زەوی دەدات، بژێوی ئێوەش دەدات.

ئەمەش وەك پێشتریش گوتمان: بۆ لابردنی پەرچ و لەمپەرێكی دیكەیە لە بەردەم ئەوانەدا كە دەیانەوێ زێدو نیشتیمانی خۆیان بەجێبێڵن لە پێناوی خوادا، كە دەربەستی بژێوو ڕزق مەبن، وەك لە سوورەتی (النساء)دا خوا دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: هەر كەسێك لە پێناوی خوادا كۆچ بكات، لە زەوییدا شتی وای زۆر دێتە ڕێ كە لووتی دوژمنانی پێ ئەوی بكات و، فراوانیی بۆ بێ، هەروەها هەر كەسێك لە پێناوی خوادا، ماڵ و حاڵی خۆی بەجێبێڵێ، دوایی مردنی بگاتە سەر، پاداشتی كەوتۆتە سەر خوا ﷻ، خواش هەمیشە لێبوردەی بەبەزەیی بووە.

---

(١) أخرجه الترمذيّ: ٢٣٤٤، وابن ماجه: ٤١٦٤، وأبو يعلى: ٢٤٧، وابن حبان: ٧٣٠.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی چەند نیشانەیەکی خواو نیعمەتێکی گەورەو گرنگی، کە بەڵگەی تەنیا پەرستراویەتیی خوان، بۆ کەسانێک عەقڵ و هۆشیان بەکار بێنن و، تێبفکرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

**شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر لێیان بپرسی (واتە: لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، لە بێبڕوایەکان): کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و، کێ خۆرو مانگی ڕامکردوون؟ بەجەختکردنەوە دەڵێن، خوا.

بێگومان ئاسمانەکان و زەوی دروست کردنیان شتێکی زۆر گەورەیە، وەک خوا لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە دروستکردنی خەڵک، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

ئنجا ئینسان تاکو عیلمی زیاتر بێ، زیاتر تێدەگات لە گەورەیی ئاسمانەکان و زەوی، لە گەورەیی ئەو گەردوونە کە خوا هێناویەتە دی، زۆربەی خەڵکی نازانن، بۆیە دروستکراوی خوا و موڵکی خوا، بە تەسک و کەمبەر دێتە بەرچاویان، بەڵام تاکو زانیارییان زیاتر بێ و، هەتا ئاسۆی زەینیان فراوانتر بێ، زیاتر دەرکی گەورەیی و فراوانیی موڵکی خوا دەکەن.

وەک جاری دیکەش گوتومانە:

أ- نوێترین بیردۆزەی گەردووونناسیی ئەوەیە کە دەڵێ: تیرەی گەردوون بە پازدە ملیار ساڵ (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)ی تیشکیی مەزەندە دەکرێ.

ب- کەهکەشانەکانی کە گەردوون دەیانگرێتە نێو خۆی، بە یەک تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)، واتە: هەزار ملیار کەهکەشان مەزەندە دەکرێن، پێشتر دەیانگوت: دوو سەد ملیار (٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیار، بەڵام ئێستا دەڵێن: زیاترن.

جـ- ئەو ئەستێرانەی کە لە نێو کەهکەشانی ئێمەدا هەن، کەهکەشانی کاکێشان، یان ڕێی شیریی، بە یەک تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە مەزەندە دەکرێن، کە خۆری ئێمە یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان، کەواتە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی زۆر گەورەیە، بەڵام بە زانیاریی ئەو گەورەییە دەرک دەکرێ.

هەروەها خوا لە سووڕەتی (الواقعة)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦﴾، واتە: وانیە وەک ئێوە دەڵێن (ئەی کافرەکان!) سوێند دەخۆم بە جێگەو ڕێگەی ئەستێرەکان و، ئەگەر بزانن، ئەوە سوێندێکی زۆر مەزنە.

﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ﴾، هەروەها ئایا کێ خۆرو مانگی ڕامکردوون؟ واتە: دەستەمۆو ملکەچی کردوون، ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، باسێکی سەربەخۆمان دەربارەی خۆر کردووەو، باسێکی سەربەخۆشمان دەربارەی مانگ کردوە، هەروەها باسی زەوییمان کردووەو لەوبارەوە زانیاریی وردمان خستوونە ڕوو، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە[1].

وشەی (وَسَخَّرَ): (سَخَّرَ يُسَخِّرُ تَسْخِيراً)، (التَّسْخِيرُ: الإجبار عَلَى عَمَلٍ شَدِيد) واتە: (تسخیر) ناچار کردنە لەسەر کارێکی سەخت، واتە: دەستەمۆ کردن وڕامکردن،

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سووڕەتەکانی: (فصلت و الرحمن و الواقعة و الشمس)یشدا، لەو بابەتانە دواوین.

مـل پـێ کەچکـردن، بـەو شـێوەیە کـە خـوا بـۆی دانـاوە، بـەو شـێوەیە کار بـکات و بەڕێوەبچـێ.

﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، زۆر بـە جەختکردنـەوەوە دەڵێـن: خـوا ﷻ، دەڵێـن: بـەس خـوا ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـەدی، خـۆرو مانگیشـی دەسـتەمۆ کـردوون.

٢)- ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، کەواتە بۆ کوێ لادەدرێن؟ ئەمە پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکردن و سەرسوڕماندن (الإستفهام للإنكار والتعجیب)ە، مادام هەر خوا بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، خوا ڕامکەری خۆرو مانگە، ئەدی بۆ کوێ لادەدرێن؟ بۆچی جگە لە خوا دەپەرستن؟

٣)- ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ﴾، خوا بژیو بۆ هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ فراوان دەکات و، بۆشی تەنگ دەکات و تەسک دەکات، واتە: بۆی زۆر دەکات و بۆی کەم دەکات، ئەم مەسەلەی فراوانکردنی بژیوو تەسککردنەوەی واتە: زۆر کردنی و کەمکردنی، لە زۆر شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە[1]، بۆ وێنە:

١- لێرە لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ( ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ) یانی: وێڕای فراوانکردنی بژیو، کەمکردنەوەو لێگرتنەوەکەش بە قازانجی ئەو بەندەیەیە، نەک بە زەرەری.

٢- لە سوورەتی (الرعد)دا هەمان ڕاستیی خوا دووبارە دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: خوا بژیو فراوان دەکات بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ وتەنگیش دەکات، فراوان دەکات واتە: زۆری دەکات و، تەنگی دەکات، واتە: کەمی دەکات.

٣- هەروەها لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ﴿٨٢﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینی، یان سەرت سوڕمێنێ لەوە کە خوا بژیو بۆ هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێ، فراوان دەکات و تەنگیش دەکاتەوە.

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الشوری) دا، لەو بارەوە کورتە باسێکمان کردوە.

٤- هەروەها لە سوورەتی (الروم)یشدا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینن چۆن خوا بژێو بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ، فراوان دەکات، یاخود تەسک دەکاتەوە، ئەم ڕاستییە لە زۆر شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، لەبەر ئەوەی ژیانی بەندەکان پەیوەندیی بە بژێوەوە هەیە، پەیوەندیی بەوە هەیە کە پێی دەژین و، ڕزق و ڕۆزیی بەشەر لە ژیانی بەشەردا، لە ڕووە ماددییەکەیەوە گەورەترین گرنگیی هەیە، بۆیە خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوەو، ڕایدەگەیەنێ: کە بژێو بە دەست خوایە ﷻو، کەمکردن و زۆرکردنی حیکمەتی خوای لە پشتەوەیە، هەڵبەتە هۆکارەکان دەوری تێدا دەبینن، بەڵام لە پشت هۆکارەکانەوە هۆکارساز هەیە، لە پشت (أسباب)ەوە، (مُسبِّب) هەیە کە خوایە ﷻ، هەروەها لە سوورەتی (یونس)یش دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ ﴾. واتە: بڵێ: کێ لە ئاسمان و زەوییەوە بژێوتان دەدات، یان کێ بیستن و چاوەکانی بەدەستن و، کێ زیندوو لە مردوو دەردێنێ و، مردوو لە زیندوو دەردێنێ و، کێ کاروبار بەڕێوەدەبات؟ دەڵێن: خوا، بڵێ: ئایا پارێز ناکەن؟!

مـادام خـوا هەمـەکارەو مشـوورخۆری هەمـوو گـەردوون و، هەمـوو لایەنەکانـی ژیانـی ئێوەیـە، کەواتـە: بۆچـی پارێـزی لـێ ناکـەن؟

٤)- ﴿ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێک زانایە، واتە: هەر کام لە فراوان کردنی بژێوو، کەمکردنەوەی، هەمووی حیکمەتی مەزنی لە پشتەوەیە، کە خەڵک دەرکی ئەو حیکمەتە ناکەن، ئەگەرنا هیچ شتێکی خوا بە بێ حیکمەت نیە، چونکە خوا ﷻ بە هەموو شتێک زانایەو، هەر شتێک کە دەیکات، ئەوپەڕی حیکمەتی تێدا بەکار دێنێ.

٥)- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوەو، سەرزەوی دوای ئەوەی کە مردوە، زیندووی کردۆتەوە؟ بەجەختکردنەوە دەڵێن: خوا.

لـە سـوورەتی (الجاثیـة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴿٥﴾ ﴾.

لـە سـوورەتی (البقـرة) دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴿١٦٤﴾ ﴾.

بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهَا ﴾، لەبـەر ئـەوەی لـەوێ تەنیا باسـی نیعمـەت و چاكەكانـی خوایـە، بـەڵام لێـرە بـاس باسـی هاوبـەش بـۆ خوادانانـە، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: لـە دوای مردنـی زەوییـەوە، كـێ زینـدووی دەكاتـەوە؟ واتـە: (مِنْ)ی بـۆ زیادكـراوە تاكـو لەسـەرەتاو دەسـتپێكی مردنەكـەوە، بیگرێتـەوە، كەواتـە: هاوبـەش بـۆ ئـەو خوایـە دامەنێـن، ئـەو خوایـە شایسـتەی ئەوەیـە بەندایەتیـی و پەرسـتشی بـۆ سـاغ و یەكلابكرێتـەوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، یـانی: زۆر بـە جەختكردنـەوەوە دەڵێـن: بـەس خـوا نـاوی دابەزانـدوەو سـەر زەوی مـردووی پـێ زینـدوو كردۆتـەوە.

٦)- ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خوا، واتە: لەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەو، لەسەر ئەو هەموو نیعمەت وچاكانەو، لەسەر ئەو هەموو سیفەتە بەرزو بێ وێنانەی خوا لە هەرسێك بواری: جوانیی و شكۆ و تەواویی (جمال وجلال وكمال)دا.

٧)- ﴿ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، بەڵكو زۆربەیان نافامن، واتە: ستایش هەر هی خوایە، بەڵام ئەوان زۆربەیان نازانن و نافامن، بۆیە دەركی ئەو بەڵگە ڕۆشنانە ناكەن و، ستایش و مەدح و سەنا، تایبەت ناكەن بە خواو خاوەنی خۆیانەوە ﷻ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ژیانی دنیا لە ڕووە ماددیەکەیەوە: خافڵان و گەمەو، مەنزڵگای کۆتایی، ژیانی ڕاستەقینەی تێدایە ئەگەر بزانن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:**

**١)- ﴿وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ﴾، ئەم ژیانی دنیایەش تەنیا خافڵان وپارییە.**

**وشەی (لَهْوٌ) (اللَّهو: ما يَلْهُوا بِهِ النَّاسُ أَي: يَشْتَغِلُونَ عَنِ الأُمورِ المُكَدِّرَةِ، أو يَغْمُرُونَ بِهِ أَوقَاتَهُمُ الخَلِيَّةَ عَنِ الأَعْمَالِ)، (لَهو): بریتیە لە شتێک کە خەڵک پێی دەخافڵێن، یاخود ئەو شتانەی کە ژیانیان لێڵ دەکات، ئەو خافڵانە لەوە بێ ئاگایان دەکات، یان کاتە بۆشەکانی خۆیانی پێ دەبەنە سەر، ئەو کاتانەی کاریان نیە، بەڵام (لَعِب): بریتیە لە کارێک کە ئینسان مەبەستی پێ گاڵتەو پێکەنین و خۆشیی بێ، نەک شتێکی جیددیی.**

**جیاوازیی نێوان (لَهْوٌ) و (وَلَعِبٌ) ئەوەیە:**

**أ- (لَعِب) بریتیە لە ڕووکردنە ناهەق، بەڵام (لَهْوٌ) بریتیە لە پشتکردنە هەق[1].**

**ب- هەندێکیش گوتوویانە: وشەی (لَعِب) لە سەرەتای تەمەنەوەیە، منداڵ یاریی و گەمە دەکات، بەڵام وردە وردە کە تەمەنی هەڵدەکشێ، ئنجا خەریکی خافڵان (لَهْوٌ) دەبێ واتە: ئەو جۆرە یارییانەی جۆرێک لە عەقڵ وردەکارییان دەوێ، هەروەها (لَهْوٌ): لە قۆناغێکی پێشکەوتووتری تەمەندا دەبێ، ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین دەبینین خوا بەزۆریی وشەی (لَعِب)ی پێشخستوەو لە چەند شوێنێکیش دا وشەی (لَهْوٌ)ی پێشخستوە، بۆ وێنە:**

---

(١) التفسير المنير: ج١١، ص ٣٨.

أ- لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۖ وَلَلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: ژیانی دنیا تەنیا یاریی وخافڵانەو مەنزڵگای کۆتایی باشترە بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن، ئایا نافامن؟

ب- لە سوورەتی (الحدید)دا دەفەرموێ: ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ﴿٢٠﴾﴾، واتە: بزانن کە ژیانی دنیا یارییە، خافڵانە، جوانیی و ڕازانەوەیە، خۆ بەسەر یەکدا هەڵکێشانە، زۆرکردنی سامان و کوڕانە (منداڵانە)، وەک بارانێک کە ڕووەکەکەی بابای خاوەن کشتوکاڵ سەرسام دەکات.

جـ- لە سوورەتی (الأعراف)یش دا وەک تێرە (لَهۡوٗ)، پێشخراوە کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا ﴿٥١﴾﴾، کەواتە: بە پێی سیاقەکە جاری وا هەیە (لَعِبٞ) پێشدەخرێ، ئەگەر مەبەست خستنەڕووی قۆناغبەندیی کاتیی بێ، بێگومان (لَعِبٞ) لە پێش (لَهۡوٞ)ەوە دێ، ئەگەر لە ڕووی چۆنیەتییەوەش تەماشا بکرێ، (لَهۡوٞ) پێشدەخرێ، چونکە (لَهۡوٞ) زیاتر مرۆڤ سەرقاڵ و سەرگەرم دەکات و، لە قۆناغێکی پێشتری تەمەنیشدا دێتە دی.

٢)- ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾، مەنزڵگای کۆتایی، بەس ئەوە ژیانی ڕاستەقینە، واتە: ژیانی ڕاستەقینە لەوێیە، ئەگەر بزانن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی ڕاستیێتی خوا بە یەکگرتن و، تەنیا خواپەرستیی و، پووچەڵیی شیرک و، بێمرادیی و ئاکام خراپیی هاوبەشدانەران:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾، کاتێک سواری کەشتیی بوون، یاخود: سواری کەشتییەکان بوون، بەملکەچیی ساغکردنەوە و لەخوا پاڕانەوە، جاری دیکەش گوتومانە: (الْفُلْكِ) هەم بەمانای بە یەک کەشتیی (السَّفِينَة) دێ، هەم بە کۆمەڵە کەشتییەک (السُّفن) دێ، وشەی (الْفُلْكِ) تاک و دووان و کۆ تێیدا هاوبەشن.

ئایا لێرەدا ڕاناوی کۆ لە (رَكِبُوا)دا بۆ کێ دەچێتەوە؟ ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا ﴾، بە سیاق دەزانین کە مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، نەگەرنا ئەگەر نیشانە (قرينة)یەک نەبێ، هەموو ئەو وشانەی کۆی خەڵک دەگەیەنن، دەبێ هەموو خەڵک بگەیەنن بە بێ هەڵاواردن، بەڵام جاری وا هەیە سیاقێک مانایەکەی تایبەت دەکات بە کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراوەوە کە لێرە وایە، واتە: کاتێک کە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان سواری کەشتیی دەبن، یان سواری کەشتییەکان دەبن، سەرەتا بێئاگایانە لە خوا ناپاڕێنەوەو بۆ لای خوا ناکڕووزێنەوە، بەڵام کە لێیان قەوما، دڵسۆزانە هاواری خوا دەکەن:

﴿ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، دوای ئەوەی تووشی گرفت و کێشەو ناڕەحەتییەک دێن، لە خوا دەپاڕێنەوە، گەردنکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، یانی: (أَخْلَصُوا خُضُوعَهُم لِلهِ وَحْدَه)، (ٱلدِّينَ) لێرەدا بە مانای ملکەچیی و ژێردەستەیی دێ، ژێردەستەیی و ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، (أَخْلَصَ يُخْلِصُ إِخْلاصاً، فَهُوَ مُخْلِص) واتە: ساغی کردەوە، ساغی دەکاتەوە، ساغکردنەوە، ئەو ساغکەرەوەیە، ﴿ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، واتە: گەردنکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغدەکەنەوەو، بەشی جگە لە خوای پێوە ناهێڵن، ئەوە لە کاتێکدا کە تووشی تەنگانەو سەغڵەتیی دەبن، هەمیشە خوا ﷻ ئەو شتانەی کە بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێن، دەیانقرتێنێ، یانی: (فَإِذا رَكِبُوا فِي الفُلْكِ، غَفَلُوا عَنِ الله، لكِن إِذاوَقَعُوا فِي شِدَّةٍ، دَعَوا اللهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِين) واتە: هەرکات سواری کەشتیی بوون، لەخوا بێ ئاگابوون، بەڵام کە تووشی سەختییەک بوون، بەملکەچیی خۆ بۆ خوا ساغکردنەوەوە لێی پاڕانەوە، ئەگەر نا یەکسەر کە سواری کەشتیی دەبن، بە ملکەچیی بۆ خوا ساغکردنەوەوە لێی ناپاڕێنەوە، وەک لە شوێنەکانی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾یونس.

خوا ﷻ ئەو ڕاستییانەی لە هەندێک لە سوورەتەکاندا، لە ئایەتەکاندا باسیان دەکات بە وردیی، لە ئایەت و سوورەتێکی دیکەدا کە هەمان ڕاستی دووبارە دەکاتەوە، ئەو شتانەی لێ دەقرتێنێ و، جێی مەبەست باس دەکات و، ئەو شتانەی کە لە شوێنەکانی دیکەدا، باسیکردوون، دووبارەیان ناکاتەوە.

٢)- ﴿ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ ﴾، کاتێک دەربازی کردن بەرەو وشکانیی، واتە: لەو شەپۆل و گەردەلوولەی نێو دەریاو ناڕەحەتییانەی کە تووشیان بووە، لە نێو دەریادا، دەربازی کردن بەرەو وشکانیی.

٣)- ﴿ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾، یەكسەر ئەوان هاوبەشدادەنێن.

(إِذَا) بـۆ كـت وپڕییـە (لِلمُفاجَئَـة) یانـی: (ابتَـدرُوا إلى الـشِّرك فَـوْرَ وُصُولِهـم إلى الـبَرّ) واتـە: یەكسـەر كـە گەیشـتنە وشـكانیی، هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن.

جـاری دیكـەش باسـم كـردوە كـە خۆم ئـەو دیمەنـەم بینیوە، لـە سـاڵی (١٩٩٨ ز)دا بـوو، ئێمـە لـە ماڵئـاوە چووینـە (بنغازي) لـە (لیبیا)، لەوسـەر كـە گەڕاینـەوە، لەهـەر سـەرەی دوازدە سـەعات یاخـود زیاترمـان پێچـوو، لـە دەریـای سـپیی نێوەڕاسـتدا، لـە سـەری گەڕانـەوە، بـاو گەردەلوولێـك لێـی دایـن، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ ﴿٤٢﴾ ﴾هـود، ئـەو كەشـتییە زلـە كـە حـەوت قـات بـوو، دەوری دوو هـەزار (٢٠٠٠) كەسـی دەگـرت، وەك تەپەدۆڕێكـی گچكـە ئـەو ئـاوە گەمـەو یاریـی پێدەكرد، هـەر جارێـك كـە پێشـەكەی دادەچـوو، دەمانگـوت: تـازە بـۆ بنـی دەریـا دەڕوات، هـەر كاتێـك بـە لای ڕاسـت دا دەكـەوت، بـە لای چەپـدا دەكـەوت، یـان بـەرەو دوا هەڵدەگەڕایـەوە، زۆر مەترسـییدار بـوو، ئـەو خەڵكـە هەمـووی لـە خـوا دەپاڕایـەوەو، تووشـی وەزعێكـی ناڕەحـەت بـوو بـوون بـە مسـوڵمان و نامسـوڵمانەوە، بـەڵام هـەر ئەوەنـدە كـە كەوتینـەوە خۆشـیی و، شـەپۆل و گەردەلوولەكـە بەسـەرچوون، كـە پێشـتر شـەو بـوو، دوایـی كـە ڕۆژمـان لـێ بـووەوە، دنیـا ڕوونـاك بـوو، دەریـا كـش و مـات بـوو، خەڵـك گەڕایـەوە سـەر بەزمـی پێشـووی.

٤)- ﴿ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ﴾، با بەوەی پێمانداون سپڵەو بێ نمەك بن، (ل)ی (لِيَكْفُرُوا۟) (لام التعليل)ی پێدەگوترێ، بە مانای تاكو (كَيْ)دێ، (كَيْ يَكْفُرُوا بِمَا اتَيْناهُم)، تاكو سپڵەیی بكەن بەرانبەر بەوەی پێمانداون، دەشگونجێ (لام العاقبة) بێ واتە: سەرەنجام وایانلێبێ ناسپاس وسپڵەبن، دەشگونجێ (ل) لامی فەرمان (لام الأَمْر) بێ، بەڵام مەبەست پێی هەڕەشە بێ واتە: با سپڵەیی بكەن بەرانبەر ئەوەی پێمان بەخشیون! دوایی دەزانن چییان بەسەردێ!

٥)- ﴿ وَلِيَتَمَتَّعُواْ ﴾، هەروەها با ڕابوێرن و بەهرەمەند بن، (التَّمَتُّعُ: الإنتِفاعُ القَصِيرِ زَمَنُهُ)، (تَمَتُّع) بریتیە لە سوودمەند بوونێک کە ماوەکەی کەم بێ.

٦)- ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن، ئەمە بە تەئکید هەڕەشەیە، لەمەودوا دەزانن کە چۆن سزایان دەدەین لەسەر ئەو سپڵەیی و، بێئاگا بوونە لە خوا ﷻ.

ئەو ئایەتەی پێشتر بە گشتیی بۆ هاوبەشدانەرەکان بوو، ئنجا تایبەت بۆ هاوبەش دانەرەکانی مەککە، خوا ﷻ لە چەند شوێنی دیکەش داو لێرەش خوا ﷻ بەتایبەت هۆزی قورەیش، کافرەکانی مەککە دەدوێنێ و، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا ﴾، ئایا نابینن کە ئێمە حەڕەمێکی پڕ هێمن و ئاسایشمان بۆ ڕەخساندوون! ( أَوَلَمْ يَرَوْاْ ) پرسیار کردنەکە پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنە، واتە: بە دڵنیایی دەیبینن کە ئێمە حەڕەمێکی پڕ هێمن و ئاسایشمان بۆ ڕەخساندوون، کە تێیدا لە خۆیان ئەمین و دڵنیان.

٨)- ﴿ وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴾، لە حاڵێکدا کە خەڵک لە دەوریان دەڕفێنرێ، دەبردرێ.

٩)- ﴿ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ ﴾ ئنجا ئایا ئەوانە بڕوا بە پووچ (باطل) دەکەن؟ (باطل) پێچەوانەی هەقەو، مەبەست پێی هەموو ئەو شتانەیە کە لەگەڵ ئیسلامدا تێکدەگیرێن، ئایا بڕوا بە ناهەق دەکەن؟

١٠)- ﴿ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴾، کەچی بەرانبەر بە چاکەی خوا سپڵەن؟ یاخود (يَكْفُرُونَ) یانی: بێبڕوان، کەچی بێبڕوان بە چاکەی خوا؟

١١)- ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾، ئایا کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ؟ ئەمەش دیسان پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنە، واتە: هیچ کەسێک لەو کەسانە ستەمکارتر نیە کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، درۆ هەڵبەستنەکەش ئەوەیە بڵێن: خوا هاوبەشی هەیە، خوا ڕۆڵەی هەیە، کچی هەیەو کوڕی هەیە.

وەک لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٠﴾﴾، واتـە: بـە بـێ زانیاریـی کچـان و کوڕانیـان بـۆ خـوا دانـان، دەیانگـوت: فریشـتەکان کچانـی خـوان، شـەیتانەکان کوڕانـی خـوان.

١٢)- ﴿أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ﴾، هەروەها: یان کێ ستەمکارترە لە کەسێک کە هەق بە درۆ دادەنێ کاتێک بۆ لای دێ، یانی دوای ئەوەی خوا پێغەمبەر ﷺ دەنێرێ، ئەو هەقەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێیەتی کە قورئانە، بەبێ خۆ ماندووکردن دێتە لایان، بێ ئەوەی ئارەقی پێوە بکەن، کەچی ئەوان بە درۆی دادەنێن، کێ لەوانە ستەمکارترە؟ بێگومان کەس.

١٣)- ﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ﴾، ئایا لە دۆزەخدا بۆ بێبڕوایان جێگای حەوانەوە نیە؟

هەمـزە (أ)ی (أَلَيْسَ) بـۆ پرسـیار کردنـە بـۆ دانپێپێداهێنـان (تقریـر)ە، بـە زۆریـی پرسـیار کـردن لەگـەڵ لابـردن (نفـي)دا (أَلَيْسَ) کـە دێ، بـۆ پرسـیار لێکردنـی دان پـێ پێداهێنانـە، کـە بەرانبەرەکـە دەبـێ دانـی پێـدا بێنـێ.

(المثْوى: مَكانُ الثَّواء وهُوَ الإقامَـةُ الطَّويلَـة والسُّكْنى)، (مثوى): بریتیـە لـە شـوێنی تێـدا نیشـتەجێ بـوونی درێـژو تێـدا حەوانـەوە، واتـە: کافـرەکان ئەگـەر شـوێنێک هەبـێ تێـدا بحەوێنـەوەو نیشـتەجێ بـن تەنیـا دۆزەخـە.

ئەلیـف و لامـی سـەر (لِلْكَافِرِينَ) بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام ناسـاندنی (عهـد)، واتـە: بـۆ کافـرەکان، ئـەو کافرانـەی کـە دیـارە کێـن، کـە پێشـتر قسـەیان لێکـراوە.

جەریر کە یەکێکە لە شاعیرەکان، دیارە مەدحیی پاشایەک دەکات دەڵێ:

ئایا ئێوە باشترین کەسێک نین کە سواری وڵاخان بووە،

ئایا تۆ لە هەموو جیهانییان نێو لەپت تەڕتر نیە، (یانی: بەخشندەتر نی)؟

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ئەوانـەی لـە ڕێـی خـودادا تێدەکۆشـن، خـوای میهرەبـان ڕێبازەکانـی خۆیـان پێشـان دەدات و، بـە دڵنیایـی خـوا لەگـەڵ چاکـەکاران دایـە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا ﴾، ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێدەكۆشن، لێرەدا ( وَالَّذِينَ) (الإسْمُ الموصولُ هُنا بِمَنزِلَةِ المُعَرَّفِ بِلامِ العَهْد) (الذين) (إسم الموصول)ە، بەڵام لە شوێنی ناوێكە بە (أل)ی (عهد) پێناسە كرابێ، یانی: ئەو كەسانەی كە، (كە دەزانین كێن،) لە پێناوی ئێمەدا تێدەكۆشن.**

**(جَاهَدُوا ) واتـە: تێكۆشـاون و ئەوپـەڕی توانـای خۆیـان بەكارهێنـاوە، (فِينَا ) واتـە: لـە پێنـاوی ئێمـەداو لەبـەر ئێمـە، كەواتـە: دوو خەسـڵەتیان هەبـوون:**

**١- تێكۆشاون و ڕەنجیان داوەو خەباتیان كردوە، خۆیان ئەوپەڕی ماندوو كردوە.**

**٢- تێكۆشانەكەشیان تەنیا لە پێناوی خوادا بووە.**

**كـە مەبەسـت لـە جیهادەكەیـان خۆڕاگریـی بـووە لەسـەر ئـازارو ناڕەحەتیـی و، بـەڵاو بەرپـەرچ دانـەوەی دوژمنـان و...هتـد.**

**٢)- ﴿ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾، بە دڵنیایی ڕێبازەكانی خۆمانیان پێشان دەدەین.**

**(لَنَهْدِيَنَّهُمْ ) (ل)كـە بـۆ سـوێندە (لام القسـم)، نوونەكـەش بـۆ تەئكیـدە، واتـە: بـە دڵنیایـی ڕێیەكانـی خۆمانیـان پێشـان دەدەیـن، واتـە: ئـەو ڕێبازانـەی كـە جیهـادو خەباتێكـی ڕاسـت و دروسـتیان لێـوە بكـەن، ئـەو ڕێبازانـەی كـە دەیانگەیەنـن بـە ئامانـج لـە دنیـاداو، دەیانگەیەنـن بـە ڕەزامەندیـی ئێمـە لـە ڕۆژی دوایـی دا.**

﴿ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾، ئاماژەشی تێدایە کە ئەوانەی دەیانەوێ لە پێناوی خوادا ڕەنج بدەن، خەبات بکەن و، دەیانەوێ کۆچ بکەن، خوا ڕێی کۆچ کردنیان بۆ ئاسان دەکات و، زەمینەیان بۆ خۆش دەکات.

٣)- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە، بە تەئکید ئەم لەگەڵدا بوونە، لەگەڵدا بوونێکی تایبەتە، لەگەڵدابوونی مشوور لێخواردنە، ئاگا لێبوونە، سەرپەرشتیاریی کردن و هاوکاریی کردنە.

گوتراوە: (مَنْ عَمِلَ بِمَا عَلِمَ، وَرَّثَهُ اللَّهُ عِلْمَ مَا لَمْ يَعْلَمْ) واتە: هەر کەسێک کار بکات بەوەی دەیزانێ، خوا ئەوەشی کە نایزانێ فێری دەکات، زۆرجار ئینسان لە نیشدا فێرە نیش دەبێ، لە ئەنجامی کارکردن دا بەو زانیارییەی کە پێت دراوە، دەرگای زانیاریی دیکەت لێ دەکرێتەوە.

(القرطبي) لەو بارەوە ئەو شوێنەوارەی هێناوە لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: گوتراوە: سوفیانی کوڕی عوەینە بە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکی گوتوە: هەر کاتێک بینیت خەڵک کەوتبوونە ڕاجیایی لە شتێکدا، تۆ پرسیار لە موجاهیدەکان بکە، (لە تێکۆشەران بکە) لەوانەی کە سەنگەر نشینن، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە ڕێنمایی دەکەین، ڕێیان پێشان دەدەین، دەیانخەینە سەر ڕێیەکانمان، ئەو ڕێیانەی کە بە ڕزامەندیی ئێمەیان دەگەیەنن.

منیش لە کۆتایی دا، لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە دەڵێم:

خوا ﷻ دوو شتی داناون بۆ بەندەکان:

١- (جَٰهَدُواْ) ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکار هێناوە، چونکە (جِهاد: بَذْلُ أَقْصَى ما فِي الوِسعِ) (جِهاد) بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانایە، بەندەکان ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکارهێناوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٣، ص٢٩٤.

٢- (فِينَا) لەپێناوی ئێمەدا، لە پێناو ڕازیی کردنی خوادا، یانی: لە پێناوی بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خواداو بۆ ڕازیی کردنی خوا.

کەواتــە: لەبەندەکانــەوە: بەکارهێنانــی ئەوپــەڕی توانــا، بــە ســاغیی و خــوا پــێ مەبەســت بوونــەوە.

لەلایەن خوای پەروەردگاریشەوە، دوو بەڵێن و موژدە دراون:

١) ﴿ لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا ﴾، ڕێیەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین، دەیانخەینە سەر ڕێیەکانی خۆمان، ئەو ڕێیانەی کە دەیانگەیەنن بە ڕەزامەندیی ئێمە، بە هێنانەدی ئامانجە شەرعییەکان.

٢) ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە، بە لەگەڵدا بوونێکی تایبەت ئاگای لێیانە، مشووریان لێ دەخوات، هاوکاریان دەبێ.

وەک پێشــتریش گوتمــان: لێــرە دەفەرمــوێ: (سُبُلَنَا) ڕێیەکانــی ئێمــە، بێگومــان ڕێــی خــوا هــەر یەکێکــە، کــە ڕێــی ئیســلام و قورئــان و شــەریعەتە، بــەڵام لێــرەدا (سُبُلَنَا) واتــە: ئــەو ڕێیانــەی کــە ئــەوان دەیانگرنــە بــەر بــۆ تێکۆشــانیان لــە پێنــاوی ئێمــەدا، کە ســەرەنجام ئــەو ڕێیانــە بیانگەیەنــن بــە ئامانجــە شــەرعییەکان، کە خــوای پــەروەردگار لێیــان ڕازییــەو ڕەزامەندیــی خوایــان تێدایــە.

کەواتــە: لــەو ئایەتــە موبارەکــە وەردەگیــرێ: کــە لــە ئێمــە حەڕەکــەت، لــە خــوا بەرەکــەت، لــە ئێمــە جــووڵان، لــە خــوا ﷻ یارمەتییــدان.

هەروەهــا لــەو ئایەتــە ئــەوەش وەردەگیــرێ: کــە کارکــردن بــۆ خــوا، مایــەی بەرچاو ڕوونیــی و هیدایــەت درانــە، کەســێک کار بــۆ خــوا بــکات، لــە پێنــاوی خــوادا خــۆی مانــدوو بــکات، دەبێتــە مایــەی ئــەوە کــە خــوا بەرچــاوی ڕوون بــکات و بــەر پێــی خــۆی ببینــێ، ڕاســت و چەپــی لێــک بکاتــەوەو، خــوا لــە دینــی خۆیــدا، ســەر ڕاســت و شــارەزای بــکات.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی، ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە ئەوپـەڕی تواناپـان بەکاردێنـن لـە پێنـاوی خـوادا، بـە دڵسـۆزانە، بـە سـاغیی، هەروەهـا خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە هـەردەم هەوڵـدەدەن لـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوادا بەرچـاو ڕوونتربـن، زاناتربـن، شـارەزاتربن، بـۆ ئـەوەی هیـچ شـتێک نەڵێـن و هیـچ شـتێک نەکـەن، کـە ئایینـی خـوا پێـی ڕازی نەبـێ و، جێـگای ڕەزامەندیـی خـوای پـەروەردگار نەبـێ و، دوور بـێ لـە سروشـتی ئایینـی خـوا، کـە بـە تەئکیـد هـەر شـتێک جێـگای ڕەزامەندیـی خـوا نەبـێ، خـوا بەرەکەتـی ناخاتـێ و، هـەر شـتێک پێچەوانـەی سروشـتی ئایینـی خـوا بـێ، بێگومـان لـە جیاتـی ئـەوەی خزمـەت کـردن بـێ بـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا، دەبێتـە هـۆی ناشـیرینکردنی ئایینـی خـوای بـەرزو مـەزن و، دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە خەڵـک لـەو ئاییـن و بەرنامـە ڕێـک و ڕاسـتە دوو دڵ و دڕدۆنـگ بـن و، بکەونـە گومانـەوە، خـوا بمانپارێـزێ لـەوەی کـە ببینـە مایـەی دوور خسـتنەوەی خەڵـک و سـڵەمانەوەی خەڵـک لـە ئایینـی خـوا، بـە هـۆی قسـەو کـردارو هەڵوێسـتی ناشایسـت و نەگونجـاو، لەگـەڵ سروشـتی بـەرزو پـاک و بێوێنـەی ئاییـن و بەرنامـەی خـوای پـەروەردگاردا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# نێوەڕۆک



## تەفسیری سووڕەتی القصص

## تەفسيرى سووڕەتى العنكبوت